# ئیسلام و ناسیونالیسم

ئەبوبکر عەلی





# ئیسلام

# و

# ناسیۆنالیزم

ئەبوبکر عەلی

زنجیرەی "ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی"

**بەناو خوا کە دەهەندە و دلۆڤانە**

# ئیسلام و ناسیۆنالیزم

## (ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ؛ دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ)

## (ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ؛ خوێندنەوەیەکی مەیدانی)

نووسەر: ئەبوبەکر عەلی

رووبەرگ: رۆنیکا

نێوەرۆک: رێباز

ئەژمار: ٢٠٠٠ دانە

چاپ: هەولێر

بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی ١١٨٢ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێداوە

ئەم زنجیرەیە پێشکەشە بە:

- گیانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری
- ڕێبەر و ڕەمزە نەتەوەیەکانی کورد
- شەهیدانی ڕێگای ڕزگاریی و سەربەخۆیی کوردستان
- شەهیدانی ئەنفال وکیمیاران
- لایەنگرانی مافی چارەنووسی گەلان لەجیهاندا
- هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە برایەتی و بەیەکەوەژیانی ئاشتیخوازانەی گەلان هەیە
- ئیسلامخوازانی سەربەخۆخواز لە ریزەکانی تەوژمی ئیسلامیی کوردستاندا.

# پێڕست

## بەشی یەکەم

## (ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ؛ دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ)



## فەسڵی یەکەم

## فەسڵی دووەهەم



## فەسڵی سێیەم

**ئیسلام و ناسیۆنالیزمی کوردی**

# فەسلی چوارەم

**ناسیونالیزمی کوردی..**

# بەشی دووهەم
# (ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ؛ خوێندنەوەیەکی مەیدانی)



## فەسلی یەکەم



## فەسلی دووهەم

## فەسڵی سێهەم



## فەسڵی چوارەم

## فەسڵی پێنجەم



## فەسڵی شەشەم

## فەسلی حەوتەم



## فەسلی هەشتەم

## پێشەکی

سەرجەم بابەتەکانی ئەم زنجیرە بەدەوری ئەم دوو تەوەرەدا دەخولێنەوە. واتە قسەکردن لەسەر کێشەو گرفتەکانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی و، هەوڵدان بۆ بەشداری لەچارەسەرکردنی ئەو کێشانەو کردنەوەی ئاسۆی نوێ بەڕویدا، هەروەها خستنەڕووی تێگەیشتنێکیتر بۆ پێگەی ئیسلام لەکۆمەڵگادا و پەیوەندی ئەو بە ناسیۆنالیزمی کوردییەوە، کە ڕێگا لەوە بگرێت ئایین بکرێتە ئیشکالیەتێکی ناسیۆنالیزمی کوردی و بەمەش کێشەیەکیتر بچێتەسەر کێشە زۆرو زەوەندەکانی ئەم ناسیۆنالیزمە. چونکە ئیسلام بەسیفەتی ئایینی زۆرینەی کۆمەڵگا ڕۆڵێکی گرنگی شوناسی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد و گەلی کوردستانە. لێرەشەوە قسەکردنەکانی نوسەر لەسەر پەیوەندی نێوان ئیسلام و ئیسلامیەکان و بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی چەند ئامانجێکی ڕوونی لەپشتەوەیە، لەوانەش، لەڕوو هەڵماڵینی ئەو شەڕە ئایدۆلۆژیانەی بە ناوی ناسیۆنالیزمەوە دەکرێن و لە جەوهەردا خەمی ناسیۆنالیستانەیان لەپشتەوە نییە بەڵکو ناسیۆنالیزم کراوەتە پاساو و سەنگەر بۆ ئەوەی بانگەشە کردن بۆ ئامانجە ناسیۆنالیستییەکان بچنە سەرووی ململانێ ئایدۆلۆژی و سیاسی و گروپییە ناوخۆییەکانەوە. ئەگەر ئایدۆلۆژیا و ڕێباز و شوناسی سیاسی و گروپی لێکمان جیابکاتەوە، دەبێت ناسیۆنالیزم کۆمان بکاتەوە

و زەمینەی ئاشتبوونەوە و کاری هاوبەشمان بخاتە بەردەست. هەربۆیە دەبێت کێشە ناوخۆییەکان نەگەیەنرێتە ئەو ئاقارەی وێنەی هەندێ لایەنی سیاسی ناوخۆیی بخرێنەپاڵ وێنەی بەرامبەری نەتەوەیی، چونکە ئەمە خۆی لەخۆیدا دژی سەرەتاکانی ناسیۆنالیزمە. لەپاڵ ئەمەدا خەمێکی سەرەکی نوسەر هۆشیار کردنەوەیە بەرامبەر ئەو گۆڕانەی بەسەر شوناسی فکریی بزاڤی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا هاتووە. کە ئەمەش لەدەرکەوتنی هێزو بزوتنەوە ئیسلامیەکاندا خۆی دەبینێتەوە. زۆر گرنگە گەر بەزمانە باوەکەی دوێنێی ئەدەبیاتی سیاسی کوردیش بدوێین ئەوە ڕوون بێتەوە کە ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی گشتی باڵێکی بزوتنەوەی بزاڤی ڕزگاری نیشتمانی کوردستانن و بەشێکن لەو ووزە نیشتمانیە کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشە دەرەکیەکان و سەرخستنی پڕۆژە نیشتمانیە کوردیەکە. وە دەبێت ئیسلامیەکانیش بۆ ساتێکیش ئەم پێگە سروشتییەی خۆیان لەیاد نەچێت و هۆشیاربن پێی و بەو هەناسەوە سیاسەت بکەن و بجوڵێنەوە، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش واتە بوونی ناسیۆنالیزمی کوردی بەچوارچێوەیەکی هاوبەشی لەخۆگری جیاوازە ئایدۆلۆژیەکان جەختی زۆر لەسەر مەسەلەی ئیرادەی بەیەکەوە ژیان و باوەڕبوون بەفرەیی و جیاوازی و ڕێزگرتنی تەوژم و لایەن و پێکهاتەکان بۆیەکتر کراوەتەوە. لەهەمان کاتدا جیاوازیەکان لەچوارچێوەی یەکیەتیدا خراونەتەوەڕوو واتە لەچوارچێوەی نەگۆڕە نیشتمانییەکان و خاڵە ناکۆیەکان و بوونی دەستورێکی مەدەنی کە ماف و ئازادی و شوناسی سەرجەم پێکهاتەو تەوژمەکان دابین بکات و ئاراستەش بەگۆڕانەکان بدات.

لێرەوەیە لەکاتێکدا نوسەر گۆشەیەکی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزم یاخود ناسیۆنالیزمی کوردی و تەوژمی ئیسلامیی کوردستانی لەڕوانگەیەکی ئیسلامیی هاوچەرخەوە دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، لەهەمانکاتدا لەدیدێکی نیشتمانی فراوانەوە دەیخوێنێتەوەو سەیری بەرنجامگیرییە فیکرییەکان دەکات. لەپێناو تازەکردنەوەی وێنەی تەوژمەکان لەیەکتری و دەرچوون لەبازنە ئایدۆلۆژی و گروپی و حیزبیە تەنگەبەرەکان و کردنەوەی ئاسۆیەکی فراوانتر بەڕووی تێگەیشتن لەکاری نیشتمانی و هەوڵی ئیسلامخوازانە و یەکتر تەواوکردنی تێزەکان لەبۆتەی بەرنامەیەکی کاری نیشتمانی هاوبەش و هەوڵێکی ڕاستەقینە بۆ ڕزگاری و سەرفرازی کوردستان و گەلەکەی.

یەکەم ئەڵقەی ئەم زنجیرەش کە ئەم کتێبەیە لەدوای پێشەکی چوار فەسڵ لەخۆدەگرێت. فەسلی یەکەم تایبەتە بەهەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەچەمکی ناسیۆنالیزم و خستنەڕووی تێگەیشتنێکی ئیسلامیی هاوچەرخ بۆ چەمکەکەو پراکتیزەکردنی ئەم تێگەیشتنە بەسەر دۆخی کورد و کێشە نەتەوەییەکەیدا. نوسەر لەم فەسڵەدا هەوڵی داوە مەنهەجیەتێکی نوێ بۆ قسەکردن لەسەر پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزم دابهێنێ کە بە (تواضع)ەوە ئاماژە بەوەدەکات ئەو مەنهەجیەتە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلام تازەیەو زۆر کەمن ئەوانەی توانیویانە بەو هەناسەوە لەو باسە بدوێن. نوسەر لەم فەسڵەدا نایەوێت زۆر لە دەقە ئیسلامیەکان بکات و ملکەچی چەمك و پێوەرە سەردەمییەکانیان بکات، بۆئەوەی بیسەلمێنێ ئیسلام پشتیوانی لە ناسیۆنالیزم و کێشەی کورد دەکات، وەك هەندێ لە سۆنگەی لاوازی پاشخانی فکری و سۆزی نەتەوەییەوە ئەمەیان کردووە، چونکە کارێکی لەوجۆرە

شێواندنی ناوەڕۆکی دەقە ئیسلامیەکان و ناسیۆنالیزمیشە. ئەوەش لەبەرەنجامی کۆتاییدا خزمەت بەمەسەلە ناوەندییەکەی ئێمە ناکات. چونکە گەر هەندێ پێیان وابێت دەبێت (إستغلال)ی ئیسلام بکەین بە قازانجی ناسیۆنالیزمی کوردی وەك هەندێ ناسیۆنالیستی کورد لێرەو لەوێ باسیان کردووە. نوسەر دژی ئەو لۆژیکەیەو پێشی وایە کارێکی لەو جۆرە لەم سەردەمەدا مەیسەر نابێ و گونجاویش نییە. ئەوەی بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی لەپەیوەندی بەباسی ئیسلامەوە گرنگە ئەوەیە تێگەیشتن و ڕاڤەیەکی مێژوویی و فقهی وشك لەئیسلام نەخرێتەڕوو کێشەی بۆ دروست بکات، کە خۆشبەختانە مێژووی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی و کۆمەڵگای کوردستان زۆرکەم هەوڵی لەم شێوەی بەخۆیەوە دیوە، گەر لێرەو لەوێش دەنگێ هەبووبێت ویستبێتی بەم ئاراستەیەدا قسەبکات نەیتوانیوە لەبازنەیەکی زۆر تەسك دەربچێت و بەرەو پوکانەوە چووە. چونکە تەوژمە ئیسلامیەکەی کوردستانیش دوای دەیان ساڵ لەچوونەژێر کارتێکردنی کۆمەڵگاو ڕۆشنبیری کوردی بۆ ناسیۆنالیزم سەری هەڵداوەو بەجۆرێ لەجۆرەکان بارگاویە بەزمان و چەمك و هەناسەو دنیابینییەکانی. لەڕوویەکی‌ترەوە ئەوەی گرنگە سوود وەرگرتنە لە ووزە شاراوەکانی ئیسلام لەچوارچێوەیەکی سروشتی و لەدیدێکی عەدالەتخوازانەوە بەقازانجی ئامانجە ناسیۆنالیستییە ڕەواکان و یەکانگیری کۆمەڵگا.

فەسڵی دووەمی کتێبەکەش تەواوکەری فەسڵی یەکەمەو باس لەمافی چارەنووس دەوڵەتی نەتەوەیی دەکات لەدیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخەوە. دەیەوێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە ئایا دەشێت ئێمە دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ بۆ ئەو دوو چەمکە گرنگەی ناسیۆنالیزم بنیاتبنێین بەتایبەتی بۆئێمەی کوردستانیەکان لەم

قۆناغە زۆر گرنگەی ژیانی سیاسیماندا؟ ئایە دەشێت لەڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە خەڵکانێ ئەو چەمکانە ڕەتکەنەوەو بەوەش ڕەهەندێکی ئیسلامیی بدەن بەو هەوڵانەی دژ بە ناسیۆنالیزمی کوردی و نەتەوەی کورد دەیدەن؟ ئەگەر ناتوانن چۆن و بە چ شێوەیەك؟

فەسڵی سێیەمیش خوێندنەوەیەکی ناسیۆنالیستانەو ئیسلامیانەی هاوچەرخە لەیەك کاتدا بۆ پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزمی کوردی لە (١٠٠) ساڵی ڕابردوودا. لەم فەسڵەدا مشتومڕی بیروڕای کۆمەڵێ نوسەر کراوە کە لەوبارەوە نوسیویانەو بیروبۆچوونیان دەربڕیوە. نوسەر هەوڵیداوە بەشێوەیەکی زانستی و لۆژیکی و بەپشت بەستن بەڕەنگدانەوەی پەیوەندیەکان لەواقیعدا کۆمەڵێ لەو بیروڕایانە ڕەتبکاتەوە. لەو سۆنگەوە کە پێی وایە نەیانتوانیوە لەسروشتی ئەو پەیوەندیە تێبگەن و گرفتی جەوهەری ئەو سەرلێشێواویە فکریەی لەو ڕووەشەوە لەئارادایە دەگێڕێتەوە بۆ تێڕوانینی ئایدۆلۆژیانەو ڕەچاونەکردنی سەرتاکانی کاری زانستی و شەڕکردنی ئایدۆلۆژی و تەنانەت هەندێکجار سیاسی و گروپیش لە بەرگی ناسیۆنالیزمی کوردیدا. لەم فەسڵەدا نوسەر ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوەی لە (١٠٠) ساڵی ڕابردوو لەپشت زیندەبەچاڵکردن و لەباربردنی خەونی کوردەوە بووە مۆدێرنەبووە، بەتایبەتیش ئەو ڕووە نێگەتیڤەی مۆدێرنە کە لەڕەفتاری کۆلۆنیالیستە خۆرئاواییەکان و ڕژێمە سیاسییە سەرکوتکەرەکانی ناوچەکەدا بەرجەستە دەبێت. ئەوەی هەر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەداو لەو ساتەوەختەوە، پرۆسەی ڕیفۆرم لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا پەرەدەستێنێ تا سەراسەری سەدەی بیستەم لەپشت دابەش کردن و مەینەت و بێقەوارەکردنی

کوردەوەبووە مۆدێرنەو سیاسەت و هێزە هاوچەرخەکان بوون، ئەو هێزانەی گەر بەوجۆرەی دوژمنایەتی کوردیان کردووە دوژمنایەتی ئیسلامیشیان نەکردبێت، ئەوا لانی کەم پەراوێزیان خستووەو بەپەیڕەوکردن لە سیاسەتێکی دواکەوتووی زۆردارانەش دەرهەق بەکورد سوکایەتیان بە بەهاکانی ئەو ئیسلامە کردووە. گەر لە وێستگایەکیشدا ئایین یاخود ئیسلام بەجۆرێ لەجۆرەکان دژ بەخواستێکی ئێمە بەکارهێنرابێت ئەوە هەمان مۆدێرنەو ئایدۆلۆژیاکانی و لەوانەش ناسیۆنالیزمە باڵادەستەکانی ناوچەکەی لەپشتەوەبووە. بۆیە پێداگرتن بەشتێ لە نوخبە سیاسی و فکرییە کوردییەکە لەسەر ئەوەی ئیسلام لەپشت کلۆڵی و کۆستەکانی دەیان ساڵەی ئێمەیە جگە لە ڕاکردن لە لێپرسراوێتی و دەست نیشان نەکردنی هۆکارە ڕاستەقینەکان و سەرچاوەی کێشەو مەینەتیەکانمان و تەنانەت جۆرێ لە ئەستۆپاکی پڕکردنەوە بۆ وەردیانەکانمان شتێکیتر نیە.

فەسڵی چوارەم و کۆتاییش خوێندنەوەیەکی ئەدەبیاتی یەکێ لە هێزە سیاسییە کوردستانییەکانە لەڕوانگەی ناسیۆنالیزمی کوردیەوە. یاخود بەڕوویەکیتردا دەرخستنی ئەوەی داخۆ پێگەی ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی لەناو ئەم هێزەدا وەك یەکێ لە دەرکەوتە سیاسیەکانی ژیانی سیاسی لەدوای ڕاپەڕین بەبەرگێکی ئیسلامییەوە لەکوێدایەو تاچەند توانیویەتی تێگەیشتنێکی ئیسلامیانە بۆ ئەم مەسەلە بخاتەڕوو و هەڵوێستی بەرامبەر کێشەی کورد و چەندین پرسی تایبەت بەو چییە؟ ئەم فەسڵەش دەچێتە چوارچێوەی ئەوەی لەپێشتردا ئاماژەی پێکرا واتە ئاراستەکردنی سەرجەم هێزو توانا نیشتمانیەکە بەئاقاری بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانی و نەتەوەییەکان، وە دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی و کێشمەکێشی ناوخۆیی

بەناوی (ئیسلام) یاخود (نەتەوایەتی)یەوە بەحوکمی ئەوەی هیچ هێزو تەوژمێ مافی ئەوەی نییە ڕێ بەخۆی بدات خۆی بەقسەکەری فەرمی یەکێکیان بزانێت. چونکە (ئیسلام) و (نەتەوە) لەناو کۆمەڵگادان و هەردووکیان دوو ڕووی شوناسی کەسێتی مەعنەوی و نەتەوەیی ئێمەن.

ماوەتەوە بڵێین چاپکردنی ئەم زنجیرە کتێبە لەسەر ناسیۆنالیزمی کوردی کە لەخۆگری سەرجەم نوسینەکانی نوسەرە لەوبارەیەوە تا هەنووکە مەبەست تیایدا ئاشناکردنی ژمارەیەکی زۆرتری خوێنەرانە بەبیروبۆچوونەکانی چونکە نوسەر دڵنیایە ژمارەیەکی زۆر کەمی خوێنەران نەبێت زۆرێ لەبابەتەکانیان نەبینیوە، هەروەها بۆ پێشکەشکردنی چوارچێوەو هێڵەگشتییەکانی دیدی نوسەرە لەمەڕ ئەم پرسە، بۆئەوەی بتوانێت جوانتر پەیامەکەی خۆی بگەیەنێت و هەوڵەکانی سوودمەندترین. لەبەرئەوەش کە ئەم بابەتانە لەکاتی جیاوازدا نوسراون لەهەندێ برگەو شوێندا هەست بە دووبارەبوونەوەی هەندێ چەمك و بۆچوون دەکرێت. بەڵام گرنگە خوێنەر ئەوە بزانێ کە ئەو دووبارە بوونەوە لەهەندێ شوێنا لەبەرەنجامی کۆتاییدا یەکتر تەواوکردنە، گەر لەهەندێ شوێن بەکورتی ئاماژە بە بیرۆکەیەك کرابێت ئاساییە لەبابەت و فەسڵێکیتردا درێژەی پێدرابێت و ڕەهەندەکانیتری خرابێتە ڕوو، یاخود لە سیاقێکی نوێدا بۆ ئامانجێکیتری فکری سوودی لێوەرگیرابێت. ئاسایشە کە ئەم کتێبە هەر سێ عەڵقەکەیتریش خزمەت بە کۆمەڵێ بۆچوون و هێڵی گشتی بنەڕەتی بکەن کە هەموو نوسەرێ لەژیانی نوسینی خۆیدا دەبێ بەخاوەنیان و لەوێوە پەل دەهاوێت و بینای بۆچوونەکانی بەرز دەکاتەوە و پەرەی پێدەدات و فراوانی دەکات.

هیودارم بەم کارەم توانیبێتم بەشێ لە ئەرکەکانم بەرامبەر نەتەوەکەم و ئەم قۆناغە ناسکەی ناسیۆنالیزمی کوردی و فکری ئیسلامی هاوچەرخ جێبەجێ بکەم و لەخوای گەورەش دەخوازم یارمەتی هەموو لایەك و نەتەوەکەمان بدات لە سەرەڕێی سەرکەوتن بەسەر کۆسپەکان و بەهێزکردنی گیانی هاوچارەنووسیی ناوخۆیی و ڕێزگرتن لەماف و ئازادی و کەرامەتی مرۆڤ بەدیهێنانی ئاواتە نەتەوەییەکان و، لەوانەش دەوڵەی سەربەخۆی کوردستانی..

بەهیوای ئەو ڕۆژە..

نوسەر

٢٠٠٨/٥/٢٠

هەولێر

# فەسڵی یەکەم

ناسیونالیزم......

دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ....

تێڕوانینێکی مەنهەجیانە و ئاماژەیەک بە دۆخی کورد

## پێشەکی

نەتەوایەتی وەك چەمك و تەوژم و سەرەتای سیاسی و ئایدیا، لە (٢٠٠) ساڵی ڕابردوودا یەکێ لە گەورەترین بزوتنەوەکانی سیاسیەتو داڕێژەری پەیوەندیو ئاراستەکەری ستراتیژییەکان بووە، سەرهەڵدانی نەتەوایەتی هاوشان بوو لەگەڵ فۆرمۆڵەبوونی مۆدێلێکی نوێ لە دەوڵەت و دەسەلات، کە ئەویش مۆدیلی (دەوڵەت ـ نەتەوە)یە.

هەروەها (ناسیونالیزم) لە پشت بەشێکی گرنگ لە شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی دنیاو، لەوانەش ناوچەکەی ئێمەوە بووە هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمیش وردە وردە ئەم ئایدیایە پەڕیە ڕۆژهەلاتی ئیسلامیو بوو بە بەشێ لە شوناسی فکری بەشێ لە دەستە بژێرەکان.

بەڵام ناسیۆنالیزم لە خۆرهەلات وەك زۆر چەمك و تەوژمیتر، نەیتوانی ڕەوتی سروشتی خۆی ببڕێ و بە ئاکامە سروشتییەکانی خۆی بگات، چونکە لە خۆرئاوادا ناسیۆنالیزم تا ڕادەیەك ئەو بۆشاییە ڕۆحیەشی پڕ کردەوە کە ڕەخنە ڕادیکاڵەکانو هێرشە توندەکانی ڕۆشنگەری بۆ سەر ئایینی مەسیحی لەبەرگی کڵێسادا دروستی کردبوو. لە کاتێکدا لێرە (ئایین) پانتاییەکی فراوانی ژیانی ڕوحیو ماددی مرۆڤەکانی

داگیر کردبوو، هەروەها بە پێچەوانەی خۆر ئاواوە ، ناسیۆنالیزم لەمەڕ ئێمە نەبووە چوارچێوەیەك بۆ گەشەکردنی لیبڕالیزمی سیاسیو دیموکراسی.

بەریەککەوتنی ناسیۆنالیزم لەگەڵ سیستمی بەهایی ناوچەکە، کاردانەوەی جۆراوجۆری خولقاند، لە بەراییەکاندا (ناسیۆنالیزم) زیاتر وەك خۆشەویستتی خاكو نیشتیمانو هاوسۆزی لەگەڵ هاونیشتمانیاندا دەرکەوت. لەم ئاستەشدا ناسیۆنالیزم و ڕۆشنبیرییە تەقلیدییە ئیسلامییەکە لە بۆ تەیەکی هاوبەشدا بزوتنەوەکانی بەرەنگاریان دژ بە داگیرکەرانو کۆلۆنیالیزم ئاراستە دەکردو سازدەدا.

لە ئەزموونی کوردستانیشدا تا ڕادەیەکی بەرچاو هەر بەو شێوە بوون، هەر لە شێخ عوبەیدوڵڵای مەزنەوە بگرە ، تا شێخ ( عبدالسلام ) بارزانیو شێخ مەحمودو شێخ سەعیدی پیرانو قازی محەمەدو شۆڕشو ڕاپەڕینەکانیان، ئەم ڕاپەڕینانەیان بە هەناسەیەکی تێکەڵی میللی ئیسلامییەوە بەرپاکراون.

بەڵام ئەم بەیەکەوە بوونو کارلێکردنە تا سەر نەبوو، بەڵکو لەگەڵ دەرکەوتنی زیاترو بڵاو بوونەوەی ئایدۆلۆژیا هاوچەرخەکان، بە عەلمانیو ئیسلامییەوە، بە تایبەتیش مارکسیزمو ئایدۆلۆژیای نوێی ئیسلامی، هەروەها پێ نانە ناو سەردەمی کودەتا سەربازییەکانو دەسەڵاتە سەر کوتکەرە ناسیۆنالیستە دواکەوتووەکانی ناوچەکە، مەسەلەی ئیسلامو نەتەوایەتی لە هەردوو بازنەکەدا لە ئاستێکی فراواندا وەکو گرفتێكو دوو جەمسەری دژ بەیەك و ئەڵتەرناتیفییەك خرانە ڕوو. کەئەمەش لە چەندین وڵاتدا بوو بە هۆی تەقینەوەی ململانێیەکی خوێناوی لە نێوان بزوتنەوە ناسیۆنالیستییە مەشرەب چەپو سۆشیالیستییەکە، لەگەڵ تەوژمی ئیسلامی.

ئەمەش بە سزاو ئازارو خوێنی دەیان هەزار کەس زیاتر تەواو بوو، لێرەوە مرۆڤی موسڵمان زۆر کات خراوەتە بەردەم دوو ڕێیانێکەوە ، کەیان دەبێت ئیسلامو شوناسی ئیسلامی هەڵبژێرێ، یاخود نەتەوایەتی!! لەو لاوە هەندێ جارنەتەوایەتی یەکسان کراوە بە هەڵوێستی سلبی بەرامبەر ئیسلام و پەراوێزخستنی شوناسی ئیسلامی کۆمەڵگا. عەلمانییەتە بە ئایدۆلۆژیاکراوەکەی ڕۆژهەڵاتیش ، زۆر کات لەبەرگی نەتەوایەتیدا شەڕی ئیسلامی دەکردو ، ئایدۆلۆژیا ئیسلامییە ڕادیکاڵەکەش نەتەوایەتی یەکسان دەکرد بە دەمارگرژی سەردەمی نەفامی؟! ئەم مشتو مڕو هەراو هۆریا فکری و سیاسییە نەزۆکەش ، وێڕای ئەوەی دەیان ساڵی خایاندو تا ئێستاش زۆرو کەم بەردەوامە، بەڵام زۆر کەم نەبێت مشتو مڕەکە نەچۆتە چوارچێوەی تەرحێکی مەعریفی ڕۆشنو دیارەوە، بەڵکو بە نیمچە هەمیشەیی بە هەناسەیەکی ئایدۆلۆژیانەوە خراوەتە ڕوو. خۆشبەختانە هەرێمی کوردستان کەمتر ئەم گرفتانەی هەبووە ، چونکە هەردوو تەوژمەکە تەوژمە ناسیۆنالیستە مێژووییەکەو تەوژمی ئیسلامی کوردستان ، لەسەر داخوازیو دروشمە نەتەوەییەکان کۆکن. گەر بەیەکدادانو گرفتێکیش لە ڕابردودا هەبووبێت بە تایبەتیش لەبەرگە چەکداریەکەدا زیاتر دەچێتە خانەی ئەو کێشەو ململانێیە ناوخۆییانەی لە نێوان هێزەکاندا هەبوون.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە لە هەردوو بازنەکەدا، بەتایبەتیش بازنەی ئیسلامیو بیرمەندە ئیسلامییەکان ، لەبەر تیشکی واقیعەکە و سوود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانیترو مەنهەجیەتێکی ڕۆشنو بە ڕوحێکی مەعریفییەوە، دیدێکی ڕۆشن لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو فکری ئیسلامیو ناسیۆنالیزم بخەنە ڕوو.

دیدێکی هاوسەنگو زانستیو میانەڕەوی وا، کە ئەو ڕاستییە لە بەرچاوبگرێت موسڵمان بوونو کوردبوون یاخود کوردستانی بوون، بە مانا سیاسییە هاوچەرخەکەی، دوو ڕووی شوناس و ڕەهەندی کەسێتی نیشتیمانیو نەتەوەیی ئێمە پێکدەهێنن و ناکرێت دوژمنایەتیەکی دەستکردیان لە نێواندا دروست بکرێت، بەڵکو دەبێت لە پەیوەندیەکی یەکتر تەواو کردندا بن، چونکە ئەگەر لەیەکتر تێگەیشتنی تەوژمەکان، لەوانەش تەوژمی ئیسلامیو تەوژمە ناسیۆنالیستە باوەکە ، بۆ سەرجەم وڵاتان زەرورەتێکی سیاسیو ژیاری بێت، ئەوا بۆ ئێمە پێویستیو گرنگییەکەی چەند قات دەبێتەوە،، چونکە گەلی کوردستانو نەتەوەی کورد هێشتا زۆریٚ لە ئامانجە نەتەوەیییەکانی لەسەر ئاستی نەتەوەیی گشتیدا نەهاتوونەتە دی. ئەوەی بەدیش هاتووە هەڕەشەو مەترسی ئەم لاو ئەولای لەسەرە. کە ئەمەش داوای بەرەیەکی ناوخۆیی تۆکمە و کۆکبوونی تەواوی هێزەکان لەسەر داخوازیو چەسپاوە نیشتیمانییەکان دەکات.

ماوەتەوە بڵێین توێژەر بابەتەکەی دابەش کردووە بەسەر چەند بەشێکدا سەرەتا لەسەر چەمکی ناسیۆنالیزم لە فکری نوێدا وەستاوە، دواتر باسی لە بایەخی مەنهەج کردووە لە دیاریکردنی پەیوەندییەکەدا.

سێهەمیش ئاماژەی بە بەشیٚ لە پێگە فکرییەکانی فکری ئیسلامی هاوچەرخ کردووە بۆ تێڕوانین لە مەسەلەی نەتەوایەتی، لەگەڵ بەرەنجام و کۆتایی، خۆشحاڵیشە ئەگەر توانیبێتی بەم بابەتەی بەشداریەك لە زیاتر ڕۆشن کردنەوەی دیدەکانو قوڵکردنەوەی گیانی بەیەکەوە ژیان و هاوچارەنوسی باڵەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی کوردستان بکات. بۆ ئەوەی گەلی کوردستان بە دوا ئاواتەکانی

خۆی بگات ، لە ڕزگاریی‌و دیاریکردنی مافی چارە نووس و چەسپاندنی پایەکانی دیموکراسیی‌و دادپەروەری کۆمەلایەتیی‌و کۆمەڵگایەکی خۆشگوزەران‌و گەشە کردوو.

## سەرەتایەك دەربارەی چەمکی ناسیونالیزم

ڕەنگە ئاسان نەبێت پێناسەیەکی کۆنکرێتی بۆ ناسیۆنالیزم بکەین ، چونکە سەرەڕای بەربڵاوی دیاردەی ناسیۆنالیزم لە سەر ئاستی جیهانیداو بڵاوبونەوەی مۆدێلی ( دەوڵەت ـ نەتەوە) و گشتگیربوونی وەك بەشێ لە باڵا دەستی مۆدێرنەی سیاسی و ئەو ڕۆڵە هەستیار و کاریگەر و مەترسیدارەی کە لە (٢٠٠) ساڵی ڕابردووی مێژوی نوێدا ئەم تەوژمە بینیویەتی و، هەندێ جاریش لە بەرگە توند ڕەوەکەیدا مرۆڤایەتی تا ڕۆخی هەڵدێران بردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە (ناسیۆنالیزم لە زمانە جیاوازەکان ، سەردەم و قۆناغە جیاجیاکان و، تەنانەت لە نێو نوسەرو بیریارە ناسیونالیستەکانیشدا بە ماناو واتای جیاواز لێکدراوەتەوە،ئەمە وای لە توێژەران کردووە ،کە پێناسەی جیاجیا بۆ ئەم چەمکە فیکری و کۆمەلایەتییە دابڕێژن ، چونکە ئەوانیش لە ڕوانگەو دیدی نەتەوەیی جیاواز ، کات و سەردەمی جیاواز، تێڕوانین و فەلسەفەی سیاسی جیاواز و ، جیهانبینی تایبەتی خۆیانەوە پێناسەی چەمکی "ناسیۆنالیزم"یان کردووە).[1]

هەرچەندە گومانی تێدا نیە کە لە نێوان تیۆرو پێناسەکاندا خاڵی هاوبەش هەیە، بەڵام ناسیۆنالیزمی هەر نەتەوەیەك و قۆناغ و جوگرافیایەك، هەڵگری

---

[1] جەعفەر عەلی، ناسیونالیزم و ناسیونالیزمی کوردی / چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ، ٢٠٠٤، ل٢٥.

خەسڵەتی تایبەت بە خۆیەتی، کە وێڕای لێکچونی لە ناسیۆنالیزمەکانیتر جیای دەکاتەوە.

هەندێ جاریش پێناسە کردن و تیۆریەکان تەنها لە دیدێکی ئەکادیمی ڕوتەوە بەرهەم نەهاتوون، بەڵکو ململانێ و بەرژەوەندییە ناکۆك و دژ بەیەکە نەتەوەییەکان ڕۆڵی خۆیان لە شکڵ دان بەو تیۆر و پێناسانەدا هەبووە. کە ڕەنگە ئەوە بە ڕوونی لە جیاوازی قوتابخانەی فەرەنسی و ئەڵمانیدا سەبارەت بە دیاریکردنی ناوەڕۆکی ناسیۆنالیزم بە دەربکەوێت.[1]

بۆیە ڕەنگە و وێڕای ئاگا بوون لەو باگراوندە سیاسی و نەتەوەیی و مێژوییانەی پێناسەو دیدەکانیان دەربارەی نەتەوایەتی لێ بەرهەم هاتوون بۆ پێناسە کردنی ناسیۆنالیزم ڕەچاوی دیدگا جیاوازو پێناسە جیاجیاکان بکەین.

لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزیدا هاتووە کە (ناسیۆنالیزم ویست و ئارەزووی گروپێکی مرۆییە کە هاوبەشن لە (ڕەگەز، کەلتور ، زمان...) بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ).[2]

بە گوێرەی ئەم پێناسە جگە لە بوونی مەیلی خۆشەویستی بۆ نەتەوە و هەست کردن بە هاوبەشە نەتەوەییەکان و هۆشیاری بە خود و جیاوازییەکان لە گەڵ

---

[1] د. عبدالغنی بسیونی / النظم السیاسیة، اسس التنظیم السیاسی / الدار الجامعیة للطباعة والنشر / بیروت /١٩٨٤/ ص٢٤.

[2] جەعفەر عەلی، هەمان سەرچاوەی پێشو ل٢٩.

نەتەوەکانیتردا، بوونی ئیرادەیەکی مکوڕ لە پێناو بەدیهێنانی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەیی مەرجی بوونی ناسیۆنالیزمە.

کۆمەڵێ پێناسەیتر هەن کە بە دەوری خۆشویستن و (انتماء)ی تاك بۆ نەتەوەو وەفاداری بەرامبەر ئامانجە نەتەوەییەکان و دڵخۆش بوون و بە شکۆمەندی و سەروەرییەکانی و ، بە پێچەوانەشەوە ئازار چەشتنی دەروونی لە کاتی شکست و نەهامەتی نەتەوەییەکاندا و، ئەو هەستەی کە مرۆڤ بە تاکەکانیتری نەتەوەکەی و کەسێتی مەعنەوی خودی نەتەوەوە دەبەستێتەوە و کار دەکاتە سەر پێکهاتەی دەروونی و سۆزداری و هەستە دەرونییەکانی وەك ڕق لێ بوونەوەو خۆشەویستی و لایەنگری و ڕەتکردنەوەو هەست بە شانازی و...هتد دەبەستنەوە.[١]

دیارە بۆ تێگەیشتن لە ناسیۆنالیزم بە تایبەتیش لەم سەردەمەدا زۆر گرنگە بگەڕێینەوە بۆ لای بیرمەندەکانی ، کە لە هەشتاکانەوە کۆمەڵێ بیرمەند دەرکەوتن کە بایەخێکی فکری کەم وێنەیان بەم چەمك و دیاردە گرنگ و وورووژێنەرەی مێژوی نوێ ی مرۆڤایەتی داو تیۆرەکانیشیان لە سەر ئاستی جیهانی دەنگدانەوەی گەورەیان دروست کرد.

ناسیۆنالیزم لە دیدی ئەم بیرمەندانەوە دابڕاو نییە لە سیستمی خوێندنی هاوچەرخ و ڕێکخستنی سوپای نوێ و ئەتڵەسی نیشتمانی و وەدەرکەوتنی زمانە نەتەوەییەکان لە بواری خوێندن و نوسین و میدیاو بە تایبەتی ڕۆژنامەو چەندین میکانیزم و چوارچێوەی هاوچەرخیتر ، کە بەسەریەکەوە شوناس و (انتما) دروست

---

[١] لەم ڕووەوە بگەڕێرەوە بۆ هەمان سەرچاوەی پێشو.

دەکەن وێکچوون و هاوشێوەیی پەرەپێدەدەن بۆ ئاستی دروستکردنی رۆشنبیری و هەست و دەسەلاتی هاوبەش و ژیان لە چوارچێوەیەکی سیاسی نوێدا کە ماف و ئەرکەکان لە سەر بناغەو دیدێکی نوێ دادەرێژنەوە و هەر لەو دۆخەشدا لە بری ئیمپراتۆرە پان و بەرینەکان، دەوڵەتە نەتەوەییەکان دەبنە یەکەو کەسێتی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی.

بۆ نمونە کاتێ دەگەرێینەوە بۆ لای بیرمەندێکی گرنگی وەکو ( گێڵنەر) دەبینین لە سەر (ناسیۆنالیزم) دەوەستێ و بە پرەنسیپێکی سیاسی پێناسەی دەکات. کە بروای وایە دەبێت یەکیەتی سیاسی و نەتەوەیی کۆك و تەبابن و لە گەڵ یەکدی کۆببنەوە. هەروەها دەڵێ ناسیۆنالیزم وەك سۆزو جوڵانەوە دەکرێت بە جوانترین شێوە بە زمانی ئەم پرەنسیپە پێناسە بکرێت سۆزی نەتەوەیش بریتیە لەو هەست بە تورەیی کردنەی پێشێلکردنی ئەم پرەنسیپە دەیوروژێنێ، یاخود ئەو هەست بە رازی بوونەی کە بە دیهاتنی دەیخولقێنێ.

بزوتنەوەی ناسیۆنالیستیش بزوتنەوەیەکە کە سۆزێکی لەم چەشنە وەگەری دەخات.[1]

لێرەوە گێڵنەر پێی وایە کە دەبێت دەسەلاتێ سیاسی نەتەوەیەك تا سنورەکانی فەرهەنگی ئەو نەتەوەیە درێژ ببێتەوە ، واتە دەوڵەت و دەسەلاتی نەتەوەیی ببێ بە چەترو روپۆشی کلتوری نەتەوەیی و لە سەر بناغەی جیاوازی سنورە

[1] ایرنست غلنر / الأمم والقومية / ترجمة دكتور مجيد الراضي / دار المدى للثقافة والنشر / دمشق / سوريا / الطبعة الأولى ١٩٩٩ ص١٥ .

فەرهەنگی‌یەکان سنورە سیاسییە نێو دەوڵەتەکانیش لە گەڵ یەکدی بە یەك بگەن و یەکە ڕێکخستنە سیاسی‌یەکان لە یەکتر جیاببنەوە.

(ئەریك هوبساوم) یش لە دوو توێ ی قسەکردن لە سەر نەتەوەو بزوتنەوە نەتەوەییەکان پێی وایە کە (نەتەوە) قەوارەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی چەسپاوو نەگۆڕ نی‌یە.بەڵکوبە دیاریکراوی سەر بە سەردەمێکی دیاریکراوەو لە ڕووی مێژوویی‌یەوە بوونەوەرێکی تازەیە. لە کاتێکدا قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی‌یە کە پەیوەستە بە جۆرێکی دیاریکراو لە دەوڵەتێکی هەرێمی مۆدێرن کە ئەویش بریتی‌یە لە مۆدێلی( دەوڵەت ـ نەتەوە). لە دەرەوەی پەیوەست بوون بەم قەوارە سیاسی‌یە نوێیەوە قسە کردن لە نەتەوەو ناسیۆنالیزم بێ سوودە. لێرەشەوە (هوبساوم) لە گەڵ گێڵنەر هاوڕایە، هەردووکیان بڕوایان بە دروستکراوی و داهێنراوی نەتەوەکان هەیە.

ئەویش لە گەڵ گێڵنەر جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوە ناسیۆنالیزم و بزوتنەوەی نەتەوەیی‌یە نەتەوەو دەوڵەتە نەتەوەیی‌یەکان دروست دەکات نەك بە پێچەوانەوە.[1]

کەواتە بە گشتی ناسیۆنالیزم بریتی‌یە لە خۆشەویستی تاك بۆ نیشتمان و نەتەوەکەی و ڕۆڵەکانی و هەستکردن بە هاوبەشەکانی نێوان ئەم تاکانە و (انتما) بۆ نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوەیی و ئامادەیی بۆ خزمەت کردنی گەل و، ڕێزگرتن لە دروشم و هێماومێژوو سەروەریەکانی و قوربانی دان لە پێناو سەربەرزی و

---

[1] اريك هوبسباوم / الأمم والنزعة القومية / ترجمة عدنان حسين / مراجعة وتحرير د . مجيد الراضي /دار المدى للثقافة والنشر / دمشق / سوريا / ٢٠٠٥ / ص١٧

شکۆمەندی لە کاتی پێویستدا ، هەروەها پرەنسیپێکی سیاسی‌یە نەك ئایدۆلۆژیا کە ماف دەدات بە نەتەوەکان لە سەر بناغەی تایبەتمەندی نەتەوەیی مافی چارەنوسیان هەبێت و دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن.

**بایەخی مەنهەج لە دیاریکردنی دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخ لە مەڕ ناسیۆنالیزم**

هەروەك ڕوونە میتۆد بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ گەیشتن بە ڕاستی‌یە زانستی‌یەکان و لێك جیاکردنەوەی کایەکان و ناوەڕۆکی چەمکەکان و ئەو پێوەرو ژێدەرانەی کە لە کاتی ناکۆکی و داوەریدا دەگەڕێینەوە بۆیان. مەنهەجیەتێکی زانستی و دروست دەمانپارێزێ لەوەی بکەوینە ناو هەڵەی لۆژیکی و بەرەنجامگیری ناواقعی و نا زانستی و داوەری کردنی ناڕاست و وێنا کردنی هەڵەوە.

گرفتێکی گەورەی دنیای ڕوناکبیری ئێمەش لە ڕابردوودا هەر لەمەدا بووە. ئەو گرفتەش لەو کاتانەدا دیارتر وەدەرکەوتووە کە ویستراوە بە زمانی مۆدێرنەی فکری و سیاسی قسە لە سەر مێژوو کەلەپور بکرێت، یاخود بە پێچەوانەوە،[1] بە زمانی مێژووی پێش مۆدێرنە قسە لە سەر دیاردەو چەمك و دەرکەوتەکانی دنیای مۆدێرن بکرێت.

هەر بۆیە هەمیشە توێژینەوەی زانستی سەرەتا ویستویەتی تێگەیشتنێکی بێلایەنانە و بابەتی دەربارەی چەمك و ڕێبازەکان بەرهەم بێنێ و ڕێبازی توێژینەوە و تیۆری پەیرەو کراو لەو نێوەندەدا دیاری بکات، چونکە قسە کردنی ئایدۆلۆژی و

---

[1] ئەبوبکر علی / مافی چارەنوس دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخ / گۆڤاری مێشتا / ژمارە (٢) هاوینی ٢٠٠٥ / ل٢٢٧.

گشتی لە سەر چەمك و دیاردەكان، لەوانەش ئەو چەمكانەی بە هۆی مۆدێرنەی فكری و سیاسییەوە تێكەڵاو بە فەرهەنگ و بیركردنەوەی ئێمە بوون، زۆر جار وێنایەكی هەڵەی واقیعمان دەخاتە بەردەم و دووچاری حوكمی پێش وەخت و لێكدانەوەی زۆرە ملێیانەمان دەكات.

نەتەوایەتی یەكێكە لەو چەمكە نوێیانەی كەلە خۆرئاواوە گەیشتووە بە ئێمە و لە سەرەتای سەدەی ڕابردووەوە و كەم و زۆر تێكەڵ بە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵات بە گشتی و كوردیش بووە ، كە تێكەڵاویش بووە زیاتر لە ڕێی هەستی میللی و شیعرو ئەدەبیات و دروشمی خوێن گەرمانەو هەندێ داخوازی نەتەوەییەوە گوزارشتی لە خۆی داوەتەوە. ئەگەر ناسیۆنالیزم لە سەر ئاستی جیهاندا تا سەرەتای هەشتاكانی سەدەی بیستەم نەیتوانیبێ بیرمەندی تایبەت بە خۆی دروست بكات.[1]

ئەوا بە دڵنیاییەوە لە مێژووی فكری ئێمەش دا زۆر كەم قسەی فكری جدی لە سەر ناسیۆنالیزم كراوە وەك چەمك و دیدگا و تەوژم و ڕەهەند جۆرەكانی ، كاتێكیش دیاردەیەك نابێتە خولگەو بابەتی قسە لێكردنی فكری و ئەكادیمی ، ئەو كاتە دەبێتە تەوەرەی مشت و مڕو ململانێ ی سیاسی و گروپی و ، زیاتر سۆز و هەست و گیانی لایەنگیری و دوژمنایەتی و پێداویستییە ڕۆژانەیی و هەنوكەییەكانی ململانێ سیاسییەكە ئاڕاستەو زمانی قسە كردنەكان دیاری دەكات.

---

[1] مەریوان وریا قانع / ناسیۆنالیزمی دور مەودا ، كورد لە دەرەوەی كوردستاندا (نموونەی هۆڵەندا) گۆڤاری ڕەهەند ، ژمارە ٩ ـ ١٠ / ساڵی ٢٠٠٠ / لا ٦٨ .

ئێمە گەر سەیری سالآنی ڕابردووی ولآتی خۆمان بکەین و هەندێ لە لاپەڕەکانی مێژووی هاوچەرخی کوردستان هەڵبدەینەوە بە زەقی هەست بەم قسە کردنە ئایدۆلۆژی‌یە دەکەین ، کە لە هەندێ کاتدا نەتەوایەتی تەنها ڕووی دەرەوەی ململانێ ئایدۆلۆژی‌یەکانی ڕزاندۆتەوە.

لە کوردستاندا بە تایبەتی دوای سەر هەڵدان و بڵاو بوونەوەی تەوژمی چەپ تیایدا بەشێ لە ناوەندە سیاسی و ڕۆشنبیری‌یەکە لە هەوڵی ئەوەدا بوون بە کاریگەری ئایدۆلۆژیا چەپەکە ئیسلام لە بەرگی هەندێ ڕەمزو ڕوداودا ئامادەی بکەن و لەوێوە هەوڵی وەدەرنانی لە یاداوەری کوردیدا بدەن هەروەها هەوڵیان داوە هەموو شکستەکانی کورد لە مێژودا بە ئیسلام تەفسیر بکەن![1] لە دوای وەدەرکەوتنی بوونی ڕێکخراوانەی‌تەوژمی ئیسلامیش لە کوردستاندا ، ئەم ململانێ فکری‌یە توندتر بوو ، لە هەشتاکان و بەتایبەتیش لە نەوەدەکاندا کۆمەڵێ نوسەری کورد و بەشێ لە ناوەندە سیاسی و ڕوناکبیریەکەی کوردستان ، لە هەوڵی ئەوەدا بوون ، کە بیسەلمێنن ئیسلام نەك لە مێژوی خۆیدا هیچ خزمەتێکی بە ناسیۆنالیزمی کوردی نەکردووە ، بەڵکو زیانی گەورەشی لێداوە ، هەروەها لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە بیخەنە ڕوو ، ئیسلام دژی نەتەوایەتی‌یەو وەك بەرەنجامێکی لۆژیکی ئەو قەناعەتە پێشەکیەش، هەرکەسێ ئیسلام بەشێ لەسەرچاوەی ئیلهامی پێك بێنێت، دیسانەوە

---

[1] بۆ نمونە حیکایەتی مەلا ئیدریسی بەدلیسی و مەلای خەتێ و تەوقە نەکردنەکەی شێخ محمود لە گەڵ نوێنەری ئینگلیزەکان....هتد .

ئەویش ناتوانێ لەگەڵ چەمکی نەتەوایەتی و دەرهاویشتەکانیدا هەڵکات[١] لەبەرامبەریشدا هەندێ نوسەرو چالاکی سەر بە ناوەندە ئیسلامی کە ویستویانە ووشەی (قوم) لە قورئاندا لەسیاقە زمانەوانی و مێژووییەکەی دەربێنن و بە ناوەرۆکە ناسیولیزمە هاوچەرخەکەوە بەکاری بێنن[٢] وە جەخت لە سەر ڕەسەن بوونی هەستی نەتەوەیی بکەنەوە بەرامبەر قبوڵنەکردنی بیری نەتەوە پەرستی[٣] هەڵبەت مێژوو پێمان دەڵێ پێش دەرکەوتنی ئایدۆلوژیا هاوچەرخەکان و لەپێش هەموشیانەوە ئادۆلۆژیای مارکسیزم و دواتریش ئادۆلۆژیای ئیسلامیی هاوچەرخ، پەیوەندی ئیسلام و نەتەوایەتی لەکۆمەڵگای کوردستان و لە بەرگی شۆرش و راپەرینە نەتەوایەتیەکاندا، نەك هەروەکو گرفتێ خۆی نە خستۆتە ڕوو، بەڵکو لەپەیوەندیەکی یەکتر تەواو کردنی ناوەکی توندو تۆڵدا بون و هەستە میللی و ئایینییەکە بەیەکەوە بونە هەوێنی کێشەیەکی عادیلانە، بەڵام دوای گەورەبونی پانتایی کاریگەریی نوخبە مۆدیرنەکان لەکۆمەڵگادا ، ئەم پەیوەندیە وەك گرفت خراوەتە ڕوو، کە ئەمەش ئەوە دەسەلمێنی ئەم گرفتە پێش ئەوەی گرفتی ئیسلام و ناسیۆنالیزم بێ لە واقعی کوردی و لەسەر ئاستی بنکە جەماوەریەکەی کوردایەتی‌دا، گرفتی دەستە بژێرە

---

[١] ئەم دیدە دیدێکی بڵاوە دەتوانین لە نوسینەکانی ڕەفێق سابیر ،فوئاد مجید مسری ، مەلا بەختیار ، بەشێ لە نوسینەکانی عەتا قەرەداغی و چەندین نوسەری تردا بیدۆزینەوە.

[٢] لە هەشتاکانەوە ئەم ئاڕاستە لە ناو ئیسلامی یەکانی کوردستاندا سەرهەڵدەدا کە ئاماژەیە بە تێکەڵ کردنی مەسەلە ئیسلامی‌یەکان بە هەستی ناسیونالیستانەو بارگاوی کردنی دەقەکان بەو ڕۆحە، بەڵام هەڵگری دیدێکی مەنهەجی تۆکمە نی‌یە .

[٣] لەو ڕووەوە سەیری کتێبەکەی مامۆستا علی باپیر بکە / سۆزی نەتەوایەتی /چاپی دووەم / کوردستان /١٩٩١

کەبووە لەگەڵ ئەو پەیوەندیەدا و ئاماژەیە بەو گۆرانەی کە لە ئاراستە و ناوەڕۆکە فکریەکەی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دەرکەوتووە.

بەڵام لەراستیدا بەبڕوای توێژەر ئەو دوئاراستە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئیسلامدا لە پەیوەندی بەپرسی ناسیۆنالیزمەوە، خۆیان لەبەردەم ڕەخنە گرتنی مەنهەجی ڕاناگرن و لەخۆ گری ئەو توخم و راستی و رەهەندانەدا نین کە مەنهەجیەتێکی دروست دەیخوازێ.

لێرەوە دەخوازین تیۆریزە بۆ ڕێبازی سێهەم و مەنهەجیەتێکی نۆی بکەین، کە (ئیمان) و(نائیمان)نا هێنێتە ناو بواری قسە لەسەرکردن ، بەڵکو تەنها دەخوازێت وێناکانی واقیع و پەیوەندی توخمە پێکهێنەرەکانی وەك خۆی ببینرێت.

بە بڕوای توێژەریش هەر مەنهەجیەتێك بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی فکری ئیسلامی لە بەرامبەر (ناسیۆنالیزم) ەوە دەبێت ڕەچاوی ئەم ڕاستیانەی خوارەو بکات[١]:

یەکەم: باوەڕبوون بەوەی کە ناسیۆنالیزم دەرکەوتەو دیاردەیەکی دنیای تازەو یەکێ لە بەرهەمەکانی مۆدێرنەی سیاسی‌یەو مێژوی سەرهەڵدانی لە خودی خۆرئاوادا لە(٢٠٠) ساڵ تێناپەڕێ، لە خۆرهەڵاتیشدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەوە تێکەڵ بە فەرهەنگی گەلانی ناوچەکە دەبێت و لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بە شێوەیەکی بەر بڵاو پەرە دەستێنێ و بزوتنەوە ناسیۆنالیستی‌یەکان (اختراق)ی کۆمەڵگاکان دەکەن و دەتوانن بە دروشم و جوڵێنەرە نەتەوایەتیەکان جەماوەرێکی بەرین بجوڵێنن و ئاڕاستە بکەن. ئەم

---

[١] بڕوانە گۆڤاری هێشتا هەمان ژمارەو بابەتی پێشو لا ٢٣ و دواتر.

دیاریکردنە مێژوییەیە وامان لێ دەکات کە بۆ دیاریکردنی سروشتی پەیوەندییەکان لە نێوان ئیسلام و فکری ئیسلامی و ناسیۆنالیزمدا ، نەگەڕێنەوە بۆ مێژوویەك کە هێشتا ناسیۆنالیزم وەك هێزێکی ئایدۆلۆژی سیاسی ڕێکخەر و هاندەر و مۆبۆلیزەکەر لە دنیادا بوونی نەبووە.

دووەم: ئیسلام و فکری ئیسلامی کلاسیکی قسەی ڕاستەوخۆیان لە سەر دیاردەیەك بە ناوی (ناسیۆنالیزم) نەکردووە.دووبارە بوونەوەی بەرچاوی وشەی (قوم) یش لە قورئاندا کە لە عەرەبی هاوچەرخدا زاراوەی (القومیه)ی لێداتاشراوە، ئاماژە نییە بە بەکارهێنانی وشەکە بەو ناوەڕۆکە فکری و سیاسییەی زاراوەکە لە ئێستادا هەیەتی، بەڵکو وشەی (قوم) لە بەکارهێنانە قورئانییەکەیدا هەروەك فەرهەنگە مێژووییەکانی زمانی عەرەبی ڕوونیان کردۆتەوە بە پلەی یەکەم ئاماژەیە بە یەکەیەکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی کە خوێن و ڕەچەڵەکی هاوبەش ڕۆڵی بنچینەییان لە دروستکردنیدا بینیوە.

کۆڕی زمانی عەرەبیش واتای وشەکەی بە گوێرەی بەکارهێنانەکانی ڕونکردۆتەوەو لەو ڕوەوە دەڵێت: مەبەست لە (قوم) لە قورئاندا کۆمەڵە ژن و پیاوێکن بەسەر یەکەوە ، یاخود کۆمەڵە خەڵکێکن کە بەهۆی پەیوەندی ڕەچەڵەك (نسب) و (خوێن) یاخود بە یەکەوە بوون و ژیانی هاوبەش لە شوێنێکدا بە یەکەوە بەستراونەتەوە هەروەك (نوح) سلاوی خوای لێبێت دەفەرموێت:(ربّي ان قومي كذبون)[١].

---

[١] الشعرا (١).

بەم پێیەش هەر بڕیار دانێکی سەرپێی و هەڵوێستگرتنێکی ئایدۆلۆژی کە بۆ ئەوە بچێت ئیسلام ڕاستەوخۆ لە گەڵ (ناسیۆنالیزم)ە، یاخود ڕەتی دەکاتەوە، دەمانخاتە ناو هەڵەی مەنهەجی‌یەوە.

کەواتە ناکرێت لە مێژودا قسە لە سەر پرسی ناسیۆنالیزم و پەیوەندی ئەو بە ئیسلامەوە بکرێت. مێژویەك کە هەروەك ئاماژەمان پێکرد ناسیۆنالیزم پێکی نەهێناوەو سیماکانی دیاری نەکردووە. هەروەها ناشکرێت باس لە هەڵوێستێکی ئیسلامیی چەسپاوو دیاری کراوی بان مێژویی و هەمیشەیی بکەین ،، چونکە ئایین بە گشتی و بە تایبەتی (ئیسلام) یان نەتەوەیی‌یەو گوتاری خۆی ئاڕاستەی مرۆڤ دەکات بە سیفەتی مرۆڤبوونی بەبێ گوێدانە جیاوازی زمان و ڕەنگ و فەرهەنگ و نەژادو شوێنی ژیان و نیشتەجێ بوون و پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بابەتی ( ئایین) بە تایبەتیش (ئیسلام) مرۆڤە، بەدەر لەو وابەستەگی‌یە پێشینانەی ئاماژەمان پێ کردن.

بە پشت بەستن بە خاڵی یەکەم، لە کاتی هاتنە خوارەوەی ( ئیسلام) و قورئاندا ،شتێ لە ئارادا نەبووە بە ناوی ناسیۆنالیزم تاکو ئیسلام هەڵوێستی لە بارەوە دیاری بکات ، لە ناوەڕۆکیشدا ئیسلام هەڵوێست نەبووە بەرامبەر زمان و ڕەگەزو نەژادو ڕەنگ و فەرهەنگێکی بەشەری دیاریکراو ، بەڵکو ئایینێ بووە بە زمانی ( یا ایها الناس) و ( یا بني آدم) و ( یا أیها الذین آمنوا) ڕوی کردۆتە هەموان و بۆ هەموان. هەر بۆیە ئەو گەلانەی هاتنە ناو ئیسلامەوە پارێزگاریان لە زۆرێ لە فەرهەنگ و داب و نەریتی خۆیان کرد ، بەڵکو لە مێژوی کارلێکی نێوان ئیسلام و گروپە بەشەری و فەرهەنگ و میللەتە جیاوازەکاندا، ئەوانیش ئیسلامیان لە بەرگی مەعریفەی ئیسلامی

دا خستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، جیاوازی داب و نەریتەکانی نێوان گەلانی موسڵمان و مۆدێلە جیاوازەکانی هەندێ سروت و ڕێ و ڕەسم لە سەردەمی ئێستادا ، شایەتی ئەو ڕاستیەیە.

بەدەر لەوە گەر لە سەر ئاستی (ئیسلام) وەك (ئایین) یش دابەزین بۆ فکری ئیسلامیی مێژوویی ، لە (١٣٠٠) ساڵ مێژووی ئیسلامیشدا پرسی ناسیۆنالیزم وەك دیاردەو تەحەدا و پرسیار و واقعێك ، لە بەردەم شەرع ناس و زاناو ڕێبەرانی فکری ئیسلامیی کلاسیکدا نەبووە، تا هەڵوێستی فیکری و شەرعی لە بارەیەوە دیاری بکەن و ئێمەش بتوانین لە ئێستادا بۆی بگەڕێینەوە و یارمەتیدەرمان بێت لە دیاریکردنی هەڵوێستمان لە ناو جەرگەی گۆڕاوەکانی سەردەمدا ، ئەمەش وا دەکات گومان لە هەموو دروشمێ بکەین کە لایەنگرانی (شمولیە)ی ئیسلام و دروشمی (الأسلام هو الحل) بەرزی بکەنەوە و بیخەنە ڕوو، کە چارەسەرێکی ئامادە کراویان بۆ پرسی نەتەوەیی پێیە ، چونکە ئەگەر ئەم بەرەنجامە لە سەر ئەوە وەستا بێت کە ئیسلام هەمە لایەنەیەو بە حوکمی ئەم سیفەتەشی، ناکرێ لێکدانەوەو چارەسەری پرسێکی گرنگی وەکو ناسیۆنالیزمی تێدا نەبێت، یاخود بە نکولی کردن لە ئەو داخوازیانە بن کە بزوتنەوە نەتەوەییەکان بەرزی دەکەنەوە، بە بیانوی ئەوەی کە ئێمە هەموومان موسڵمانین و برای یەکترین، لە هەردوو حاڵەکەتەدا ئەو لێکدانەوەو هەڵوێستانە ڕووبەڕووی چەندین گرفت دەبنەوە ، وەك ڕاکردن لە واقیع و لە دەستدانی دەستپێشخەری فکری و ژیاری و سیاسی دەکەوێتە ڕوو.

لە پاڵ ئەمەشدا ئەوانەی لە سەرناوەندە عەلمانییەکە حساب دەکرێن و لە ژێر کاریگەری پێداویستی جەنگی دەروونی دژی تەوژمی ئیسلامی و هەندێ جاریش خودی ئیسلام، ڕیشەکانی ناسیۆنالیزم دەگێڕنەوە بۆ سەدان ساڵ لەمەو بەرو لە گۆڕەپانی مێژودا شەڕێکی دەستکرد لە نێوان ئیسلام و ئەودا دروست دەکەن ، یاخود بە پێچەوانەوە تەفسیرێکی ناسیۆنالیزمانەی بەرچاو تەنگ بۆ مێژووی ئیسلامیی دەکەن ، دیسانەوە لە ناو هەڵەیەکی مەنهەجی قوڵدا دەژین.

سێهەم: هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە ناوەرۆك و ڕەگەزو پێکهێنەرەکانی چەمکی (ناسیۆنالیزم) و بەراورد کردنیان بە بەهاو پرەنسیپە گشتییەکانی ئیسلام و گیانە عەدالەت خوازەکەی، واتە تەرحکردنی لە دیدێکی ئیسلامییەوە، نەك خودی ئیسلام وەك ئایین، چونکە ناکرێت ئیسلام ملکەچ بکرێت بۆ چەمکەکانی ناسیۆنالیزم و بکرێتە موڵکی نەتەوەیەکی دیاریکراوە بە واتایەکیتر، مامەڵە کردنێکی بەها گەرایانە لە گەڵ ئیسلام و گەڕانەوە بۆ سەرەتا گشتییەکانی، دەتوانێت یارمەتی دەرمان بێت بۆ دیاریکردنی شوێنی ناسیۆنالیزم لە دیدێکی ئیسلامی سەرچاوە گرتوو لە ئیسلام. تێگەیشتنێکی مەبەست گەرایانە لە ئیسلام و مامەڵە کردن لە ئاستی بەهاکانیدا دەبنە ئەو چوارچێوە تیۆری و دیدگا بەندییانەی، کە لە وێوە دیاردەیەکی وەك ناسیۆنالیزم بخوێنینەوە و، لە بەر تیشکی پێکهێنەر و پێداویستییەکانی واقیعە هاوچەرخەکە پێشنیاری پەیوەندییەك بۆ نێوان فکری ئیسلامی و ناسیۆنالیزم بکەین.وە هەر لێرەشەوە باس لە چارەسەرێکی مەشرەب ئیسلامیی بۆ کێشە نەتەوەییە هاوچەرخەکان لەوانەش کێشەی کورد بکەین. لێرەدا وشەی کێشە گرنگەو تەنها ئاماژەش نییە بە دۆخی تایبەتی کورد ، کە تاکو

ئێستا لە بەر چەندین هۆکاری خودی و بابەتی نەیتوانیوە قەوارەی دڵخوازی نەتەوەیی خۆی پێکبهێنێ و چارەسەرێکی ڕەواو عادیلانەی کێشەکەی بکرێت ، بەڵکو هەر لە سەر ئاستی پرەنسیپ ، هەموو دان نەنانێك بە مافە نەتەوایەتیەکاندا لە چاخی ناسیۆنالیزمدا ستەمی نەتەوەیی لێ دەکەوێتەوە، مێژوی نوێ و هاوچەرخی دنیاش شایەتێکی زیندوی ئەم ڕاستی‌یەیە.

لەم خاڵەدا گرنگە گەر وەك نموونەش بێت ، ئاماژە بە هەندێ سەرەتای گشتی و بەهای ئیسلامی بکەین کە لە ڕێی ئەوانەوە دەتوانین ( تأصیل)ێکی ئیسلامیی بۆ ناسیۆنالیزمێکی میانەڕەو ئینسانی بکەین و وەك پێگە فکرییەکانی فکری ئیسلامیی هاوچەرخیش بیانخەینە ڕوو ، بۆ مەسەلەی نەتەوایەتیی و چارەسەری کێشەی گەلی کوردستان

## پێگە فکرییەکانی تێڕوانینی فکری ئیسلامیی هاوچەرخ بۆ ناسیۆنالیزمێکی میانەڕەو[١]

**یەکەم: تیۆری جێنشینی مرۆڤ لە سەر زەوی و کەرامەتی خوا پێداوی ئەو.**

لە ڕوانگەی جیهانبینی ئیسلامی‌یەوە، مرۆڤ سەروەری بوونەوەرو جێنشینی خوای گەورە و ئاوەدانکەرەوەی زەوی و دروستکردنی شارستانێتی لە ئەستۆدایە ، کائینی ڕێز لێگیراوی خوای گەورەیە، خوای گەورە (بالقوە) پێداویستی‌یەکان

---

[١] لەم ڕووەوە بگەڕێرەوە بۆ کێشەی کورد لە ستراتیژیەتی یەکگرتوودا / ئەبو بەکر عەلی / سلێمانی /١٩٩٨

ژیانێکی سەربەرزانەو ئابڕومەندانەی لە زەویدا بۆ فەراهەم کردووە ، ژیانێ شایستەی گەورەیی مرۆڤ بێت و دەرگا بە ڕووی گەشە کردنی وزەو تواناکانیدا بکاتەوە.

قورئان بەرامبەر کەرامەتی مرۆڤ بە سیفەتی مرۆڤ و بەدەر لە شوناسی ئایینی و نەتەوەیی و نەژادی و گروپی و پێگەی کۆمەڵایەتی ، دەفەرموێت (ولقد كرّمنا بني آدم...)

لە سەر ئاستی ژیانی شەخسی و پێکهاتەی جەستەیی و دەرونی و عەقڵیدا ، ئەو ڕێزگرتنە لە بوونی عەقڵ و ویست و هەستی ئەخلاقی و سەروەرێتی بە سەر بوونەوەرەکانیتر و تەنانەت ڕوخسارە بایۆلۆژیەکەشییەوە دیارە، پێویستە لە پاڵ ئەم ئاستەشدا لە سەر ئاستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوریشدا ڕەنگ بداتەوە، چونکە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و شارستانییەو ناتوانێت بە تەنها بژی و ئەندامی کۆمەڵگایەو لە پەیوەندییەکی فرە ڕەهەندایە لە گەڵ تاکەکانیتر و دامەزراوە و بونیادەکانی کۆمەڵگادا.

کەرامەت و ڕێزو گەورەیی مرۆڤیش شتێ نییە دابڕاو بێت لەو دۆخە تایبەتیەی سروشتی ژیانی مرۆڤ ، هەست کردنی ئەو بە پاراستنی کەرامەتی و ڕێزو گەورەیی گرێدراوە بە پێگەی سیاسی و یاسایی و ئاستی بەهرەمەند بوونی لە مافەکانی و دوور بوونی لە هەموو فۆرم و شێوازەکانی زۆر لێکردن و ستەم و دەستدرێژی کردن.

ناکرێ مرۆڤێ لە سایەی دەسەڵاتێکی سەرکوتکەرو ناعەدالەتی کۆمەڵایەتی و نا هاوسەنگی پەیوەندییەکاندا بژی و، بە دەست هەژاری و دواکەوتوویی و بن دەستی و جەور کێشانەوە بناڵێنێ، لە هەمان کاتدا وابزانین بەختەوەرە و کەرامەتی

پارێزراوە؟! چەمکی کەرامەت و ڕەنگدانەوەکانیشی ناوەڕۆکێکی چەقبەستووی نییە، کە بە درێژایی سەدەکان و لە گەڵ جیاوازی ژینگەو قۆناغ و ئاستی گەشە کردنی کۆمەڵگاکاندا، تەنها یەك ناوەرۆکی هەبێت ، بەڵکو چەمکێکە گەرچی ریشەی لە قوڵایی فەلسەفەی ئاین و ئەخلاقدایە، بەڵام بەگۆڕانی قۆناغە مێژوویی‌یەکان وپێوەرەکانی، ئەویش دەگۆڕێت. ڕەنگە ڕەفتارێکی دیاریکراو لەسەردەم و ساتەوەختێکی مێژوویدا بە ستەم و دەستدرێژی و بریندارکردنی کەرامەت لەقەڵەم نەدرابێت ، بەڵام هەمان ڕەفتار لەدۆخێکی‌تردا ئاماژەی زۆر ترسناك پەیدا بکات و هێمابێت بۆ ڕێز نەگرتن لەکەسێتی و کەرامەتی مرۆڤ ومافەکانی.

بۆ نمونە پێش مۆدێرنەودەوڵەتی نویێ گەریەکێ لە ڕەگەزنامە بێ بەش بکرایە، بۆ ئەو هیچ شوێنەوارێکی لیێ نەدەکەوتەوە، بەڵکو شتیێ نەبووە بەناوی ڕگەزنامەو تابعیەتی سیاسی و یاسایی بۆ دەوڵەت، هەتا بچێتە بواری بیرلێکردنەوەوە، بەڵام لەسەردەمی مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە)دا و ئەو ئاسەوارانەی لەبون و نەبوونی ڕەگەزنامەوە بەجیێ دەمێنیێ، بیێ بەشکردنی مرۆڤێك یا خود گروپێك لە ڕەگەزنامە دەبێتە سەرچاوەی چەندین ستەم و بیێ مافی و پەراوێزخستن .

لە سەردەمی باڵادەست بوونی هەست و بیر و مۆدێلی خۆڕێکخستنی سیاسی نەتەوەیی ، بەشێکی گرنگ لە کەرامەتی مرۆڤ پەیوەستە بە وابەستەیی و (انتماء) ی ئەو بۆ نەتەوەکەی. هەر لێرەشەوە مەسەلەی کەرامەتی نەتەوەیی بۆ کۆمەڵگا و گروپێکی بەشەری دێتە کایەوە، پێشێلکردنی کەرامەتی نەتەوەیی سەرەنجام یەکسان دەبێت بە بریندارکردنی کەرامەتی تاکەکانی ئەو نەتەوەیە، چونکە

سەرەنجام نەتەوەکان لە تاکەکان پێکدێن، لەو سۆنگەوە کە ئەگەر خێزانیش بکەینەعەلْقەیەکیتری نێوان تاك و نەتەوە بناغەی خێزانیش هەر تاکە.

گەر خوای گەورە کەرامەتی بە (مرۆڤ)یش بەخشیبێ وەك (جۆر) و وەك کەس. ئەوا هەمان کەرامەتی بە گروپە مرۆڤایەتیەکانیش بەخشیوە، چونکە وەك گوتمان ئەوانیش بەرەنجامی کۆبوونەوەی مرۆڤەکانن، لێرەشەوە ڕێز نەگرتن لە تایبەتمەندییە نەتەوەییەکان لە سەردەمی ناسیۆنالیزمدا و چەوساندنەوەی نەتەوەیی ئاسەواری وێرانکەری بە سەر ژیانی ڕۆحی و ماددی تاکەکانی ئەو نەتەوەدا بە جێ دێڵێ ، چونکە وێنا کردنی ئەوە ئاسان نییە نەتەوەیەکی بێ بەشکراو لە مافە نەتەوەییەکانی تاکەکانی بتوانن هەست بە شکۆو ڕێزو کەرامەت و ئینسانییەت و پێگەی شایستە بە خۆیان بکەن.

لە ژێر تیشکی ئەم بەرەنجام گیرییە فکریانەشدا دەتوانین بێ دوو دڵی بڵێین کە چەوساندنەوەی دەیان ساڵەی نەتەوەی کوردو ئەو دۆخە ناهەموارو دژوارەی بۆ ئەم نەتەوەیە دروستکرا، پێش هەموو شتێ پێچەوانەی ئەم سەرەتایە بوو کە باسمان کردو تەواو پێچەوانەی ئەو دۆخ و پێگەو بارەیە کە خوای گەورە بۆ مرۆڤ و گروپە مرۆییەکان قایلە.

دووەم: بوونی گەل و نەتەوەو ڕەنگ و زمان و پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی خێزانی مرۆڤایەتی ، ڕاستییەکی گەردوونی و ڕەنگدانەوەی ویستی خوایە لە بووندا: لە گەڵ ئەو ڕاستییەی کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، کە وشەی (قوم) لە قورئاندا ئاماژە نییە بە نەتەوەو نەتەوایەتی بە ناوەڕۆکە هاوچەرخەکەی و ، هەر تەفسیرێکی لەو

جۆرە بۆ ئەو دەقانە دەرهێنانیانە لە سیاقە مێژووییەکەی خۆیان و بەسەردا بڕین ( اسقاط)ێکی نازانستییە و چاوەڕوانییەکی نالۆژیکیشە لەوەی بمانەوێت قورئان بە زمانی ئەمڕۆ قسە لە سەر دیاردەکان بکات ، بەڵام لە گەڵ ئەمەدا ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر لە قورئاندا هەیە کە ئەویش بریتییە لە داننان بە یەکەو گروپی بەشەری جیاواز و جۆراو جۆر کە خاوەن فەرهەنگ و ڕەنگ و زمان و تایبەتمەندی هاوبەشی خۆیانن.

قورئان لە زیاد لە ئایەتێك و شوێنێکدا ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات و بیرۆکەی (جیاوازی) لە ئاستێکدا بە ڕەسەن و بەشێ لە ڕاستییەکانی بوون داناوە، ڕوونە کە یەکێ لەو بیرۆکانەی (ناسیۆنالیزم) یش کاری لە سەر دەکات بیرۆکەی (جیاوازی)یە، هەڵبەتە لە ئاستێکی جیاوازتردا لەوەی ناسیۆنالیزم تەرحی دەکات.

قورئان لەم ڕووەوە دەفەرموێت (ومن آياته خلق السموات والأرض واختلاف السنتكم والوانكم ان في ذلك لآيات للعالمين)[١]

لەم ئایەتەدا جیاوازی ڕەنگ و زمان بە دوو نیشانەی خوای گەورە لە بوونەوردا خراونە ڕوو بە ویستی ئەوەوە بەستراونەتەوە، جیاوازی ڕەنگ و زمان لە بوونەوەردا دەستکرد نین، نابێ بابەتێکیش بن بۆ کێشمەکێش و سڕینەوەو شەڕ لە گەڵ کردن، چونکە نە زمانی هەڵبژێردراوی خواو نە ڕەنگ و نەژادی هەڵبژێردراوی خوای گەورە بونیان نییە. هەموو زمانەکان و سەرجەم ڕەنگ و نەژادەکان، هەڵبژێراوی ئەوو ڕەنگدانەوەی ویستی ئەون لە بووندا. گەر خودا خۆی تاك و تەنهاو بێ هاوبەش و

[١] سورة الروم (٢٢)

هاوتایه ، ئەوا خودا بوونەوەرێکی هەمە ڕەنگ و جۆراو جۆرە **(ولو شاء ربّك لجعل الناس امه واحد ولا يزالون مختلفين الا مَن رحمَ ربَك ولذلك خلقهم)**.[1]

لێرەشەوە لە دیدی جیهانبینی یەکتاپەرستی ئیسلامیەوە بە پێچەوانەی چەندین مۆدیل لەئایدۆلۆژیای ئیسلامی هاوچەرخ، (جیاوازبوون)دەبێت بە ماف. مافی تاك و مافی گروپەکان. گەر قورئان لەم ئایەتەدا لەسەر ئاستی جاوازی جۆرەکان قسەمان بۆ دەکات ، ئەوا لە ئایەتێکی‌ترداو لەسیاقە مێژویەکەدا لەسەر ئاستی پێکهاتە و یەکە ڕێکخەرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیەکان، مرۆڤ دەدوێنێ وەك دەفەرموێت **(ياايهاالناس انا خلقناكم من ذكر وانثي وجعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اكرمكم عندالله اتقاكم)**.[2]

قورئان لەم ئایەتەدا سەرەتا مرۆڤایەتی لەوە ئاگاداردەکاتەوە کە بەجیاوازی نەتەوەیی و ئایینی و نەژادیەوە یەك بنەڕەتیان هەیە. لەئاستی بەدیهاتنی سەرەتاو ریشەی بنەڕەتیشدا، یەکسانییەکی رەها لەنێوان مرۆڤەکان و نەتەوەو گروپە جۆراوجۆرەکاندا هەیە ، بوار لە بەردەم دروستکردنی ئەفسانەی سەرەتایدا دەبڕێت، بەڵام یەکیەتی ریشەیی و بناغەی نەتەوە و گروپە مرۆییە جۆراو جۆرەکان، ڕێگا لەبونی ڕاستی‌یەکی‌تر ناگرێت کە ئەویش جۆراو جۆری و جیاوازی نەتەوە و فەرهەنگ و نەژاد و گروپەکانە. گەر قورئان لە نمونە هێنانەوەکەیدا موفرەدەیەك بەکاردەهێنێ کە وەرگرانی یەکەمی پەیامەکەی تێی بگەن، بەڵام ئەوە مانای

---

[1] سورة هود (١١٨)

[2] سورة الحجرات (١٣)

قەتیسدانی ماناکان لەو سیاقە مێژوییەدا ناگەینێت[1]. بونی (شعوب) و (قبائل) لە ئایەتەکەدا بەستراوەتەوە بەخواستی بەدیهێنەرەوە.ئەوە خوای گەورەیە کە یەك ڕەنگی ڕەتدەکاتەوەو لەگەڵ فرە ڕەنگیدایە.

بەڵام کاتێك ئایەتەکە بیرۆکەی (جیاوازی) دەخاتە ڕوو، ڕەوایەتیەکی ئاسمانی و خوایی پێدە بەخشێت، وەك بیرۆکە و بنەما نەك ڕەنگدانەوەو بەرجەستە بوون ، هەروەها دەیکات بە بەشی لەروخسارەکانی بونی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و لە سەر ئاستی قۆناغ و ژیارەکاندا. لەهەمان کاتدا دیدێ بۆ سروشتی پەیوەندی نێوان جیاوازەکان دەخاتە روو کەئەویش لە (لتعارفو) دا بەرجەستە دەبێت.

واتە(جیاوازی)یەکان نابێ سەرچاوەی شەڕو ناکۆکی و دڕدۆنگی بن.، بەڵکو دەبێت مەیلی یەکتر ناسین و گفتوگۆو بەسەریەکدا کرانەوە بەهێز بکەن و پێکهاتە جیاوازەکان هەوڵی ئەوە بدەن لە بەرامبەرەکانیان تێبگەن و لە پەیوەندیەکی کارلێکی ژیاری و فەرهەنگی و ڕۆحی دا بن لە گەڵ یەکتردا. کۆتایی ئایەتەکەش زەمانەتێکیتری ئەو یەکتر ناسین و دیالۆگ و بە یەکداچونەیە ( ان اکرمکم عنداللە اتقاکم) کە ئەم برگە لە ئایەتەکە ئەوە دەخاتە ڕوو کە ڕێزو گەورەیی مرۆڤ بە ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و بنەچەکەیەوە نیە ، بەڵکو پەیوەستە بە حاڵەتێکی دیاریکراو کە لە ناخ و ژیانیدا بەرجەستەی دەکات ، (پلەی بەرێزترین) شتێ نیە پەیوەست بێت بە ڕەنگ و زمان و نەتەوەیەکی دیاریکراوەوە، بەڵکو (خیار)ێکی کراوەیە لە

[1] مەبەست ئەوەیە کە کۆمەڵگا و پێکهاتەکان لە سەردەمە جیاوازەکان مەرج نی یە یەك بەرجەستە بوونی دیاریکراوی هەبێت . لە سەردەمێکدا خێڵ و ( شعوب) رۆڵی گرنگ دەگێرن و سەردەمێکی تر نەتەوە بە مانا هاوچەرخەکەی و هەروەها .

بەردەم سەرجەم مرۆڤ و گروپەکاندا. بە پلەی یەکەمیش باس لە تاکی مرۆڤە لە پەیوەندی بە ڕازی کردنی پەروەردگارەوە.

کەواتە گەورە بوون و فراوانبوونی بازنەی گەشە کردنی خێزانی مرۆڤایەتی بە گوێرەی یاسا گەردونی و خواوەندییەکان (السنن الألهیه والکونییه) و هەل و مەرجەکانی ژیان ، جیاوازی دەکەن بە سیمای ژیان و بوون.

قۆناغێ لە گەشە کردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دێتە پێشەوە کە یەکیەتی لە نێو جیاوازیەکاندا ماناو فۆرمێکی نوێ پەیدا بکات و بەو فۆرمە سادە نەمێنێ کە بەراییەکانی ژیانی مرۆڤ خواستوویەتی. دەرکەوتنی ئەو جیاوازیانەش هێندەی لە دایك بوون و زۆربوونە ، کەرتبوون و ( انشقاق) نییە ، خوای گەورە مەبەستیەتی ئەم قەوارانە کە ڕەنگدانەوەو بەرجەستە بوونیان بە گوێرەی قۆناغە مێژوییە جیاوازەکان و گەشە کردنی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی دەگوزرێت بە یەکەوە بژین و هاوکارو تەبابن و ڕێز لە بوون و ژیان و ئازادی و تایبەتمەندی یەکتر بگرن و ووشەی (لتعارفوا) ش پەیامێکە بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی میللەتان لە گەڵ یەکتردا ـ هەڵبەت تەنها میللەتان ـ ئەمەش لانی کەمی واتای لێكتێگەیشتن و لە یەکتر نزیك بوونەوەی دوو قەوارەو بڕیاری ئازاد دەگەیەنێت ،، چونکە یەکتر ناسین و هاوکاری کردن لە پێناو خێرو خۆشی دوو لایەنە و تەواوی مرۆڤایەتیدا ، هەرگیز لە نێوان دوو ئیرادەو قەوارەو (خیار)دا بەدی نایەت کە یەکیان باڵا دەست و ئەوی دیان نزم و بن دەست بێت و نا یەکسانی حوکمی پەیوەندی نێوانیان بکات[1].

---

[1] ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە ٨٧/ ١٩ /١٩٩٦/٤

بۆ ئەوەی ئەم مەبەستەش بێتە دی دەبێت ئەو بەرەنجامەی لە جیاوازی و هەمە ڕەنگی فەرهەنگی و نەتەوەیی دەکەونەوە ڕێزیان لێبگیرێت ، بە تایبەتیش لە سەردەمی ناسیۆنالیزمدا، کە ناسنامەی مرۆڤ و هاولاتیان و سیستمی مافەکان پەیوەستە بە قەوارە نەتەوەیی‌یە هاوچەرخەکانەوە.

ئەگەر بەو جۆرەی باسکرا (جیاوازبوون) ماف بێت وەڕاستی‌یەکی گەردوونی بێت ، لێرەوە سەرجەم ئەو هەولانەی لە مێژوی نوێدا دراون بە مەبەستی سڕینەوەی شوناس و فەرهەنگی نەتەوەکان و کارکردن بۆ تواندنەوەیان لە بۆتەی نەتەوە بالا دەستە دەستدرێژی کەرەکاندا لەوانەش هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەی کورد، پێچەوانەی ئەم سەرەتایەی جیهانبینی ئیسلامین و دەڕژێنە خانەی ئەو هەولانەی بە ئاڕاستەی پێچەوانەی ویستی پەروەردگار لە گەردووندا خراونەتە گەڕ وەخودان هیچ ڕەوایەتیەکی ئیسلامی و ئەخلاقی نین.

هەروەك چۆن لە بەرامبەرەوە، قولکردنەوەی جیاوازیەکان بۆ ئاستی دەمارگرژی و لە بیر کردنی مەسەلە مرۆڤایەتیە هاوبەشەکان ، کە لە مێژوی نوێدا نمونە گەلی وەك فاشیزم و نازیزم و بەعسیزمی لێ کەوتۆتەوە، کە ئاماژەیە بە توند ڕەوی و بەرچاو تەنگی و گیانی فراوانخوازی و دوژمنکاری نەتەوەیی ، دیسانەوە لە گەڵ گیانی ئیسلام و سرشتی پەیامەکەی ناتەباییەکی توندیان هەیە و ڕێباز و ڕواڵەتگەلێکن ئاماژەن بە لادان و گومڕایی و پێویستە بەرهەڵستیان بکرێت.

هەر لەم سۆنگەوە گەلی کوردستان مافی خۆیەتی کە داوای ئەوە بکات دەبێت لایەنێکی سەرەکی و یەکسانی دیالۆگی نێوان نەتەوەکانی ناوچەکە بێت و ئەو

نایەکسانی و لاسەنگی‌یەی لەو پەیوەندیانەدا هەن ڕاست بکرێنەوە ، کە مێژوویەکی دورو درێژ لە بێ بەشی و چەوساندنەوە دروستی کردوون. هەروەها مافی خۆیەتی کە خۆی خۆی پێناسە بکات بۆ دەرەوەی خۆی وەك گەلی کوردستان و نەتەوەی کورد دەرفەتی گوزارشت دانەوەی ئازادی لە بوون و شوناس و داخوازیەکانی هەبێت ، کە ئەمەش چارەسەرکردنی کێشەکەی و دامەزراندنی قەوارەی نەتەوەیی دڵخوازی خۆی دەخوازێت.[1]

سێهەم: یەکسانی گروپ و گەل و نەتەوەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە:

پێویست بە سەلماندن ناکات کە لە ئیسلام دا گەل و نەتەوەی هەڵبژێردراوی خوا بوونی نییە، چونکە ئیسلام ئایینێکی بان نەتەوەیی‌یە و مەسەلەی (افضل) بوونیش هەروەك ئاماژەی پێدرا لەم دیدەوە پەیوەستە بە هەندێ بەهاوسەرەتاو بەرجەستە کردنی شێوازێکی ژیان و ئەخلاقیاتێکی دیاریکراو کە (خیار)ێکی کراوەیە لە بەردەم هەمواندا (خوای گەورە زمان و ڕەنگ و ڕەگەزی نەکردووە بە تەرازووی ڕێزدانی یەکێك یاخود گروپێك بە سەر کەس و گروپێکی‌تردا ، تا هەندێ کەس وا حاڵی بن کە ستەم کردن بە ناوەوە لە کەسانی‌ترو بێ بەش‌کردنیان لە مافەکانیان و دانی پێدا نراوە و ڕەوایە ، بەڵکو ئیسلام بەم جۆرە بیرکردنەوە بە هەستێکی نەفامانە دەداتە قەڵەم)[2]

---

[1] گۆڤاری هێشتا هەمان بابەت و ژمارەی پێشو ل ٣٠ .

[2] الأتحاد ألأسلامي الكردستاني منطلقات ومواقف / من منشورات الأتحاد الأسلامي الكوردستاني / بدون تأريخ /ص١٤.

دیدی ئیسلامی هاوسەنگ و ڕەسەن هەموو ( فکرو ڕێبازو دەسەلاتێ ڕەت دەکاتەوە کە لە سەر بناغەی ڕێزدانی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەیەکیتردا یاخود ڕەگەز پەرستی و ستەم کردن لە کەسانیترو نکولی کردن لە مافە ڕەواکانیان لە سەر بنچینەی ئینتمای نەتەوەییان داڕێژرابێت).[١]

شتێکی بەلگە نەویستە کە لە ئیسلامدا موسڵمانان بە جیاوازی ڕەنگ و زمان و نەژادو پێگەیانەوە خاوەنی مافی وەك یەکن و لە بەردەم خوای گەورەو یاسای ئیسلامی دا یەکسانن ، هەموو ئەو نایەکسانییەی لە مێژوی ئیسلامیدا دەمارگرژی و عەقڵیەتی خێڵایەتی و لە سەردەمی نوێشدا بەرچاو تەنگی نەتەوەیی خولقاندویانە، بە ڕواڵەتگەلێکی لادان لە جەوهەرو ڕۆحی ئیسلام دەدرێنە قەڵەم. خوای گەورە لە قورئاندا نەك هەر دەربارەی باوەڕداران.

بەڵکو سەبارەت بە تێکڕای ئادەمیزادەکان دەفەرموێت (الذي خلقكم من نفس واحده)[٢] لە چەندین دەقی فەرمودەشدا هەموو جیاکاری و هەڵاواردنێك لە سەر بناغەی ڕەنگ و نەژاد ڕەتکراوەتەوە هەروەك پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت (ایها الناس ان ربكم واحد، وان اباكم واحد كلكم من ادم وادم من تراب ولا فضل لعربي علي عجمي ولا لعجمي ع لي عربي ولا لأبيض علي احمر وليس فضل الا بالتقوي)[٣]

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشو لا ١٥٧ .

[٢] سورة النساء.

[٣] صلاح الدين الأيوبي / الأسلام والتميز العنصري / دار الأندلس للطباعة والنشر / الطبعة الأولى /١٩٧٢ / بيروت ـلبنان / ص١٤٧

لەم فەرمودەدا هەر جۆرە بالاّ دەستی و ڕێزدانێکی نەتەوەیی و نەژاد پەرستانە ڕەتکراوەتەوە و ڕەوایەتی ئیسلامیان لیّ سەنراوەتەوە ، جارێکیتر ( افضل) بوون بەستراوەتەوە بە چاك ژیان و پەیوەستە بەسەر پشكە ویستگەراكان، هەڵبەتە ئەویش بەرەنجامەكەی لە ڕۆژی قیامەتدا وەدەردەكەوێت.

لە فەرمودەیەكیتریشدا هاتووە (**الناس سواسیه كأسنان المشط**) خەڵكی هەر وەك دانەكانی شانە لە گەڵ یەكدی یەكسانن ، مەسەلەی سەرنج ڕاكێشیش لێرەدا ئەوەیە كە یەكسانییەكە تەنها باسی باوەڕداران نییە، بەڵكو باسی خەڵكییە بە گشتی بازنەی (خەڵك) یش بازنەیەكی كراوەترو لە خۆگری هەمە ڕەنگی ئایینی و فەرهەنگی و نەتەوەییە.

بەرەنجامێكی پرەنسیپی یەكسانی گروپەبەشەری و نەتەوەكانیش ڕەتكردنەوەی دەمارگرژی و لوتبەرزی نەتەوەیی‌یە، لێرەشدا گرنگە گەر بە كورتیش بێت لە سەر دەمارگرژی بوەستین و سەرەتاش ناوەڕۆكەكەی دیاری بكەین:

دەمارگرژی واتە: (مرۆڤ لە هەموو حاڵەتێكدا پشتی گروپەكەی بگرێت و بە دەمیانەوە بچێت و لە گەڵیان ڕوبەڕوی نەیارەكان ببێتەوە و بۆیان بجۆشیّ جا ستەم لێكراو بن یا خود ستەم كار[1].

دەمارگرژی نەتەوەیش ژێرخانی توندڕەوی نەتەوەیی و نەتەوەپەرستی‌یەكی كوێرانەیە و دژی لێبوردەیی و بە یەكەوە ژیان و فرەیی و ڕێز گرتنە لە مافەكانی بەرامبەر. هەروەها بریتی‌یە لەوەی كە: (مرۆڤ وا بیر كاتەوە نەتەوەكەی لە

[1] ابو منصور محمد بن احمد الأزهري / تهذيب اللغة / دار المصرية للتأليف والترجمة ٢/٤٩ / لة ريَى

نەتەوەکانی‌تر باشترە، بە جۆرێ باوەڕی وابێت کە دەبێت نەتەوەکانی‌تری پاشکۆی نەتەوەکەی ئەم بن و لە ژێر چنگیدا بن، وە بە مافی نەتەوەکەی بزانێ خاکی نەتەوەکانی‌تر داگیر بکات و بۆ بەرژەوەندی‌یەکانی خۆی بیانچەوسێنێتەوە و بەهرەیان لێ بەرێت.[1]

زۆر جاریش ئەم دەمارگرژی‌یە نەتەوەییە لەو دەوڵەتانەدا دروست دەبێت کە زیاتر لە نەتەوەیەکی تێدا دەژی و نەتەوەی باڵا دەست سیاسەتی نکوڵی کردن لە نەتەوەکانی‌تر پەیڕەو دەکات و دەیەوێت بە ئاگرو ئاسن لە بۆتەی خۆیدا بیانتوێنێتەوە.

ئەم فۆرمە لە نەتەوایەتی فۆرمێکی دواکەوتوو دژی سەرەتاکانی ئیسلامیشە ، پێغەمبەریش(د.خ) لە چەندین فەرمودەدا ئاماژەی بە (دەمارگرژی) کردووە و باوەڕدارانی لە ئاستیدا هوشیار کردۆتەوە هەر وەك دەفەرموێت (لیس منا من دعا الي عصبيه و ليس منا من قاتل عن عصبيه وليس منا من مات علي عصبيه).[2]

هەڵبەت جێی سەرنجە هەندێجار بزوتنەوەیەکی هەقخوازانەی وەکو بزوتنەوەی نیشتمانی گەلی کوردستان کە وەك گەلێکی ستەملێکراو داوای مافەکانی خۆی و کۆتایی بەو ستەمەی لێی دەکرێت کردوە  بە دەمارگرژی تۆمەتبار کراوە.

---

[1] د . محمد گەزنەیی / دەمارگرژی نەتەوایەتی / کوردستان / ٢٠٠٢ چاپی یەکەم لا٥٤ـ٥٥ .

[2] سنن أبي داود / الأمام عبدالرؤوف المناوي. فيض القدير بشرح الجامع الصغير / مطبعة بولاق المصرية (١٢٨٠ﻫ):٢:/٣٣٠ ، العصبية القومية في منظور الأسلام / ص٣٣ .

له کاتێکدا پێغەمبەر دەفەرموێت (خيركم المدافع عن عشيرته مالم ياثم). ئەوانەی بەرگری لە قەوم و نەتەوەی خۆیان دەکەن ـ دیارە ئێستا باسی نەتەوەیە ـ لە سەر هەق لەباشترین کەسانن واتە گەر خۆبێبەریکردن لە دەمارگرژەکان سیفەتی (باشترین)بن ئەوا لەدیدێکی هەقخوازانەوە ئەوانەش کە بەرگری لەگروپ و نەتەوەی خۆیان دەکەن و دژی دەمارگرژیەکی دەستدرێژکار دەوەستنەوە و داکۆکی لە مافەکانی خۆیان دەکەن، دیسانەوە لە کەسە باشەکانی ناو کۆمەڵی خۆیانن.

دیارەئەگەر پرانسیپی یەکسانیی گروپ و رەنگ و زمان و نەتەوەکان خۆی لە خۆیدا گرنگ بێت، ئەوا دیاریکردنی ناوەرۆك و مەوداو رەنگدانەوەکانی لەئێستاداو کاریگەرییەکانی بۆسەر سیستەمەکانی ماف پێدان و هەڵسەنگاندن و داوەری کردن گرنگترە.

چونکە ئەگەری ئەوە هەیە خودی پرانسیپەکە، بەئاراستەیەکی پێچەوانە (استغلال) بکرێت و بکرێتە پاساوی نایەکسانی مەیدانی، بۆنمونە هێزو دەسەڵاتێ ئەو سەرتایە بەکاربێنی بۆ دژایەتی داخوازیە نەتەوایەتیەکانی نەتەوەیەکی وەك نەتەوەی کورد وگەلی کوردستان.پوختەی ئەو هەوڵەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت بوترێت کەئیسلام هەموو میللەتان بەیەك چاو سەیر دەکات و موسڵمانانیش بەبرا دەزانێت ، گەرمەسەلەکەش بەم جۆرەبێت وروژاندنی باسی مەسەلەی نەتەوایەتی و مافی چارەنوس و ماڵجییایی و بیناکردنی داخوازی و داواکاری لەسەر بناغەی جیاوازیی نەتەوەیی، چ پاساوێکی هەیە؟! لەکاتێکدا ئەم باسی یەکسانی کردنە لەدۆخێکدا کە نایەکسانی بەرهەم دەهێنێ و سیستمی سیاسی لەسەر بناغەی گەلێکی دەرەوەیئەو چەمك و پێوەرانە دارێژراون دەبێت بەهەوڵێك گەر واشدابنێین

ئەو پەری نیاز پاکی لەپشتە، لەگەڵ چەندین گرفت و رەخنەی جدی ڕوبەرو دەبێتەوە، لەوانەش :

ا ـ ئەم دیدە ئەو نایەکسانییە لەبەرچاو ناگرێت کەئێستا بەهۆی ناسیۆ نالیزمەوە لەنێوان نەتەوەکاندا دروست بوە دیارە لەوانەش لەنێوان گەلی کوردستان و نەتەوەکانی دراوسێ کەهەندێکیان خاوەن قەوارەو سرودی نیشتمانی و زمانی فەرمی و ئاڵا و ئەندامێتی نەتەوە یەکگرتوەکانن و هەندێکیتریشیان بێبەش لەم مافانەو ستەم لێکراو. ئەم دیدە لە ناو ئەو فەزاوچوارچێوەو قەوارە مۆدێرنانەن و ئەو سیستمە نێودەوڵەتیەی لە ئارادایە یەکسانی تەرح ناکات، بەڵکو قسەکردنی لەسەرپرەنسیپی یەکسانی بەجۆرێکە کەهێشتا ئیمپراتۆریەتە فرە نەتەوەییەکان یەکەی رێکخستنی سیستمی نێودەوڵەتین و شتانێکیش بەناوی رەگەزنامەو ناسنامەو پاساپۆرت و ئەتڵەسی نیشتیمانی و سوپاو سنورە نەتەوەییەکان و مۆدیلی (دەوڵەت ـ نەتەوە) لەئارادا نەبن! ، چونکە باسکردن لە یەکسانی کاتێك مانا پەیدا دەکات کە لەبەر رۆشنایی واقیعەسیاسی و نیشتمانی و نێودەوڵەتی و فۆرمە سیاسی و ئیداری و یاساییە کارپێکراوەکان تێی بڕوانرێ و مەوداو ناوەڕۆك و رەهەندەکانی دیاری بکرێت..

لەسەردەمێکدا کەژیان لەچوارچێوەی دەوڵەتی هاوچەرخ و میکانیزمەکانیدا پێگە و چارەنوسی تاك و گروپەکان دیاری دەکات ،پرسیار دروستکردن لەسەر بزوتنەوەی هەقخوازانەی نەتەوەیەك بەپاساوی یەکسانییەکی تیۆری یان مژدە پێدراو کەلەدوارۆژدا دێتە دی ، کارێکی بێهودە و بێ ناوەرۆك کردنی چەمکی یەکسانییە.

چونکه ئەم سەرەتایە کە ئێستا سەرەتایەکی دانپێنراوی نێودەوڵەتییە ـ لانی کەم لەسەرئاستی تیۆری ـ چەمکێکە بەدەستی ماف خوراوەکانەوە، بۆدادگاییکردنی سەرجەم ئەو دیدو ئادۆلۆژیا توندڕەوانەی کە بە جۆرێ لە جۆرەکان بەشدارن لەپاساوهێنانەوە بۆ ئەو نایەکسانیی‌یەو درێژە پێدانی. بەرنجامگیریەکی سروشتی پرەنسیپی یەکسانی گەل و نەتەوەکان لەسەردەمی ناسیۆنالیزمدا، داواکردنی یەکسان بوونە بەگوێرەی ئەو پێوەرانەی کە مۆدێرنەی سیاسی لەسەر ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی خستونییە ڕوو.بۆ نمونە لەسەرئەم بناغەیە کوردێك رویکاتە نەتەوەی باڵادەست کەلەمافەنەتەوەیەکانی بێبەشی کردوە و پێی بڵێت گەر ئیسلام ئێمەی لەمافدا یەکسان کردوە دەبێت ئەو مافانەی تۆ هەتە لە قەوارەو ئاڵا....هتد منیش هەمان مافم هەبێت، هەرکات تۆ ئامادە بووی دەست لەو مافانە هەڵبگریت ,منیش دەتوانم بەجۆرێکی‌تر بیر لەفۆرمی بەیەکەوە ژیان بکەمەوە ، چونکە پرنسیپی یەکسانی گروپ و نەتەوەکان لەڕوانگەی ئیسلامەوە بەتایبەتیش گەل و نەتەوە موسڵمانەکان، مافی وەك یەك دەدات بەهەموان. هەر ئەم پرەنسیپەش ڕێگرە لە بەردەم درووسبونی نەتەوە خوازی دەستدرێژکار و فراوانخواز و توندڕەو دەمارگرژیدا.

چوارەم: هەڵوێستی توندی ئیسلام بەرامبەرستەم و ستەمکاری هەرکەس لانیکەم ئاگاداری بەسەر دەقە دامەزینەرەکانی ئیسلامدا هەبێت بەئاسانی پەی بەهەڵوێستی بەبڕشت و توندو یەکلاکەرەوەی ئیسلام و دیدی ئیسلامی ڕەسەن بەرامبەر ستەم لەبەرگە جۆرا و جۆرەکانیدا دەبات.

* ستەم کردنی مرۆڤەکان لە یەکتری قەدەغەیە (یاعبادی انی حرمت الظلم علی نفسی وجعلت بینکم محرماً)[١] دەقەکە جگەلەوەی هەرجۆرە ستەمکاری یەك لەخوای گەورە بەدوردەگرێت، جاڕی ئاسمانی و خوایی حەرام کردن و قەدەغەکردنی ستەمکردنی بەندەکانی خواش لە یەکتری رادەگەیەنێت. لێرەوە ئەو ستەمانەی بە ستەمکاری ناوی خوایان دەدرێتە پالْ - وەك هەندێك گروپ و کەس لەمڕۆدا بەناوی ئیسلامەوە دەیکەن، خۆی ستەمێکیترە.

* خوێن و مالْ و ناموس و شەرەفی موسڵمانان لەسەر یەك حەرامەوەك درێژەی بنەمای قەدەغەکردنی زوڵم(کل المسلم علی المسلم حرام , دمه, وماله, وعرضه)[٢]

هەرکەسێکیش ستەم لە هاوڵاتیەکی ناموسڵمانی ناو کۆمەڵگا بکات ئەوا بەو کارەی دوژمنایەتی و خەنیمی پێغەمبەری خوا (د.خ) لە رۆژی دوایدا بۆ خۆی مسۆگەر کردوە. دیارە لەم دونیاش یاسای سزادان سزای پێویستی دەدا.[٣]

*هاوکاری نەکردن و ئیدانە کردنی ستەم و لە رووهەڵماڵینی بەهەموو شێواز و زمانێ، کە ستەمێکیتری لێنەکەوێتەوە ڕەوایە (لا یحب الله الجهر بالسوء من القول الاّ من ظلم)[٤] خوای گەورە دەنگ لێ بەرزبونەوە و قسەکردنی خراپی پێ پەسند نییە ، جگە بۆ کەسێك نەبێ کە ستەمی لێکراوە.چونکە ستەم هیچ حەسانەو

[١] سنن أبي داود المصدر السابق ٤/ ٣٣١-٣٣٢، رقم الحديث ٥١١٩ العصبية القومية في منظور الأسلام /ص٣٢.

[٢] رواه البخاري ومسلم عبدالعزيز عبدالرحمان / الأسلام والعنصرية / دار النشر جدة / المدينة المنورة / الطبعة الثانيية / ١٩٩٥ ص٧٧ .

[٣] ئاماژەیە بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر لەو بارەیەوە .

[٤] النساء /١٤٧

پیرۆزیەکی نییە و دۆخی ستەملێکراویش بەزمانی یاسایی سەردەم(ظرف المخفف)ە و رێگا بەمرۆڤی ستەم لێکراو دراوە کە بە زمانێکی نائاسایی رووبەرووی بووەستێتەوە.

ستەم لێکراو بۆی هەیە سیفەتە زشت و ناشیرینەکانی ستەم و ستەمکاری لەقاوداو بەزمانێکی توندسکالآی لەدەست دەربرێت دیارە لەسەر ئاستی گروپیش هەمان شتە .

* جگە لە رەوایەتی دان بە ئیدانە کردنی ستەم و لە روهەڵماڵینی بە زمان و لە ئاستی راگەیاندن و تیۆری، هەروەها دژایەتی کردنی بە کردەوە و بەرهەڵستی کردنیشی ، کردووە بە ئەرکێکی باوەرِدارانەو خەسڵەتێکی کۆمەڵگایەکی موسڵمان ، کە خوایەك دەپەرستن، ستەمی لە خۆی قەدەغە کردووە و جارِی ئەبەدی حەرامکردنی ستەمیشی بە گوێی مرۆڤەکاندا داوە.

لە سورەتی (الشوری) دا کە هەر ناوەکەی ئاماژەیە بە رێز گرتنی ئیرادەی مرۆڤەکان و رەتکردنەوەی قۆرغ کردنی بریارو دەسەلآت و سامان و تواناکانی ئاراستە کردنی کۆمەڵگا ، خوای گەورە رەوایەتی داوە بە بەرهەڵستی ستەم و دەفەرموێت ( والذين اذا أصابهم البغي هم ينتصرون)[1] ئەم ئایەتە یەکێ لە سیفەتەکانی کۆمەڵێکی باوەرِدارو پابەند بە بەها ئیسلامییەکانەوە دەکات کە ئاماژەیە بەوەی هەرکاتێ دووچاری ستەم و دەستدرێژی و زۆرداری بونەوە (خیار)ی

---

[1] الشورى /٣٩

ملکەچی و خۆ بەدەستەوەدان و چۆك دانان هەڵنابژێرن، بەڵکو پشتی یەك دەگرن و ڕووبەڕوی دەوەستنەوەو بەرهەڵستی دەکەن.

ستەمیش لە بەرگ و ئاستی جۆراوجۆردا دەردەکەوێت، هەر لە ستەمی تاکە کەسی و خێزانییەوە بگرە، تا ستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی و مەزهەبی یەکێ لە ستەمە دیارەکانی مێژوی هاوچەرخیش ستەمی نەتەوەایەتی‌یە ، واتە بێ-بەش کردنی نەتەوەیەکە لە مافە نەتەوەیی و سیاسی و مەدەنییەکانی و ، هەوڵدانە بۆ سڕینەوەی ناسنامەکەی و ڕێگە گرتن لە گەشەدان بە فەرهەنگەکەی و گۆڕینی دیمۆگرافیای نیشتمانەکەی و جۆرەها شێوازی‌تری ستەم و چەوساندنەوە، هەڵوێستی ئیسلامیش بەرامبەر بە ستەم هەڵوێستێکی گەردونی و گشتگیرە، دژایەتی ستەم یەکێ لە بنەما نەگۆڕو پایە گەورەکانی جیهانبینی‌یە یەکتا پەرستەکەیەتی گۆڕانی ڕواڵەتەکانی ستەمکاری و ئەو فۆرمانەی بەرجەستەی ستەم دەکەن، هیچ لە ناوەرۆکی سەرەتاکە و ڕەوایەتی خەبات دژی ستەمکاری ناگۆڕن.

نەتەوەی کورد و گەلی کوردستانیش یەکێکە لە هێماکانی قوربانیانی ستەمی نەتەوەیی لە سەدەی ڕابردوودا. کورد (بەهۆی دابەشکردنی وڵاتەکەی بە سەر عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا و ڕوسیادا، بەو جۆرەی کە بەرژەوەندی وڵاتانی ئیستعماری لە پەیمانی (سایکس بیکۆ) دا خواستویەتی ، لەم سەردەمەداو لە مێژوی نوێدا توشی ستەمێکی مێژوویی هاتووە کە تاکو ئێستاش بە دەستیەوە دەناڵێنێ)[1]

---

[1] ڕۆژنامەی یەکگرتوو / ژمارە ١٣ / ١٩٩٧/٩/٢ .

پرەنسیپی دژایەتی کردنی ستەم بەو جۆرەی باسمان کرد لەسەر ئاستی کێشەو داخوازیە نەتەوەیی یەکاندا ، چەندین ڕەنگدانەوەی دەبێت لەوانەش :

* قەدەغە کردنی ستەمی نەتەوەیەك لە نەتەوەیەکی‌تر لە هەموو ئاست و ڕواڵەتەکاندا.

*ڕەوایەتی دان بە بەرهەڵستی نەتەوەیەك کاتێك دەکەوێتە بەر شاڵاوی ستەم و دەستدرێژی و چەوساندنەوە.

* بە ڕەوا بینینی هەموو ئەو زەمانات و چوارچێوانەی لابردنی ئەم ستەمە دەستەبەر دەکەن، لەوانەش پێکهێنانی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەیی و سەروەرێتی بە سەر نیشتمان و خاکی نەتەوەییەوە.

**پێنجەم:** سەرەتای دادپەروەری؛ ئەگەر ئیسلام و دیدی ئیسلامی بەو جۆرەی لە خاڵی پێشودا خستمانە ڕوو ، دژی ستەمە لە هەموو ئاست و ڕەهەندەکانیدا، ئەوا ڕوونە لە بارەیەوە پێ لە سەر چەسپاندنی دادپەروەری دادەگرێت لە کایە جۆراوجۆرەکانی ژیان و کۆمەڵگادا، قورئان مەسەلەی دادپەروەری کردوە بە ناونیشانی گەورەی هەوڵی پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) لە درێژایی مێژودا ، هەروەك لە سورەی (الحدید)دا دەفەرموێت **(ولقد أرسلنا رسلنا بالبینات وانزلنا معهم الکتاب والمیزان لیقوم الناس بالقسط)**[١]

---

[١] الحدید / ٢٥

هەروەها لە ئایەتێکیتردا دەفەرموێت ( یا أیها الذین آمنوا کونوا قوامین بالقسط شهداء لله)[١].

ڕۆحی دادپەروەریش وەك یەکی و یەکسانی و هاوسەنگی و میانەڕەوی دەخوازێت. دادپەروەری ئەو چەمك و بەهاو پێوەرەیە دەبێت بچێتە ناو تۆڕی پەیوەندییەکان و دیاری کردنی ماف و پێگە یاسایی و سیاسی و ئابورییەکان.

سەرەتای دادپەروەری دەخوازێت نەتەوەکان خاوەنی مافی وەك یەك و نەتەوەیەك بالا دەست نەبێت بە سەر یەکێکیتردا و پەیوەندییەکی هاوسەنگ لە نێوانیاندا بێت و مافە نەتەوەییەکان ڕێزیان لێبگیرێت. لە ڕویەکیترەوە دادپەروەری ئامرازێکی فکری و ئەخلاقی وەسفکردن و پێناسە کردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەیەکی بن دەست و داخوازیە نەتەوەییە ڕەواکانە. گەر دادپەروەری لە سەر ئاستی ئەخلاقدا ئەو سەرەتایە بەرجەستە بکات کە دەڵێت (چیت بۆ خۆت پیّ خۆشە دەبێت هەمان شتت بۆ کەسانیتر پیّ خۆش بێت و چیشت بۆ خۆت پیّ ناخۆشە بە هەمان شێوە بۆ کەسانیتر پێت ناخۆش بێت) واتە لە حاڵەتە جۆراوجۆرەکاندا خۆت بخەیتە شوێنی بەرامبەرەکان و لەوێوە داوەری بکەیت و حوکم بدەیت، دەبێت لە سەر ئاستی نەتەوەیی و نەتەوەکانیش بەو جۆرە بێت.

کێشەی گەلی کوردستانیش کێشەیەکی عادیلانەیە، چونکە ئاماژەیە بە ستەمێکی مێژوویی کە لەم نەتەوە کراوە وەبەو نایەکسانییەی لە پەیوەندیدا لە گەڵ

---

[١] النساء ⁄ ١٣٥

نەتەوەکانی دەورروبەر دووچاری هاتووە. داخوازییەکانیشی ڕەواو عادیلانەن، چونکە داوای وەك یەکی‌یە بە گوێرەی پێوەرە بابەتی و ئیسلامی و نێودەوڵەتیەکان و بەدەسهێنانەوەی ئەو مافانەیە کە سیستەمی سیاسی و مافخوازی سەردەم کردوونی بە مافی هەر نەتەوەیەك، لەوانەش مافی چارەی خۆنوسین(دیاری‌کردنی چارەنووس) و یەککگرتنی ئارەزومەندانە، یاخود جیابونەوە و سەربەخۆ بوون و گەیشتن بە ئامانجی سروشتیی هەر ناسیونالیزمێ کە دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەییە.

### کۆتایی

دوای ئەوەی لە لاپەڕەکانی ڕابردوودا لە دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخی ئیجتیهاد ئامێزەوە تاوتوێی دیاردەی ناسیۆنالیزم و نەتەوە خوازیمان بەو جۆرەی مۆدێرنەی سیاسی و فکری بەرهەمی هێناوە کرد ، سەرەتا هەوڵی گەیشتن بە پێناسەیەکی نەتەوەخوازیمان‌دا و دواتر قسەمان لە سەر مەسەلەی مەنهەج کرد و دواتریش تاوتوێی هەندێ لەو پێگە فکریانەدا کرد کە بە بڕوای توێژەر، بەشێ لە پێگە فکرییەکانی دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخ و ڕەسەن لە مەڕ مەسەلەی نەتەوایەتی دەخەنە ڕوو، دەتوانین بەرەنجامەکان و باری سەرنجی توێژەر لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشان بکەین:

١) نەتەوایەتی پرەنسیپێکی سیاسی و هەستکردنە بە (انتما) بۆ نەتەوە و پەرۆشی‌یە بۆ سەربەرزی و شکۆمەندی ئەو ، واتە ئایدۆلۆژیایەکی هەمە لایەنە نییە ، بەڵکو پێویستی بە جیهان بینی و دیدێکی فەلسەفی دیاریکراو هەیە بۆ ئەوەی بۆ بونیاد نانی دەوڵەتە و کۆمەڵگاو ژیانی دەستوری و دامەزراوەیی

هەڵبژاردنی سیستمی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی پشتی پێ ببەستێ کە ئەم دیدە فەلسەفیەش ناوەڕۆکی ناسیۆنالیزم پێکدەهێنێت.

٢) مەسەلەی مەنهەج لە تاوتوویێ کردنی دیاردەی ناسیۆنالیزم لە دیدێکی ئیسلامیی‌یەوە ، گرنگی لە ڕادە بەدەری هەیە، چونکە هەڵەی مەنهەجی پێشەکی هەڵەمان دەداتێ و سەرەنجام پێشەکی‌یە هەڵەکانیش بەرەنجامگیری هەڵەیان لێ دەکەوێتەوە، مەنهەجی‌بونیش دەخوازێت پێش هەموو شتێ مەسەلەکە زیاتر لەوەی لە سەر ئاستی (ئیسلام) وەکو ئایین بخرێتە ڕوو ، لە سەر ئاستی بەها ئیسلامییەکان و فکری ئیسلامی و دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخ چارەسەر بکرێت، چونکە لەم ئاستەدا مرونەت و ڕێژەیی بوون و هارمۆنییەتی مامەڵەکردن لە گەڵ واقیع و دیاردەکەو دەقەکاندا زۆرترە و لە ڕوی مەنهەجیشەوە ڕاسترە، هەروەها خستمانە ڕوو دوو ڕێبازی بیرکردنەوە و مامەڵە کردن لەگەڵ دیاردەی ناسیۆنالیزم لە پەیوەندی بەئیسلامەوە لە بازنە ئیسلامی و عەلمانییەکەدا هەستی پێ دەکرێت، کە بە بڕوای توێژەر هەردووکیان هەڵەن (اسقاطات) ی هەڵەیان هەیە. یەکێکیان دەیەوێت وا دەرخات لە سەر ئاستی دەق و ڕاستەوخۆ لە ئیسلامدا مەسەلەی نەتەوایەتی باسی کراوە و چارە کراوە، لە بەرامبەرەوە دیدەکەی‌تریش پێی وایە ئیسلام بە حوکمی بان نەتەوەیی بوونی ، دژی سەرەتای نەتەوایەتی‌یە و دان بە جیاوازی و مافە نەتەوایەتییەکاندا نانێت، توێژەر لە بەرامبەردا ڕێبازی سێهەم پێشنیار دەکات کە ناسیۆنالیزم بە دیاردەیەکی مۆدێرنە دەناسێ و لە سەر ئاستی بەهاو پرەنسیپە گشتی‌یەکانی

ئیسلام و ڕەنگدانەوەکانیان لە واقیعی هاوچەرخدا لە دیاردەی ناسیۆنالیزم دەکۆڵێتەوە.

٣) نەتەوایەتی دیاردەیەکی نوێ و بەرهەمی مۆدێرنەی فکری و سیاسی‌یە و لە خۆرئاوادا کە ژینگەی سەرهەڵدانییەتی تەمەنی لە (٢٠٠) ساڵ تێپەڕ ناکات و زیاتر لە دوای شۆڕشی فەڕەنسەوە ئەم پرەنسیپە دەست بە بڵاوبوونەوە دەکات.

٤) هەموو باسکردنێك لە خستنە ڕووی دیدو سەرەنجام لە خۆ گرتن و چارەسەرێکی مەشرەب ئیسلامی بۆ دیاردەی نەتەوایەتی، دەبێت لە چوارچێوەی ئەو واقیعەدا بێت کە سەد ساڵ مێژوی ئامادەیی ناسیۆنالیزم و مۆدێرنە لە وڵاتانی ناوچەکەدا دروستی کردووە.

٥) دیدی ئیسلامی لە سەر ئاستی فەرهەنگ و ڕەنگ و زمان ئیش لە سەر بیرۆکەی (جیاوازی) ی دەکات و هەر ئەم بیرۆکەش میکانیزمێکی ناسیۆنالیزمە، بەڵام لە ئاستێکی‌تردا و لەو کاتەدا کە جیاوازی‌یە سروشتی و فکری‌یەکانی وەکو زمان و فەرهەنگ بەرز دەبنەوە بۆ ئاستی داواکاری سیاسی، بەو جۆرەی کە ناسیۆنالیزم داوای دەکات. لە هەمان کاتدا مەترسی توندڕەوی نواندن لە وێنا کردنی ئەو (جیاوازی)یە خراپە ڕوو کە لە مێژوی نوێدا فاشیزم و نازیزم و کەمالیزم و بەعسیزمی بەرهەم هێناوە و بەها ئیسلامی‌یەکانیش ڕێگرن لەو توندڕەویە و ناهێڵن بازنەی نەتەوەیی، بازنەکانی ئیسلامی و ئینسانی و

هەرێمایەتی و ژیاری بسڕێتەوە ئەمەش خەسڵەتێ ناسیۆنالیزمێکی میانەڕەو و ئینسانی و لێبوردەیە.

٦) یەکسانی گەلان و نەتەوەکان و سەرەتای دژایەتی ستەم و دادپەروەری هەر هەموویان دەخوازن نەتەوەکان خاوەنی مافی وەك یەك بن و هەموو شێوازێکی باڵا دەستی و لوتبەرزی و خۆ بەزل زانین و دەمارگرژی و توند ڕەوی و فراوانخوازی نەتەوەیی ڕەتدەکەنەوە کە بەیەکەوە سەرچاوەی ستەم و شەڕو تاوان و خوێن ڕێژی پێکدەهێنن و دژی سەرەتاکانی برایەتی و بەیەکەوە ژیانی ئاشتی خوازانەی گەلانن.

٧) بزوتنەوەی هەقخوازانەی نەتەوەی کورد و گەلی کوردستان بە گوێرەی ئەو سەرەتایانە بزوتنەوەیەکی هەقخوازانە و خاوەن کێشەیەکی ڕەوا و شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردیش لە گەڵ هەر کەم و کورتیەك کە هەیانبوبێ ناونیشانبون بۆ هەوڵی بێ وچانی ئەم نەتەوەیە بۆ دژایەتی ستەمی نەتەوەیی و ملکەچ نەکردن و گەیشتن بە لەحزەی ڕزگاری. ناوەڕۆکی کێشەی کوردیش عادیلانە و چەوسێنەرانی کورد و گەلی کوردستانیش داڕنراون لە هەر ڕوایەتییەکی ئیسلامی و لە سەرەڕێی ستەم کردن لە کوردیش پێش ئەوەی بەڵگەنامە نێو دەوڵەتیەکان و جاڕنامەی گەردونی مافی مرۆڤ و ویژدانی زیندوی مرۆڤایەتی جوڵابنەوە دژایەتی پرەنسیپ و بەهاو بنەما ئیسلامیەکان و سەرەتای برایەتی ئیسلامی نێوان گەلانی ناوچەکەیان کردووە.

٨) گەیشتنی کورد و گەلی کوردستان بە مافە نەتەوەییەکانی لەوانەش دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بەشێکە لە ڕەنگدانەوەی سەرەتای یەکسانی نەتەوەکان و ڕێگرتن لە بەردەوامبونی ستەمە مێژوییەکە و بە دیهاتنی سەرەتای دادپەروەری لە پەیوەندی نێوان نەتەوەکاندا.

٩) دیدە ئیسلامییەکە بەو جۆرەی خستمانە ڕوو ئەو سیستمە نێودەوڵەتی و دۆخە جیهانییە ڕەتدەکاتەوە و بە ستەمکاری دەزانێ کە لە ماوەی ڕابردوودا و بە تایبەتیش لە سەدەی بیستەمدا بە هۆی بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوری و کۆلۆنیالیستییەکانەوە ڕێگر بوون لەوەی کۆمەڵێ نەتەوە و لە پێش هەمووشیانەوە نەتەوەی کورد بە مافە نەتەوەیی خواپێداو و دانپیانراوەکانی خۆیان بگەن و پێی شاد بن.

## مافی دیاریکردنی چارەنووس و دەوڵەتی نەتەوەیی، دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ

مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسیاندا یەکێکە لە ڕەنگدانەوە و دەرکەوتەکانی ناسیونالیزم و ستراتیژی ناسیونالیزمی هەر نەتەوەیەك بریتی‌یە لە گەیشتنی نەتەوە بەم مافە ، کە فۆرمی باڵاشی پێکهێنانی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەییە.

ئامانجی ئەم فەسڵەش پێشکەشکردنی دیدێکی ئیسلامی هاوچەرخی ئیسلامییە بۆ ئەم مافە و فۆرمە باڵاکەی کە دەوڵەتی نەتەوەییە، بەمەبەستی پێدانی ڕەهەندێکی قوڵتر بەم چەمکە لە ئەدەبیاتی سیاسی کوردیدا و خوڵقاندنی هاوچارەنووسییەکی نیشتمانی‌تری جۆشخواردوتر و داڕنینی ڕەوایەتی ئیسلامی لەهەر هەوڵێ لە ئێستا و دوا ڕۆژدا بدرێت بەمەبەستی بێبەشکردنی گەلی کوردستان و نەتەوەی کورد لەم مافە سروشتی و بنەڕەتییە.

## سەرەتایەك دەربارەی زاراوەی مافی دیاریکردنی چارەنووس و شوێنی ئەو لە دیدی ئیسلامیدا

زاراوەی (مافی دیاریکردنی چارەنووس) هەر وەکوو نەتەوایەتی، بەم ناوەرۆکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵی گرتووە، لەکاتی هاتنە خوارەوەی قورئاندا لەناوەندی فکری مرۆڤایەتیدا لەئارادا نەبووە[1].

مافی دیاریکردنی چارەنووسیش زۆر بە سادەیی بریتیە لەوەی نەتەوەیەك بەئازادی بتوانێت جۆرێی سیاسی خۆی دیاری بکات و خۆی کاروباری خۆی بەڕێوە بەرێت و لەژێر راسپێری و چاودێری (وصایە)ی ئەم و ئەودا نەبێت، ئەم مافەش دەکرێت بەچەندین شێوە پەیڕەو بکرێت لەوانەش:

أ) پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی.

ب) یەککگرتنی ئارەزوومەندانە.

ج) چوونە پاڵ دەوڵەتێکیتر.[2]

هەروەك مەسەلەی نەتەوایەتی، تێگەیشتن لەم چەمکەش پێویستی بە لەپێشگرتنی میتۆدێکی گونجاو هەیە بۆ ئەوەی لەدیدێکی ئیسلامیەوە هەڵوێستی لە بەرامبەرەوە دیاری بکەین، کە دەکرێ لەم رووەوە چەند حاڵێکیتر بخەینە پاڵ ئەو ڕێبازەی لەپەیوەندی لەگەڵ تێگەیشتن لە چەمکی ناسیۆنالیزم دیاریمان کرد:

---

[1] پەیامی راستی، ژمارە (٥١) نیسانی ١٩٩٨ .

[2] محمد عبدالجبار، الاسلام والدولة القومية، رۆژنامەی (الحیاة) ژمارە (١٢٦٦٧٠).

أ) تێگەیشتن لە زاراوەکە: مەبەستمان لەمەش بریتیە لەشیکردنەوەی زاراوەکە بۆ رەگەزە سەرەتاییەکانی و جەخت کردنەوە لەوەی کە ئەم رەگەزانە ناوەرۆکێکی پێچەوانەی بەهاو پرەنسیپەئیسلامیەکانیان هەڵنەگرتووە.

ب) دەقە ئیسلامیە دامەزرێنەرەکان و بەهاو رێسا گشتیەکان و مەبەستەکانی شەریعەت، دەکرێن بە پێوەری وەرگرتن یاخود رەتکردنەوەی چەمکەکە.

گەر لەم رووەشەوە سەیری قورئان بکەین هەست بە مەسەلەیەکی زۆر بنەرەتی دەکەین کە ئەویش ئەوەیە مرۆڤ سەروەری خۆیەتی و چارەنووسی خۆی بەدەست خۆیەتی.

ئەم سەروەریەشی لە رێسای جێنشینی و ئەو ئایەتەوە وەرگرتوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: (**اني جاعل في الارض خليفة**)[1].

مرۆڤ ئەو مافەی هەیە کە چارەنووسی خۆی بەرامبەر بەخۆی و کەسانیترو خوای گەورە دیاری بکات (**انا هديناهُ السبيل اِما شاكرا واما كفورا**)[2] ئێمە رێگای راستمان نیشانی مرۆڤ داوە ئەوە دواتر بەئیرادەی خۆیەتی شوێن رێبازی ئێمە دەکەوێت و رێگای سوپاسگوزاری هەڵدەبژێرێت یاخود بێ باوەڕ دەبێت.

ئەم مافەش هەروەك چۆن مافی مرۆڤێکە وەك تاکە کەس، هەر ئاواش مافی گروپ و کۆمەڵەکانیشە، چونکە قورئان مافی هەڵبژادنی (چارەنووس)ی بۆ جۆری مرۆڤ بڕیار داوە، خوای گەورە ئەو مافەی داوە بەمرۆڤ کە چارەنووسی خۆی بەرامبەر بەخۆی و

---

[1] البقرة / ٣٠

[2] الانسان / ٣

خوواو بونەوەر دیاری بکات، تەنها داوا ئەوەیە لە مرۆڤ دەکات هوشیار بێت بەوەی کە ئازادی گرێدراوی لێپرسراویتیە و لەرۆژی دواییدا مرۆڤ دەبێت کۆڵی لێپرسراوێتی هەڵبژاردنەکانی هەڵبگرێت (وقفوهم انهم مسؤلون)[1]

جا کاتێك خوای گەورە لەناسکترین مەسەلەدا کە ئیمان و بیروباوەڕە ئەو مافەی دابێت بەمرۆڤ کەبێ باوەڕ بێت و رەتی سەپاندنی ئایین و بیرو باوەڕی بەسەردا کردبێتەوە (لا اکراه في الدين قد تبين الرشد من الغي) ، (افانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين)[2].

ئیتر لەوە بەدوا دەبێت مەسەلە گەلێکی تەواو مرۆیی و رێژەیی و گۆڕاوی وەك دیاری کردنی دراوسێیەتی سیاسی و ئەو چوارچێوە سیاسی و ئیداریەی خۆی هەڵیدەبژێرێت بۆ ئەوەی ژیانی تێدا بگوزەرێنێ چۆن سەیر بکەین؟ بەدڵنیاییەوە دەبێ مرۆڤەکان لەمەدا کە هەر لە خودی خۆیدا باسی پیرۆزی تێکەڵ نییە، ئازادی تەواویان هەبێت و بۆ هیچ کەس و هێزێ نییە رێگا لە بەردەم دیاریکردنی مافی چارەنووس و بەدیهاتنی ئاواتەکانیان بگرێت.

دیارە هەروەك روونە یەکێ لەو سیفەتانەی مرۆڤی پێ لە زیندەوەرانیتر جیا دەکرێتەوە بوونی ئیرادە و توانای (اختيار)ە، کە ژێرخانی ئازادیە. بۆیە ئەو هێز و کەس و ئایدیۆلۆژیا و دۆخانەی دەخوازن مرۆڤ لە ئیرادەی دابڕنن و ئازادی لێ زەوت بکەن، بەم کارەیان تەنها مرۆڤ ناکەن بە کۆیلە، چونکە کۆیلە چیە جگە لەو کائینەی ئیرادەی لێ زەوت کراوە و توانای قسە کردنی دەربارەی چارەنوسی خۆی

[1] الصافات / ٢٤

[2] يونس/٩٩

لەدەستداوەو، لە بکەرێکی خاوەن را و هەڵوێستەوە، بووە بە بابەت بۆ ئیرادە و خواست و حەزی کەسانیتر و چۆنیان بوێت بەو ئاقارەدا هەڵی دەسورێنن! بەڵکو لەوەش زیاتر پرۆسەی بە ئاژەڵکردنی بەسەردا مومارەسە دەکەن، بەمەش هەرچی پێی بوترێت کەرامەت و شکۆو مەزنی و پیرۆزی هەیە لێی دادەڕنن و عەقڵی پەك دەخەن و هەوڵ دەدەن بەرهەمەکەکانی بەرێوەی بەرن و ژیانێکی بایۆلۆجی داڕنراو لەهەر هەستێکی ئەخلاقی بەرزو تاسەی رۆحی و چێژوەرگرتن لەبوونی ئیرادە بەرێتە سەر.

دیارە ئەم مافەش لانی کەم دوو رەهەندی هەیە.[1]

أ) رەهەندێکی نێگەتیڤانە: واتە هێز و کەسێکیتر دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤدا نەسەپێنێ (لست علیهم بمصیطر)[2] رەتکردنەوەی کۆنترۆڵکردنی مرۆڤ لە لایەن هێزێکیترەوە.

ب) رەهەندێکی پۆزەتیڤ: کە لەوەدا خۆی دەنوێنێ مرۆڤ ماڤی هەڵبژاردنێکی ئازاد و بەرپرسانەی هەبێت.

بەم جۆرە بەپشت بەستن بەو راستی و سەرەتایەی سەرەوە وادەبینین کە هیچ رێگرێکی قورئانی لەئارادا نییە بەرامبەر رازی بوون بە (ماڤی دیاریکردنی چارەنووس) بەو جۆرەی کە فیکری سیاسی هاوچەرخ ناسیویەتی.

---

[1] محمد عبدالجبار، الاسلام والدولە القومیە، رۆژنامەی (الحیاە) ئەلقەی (٣)ژ (١٢٦٦٧).

[2] البقرة (٢٥٦)

چونکە جێگرەوەی ئەم مافە لە سایەی ناسیۆنالیزمدا ستەم و زۆر لێکردن و داپلۆسین و ژێرپێدانی ماف و ئازادیەکانە، کە هەر کەسێ لانیکەمی رێزگرتنی لە لۆژیك و عەقڵ و بەهاکانی ئیسلامی هەبێت، نەك هەرپێیان رازی نابێت، بەڵکو دژایەتیان دەکات و بەپێچەوانەی گیانی عەدالەتخوازی ئیسلامیان لەقەڵەم دەدات.

هەربۆیە بە متمانە و دڵنیاییەکی تەواوە دەڵێین مافیچارەنووس کە رەنگدانەوەی بوونی ئازادی و توانای هەڵبژاردن و رێزگرتنە لەئیرادەی مرۆڤ، مافێکی رەسەنی ئادەمیزادە، بەڵکو مافی بنەڕەتی و دایکەو مافەکانیتر لەمەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش هەروەك بەتاکێك رەوا بینراوە هەروەك ئاماژەمان پێکرد، مافی گەل و نەتەوەو کۆمەڵ و گروپە جۆراوجۆرەکانیشەوە،، چونکە ئەوانیش شتێ نین جگە لە کۆکراوەی مرۆڤەکان.

گروپە مرۆییەکان مافی خۆیانە خۆیان چارەنووس و رێ و جێی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ژیاری خۆیان دیاری بکەن، لەم رووەشەوە لەهەموو رووەکانی یاسایی و سیاسی و مافەکانەوە لەگەڵ یەکدی یەکسانن، کەس مافی زیاتری لەویتر نییەو بۆکەسیشیان نییە ئەم مافە لە گروپێکیتر زەوت بکات، یاخود پێی وابێ دەتوانێ پێی ببەخشێ یاخود لەرێی زەبر و زۆرەوە ئیرادەی خۆی بەسەردا بسەپێنێ.

### سروشتی دەسەڵات و سەرچاوەی ڕەوایەتی لەفیکری سیاسیی ئیسلامیدا

دەوڵەت لە بۆچوونی ئیسلامیدا سروشتێکی دنیایی و مێژوویی هەیە و دەسەڵاتیش بابەتی ڕێکەوتێکە لە نێوان ئەوانەی دەسەڵات دەگرنە دەست لە گەڵ ئەوانەی دەسەڵاتیان بە سەردا پیادە دەکرێت هەوڵ دەدەین ئەم بابەتەش بەم جۆرەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

أ) لە دیدی ئیسلامیدا دەوڵەت دیاردەیەکی مێژوویی و پێداویستی خۆڕێکخستنی سیاسی و بەکۆمەڵ ژیانی مرۆڤەکان بەدیهێناوە و هیچ ڕەهەندێکی ئاسمانی و پیرۆزی نییە، یەکێ لەو شۆڕشە گەورانەش کەبیری یەکتاپەرستی و ئایینە ئاسمانییەکان لەمێژوودا بەسەر بیری مرۆڤایەتیاندا هێناوە هەروەك (د. بورهان غلیۆن) ئاماژەی پێ دەکات[1] بریتیە لە چەسپاندنی ئەو سەرەتایەی کە غەیری خوای گەورە کەس پیرۆز نییەو پیرۆزی دانرێنە لەپادشاو قەڕاڵ و کاهینەکان، کەلەمێژوودا هەندێ جار گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی خۆیان بەخوای خەڵکی بزانن، یاخود لاف ئەوە لێ بدەن کە خوێنی خوایەتی بە شادەمارەکانی جەستەیاندا دێت و دەچێت.[2]

---

[1] برهان غليون، نقد السياسة، الدولة و الدين، الموسسة العربية للدراسات و النشر، المركز الرئيسي بيروت الطبعة الثانية ١٩٩٣، ص٢٦-٢٧

[2] هەروەك (کسرا)کان لاف ئەوەیان لێدەدا.

ب) دەوڵەت و جۆری سیستەمی حوکمڕانی لەدیدی ئیسلامیدا مەسەلە گەلێکن وازیان لێهێنراوە بۆ جوڵەی عەقڵ و (اجتهاد) و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و گۆڕانی کۆمەڵگاکان، قورئان لەم ڕووەوە جگە لەئاماژەکردن بەهەندێ ڕێسای گشتی وەك پاراستنی سەرەتای دادپەروەری و شوراو دژایەتی یەکسانی نەچۆتە ناو هیچ جۆرە وردەکاریەکی سیستەمی سیاسیەوە. شەریعەتی ئیسلامی هیچ تەفسیرێکی دەربارەی ئەو بناغەیە نەخستۆتە ڕوو کە دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێ و ڕاستەوخۆش باسی سیستەمی فەرمانڕەوایی نەکردووە.[1]

پێغەمبەریش (د.خ) سیستەمێکی بۆ ڕژێمی حوکم و حکومەتی ئیسلامی دانەناوە، پێغەمبەر (د.خ) دەقێکی ڕاشکاوی دەربارەی مەسەلەی حوکم لە دوای خۆیەوە بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو ئەم پرسەی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە بۆ شۆرای مسوڵمانان.[2]

کاتێ کۆچی دواییشی کرد، کەسێکی لەجێگای خۆی بۆ جێنشینی دیاری نەکرد، بەڵکو باسی ئەوەشی نەکردووە کە سەرۆکی دەوڵەت دەبێت کێ بێ و بە چ شێوازێك دیاری بکرێت و ئەو مەرجانەی پێویستە تێیدا بن چین و دەوڵەت لە چ دام و دەزگایەك پێکبێت؟[3]

---

[1] الاسلام والدولة العصرية، حسين فوزي النجار، الهيئة المصرية العامة للكتاب سنة (١٩٨٧) القاهرة سنة ١٣٤٤ ص٢٥.

[2] د. حسين ابراهيم، تاريخ الاسلام السياسي، طبعة الدار الجبل، بيروت، مكتبة النهضة المصرية، ص٢٤٩.

[3] محمد سليم العوا، المعالم من النظام السياسي للدولة الاسلامية دار الشروق، ١٩٨٩، ص٦٦.

چونکە مەسەلەی خۆرێکخستنی سیاسی کاری عەقڵەو لەوکارو بارانەی ژیان و دنیایە کە جگە لە ئاستی بەهاو ڕێسا گشتیەکان و ڕۆحێکی عەدالەتخوازو خەڵك پەروەر، پێویستی بە (ئایین) نییە، ئەرکی (ئایین) جەخت کردنە لەسەر دادپەروەری و شوراو ڕێزگرتنی کەرامەتی مرۆڤەکان و دروستکردنی ویژدانێکی زیندوو بۆیان و پەرەدان بەهەستی ئەخلاقی لەناو کۆمەڵگاداو رواندنی تۆوی هەست بەلێپرسراوێتی و ئەمانەت کردنە لەدڵ و دەروونی باوەڕداران و لەوانەش فەرمانرەواکاندا.. ئایین پێمان دەڵێ: ستەم قەدەغەیەو ستەمکاری تاریکیەو مایەی روخانە، دەبێ ئێوە قبوڵی ستەم نەکەن، بەڵام چۆن و بە چ میکانیزم و شێوازێکی خەبات بۆ دژایەتیی ستەم و چەسپاندنی دادپەروەری و سنورداركردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان لەپێش بگرین و چ مەرجێکیان بەسەردا بسەپێنین؟ ئەوە سەرجەمی پەیوەستە بەبیرکردنەوەی ئێمە و بەکارهێنانی عەقڵ و سود وەرگرتن لەو ئەزمون و ڕێ و شوێنە تاقیکراوە باش و کاریگەرانەی کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی کە لە درێژەی خەباتیاندا بۆمرۆڤ و حەق سەروەری و دژایەتیکردنی ستەمکاریی پێی گەیشتوون و بەرهەمیان هێناوە.

ج) بەپشت بەستن بەو دوو خاڵەی سەرەوە هەرچی ئەوەی پێی دەوترێت نمونەی حوکمی ئیسلامیی لەمێژوودا بەئەزمونێکی مێژوویی مسوڵمانەکان دادەنرێ و هیچ پیرۆزی (الزام)ێکی ئایینی بۆ ئێمە نییە و وەك هەر ئەزمونێکیتری بەشەری بۆی دەڕوانین و لەوڕوانگەشەوە تا چەند دەتوانێ

خزمەت بەئەمڕۆی ئێمە بکات، دەیخوێنینەوەو سودی لێ وەردەگرین، واتە بەشێکە لەکەلەپورو لەسیاقی کات و شوێنی خۆیدا دەخوێنرێتەوەو ئەرکی مسوڵمانێك نییە لەم سەردەمەدا هەوڵی زیندوکردنەوەی ئەو نمونە بدات لەسەر ئاستی فیکرو رێکخستنی سیاسی و ئیداری و جۆری بەڕێوەبردنی دەسەڵات، کەواتە ئێمە لەسەر ئاستی مەیدانی و دامەزراوە، نمونەیەکی ستاندارمان نییە تا یەکێ لەو رێگایەوە بیەوێت (ماف چارەنووس) بکاتە دەرەوەی قبوڵ کراوە ئیسلامیەکانەوە.

د) گرێبەند وەك سەرچاوەی رەوایەتی: مەسەلەیەکیتر کە فیقهی دەستوریی ئیسلامیی و فیکری سیاسیی مێژوویی ئیسلامی ناسیویەتی، مەسەلەی (بەیعەت)ە وەك میکانیزمێ بۆ پەیداکردنی رەوایەتی بۆ دەسەڵات، زۆرێ لە زانایان و شەرع ناسان و بیرمەندانی سیاسی لەسەر ئەوە رێکن کە ئەوەی پەیوەندی نێوان فەرمانڕەواو فەرمان بەسەرکراوەکاندا رێك دەخات و سەرچاوەی رەوایەتی پێکدەهێنێ گرێ بەند(عقد)ە.

لەو سۆنگەشەوە کە لەمێژووی ئیسلامیدا زیاتر بەزمانی یاسا و ، بەڵکو یاسای تایبەتیش قسە لەسەر مەسەلە سیاسیەکان کراوە وشەی (بەیعەت) کە بۆ پێناسەکردنی گرێ بەندەکە کراوە لەرووی زمانەوانییەوە لە ریشەی (بیع)ەوە وەرگیراوە، واتە گرێبەستەکەیان بەگرێ بەستێکی ئاسایی کڕین و فرۆشتن چواندوە (لەبەرئەوەی ئەوگرێ بەندەی لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمان بەسەرکراودا دەبەسترێ تارادیەکی زۆر لەگرێبەندی فرۆشتن دەچێت و دەبێت هەردوولا پابەندو وەفاداربن

بەگرێبەندەکەو مەرجەکانییەوە لەبەرئەوە مسوڵمانان ناویان ناوە گرێبەندی بەیعەت).

دکتۆر (محمد انس قاسم جعفر) دەربارەی سروشتی یاسای خەلافەت دەڵێ: "کۆدەنگیەك لەنێوان زاناو شارەزایانی ئیسلامدا هەیە جگە لە (شیعەکان) کە خەلافەت گرێبەندە لەنێوان نوێنەرانی ئوممەت و خەلیفەدا".[1]

گەورە یاساناسی خۆرهەڵاتیش (دکتۆر عبدالرزاق سنهوری) دەربارەی سروشتی گرێبەندی پێشەوایەتی(فەرمانرەوایی) دەڵێت: گرێبەندێکی راستەقینەیە[2] واتە گرێبەندێکە هەموو مەرجە یاساییەکانی تێدایەو لەسەر رەزامەندی دامەزراوەو مەبەستیش تێیدا ئەوەیە ببێتە ئەو سەرچاوەی فەرمانرەوایەتی دەسەڵاتی لێوەر بگرێت، هەر لەم رووەوە ماوەردی دەڵێت: ئەگەر یەکێ داوای لێکرا جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست و ملی نەدا ناچار ناکرێت لەسەر وەرگرتنی، چونکە گرێبەندەکە لەسەر رەزامەندی و هەڵبژاردن (اختیار) راوەستاوە و نابێت زۆر لێکردن و سەپاندنی تێکەڵ ببێت.[3]

کاتێك فەرمانرەوایەتیش گرێبەندیەکی راستەقینە بوو کەدەسەڵاتی گشتی بەفەرمان رەوا هەڵبژێراوە کە دەبەخشێ دوو بەرەنجامی لێدەکەوێتەوە:

---

[1] د. محمد انس قاسم جعفر، النظم السياسية والقانون الدستوري ١٩٩٩، دار النهضة العربية.

[2] د.محمد ضياالدين الريس ، النظريات السياسية الاسلامية، القاهرة، الطبعة السابعة، ص٢١٣.

[3] الماوردي، الاحكام السلطانية الطبعة الاولى، ١٩٨٣، القاهرة، ص٣.

أ) پێویسته ئەو کەسەی هەڵدەبژێرێت ڕەزامەندی تەواوی لەسەر هەڵبژاردنەکەی هەبێت.

ب) هەرشتێك ڕەزامەندی دەنگدەران واتە ئەوانەی فەرمان ڕەوا هەڵدەبژێرن تێك بدات بەتایبەتیش زۆرلێکردن(اکراه) دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی بەرەنجامی هەڵبژاردنەکەو هیچ شوێنەوارێکی لێناکەوێتەوە.[١]

دیارە مەرج نییە ئێستا وشەی (بەیعەت) بەکاربێنین یاخود ئەو میکانیزمە بەکاربێنین کە لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا بەکارهاتووە، هەروەك شارەزایانی مێژووی سیاسیی ئیسلامیی دەزانن لەزۆربەی کاتدا فەرمانڕەوا ناشەرعیەکان کە بەسەرە نێزە و هێز، خۆیان بەسەر کورسی دەسەڵاتدا سەپاندووە، ئەم گرێبەندەیان لەناوەڕۆکی خۆی بەتاڵ کردۆتەوەو تەنها وەکو ڕێ و ڕەسمێکی شکڵی هێشتویانەتەوە، هەروەك چۆن دەسەڵاتە ستەمکارەکانی ناوچەکانی ئێمەو زۆر شوێنیتری جیهانیش لەدەیان ساڵی ڕابردوودا دیموکراسیان لەناوەڕۆکەکەی بەتاڵ کردۆتەوە و لە کۆمەڵێ هەڵبژاردنی شانۆکارانە و دام و دەزگای کارتۆنی بەرواڵەت دیموکراسیدا کورتیان کردۆتەوە، لە ئێستادا باشترین شێواز بۆ جێبەجێکردنی ئەم گرێبەندە و (بەیعەت)ە هەڵبژاردنی گشتی و بەشداری سەرجەم هاووڵاتیانە لە پرۆسەی سیاسی و شەرعیەت دان بەدەسەڵاتی سیاسی گرنگ ئەوەیە کە(عقد) سەرچاوەی شەرعیەتی دەسەڵاتی ئیسلامی پێك دەهێنێت. یاسایەکی گشتیش هەیە

[١] د. عبدالرزاق السنهوري، فقه الخلافة وتطورها لتصبح عصبة الامم الشرقية، القاهرة، الطبعة الثانية، ص١١٩.

هەروەها (البيعة في الفقه الاسلامي واختيار الحاكم في الانظمة السياسية المعاصرة) دراسة مقارنة د. عبدالمنعم احمد سلطان، القاهرة ٢٠٠١ ص ١١٩.

کە دەڵێت: (العقد شريعه المتعاقدين) ئەمەش ئاماژەیە بەو مەرجانەی لە گرێبەندەکەدا هەیە و لایەنەکان بە ئیرادەی ئازادی خۆیان پێوەی پابەند دەبن، هەموو گرێبەندێکیش راستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ (ئیجاب) و (قبول)ی تێدایە هەر فشار و ناچارکردنێکیش کار لەسەر ئیرادە و بڕیاری لایەکی گرێبەندەکە بکات لەروی یاساییەوە ئەو گرێبەندە بەتاڵدەکاتەوە و (فاسد)ی دەکات، بۆیە کاتێ باسی گرێبەند و بوونی دوولایەن و رەزامەندی و ئازادی ئیرادە دەکەین، دەبێت هەندێك لەسەر بێژە و زاراوەیەك بوەستین کە ئەویش ناچارکردن، واتە (الاكراه)ە.

**تیۆری زۆرلێکردن(اکراه) لە فیکری یاسایی ئیسلامیدا و پراکتیزەکردنی بەسەر کێشەی کوردا**

کە باسی ناچارکردنیش دێتەپێشێ واتە لایەکی هاوکێشەکە خاوەن هێز و باڵادەست و ئەویتریان ژێردەستە و لاوازە، ئیرادەیەك پێشەنگەو یەکێکیتریش پاشکۆ.

لەوێدا رەفتار و بڕیاری مرۆڤ رەنگدانەوەی ئاراستەو ئیرادە و هەڵبژاردنی خۆی نابێت، بەڵکو بەرجەستەکەری ئەو هەڕەشە و فشار و زۆرە دەبێت کە لەسەر مرۆڤە، یاخود لەسەر گروپێکی مرۆییە، هەڵبەت زانایانی ئیسلامی و شەرعناسان لەبواری یاسای تایبەت و یاسای سزادان و تاواندا خاوەنی چەندین تیۆری جۆراوجۆرن و بە دور و درێژی قسەیان لەسەر (اکراه) لە پەیوەندی بە لابردنی سزا یاساییەکان یان لەئەستۆگرتنی یاخود نەگرتنی لێپرسراوێتی مەدەنی لەئاقار ئەو رەفتارانەی

لەحاڵەتی ناچارکردنی مرۆڤدا دەنوێنرێن کردووە. هەروەها بەدرێژی باسیان لەوە کردووە چی بە (اکراه) دادەنرێت و چەند جۆرە و هەریەکەیان چەند کاریگەریان لەسەر مۆڵەتپێدانی کارولابردنی حەرامێ یاخود جۆرێك لە سزادان و لێپرسراوێتی مەدەنی هەیە.[1]

ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێ لەوەی ئەو زانایانە لەبواری رێکخستنی پەیوەندی تاکەکان و یاسای تایبەتیدا باسیان کردووە بگوێزینەوە بۆ بواری یاسای دەستوری و بواری سیاسی و پەیوەندی نێوان گروپ و نەتەوەکان.

یاساناسانی ئیسلامی هەڕەشەکردن بەسزادان بە ناچارکردن (اکراه) دەزانن، کە ئەگەر ئەو دەربڕینە وەربگێڕێتە سەر زمانی یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ دەبێتە (هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز) لێرەشەوە ئەگەر مێژووی هاوچەرخی کوردستان لەنێوان قەوارە هاوچەرخەکاندا بخوێنینەوە، دەبینین تۆماری زۆر لێکردنێکی بەردەوامە، بەڵکو مەسەلەکە لەپەیوەندی بەکوردەوە لە هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز تێپەڕیوەو سەری لە بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوو ئەنجامدانی تاوانی ژینۆسایدەوە دەرچووە.

(اکراه) لەبواری یاسای تاواندا سزا لادەبات (دیارە لەو تاوانانەی کە یاسا ناسان باسیان کردووە)، چونکە رەفتارە تاوانکاریەکەی مەبەست واتە (قصد)ی لەپشتەوە نەبووە، بەڵام لەبواری سیاسیدا رەوایەتی لەرەفتارێکی دیاریکراو دەسێنێتەوەو

[1] بۆ تێگەیشتن لە تیۆرەکانی (اکراه) لە بواری یاسای سزادانی ئیسلامی و هاوچەرخ بگەڕێوە بۆ عبدالقادر عودة، التشريع الجنائي الاسلامي مقارنا بالقانون الوضعي، الجزء الاول، بيروت، دار الكتب العربية ص٥٦٣، و لاپەڕەکانی دوایی.

لەناوەرۆکی خۆی بەتاڵی دەکاتەوە،، چونکە لەم کایەدا ناچارکردن پەیوەندی بەماف و ئازادی و ئیرادەی مرۆڤەوە هەیە.

بۆ نموونە کاتی خۆی و لەسەروبەندی پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقدا کوردستانی باشور بەعێراقی عەرەبییەوە لکێنراوە، بێ ئەوەی پرس بە کۆمەڵگەکەی و دانیشتوانە رەسەنەکەی بکرێت، بەڵکو ئەم کارە بەزۆر و ناچارکردن ئەنجام دراوە و جەبرە سیاسییەکان دەوریان تێدابینیوە.

واتە ئەگەر گەلی کوردستان بیتوانیایە ئەو پرۆژە رەتکاتەوەو ئازاد بوایە لەوەی داخۆ دەیەوێت لەگەڵ عێراقی تازە کەوێ یاخود خۆی قەوارەیەکی سەربەخۆی هەبێت و لەو چوارچێوەشدا گەلی کورد لەسەراپای نیشتمانەکەیا لەچوارچێوەی قەوارەیەکی تایبەت بەخۆی خۆی رێکخات، راستیە مێژووییەکان و خەباتی دورودرێژی کورد و ناخی شاراوەی مرۆڤی کورد پێمان دەڵێن، کە بەدڵنیاییەوە دووەمی هەڵدەبژارد. کورد هەمیشە (اکراه)ی ماددی و مەعنەوی لەسەر بووە بۆ ئەوەی مل بەژیان لەو چوارچێوانەدا بدات، کە ناسیونالیزمە سەردەستەکان و نەخشە کۆلۆنیالیستەکان بۆیان دیاری کردووە.

مەسەلەی (اکراه) و ناچارکردنی بەردەوامی کوردیش چەندین بەرەنجامی‌تری لێدەکەوێتەوە لەوانەش:

أ) لەروانگەی شەریعەتی ئیسلامیەوە هەموو ئەو سەربازو چەکدارانەی بەشداربوون لەکوشتنی مرۆڤی کورد لەکوردستاندا لەرووی یاساییەوە لێپرسراوێتی (جنائی)یان لەئەستۆدایە،، چونکە زۆربەی هەرە زۆری

شەرعزانەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر یەکێ زۆری لێکرا یەکێکیتر بکوژێ نابێ ئەو کارە ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی گیانی خۆی رزگار بکات، لێرەوە جێبەجێکردنی فەرمانە سەربازیەکان لەپەیوەندی بە کوشتنی خەڵکی مەدەنی کوردستانەوە لێپرسراوێتی لەئەستۆی ئەفسەرو سەربازو چەکدارەکاندایە دیارە بەپلەی یەکەم لە ئەستۆی ئەوانە دایە کە لە پشت دەرکردنی فەرمانەکانەوەن، بەڵام ئەگەر لە چوارچێوەی سوپایەکدا کاری جیاکردنەوی یەکەیەکەی بکوژەکان کارێکی ئاسان نەبێت و سەربازانی سوپاکەش بەگشتی بەپیاوکوژ نەناسرێن، ئەوا لانی کەم ئەو سوپایەو دەوڵەت و سەرانی لێپرسراوێتی (جنائی)و مەدەنی تەواویان دەکەوێتە ئەستۆ.

ب) لەو تاوانەشدا کە ناگاتە تیابردنی ئەندامی یەکێکیتر یاخود کوشتن، کاتێ مرۆڤ لەژێر باری ناچاریدا کارێك دەکات وەك تیابردنی (ماڵ)ی یەکێکیتر ئەوا ئەو رەفتارەی لێپرسراوێتی مەدەنی لەگەردن دانا ماڵێ، بەڵکو دەبێت دواتر ئەو ماڵە بۆ ئەو کەسە ببژێرێت، لێرەشەوە کورد مافی خۆیەتی داوای قەرەبوکردنەوەی هەموو ئەو زەرەرو زیانانە بکات کە لێی دراوە.

ج) کاتێ کورد لەژێر باری ناچاری و نەبوونی رێگایەکیتر بۆ داواکردنی مافەکانی و رێزگرتن لەئیرادەی پەنای بردۆتە بەر چەك و بەرگریکردنی مادی لەخۆی لێپرسراوێتی یاسایی ناکەوێتە ئەستۆ، مەگەر لە مەسەلەیەکدا کە ئەخلاقیاتی جەنگ لە شەریعەتی ئیسلامی و یاسای مرۆیی نێودەوڵەتیدا قەدەغەی کردبێت (رفع القلم عن ثلاث... وما استكره عليه).

د) هەموو ئەوانەی لە دوای پێکهێنانی ئەم قەوارانەوە وەك نوێنەری کورد ناسراون بەتایبەتیش لەلایەن دەسەڵاتە خۆسەپێنەرەکانەوە رەفتار و بڕیارەکانیان بەناوی کوردوە هیچ شەرعیەتێکی یاسایی نییە، چونکە نوێنەرایەتی کردنەکە رەنگدانەوەی دەسەڵاتپێدانێکی میللی ئازاد نەبووە، بەڵکو نوێنەرایەتی دامەزراوە سەرکوتکەرو دۆخە ستەمکارەکان و ئایدیۆلۆژیا هەژمونخوازەکان بووە.

ه) ئەگەر (اکراه) و ناچارکردن لەم نێوەندەدا و لە پەیوەندی بە مەسەلەی کوردەوە رەوایەتیەکی هەبێت ئەوا لەو رووەوەیە کە فشار بخرێتە سەر ئەو رژێمانەی تاکو ئێستا رێگربوون و رێگرن لەوەی نەتەوەی کورد بەئیرادەی ئازادی خۆی رێوشوێنی خۆی دیار بکات و کاتێ لەم پێناوەشدا تێکۆشاوە لەگەڵ توندترین سەرکوت و کوشت و بڕین و چەوساندنەوە رووبەروو بۆتەوە.

واتە دەستێوەردانی مرۆڤ دۆستانە و بەکارهێنانی فشاری دیپلۆماسی و سیاسی و ئابوری بۆ ئەوەی ئەم رژێم یاخود ئەو رژێم ناچار بکەن دەست لە چەوساندنەوەی بەشێ لە گەلەکەی هەڵبگرێت و چیتر لەژێر چەکمەی رەشی زۆرداریدا ناچاری نەکات رۆڵەکانی پێچەوانەی خواست و هیواو بیرکردنەوەی خۆیان رۆژەکانی ژیانیان بەسەربەرن.

ئەوەی ئەرکی گەلانی مسولمانیشە، (ئەگەر لەپێگەی ئەرکە ئیسلامیەکانی خۆیانەوە هەڵوێستە سیاسیەکانیان دیاری بکەن)، پشتیوانی کردنە لە گەلی کوردستان بەرامبەر ئەو دەسەڵاتە ناشەرعیانەی دەستدرێژی دەکەنە سەری

و لەمافەکانی بێ بەشیان کردوەو بێ بەشی دەکەن، ئەویش بەگوێرەی ئەو ئایەتەی سورەتی (الحجرات) کە دەفەمورێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ).[1] هەڵبەت (طائفة) بە شێوەیەکی سەرەکی لەم سەردەمەدا بەمانا سیاسیەکەی بریتیە لە گەل و نەتەوەکان، گەرچی ئەمە رێگا لەوە ناگرێ مانای لەوە بچوکتریشی هەبێت.

ئایەتەکە کەبەشێ لە یاسای گشتی ئیسلامی و ئەرکی گەلانی مسوڵمان لە بەرامبەر دوو لایەنی بەشەڕهاتووی مسوڵماندا دیاری دەکات، زۆر بەروونی ئەوە دەخاتە روو کە هەڵوێستی تەماشاکردن و گوێ پێ نەدان هەڵوێستێکی نائیسلامی و رەتکراوەو ئیدانەکراوە،، چونکە کێشەی گەل و گروپێکی مسوڵمان دەبێت کێشەی سەرجەم گەلانی مسوڵمان بێت، هەروەك چۆن لە ئێستادا دەبێت کێشەی خێزانی مرۆڤایەتیش بێت.

یەکەم داواکاری لەو کۆمەڵگا مسوڵمانەی بەشداری شەرەکە نییە هەوڵدانە بۆ ئاشتەوایی و کۆتایی هێنان بەشەڕەکە، بەڵام نەك بەهەر جۆرێك بێت، بەڵکو دەبێت ئاشتیەکە لەسەر بناغەی (دادپەروەری) بێت، واتە ئیرادەی لایەنێکی تێدا نەسەپێنرێت، بەتایبەتیش بەسەر لایەنە لاوازو ستەملێکراوەکاندا، واتە نابێ ئەوەی جەنگێکی ناعادیلانە پێی نەکراوە بەئاشتیەکی سەپاوو ناعادیلانەدا بێتەدی.

---

[1] الحجرات/٩.

چونکە ئەگەر وابوو لەڕوویەکەوە پیرۆزبایی لە زوڵم و زۆرداری کراوەو ئیش بەو ڕێسایەشکراوە کە دەڵێ کێ هێزی هەیە حەق لەگەڵ ئەوەدایە، لەلایەکیترەوە ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤایەتی سەلماندوویەتی گەر ئاشتی لەسەر بناغەی دادپەروەری دانەمەزرێت، ئەگەری ئەوە لەئارادایە دووبارە ئاگری شەڕەکە کڵپە بسێنێتەوە،، چونکە ناهاوسەنگی هێزەکان و ملدانی ناچاری لەو کاتە لەپشت ڕازی بوونە بەکۆتایی هێنانی شەڕەکان، نەك قەناعەتی ناوەکی لایەنەکان بەتایبەتیش لایەنە لاوازو تێکشکاوەکان.

خۆ ئەگەر لایەنێ ڕازی نەبوو بەئاشتیەکی دادپەروەردانەو بەردەوام بوو لەسەر جەنگ و دەستدرێژی کردن بۆ سەر لایەنی بەرامبەر، ئەوکاتە دەبێت بێ لایەنەکانیش لەدژی لایەنی دەستدرێژیکار بچنە ناو شەڕەکەوە و بەزۆر ناچاری بکەن بەگەڕانەوە و ڕازی بوون بەشتێ کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە و بڕیاری لەسەر داوە ئەویش ئاشتیەکی دادپەروەرانە و وازهێنانە لە لۆژیك و خەونی دەستدرێژی کاری و فراوانخوازی و گەڕانەوەیە بۆ پەیوەندییەك کە دادپەروەری و برایەتی باوەڕداران دەیخوازێت.

دوای ئەوەش کەناچار بەکۆڵدان دەکرێ دووبارە مەسەلەی ئاشتی دادپەروەرانە لەنێوان دوولایەنە بنەڕەتیەکەدا سەرهەڵدەداتەوە، گەر لەم ڕوانگەوە سەیری کێشەی گەلی کوردستان بکەین هەموو دەزانین کە بۆدەیان ساڵ ڕژێمی دەسەڵاتدار لەعێراقدا شەڕی گەلێکی بێ دیفاع و ستەملێکراوی وەك کوردی کردووە گەلی کوردیش ناچار شۆڕشی بەرپاکردووەو بەرگری لەخۆی کردووە، لێرەشەوە ئەرکی

جیهانی ئیسلامیی و گەلانی مسوڵمانیش (گەر باس لە ئیسلام بێت لەم نێوەندەدا) دەبوایە ئەوە بێت کە پشتیوانی لەگەلی کوردستان بکەن، وەك لایەنێکی دەستدرێژی بۆسەر کراوی ستەملێکراوی گوێ بۆ نەگیراو، هەروەها وەکو لایەنێ کە هەمیشە ئامادە بووە لەرێی گفتوگۆ و رێگا چارەی ئاشتیانەوە کێشەکەی لەگەڵ دەسەڵاتـدارانی ناوەندا بخات بەلایەکدا، بەڵام ئەوان ئەم داوایەیان بەئاگرو ئاسن و نکوڵیکردن لە مافەکانی وەڵام داوەتەوە.

ئێمە لێرەدا بەکورتی هەندێ لەسەر چەمکی ناچار کردن یاخود زۆر لێکردن (الاکراه) وەستاین،، چونکە پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ بیرۆکەی گرێبەندا وەك سەرچاوەیەك بۆپێدانی رەوایەتی و دامەزراندنی پایەکانی دەسەڵاتێکی دادپەروەرانە هەیە.

ئەوەی رونیش بۆوە ئەوەیە کە پێویستە مرۆڤەکان، گروپەکان، گەلەکان، بەدوور لەهەر زۆر لێکردنێك و، بەئیرادەی ئازادی خۆیان بچنە ناو پەیوەندی و چوارچێوە سیاسیەکانەوە، نابێ رژێم و مۆدیلێ لە دەسەڵات و فەرمانڕەواییان بەسەردا بسەپێنرێت، کە بەدڵی ئەوان نەبێت و رەنگدانەوەی ویست و بەرژەوەندی و ئاراستەی گشتیان نییە.

(شورا)ش وەك بەها و بنەمایەکی ئیسلامیی رەسەن ئەگەر مانایەکی هەبێت هەر لەم نێوەندەدایە و پەیوەستە بە رەتکردنەوەی خۆ سەپاندن و زۆر لێکردن و بە سەنتەرکردنەوەی رەزامەندی و ئازادیە لە پرۆسە و کاری سیاسی و دیاری کردنی چارەنووسدا.

هەروەها (برایەتی ئیسلامیش گەر مانایەك لەم میانەدا پەیدا بکات هەر لەم سۆنگەوەیە کە پێغەمبەر دەفەرموێت: (المسلم اخو المسلم لایسلمه ولایظلمه ولا یخذله بحسب المرء من الشران یحقر اخاه المسلم).

مسوڵمان برای مسوڵمانە، نایدات بەدەست دوژمنەوە، ستەمی لێ ناکات و سەرشۆڕی ناکات، هەروەها دەفەرموێت: (کل المسلم علي المسلم حرام دمه وماله وعرضه) خوێن و ماڵ و ناموسی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان حەرامە، ئەم دەقانە و بەرەنجامەکانی برایەتی و چەندین دەق و سەرەتایتر، دەبێت لەسایەی پەیوەندییەکی ناهاوسەنگی پڕ لە چەوساندنەوەو بوونی باڵادەستیی ناسیۆنالیستی-دا چۆن بتوانن پاتاییەك بۆ درەوشانەوە و جێبەجێ بوون بدۆزنەوە؟ بەتایبەتیش لەسەر ئاستی پەیوەندی نێوان گەل و نەتەوە مسوڵمانەکانی ناوچەکەدا.

ئەگەر پەیوەندیەکان لەسەر بناغەی هەق و داد پەروەری و مروەت و رێزگرتن لە ویست و کەرامەت و ماف و ئازادی یەکتر بنیادنرابێت، دەبێت گەوهەرو مرواری برایەتی لە گۆمی لیخنی خۆبەزلزانینی ناسیونالیستی و پێشێلکردنی مافی بەشێ لە براکان و سپاردنیان بەدنیای دڵڕەقی و فەرامۆشی و بێ مافیدا بە چ شێوەیەك بدۆزرێتەوە؟

ئایا ئەگەر گەلی کوردیش وەك نەتەوەیەك و گەلی کوردستان بەگشتی لە دەیانساڵی رابردوودا خاوەن قەوارەی نەتەوەیی خۆی بوایە و لەو سۆنگەوە لە ستەم و چەوساندنەوە بەدور بوایە سەدان جار بۆ برایەتی گەلانی ناوچەکەو ئارامی و جێگیری و پێشکەوتنی سیاسی و ئابوریان باشتر نەدەبوو؟ بەداخەوە ئەو لۆژیك و

ئایدیۆلۆژیانەی لەدەیان ساڵی رابردوودا رەوایەتیان داوە بە بێبەشکردنی گەلی کوردستان لە مافی چارەنووس، هەڵگری دیدێکی راستەقینە تەنانەت بۆ بەرژەوەندییە ژیانییە دور مەوداکانی ئەو نەتەوانە خۆشیان نەبوون، گەر بشگەڕێتەوە بۆ باسکردنی (گرێبەند) وەك سەرچاوەی بەدەستهێنانی رەوایەتی سیاسی لە نمونەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا لانی کەم لەسەر ئاستی تیۆریداو (اکراه)یش وەك ڤایرۆسی دژ بەو سەرەتایە، پێویستە ئەو گرێبەند و ناچارکردنە لە پەیوەندی بەکورد و قەوارەکانی ناوچەکە لە دوو ئاستدا تێبگەین:

أ) لەسەر ئاستی ساتەوەختی پێکهێنانی قەوارەکان، لەو سۆنگەوە کە هەندێ لە یاساناسان (گرێبەند) لەبواری یاسای دەستوری و فیکری سیاسیدا دەکەن بەدوو جۆرەوە، یەکەمیان گرێبەندی کۆمەڵایەتی کە بناغەی دامەزراندنی دەوڵەت و دەسەڵات شی دەکاتەوە.

ب) بریتیە لە گرێبەندی سیاسی کە پەیوەستە بەرێکخستنی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو هاووڵاتیان و دەسەڵاتی لەئارادابوو، دەبێ پرسیار لە خودی قەوارەی دەوڵەت بکەن،، چونکە سەرەنجام موماره‌سەی دەسەڵات لەناو دەوڵەتێکی هاوچەرخداو، لە چوارچێوەی سنورە نێودەوڵەتیە دانپیانراوەکانی ئەودا جێبەجێ دەکرێت.

بائێستا بپرسین کە ئایا لەکاتی دروستبوونی ئەم قەوارانەدا پرس بەگەلان و پێکهاتەکانی ناویان کراوە؟ داخۆ ئیرادەی ئازادی گەلان و گروپەکان لەپشتیانەوە وەستاوە؟ یاخود بەپێچەوانەوە مەرامی‌تری دوور لەخواستی گەلانی ناوچەکەو

پێکهاتەکان لەپشت مەسەلەکەوەن و لەدروستکردن و دامەزراندنیاندا راستیە مێژوویی و جوگرافی و نەتەوەییەکان رەچاو نەکراون؟ واتە ئەوەی رەچاوکراوە بەرەژەوەندی گەلانی ناوچەکە نەبووە، ئیرادەو خواستی ئەوان نەبووە، بەڵکو بەرژەوەندی و دیدێکی دەرەوەی ئەوان (تحكم)ی بەسەر پرۆسەی دارشتنەوەی ناوچەکەو شێوەی شکڵگرتنی قەوارەکاندا کردووە.

هەربۆیە ئەوانەی بەناوی ئیسلامەوە یاخود بەناوی ناسیۆنالیزمەوە بەرگری لە مانەوەی ئەم واقیعەی ئێستاو ئەم نەخشە جوگرافی و دابەشکردنە سیاسییە دەکەن، لەناوەرۆکدا بەرگری لەو کەلەپورو ئاسەوارە دەکەن کە کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایی لە سەدەی رابردوودا بۆ گەلانی ناوچەکە بەمیراتی بەجێی هێشتووە، بەرگری لە چەسپاندن و درێژەدان بەو قەوارەو شێوە رێکخستنەوەی ناوچەکە دەکەن، لە دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کە بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەو سەردەمە خواستوویەتی و سەپاندوویەتی، چونکە ئیسلام و بەشێ لە گەلانی ناوچەکەش لەرێگەی دام و دەزگاکانی خۆیانەوە بەگوێرەی نەخشەیەکی دیاریکراو، ئەم قەوارانەیان بەم شێوە دروست نەکردووە، کە دواتر بوونە دیفاکتۆی یاساو سیستمی نێو دەوڵەتی، لەسەدەی رابردوو لەسایەی کۆمەڵەی گەلان و نەتەوە یەکگرتوەکان و ململانێ جیهانییەکان و پۆل بەندیەکان و جەنگی سارددا پیرۆزییان پێدراوە وەك قەوارەی شەرعی ، بەڵکو وەك تاکە نوێنەری شەرعیی گەلان مامەڵەیان لەگەڵ کراو بەبیانووی دەست نەخستنە ناو کاروباری ناوخۆی دەوڵەتانیشەوە رێگا درا دنیایەك لەخوێنی بەناحەق برژێ و ناوچەکەش چەندین کارەسات و شەرِوناکۆکی بەخۆیەوە ببینێ.

ئەوانەی پەرۆشی ئیسلام و دوارۆژی ئیسلامیی و برایەتی گەلانی ناوچەکەن لێیان چاوەڕێ دەکرێت توانا ماددی و رەمزیەکانی ئیسلام و گەلانی مسوڵمان بەکاربێنن بۆداڕنینی ئەو پیرۆزیەی پەیماننامەی نەتەوە یەککگرتوەکان و یاسای گشتی نێودەوڵەتی بەم قەوارە دەستکردو ناهارمۆنی و ناسروشتیانەیان بەخشیوەو، رایبگەیەنن کە جگە لە خوا تەنها مرۆڤ وەك (جۆر)و مافەکانی پیرۆزن، هەوڵی گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ بونیادی پەیوەندی نێوان گەلانی ناوچەکە بدەن و کار بۆ سڕینەوەی ئاسەوارەکانی کۆلۆنیالیزم بکەن، ئەویش لەرێی گێڕانەوەی ئیرادە بۆ نەتەوەو گەلەکان و داننان بە راستیە مێژوویی و واقیعی و نەتەوەییەکان و ئازایەتی نواندن لەرێی داننان بە مافە رەواکان و گیروگرفتەکان و چارەسەرکردنیان.

### مافی چارەنوس و تێگەیشتن و فۆرمێکی نوێ بۆ یەکیەتی ئیسلامی

رەنگە یەکێ لەو گومانانەیتر کە لەلایەن هەندێ ناوەندەوە بخرێنە سەر سەرەتای مافی چارەنووس، وروژاندنی رێسای یەکیەتی جیهانی ئیسلامیی بێت.

بۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەین کەمێ باس لە پەیوەندی ئەم مەسەلەیە بەمافی چارەنووسەوە بکەین، واتە مەسەلەی وروژاندنی یەکیەتی قەوارەی ئیسلامیی و پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە ئیسلام داوا لە مسوڵمانان دەکات کە هەموویان یەککگرتوو بن و لەچوارچێوەی دەوڵەت و قەوارەیەکی سیاسی هاوبەشدا بژین.

هەڵبەت دەبێ بوترێت بەسەیرکردنی واقیعی لەئارادا بووی جیهانی ئیسلامی و بوونی زیاتر لە (٧٠) ئەندامی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی و جۆرەها ناکۆکی و

ناتەبایی لەنێوان ئەم دەوڵەتانەو لاوازی هارکاری لەنێوانیانداو هەندێ جار بەشداری کردن لە پیلانگێڕان دژ بەیەکتر، هەموو ئەمانە باسێکی لەم جۆرە تا رادەیەکی بەرچاو دەکەن بە بابەتێکی تیۆری.

واتە بابەتێك کە هێندەی یاداوەری رابردوو خەونێکی دوور مەودای لەپشتەوەیە ئەوەندە ئەگەرێك نییە لەبەردەم وڵاتانی ناوچەکەدا، بۆیە ئەگەر هێزو کەس و ناوەندو دەوڵەتێك لەم روانگەوە دژایەتی مافی چارەنووسی گەلی کوردستان بکات، دەبێ لەوە تێبگەین کە داوایەکی لەم جۆرە بەئیسلام ئارایشتکراوە لەناوەرۆکدا دیدێکی ناسیۆنالیستانەی لەپشتەوەیە کە یەکیەتی بەزۆر بنیاتنراوی خاکی ئەم وڵاتانە بەپیرۆز دەزانێ و لەو نێوەندەشدا هەندێ جار پەنا دەباتە بەر بەهرەبردنی خراپ لەچەمك و دروشمە ئیسلامیەکان، دەنا جگە لەوەی کە دیدی ئیسلامیی بەو جۆرەی رونمان کردەوە یەکیەتی خاکی هیچ قەوارەیەك بەپیرۆز نازانێ، بەڵکو بە مەسەلەیەکی رێژەیی و گۆڕاوو مرۆیی روتی دەزانێ، کەسیش ناتوانێ خاکی قەوارەیەك لەم قەوارانە یەکسان بکات بەخاکی ئیسلامیی، یاخود گەلێکی سایەی ئەم دەسەڵاتانەی ناوچەکە بکات بەئوممەتی ئیسلامی و لەوێوە لاف ئەوە لێ بدات کە ئەگەر گەلی کوردستان یاخود هەر نەتەوەیەکی دی، داوای مافی چارەنووس و پێکهێنانی قەوارەی نەتەوەیی خۆیان بکەن، بەیاخی و هێزێك لەقەڵەم بدرێت کە دەیانەوێت ئوممەتی ئیسلامی پارچە پارچە بکەن، یاخود خاکی ئیسلامیی دابەش بکەن!

سەرەڕای ئەمە ئەوەی واقیع و ڕاستیەکان سەبارەت بەکورد دەیخەنە ڕوو تەواو پێچەوانەیە، چونکە ئەوە کۆلۆنیالیزم و ناسیۆنالیزمەکانی ناوچەکەیە خاکی کوردستانیان دابەش کردووەو نەتەوەی کوردیان پارچە پارچە کردووەو بەمەش مافی یەکسان بوونیان لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێی ڕەتکردۆتەوەو دووچاری جۆرەها چەرمەسەری و ستەم لێ چوویی و بێ بەشی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیان کردووە.

قسەکردنی ڕاستەوخۆش لەسەر بابەتەکە لەهەرسێ ڕووی تیۆری و مێژوویی و واقیعیەوە دەمانگەیەنێتە ئەو بەرەنجامەی کە بانگەشەکردن بۆ مافی چارەنووسی نەتەوەیەك لەواقیعی ئێستای جیهانی ئیسلامییدا دژایەتی لەگەڵ هیچ سەرەتایەکی ئیسلامییدا نییە، بەڵکو لەهەندێ ڕووەوە داوایەکی ئیسلامییە ئەویش لەو سۆنگەوە کەکارێکی لەو جۆرە ستەمی نەتەوایەتی لەسەر هەندێ نەتەوە ناهێڵێ و سەرچاوەی نائارامی و ناکۆکی لەنێوان گەلانی مسوڵمانی ناوچەکەدا کەمتر دەکاتەوەو بناغەیەکی پتەوترو پڕ لە متمانەتر بۆ دامەزراندنی پەیوەندییەکی برایانەو دۆستانەو هاریکاری هەمەلایەنە دادمەزرێنێ.

لەلایەکیترەوە مافی چارەنووس پێچەوانەی بانگەشەی ئیسلام نییە بۆ یەکیەتی و یەکڕیزی و هاوکاری مسوڵمانان،، چونکە ئەم یەکڕیزیە مەرج نییە تەنها بەبوونی قەوارەیەکی سیاسی یەکگرتوو بێتە دی، کە لە واقیعی ئەمڕۆی جیهانی ئیسلامیدا نیمچە ئەستەمە، هەروەها مافی چارەنووسیش لە سایەی دۆخێکی ئازادو دیموکراسی و لەسایەی شەراکەتێکی ڕاستەقینەدا مەرج نییە هەموو کاتێك مانای پێکهێنانی

قەوارەی سەربەخۆ بگەیەنێت،، چونکە یەکیەتی ئارەزوومەندانەش فۆرمێکی‌تری مافی چارەنووسە.

لەروویەکی‌ترەوە ئەگەر یەکیەتیەك لەسەر بناغەی ڕێزگرتنی ئیرادەو هەڵبژاردنی ئازادی مرۆڤ و گروپەکان بنیات نەنرابێت، بەڵکو بەزۆر بەسەر پێکهاتەکانی دەوڵەتێکدا سەپێنرابێت، لەناوەرۆکدا دژی خودی پرەنسیپ و بەهاو ئامانجە باڵا ئیسلامیەکانە، بەو جۆرەی کە لە پێشەوە روونمان کردەوە، لێرەشەوە ئەو پرسیارە رەوایەتی پەیدا دەکا کە دەڵێ: ئایا دەشێ دەسەڵات و قەوارەیەك بەئیسلامیی لەقەڵەم بدرێت و لەهەمان کاتدا پێچەوانەی ئاراستەو بەها ئیسلامیەکان بجوڵێتەوەو سەرەتاکانی ئەو لەبەرچاو نەگرێت؟

لەلایەکی دیکەوە مێژوو سەلماندوویەتی کەهەموو یەکیەتیەکی زۆرەملێ لەگەڵ ئەوەدا کە لەواقیعدا یەکسانە بەشێواندنی مانای یەکیەتی تۆوی چەندین ناکۆکی و قەیران و کێشەی لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووەو لەهەر دەرفەتێکدا هەل و مەرجی گونجاوبێت سەرجەم ئەو کێشەو قەیرانانە خۆیان نمایش دەکەن و دەتەقنەوە، بەمەش نەك هەر یەکیەتییە ساختەکە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵکو کارەسات و وێرانیش لەدوای خۆی جێ دەهێڵێت، کەواتە یەکیەتیەك ئیسلامییەو هەروەها ریشەدارو بەردەوام دەبێت، کە ساختە و رواڵەتی نەبێت، لەسەر ئیرادەی ئازاد و ئارەزوومەندێتی و بوونی گیانی بەیەکەوە ژیانێکی راستەقینە دامەزرابێت و پایەکانی داڕێژرابێت، بۆیە ئەوانەی خەونی یەکیەتی ئیسلامیان لەسەردایە دەبێ پێش هەموو شتێ لەچوارچێوەی بەها ئیسلامیی و رێسا گشتیەکانی و مەبەستەکانی لەژیاندا بیر

بکەنەوە، نەك لە سایەی فەزای ئیمپراتۆریە مێژووییە بەسەرچوەکاندا، دەبێ ڕەچاوی واقیعیی جیهانی ئیسلامیی بکەن کە چۆن بۆ دەیان قەوارەی تازەی دامەزراو لەسەر شەرعیەتی ناسیۆنالیستی یاخود تێکەڵەیەك لەگەڵ ئەودا دابەش بووەو هەریەکەش لەم قەوارانە وەك کەسێتیەکی یاسای نێودەوڵەتی ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکانە، بۆیە ناکرێت چارەسەری گیروگرفتە نەتەوەییەکان و غەیری ئەوانیش هەڵپەسێردرێت تاکو ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو خەونە بەدی دێت کە هیچ ئاماژەیەك نییە مژدەی ئەوەمان پێ بدات لەدوارۆژێکی نزیکدا بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە بەرگی جێبەجێ بوونی دەکرێتەبەر.

یەکیەتیەکی لەو جۆرە شانسێکی هەبێت بۆهاتنەبوون بە بەدڵنیایەوە بە ڕێی چارەسەرکردنی گرفتەکان و لەوانەش گرفتە نەتەوەییەکانی ئەم جیهانەدا تێ دەپەڕێت، دەبێت سەرەتا لایەنە پەیوەندیدارو گەلان و نەتەوەکان کە لەرووی مێژوویی و عەقیدیەوە ئوممەتی ئیسلام پێکدەهێنن لەرووی سیاسی و نەتەوەییەوە هەست بەیەکسانی و ڕێزی وەك یەك بکەن و بەتەواوی لە بەرامبەر شوناسی خۆیان و مافەکانیان دڵنیا ببنەوە، ئەوکاتە پێویستیەکانی جیهانی ئەمڕۆ کە خوازیاری پێکهێنانی کوتلەی گەورەو مێژوویی ئابوری و سیاسی و ژیاری و سەربازیەو، بەدیهاتنی بەرژەوەندیە هاوبەشە باڵاکانیان پاڵیان پێوەنێت بۆبیرکردنەوە لەدۆزینەوەی میکانیزمێك بۆکاری هاوبەش و فۆرمێك بۆ یەکبوون.

ڕەنگە لێرەدا یەکێ بڵێ مێڵی گشتی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەمێژوودا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە مسوڵمانان دەبێت یەك دەوڵەتیان هەبێت، ئەم دیدە ئەوەشی لەناودا شاراوەتەوە کە بوونی یەك دەوڵەت بکات بە ئەرکێکی ئاینی، بەڵام

لەراستیدا لەگەڵ ئەوەی کە دیدی ئیسلامی جەخت لەسەر یەکیەتی مسوڵمانان دەکاتەوە، هەڵوێستی ئیسلامی لەمەر کێشەی فرەدەوڵەتی لەناو ئوممەتی ئیسلامییدا مەسەلەیەکی مێژووییە نەك (تشریع)ی، ئەوەی هەڵوێستەکەی دیاری کردووە دۆخە مێژوویەکەو (ملابسات)ە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بووە، لەراستیدا هەر لەسەرتای ئیسلامەوەو راستەوخۆ دوای کۆچی پێغەمبەر (د.خ) مشتومڕ لەنێوان مسوڵماناندا سەری هەڵدا کە ئایا دەشێ مسوڵمانان لەدەوڵەتێ زیاتریان هەبێت.؟

بەڵام لەبەر ئەوەی مسوڵمانان لەسەرەتاوە بەحوکمی کۆمەڵێ هۆکار یەك دەوڵەتیان هەبووە، مشتومڕەکان تا رادەیەك کپبوونەوە، بەڵام ئاڵوگۆڕو پەرەسەندنەکانی دواتر جارێکیتر ئەم باسەیان هێنایەوە ناو پانتایی مشتومڕی فیکری و فیقهی مسوڵمانانەوە، سەیر دەکەین فاتمیەکان یەکەمجار لەساڵی (٢٧٩)داو لە خۆرئاواو دواتر لەساڵی (٣٦٢) لە (مصر) دەوڵەتێکی سەر بەخۆیان دامەزراند، لە بەرامبەر خەلافەتی عەباسیەوە ئەمانیش خەلافەتێکیان راگەیاند.

لەساڵی (٢٠٠ك)یشدا میرە ئەمەویەکانی ئەندەلوس دەوڵەتێکیتریان دروست کردوو ناوی خەلیفەشیان لە سەرۆکی دەوڵەتەکەیان نا.

بەم جۆرە بەکردەوە مسوڵمانن بوون بە خاوەنی سێ دەوڵەت لەپاڵ چەندین قەوارەی لەمان بچوکتر، ئەمەش وای کرد جیاوازی بکەوێتە نێو زاناکانەوە لەسەر ئەوەی کە ئایا لێرەدا پرسیارێکی تەقلیدی دوبارە دەبێتەوە کەئەویش ئەوەیە ئایە

دەکرێت مسوڵمانان لەسەرۆکێك و دەوڵەتێك زیاتریان هەبێت؟ ئەگەر وەڵامەکە بەئەرێیە کەی و چۆن و بە چ شێوەیەك.[1]

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەتا نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە مشتومڕو گفتوگۆ فیکریەکان لەو مێژووەدا لەسایەی بارودۆخێکی جیهانیدا ئەنجام دراون، کەفۆرمی ڕێکخستنی سیاسی ئیمپراتۆرە فراوان و پان و پۆڕو فرە نەژادو ئایین و مەزهەبەکان پێکیان هێناوە.

ڕەنگە یەکێ بڵێ باسکردن لە فرەدەوڵەتی لە مێژووی ئیسلامیدا لەوەی ئێستا دەخرێتە ڕوو جیاواز بووە،، چونکە ئەو فرەییە وەك ئێستا لەسەر بناغەی جیاوازی نەتەوەیی نەبووەو بەگشتیش ئیسلام بەجۆرێ لەجۆرەکان و لە ئاستێ لە ئاستەکاندا بەسەر دۆخەکەدا زاڵ بووە، بۆیە مەسەلەی مافی چارەنووس بەتایبەتیش لەفۆرمی پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەییدا، هێشتا بێ گیروگرفت نابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە ئەمڕۆ ئەو فۆرمە بۆتە دیفاکتۆ لەزۆربەی هەرەزۆری سەر ئەو خاکەی لەڕووی مێژووییەوە جوگرافیای قەڵەمرەوی دەسەڵاتی ئیسلامیان پێکهێناوە سەرەڕای ئەوە دەڵێین: بەگشتی دەوڵەت لەڕووی ناسنامەوە سێ جۆرە:

١) دەوڵەتی (قطر)ی.

٢) دەوڵەتی نەتەوەیی.

٣) دەوڵەتی فیکری.

[1] محمد عبدالجبار / الأسلام والدولة القومية / ڕۆژنامەی ( الحياه )ی لەندەنی / ژمارە ١٢٦٦٥ ، ١٢٦٦٧ .

جۆری سێیەم ئەگەر لەسەر بنەمای فیکری ئیسلامیی دامەزرابێت، ئەوا دەوڵەتی ئیسلامییەو ئەگەر واش نەبوو لەروانگەیەکی فیقهی رووتەوە دەوڵەتێکی نائیسلامیە، بەبێ ئەوەی هەرێم و ناسنامە و نەتەوە لەم رووەوە رەچاو بکرێت، هەڵوێست وەرگرتنیش لە بەرامبەر جۆری یەکەم و دووەمی دەوڵەت کە لە روانگەی ئەو بنچینە فیکریەوە دەبێت کەلەسەری دامەزراوەو یاساو بۆچوونەکانی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا لێ وەردەگرێت.[١]

نەتەوایەتیش پەیوەندیەکی مێژوویی و زمانەوانی و پرەنسیپێکی سیاسیە ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەیەکی خاوەن سەرەتاو رێسای دیاریکراو نییە کە تێروانینێکی چوارچێوەدار بۆ ژیان و بوون و کۆمەڵگا تەرح بکات دەتوانین بڵێین بەرامبەر فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو رێبازە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان تا رادەیەکی بەرچاو بێ لایەنە بەتایبەتیش لەچوارچێوەی نمونە ئیسلامیەکەدا بە بەپێچەوانەی کڵێسای مەسیحیەتەوە ئایین و پیرۆزییەکانی پەیوەست نین بە پەیکەرێکی دیاری کراوی ئیداری و سیاسی و رێکخراوەییەوە، لەبەرئەوە نەتەوایەتی پێویستی بەوەیە بۆچوونێکی دیاریکراو هەڵبژێرێت و پێی بڕوانێتە گەردوون و ژیان و فەلسەفەیەکی هەبێت لەسەر بناغەی ئەو سیماکانی ژیاری و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکەی دابڕێژرێت.

بەواتایەکیتر هەموو ناسیۆنالیزمێ ناوەرۆکێکی فیکری هەیە، بۆ نموونە ناوەڕۆکی هەندێ لەبزوتنەوە ناسیۆنالیستەکانی ئەوروپا لیبرالیزم و هەندێ بزوتنەوەیتری ناوچەکەی ئێمەش سۆشیالیزم و ناسیۆنالیزم گەلێکی وەکو پاکستان

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

و بەنگلادیش و شیشان و کشمیرو هەندێ شوێنیتریش، ئیسلام یاخود تێگەیشتنێکی ئیسلامی دیاریکراو ئەو ناوەرۆکە پێکدەهێنێت، کەواتە ناکرێت لە دیدی ئیسلامیەوە هەڵوێست لە دەوڵەتێك وەربگرین هەر لەبەر ئەوەی نەتەوەییە واتە دەوڵەتێکە تایبەت بەنەتەوەو گەلێکی دیاریکراو، چونکە بەگوێرەی پێوەرە نێودەوڵەتیەکان و سەرەتاکانی ئیسلام و بەهاکانی ئەوە مافێکی رەوای گەلانە، بەڵکو بۆهەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر دەوڵەتێکی لەوجۆرە دەبێت قسە لەسەر سروشتی دەوڵەت و بنەما فکری و دەستوریەکانی و رەفتاری سیاسی دەسەڵات و جۆری ناسیونالیزم بکرێت، ئەگەر دەوڵەتە نەتەوەییەکە لەناوخۆدا نادیموکراسی و ستەمی لەگەلەکەی دەکرد، دەستدرێژیی دەکردە سەر ماف و ئازادی هاووڵاتیان، بەرووی دەرەوەشدا خاوەن دیدێکی ناسیونالیستی دەمارگرژ و رەگەزپەرست بوو و هەڕەشەی بۆ دەرودراوسێ و ئاشتی و تەبایی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی دروستکرد، ئەو کاتە ئەم جۆرە دەوڵەتە بە گوێرەی پێوەرە ئیسلامیەکان رەت دەکرێتەوە، چونکە ئیسلام فەرمان دەدات بەدادپەروەری و شوراو رێزگرتن لە کەرامەتی مرۆڤ و دژی ستەم و خراپەکاری و دەستدرێژی و رەگەزپەرستی و دەمارگرژییە، لە هەر کوێیەکی ئەم زەویەدا و لەلایەن هەرکەس و ناوەند و دەوڵەت و دەسەڵاتێکەوە ئەنجام بدرێت، کەواتە حوکمدان بەسەر دەوڵەتێکدا نابێ لەو روانگەوە بێت کە دەوڵەتی نەتەوەیەکە، بەڵکو دەبێت بەگوێرەی بنەما فکری و سیاسی و دەستوریەکانی و کارنامەی دەسەڵاتی سیاسی و ئاشتیخوازی و رێزگرتن لە ماف و ئازادیەکانی هاووڵاتیان بێت، لە روانگەی ئەو سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکیانەوە بێت کە پەیڕەویان لێ دەکات.

قورئانیش لەم رووەوە دەفەرموێت: (لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٨)إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ).[١]

بەکورتی لەدیدی ئیسلامییەوە هەڵوێست بەرامبەر هەر دەوڵەتێك لە دوو گۆشەو روکارەوە دەبێت:

١) هەڵوێستی بەرامبەر ئیسلام (دژی ئیسلام نەبێت).

٢) مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتیان و دەرەوەی خۆی لە رووی رەفتاری سیاسیەوە.

گەر دەوڵەتێك هەڵوێستی بەرامبەر ئیسلام دوژمنانەو لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆی و دەوڵەتانی دراوسێ و دونیاداناداپەروەرو ستەمکارانەو شەرەنگێزانەبوو ئەوا لەروانگەی ئیسلامی‌یەوە نارەوایەو دانی پێدانانرێت.

کەواتە نابێ جیاوازی هەڵگرانی پرۆژەیەکی ئیسلامی و رێبازە فکریەکانی‌تر لەناو کۆمەڵگاو گەلێکی مسوڵماندا لەم سەردەمەدا لەسەر ئەوە بێت، کە ئایا ئەم نەتەوە و گەلە مافی ئەوەی هەیە چارەنووسی خۆی دیاری بکات بە پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەییشەوە یاخود نا؟ بەڵکو ئەگەر جیاوازیەك لە دید و بۆچووندا لەئارادابێت دەبێت لەسەر ئاستی رووەکانی ناسنامە و مەرجەعیەتی فیکری و سروشتی دەوڵەت و دەسەڵات و لەسەربوون و نەبوونی دیموکراسی و ئازادیە سیاسی و مەدەنییەکان و پارێزگاری لەمافی مرۆڤ و هاووڵاتی و ئاشتی خوازی و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان بێت.

---

[١] الممتحنة (٨،٩) .

لەکۆتاییشدا دەڵێین ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان باس لە یەکیەتی نێوان گەلان و وڵاتانی ئیسلامی بێتە ئاراوە هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ ئەوەدا نییە کە لەمەڕ مافی چارەنوس و دەوڵەتە نەتەوەیەکان دەرمانبڕی، چونکە ئەگەر ئەو یەکیەتیە کە لەهۆشی هەندێکدا هێندەی یۆتۆپیا ئاراستەی دەکات ئەوەندە پێدراوە واقیعیەکان پشتگیری ناکات، مانای یەککرتنی مسوڵمانان لە دەوڵەتێکی یەککرتووی سادەدا بگەیەنێت، بیرکردنەویەکی لەم جۆرە لە سنوری پێدراوەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی مسوڵمانان و مرۆڤایەتیدا جگە لەخەونێ هیچی‌تر نییە.

خۆ ئەگەر بەکردەوە ڕۆژگارێك هاتە پێشەوە لەوڵاتانی ئیسلامیدا دیموکراسی و ئازادی چەسپی و گەلان ئازادبوون لە دیاریکردنی فۆرمی خۆرێکخستن و چۆنییەتی پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندیەکانیان ئەوا ئەزمونی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان بۆ نمونە ئەوروپا چارەسەری هاوچەرخی گونجاویان سەبارەت بە پرسی یەکبوون خستۆتە بەردەممان، واتە دەکرێت ئێمە یەکیەتی لەڕێی دامەزراندنی کۆمەڵێ دام و دەزگای هاوبەشی وەکو پەرلەمانی وڵاتانی ئیسلامی، دەستوری هاوبەش و پەیمانی سەربازی و بازاڕو پولی هاوبەش و لابردنی ڕێگرە گومرگیەکان و فیزەو جۆرها میکانیزم و شێوازی‌ترەوە تێبگەین و بێتەدی واتە قەوارەکان لەکاتێکدا پارێزگاری لەسەربەخۆیی و تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیان دەکەن.

لەهەمان کاتدا لەکۆمەڵێ ڕووەوە لەڕووی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و یاساییەوە، لەنێو پرۆسەی یەکتر تەواوکردنێکی ئیجابیدا خۆ ئەگەر پەرەسەندنە سیاسی و ئابوری و زانستی و ژیاریەکان لەسایەی تەوژمی جیهانگیریدا لەقۆناغێکی دیاری کراودا ئەم وڵاتانەی گەیاندە قەناعەتێ کە پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان

لەدۆخێکی وەکو ئەوەی لەئارادایە پێکهێنانی ئەزموونێکی فیدراڵی وەك ئەزموونی ئەمریکا دەخوازێت و هەموو نەتەوەکانی ناوچەکەش ئەم خیارەیان هەڵبژارد، ئەوا لەو فیدراڵیەتە ئیسلامیەدا کوردیش ماڤ خۆی دەبێت بە یەکسانی لەگەڵ عەرەب و تورك و فارس و نەتەوەکانی‌تر مومارەسەی تایبەتمەندیەکانی خۆی بکات و پشکدارێکی راستەقینەی پێکهێنانی قەوارە هاوبەشەکە بێت، بەڵام هەرکەسێ مەبەستیەتی جیهانی ئیسلامی بەرەو ئەو ئاقارە بڕوات، دەبێت پێش هەموو شتێ راستگۆیی خۆیی بسەلمێنێ لە پشتیوانی کردن لە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و دژایەتی کردنی ستەمکاری و زۆرداری و زۆرلێکردن و پەراوێزخستن و بێبەش کردن و سەرکوتکردن و هەرەشەکردن لە ناسنامەو تایبەتمەندیە جۆراوجۆرەکانی ئەم جیهانە.

دەبێت بەکردەوەش کار بۆ ئەم ئامانجە بکات و ئیشکردنەکەشی لەناو جەرگەی کێشمەکێشەکانی واقیعی سەردەمدا بێت، نەك لە مێژوودا یاخود لە واقیعێکی داتاشراوی ناو هۆشیاریەکی ساختەدا، هەروەها دەبێت پشتیوانییەکی بێدرێغ لەماڤ چارەنووسی کوردو نەتەوەکانی‌تر بکات، بۆ ئەوەی خواستە نەتەوەییەکانیان بێتەدی و لەم رووەوە تێربن و لە ناسنامەیان دڵنیا ببنەوە، هەست بەماڤ یەکسان و چارەنووسی هاوبەش لەگەڵ نەتەوە مسولمانەکانی دەوروبەریان بکەن.

واقیعێ بێتە گۆڕێ میللەتان بە ئیرادەی ئازادی خۆیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی خۆیان جۆرەها فۆرمی یەکبون و کاری هاوبەش بدۆزنەوەو هەڵبژێرێن.

خۆرئاواش هەتا ئەم قۆناغەی تێنەپەڕاند بەم دۆخەی ئێستای نەگەیشت، کە گەل و نەتەوەکانی ئەوێ ڕۆژ بە ڕۆژ و ساڵ بە ساڵ زیاتر بەربەست و ڕێگرەکانی نێوانیان لادەبەن و کەم دەکەنەوە، ئەم هەناسەو هەنگاوانەش لە ئەزموونی یەکیەتی ئەوروپادا گەیشتۆتە ئاستی هەوڵدان بۆ هێنانەدی دەستوری هاوبەش و هاووڵاتی ئەوروپی.

بەدەر لەم میکانیزمە هاوچەرخانە و خۆگرێدانی تەواو بە ئیرادەی ئازادی گەلانی قەڵەمڕەوی مێژووی جیهانی ئیسلامیی، خستەرووی هەر ڕێگا و دیدێکی‌تر بۆ یەکیەتی جگە لە کارەسات و زیاتر لێکدابڕان و ستەم و ناکۆکی زیاتر، هیچی‌تری بەدواوە نابێت.

## سەرەتایەك

کاتێ بەدووی جوڵانەوەی فیکری کوردی دەکەوین و سەرنج لە ناوەندە رۆشنبیریەکەی دەدەین، دەبینن بەشێك لە نوخبەی کوردی و خاوەن قەڵەم لێرەولەوێ دەیانەوێت لێکدانەوەی سەرجەم شکست و ناکامی و لەبارچوونی خەونەکان و بەدینەهاتنی ئامانجەکانی کورد لە ئیسلامدا بدۆزنەوە!! ئەم دیدە دەیەوێت پێمان بڵێت کێشەکانی کورد لەبنەڕەتدا ئیسلام لێیان بەرپرسیارە، کورد تراژیدیای هەیەو لە قەیراندایە،، چونکە مسوڵمانە؟ کورد قوربانی ئەو ئیمراتۆریانەیە کە یەك لەدوای یەك هاتوون و هەقی ئەمیان خواردوە هەر هەموو ئەو ئیمراتۆریەتانەش گوزارشت دانەوە بوون لە ئیسلام[١] لەو سۆنگەشەوە کە ئیسلام لە (١٤٠٠) ساڵی رابردوودا لەگەڵ هەست و نەست و فەرهەنگی کوردیدا تێکەڵ بوە و بەشێکی گرنگ لە پەیکەری مێژوویی ئەو پێکدەهێنێ، یاخود بەدیوێکی‌تردا بڵێین لەچوارچێوە گشتییەکەیدا زمان و کلتورو جوڵەی کورد لەفەزایەکدا رەوتی گەشەکردنی خۆی بریوە کە ئیسلام وەکو ئایین و ژیارو فەرهەنگ ئامادەیی هەبووەو ئەمەش کارێکی کردووە باس کردن لەمێژوی کورد خۆی لە خۆیدا بگۆڕێت بە باسکردن لەئیسلام ، هەڵبەتە بەوجۆرەی ئەمان باسی دەکەن و لێی تێگەیشتون –

---

[١] فاروق رەفیق/ خۆرئاواو (ئەو)ەکانی مسوڵمان وەکو (ئەو)ی خۆرئاوا، رەهەند، ژمارە ١٩٩٩/٨/لا ٧٤.

ئەم تێکەڵاوبوونەی ئیسلام فەرهەنگ و کلتوری کوردی و بوونی کورد وەك گەلێکی مسوڵمانی ناوچەکە، کەسانێکی خستۆتە سەر ئەو کەڵکەڵەی کە بەچاوێکی دوژمنانەوە بڕواننە ئەم مێژووەو دەکرێ بڵێین بکەونە حاڵەتێکەوە کە ناوی بنێین جەنگ لەگەڵ مێژوودا، هەرلێرەوە گەر بەتۆماری رابردووی ئەم تەرزە خوێندنەوە لەدنیای رۆحیەتی کوردیدا بچینەوە ، هەست دەکەین لەمامەڵە کردنیدا لەگەڵ مێژوو، تووشی گرفت و ئیشکالیەتی جۆراوجۆر هاتوەو ئەوەی پێی دەوترێت خوێندنەوەی مەنهەجی و بابەتی تارادەیەکی لەبەرچاوو ون و نادیارەو نیمچە فەوزایەك باڵی بەسەر ئەم تێڕوانینەدا کێشاوە، بەجۆرێك سەرلێشێواوی فکری و هەڵەی مەنهەجی گەورەی لێ بکەوێتەوەو، لەباتی خزمەتکردن بە بنیاتنانی دیدێکی کوردانە بۆ مێژووی نەتەوەی کورد بەشداری بکات لە بێ نەزمی و پاشاگەردانییەك لەم بوارەدا.

گەڕانەوەی ئەمان بۆ مێژوو، گەڕانەوەیەکی پڕ گرفت و لەسەر چەند خوێندنەوەو گریمانەیەکی هەڵە دامەزراوە، زیاتر لەوەی تێزەکەیان رەنگدانەوەی مامەڵەکردنێکی مێژوویانە بێت زادەی دیدو حوکمدانێکی ئایدیۆلۆژیانەو سیاسییانەیە، هەربۆیە زۆرگرانە ئەم جۆرە راڤەو هەڵوێستگرتنە حیساب بۆنەکراوو سەرپێیانە بچنە خانەی قازانج و بەرژەوەندی نەتەوەیی کوردەوە.

چونکە هەر لەبنەڕەتەوە خوێندنەوە کە لەدیدێکی کوردانەی بێ لایەن و، یاخود ناسیۆنالیزمێکی بەرچاو رۆشنەوە بەرهەم نەهاتووە، گەرچی خاوەنەکانیان بەردەوام دەیانەوێت پەرۆشی و مۆرکی ناسیونالیستانە بەگوتەزاو نوسین و لێکدانەوەکانیانەوە بلکێنن.

هەڵبەتە لای هەموان رۆشنە کە رۆحی نەتەوە بریتییە لەمێژوو و بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکانیش مەستن بەئایدیای مێژوو لەپاڵ مێژوودا غروری نەتەوە دەدۆزنەوە.[1]

هەروەك چۆن ناسیونالیزم بێ نەتەوە و فەنتازیا و سەرمایەی رەمزی نابێت، ناکرێ ناسیونالیزمێکیش هەبێت بێ مێژوو، چونکە مێژوو، دەورێکی گەورەی هەیە لە پەروەردەکردنی عەقڵدا.[2]

یاداوەری نەتەوە لە مێژوودا تۆمار کراوەو مێژوو لە هەر کۆڵەکە بەهێزەکانی هۆشیاری یاخود پێکهێنانی ناسنامەو گەرانەوە سەربەخۆو خولْقاندنی فەزایەکی بارگەکراوە بەدروشم و هەناسەی ناسیونالیزم. بەخۆرایی نییە کە لەمێژووی هاوچەرخی کورددا، کتێبە مێژوویەکان لەسەر مێژووی کورد، لەلایەن ناسیونالیزمی باڵادەست و دەسەڵاتە مۆدێرنە سەرکوتکەرو دژی کوردییەکەوە هەمیشە لەریزی ئەو کەرەسە قاچاخانەدا بوون کە کوردی لەسەر راوەدونراوەو ئازار دراوە،، چونکە ئەوان بەجوانی زانیویانە بابەتە مێژووییەکان هەست و بیری نەتەوەیی لای رۆڵەکانی نەتەوەیەك گەشەپێدەدەن و هەستکردنیان بەناسنامەی سەربەخۆو تایبەتمەندییە کلتوریەکان لایان بەهێز دەکات و گیانی بەرگریان لە بەردەم ئەو پرۆسانەشدا بەهێزو پتەو دەکات کە مەبەست تیایاندا تێکشکاندنی رۆحی نەتەوەو سرکردن و

[1] فاروق رفیق/ ناسیونالیزم وەك مێژێکی ئایدیۆلۆژی/ گۆفاری سەردەم ژمارە ٥/ تشرینی یەکەم /١٩٩٩، ل٨

[2] د. کمال مەزهەر ئەحمەد/مێژوو/بەغدا ١٩٨٣ ل٦٣ .

کوژاندنەوەی حەماس و کویرکردنەوەی سەرچاوەکانی هەست بە جیاوازی و سەربەخۆیی کردنن.

هەر لێرەوە ئەو قسەی پێشوومان بەراست دەگەڕێ کاتێ سەرنجمان بۆلای ئەوە راکێشا کە دوژمنایەتی کردنی مێژووی کورد ، یاخود بڵێین بەشێکی هەرە گەورەو بەرچاوی ئەو مێژووە کە قۆناغی مسوڵمان بوونی کوردە، بەهیچ پاساوو بروبیانویەکەوە ناچێتە خانەی بەرژەوەندیە ناسیونالیستیەکانی کوردەوە.

بەڵکو رەنگە زیادەڕەویمان نەکردبێت گەر بڵێین لەهەندێ رووەوە خزمت کردنە بە ستراتیژیەتی ناسیونالیزمە دوژمنەکانی کورد لەناوچەکەدا ، هەروەها لەناوەرۆکدا ئیشکردنە بەلۆژیکی گوتاری خۆرهەڵاتناسی کە گوتارێکە بەشێوەیەکی گشتیی لەسەر بناغەی تەحقیرکردنی رۆژهەڵات و گەلانی رۆژهەڵات و شارستانییەتەکەیان داڕێژراوەو هەروەك (فاروق رەفیق) راشکاوانە دەڵێ: (بێ دوودڵی دەڵێم کەم بۆچونمان هەیە لەسەر ئیسلام و شارستانییەتی ئیسلامی کەزادەی بینین و عەقڵی خۆمان بێت، بەڵکو زۆربەیمان خواستووە ، هەروەها زۆرجار بۆچوونە سادەکانی خۆرهەڵاتناسەکان سەدەی هەژدەو نۆزدە لەسەر کورد دووپات دەکەینەوە، بەشێ لەو نووسینانەی لەم دواییەدا لەم رووەوە نوسراون دووپاتکردنەوەی هەندێ دۆگمای خۆرهەڵاتناسین لەسەر ئیسلام و کورد ، هەروەها هەڵگری بوغزێکن بەرامبەر ئیسلام و شارستانێتی ئیسلام و میللەتانی دەورویەر).[1]

[1] فاروق رفیق/ خۆرئاواو (ئەو)ەكانی مسوڵمان وەکو (ئەو)ی خۆرئاوا/ هەمان سەرچاوە ل٧٠.

بۆیە دەبینین دۆگماکانی: ئیسلام بەزۆر فەرزکراوە، ئیسلام گەلی ئێمەی دواخستووەو بۆتە مایەی دواکەوتنمان و ستەمی لە ئافرەت کردووە، ئایینی دڵرەقی و خوێنڕشتن و تاڵان کردنی گەلان و لەوانەش گەلی ئێمەیە!! دەبن بەبەشێکی گرنگ لەوگوتارەی ئەم بەشە لە نوخبە کوردیەکە بەرهەمی دەهێنێت و ناوەندە رۆشنبیرییەکەو هەندێ جار بەشێ لە جەماوەریشی پێ دەدوێنێ، کە هەرکەسێ کەمترین ئاگاداری و شارەزایی دەربارەی ئەو گوتارو چەمك و گوتەزاو لیستی تۆمەتانە هەبێت کە خۆرهەڵاتناسی لەماوەی زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ دژی ئیسلام بەرهەمی هێناوە، هەر زوو هەست بەوراستییە دەکات کە ئەم گوتارە دووپاتکردنەوەی کۆمەڵێ دۆگمایەو لەبەر لاوازبوونی هەستی لێپرسراوێتی فیکری و هەر هەستێکی‌تری رەخنەیی جددی لای خاوەنانی ئەم تێزە، گوێ نادرێ بەوەی لەژێردارو پەردووی ئەم گوتارەدا تا چەند هەقیقەتی مێژوویی دەمرێت و لەوێشەوە بوونی ئێمە لە مێژوودا بەر چ زەبرێکی کاریگەر دەکەوێت. یاخود تاچەند بوونی مێژوویمان ، کە رووێکی گرنگی ناسنامەی نەتەوایەتیمانە، تووشی شێوان دێت و ئەمەش کار لەسەر ئاست و قووڵایی ئینتیمای تاك و مرۆڤی کورد دەکات بۆ نەتەوەکەی و پرۆژەی ناسیونالیزمی کوردی.

گەر خۆرهەڵاتناسی جەوهەرێکی نەگۆڕ دەدا بە خۆرهەڵات و ئەو جەوهەرەش یەکسان دەکات بە بەدنیایەك لەناشیرینی و تاریکایی و نزمی، لێرەش ئەو جەوهەرە بەمێژووی کوردو لە قۆناغی مسوڵمانبوونیدا دەدرێت و هەرچی مەینەتی و بێ بەشی و ناسۆری کورد هەیە دەکرێت بەناوەرۆکی ئەو جەوهەرە!

هەروەها گەر گوتاری خۆرهەڵاتناسی بەرامبەرکانی تا ئاستی لە ئینسان خستن دەکات بەقوربانی و لەبەر تیشکی ئێسك و پروسکی سوتاوی ئەواندا شکۆو گەورەیی و دەسکەوتەکانی و مرۆڤایەتی خۆی نمایش دەکات، ئەم گوتارەش لەسەیرکردنیدا بۆمێژووی ئیسلامیی کوردی واز لە هەمووسەرەتاکانی زانستی بوون و بابەتی بوون دەهێنێ و چێژ لە پارچە پارچەکردنی ئەو مێژووە دەبینێ و لەخوێناوی کردنی ئەوجەستە مێژووییەدا دەگات بەچێژەکانی خۆی.

مەبەستمە بڵێم ئەم خوێندنەوە لە بنەڕەتدا خوێندنەوەیەکی کوردی نییە بۆ ئیسلام و سەیرکردنی مێژوو نییە بەچاوێکی کوردانە، بەڵکو سەیرکردنی کوردێکی بارگاوی بووە بەگوتاری خۆرهەڵاتناسی و هەندێ ئایدیۆلۆژیای مۆدێرن بۆ مێژوو و ناسنامەو خودی خۆی لەچاوی خەڵکانیترو بەتایبەتیش خۆرئاواوە ، سەیرکردنە بۆ ئیسلام و مێژووی ئیسلام و کوردو مێژووەکەی لەسایەی بەراست وەرگرتنی ئەو وێنانەی کەچاوی کامێرای خۆرهەڵاتناسی گرتوونی و وەك تاکەوێنەی ئیسلام و خۆرهەڵات پێشکەش بەخۆرهەڵاتی دەکاتەوە.

لەکاتێکدا خۆرهەڵاتناسی بەناوی کوردناسی و لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆریتردا تەنانەت لەم سەردەمەشدا لە ئەورپاو کوردستانیشدا دەیان دەزگاو دامەزراوەی بەناو فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و زانستی دادەمەزرێنن و خەباتێکی بێ وچان دەکەن بۆتێکدان و هەڵوەشاندنەەی ئەو بنەما ئەخلاقی و دینی و سیاسی و فەرهەنگیانەی بوونەتە کۆڵەکەی خۆڕاگرتنی کوردو مانەوەی وەك نەتەوەیەك، بەڵام بەداخەوە زۆرێ لەروناکبیرو خوێنەرو تەنانەت گەورە کەسایەتیەکانی کوردی ئێمە هەست بەو هەڕەشەیە ناکەن و لە میکانیزمی شێواندنی فەرهەنگ و زمان و مێژووی کورد

نەگەیشتوون و ناتوانن دەرك بەو پیلانە ئەهریمەنییە بکەن کە رۆژئاوا بۆ کۆتکردن و داپڵۆسینی رۆژهەڵات کێشاویەتی و جێبەجێی دەکات، ئەمانیش کەوتوونەتە بەردەمی ئەومێشك شۆرینەوەی ماسمیدیای رۆژئاوا کردوویەتی بەئەرکی پیرۆزی خۆی ، ئەم خۆرهەڵاتناسانە بەناوی کوردستانەوە لە (١٥) ساڵی رابردوودا چەندان بابەتیان نوسیوە کە گومان لەسەر بابەتەکانی کوردی دروست دەکات ، شت لەسەر زارەکانی عەلەوی یەزیدی چی هەبێت بێ سێو دوو بڵاوی دەکەنەوە.[1]

ئایا بەلەبەرچاوگرتنی ئەم واقیعە بەبێ تۆمەتبارکردنی نیازی شاراوەی هیچ نوسەرو روناکبیرو سیاسەتمەدارێك، هەموو ئەو بابەت و نووسین و توێژینەوانەی بەو ئاراستەدا نوسراون، کە گومان لە رەسەنبوونی مسوڵمانێتی کوردو گەڕانەوە بۆ زەردەشتیەت و دانانی هەندێ ئایینی کۆنی کوردی بەئاییني رەسەن و دێرینی کوردی، ناچنە ریزی ئەو توێژینەوە کوردستانیانەی شاکەلی ئاماژەیان پێ دەکات کە لەدیدە خۆرهەڵاتناسیە تەقلیدیەکەوە بەرهەم دەهێنرێن و مەبەست تیایاندا گومان دروستکردنە لەسەر هەموو ئەوشتانەی مێژووی سەدان ساڵ و کارلێکە مێژووییەکان و ئاڵوگۆڕە کان کردوویانە بەبەشێکی بنەڕەتی لەناسنامەی کوردی و بوونە نەتەوەیی و شارستانییەتەکەی؟

چ کارەساتێکی گەورەیە رۆشنبیری کورد وێنە خۆرهەڵاتناسییەکە وەکو سکێچەر وەربگرێ و لەباتی گومانکردن لەو وێنەو کەشفکردنی ئەو بونیادە سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و ژیاری و ئەو بوغزو دۆگمایەی لەپشتیەوە شاراونەتەوە بێت، لە

---

[1] فەرهاد شاکەلی/ رۆژهەڵاتناسی و کوردناسی، هەفتەنامەی گوڵان ژمارە ٣٢٢/٢٩/٣/٢٠٠١ ل٥٤.

بەردەم بالاّنۆمای ئەودا سەیری مێژوو خودی شارستانیانەی خۆی بکات و شەڕە فکری و سیاسیەکانیشی لەسەر ئەم بناغەو لەم سۆنگەوە بەرپا بکات و هەموو ئەم هەڵوێستە سەرتاپا نێگەتیف و پاشکۆیەش بەناوی دڵسۆزی بۆکوردو پرۆژەی ناسیونالیزمی کوردی بەناوەندێکی رۆشنبیری و سیاسی بفرۆشێ، کە خۆی لەخۆیدا بەهۆی چەندەها هۆکاری خودی و بابەتییەوە بەدەست چەندین مۆدێلی سواوو بەسەرچووی فکری و کەرەسەی پەککەوتووی مەعریفی و قەیران و گرفتی جۆراوجۆرەوە دەناڵێنێ و چاوەڕێی خۆتازەکردنەوەو بوژانەوەیەکی هەمەلایەنەیە ؟

پەیڕەوکردنی دید و گوتاری خۆرهەڵاتناسی بەرووەکەیتردا ئاشکراکردنی شەڕکردنێکی بێ ئەمانە لەگەڵ مێژوو خودی شارستانی و نەتەوەیی و فەرهەنگی خۆمان ، شەڕێك کاتێ بەناوی دڵسۆزی بۆکوردو بزوتنەوە ناسیونالیستەکەیەوە دەکرێت ، نەك هەر سروشتی ناشارستانی و تا نەتەوەیی بوونی ناگۆڕێ، بەڵکو قێزەونترو ترسناکتری دەکات . شەڕ لەگەڵ ئیسلام کە بەشێ لەستراتیژی خۆرخەلاّتناسییە، شەڕە لەگەڵ تاکی کوردو کۆمەڵگای کوردی، شەڕە لەگەڵ پاشماوەی ئەو کەنارە ئارامانەی کە ئینیتما بۆ ئیسلام لەسایەی بێ بەشییەکی مێژوویی کورددا، بۆ مرۆڤی کوردی هێشتوەتەوە، شەڕە دژی ئەو هەندە غرورەی کە سەرەڕای هەموو ستەم و ملپێکەچکردنێکی، مسوڵمانی ئاسایی سادەی کوردی هەستی پێ دەکات و گەر لەسەر ئاستی تاکەکەسیش بێت ناهێڵێ هەموو دەرگاکانی بەڕوودا دابخرێ و دەرگای ئاسمان و ئارادەیەکیش دوارۆژ بەکراوەیی بەروویدا جێ دێڵێ.

هەروەها ئەم تێزە لەتێگەیشتن و قسەکردنە نازانستیە لەسەر ئیسلام، بانگەشەکردنە بۆ شەڕێکی ناوخۆیی ئایین و بۆ ئاراستەکردنی وزە کوردییەکە بۆناو خۆو تەقاندنەوەی لەڕێی بەرپاکردنی جەنگێکی ناوخۆوە، ئەمە جگە لەوەی لەسەر ئاستی هۆشیاری نەوەی نوێدا سادەکردنەوەو رووکەش کردنی ئەو هۆشیاریەیە تائاستی خۆخوێندنەوەی هەڵەو پێچەوانە بینینی واقیع و داڕنینی شکۆ لە راستییەکان و بەپیرۆزکردنی لۆژیکی درۆو چەواشەو بەسەنتەرکردنی گوتاری پروپاگەندەو، قوڵکردنەوەی تاسەرئێسقانی گرێی هەست بەکەمی کردن و شکاندنی ئەو بەربەستانەی رێگرن لە بەردەم مەسخبوونی کەسێتی کوردی و توانەوەی لە رووە سلبیەکانی شەپۆلەکانی سەردەمی بەجیهانی بوون.. نەخۆشی و ئیفلیجی ئەو گوتارە لەئاستی رۆشنبیریدا رەنگدانەوەی سروشتی پەککەوتوویی سیاسەتی کوردییە لەهەندێ رووەوە، لەراستیشدا ئەم تێزە دەنگدانەوەی سیاسەتێکە کە ئەویش لەو راستیەدا خۆی شاردۆتەوە کە زۆرجار نەیتوانیوە بەگوێرەی پێویست پەی بە بەرژەوەندیە راستەقینەکان بەرێ و واقیع بەجوانی هەڵسەنگێنێ و لەبەر تیشکی هەڵسەنگاندنێکی هەمەلایەنەو دەرککردنێکی قووڵدا داواکاری و داخوازی و میکانیزمەکانی دابڕێژێ، ئەمیش بەهەمان شێوە بەناوی کورد و بزوتنەوە ناسیونالیستەکەی و رۆڵی نەتەوەکەیەوە، دەکەوێتە وێزەی ئەو جەستەو ئازاری دەدات، گرفتی ئەم جۆرە رۆشنبیرەی کورد لەگەڵ ئیسلامدا گرفتێکی گەورەیە، ئیسلام ناسییەکەی هەژارییەکی گەورەی پێوە دەردەکەوێ بەجۆرێ دەگاتە ئاستی کۆڵەواربوون، تێگەیشتنی بەشی زۆری ئەو بەشە لەناوەندە رۆشنبیریەکە لەئیسلام تێگەیشتنێکی سەرپێیی و سادەو رووکەشە، زیاتر لەوەی تێڕامان بێ لە

پرنسیپەکان و رۆح و ئامانجەکانی ئیسلام لەژیان و گەردووندا ، یاخود ناسینی ئیسلام بێت بەکەرەسەناسینە سروشتیەکان لەناوەوە، وێناکردنی ئیسلامە لە مێژوودا، یاخود لە ژیانی کۆمەلایەتیدا، واتە بەرجەستەکردنی ئیسلام لەفۆرمێکداو حوکمی کۆتاییە بەسەریدا لەمیانەی کارایی و کاریگەری و رەنگدانەوەو رۆڵی ئەو فۆرمە، بینین و روانینە سەرزەوی ئیسلامە لەچاوی دوژمنە مێژووییەکانی ئیسلامەوەو لە پێش هەمووشیانەوە ئەو بەشە لە خۆرئاتناسان کە هەڵگری بوغزن بەرامبەر بە ئیسلام، ئەم گرفتەی رۆشنبیری کورد گرفتێکی گەورەو لەسەر راوەستانی جدی دەوێ،، چونکە کاری کردۆتە سەر سروشت و ئاراستەی ئەو فکرەی بەرهەمی دێنێ، یاخود وردتر بڵێین ئەو فکرەی بەناوی خۆیەوە دەیڵێتەوە،، چونکە خۆی کەمتر گەیشتۆتە لەحزەی بەرهەم هێنانی فکر. هەر ئەم رەوشەو حاڵەشە وای کردووە هەندێ رۆشنبیری کورد لەهەندێ کاتدا ناتوانێ ناوەوەی کورد وەکو مرۆڤ و کۆمەڵگاو نەتەوەش بەشێوەیەکی واقیعیانە بخوێنێتەوە یاخود لەکاتی خوێندنەوەیدا یەکێ لە بنەڕەترین پێکهێنەرەکانی کەسێتی و کلتوری نەتەوەیی کە ئیسلامە پشتگوێ دەخات یاخود لەژێر کارتێکردنی هەندێ تێزی خۆرئاوایی و دابەشکردنی قۆناغە مێژوویەکانی سەدەی نۆزدەو دیاریکردنی رۆڵی ئایین لە ژیانی مرۆڤی هاوچەرخدا، بەگوێرەی ئەو پۆلێنکردنانە تووشی غرورێکی بێ بناغە دەبێ و کارتێکردنی مۆدێرنە بەمانا ماتریالیەکەی لەژیان و ناوەوەی مرۆڤی کورددا ئەوەندە گەورەو کاریگەر دەکات، کە پێی وایە شوێنێکی وابۆ هەناسەدان و بوژانەوەی سەرلەنوێی گیانە ئیسلامییەکە نەماوەتەوەو، لێرەشەوە دەتوانێ ئیسلام لە سەر لوتکەی رۆحیانەت و کارتێکردنە مەعنەوی و ئایینیەکانەوە دابەزێنی بۆئاستی

کەلەپورو نیشاندانی وەك رابردوویەك و جەستەیەكی خامۆش و بێ جوڵە و ناكاریگەر!

بەڵام لەو راستییە تێنەگەیشتووە كە زۆرینەی كورد مسوڵمانەو لەبەر خاتری هەندێ رۆشبیرو هەڵگری ئایدیۆلۆژیای ئەنتی ئیسلامی ئامادە نییە واز لە ئیسلام بێنێ و دەستبەرداری بێت، لەرووی فەرهەنگ ناسیشەوە كارێكی وا نیمچە ئاستەمە، چونكە ئیسلام لە ژیانی مرۆڤی كورددا بەسیفەتی مرۆڤ بونی وەڵامدەرەوەی چەندین پرسیاری وجودی و دەستەبەكەری چەندین پێداویستی مەعنەوی و بەشدارێكی گرنگی پەیكەری ئەخلاقییەتی و لەویژدانیشدا سەرەڕای هەموو ئەو مەرگەسات و چەواشەكردن و زۆرو ستەمەی بەناوی ئەم ئایینەوە ئەنجامدراون، هێشتا ئیسلام رەمزی رەحمەت و عەدالەت و ئەو پەناگەیە كە هەركەسێ بەراستی بۆی بگەڕێتەوە و پەنای پێ بەرێ ئامێزی گەرمی كراوەیەو ئومێد دەگەڕێتەوە بۆدەروونە ماندوو رەتێنراوو نائومێدەكان.

### گریمانە هەڵەكان و چارەسەرە گرفتاویەكان

هەروەك لەسەرتاوە ئاماژەمان بۆكرد ئەم گوتارەی ئەم بەشە لە رۆشنبیری كورد، لەسەر چەندین گریمانەی هەڵە بنیاتنراوە هەركاتێ پێشەكییەكانیش هەڵەبوون بەرەنجامەكان هەڵەدەبن، لەوسۆنگەشەوە كە كۆمەڵێ گریمانەی هەڵەو ناراست بەردی بناغەی گوتاری بوغز بەرامبەر ئیسلام لەناوەندی رۆشنبیری كورددا پێكدەهێنن، دیارە ئەو چارەسەرانەی دەشیخەنەڕوو لەسەر بناغەی چەند رەهەندو

تێزێکی هەڵە دامەزراون و ئاراستە دەکرێن ، بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە چارەسەر نین و خۆیان جۆرێکی‌تر لەگرفتی کورد پێکدەهێنن، گرفتێ کە لە بەرەنجامی روکەشی رۆشنبیری و سادەیی و ساکاری و گرفتاوی بوونی ئەو گوتارەوە سەرچاوە دەگرێ، کە راستیەکانی مێژوو ژیان و واقیعی کوردی بەهەند ناگرێ و دەیانخاتە دەرەوەی بایەخپێدانی خۆیەوەو، لەودیو ئەوانەوە باس لە کۆمەڵێ بەهاو پێوەرو بناغەو توخم دەکات کەلەچاو پێوەرو بەهاو رەگەزە راستەقینەکاندا یەکجار ناکاریگەرو ، بەڵکو هەندێ جار لە ریزی نەبودان و بوونیان تەنها پەیوەستە بەو لەحزانەوە کە رۆشنبیرێکی سەربەم ناوەندە دەیەوێت لەرێی هەناسە پێدانێکی دەستکردەوە گیانی بکاتەوە بەبەرداو، وای دەرخات کە هێشتا چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ وەك جەستەیەکی زیندوو پڕ لە ژیان رۆڵ پەیدا کاتەوەو شوێنی خۆی لە سەرشانۆی رووداوەکان بکاتەوەو ببێ بە بەشێ لەپێکهێنەرە رۆحی و مادییەکانی کۆمەڵگا!

لە گریمانە هەڵەکانی ئەم تێزە ئەوەیە کەپێی وایە (هەستکردن بەکەمی لای مرۆڤی کورد لەتێکشکانی پەیوەندی مرۆڤی کورد بەژیاری خۆی و بەئایینی خۆیەوە هەڵقوولاوە).[1]

تێکشکاندنی مرۆڤیش بە ژیاری خۆیەوە بەهەموو مانا سایکۆلۆژیەکان تێکشکاندنی بنەماکانی کەسێتی دیاری دەکات.[2]

---

[1] ئیسماعیل حەمە ئەمین، نوخبەی سیاسی لە پرۆسەی منی مێژوویی و ستراتیژیەتی نێر فۆسدا/ رەهەند/ ژمارە ٦/١٩٩٨/ ل١٣٣.

[2] هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

یاخود کە دەڵێ (پەیوەندی کورد لەرێگەی روناهییەوە بەخواوە پەیوەندی راستەوخۆی من و خودابوو واتە ئەو پەیوەندییە رۆحییەی من هەڵمبژاردوەو لەرێگایەوە بەویستی خۆم لەگەڵ خوادا بەزمانی خۆم دەدویم ئەمەشکێنراو هەوڵ و تەقەلای ئازادکردنی پەیوەندی راستەوخۆی مرۆو خوا گۆرا بۆ پەیوەندیەکی‌تر کە لەژێر سمی ئەسپی عەرەبیە خوێناوییەکانی غەزاوە چەکەرەی کردو بەکوشتار چەسپێنرا، دیارە پەیامێك گەر لەسەر هەرەشە بیناکرابێت هەردەشێت بەهەرەشەو جەنگی خوێناوی و جەنگی دەروونیش بچەسپێنرێت.

ئیتر کورد لەپەیوەندی روناکی و خۆشەویستی خواوە خرایە ژێر نەزمی زمانی عەرەبی، فەرهەنگی عەرەبی و سەرکردە خوێناویەکانیش سەدەیەك لەتاریکی خوێنیان بەسەر کورددا سەپاندو ئیدی بە بەردەوامی سیاسەتی بەمسوڵمانکردنی کورد پیادەکراو لەو رۆژەشەوە چیرۆکی دابڕانی کورد دەستیپێ کرد).

ئەم قسانەش زۆر بەکورتی (یاریکردنە، دەستێوەردانەو دەستدرێژیکردنە بۆسەر بیرەوەری مێژوویی کوردو گورزێکە لەئینسانی کوردو ئینسانییەتی و رۆحیانەتی! دەبێت پرسیار بکەین و بڵێین ئەوە کێیە لەودیو ئەو گوتارەوە قسە دەکات؟ چ هێزێکە؟ دڵنیام ئەوەی قسە دەکات هێزێکە بۆ ئەوە نەهاتووە کەشوناسی ئێمەی کورد دەوڵەمەند بکات، بەڵکو هاتووە تاگورزێك لەشوناسی ئێمە بدات، بۆ ئەوە نەهاتووە برینەکانمان سارێژ بکات ، بەڵکو خەنجەرێکی ژەهراوی پێیەو گەرەکیەتی برینی قولترو هەرگیز سارێژنەبوو بکاتە ناوجەستەو رۆحمان، نەهاتووە تادەستمان بگرێ و لەقەیرانەکانمان رزگارمان بکات، بەڵکو قەیرانی قەیرانەکانمان بۆدروست

دەکات، پرۆژەیەکی پێ نییە تائێمە لەم تونێلە کوردییە دەرباز بکات ، بەڵکو رێگای هەموو روناکیەکمان لێدەگرێ).[١] زۆر ناڕاستیشە هەست بەکەمی کردن لای کورد بگێڕنەوە بۆ گۆڕانی پەیوەندی ئەو بەخواوە هەست بەکەمی کردنی کورد بەم واتاو ناوەرۆك و دەستنیشانکردنە جگە لە حیکایەتێکی هەڵبەستراوو وتەیەکی تیۆری و رایەکی پشت راست نەکراوە بە بەڵگەی زانستی، شتێکیتر نییە، هەست بەکەمی کردنی کورد لەو لەحزەوە دەست پێ ناکات کە کورد ئیسلام دەکات بەئایینی خۆی، چونکە تەنانەت گەر لەدیدێکی زانستیانەو خۆرئاواییانەی روتیشەوە مەسەلەکە هەڵسەنگێنین ئیسلام ئایینێکی یەکجار پێشکەوتووترو تێروتەواوترو پێگەیشتووترە لەچاو ئایینی زەردەشتیدا، گەر یاسایەکە باس لە پەیوەندی بەستن بەخواوە بێت بەدڵنیاییەوە پەیوەندی مرۆڤی کوردیە بە خواوە لەچوارچێوەی ئایینێکی یەکتاپەرست و پێگەیشتووی وەکو ئیسلامدا گەرم و گوڕترو راسترو زیندووتر بووە، بەڵام ئەم خوێندنەوە زۆر مەبەستی بوون و نەبوونی ئەو پەیوەندییە نییە، چونکە بەهۆی پاشخانە ئایدیۆلۆژیە چەپەکەیەوە، هەر لەبنەڕەتەوە پەیوەندی مرۆڤ بەخواوە لەروانگەی ئەوەوە هێندە جێگای بایەخی قووڵ نییەو خوا وەك ئەوەی هەیە کەمتر لەهۆش و بیرکردنەوەیدا ئامادەیە.. هێنانە گۆڕێی چیرۆکی پەیوەندی کورد بەخواوەو دروستکردنی داسانی قەیرانی کەسێتی کوردی و تێکشکاندنی بنەماکانی وەك بەرەنجامێ بۆ ئاڵ و گۆڕ لەفۆرم و زمان و رۆحی ئەوپەیوەندیەدا، زیاتر لەو گۆشەنیگایەوە لێکدەدرێتەوە کە بیانوو داتاشین و سەرزەمین و سەنگەر دۆزینەوەیە بۆئاشکراکردنی بوغز بەرامبەر بە ئیسلام و شەڕ لەگەڵ کردنی. ئەگەرنا

لەحزەی مسوڵمانبوونی کورد لە حزەی دابڕانی کورد نییە، بەڵکو قۆناغی مسوڵمانبوونی کورد قۆناغێکی شارستانیی کوردییەو قسەکردنیش لەسەر قۆناغی زەردەشتبوونی کورد گەرسڕینەوەو لەیادکردنی ئەو چوارده سەدەیە بێت لە مێژووی میللەتەکەمان ئەوە بەهەوڵێکی بێ ئومێدی لەقەڵەم دەدەم و هەوڵێکی ترسناك و پڕ لە ئیشکالیەتیشە.[١]

لەحزەی مسوڵمان بوونی کورد لەحزەی دابڕانی کورد نییە لە خودی خۆی و ژیارو فەرهەنگی خۆی ، بەڵکو لەحزەی چوونەوە ناو مێژووە، دابڕانە لەگەڵ مێژوو واقیعێکدا کە رەنگە ئەگەر درێژەی بکێشایە بوونی کورد وەکو نەتەوەو خاوەن کولتورو زمانی سەربەخۆ بخستایەتە بەردەم هەڕەشەیکی جددیەوە، بەهۆی نزیکی و تێکەڵاوی فەرهەنگ و زمانی کوردی و فارسی و دەسەڵاتداربوونی بنەماڵە فارسەکان و ئەو رەوشەی ژیان و گوزەرانیش کە لەژێر سایەی ئیمراپۆریەتی ساسانیدا حاکم بوو بەسەر ژیانی مرۆڤەکاندا، هاتنی ئیسلام کوردو فارسی یەکسان کرد بەیەك و هەردووکیانی لە بەردەم یەك واقیعدا راگرت و خستنییە بەردەم رێ و جێیەکی هاوبەشی نوێوە، بەهۆی جیاوازی قووڵی نێوان زمانی عەرەبی و کوردی زبان قەومی بوونی ئیسلامیشەوە، ئەو هەڕەشە لەسەر خەڵکە گشتییەکە دورکەوتەوە کە زمانیان بفەوتێ و تیابچێ، بۆ ئەوەی زمانی کوردیش تەنانەت لەسەر ئاستی ژیاری و زانستیشدا جێگای خۆی بکاتەوە دیارە دەیان ساڵی ویستووە هەڵبەتە هەموو ئەم قسانە لەو سۆنگەوە لێکدانەوەیەکی بەجێ دەردەچن کە ئێمە

---

[١] سەرچاوەی پێشوو/ل٦٨.

لەوە بووبینەتەوەو کە زەردەشتی بەئایینێکی کوردی دابنێین کە قسەیەکی لەم جۆرە لەرووی مێژووییەوە دەبێت بەهۆشیاریەوە بیکەین، چونکە بەڵگەو شیکردنەوەو توێژینەوەکان بەشی ئەوە ناکەن هەرچی سەرچاوەی گومان هەیە لەم رووەوە وشکی کەن و نەیهێڵن،، چونکە فارسەکانیش ئایینی زەردەشتی بەئایینی خۆیان دەزانن، خۆئەگەر هیچ پرسیارێکێش لەسەر کوردبوونی زەردەشتی دانەنێین و تەسلیم بین بەو رایەی کوردبونی دەکاتە راستیەکی مێژوویی، ئەو کاتە تێڕامانی ئێمە لە پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدارێتی ساسانی و زەردەشتی و فارس و زەردەشتی چەندین پرسیارمان بۆ دروست دەکات کە ناکرێ هەروا بە سادەیی پشت گوێیان بخەین و لەسەریان نەوەستین، لەو پرسیارانەش ئەوەیە، گومانی تیانییە کە زەردەشتی ئایینی رەسمی دەرباری ساسانی بووە، ئایینی دەسەڵاتدارو ئیمراتۆریەکانی ئەوکاتەش ئامرازێکی کۆنترۆڵکردنی خەڵك و پایەکی گەورەی دەسەلات و شەرعیەتی ئەو دەسەڵاتە بووە، ئەگەر راست بێت لەو قۆناغەدا باس لە شەرعیەت بکەین. لێرەوە دەکرێ بپرسین ئایا بەرەسمی کردنی ئەم ئایینە نەبووە هۆی پوکانەوەی بەشێکی بەرچاو لە ماناکانی؟ لە روویەکیترەوە گەر بڕیار بێت فارسەکان لەوقۆناغە دا پەیڕەوی ئایینی کوردی بووبن و کردبێتیان بەئایینی رەسمی ئیمپراتۆری ساسانی، کەواتە هەر لەبنەڕەتەوە ئایینێکی نەتەوەیی پەیڕەوکراویان نەبووە گەر بەوجۆرەش بێت ئایا ئەم تێزە پێمان ناڵێ بۆچی فارس تووشی ئەو شکستە رۆحییە نابێت؟ بۆهاتنی ئیسلام لەناو سەرجەم ئەو گەل و نەتەوەو گروپە بەشەریانەی بڕوای پێ دێنن و شوێنی دەکەون تەنها کەسێتی کورد

تێکدەشکێنێ و بەگوتەی (کاك عەتا قەرەداغی) ڕۆحی کورد ناگات بەپلەی ڕەهایی خۆی کە ئەویش پێکهێنانی دەوڵەتە.[١]

لەڕوویەکیترەوە تۆ بڵێی مەبەست لەوروژاندنی مەسەلەی زەردەشتی بوونی کورد چی بێ؟ تەنانەت بەجۆرێ وا لە هەندێ کەس بکات بەناوی فکرو ناوەندە ڕۆشنبیریە کوردییەکەوە بەپشتگوێ خستنی سەرجەم بنەما زانستیەکان و واقیعی مێژوویی و ئێستاش باس لەوە بکەن تەنانەت لەسۆنگەی خواناسی و یەکتاپەرستی رووتیشەوە زەردەشتی لە ئیسلام پێشکەوتووتر خاوێنترو تەواوتر بووە.[٢]

ئایا ئەو کەسانە دەیانەوێ زەردەشتی جارێکیتر لەهۆش و یاداوەری و ژیانی ڕۆحی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی کورددا ئامادەیی پەیداکاتەوەو بیێتەوە ئەو بناغە کوردییەی جارێکیتر کەسێتی کوردی بنیاتبنێتەوەو لەوتێکشکاوییە مێژووییە رزگاری بکات کە پرۆسەی فەتح دووچاری کردووە؟[٣] واتە بیێتەوە ئەو پردەی بوونی کورد بەرەگ و ریشە ئایینی و ژیاری و کلتوریە ڕەسەنەکەی خۆیەوە گرێ بداتەوە، وەك ئەوانەی بەم جۆرە قسە دەکەن پێیان وایە هەرلێرەشەوە ڕۆحی کوردی ڕێڕەوی بەرەو ڕەهایی چوونی خۆی تەی دەکات و دەگات بەدوا ترۆپکەکانی شکۆو بەرەنجامیش جەبری مێژوو جوگرافیاو نەفرەتەکانی پەیوەندییەکانی هێز لە بەردەم سام و گەورەیی هەڵسانەوەیەکی کوردی پەیامداردا یەکسان دەبن بەسفرو ئەو

---

[١] کاك عەتا قەرەداغی ئەو وشە زۆر دوپات دەکاتەوە لە کتێبەکەی خۆیدا (چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لەکۆمەڵگای کوریدا)

[٢] ئەکرەمی میهرداد.

[٣] هەروەك کاك عەتا قەرەداغی لە (تێکشکاندنی کەسێتی کوردیدا) ئامازەی پێدەکات.

زەمەنە کوردیەش دەستپێدەکات کە کورد وەك مرۆڤ و نەتەوەش خۆی تیا دەدۆزێتەوە و بەناسنامەی سەربەخۆی خۆیەوە دەچێتەوە ناو مێژوو لەچوارچێوەی قەوارە نەتەوەیی خۆشیدا لەئاستی جیهانیدا بەوپەڕی کارایی و ئەکتیڤییەوە گوزارشت لەرێ و جێ و پەیامی خۆی بداتەوە لەم گەردوونەدا؟!

هەڵبەتە بەسەرنجدانێکی سەرپێیی ئەم جۆرە بیرکردنەوە دەبێت بەقسەیەکی سادە،، چونکە رەگ و ریشەی ئیسلام لەناو ناخ و پێکهاتەی کەسێتی کوردی و فەرهەنگ و مێژوو و ئێستای کۆمەڵگای کوردیدا، زۆر لەوە ریشەدارترو بەهێزترە رێگابدات شتێکی لەم جۆرە روویدات، ئامادەیی ئایینی زەردەشتیش لەیادەوەری کوردیدا زۆر لەوە لاوازترە بتوانێ نەك کاری لەم جۆرە، بەڵکو کارتێکردنی زۆر سەرەتایشی بۆسەر ناسنامەو عەقیدەی ئیسلامی کورد هەبێت، چونکە زەردەشتیەت نەك لە یادەوەری مرۆڤی کوردیدا ئامادەیی نییە، بەڵکو لە فۆلکلۆری کوردیشدا زۆر کەم نەبێ ناتوانی رەمزەکانی ئەم ئایینە بدۆزێتەوە ئامادەیی زەردەشتیەت گەر بتوانرێ باسی بکرێ تەنها لای چەند کەسانێ باسی هەیە کە بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن، بێگومان ئەوانیش بەشێك لەسۆنگەی هەڵوێستی سلبیان بەرامبەر خودی (ئایین) خۆی خوازیاری ئامادەکردنەوەی (ئایینی زەردەشتی) وەکو ئایین نین ، بەڵکو زیاتر وەکو کەلەپورو کلتورێك، بەڵام ئایا ئەمانە بێئاگان یاخود خۆ بێئاگا دەکەن لەوەی تەنانەت لەم ئاستەشدا واتە لە ئاستی کلتوریشدا بۆ ئەوەی رەمزو فەنتازیاو رێ و رەسم و شێوەژیان و سروت و بنەماو بەها گەلێك ببێ بەکەلەپورو کلتورو شەرعیەتێکی میللی وەبەدەستبێنێ و لەکایە جۆراوجۆرەکانی ژیانی رۆحی و ماددیدا ئامادەیی و رەنگدانەوەی هەبێت،

خوازیاریِ سەدان ساڵ زیاترە؟ گەر نەتەوایەتیش لەرووبەکەوە گەڕانەوەبێت بۆ کلتوری نەتەوە، کلتوری نەتەوە بەمشێوەیەو بەسەرە قەڵەمی هەندێ نووسەرو ئاواتخواستنی ئەوان ناخەملێ و ناشبێ بەسەرچاوەی ئەو سەرمایە رەمزییەی هەموو (ناسیونالیزم)ێك بۆلەسەر پێ وەستان و گەشەکردنی خۆی پێویستی پێیەتی.

لەگەڵ بوونی هەموو ئەو رێگریانەو نەبوونی باس و خواسێکی وا لەبارەی زەردەشتیەتەوە لەبیرکردنەوەو یاداوەری مرۆڤی کوردیدا، خاوەنانی ئەم تێزە پێمان نالێن لەرێی چ میکانیزێکی فکری و رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆحییە وە دەتوانن زەردەشتی بوون بخەنەوە ناویاداوەری کوردی و لەپرۆسەی بنیاتنانەوەی کەسێتی و پەروەردەی نەتەوەییدا ئامادەی بکەنەوە؟

ئەمە لەکاتێکدا گەروا دابنێین زەردەشتی لەرابردووی کوردیدا کاریگەربووەو توانیویەتی لەسەر عەرشی سۆزو ناوەوەی مرۆڤی کورددانیشێ، بەڵام لەراستیدا (زەردەشتی) وەك ئایین لەژێر پرسیاری جدیدایە چەندین گومان و تەم و مژی بەدەورەوە هەڵچنراوە، چونکە ئەو پچڕانە ئەبەدی و قوڵەی کورد لەگەڵ زەردەشتی تەنها بەهاتنی ئایینی ئیسلام لێکنادرێتەوەو پەیوەندی بەسروشتی ئایینی زەردەشتی خۆی و جۆری پەیوەندی مرۆڤی کورد بەو ئایینەوە لەمێژوودا هەیە.

ئەوەی تائێستا دەربارەی کاتی راستی لەدایکبوونی زەردەشت و مێژووی ژیانی و کەسێتی ئەو وتراوەو دەوترێن تەنها هەوڵن بۆئاشکراکردن و دۆزینەوەو گەیشتن بەراستیەکان.

تاکو ئێستاش بەتەواوی شوێنی لەدایکبوونی زەردەشت، نەزانراوە شوێنیش گرنگە بۆ ئاشکراکردنی نەژادو رەگەزو زمانی ئایینەکەی، تاکو ئێستاش زۆری لەمێژوونووسان ئایینی زەردەشتی بەئایینی فارسی لەقەڵەم دەدەن و زمانی ئافێستاش لەکوردی دوور دەخەنەوە.

پەیڕەوو پرەنسیپی ئایینی زەردەشتی تاکو ئێستا بەتەووای ئاشکرا نییە ئەگەر سەرنجی ئایینی زەردەشتی بدەین وەکو پەیامی رۆحی و ئایینی کورد لە رابردوودا ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کەسێ بنەمای سەرەکی مسۆگەرکردنی ناسنامە ئاشکران کە ئەوانیش بریتین لە (کات، شوێن، ماهیەت لە پرنسیپ. بۆیە زەردەشتییەت وەکو ئاین لەرابردووشدا هیچ ئامادەییەکی وای لەژیانی کوردیدا نەبووە گەرناویشی مابێتەوە رەنگە بەهۆی فارسەوە بێت کە بەئایینێکی کۆنی خۆی دەزانی[1] زەردەشتییەت لەروانگەی کورد خۆیەوە وەکو رابردوویەکی ون و بێ ناسنامە لێی دەڕوانرێن، کەواتە بەگوێرەی کورد ئایینی زەردەشتی کەینونەیەك نەبووە کەتواناى سەلماندنی خودی خۆی لەمێژوودا هەبووبێت.[2]

ئەگەر ئەمە واقیعی مێژوویی بێت هەر ئەو قسەو هەولانە نابن بەراکردن بەدوای سەرابێکداو جووت کردن لەناو دەریادا ناگەیەنێ و، جگە لە نانەوەی هەندێ فەوزاو پاشاگەردانی لەناوەندە رۆشنبیریەکەدا هیچ بەرەنجامێکیتری رۆشنی لێدەکەوێتەوە؟

---

[1] هەمان بانگەشەی گەڕانەوە بۆ زەردەشتییەت کاتی خۆی لەناو ناسیونالیستە ئێرانییەکانیش لەئارادابوو، لەم رووە بگەڕێوە بۆ کتێبەکەی ریچارد حاتم (ناسیونالیزم در ایران) تهران ١٣٧٨.

[2] عەتا قەرەداغی / تێکشکانی کەسێتی کوردی. ل٦٧ – ٦٩.

هەموو ئەو تێزو لێکدانەوانەی باس لەوە دەکەن پرۆسەی فەتح کەسێتی و زمان و داب و نەریت و کلتوری کوردی تێکشکاندوە، زیاتر قسەیەکی ئایدیۆلۆژی و سیاسین و ناچنە خانەی راڤەکردنێکی جددی و زانستییانەی قووڵەوەو، بەڵگەشە لەسەر سنورداربونی ئاسۆی بیرکردنەوەو هەژاری توانای لێکدانەوەو ئەوکەرەسە مەعریفیانەش کە لەم رووەوە بەکاردەهێنرێن سادەیی ئەم گریمانەو چەندین گریمانەیتر لەوێوە وەدەردەکەوێ کە لەسەر بناغەی گریمانەیەکیتر دارێژراوە کە ئەویش بەزۆر سەپاندنی ئیسلامە؟!

ئەم تێزە بەسود وەرگرتن لەناوەندێکی پرسیار نەکەرو بەسەرا تێپەڕینی دوگماکان و گومان نەکردن لەو گوتارانەی دەرهاویشتەی دۆخێکی نەخۆش و قۆناغێکی نائاسایین لەهەوڵێکی نائومێد کەرانەدا دەیەوێت شەڕکردن لەگەڵ دەرباری ساسانیدا یەکسان بکات بەشەڕکردن لەگەڵ کورد! هەروەها وادەبینێ کورد لە سایەی ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا رەوشی باشتر بووە وەك لەسایەی ئیسلامدا! کە بەدیوەکەیتردا ئەم جۆرە رۆشنبیرانە دەچنە سەنگەری داکۆکی کردن لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی لەکاتێکدا مێژوو بەم جۆرە پێکنەهاتووە.

بوونی شەڕ لەسەر زەوی مێژوویی کوردان واتای شەڕکردن لەگەڵ ئیسلام ناگەیەنێ، چونکە ئەوسەرزەوییە هەر لەبنەڕەتەوە لەرووی دەسەڵات بەسەردا پەیدا بوونەوە بەشێ بووە لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی ساسانی، دەبێ هەڵگرانی ئەم تێزە پێمان بڵێن بۆدەبێت کوردو غەیری کورد شەڕی مانەوەی ساسانییەکان بکەن؟

شەڕکردن لەناو سوپا زۆرە ملێکانیش نەئەوساو نەئێستاش ئەوەندەی ملدانە بەپرۆسەی بێ ئیرادەکردنی مرۆڤ و بەمێگەل بون و بونە ئامێر بەدەستی دەسەڵاتدارانەوە هەرگیز یەك لەسەر سەدی ئەوە بەرگریکردن لەپرۆژەیەك نییە یاخود بەرگریکردنێك نییە پەرۆشی و ئیرادەی ئازادی لەپشتەوە بێت، تەنانەت پەرۆشی بەشێکیش لەخەڵك لەژێر هەل و مەرجێکی دیاریکراودا نابێ بەپەرۆشی سەرجەم خەڵك و کۆمەڵگا. لەبەرئەوە دەبێت لەرۆحی مەزنی ئیسلام و رەهەندە رۆحییە قوڵەکەی و بانگەشەکردن بۆ عەدالەتخوازی سڕینەوەی جیاوازییە نەژادی و رەگەزی و رەنگی و زمانی و شێوازەکانیتری جیاوازییەوەو لێبوردەیی و یەکتاپەرستییە رۆشنەکەی بۆ مسوڵمانێتی گەلان و لەوانەش موسڵمانبوونی گەلی کورد بگەڕێین، راستە شەڕەکانیش بایەخی گەورەی خۆیان هەبوو لەم پرۆسەی مسوڵمانبوونەدا، بەڵام نەك لەو سۆنگەوە بەزۆر ئیسلام بەسەر خەڵکدا فەرزکرابێت ، بەڵکو لەو رووەوە کەسام و شکۆی نامرۆڤانەی دەربارو ئیمراتۆرو دەسەڵاتدارانی زۆرداری ئەوکاتەی وردو خاش کردووەو کەشێکی خولقاندوەو زەمینەیەکی سازاندوە خەڵکی بتوانن بۆتاوێ بەدەر لەهەڕەشەو کۆنترۆڵکردنی رۆحییەوە مرۆڤەکان بیر لە چارەنووسیان بکەنەوەو هەڵوێست و ناسنامەی ئایینی خۆیان و شێوە ژیانی ئاییندەیان دیاری بکەن.

ستراتیژیەتی (ئیسلام)یش لەسەر تێکشکاندنی زمان و داب و نەریتی گەلان دانەمەزراوە،، چونکە ئەگەر وابووایە دەبوایە لەماوەی (١٤٠٠) ساڵی رابردوودا ئەوەی پێی دەوترێت داب و نەریتی گەلانی مسوڵمان و لەوانەش گەلی کوردو زمان و فەرهەنگ و کەلەپوری تایبەت بەخۆیان لەدەست بدایەو بتوانایەوە.

لەکاتێکدا ئێستا کورد بە بەراورد لەگەڵ گەلانی مسوڵمانی دراوسێی سەرەڕای هاوبەشبوونی هەموویان لەمسوڵمان بوون و چوونە ناو بازنەی ئیسلامەوە نکولی لەوە ناکرێت کە خاوەنی داب و نەریت و کەلەپورو فەرهەنگی تایبەت بەخۆیەتی کە ناسنامەو کەسێتی تایبەتی کورد لەناو گەلانی ناوچەکەو جیهاندا دیاری دەکات.

ئەوەندەی پەیوەندی بەزمانیشەوە هەبێت بوونی زمانی عەرەبی بەزمانی زانستی و ژیاری مانای سڕینەوەی ڕۆڵی زمانەکانیتر نەبووە تەنانەت لەبازنە تایبەتییەکەی پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤیشدا (زمانی کوردی شان بەشانی زمانی عەرەبی نزیکە لە هەموو مەراسیمێکی ئایینی و تەنانەت لەهەندێ فەرزیشدا بەکار دەبرێت، وەکو مارەکردن، تەلقیندانی مردو، دوعاکردن، جەژن، یادی لەدایکبونی پێغەمبەر (د.خ) و.. هتد نەك هەر ئەوەندە ، بەڵکو تەنانەت بەشێکی نوێژیش کە فەرزێکی ئیسلامی سەرەکییە بەکوردی دەبێ: وەکو نییەت هێنان بۆ نوێژکردن (بەبێ نییەت هێنان نوێژەکە بەتاڵە هەروەها دوعاکردنی دوای نوێژ، کەواتە دەتوانین بڵێین زمانی کوردی بەرادەیەکی زۆر خراوتە نێو ئایینی ئیسلامەوە لەکۆمەڵگای کوردیدا، ئەم پرۆسەیەش هەر بەردەوام دەبێ و زیاتریش دەبێ).[١]

هەڵبەتە هەڵەیەکی یەکجار گەورەی ئەم جۆرە لێکدانەوەیەو بەستنەوەی تێکشکانی کەسێتی نەتەوەیی بەگۆڕینی ئایین لە قووڵایی مێژوودا، لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەم جۆرە ڕۆشنبیرانە ئایین دەکەنە بەرهەمێکی نەتەوە تەنانەت بەمانا

---

[١] د. ڕەشاد میران، دەوروبایەخی زمانی کوردی لە پرۆسەی ئیتنۆ – کۆمەڵایەتیدا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی / ژمارە١٠/ شوباتی ١٩٩٩ ل٣٥.

ناسیونالیزمیە هاوچەرخەکەشی! بەگوێرەی ئەم بۆچونەش بێت ئایینێ بۆ ئەوەی نەتەوەیەك تووشی نامۆ بون لەگەڵ بوونی خۆی نەکات و بنەماکانی کەسێتییەکەی پارێزراوکات دەبێت لەکارگەی نەتەوە خۆیەوە سەری هەڵدابێ و سەرچاوەی گرتبێت و گەشەی کردبێت، هەر لەم کاتەشدایە ئەم ئایینە دەبێتە کلتورێکی رۆحی نەتەوەو بناغەیەك بۆژیاری و فەرهەنگەکەی، بۆسەلماندنی ئەم رایەش هەندێ جار تووشی لێکدانەوەی ناراست هاتوون ، بۆ نموونە یەکێ لەم نوسەرانە دەربارەی پەیوەندی ئەوروپا بەئایینی مەسیحییەتەوە دەڵێ: (مرۆی سەربەست کاتێ پەیوەندی خۆی لەگەڵ خودا بەسەربەستی بینا دەکات، لەهەمان کاتدا ژیاری خۆی دروست دەکات لە خەسڵەتی ئینسانی و پێناسەی نەتەوایەتی خۆی دەدۆزێتەوە ئەوروپا هەمیشە لەرێگای پیادەکردنی گۆڕانی سیاسی و قەیران و دیالۆگەوە لەگەڵ کەنیسەدا شۆڕش و پەیمانە کۆمەڵایەتیەکانی خۆی دەستپێکردوە.

ئەوروپا زۆر زوو بەسەر خورافەکانی دیندا سەرکەوت، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری ئەو خەسڵەتە خۆییە ژیارییانە نەبووە کەکەسێتی ژیارییانەو مێژووییانەی مرۆی ئەوروپی بەکەنیسە دەبەستێتەوە.[1]

ئەم نووسەرە لەپێناو بەڵگەداتاشین بۆراکانی کەوتۆتە هەڵەیەکی زەقەوە، چونکە ئایینی مەسیحی بەئایینێکی ئەوروپی دادەنێ و نازانێ مەسیحیەت ئایینێکی خۆرهەڵاتییەو زێدی مێژوویی مەسیحیەت شام و فەلەستینەو، لەخۆرهەڵاتیشەوە پەرپوەتە خۆرئاواو دواتر تەشەی کردووەو سەراپای ئەوروپای خستۆتە ژێر سێبەری

---

[1] ئیسماعیل حمە ئەمین، هەمان بابەت و سەرچاوەی پێشوو/ل١٣٦

خۆی و بووە بە ناسنامەی ئایینی و رۆحی نەتەوەکانی، کەواتە ئەم نموونە بۆچوونەکانی نووسەر خۆی هەڵدەوەشێنێتەوەو دەیسەلمێنێ کە ئایینی بۆ ئەوەی ببێ بەکەلتورێکی رۆحی گەورە بونەتەوەیەك مەرج نییە ئەو ئایینە بەزمانی ئەو نەتەوەو لەناو خۆیدا سەریهەڵدابێ، چونکە (ئایین توخمێکی هەرە گرنگی کلتوری گیانییە بۆیەش کەواتە هەمیشە نەتەوەییە تەنانەت گەر ئایینەکە لە بێگانەشەوە وەرگیرا بێت)[1] بەڵگەش ئەورووپاو گەلانی ئەورووپایە هەرچەندە مەسیحیەت ئایینێ بوو لەخۆرهەڵاتەوە سەری هەڵدابوو، بەڵام بوە بناغەی ناسنامە ژیاری و کلتوری رۆحی ئەو گەلانە نابێ لەبیری نوسەریش بچێت تاسەدەی (١٦) هەم و سەردەمی سەرهەڵدانی بزاڤی ریفۆرمی ئایینی و چاخی رێنیسانسی ئەورووپی زمانی کەنیسەو پیاوانی ئایینی مەسیحی و کتێبی پیرۆز زمانی لاتینی بوو نەك زمانە نەتەوەییەکانی وەکو فەرەنسی و ئینگلیزی و ئیتالی و ئەڵمانی، ئەمەش ئەوە دەخاتە روو کەئایینەکان بەتایبەتیش ئایینە ئاسمانییەکان ئایینی بان نەتەوەیین و موڵکی نەتەوەو میللەتێکی دیاریکراو نین.

تەنانەت ئایینی بوزی کە ئایینی ئاسمانیش نییە، کەچی لە یابان و کۆریاو ڤێتنام و کەمبۆدیاو تایلاندو بەشێ لە چین و چەندین وڵاتیتر بڵاوەو ئایینی ئەو نەتەوە جیاوازانە پێکدەهێنێ.

لەگەڵ تیپەڕبوونی رۆژگارو کارلێکی بەردەوام و فرە رەهەندو هەمە جۆری ئەم ئایینانەش لەگەڵ گەل و نەتەوەکاندا مۆرکی خۆماڵی وەردەگرن و لەرووی

[1] رەشاد میران، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤.

کلتوریەوە تێکەڵ بە توخمە کلتوریە نەتەوەییەکە دەبن و تاسەرەنجام دەبنە بەشێکی بنەڕەتی لەکلتوری رۆحی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و تەنانەت سیاسیش، هەڵبەتە بەرەچاوکردنی پانتایی تواناکانی کارتێکردنی هەر ئایینێك و جۆراوجۆری بایەخەکانی و ئەوروپێوەش کەلەژیاندا کاری تیادەکات و شوێنەواری خۆی بەسەریەوە جێ دەهێلێت، بۆیە قسەکردن لەنامۆبوونی ئیسلام بەکوردو رۆحی کوردو کلتورو فەرهەنگی کوردی دوای تێکەلاوبوونێکی زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵی ئەم ئایینە بەکەسێتی و مێژوو کلتوری کوردی ناچێت .

لەقسەیەکی سادە زیاتر لە هیچیتر ناچێت، چونکە هەندێ سروت و دروشمی ئیسلامی بوون بەربەستی لەداب و نەریتی میللی بۆ نموونە: جەژنەکانی رەمەزان و قوربان گەر لەرووەیەکەوە جەژنی ئایینی بن لە روویەکیترەوە جەژنی میللی خەلکی کوردستانن، چونکە ئیسلام و توخمە کلتورییە ئیسلامییەکان زۆر دەمێکە بە ئەندازەیەك تێکەڵ بەرۆح و فەرهەنگی رۆژانەی خەڵك و ژیانی رۆژانەیان و بەهاو مەراسیم و بۆنەکانی بووە بوون بەبەشێ لە بۆنە میللیەکانی خەڵك.

هەرلەو ساتەشەوە کە نووسینی کوردی پەیدا دەبێت، ئەو کلتورەی بەرهەم دێت لەگەڵ رۆح و ژینگە کوردییەکەدا بەرهەم دێن، ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری و نالی و مەحوی و دەیان شاعیرو بوێریتر کەس ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات لەناوەندە ئیسلامییە خۆماڵییەکەوە سەریان هەڵداوەو بەرهەمەکانیشیان تێکەڵ بەهەناسە عیرفانییە ئیسلامیەکەیە، تەنانەت حاجی قادر وەك رێبەرێکی بەرایی فکری نەتەوەیی کوردی لە روویەکەوە بەکوردی نووسینی بەوجۆرە پاساوداوە تانەوترێت بەکوردی نەکراوە مەدحی باری.

باسکردن لەنامۆیی و بێگانەبوونی ئیسلام جگە لەوەی لە قسە بزرکاندنێك بەولاوە هیچیتر نییە سەردەکێشێ بۆ نامۆ لەقەڵەمدانی هەموو ئەو کلتورە کوردییەش کە بەشێوەی جیاواز ئیسلام بەرۆحی کوردی لەبەر هەمهێنانیدا ئامادەیەو ئەوانەی بەرهەمیشیان هینانەوەی خۆیان رەمزی شانازی کردنن بەئیسلام و مسوڵمانبوونی خۆیانەوە، ئەم قسە تا پیرەمێردی شاعیرو دانای کوردیش راستە... پیرەمێرد گەر لە زینداندا بەسوتاندنی جل و بەرگەکانی خۆی یادی نەورۆزی کوردەواری بەزیندوو راگرتبێت، لەلایەکیترەوە بەگەڕانەوە بۆ شیعرە عیرفانییەکانی تێدەگەین ئیمانە ئیسلامییەکەشی چ ئاگرێکی رۆحی و مەعنەوی گەورەی لەدڵ و دەروونیدا داگیرساندووەو چۆن بەوشەکانی ئەو زمانە کوردییەکەی ناسکترین گوزارەی داوەتەوە لە پەیوەندی نێوان بەندەیەك و پەروەردەگاریدا.

ئیتر ئەوانەی دەیانەوێ بەمەحوی و پیرەمێردو دەیانیتر بڵێن ئێوە بەهەڵەدا چوون کاتێ جەخت لەسەر رەهەندە موسڵمانبونەکەی خۆتان دەکەنەوەو بەهاوسەرەتا ئیسلامیەکانیش لەدوو توێی قەسیدەو بەرهەمەکانتاندا ئامادەیە، چونکە بەم کارەتان پرۆسەی نامۆکردنی کورد بە خود و ژیارو مێژووی نەتەوەیی خۆی فرە رەهەندترو قوڵتر دەکەنەوە، دەبێت جگە لەدووبارە کردنەوەی هەندێ دۆگماو خوێندنەوەیەکی جەوهەر گەرایانەی بێ جەوهەر بۆ پەیوەندی نێوان ئیسلام و کوردو کەسێتی کوردی چیتر بکەن؟

ئەگەر ئەم تێزو لێکدانەوە لەرووبەکەوە زەربێکی راست و چەپ هێنان بێ بە سەرکەلتورو بەشێ کەلەپوری کوردیداو گومان دروست کردن بێ لەو رەمزانەی

پایەگەورەکانی پێکدەهێنن و بەتاریك نیشاندانی هەزارو چوار سەد ساڵ لەژیان و مێژووی نەتەوە بێت ، کە ئەویش قۆناغی ئامادەبوونی ئیسلامە، لەو ڕوانگەوە کە کورد گەلێکی مسوڵمانەو دژایەتی ئیسلامیش بمانەوێ و نەمانەوێ یەکسانە بە دژایەتی کردنی ئایینی نەتەوە، دژایەتی کردنی ئایینی نەتەوەش بەمانا ناسیونالیستیەکەی واتە هەوڵدان بۆ هەژارکردنی ناسنامەی نەتەوەیی و بێ بەشکردنی لەو سەرچاوانەی بەهاو وزەی رۆحی و مەعنەوی لێوەردەگرێت، کەواتە گەر مەسەلەکە بەمجۆرە بێت و لەروانگەی خەون و بەرژەوەندی ناسیونالیستانەوە ئەم هەوڵە نەك بێ پاساو بێت، بەڵکو هەوڵێکی گومان لێکراویش، بێت ئەی داخۆ دەبێت بۆ ئاشکراکردنی پاڵنەرەکان و ئەوبیرکردنەوەی لەپشت ئەم تێزەوە وەستاوە پەنا بۆ کام رێبازی لێکدانەوە بەرین؟ لەراستیدا گەڕان بۆ تەفسیرێکی قایلکەر بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەو لێکدانەوەیەکی راست و دروستی ئەم حاڵەتەی دنیای رۆشنبیری و سیاسی کوردی، پشکنینی ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتی کوردی دەوێت،، چونکە رەگەکانی لەوێدا شاراوەتەوە.

**مارکسیزم و ناسیونالیزمی کوردی**

ناسیونالیزمی کوردی یەکێکە لەو ئایدیۆلۆژیانەی چەندە لەشەڕێکی سیاسیدا بووبێت لەگەڵ مارکسیزم، بەڵام هەمیشە لەخزمایەتیەکی ئایدیۆلۆژیا بووە لەگەڵی.[١]

---

[١] بەختیار عەلی، سەدەی ناسیونالیزم، رەهەند، ژمارە ٩ – ١٠/٢٠٠٠، ل١٤٨.

گەر سەیری گوتاری حزبە سیاسەکان و رۆشنبیرانی هەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی کوردستان بکەین دەبینن بەپلەو ڕاددەی جیاواز گوتاری بەناویەکدا چونی ناسیونالیزم و سۆشیالیزم بوو، ئەوکاتە زیاتر باس لە چارەسەرێکی دیموکراسیانەو سۆشیالیستانەدەکرا بۆ کێشەی کورد.[١]

دیارە هەر لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکانەوە وردە وردە مارکسیزم و گوتاری سۆشیالیزم تێکەڵ بەناوەندە رۆشنبیری و سیاییەکەی کورد بووە، کوردەکان جگە لەوەی لەچلەکاندا حزب لەسەر بناغەی چەپگەرایی پێکدەهێنن دەبنە توخمێکی چالاکی ناو پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش، بەجۆرێ ئەو پارتە لەکوردستاندا بووە کێبرکێکارێکی گەورەی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردیی ، کە لەنیوەی دووەمی چلەکان بەدواوە پارتی دیموکراتی کوردو دواتر کوردستان دەبێتە نوێنەرو ئاڵاهەڵگری، بەڵکو لە پەنجاکاندا خودی بزوتنەوەی ناسیونالیستییەکەش لەژێر فشاری دۆخە جیهانی و تەوژمە شۆڕشگێریە چەپەکەی ناوچەکەدا تارادەیەکی بەرچاو دەکەوێتە بەرهەژمونی مارکسیزم و ئەم کارتێکرانەش دواتر شوێنەوار لەسەر جۆری ئەودروشم و چارەسەرو میکانیزمانەش دادەنێ، کە بزوتنەوەی رزگاریی نەتەوەیی بەرزی دەکاتەوەو دەیخاتە روو، ئەو کۆمۆنیستە کوردانەی پان عێراقی بوون، لەگەڵ ئەوەی باسیان لەکوردو کێشەی کورد کردووە، بەڵام ناتوانین باوەڕ بەوە نەکەین کە کێشەی چینایەتی بۆ ئەوان، بەحوکمی جیهانبینییە مارکسییەکە پرسی یەکەم بووە، هەر لەو سۆنگەو لەروانگەی گومانکردنیان لەوەی کورد نەتەوە

[١] لەنێوان مۆدێرنەو ئیسلامی سیاسیدا/ مەریوان وریا قانع/ رەهەند ژمارە ١١/٢٠٠٠ ل٣٩.

بێت بەگوێرەی پێناسە ستالینییەکە بۆنەتەوە، رێگربوون لەوەی پارتێکی سەربەخۆی کۆمۆنیستی کوردی دابمەزرێ لەبەرئەوەی بەگوێرەی خوێندنەوە مارکسییەکان کارێکی لەم جۆرە ناکۆکییە لاوەکییەکان دەکات بەسەرەکی و مانای دەمارگرژی نەتەوەیش دەگەیەنێ و زیان بە تاوسەندن و یەکریزی چینایەتی و خەباتی چینی پرۆلیتار دەگەیەنێ لەسەرە رێی خەباتکردنی شێلگیرانەی خۆی بۆ گەیشتن بەئامانجە چینایەتی و نیشتمانییەکانی، هەڵبەتە لەهەفتاکانەوە کوردستان شایەتی وەدەرکەوتنی گروپی مارکسی ناسیونالیستیە، کە لێرەدا ئێمە مەبەستمان نییە باس لەو دیاردە بکەین و ئاکام و رەنگدانەوەکانی شی بکەینەوە.

لەم بارەیەوە کاك عەتا قەرەداغی دەنووسێ: (مارکسیزم.. وەکو کلتورێکی ئامادەو لەدەرەوە هێنراو نەتوانراوە بکرێت بەبنەمایەك بۆ خوێندنەوەی کەسێتی کوردی و دەرخستنی سیفاتە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی کورد، تا لەو روانگەیەوە گەوهەری گرفتی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری کورد دەربخرایەو قسە لەسەر پرۆژەی بنیادنانەوەی کەسێتی کوردی و بەوپێیەش گوتاری نەتەوەیی کوردی بکرایە، تێڕوانینی مارکس یان کۆمۆنیستی لە کوردستاندا ئەگەر بەمەبەستیشەوە نەبوبێت لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنان و بەهەڵە لێکدانەوەیدا دەوری سەلبی لەسەر شێواندنی گوتاری نەتەوەیی کوردی و ویستەکانی ئینسانی کورد هەبووە، بەواتایەکیتر دەتوانین بڵێین کەلتوری مارکسی و کۆمۆنیستی رۆحی گوتاری نەتەوەیی کوردی لە نێو گوتاری نێو نەتەوەیی پرۆلیتاریادا تواندۆتەوە خەباتی

نەتەوایەتی لەپێناو مافە نەتەوایەتییەکاندا کە ناسیونالیستە و کۆنەپەرستە و لەخەمی کەلتوری نەتەوەییدایە کە کەلتورێکی دزێوو دواکەوتووە.[١]

لێرەدا ناتوانم سەرسوڕمانی خۆم لە چاوەڕوانییەکانی نوسەری ئەم پەرەگرافە لە مارکسیزم، بشارمەوە ئەو دەیەوێت مارکسیزم تەفسیری کۆمەڵگای کوردی و رەگەزە پێکهێنەرەکانی بۆبکات و ببێتە بنەمایەك بۆخوێندنەوەی کەسێتی کوردی و گرفتە جۆراوجۆرەکانی و لەوێشەوە بیناکردنەوەی ئەم کەسێتیەو گوتارە نەتەوەییەکەی! لەراستیدا ئەم چاوەڕوانییە لە مارکسیزم لەشوێنی خۆیدا نییە، چاوەڕوانی ئەرکێکە کە بە مارکسیزم ئەنجام نادرێت، جیهانبینی و ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم و میتۆدو ئامرازە تەفسیرییەکانی لەوەبێ دەسەلاترەو کۆڵەوارترە بتوانێ لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنەی کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای کوردی بکات و هێزە بزوێنەرەکانی دیاری بکات و ئەو یاسایانەی لەناوەوە بەڕێوەی دەبەن بدۆزرێتەوە، چونکە ستراتیژیەتی تەفسیرکردن بۆ مێژوو لای مارکسیزم و دەزگا چەمکییەکەی لەم بارەوە بەتوندی بەململانێی چینایەتییەوە بەستراوەتەوە، وەك تاکە پاڵنەرو بزوێنەری مێژوو ئاڵ و گۆڕە کۆمەڵگاییەکان، هەڵبەت پێویست ناکات بڵێین کەفاکتەری جوڵاندنی ململانێکەش لە جەوهەردا ئابوورییە.

ئێمە گەر قسەکردن لەسەر ئەم ئاستە لەمەڕ پەیوەندی مارکسیزم بەناسیونالیزمەوە بگوازینەوە بۆ ئاستی قسەکردن لەسەر کارتێکردنی ئەم ئایدیۆلۆژی و قوتابخانە فکری و فەلسەفییە لەسەر پرۆسەی هەوڵدان بۆ بێ

[١] عەتا قەرەداغی/ تێکشکانی کەسێتی کورد .

مێژووکردنی کورد و ئەو لێکدانەوە تاك رەهەندییەی دەیەوێت تەنها بەئیسلام و ئامادەیی ئەو لە واقیعی مێژوویی کورددا، سەرجەم گۆڕانکاریە مێژووییەکان و هەڵکشان و داکشانە کوردییەکە لێکبداتەوە، لەلایەکیترەوە هەندێ پەنجە بخەینە سەر بایەخی مێژوو بەناوەرۆکە ناسیونالیستەکەیەوە، لەپرۆژەی وەدەرخستنی ئەو هەموو دژواری و ناکۆکییەی مارکسیەتی کوردی لە لێکدانەوەی مێژووی کوردی و پەیوەندی بەئیسلامەوە تێی کەوتووەو، دەبێ بڵێین سەرەڕای ئەوەی نەیتوانیوە وێنایەکی حەقیقی واقیعی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و کولتوری کورد وەك ئەوەی هەیە وێنا بکات ، بەڵکو لە رێی خۆیەوە کاریگەری نێگەتیڤانەشی بەسەر جۆرو ئاراستەی پەروەردەی ناسیونالیستانەی کورد لەکوردستاندا بەجێ هێشتووە.

گەر چاوێ بەئەدەبیاتی حزبی و بەرنامەی پێگەیاندنی کادر لەناو حزبی کوردیدا بخشێنین رەنگە بە ئاسانی هەست بەو کەلەبەرە بکەین کەلەرووی مێژووییەوە پەروەردەی حزبی بەدەستیەوە ناڵاندویەتی ، ئەمەش کاری کردۆتە سەر جۆری ئەو سەرمایە رەمزییەی گوتاری باو لە ناوەندە رۆشنبیری و سیاسەتدا کردویەتی بەکەرەستەی خۆی لەپرۆسەی رێکخستن و هۆشیارکردنەوەی جەماوەر و ئاراستەکردنیانی .

مارکسیزم لەرووی مێژووییەوە ئەو سێبەرە بووە یاخود ئەو عەبایە بووە کە زۆربەی ئەو نوسەرو سیاسیانەی لەژێر هاتۆتە دەرەوە کە ئەمڕۆ لەدوای تێزی بەئیسلامی کردنی سەرجەم مەینەتی‌یە مێژوویەکانی کوردەوەن با ئەمڕۆش وەك مارکسیست خۆیان دەرنەخەن و دەرنەکەون ، ئەمەش رەنگدانەوەی خۆی هەبووە

بەسەر دروستکردنی باری سەرنجی ئەمان دەربارەی مێژوو بایەخی مێژوو لە دروستکردنی ئالْ و گۆڕو جۆشدانی خەڵك و دروستکردنی ئینتیمادا.

مارکسیزم بەحوکمی ئەوەی ئایدیۆلۆژیایەکی بان نەتەوەییە، ناتوانێ بێتە ئەو چوارچێوەی لە ئەودا کلتوری نەتەوە بەواتا ناسیونالیستەکە جێگای بایەخ بێ و ببوژێنرێتەوەو گەشەبکات، چونکە پۆلێنکردنە بنەڕەتیەکانی کردەی شوناسپێدانی لەسەر ئاستی چینەکانە نەك نەتەوەکان، گوتاری مارکسیزم رووی لەسەرجەم کرێکارانی جیهانە، مێژوو لە دیدی مارکسیزمەوە بەتەواوی جیایە وەك لەدیدی ناسیونالیزمەوە، لەدیدی ناسیونالیزمەوە مێژووی نەتەوە کۆی چالاکی سەرجەم چین و توێژەکان لەدوو توێی بزوتنەوەی ژیاندا دروستی دەکەن، ناسیونالیزم چەند چاوبڕینە ئاییندەیە ئەوەندەش گەرانەوەیە بۆ مێژوو، دەیەوێت لەمێژوودا رەوایەتی پەیدا بکات و شکۆو گەورەیی نەتەوەش لەوێدا بدۆزێتەوەو بیشیکاتە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتوو بۆدروستکردنی فەنتازیاو دەستەبەرکردنی سەرمایەی رەمزی.

رەگ و ریشەی ئەفسانەکانی نەتەوەش لەزۆر کاتدا لەناو مێژووی نەتەوەدا بنج داکوتراون، لەروویەکیترەوە بزاوتی مێژوو تەنها فاکتەری ئابوری و ململانێی چینەکانی لەپشتەوە نییە، بەڵکو تایبەتمەندییە نەتەویەکان هۆکارێکی گرنگی دروستکردنی مێژوو ئاراستەکردن و شکلْ پێدانییەتی، بەڵام لە مارکسیزمدا گەرانەوە بۆمێژوو بۆ ئەوە نییە شوناس بدا بە شوێنکەوتوانی یاخود بۆزیندووکردنەوەی رەگەزەکانی نییە بە واتا ناسیونالیستی‌یەکە، بەڵکو زیاتر بۆ باوەڕهێنان و دۆزینەوەی ئەو جەبرەیە مێژوو بەڕێوە دەبات ، بۆ پەی بردنە

بەسروشتی ململانێکان، بۆ ئەوەیە بیسەلمێنێ لەمێژووشدا نەتەوە لەناوخۆیدا دابەش دەبێ بۆچینەکانی پانتایی مێژوو، لە ئێستاشدا لەسەر ئاستی چینەکان ململانێکان بەڕێوەدەچن، لەم گەڕانەوەیە دەیەوێت بڵێ ئێمە لە مێژووەوە تێدەگەین گۆڕانەکان هەمیشە بەرەو سەرەوە و ترۆپکی رەهایی خۆی کە ئەویش سەرکەوتنی بێ کۆتایی چینی پرۆلیتاریا و پوکانەوەی دەوڵەت و وەدیهێنانی کۆمەڵگای یەکسانە دەڕواتە پێش.

هەر لێرەوە ئەگەر ناسیونالیزم زۆر جەخت لەسەر قەوارەی نەتەوە دەکاتەوە ، بەڵکو لای کەسێکی وەك هیگڵ دەبێتە تاقە فۆرمێك کەشکۆمەندی رۆحی نەتەوەیی تیا بەرجەستە دەبێت و دەدرەوشێتەوە ئەوا مارکسیزم لەرووە تیۆریەکەیەوە دەوڵەت بەدیاردەیەکی کاتی دادەنێ و قۆناغێکە مرۆڤایەتی بەجێی دەهێڵی و دواتر دەگاتە قۆناغی پاش دەوڵەت،، چونکە دەوڵەت شتێ نییە جگە لە ئامرازی دەستی چینێ بۆ چەوساندنەوەی چینەکەیتر، هەرکاتێ ململانێ چینایەتیەکانیش نەمان راستەوخۆ دەوڵەت دەپوکێتەوە.. لەو نێوەندەدا مارکسیزم بۆ جۆشدانی شوێنکەوتوانی دەزگا پڕوپاگەندەییەکەی جەخت دەکاتە سەر ئامادەکردنەوەی بەردەوامی رەمزە چینایەتییەکان و رێبەرە ئایدیۆلۆژیەکانْ نەك رەمزە نەتەوەییەکان، مەگەر لەهەندێ قۆناغی دیرایکراودا کە رەمزە نیشتمانی و ئایدیۆلۆژیەکان لە رابەرێکدا بەرجەستە بێت. هەربۆیە دەبینین بۆ زیاتر لە نەوەیەکی کورد لەدوای پەنجاکانەوە ئەوەندەی مارکس و لینین و ئەنگلزو ماوتسی تۆنگ تەنانەت (ستالین)یش بونەتە ئەو رەمزانەی شانازییان پێوەبکات و بیان کات بەسەر مەشقی خۆی و ئیلهامی خەبات و بەرخۆدانیان لێوەرگرێ، هەرگیزاو هەرگیز

(صلاح‌الدین) و (شێخ عوبێدولّا) و (شێخ مەحمود) و (سەعیدی پیران) یەك لەسەر دەی ئەوان کاریگەری لەسەر سایکۆلۆژی و بیرکردنەوەی ئەوان نەبووە!، هەندێ جاریش ئەو رەمزە کوردیانە شوناسێکی چینایەتی دواکەوتوویان پێ دەدراو لەدەرەبەگ و خاوەن مولکێ بەولاوە هیچی‌تریان لێ نەدەمایەوە! کەواتە مارکسیزم هەر لە بنەڕەتەوە ناتوانێ هۆشیاری مێژوویی لەدیدە نەتەوەییەکەوە لای رۆلّەکانی نەتەوەیەك گەشە پێ بدات، بەلّکو بەپێچەوانەوە دەیەوێت ئەوەندەی دەکرێت یاداوەری نەتەوەیی نەتەوە وێران کات و رەمزەکانی تێکبشکێنرێ و جێگایان پێ چۆلّکات بۆچەمك و بەهاو رەمزو مەخزونە یاداوەریەکانی تایبەت بەخۆی، تەنانەت کاتێ لەبەر گە (لینینی)یەکەیدا باس لە خەباتی میللی دەکات و مەسەلەی مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەکان دێنێتە گۆڕێ، هەرگیز بەواتا (ناسیونالیزم)ەکە ئەم مەسەلانە ناخاتەروو ، بەلّکو لەو روانگەوە چارەسەری پرسەکە دەکات کە لەهەر وڵاتێکدا خەباتی میللی هەبوو چینی کرێکار بەشداری ئەو خەباتە دەکات بۆ ئەوی خەباتە چینایەتیەکەی بکاتەوە بەپرس و ململانێی یەکەم لەناو کۆمەلّگادا، لەبەرئەوەی ئەم خەباتە میللیە لەخەباتی نەتەوەیی جیایە بەئەندازەی جیاوازی دیموکراسی لیبرالّی لە دیموکراسی میللی کە دیسانەوە ئەمەی دوایی مۆدێلی دیموکراسی وڵاتە سۆشیالیستەکان بوو.

جا ئەگەر مارکسیزم خۆی لەخۆیدا تێپەڕاندنی مێژووبێت بەناوەرۆکە ناسیونالیستەکەیەوە بەمۆدێلێکی سەرمایەداری لەقەلّەمبدا و سەرەنجام لەم سۆنگەشەوە دەبێت دوژمنایەتی بکرێت و هەر لێکدانەوەیەك بۆ مێژووی نەتەوە دەبێت تیۆریزەکردنی مارکسیانە لە پشتەوە بێ بۆ ئەوەی مارکسیەکان لەمێژووی

نەتەوەدا، سومبول بۆخۆیان پەیدا بکەن، بۆ نموونە لەمێژووی ئیسلامیدا (ئەبو زەڕ) دەبێتە نوێنەری چینی زەحمەتکێش و لەکوردستانیشدا لێکدانەوەی چینایەتیانە بۆ شیعرەکانی (حاجی قادر) و (مەحوی) دەکرێت.

دیارە دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم دیدە ناچێ کە رەسەشیکارییە مارکسیستیە ئاشکراو ناسراوەکان لەدیاریکردنی هەڵوێستی فیکری و سیاسی دەربارەی مێژوو وەك ئەوەی هەیەو فەرهەنگی کلاسیکی مارکسیزم پێی ناساندووین بەکاربێنێ و لەناو مێژووی ئێمەدا ئیشی پێ بکات، وەك ئەوەی هەندێ رۆشنبیریتری کوردی هەندێ هەوڵی لەو جۆرەیان کرد بەناسنامە مارکسیستیە ئاشکراکەی خۆیانەوە ، بەڵکو چوونە ژێر کارتێکردنە مارکسیەکە زیاتر لەبنیاتنانی دیدێکی سەلبـی دەربارەی ئایین و لەوانەش ئیسلامدا دەردەکەوێت.

واتە ئەوەی ئەم لە مارکسیزمی وەردەگرێت لانی کەم لەم کایەداو لە مامەڵە کردنیدا لەگەڵ مێژووی ئیسلامیی کوردی دیدە نێگەتیڤەکەیەتی دەربارەی ئایین و بارەگاوی بوونە بەو هەناسەیە ئەگەرنا لێکدانەوەکانی ئەم دیدە لەناوەندە رۆشنبیریەکەدا لەگەڵ لێکدانەوە مارکسیتیە باوەکە جیاوازە، بەڵام، چونکە ستراتیژی قسەکردن لێرەدا لێدانی رەمزیی ئیسلامە لە واقیعی مێژوویی و ئێستای کوردیدا، پابەندبوونی حەرفی بەمیتۆدە شیکاریەکەوە هێندە بایەخی نییە، بەڵکو میکافیللیزم دەبێتە پێکهێنەری ئەم باری سەرنجەو هەروەك لەبواری سیاسیدا سودی لێوەر دەگیرێت دەشبێتە چەمکێکی ئامادەی ئەم گوتارە.

دەنا گەر سەرەتاکانی تەفسیری مارکسیانەش بۆ مێژوو رەچاوکرایە هەرگیزاو هەرگیز ناشێ سەرجەم ئاڵ و گۆڕو هەڵکشان و داکشانەکانی مێژووی هەزارو چوارسەد ساڵەی نەتەوەیەك بدرێتە پاڵ ئیسلام بەسیفەتی ئایینێك، چونکە لەروانگەی قوتابخانە فکرییەکەی مارکسیزمی کلاسیکییەوە ئایین تەنها بەشێ لەسەر خانی سیستمی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێ و ئەو بونیادو ژێرخانەی بەرپرسە لەدروستکردنی ئەو بەشە لەسەرخان و بەشەکانی‌تری و ئاڵوگۆڕە ژیانییەکان لەچوارچێوەی مێژوو واقیعی بەرچاودا توخمە ئابورییەکەو ئەو ململانێ چینایەتییەیە کە لەسەر بناغەی ئەو دروست دەبێ و سەراپای مێژووی مرۆڤایەتی هەرلەدوای کۆمۆنەی سەرەتاییەوە دەخاتە ژێر جەبری یاسا کۆنکرێتیەکانی خۆیەوە. راستە مارکسیزم ئایین وەك چەکی دەستی چینە باڵادەست و دەسەڵاتدارو چەوسێنرەکان دادەنێ بۆ وڕکردن و دەستەمۆکردنی چینە هەژارو بن دەستەکان، بەڵام هەرگیز قووڵایی لەمێژوو ناخی مرۆڤ و واقیعی کۆمەڵایەتیدا ناگا بەو ئاستەی ببێتە ژێرخان بۆگۆڕانکارییەکان و دروستکردنی رووداوەکان و فۆرم بەخشین بە قۆناغەکانی گەشەکردن و دیاریکردنی خاسیەتە گشتییەکانی سیستمی کۆمەڵایەتی کە روونە چوونە ژێر کاریگەری ئەم تێزە وەك بەڵگەنەویست و ئامرازێکی شیکارکردنی قسە لەسەرنەکراو تاچەند وێناکان بۆکۆمەڵگاکان و هۆکارەکانی جولێنەری مێژوو لێڵ دەکات.

گرنگ ئەوەیە لە دیدی مارکسیزمەوە ئایین رەگ و ریشەو سەرچاوەیەکی ئاسمانی نییە ، بەڵکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییە بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ پێویستی چینە دەست رۆشتوەکان بۆ ئەوەی بیکەنە ئامرازێکی کۆنترۆڵکردن

و هەژارەکانیش بۆ ئەوەی جیهانی ٠ لە دنیای ئەندێشەدا بخولقێنن و هەندێ قەرەبووی سایکۆلۆژی ئەو واقیعە تراژیدییەی تیایدا دەژین بکەنەوە ٠

هەربۆیە لەدیدێکەوە کە ئەم ڕێبازە بەشداربێت لەدروستکردنیدا زەحمەتە تێڕوانینێکی ئیجابی دەربارەی خودی ئایین هەبێت،، چونکە مارکسیزم پێی وایە کە ئایین لەرووی مێژووییەوە لێپرسراوە لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاریەکی ساختە لەناوچینی بندەست و بێ بەش لەهۆیەکانی بەرهەمهێنان، لێرەشەوەو بەگوێرەی ئەم هەڵوێستە سەلبییە بەرامبەر بەئایین ئیسلام هەرشتێ بێت و هەرچی کردبێت و بکردایە لەمێژوودا بۆ نەتەوەی کورد هەر تاوانبارەو هیچ شتێ لەم مەسەلانە تکای بۆناکات و زنجیری ئەو تاوانباربوونەی لەگەردن ناکاتەوە٠

کاتێ باسی ئیسلام دەپێچرێتە باسی کوردو بزوتنەوە ناسیونالیستەکەی ئەوو، تێکەڵ بەناکامی و شکست و خەونە بەدینەهاتوەکانی ئەم دەکات بۆ (استغلال) کردنی سۆزو هەستی نەتەوایەتی خەڵکە بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام، واتە لەکاتێکدا هەستی نەتەوەیی خەڵك تا ئاستێکی ترسناك بریندارەو ئەمەش بواری هەر خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنێکی زانستی و مەعریفی و هاوسەنگ و عەقڵانی لەبەردەمدا تەسك کردۆتەوەو، ئەم حاڵەتەش لافاوێ لەرق و تورەیی لەگەڵ خۆیدا دروست کردووەو لەسینەی مرۆڤی کوردو هەناوی کۆمەڵگادا پەنگی خواردۆتەوە ، دەخوازێ هەوڵدات ئاراستەی ئەم لافاوە بکاتە ناو ئاوایی ئیسلام و بیکاتە لێپرسراو لە دنیایەك بێ بەشی و مەینەتی و کوێرەوی و ژیان لەسایەی چەندین فشاری کۆمەلایەتی و رۆحی و فەرهەنگیدا.

کەدەشڵێین هەڵوێستی بەشێ لە رۆشنبیران پەیوەست نییە بەکارنامەی مێژوویی ئیسلام لە مێژووداو وەنەبێ هەرلە خۆمانەوە ئەم هەڵوێستە دەربڕین،، چونکە هەڵوێستی بەشێ لە ڕوناکبیرانی نەتەوە دراوسێکانی کورد کە بزوتنەوە ناسیۆنالیزمەکەیان چەوسێنەری کوردن بەرامبەر ئیسلام هەمان هەڵوێستی ئەم بەشە لە ڕۆشنبیرانی لای خۆمانە . گەر ئاورێ لە هەڵوێستی رۆشنبیران و سیاسییە هاوبیروباوەڕەکانی ئەمان لای گەلانی دسەڵاتداری ناوچەکە لە (عەرەب، تورك، فارس) بدەینەوەو سەرنجی تێڕوانینیان بدەین دەربارەی ئیسلام لەکاتێکدا لەدیدی ئەم بەشە لەنوخبەی کوردییەوە ئیسلام بۆعەرەب و تورك و فارس لە رووی مێژووییەوە بووە بەخێرو بەرەکەت و لەسایەی ئەودا، کەسێتی نەتەوەیی خۆیان بنیاتناوەتەوەو دەسەڵاتـی نەتەوەییان دروستکردوە، بەڵام لەو سۆنگەوە کە رۆشنبیران و نوخبەی سیاسی ئەو گەلانە ئەوانەیان کە کەوتوونەتە بەر تەوژمی چەپ و مارکسیزم یاخود سەرمەشق و ئیلهامی فکری و سیاسی خۆیان لە مۆدیلە عەلمانییە توندڕەوەکانی وەکو مۆدێلی فەرەنسی وەردەگرن و، بەو هەناسەوە کاردەکەن و رۆشنبیرە سیاسیەکەیان لەسەر بناغەی ئەو چوونە ژێر کارتێکردنەوە دادەڕێژن و دەزگا چەمکی و زراوەییەکەی ئەویش وەردەگرن ، بێ گوێدانە جیاوازیەکان لەسەر ئاستی، مێژوو، ئایین، سایکۆلۆژی، سیستمی کۆمەڵایەتی، لەژێر تیشکی ئەویشدا سیما بە پەیکەرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیرییەکە ببەخشن هەروەکو ئەمانەی لای خۆمان ، بەڵکو زۆر زیاتر هەڵوێستی سەلبـی لەسەر ئیسلام و مێژوو فەرهەنگ و شارستانییەتەکە دەردەبڕن و دەچنە سەنگەری دژایەتی کردنییەوە.

رەنگە زەقترین نموونەش لەم رووەوە (کەمال ئەتاتورك) و ئەو لەشکرە بێت لە رۆشنبیرو تیۆریست و ناوەندەکانی توێژنەوەو دەزگا زانستی و میدیاکان کە کاریان بریتی بووە لە گشتگیرکردنی بۆچوونەکانی ئەوو دابەزاندنی بۆ بنکە جەماوەرییەکەو بەڵگە بۆ هێنانەوەو رەگ و ریشە بۆدۆزینەوەو رەوایەتی پێدان بەتێزەکەی. لەگەڵ ئەوەی کە ئیمراتۆریەتی عوسمانی زیاتر لە (٥٠٠) ساڵ لەسەرانسەری ناوچەکەدا ئەم دەورە مەترسیدارەی گێڕاوە لەدروستکردنی مێژووەکەیداو ئاراستەکردنی رووداوەکانیدا، کەچی بزوتنەوەی کەمالیزم وەك فکرو سیاسەت دژایەتیەکی قوڵی ئەو رابوردوەیان دەکرد، کە زیاتر لەوسۆنگەشەوە بووە تورك لەو رابوردوەدا واتە عوسمانییەکان بەناوی تورکەوە نەجوڵاونەوەو سیمایەکی فرە نەتەوەیی و نەژادی و ئایینیان بەو ئیمپراتۆریە داوە کە دایانمەزراندوە بەناوی ئیسلامەوە کاریان کردوە، کە هەموو ئەم شتانەش جەمسەرە دژەکانی ئایدیۆلۆژیای کەمالیزم پێکدەهێنن کە لەسەر نائیسلامیی بوون و تورکچێتییەکی توندڕەوانە دامەزراوە.

(سەرجەم رابردووری عوسمانی لەروانگەی کەمالیزمەوە بریتی بوو لە پیلانگێڕان لە نەتەوەی تورك و بەرهەڵستی مێژوو مەسەلەی کوردیش بەشە دیارەکەی ئەو پیلانگێرییە بوو.[1] دیارە مەبەست لەوەیە کەبەهۆی نەگرتنە پێشی سیاسەتێکی تورانیزم کەتوانای سڕینەوەی بوونی کوردو ناسنامە جیاوازەکەی هەبێت لەلایەن عوسمانییەکانەوە، رەوشێ خوڵقاوە تورکیای هاوچەرخ روبەڕویەکی کێشەیەك بێتەوە بەناوی کێشەی کورد و جیاوازبوونی کوردی مەسەلەیەك کەناشێ

---

[1] سەبارەت بەتێزی تورك لەمێژوودا، حەمید بۆز ئەرسەلان، وەرگێرانی: سدیق ساڵح، سەردەم، ژمارە (٥) ت ١٩٩٩، ل١٣٣.

لەفەرهەنگی کەمالیزمدا بەجیاوازی قبوڵکرێ و تاکە ستراتیژیەتێك کە بەرامبەری بگیرێتە بەر ستراتیژیەتی ئاوێزانکردنی زۆرەملێ و تواندنەوەی ئەو جەستە خۆبەجیاواز زانەیە لە فەزایەکی گەورەتردا کە ئەویش فەزای ناسیونالیزمی تورکی و تێزە شارستانییەتیە مەزنە گەردونییەکەیەتی!!، ئەم پرسەش لەناوەرۆکدا خزمەتکردنێکی شارستانیانەیە بەواتای بێ بناغەو لەحاڵەتی خۆلەبیرکردندا خۆیان بەکورد دەزانن،، چونکە چوارچێوەی ناسیونالیزمی تورکی و تێزەکەی بۆژیان و جیهان تاکە هێزە نەك هەر تورکەکان خۆیان ، بەڵکو هەر گەل و نەتەوەیەکی‌تر بیەوێت قۆناغی بەربەریەت و دۆخی پێش شارستانییەت بەجێ بێڵێ و پێ بهاوێتە ناو دنیای ژیار و هێز و داهێنانەوە.

کەماڵیەکان کەلەپوری عوسمانییەکانیان بەلاوە پیلانگێڕان بوو لەنەتەوەی تورك، خێرا کەوتنە خۆداڕنین لەو کەلەپوورە، بۆیە هەر (یاسا) ، پەروەردەکردن، جل و بەرگ، ئەلف و بێ و.. هتد)یەك پەیوەندی بەوانەوە بوو بێ قەدەغەکراو پیتی لاتینی شوێنی پیتی عەربی گرتەوە (ناوی پیتی تورکی یان لێنا)و (مستەفا کەمال) ئەوەی کردە ئەرکێکی نیشتمانی، لەپاڵ ئەوەدا مۆسیقای تورکی قەدەغەکرا،، چونکە گوایە لەگەڵ گیانی (بەرز)ی نەتەوەی تورکدا تەبا نییەو مۆسیقای خۆرئاوایی خرایە جێی، کەمالییەکان بەم مانایە قوتابی وەفاداری ئەو ئیتحادیانە بون کە بێزیان لەهەموو شتێکی تورکی دەکردەوە.[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە ل١٣٤.

هەڵبەتە لەپاڵ ئەمەدا هەوڵێکیش هەبوو بۆ ئەوەی (خوا)ش بکەن بەتورك و (مستەفا کەمال ئەتاتورك)یش جێگای (محمد) بگرێتەوە بیسلەمێنن لە ئادەمەوە تا چوار خەلیفە راشیدینییەکەی ئیسلام لە بنەڕەتدا هەموویان تورك بوون، هەڵبەتە ئەم رەخنە گرتنانەی ئایدیۆلۆژی کەمالیزم لە ئیسلام واتەشەڕی مۆدێرنە بۆ تێکشکاندنی فۆرمە ئیسلامی‌یەکان و مانا پێدانێکی نوێ بە ئیسلام و دورخستنەوەی لەسەنتەری کارتێکردنی کۆمەڵایەتی.[1]

چونکە ئیتحادیەکان لەپێش ئەو مێژووەداو لەپێش شەڕی رزگاری نەتەوەیی بەڕێبەریی کەمال ئەتاتورك بۆ پێکهێنانی تورکیای نوێ بە ئاشکراکاریان لەسەر زیندووکردنەوەی ئەو رەمزانە دەکرد کە لەرووی مێژووییەوە هەڵگری پەیامی ئیسلام نەبوون ، بەڵکو بەرپرسیارن لەوێرانکردن و روخاندنی شارستانییەتی گەورەی ئیسلامی، ئەوان دەیانویست رەمزگەلێکی وەکو هۆلاکۆو تەیمور لەنگ و جەنگیزخان ببنە سەرمەشقی لاوە تورکچییەکان و نەوەی نوێی تورك فێر دەکرا عوسمانی نین و تورکن زمانیشیان زمانی عوسمانی نییەو زمانی تورکییە.

(ئەبو زیاتۆفیق بەگ) نوسەری سیاسی کە لەگوتارێکدا سەربازانی مەغۆلی جەنگیزخانی بەخوێنخۆر ناو بردبوو لەسەروبەری جەنگی جیهانی یەکەمدا لافاوێکی تورەیی و نارەزایی بەم تێڕوانینە سادە مێژووییەی دژی خۆی وروژاندبوو، ئەمەش بووە هۆی داخستنی بڵاوکراوەکەی بەبیانووی سوکایەتی کردن بەشتە پیرۆزەکان،

---

[1] بەختیار عەلی ئامۆژگاری رۆشنبیران دەکات بۆ ژیانێکی کراوەتر و بەناوی مۆدێرنەوە ئەو شەڕە لەگەڵ ئیسلامدا بکەن نەك بەناوی نەتەوایەتییەوە رەهەند ژمارە ٩ – ١٠/٢٠٠٠ ل١٩٢ – ١٩٩.

هەروەها هێرشکرایە سەر دەرهێنەرێکی شانۆ، چونکە لەشانۆگەریەکدا کاری دڕندانەی خەیاڵی خستبوە پاڵ (تەیموری لەنگ)ی ڕێبەری تەتەرەکان سەرەنجام ناچاریان کرد داوای لێبوردن بکات، تورکە تۆرانچیەکان گەیشتبوونە قۆناغێ کە نەفرینیان لەسوڵتان (ئیلدوم بایەزید) دەکردو بەتایبەتی تاوانباریان دەکرد، چونکە ڕوبەڕووی کەسایتیەکی لەخۆی گەورەتر (تەیموری لەنگ)ی ڕێبەری گەورەی بنەماڵەی تۆرانی بۆتەوە، کار گەیشتە ئەوەی تورکە نەتەوەپەرستەکان خۆڵەناو هێنانی (عوسمان)ی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بپارێزن، یەکێك لەمامۆستایانی کۆلیژی ئەفسەری لەوتارێکدا بەرامبەر کۆمەڵە ئەفسەرێك گوتی (عوسمان کێیە؟ نازانم چییە بە ئێمە دەڵێن عوسمانی).[١]

هەروەها هێرشیان دەکردە سەر سەرکردەی بەناوبانگی ئیسلامی (محمد الفاتح) کەدەستی بەسەر ئەستەمبۆلدا گرت،، چونکە بەهۆی دەستبلاویەکەیەوە بووە هۆی بەردەوامبوونی نەتەوەکانی نێو ئیمپراتۆریەت و نەرمییەکەشی تەنانەت شێوازی ژیانی کۆمەلایەتی و ئیمتیازەکانی برەو پێ دابوو.[٢]

دروستکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش لەدیدی ئەم ناسیونالیستە تورکانەوە کە ئاڵا هەڵگری بزوتنەوەی تۆرانیزم بوون یاخود باسکردنی سیاسەت کردن بەمانا

[١] زارەخاند/ تۆرانچێتی و دەرکەوتن، ئایدیۆلۆژیاو بەرنامە/ وەرگێرانی ابوبکر خۆشناو، ١٩٩٦/ل٥٢.

[٢] هەمان سەرچاوە، ل٥٠

ئیمپراتۆریەکەی حیلەیەکە نەتەوە ناتورکەکانی ناوچوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سودیان لێوەرگرتووەو لێی وەردەگرنز[1]

لەئێرانی پەهلەویشدا کاتێ بزاوتی ناسیونالیزمی فارسی پەرەدەسێنێ و لەرووی گەشەکردن و پەلهاوێشتنییەوە دەگاتە ئەوجی خۆی، دیسانەوە هەمان یاسا حوکمی خۆی دەکاتەوە ، واتە ناسیونالیزمی فارسی بۆ هەڵبژاردنی رەمزەکانی و دیاریکردنی ئەو سەرزەمینەی لەمێژوودا غروری نەتەوە لەسەریدا شکۆفەی کردووە، دەگەڕێتەوە بۆپێش ئیسلام، دەربارەی هەمان ئەو شتەی لێرەو لەناو هەندێ رۆشنبیردا باوە واتە بانگەشەی گەڕانەوە بۆزەردەشتی بوون لەوێش لەو سەروبەندانەدا بانگەشەیەکی وا لە ئارادابووەو باس لەوە کراوە کەزەدرەشتی ئایینی کۆنی ئێرانییەکانەو ئیسلام لەسەر وێرانکردنی ئایین و یادەوەری و شکۆی نەتەوەی فارس کۆشکی شکۆو دەسەڵاتی خۆی بنیاتناوە.[2]

ناسیونالیزمی عەرەبیش لەپاڵ هەوڵی شێواندنی مێژووی ئیسلام و بارگاوی کردنی بە نەفەسێکی ناسیونایستانە بەئاشکرا نەزعەی گەڕانەوەی بۆپێش ئیسلامی پێوەدیارە لە هەمان کاتدا رووبەکی ناسنامەکەی بریتی بووە لە بوژاندنەوەی مێژووی دێرینی ئەو دەوڵەتە (قگر)یەی کە ناسیونالیزمی عەرەبی لەچوارچێوەیدا خۆی گونجاندووە، بۆ نموونە لەعێراقدا پانتاییەکی بەرچاوی باسکردنی مێژوو تەرخانکراوە بۆزیندووکردنەوەی شارستانییەتی بابلی و سۆمەری و ئاشوریەکان.

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٥٣.

[2] ریچارد حاتم/ ناسیونالیسم در ایران،ل٩٨.

هەموو ئەم قسە لەسەرکردنانە لەسەر هەندێ لە رۆشنبیران و بزوتنەوە ناسیونالیستەکانی گەلانی باڵادستی دراوسێ و هەڵوێستیان بەرامبەر بە ئیسلام بۆ ئەوەبوو روونی بکەینەوە کە هێرش کردنە سەر ئیسلام و مێژوویەك ئیسلام بەشداری دروستکردنی کردووە، لەلایەن بەشێ لەناوەندە رۆشنبیری و سیاسییەکەی کوردستانەوە ، تەنها بەوە لێکنادرێتەوە ئیسلام نەبۆتە بناغەو بنکەی دروستکردنی ئیمراتۆریەتی نەتەوە لەمێژوودا، بەڵکو زیاتر بەو ناوەرۆکە فکری و ئایدیۆلۆژیە خۆرئاواییە لێکدەدرێتەوە کە بزوتنەوە ناسیونالیستەکەی ناوچەکە بەجیاوازی نەتەوەکانییەوە هەڵگری بووە، دەمەوێ بڵێم ئەم بزاوتە ناسیونالیستییەکە خۆی بەرەنجامی گەشەی سروشتی کۆمەڵگاکانی خۆی نییە وەك خۆرئاوا، وێنای ئایین لەچاوی خۆرئاواوە دەگرێت، پەیوەندی ئایین و ناسیونالیزمیش لەروانگەی پویەندی ئایین و دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرنی خۆرئاواوە سەیر دەکات. مادام ئایین لەخۆرئاوادا رۆڵێکی نێگەتیڤی گێڕاوە، کەواتە (ئیسلام)یش بەحوکمی ئایین بوونی هەمان رۆڵی لەناو نەتەوەو شوێنکەوتوەکانیدا گێڕاوە، هەڵبەتە وێناکردنە خۆرهەڵاتناسییەکەش بۆ ئیسلام و بەسەنتەرکردن و ستاندارکردنی ئەم وێنەیە لە هۆشی نوخبەی فکری و سیاسیدا ئەوەندەیتر ئەو قەناعەتەی قوڵکردۆتەوە کەدژایەتی کردنی ئیسلام وەك ئایین و ژیارو فەرهەنگ، ببێ بەبەشێ لەئەرکی هەربزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی کەبیەوێت دابڕانێ لەگەڵ رابردووی خۆیدا دروست بکات و تازەبوونەوەی رۆحی و فکری و سیاسیش بۆخۆی فەراهەم بکات، ئەمانە وەك نوێنەرێکی سەرنتەرێتی خۆرئاوایی رەخنە لەمێژووی ئایین دەگرن بەرەهایی ئەو ئایینەی پێناسە خۆرئاواییەکان ناوەرۆکێکی جەوهەرداو نەگۆڕی مێژوویی پێ

بەخشیوە. جەوهەرو ماهیەتێك كەسەرجەم جیاوازی نێوان ئایینەكان دەكات بەجیاوازی شكڵی و رواڵەتی و سەرەنجام سەرجەم ئایینەكان و كارایی و رەنگدانەوەیان لەژیان و كۆمەڵگادا یەكسان دەكرێن بەیەك و حوكمێكی یەكسانیش بەسەر هەموویاندا دەدرێ ، هەرچەندە سەرەڕای ئەمە سەنتەریزمی خۆرئاوایی زۆرجار سڵی لەوە نەكردۆتەوە مەسیحیەت وەك ئایینی پیاوی سپی پێستی خۆرئاوایی بەباڵاترو پێگەیشتوترو ئینسانی‌تر لەقەڵەم بدات بەبەراورد لەگەڵ ئایینەكانی‌ترو لەوانەش ئیسلام.

لەبەرئەوەی سەرچاوەی مەعریفەو چەمك و بەهاو پێوەرەكانی ئەم تەرزە لەرۆشنبیران تەنها خۆرئاوایە كەواتە بۆدۆزینەوەی واتای ئیسلام و حوكمدان لەبارەیەوەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنی رۆڵە مێژووییەكەی دەبێت بگەڕێین بەدوای واتای ئایین و دیاریكردنی سروشتی ئەو رۆڵەی دەیبینێ لە فەرهەنگی مۆدێرنەی خۆرائاوادا،، چونكە هەروەك وتمان ئایینەكان لەبەرەنجامی كۆتاییاندا مەنزومەیەكی هاوشێوەن و یەك رۆڵ لەژیاندا ئەدا دەكەن.*

ئایینەكان دەرهاویشتەی ژێرخانی قۆناغێكی مێژووین، كەواتە بەم گەڕانەوەیە تاراددەیەكی بەرچاو ئەو ئیسلامەی دەخرێتە روو ئیسلامێكی دورستكراوە، بەوجۆرەش دروست دەكرێ كە بتوانرێ چەندین ئەركی ناشارستانی بخرێتەپاڵ.

---

* هەڵبەت ئەمە ئەوە ناگەیەنێ سەرجەم ناوەندە ئەكادیمی و فكرییەكەی خۆرئاوا بەم جۆرە بیردەكاتەوە بەتایبەتیش لەم ساڵانەی دواییدا.

### ترس و رق لە پرۆسەی گەڕانەوە بۆ مێژوودا

گەر ژێرخانی گەڕانەوەی ئەم نوخبە بۆمێژوو بەپلەی یەکەم ئایدیۆلۆژیاو پێداویستیەکانی سیاسەت بێت، لەوسۆنگەوە کەهەردوو لە ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتیش بەجۆرێ لەجۆرەکان پۆلێن کردنەکانیان لەسەر بناغەی دۆست و دوژمن و لایەنگرو ناحەزەو پەیوەندیەکانیش لەهەندێ کاتدا بارگاوی دەکەن بەرق و تورەیی و گرژی، ترسیش دەبێت بە سەرچاوەی چەندین هەنگاوو بەرچەکرداروو کەرەسەی پەروەردەیی و جۆری ئاراستەکردن، گەڕانەوەی کوردیش بۆمێژوو بەتایبەتیش دوای ئەوەی ئایدیۆلۆژیا مۆدیرنەکان لەناوەندە فکریە کوردیەکەدا لایەنگر بۆخۆیان پەیدادەکەن و کار لەسەر جیهانبینی رۆشنبیری کوردیی دەکەن و رێڕەوی بیرکردنەوەی بۆدیاری دەکەن و، ئەم رۆشنبیریە دەبێتە هەڵگری بەها مۆدێرنەکان کەلەزۆربەی کاتدا بەهاکانی مارکسیزم بووە، یاخود تێکەڵەیەك بووە لەناسیۆنالیزم و سۆشیالیزم لەگەڵ هەندێ گوتەزای کاڵی لیبرالیزم، هەروەها کاتێ ئەم رۆشنبیرە فۆرمی تازە بۆکاری سیاسی بەرهەمدێنێ و لەوچوارچێوە نوێیانەشدا بەشداری خەباتی سیاسی دەکات و خەباتی سیاسیش لەبەردەم چەندین ناکامی و نائومێدیدا رایدەگرێ، هەموو ئەمانەو بەهۆی ئەو بۆشاییە فکری و ژیاری و حەرەکییە ئیسلامییەش کەلەئارادابووە ، وایان کردوە گەڕانەوەی ئەم رۆشنبیرە بۆ مێژوو لە عەڵقە ئیسلامیەکەیدا تێکەڵ بەترس و رق بێن . لەروانگەی لێکدانەوەکانی ئەم تەرزە لەرۆشنبیری کورد کاتێك واقیعی کوردی و بزوتنەوە ناسیونایستەکەی تووشی

قەیران دێن و عەقڵە سیاسیەکەش دەگاتە بنبەست و زوڵمی جوگرافیاو بێ پشت و پەنایی لەقەراغەکانی روخان و هەرەس نزیکی دەخاتەوە، کاتێ لەم حاڵەتەدا دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆمێژوو هەست دەکات مێژووش یارمەتی نادا بۆ دەرچوون لەقەیرانەکان، لانی کەم لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیاو دنیای یاداوەریەکاندا هەست دەکات رەگ و ریشەی نائومێدیەکانی ئەم لەمێژوودا بنجیان داکوتاوە، لەکاتێکدا گەڕانەوە بۆ مێژووی پێش مۆدیرنەی کوردی کە ئیسلام بەشداری لەپێکهێنانیدا کردووە لەحاڵەتی دیارنەبوونی هەستێکی ئیسلامی و دیدێکی خۆماڵی بۆناسیونالیزم ئاسان نییەو رۆشنبیری کوردیش فشاری ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکە تارادەیەکی بەرچاو ئەم هەستەی تیا لاواز کردوە گەرنەڵێین تیایدا کوشتووە، لێرەوە ئەم رۆشنبیرە دەیەوێت دەستکەوتەکانی مۆدێرنەو دەزگا چەمکی و تیۆریەکەی بەکاربێنێ بۆ خاپورکردنی ئەو مێژووە.

کە ئەمەش بەکردەوە هەوڵی بێ مێژووکردنی کوردە بەتایبەتیش لەقۆناغی مسوڵمان بوونیدا کە درێژترین و رۆشنترین قۆناغی مێژوویی خۆیەتی.

ئەم تەوژمە هەوڵی دابڕان لەو مێژووەدەدا ، شەڕی ناسیونالیزمی کوردی دەکات بەشەڕ لەگەڵ مێژووی نەتەوەدا،، چونکە پێی وایە نەهامەتییەکانی ئێمە لە مسوڵمانبوونەکەماندا شاراوەتەوە.؟!

بەمەش شەڕی کورد بۆرزگاری ، دەبێ بەشەڕ لەگەڵ خودە ئیسلامیەکەی و ئەو مێژووەدا کە ئیسلام بەشدارە لەسیماپێدانیدا، کە ئەم پرۆسەش بەزمانی سایکۆلۆژیاو سیاسەت وەردەگێردرێ بۆگوتەزای: خۆکوژی رێگای رزگارییە ! !

## گرێی ترسان لەمێژوو

ئەم ڕێبازە لەبیرکردنەوەو لێکدانەوە پێمان دەڵێ مێژوو بۆ ئێمە سەرچاوەی مەترسیە، مەترسیەکەشی بەشێکی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئایدیاو هێزێکی پڕ مەترسی بۆسەر جەستەی نەتەوەییمان کەئیسلامە لەو مێژووەدا ئامادەیە! هەرلەو مێژووەدایە خەونی ئێمە لەباردەچێ و ناگات بەئاکامی چاوەڕێکراو.

کاتێ مێژووش دەگۆڕێ بەسەرچاوەی مەترسی ڕۆشنە هەڵوێستگرتن لەبارەیەوە لەدوو حاڵەت تێناپەڕێ، ئەویش لەبیربردنەوەو فەرامۆشکردنییەتی یان ئەوەتا دەبێت جەنگاوەرانە بۆی بگەڕێینەوە، ڕۆشنبیری کورد بە تایبەتی ئەوبەشە لە ڕۆشنبیرەکە بەدیاری کردنی خەسڵەتەکانی بیرکردنەوەی پێناسێکمان پێدا بەشێوازی جۆراوجۆر هەردوو هەڵوێستەکەی لە ڕەفتاری فکری و سیاسی خۆیدا بەرجەستە کردووە، هەندێ جار ئەو عەڵقە لەمێژووی کوردی (واتە مێژووی کوردیی ئیسلامیی) خستۆتە دەرەوەی بایەخی خۆی و هەندێ جاریش بە هەرچی لە دەستیابووە لەکەرەسەی شەڕکردنی فکری و سیاسی پەلاماری داوەو شەڕی لەگەڵدا بەرپاکردووە.

ئەم ڕۆشنبیرە کە زۆرباسی بنیاتنانەوەی کەسێتی نەتەوەیی دەکات و بەرواڵەت وادیار دەخات ئەمە خەمێکی گەورەی فکری و سیاسی ئەوبێت، بەڵام بەکردەوە بەم شێوازە گەڕانەوە ناسروشتییەی بۆمێژوو زەبرێکی گەورە لەو کەسێتییە دەدا.

لێکدانەوەکانی سەر بۆ ئەوە دەکێشێ بیخاتە روو کەسێتی کوردی کەسێتییەکی تاسەر ئێسقان سەلبیە، بەمەش حوکمی مەرگ و هەڵنەسانەوەی بەسەردا دەدات ئاماژەکانی ئەم تێزە ئەوەیان لێدەخوێنرێتەوە کە کورد بەسیفەتی کورد بوونی، هەڵگری چەندین سیفەتی سەلبی و نائەکتیڤە، ئەمەش ئەو تیۆرە رەگەزپەرستانەی خۆرئاوای سەدەی نۆزدەمان وەبیردێنێتەوە کاتێ تیۆرداڕێژەرە خۆرئاواییەکان تیۆریزەی ئەوەیان دەکرد کە رەنگ و نەتەوەکانی‌تری جیهان جگە لە رەنگی سپی و نەتەوە ئەورووپیەکان، لەخودی خۆیاندا دواکەوتوون و لەپلەیەکی نزمتری مرۆڤایەتیدا دەژین وناتوانن وەك گەلانی ئەورووپا ببنە هەڵگری پەیامی شارستانییەت، بەڵام سەیر لەوەدایە گەر خۆرئاوا لە سۆنگەی کەڵکەڵەی سەنتەریزمی ئەورووپی و بەخولگەیی کردنی مێژوو فکرو شارستانێتی خۆی ئەمەی دەکرد، ئەمان بۆچی وا دەکەن؟، چونکە هەندێ رۆشنبیر تیۆریزەی ئەمە دژی کورد خۆی دەیکا، ئەو وێنەی خۆی لەخۆی دەیکێشێ و ئەوبڕیارە قورسانەی لەمیانەی مێژوودا دەیدات بەسەر ئەو کەسێتییە دا رەنگدانەوەی خراپی بەسەرخودی جەستەو کەسێتی و کۆمەڵگا کوردییەکەدا دەبێت و بەرەو نائومێدی و داروخانی دەبات.

ئەم گەڕانەوە بۆمێژوو کە دەیەوێت وای بخاتە روو کورد چۆن لەدنیادا دۆستی نییە ئاوا لە مێژووشدا بێ پشت و پەنایە، کەدەتوانین ناوی بنێین گەڕانەوەیەکی نائومێدانە لەناوەڕۆکدا پرۆسەیەکی ناعەقلانییەو خاڵییە لەهەر بیرکردنەوەیەکی جددی و لۆژیکی و لەپشتی ئەم گەرانەوە زەحمەتە بتوانین ئیرادەیەکی هۆشیارو بەرپرس پەیدا بکەین، مامەڵەکردنی سیاسیانە لەگەڵ مێژوو واتە خۆبواردن لەلێکدانەوەو تێگەیشتن و خستنە رووی مێژوو وەك ئەوەی هەبووەو روویداوە ،

بەڵکو پەنابردنە بەر خوێندنەوەیەك وەك ئەوەی ئەم دەیەوێت کارێکی کردووە چەمکە سیاسیەکانی لایەنگرو دۆست و خائین و هتد کە کۆمەڵێ موفرەدەو چەمکی رۆژانەی سیاسەتن دەباتە ناو مێژووەوەو لەوێشدا دەیانکات بەکەرەسەی پۆلێن کردن و رووکەشکردنەوەی رووداوەکان کە هەندێ جار خوێندنەوەی مێژوو دەگۆڕێ بۆدادگایی کردنێکی سیاسیانە لەسەرشێوەی دادگایی کردنەکانی حزب و تۆمەتبارەکانی، بۆ ئەو کەسانەی دەیەوێت ریزەکانی خۆی لێ پاك بکاتەوە. بۆئەمەش سڵ لە تۆمەت دانەپاڵ و بەڵگەدا ناشێن ناکاتەوە! هەر وەك چۆن لەشەڕەکاندا ناشیرینکردن و تاوانی بێ بناغەدانەپاڵ هەیە هەمان مامەڵەش لەگەڵ مێژوو دەکرێ، بۆ ئەوەی فەرمانی خنکاندنی هەتاهەتایی بەسەردابدرێ و وك جەستەیەکی گوناهبار لەسەر زەمینی پاکی هۆشیاری نەوەی نوێ بکرێتە دەرەوەو بەدنیای فەرامۆشی بسپێردرێ.!

هەڵەیەکی ئەم دیدە لەروبەڕوبونەوەکانیدا لەگەڵ مێژووی ئیسلامی کوردیدا لەحیسابکردنێکی نادروستەوە سەرچاوە دەگرێت ئەویش بریتیە لەوەی شەڕکردن لەگەڵ مێژووی ئیسلامیی کوردا بەشەڕکردن لەگەڵ ئیسلام دادەنێ، بەڵام لەراستیدا گەر لەروویەکەوە شەڕێت لەگەڵ ئیسلام و دەرخستنی بوغزو رقێکی ریشەدار بێ بەرامبەری لە هەمان کات و لەروویەکیترەوە بڕینەوەی رەگەکانی درەختی نەتەوەیە لەرووی مێژووییەوە ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ مێژووی کوردیدا کورد دەکات بەگەلێکی میوانی ناوچەکە.

گەڕانەوەی ئەم تێزە بۆمێژوو بۆپەیداکردنی هۆکارگەلێکە تا شکستەکانی ئێستایان بخاتە پاڵ با ئەو هۆکارانەش لەراستیدا لەڕووی زانستی و مێژووییەوە هیچ بەشداریەکیان لەورووداوو شکست نەکردبێت، شکستەکان بەشێوەیەکی گشتی رەگیان لەمێژووی هاوچەرخدایە رەگەزو هێزە پێکهێنەرەکانی ئەم قۆناغەی مێژووش ئاڵ و گۆڕیان بەسەرداهاتووەو ناکرێت هەرئاواو تەنها لەژێر کاریگەری رقی ئایدیۆلۆژی و دژواری سیاسیدا رەگی رووداوەکان بگێڕینەوە بۆ لەحزەیەکی زەمەنی کە لەرووی واقیعییەوە ناکرێ نیشتمانی نیشتەجێ بوونی ئەورووداوانە بێت.

لەروویەکی‌ترەوە دەکرێت خوێندنەوەیەکی سایکۆلۆژیشمان بۆ ئەم جۆرە گەڕانەوەیە بۆ مێژوو هەبێت.. ئەویش بەو واتایەی کاتێ ناسیونالیزمی کوردی لەم بەرگەیدا تووشی شکست و نائومێدی دێت بەدوای قۆچی قوربانییەکدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی لەلایەك هەرچی زووخاوی پەنگخواردووی شکست و نائومێدیەکانی هەیە بەسەریدا هەڵڕێژێ و لەلایەکی‌تریشەوە بیشیکاتە لێپرسراوی ئەو نەهامەتی و رۆژە رەشیانەی دوچاری بووە، بۆ ئەوەی ویژدانی خۆی ئاسودە بکات بەوەی کە ئەو لێپرسراو نییە لە شکستەکان و لانی کەمی رێزو ئیعتیباری خۆی بپارێزێ، لەرووی سایکۆلۆژیشەوە کاتێ کەسێ هێزێکی لەخۆی باڵادەستر ستەمی لێ دەکات و ئەمیش ناتوانێ روبەڕووی بێتەوەو تۆڵەی لێ بکاتەوە ئەم رق و تورەییەی بەیەکێکی لەخوار خۆی و لەخۆی بێ دەسەڵاترو لاوازتر دەرێژێ، رەنگە بۆ رۆشنبیرێکی لەم جۆرەش مێژوو خودی ئیسلامیش ئەو دوو ئامانجە بن کەئەم دەورەی بۆ بگێڕن بەوسیفەتەی مێژوو نایەتە زمان و حوکمەکانیشی ماددی و یەکسەری نییەو

ئیسلامیش دەسەڵات و هێزێك نییە بەناوی ئەوەوە بدوێ و ئەرکی بەرگریکردن لەدەستدرێژی کردنەسەری بگرێتە ئەستۆ.

بەڵام روونە ئەم رەفتارو بیرکردنەوە تاقە بەرەنجامێ لێی بکەوێتەوە دواخستنی قسە کردنە لەسەر ئەو هۆکارە راستەقینانەی ماکی شکستەکان و بونیادی نائومێدیەکان پێکدەهێنن و دیارینەکردنی لێپرسراوێتی لەناو نوخبە کوردیەکەشە کە بەشێ لەورووداوانە بەرهەمی ناکارایی ئەوو دواکەوتوویەتی، هەرئەمەشە وای کردووە لەمێژووی هاوچەرخی ئێمەو بەدرێژایی دەیان ساڵ لەشۆڕش و خەباتی چەکداری و خۆبەدەستەوەدان و هەڵسانەوەو وتووێژکردن و شەڕدەستپێکردنەوە کەمترین رەخنە لە ئایدیۆلۆژیاو میکانیزمەکانی شۆڕش و حزب بگیرێ یاخود فەزایەك بخولقێنرێ قسە لەسەر قەیران و شکستەکان زۆر بەکەمی بکرێت.

لەم گوتارە دژی مێژووییەدا مێژوو چەکی شەڕکردنە، بەڵام دژی دوژمنانی کورد نا، بەڵکو دژ بە تەوژمێکی سیاسی بەرامبەر (کە لێرەدا تەوژمی ئیسلامییە)، یاخود دژی ئایینی کوردو جەستە کوردیەکە خۆی! بەپێی ئەم بیرکردنەوەش کەمتر دەتوانرێ ئەم مێژووە بگۆڕدرێ بەچەکێکی شەڕو بەرگری بەدەست گوتارێکی ناسیونالیستییەوە، بەڵکو دەکرێتە ئامرازێکیتری روخاندن و نائومێدکردن وێرانکردن، ئەم گوتارە بێ پەردە پێمان دەڵێ ئێوە لەسەدان ساڵدا دوێنێیەکتان نییە ناوی مێژوو بێت ئەوەی دەتانەوێ پێی بڵێن مێژووی نەتەوە دەریایەکە لەئامادەنەبون و سلبیەت و سڕبوون و لەناو دەرەوەی مێژوودا بوون و ژیان.

گرفتی هەرە گەورەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەش لەوەدایە کە لەبەرتیشکی گیروگرفتەکانی ئێستادا سەیری مێژوو دەکات و دەیخوێنێتەوە و حوکمی بەسەردا دەدات، ئەم مێژووە (جلب) دەکرێت بۆئێستاو دەکرێتە لایەنگر و ناوەرۆکێکی نوێی پێ دەدرێت، مێژوویەك نییە روویدابێ، بەڵکو رووداوەکانی شێوازی روودانیان بۆدیاری دەکرێ، مێژوویەك نییە ئیسلام و هێزە کۆمەڵایەتیەکانی مێژوو سیمایان پێبەخشیبێ و رەوتیان بۆ دەستنیشان کردبێت ، بەڵکو لەکارخانەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتدا و لەتاقیگای ململانێکانی سەردەمدا توێ توێ دەکرێت و شیکاری بۆدەکرێت و یاسا ناوەکیەکان و هێزە جولێنەرەکانی وەدەر دەخرێت؟!.

مێژوویەکە یەکێ لە ئەرکەکانی پەیداکردنی پاساوە بۆشکست و ئیفلیجی زیندووەکان بۆ دۆزینەوەی هۆکاری مردنی چەندین ئاوات لەکاتێکدا ئەو وەك ئەوەی هەیە کەرەسەی ئەم شیکارییەی پێ نییە.

مێژوو لەم خوێندنەوە سەقەتەدا ئەو سەرزەمینەیە شەڕەکانی ئێستای بۆدەگوازرێتەوە ئەو سەرزەمینەی هەرچی دەیکەی بەمانا سیاسی و سەربازییە رووتەکەی کەس ناڵێ مەکە، ئەم مێژووە لێڵکردنی رووبارێکی دەخرێتەپاڵ کە ئەم سەرچاوەکەی نییە کە ئەویش رووباری دەوڵەتی مۆدێرنەیە قۆچی قوربانییە بۆ شاردنەوەی دزێویەکانی دەوڵەتی مۆدێرنە لەناوچەکەدا و ئەو تاوانانەی دژ بە کورد ئەنجامی داوەو ئەنجامی دەدا،، چونکە ریشەی نەهامەتییەکان و تراژیدیاکان بەمانا ناسیونالیزمەکەی دەبێت لە دەوڵەتی مۆدێرنەو سروشتە هەژمونخوازەکەیداو میکانیزمەکانی بەڕێوەچوونی و هاوپەیمانە نێودەوڵەتیەکانی و یاسا رێکخەرەکانی پەیوەندی ئەم بەدەوڵەتانیترەوە واتە یاسای نێودەوڵەتی بۆیان بگەڕێین.

نەك رەفتاری دام و دەزگا ئەمنی و داوەریەکانی رژێمە تۆتالیتار و سەرکوتکەرەکان لەگەڵ مێژووی خۆماندا ئەنجام بدەین و بەمەش ئەوەندەیتر ئازارەکانی جەستەمان بەسوێتر بکەین و کێشەکانیشمان ئاڵۆزتر.

ئەم تێزە ناتوانێ بێ لایەن بێ بەرامبەر ئەو مێژووە لەکاتێکدا دەبوایە بەپێوەرە ناسیونالیزمەکان بەهی خۆی بزانیایە،، چونکە بەرامبەرەکەی ئەو ئایینەو ئەو هێزە کۆمەلایەتیانەی بەشداری دروستکردنی ئەو مێژووەن بێ لایەن نییەو دژایەتیان دەکات، تێزێکی دڵرقێشە بەرامبەر مێژوو هەڵبەتە دڵرەقی بەواتای دیدی رەخنەییانەو دانانی رووداوەکان لەسیاقە مێژووییەکەی خۆیانداو هەڵسەنگانیان نایەت ، بەڵکو لێرەدا دەبێتە پێشەکیەکیش بۆلاوازبوونی هۆشیاری مێژوویی کە سەرەنجام بەئەندازەی خۆی کاردەکاتە سەر لاوازبوونی هۆشیاری نەتەوەیی ، لەراستیشدا هەڵگرانی تێزی بێ مێژووکردنی کورد بەم هەوڵەیان دەیانەوێ کورد بخەنە دەرەوەی مێژوو ، دەیکەن بەبابەتێکی کارلەسەرکراو نەك بکەرو کارتێکەر بەمەش لێپرسراوی لەئەستۆی واقیعە کۆمەلایەتی و هێزەکانی دادەماڵێ و دەخرێتە ئەستۆی کائینێ بە ناوی مێژووەوە، ئەو مێژووە ئەو ناوەرۆکە بەکەسێتی کوردی و ئاراستەی کۆمەلگای کوردی دەدات، کورد خۆی مەخلوقێکی بێ ئیرادەی ناومێژووە ئەوەی بێ ئیرادەشی کردووە مێژووە، مێژووش بەرجەستەکەری جەوهەری پەیامی ئایینێکە کە هەر لەسەرەتاوە نامۆ بووە بە رۆحی مرۆڤی کوردو کەسێتی کوردیش تووشی نامۆکردن کردووە بەرامبەر بەخودە ژیاری و ئایینی و نەتەوەیەکەی بەلام داخۆ لەدەریای مێژووی ناوچەکەدا چی والەکورد دەکات بەپێچەوانەی گەلانی دەوروبەری ئاوا لە دەرەوەی مێژوو دابرژێ، خۆ ئەگەر ئەو دیدە مارکسییەش

قبولّکەین، کە ئەوان لەرووی مێژووییەوە لەژێر کاریگەری ئەو دان کەبڕوای وایە ئاگایی رەنگدانەوەی واقیعی کۆمەلآیەتی لەئارادابووە بۆچی دەبێت لەیەك واقیعی یەکساندا لەرووی مێژووییەوە ئاگایی کوردی هەمان ئاگایی گەلانی دەوروبەری نەبێت؟ بۆچی ئەو هۆشیاریە مێژووییەی بۆپەیدا نابێت بۆ ئەوەی بیکات بەبکەر لەناو مێژووداو ئەمیش بەتایبەتمەندی خۆیەوە بەشداربێت لە ئاراستەو ناوەرۆك پێدانیدا؟

خوێندنەوەی لەم جۆر بۆمێژوو گەرچی لەژێر پەردەی عەقلآنی بووندا ئەنجام دەدرێت، بەلآم سەراپای نوقمی بیرکردنەوەیەکی غەیبانی و کەنەسییەو گێڕانەوەی روداوەکانە بۆ دەرەوەی سەرزەمینی سروشتی خۆیان، لە ئەوروپادا لەقۆناغی دەرەبەگایەتی‌دا مێژوو وەك زۆر لایەنی‌تری ژیانی روناکبیری مرۆڤ بەگشتی هەنگاوی باشی بەرەودواوە نا، لای زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسانی ئەورووپا نەخەلّك و نەکۆمەلّ و نەئالّوگۆڕە کانی ژیان هیچ دەورێکیان لەدروستکردنی رووداوەکاندا نەما ، بەپێی لێکدانەوەی کلّێسە کە ئەوسا لە ئەوروپادا هەر بۆ خۆی لەمەیداندا بوو بڕیاری بەسەر هاتەکانی مێژوو لەپشت ئاسمانەوە دەدران سەرکەوتن و ژێرکەوتن بەرەو پێشچوون و دواکەوتن وەك باران دەڕژانە سەرزەمین لەو سەردەمە تاریکەدا لەرۆژهەلآت دەنگی زولآلّی ئیبن خەلدون (١٣٣٢ ـ ١٤٠٦) بەرزبۆوە کە ئەو بەرگە دەستکردە سەپێنراوەی سەرمێژووی دامالّی و رووداوەکانی گێڕایەوە هەوارگەی سروشتی خۆیان لەم سەرزەمینەدا بۆناو خودی خەلّك ئەو دەیگوت گۆڕانی بێ

وچانی داب و نەریتیان، دامەزران و کەوتنی دەوڵەتەکانیان و باری دەوروبەری جوگرافیان مێژوو دروست دەکات.[1]

رەنگە تەفسیرکردنی مێژووی ئیسلامیی کورد بەیەك هۆکارو بزوێنەر کە ئەویش ئیسلامە دیسانەوە تارادەیەك رەنگدانەوەی لێکدانەوە مارکسییە کە بێت کە هەموو هۆکارەکان پشتگوێ دەخات و دەیانکات بەسەرخان و هۆکاری لاوەکی و ئابوری دەکاتە تاکە هۆکارو هێزو بزوێنەری راوەستاو لەدوای ئاڵوگۆڕە مێژوویەکانەوە، بەڵام لێرە مەرامی ئایدیۆلۆژی ئابوری دەگۆڕێ بەئایین، واتە ئیسلام دەکرێت بەسەرخان و تەفسیری کارکردی سەرجەم ژێرخانەکانی‌تری پێ دەکرێت و سەرجەم جوڵەو کارلێککردنەکانی نەتەوەو کۆمەڵگایەك لە ژینگەو دەوروبەرەکەیدا لەئایینەکەیدا چڕ دەکرێتەوە! لەکاتێکدا وەك مێژوونووسی فەرەنسی "لیوسێن فێڤر" Eebvre (١٨٧٨ ـ ١٩٥٦) دەڵێ: «رێگەی تێگەیشتنی مێژوو بەتێگەیشتنی کۆمەڵدا تێدەپەڕێت» فێڤر بۆ خۆی ئەو رێگەیەی گرتەبەرەو بەوردی لەدیاردەکانی ژیانی کۆمەلایەتی پێوەندی بەرهەمهێنان لەلادی بازرگانی، زوبان، ئایین، ژیانی روناکبیری و ئەو جۆرە یاسانەی، دەکۆڵییەوە بەونیازەی بگاتە بنج و بناوانی بەسەرهاتەکان کەلێکی دانە دەبڕین ، بەڵکو بەدوای پەیوەندییەکانیدا دەگەرا.

"مارك بلۆك"ی مێژوونسیش (١٨٨٦ ـ ١٩٤٤) ئەو رێبازەی لەکتێبی "بەرگری لەمێژوو" دا بەدرێژی روون کردۆتەوە، لە نووسینەکانیدا بلۆك دەیوست بزوتنەوەی کۆمەڵ بەپێی یاسای تایبەتی بسەلمێنیت، دەیگوت گەریمانەوێت لە رووداوی

[1] د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو ، بەغدا/١٩٨٣، ل٥١.

مێژوویی چۆن پێویسته وەها تێبگەین دەبێت تەنها کرداری ئەم رەفتارەی ئەو لێکنەدەینەوە پێویستە بەناخی باری ژیانی ئابوری و سروشت و کۆمەڵدا بچینەخوارێ، بەوردی لەدیاردەکان بکۆڵینەوە.[١]

دەبینی ئەم مەنهەجیەتە زانستییە لای ئەم بەشە لەروناکبیرانی ئێمە ونە، بەڵکو هەر لە ناوکوردا بەگشتی بەهۆی باری تایبەتی و کاریگەری مارکسیزم بەسەر ناوەندە فکری و سیاسییەکە و هەندێ جار روگەشبوونی هەندێ رووی رۆشنبیریە کوردیەکەو وەدەر نەکەوتنی کۆمەڵناسی لەناو کورداو دەرگا لە سەرخۆداخستن بەناوی مارکسیزم و پێشکەوتنخوازی ورزۆرشتیتر، کەمتر توانراوە سوود لەو میتۆدو رێبازە توێژینەوە جۆراوجۆرانە وەربگیرێ، کەبزوتنەوەی گەشەکردنی فکریی پێیان گەیشتووە، دەشێ بڵێین تاکە (خیار)ی زۆرێك لە رۆشنبیرانی کورد مارکسیزم و میتۆدەکەی بووەهەر لەروانگەی ئەوەوە روانیویانەتە ژیان و مێژوو گۆڕانی کۆمەڵایەتی.. گەرچی لەم کایەشدا تیۆریستی وا هەڵنەکەوتووە بتوانێ مێژوو واقعی کوردی تارادەیەك بەقووڵی و بەگوێرەی ئەم میتۆدە لێکبداتەوە، بەڵام گوتەزاو پرەنسیپە مارکسیەکە توانیویەتی کار لە دەزگای تێڕوانین و سەرچاوە مەعریفیەکان بکات، بەهۆی ئەم حاڵەتەو بەکارنەهێنانی میتۆدە جۆراوجۆرکانی خوێندنەوەو بێ توانایی لەبەکارهێنانیان لەچوارچێوەی دیدێکی کوردانەدا بۆژیان و مێژوو ، بەڵکو پشت گوێخستنی هەندێ میتۆدی خۆرهەڵاتی بۆ نموونە میتۆدەکەی (ابن خلدون)کە بە بڕوای من تا رادیەکی بەرچاو دەتوانێ یارمەتیمان بدات لەلێکدانەوەی مێژووی

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٠.

پێش دەرکەوتنی ناسیونالیزم لەناوچەکەدا بەتایبەتی تێزەکەی دەربارەی چۆنییەتی دروستبوونی دەوڵەت و بناغەکانی و یاساکانی گەشەکردن و مانەوەو پوکانەوەی و گرنگی دان بەرۆڵی دەمارگرژی ئایینی و خێلایەتی لەگۆڕانە سیاسی و کۆمەڵگاییەکاندا.

کەلەبەری گەورە لێرەدا لەوەدایە کە ئەم گەڕانەوەیە بۆ مێژوو وەك وتمان گەرانەوەیەکی سیاسییە گەڕانەوەی رۆشنبیرێکی ئایدیۆلۆژیستە، کەناتوانێ زیاتر لە میتۆدێك لەیەك کاتدا بەکاربێنێ بۆ خوێندنەوەی مێژوو کە بۆ مەرامە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکانی ئامادەیەواز لەو سەرەتا زانست و بابەتی یانە بێنێ کە لەگەڵ جیهانبینی و وێناکردنەکانی ئەم ناکۆك دەردەچن، قسەکردنی ئەم رۆشنبیرو سیاسییە لەسەر ئاستی تەوژم و بەرزنەبونەوەیەتی بۆئاستی نەتەوەکە لەخۆگری تەوژمی جۆراوجۆرەوو ئیسلامیش تێکەڵ بەژیانی رۆحی و کۆمەڵایەتی بووە تەنانەت لەم قۆناغەدا کارگەیشتۆتە ئەوەی بۆدژایەتی کردنی تەوژمێکی فکری سیاسی بەرامبەر (تەوژمی ئیسلامی کوردی) گوێ نەدرێ بەشێواندنی مێژو یاخود لێکدانەوەی بەگوێرەی خواستی ململانێکان و دابەزاندنی بۆ ئاستی سیاسەتێکی گومان لێکراو کە (استهلاك)ی رۆژانەی هەیە ئەمەش مایەی سەرسوڕمانێکی گەورەیە ئەگەر بێت و لەچاویلکەی بەرژەوەندییە ناسیونالیستە کوردیەکەوە سەیری بکەین.[1] (ئەگەر فاروق رەفیق) ئەم دۆخەی بەئاژاوەیەکی مەنهەجی ناوبردبێت[2] ، بەڵکو

---

[1] یەکێ لەوانە نوسینەکانی کاك (مەلا بەختیار)ە، تەنها بۆ نموونە سەیری ئەنفال و ئایدۆلۆژیەتی بەعس بکە، گۆڤاری ئەنفال / ژمارە ١/٢٠٠٠ ل٢١ و لاپەڕەکانی تر، هەروەها کتێبەکەی چەند کۆڕێك لەسایەی ئازادیدا

[2] فاروق رەفیق/ لە ووتاری خۆرئاواو (ئەو)ەکانی موسڵمان وەکو (ئەو)ی خۆرئاوا .

گرفتی بێ مەنهەجی و گوێ نەدان بەمەنهەج لەمامەڵە لەگەڵ مێژوودا شتێکی راستی وتووە گرفتێکی گەورەی‌تری ئەم گەڕانەوەش کەلەم فەوزا مەنهەجیەدا یاخود لەبێ مەنهەجیەدایە، پەنابردنییەتی بۆ لێکدانەوەی مێژوو بەپاڵەوان واتە ئەو میتۆدەی پێی وایە تاك (پاڵەوان) واتە مرۆڤە مەزن و هەڵکەوتووەکان مێژوو دروستدەکەن. (هیگل)یش دەیوت من بەرجەستبووی مێژووی جیهان لەم قۆناغەدا بەسەرپشتی ئەسپێکەوە دەبینم کە مەبەستی (ناپلیۆن بوو) لێرەش پەنابراوەتە بەسەر بە خولگەیی کردنی رۆڵی فەرد لەدروستکردن و ئاراستەپێدانی رووداوە مێژووییەکاندا، بەڵام بەناوەرۆکێکی تازەوە کەپێچەوانەی ئەو ناوەرۆکەیە خاوەنی ئەو میتۆدە داویانە بەمیتۆدەکەیان. لێرەدا چەند کەسایەتییەك چەند فەردێ دەبن بەوهێزە بەرپێنەگیراوانەی سروشتی مێژوویی، بەڵکو چارەنووسی هاوچەرخی ئێمەش دیاریدەکەن.

کەسانی وەکو مەلا ئیدریسی بەدلیسی و مەلای خەتێ تەنانەت تارادەیەك (صلاح الدین) و (شێخ مەحمودی نەمر)یش دەبن بەو کائینانەی سەرجەم مێژووی نەتەوەیان تیا چڕ دەبێتەوە هەر ئەوانیش نەتەوە مەحکوم دەکەن بەشکستێکی رۆحی و فیزیکی گەورە! گەر هەندێ لەناوەرۆکی ئەم گوتارە رابمێنین دەیەوێت بێ بەشی کورد لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی خۆیدا لە قەوارەی نەتەوەیی دڵخوازی خۆی و سەرنەکەوتنی لەگەیشتن بەقۆناغی رەهای رۆح کەپێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیە دەخرێتە ئەستۆی هەڵەکانی مەلا ئیدریس و فتوای مەلای خەتێ و تۆقەنەکردنی شێخ محمود لەگەڵ ئەفسەرێکی ئینگلیزی و هەوڵنەدانی (صلاح الدین) بۆ دروستنەکردنی دەوڵەتی کوردی.

واتە ئەمانە پاڵەوانی دروستکردنی مێژوو شکۆپێدانی نین، بەڵکو پاڵەوانی شکستی ئەو مێژووەو بەتاڵکردنەوەینی لەهەر ئاماژەیەکی زیندوێتی و ئیجابی بونی نەتەوە، بەدەر لەوە و لەسەرو ئەمەشەوە لێکدانەوەیەکی ئایدیۆلۆژیی سیاسیی لایەنگیرە کە ئیرادەو هێز وەك مرۆڤ و وەك فەرد لە ئەمان دەسەنێتەوە، واتە ئەوەخۆیان نەبوون وەك مرۆڤێ کە هەریەکەیان بیر دەکاتەوەو بەراورد دەکات و حەزو ئارەزووی هەیەو لەسیاقی قۆناغێکی مێژوویی و لەناو تۆڕێکی پەیوەنی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا دەژی و ئەمەش رەنگدانەوەی بەسەر بیرکردنەوەو بڕیارەکانیدا پەیدا دەکات، بەمەش هەریەکەیان وەك مرۆڤ ئەم هەنگاوە بنێت، بەڵکو ئەوە ئیسلامە، لە میانەی ئەوانەوە ئەوکارە دەکات! ئەوە پیلانی ئینگلیزەکان و حیساب کردن بۆ نەخشە سیاسی و بەرژەوەندییە ئابوریەکانیان نییە لە قۆناغێکی یەکجار ناسکی یەکلاکەرەوەی ناوچەکەدا کورد لە دروستکردنی قەوارەی خۆی بێ بەش دەکات، لەکاتێکدا شێخ مەحمود چەندین نامەو داواکارینامە ئاراستەی تەختی شاهانەی بەریتانیای مەزن و نوێنەرەکانی لەکوردستان و عێراقدا دەکات و داوای یارمەتیان لێدەکات، ئەمانە هیچی گرنگ نەبوون، بەڵام ئایا دەگونجێت دەبێت پشتکردنی ئینگلیز لەکوردو پشتیوانی کردنی رەهای لەعەرەبەکانی عێراق و بەتایبەتی ناسیونالیستە سونییەکان بە تەوقە نەکردنەکەی شێخ محمود لێکبدەینەوە؟! ئایا کورد بەهۆی تۆقەنەکردنێکەوە بەپاڵنەری ئایینی لەبەرئەوەی دەستی ئینگلیزەکان بەگڵاو زانراوە تووشی ئەم هەموو کارەسات وماڵوێرانییە هات!! یاخود بەشێکی زۆری بەهۆی گڵاوی سیاسەتی ئینگلیزەکان و وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان و دەسەڵاتە سەرکوتکەرە ناوچەییەکانەوە بوو؟

دیسانەوە ئەم تەرزە لێکدانەوە ئەفسانە ئامێزە پێمان نالێ گەر ئیسلام لەمێژوودا لە رەفتاری ئیمپراتیۆرەکان و ئەم رەمزە نەتەوەییانەدا بەرجەستە بووەو شوێنگەیەکی لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا نەبووە ، ئەی چۆن کاتێ سەرجەم ئەو دەسەڵات و رەمزانە نامێنن ئیسلام لەناو جەرگەی ژیانە کۆمەڵایەتیەکەدا هەر دەمێنێتەوەو کارلێکی خۆی دەکات!

هەڵبەتە وەنەبێ زەقکردنەوە ئەم رەمزانەو بەرجەستەکردنی ئیسلام و شکستی نەتەوە لەیەك کاتدا تیایاندا لەبناغەدا لەسەر دەستنیشانکردنێکی زانستیانە و سەرنجی لۆژیکیانە دامەزرابێ، بەڵکو زیاتر لەوەی ئەم داستانانە واقیع بن دروستکراوی خەیاڵی نەخۆشی هەندێ کەسن، لانی کەم بەو قەبارەی کەخراوەتە روو، ئەم تێزە لەپێناو سەلماندنی ئەو بۆچوونە خولگەییەی خۆی کە پێی وایە ئیسلام سەرچاوەی نەهامەتییەکانی ئێمەیە! سڵ لەوە ناکاتەوە پشت بەدرۆ ببەستێ و داستانی سەیر و سەمەرە هەڵبەستێت.[1]

ئێمە سەیر دەکەین مێژووناسی گەورەی کورد خوالێخۆشبوو مامۆستا (محەمەد ئەمین زەکیبەگ)، ئیدریسی بەدلیسی بە (مەولانا) باس دەکات واتە بە گەورەییەوە ناوی دەبات هەنگاوەکەشی لەقۆناغێکی مێژووییدا بە گرنگ دەزانێ بۆ دەرکردنی کوردستان لە فەوزایەك کەتووشی هاتبوو.[2]

---

[1] لەم رووەوە سەیری پێشەکی کتێبی کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا بکە حسن محمود حەمە کریم / چاپی دووەم / ٢٠٠٠ لەپرۆژەی سەد کتێبی کوردی ژمارە ٢٧

[2] محمد امین زکی/ خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، ترجمة: محمد علي عوني، الجزء الاول، الطبعة الثانية، ١٩٦٨، ل١٦٧.

بەڵام دواتر لای ڕۆشنبیرە ئایدیۆلۆژیستەکان کە هێندە بەخەمی ڕاستی مێژووییەوە نین ئەوەندەی لەخەمی برەودان بە ئادیۆلۆژیاکەی خۆیاندان ئەم کەسێتییە دەبێتە ڕەمزی ناپاکی و خۆهاویشتنە باوەشی داگیرکەرانەوە! دیارە ئەگەر ئەم گەڕانەوەی دوای (ئەمین زەکی بەگ) گەڕانەوەیەکی مێژوونووسانەی زانستی بووایە پەیڕەوی لە ڕێبازی زانستی لە نووسینەوەی مێژوودا بکرایە، پشتی بەژمارە و دیکۆمێنت و بەڵگەنامە مێژوویەکان ببەستایە، سیاقە مێژووییەکە لە شیکردنەوەکاندا ڕەچاوبکردایە و بەم جۆرەش ڕاستی نوێ وەدەرکەوتبایە ئەمە شتێکی‌تربوو، بەڵام ئێمە شتێکی لەم جۆرە نابینین ، بەڵکو تێزەکە بەجۆرێ ئەم مەسەلانە دەخاتەروو وەك ئەوەی بەڵگە نەویست بن و لەسەرووی قسەلێوەکردن و مشتومڕکردنەوە بن! چونکە هەر لەبنەڕەتەوە گەڕانەوەکە گەڕانەوەی مێژوونووس و مێژوونوونوسانە نییە بە واتا زانستییەکەی بۆ مێژوو، بۆیە چاوەڕێی ئەوەش ناکرێ لێکۆڵینەوە زانستییەکان بێنە زمان تاکو ئەمانیش بەقەناعەت و دۆگماکانیاندا بچنەوە، بەڵکو بڕیارەکە بڕیارێکی پێشوەختە پێویست بوونی لە داخوازییە ئایدیۆلۆژی و سیاسییە گروپیەکانەوە هەڵدەقوڵێ و بەم جۆرەش وەك زۆر کایەی‌تر پێداچوونەوە و خوێندنەوەی تازە و ڕزگار بوون لە دۆگماکان و نایەتە دی، تەنانەت دوای ئەوەی چەندین توێژەر لەدووتوێی توێژینەوە و نووسینەکانی خۆیاندا ئەوەیان خستۆتە ڕوو کە داستانی مەلا ئیدریس و مەلای خەتێ و شێخ مەحمود بەوجۆرە نین کە لە ڕابردوودا خراونەتە ڕوو و بەشێکی زۆریان دروستکراون[١] کەچی هەندێ کەس

---

[١] لەوانەی لەو بارەوە نوسیونانە مامۆستا (مەسعود محمد) و حەسەن محموود حەمە کەریم و چەند بەڕێزێکی تر

واز لە وتنەوەی ئەم بالۆرانە ناهێنن و بۆتاوێکیش ناتوانن فۆرمە تەنگەکانی بیرکردنەوەیان تێکبشکێن و جیهان بە رەنگێکیتر ببینن، شتەکەش روونە لەبەرئەوەی رەمزەکان ئیسلامین دەخوازرێ بەم جۆرە بخرێنە روو بۆ ئەوەی لە رێی لێدانی ئەوانەوە لەئیسلام بدەن ئیتر لایان گرنگ نییە ئەم جۆرە رەفتارە لەسەر رووکەشکردنی خوێندنەوە و تیڕامانەکانی نەوەیەك لەم وڵاتە دەکەوێت یاخود نا[1] لەلایەکیترەوە ئەم تێزە هەستی گەڕان بەدوای مێژووی نەتەوەو نوسینەوەو شیکردنەوەی لاواز دەکات ئەمیش لەو روانگەوە کە کاتێ نوسینەوەی مێژوو دەبێ بەنوسینەوەی شکست و نائومێدیەکان بەتەنهایی چەندین سەدەی ترسناك ئیتر دەبێت چۆن شەوق بۆ نوسینەوەی ئەو مێژووە سەرهەڵبدات.؟! هەرلەبەر ئەمەشە (هەستی مێژوویی و خوێیندنەوەی مەنهەجیانە تارادەیەکی زۆر لە ناو ئەم رۆشنبیرییەدا نائامادەیە کایە جیاجیاکانی کۆمەڵگای ئێمە تائێستاش هەریەکەو بەجیا هەریەکەو بەپێی خێرایی زەمەن و رووداوو چۆنییەتی دروستبوون و گشەکردنی ئەوکێشانەی کەهەیانە تەماشا نەکراون و نەخوێندراونەتەوە).[2]

حەز دەکەم هەر لێرەشدا پەنجە بۆهەڵەبوونی خوێندنەوەکەی مەریوان وریا قانع رابکێشم لەمەڕ پەیوەندی ئیسلامی سیاسی بەمێژووی کوردەوە کە بەگوێرەی خوێندنەوەکەی ئەویەکێ لەگریمانە سەرەکییەکانی ئیسلامی سیاسی کوردستاندا بەخشینی جەوهەرێکی ئیسلامیی بە مێژووی کوردییە[3] دواتر لە راڤەکردنی ئەم

---

[1] چونکە هەر لەبنەڕەتەوە لێدانەکە بۆ ئایدیایەکی ترەو بەرگی ناسیۆنالیزمی تێوە پێچراوە.

[2] مەریوان وریا قانع، لەنێوان مۆدێرنەو ئیسلامی سیاسیدا ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.

[3] هەمان سەرچاوە، ل٢٨.

گریمانەدا دەڵێ: (ئیسلامی سیاسی پێمان دەڵێ ئەوەی سیاسەت و ئابوری و کولتورو تەکنۆلۆژیاو زمان لەدنیای ئیسلامدا بەڕێوە دەبات مێژووی ناوەکی ئەوکایانە خۆیان نین ، بەڵکو ئەو مێژووە دەرەکییەیە کەناوی ئیسلامەو بەبۆچوونی ئەوان لە هەناوی هەریەکە لەوکایانەدا ئامادەیەو لەقوڵاییاندا دەستبەکارەو جەوهەرێکی ئیسلامیشی پێ بەخشیون).[1]

یاخود دەڵێ: (زەمەنی درێژخایەن، کە زەمەنی شکڵبەندی ستراکتووری کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەقڵییە لەناوەوە را لەڕێی دوورخایەنەکان دەکات، لای ئیسلامییەکان کراوەتە زەمەنێکی نەگۆڕی رەهەند لەناوەوە را لەڕێی ئیسلامەوە جەوهەر پێبەخشراوە.[2]

بەڵام بەبڕوای من ئەم لێکدانەوەیە بەتەواوی پێچەوانەیە، واتە ئەم تێزە تێزی ئەو جۆرە رۆشنبیرانەیە کە باسمان لێوەکردن نەك ئیسلامی سیاسی، پێدانی جەوهەرێکی ئیسلامیی نەگۆڕ بە مێژووی کورد قسەی ئەوانەیە کە ئیسلام دەکەنە لێپرسراو لە ئازار و مەینەتیەکانی (١٤٠٠) ساڵی رابردووی مێژووی کورد، گەر کاك مەریوان بەگوێرەی پێویست ئاگای لە مشت و مڕەکانی ناوەندی فکری ئیسلامیش بوایە لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیدا وا بە ئاسانی ئەو قسەیەی نەدەکرد، چونکە زۆرێ لە ئیسلامییەکان بڕوایان وایە هەر زۆر لە مێژەوە و لەسەرەتای دەوڵەتی ئەمەویەوە ئەوە ئیسلام بەمانا پەیامدارەکەی نییە کە جەوهەر دەبەخشێ بەمێژوو

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٣١.

[2] هەمان سەرچاوە،ل٣٢.

بەتایبەتیش لەکایە سیاسییەکەدا ، بەڵکو ئەوە بەهاکانی خێڵ و دەمارگرژی پێش ئیسلامە زیندوو دەبێتەوە و دواتریش کەلەپوری سیاسی ئیمپراتۆریەتەکانی ساسانی و بیزەنتی خۆدەخزێننەوە ناو فەرهەنگی دەوڵەتداری و شوێن پەنجە بەسەر جۆری مومارەسەی سیاسی و مێژوی سیاسییەوە دادەنێن.

چونکە ئەگەر وەك مەریوان دەڵێ: ئیسلامیەکان جەوهەرێکی نەگۆڕی ئیسلامی بدەن بەمێژووی جیهانی ئیسلام، دەبێت ئەوانیش بەیەکسان بینینی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی بەراست بزانن کە ئەمەش وانییەو هێڵەگشتی و بنەڕەتیەکەی ئیسلامیەکان جیاوازی دەخەنە نێوان ئیسلام و مێژووی ئیسلامی ، بەڵکو تێکەڵاوکردنی ئەم دووانەو بەیەك شت لە قەڵەمدانیان بەپیلانێکی ئەو رۆشنبیرو ناوەندانە دەزانن کە دەیانەوێت دوژمنایەتی ئیسلام بکەن و خراپیەکانی مێژوویەك کە بەرهەمی جوڵەی مسوڵمانانە وەك مرۆڤ و کۆمەڵگا بکەن بەتاقە وێنای ئیسلام و لەوێوە هێرشی بکەنەسەر. نەك هەر ئیسلامیەکان ، بەڵکو هەموو مێژوونووس و رۆشنبیرێکی ئاگادار دەزانێ چەندین هێزی هەر لەبنەڕەتەوە نائیسلامی، وەك مەغۆلەکان و خێڵە تورکییە جۆراوجۆرەکان و خاچ پەرستەکان لەگەڵ چەندین دەستەوگروپی ناوخۆ کە گوزارشت بوون لە ئامادەیی ئایین و کلتورو کەلەپورەکۆنەکان لەناو جیهانی ئیسلامدا بەشداربوون لەدروستکردنی ئەو مێژووەدا.

لەپێشیشەوە سەرنجەکەی (د. کەمال مەزهەر)مان خوێندەوە کە چۆن تەنانەت لەمێژووشدا مێژوونوس و کۆمەڵناسێکی مسوڵمانی گەورەی وەك (ئیبن خەلدون) روداوە مێژوویەکان دەگەڕێنێتەوە چوارچێوە سروشتییەکەی خۆیان و دەیانکات بە بەرهەمی بزاوت و کارلێکە کۆمەڵگاییەکان، بەڵام رۆشنبیرێکی ئیسلامی مەرج نییە

ئەو بەرەنجامگیریە بگرێ کە کاك مەریوان وەك روناکبیرێکی عەلمانی دەیەوێت پێی بگات ئەمەش هەرگیز واتای نائامادەبوونی ئیسلام وەك بیربوباوەڕو ژیارو فەرهەنگ بەتایبەتی لەئاستی فەزا گەورەکەی کۆمەڵگادا ناگەیەنێ یاخود ئەوەی لێناخوێنرێتەوە چارەسەرێ دەتوانێ وەڵامدەرەوەی پێداویستییە رۆحی و ماددیەکانی ئیمە بێت لەکاتێکدا گوێ نادات بەو کاریگەرییەی ئیسلام لەسەر تێڕوانینی و کۆنەپەرەستی و مەنزومەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی گەلانی مسوڵماندا دایناوە.

ئەگەر لای ئیسلامیەکان و رۆشنبیرانی ئیسلامی ئەو جیاوازییە لەنێوان ئیسلام و مێژووی گەلانی موسڵماندا بەشێ نەبێت لەقەناعەت و بیرکردنەوەیان ئەوکاتە دەبێت رۆشنبیرێکی ئیسلامی کورد یاخود تەوژمێکی ئیسلامی بچێتە ژێرباری ئەوەی هەرچی بەسەر کورددا هاتووە لەمێژوودا ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی ئیسلامدایە ئەویش بەحوکمی ئەوەی ئیسلام تاکە بزوێنەرو شکڵ پێدەری مێژووی ئێمە بووە کە ئەمەش شتێکی بیرلێنەکراوەیە دەشێ لەقۆناغێك لەقۆناغەکاندا لێکدانەوەیەکی دیایکراوی ئیسلام بەوە لێکبدرێتەوە کە دەوری سەلبی گێڕابێت، یاخود دام و دەزگا ئیسلامییە لۆکاڵەکان و مەنزومە فکرییە ئایینییەکە بەم جۆر یاخود بەوجۆر نەیتوانیبێت ئەو چوراچێوە بووبێت رۆحی کوردی هەست بە شکۆی زیاتری خۆی بکات و چوارچێوە تەسکەکانی خۆی بەجێ بێڵێ و ئەو فۆرمانە بشکێنێ کە بەربەست بوون لە بەردەم گەشەیەکی سروشتی ئەمدا، بەڵام ئەمە سەریکێشێ بۆخودی ئیسلام و رۆحە عەدالەتخوازەکەی دیارە ماقولیەتێکی وای تێدانییە، یاخود گەروا بوایە دەبوایە ئیسلامیەکان و رۆشنبیرەکانیان رەخنەیان لەو مێژوو کلتورە

نەگرتايەكە جووڵەی ئەو مێژووە لەناو زەمەندا بەرهەمی هێناوە كەدیسان ئەمەشیان پێچەوانەی واقیعەو ئەم رەخنە لەئارادایە و جاری وا هەیە لای هەندێ رۆشنبیریش زۆر توند دەبێت، چونكە ئەوكاتە بەگوێرەی ئەوگریمانەیە هەموو رەخنەگرتنێك لە مێژوو رەخنەگرتن دەبێت لە ئیسلام، بەڵام دووبارە ئامانج و مەبەستی پشت رەخنە ئیسلامی و عەلمانی‌یەكی لەهەمان مێژوو كە مێژووی ئیسلامییە جیاوازە، چونكە لەكاتێكدا رەخنە عەلمانییەكە دەیەوێت پێمان بڵێت ئیسلام ئەوەیە لە مێژوودا بەرجەستەبووە هەربۆیە ناكرێ چاوەڕێی ئیسلام بین وەڵامدەرەوەی هیچێ لە پرسیارەكانی سەردەم و پڕكردنەوەی پێداویستیەكانیانمان بێت دەسەڵات پەیداكردنەوەی ئیسلامیش شتێ نییە جگە لەدەسەڵاتپەیداكردنەوەی فۆرم و دامەزراوو میكانیزمە مێژووییەكان و بەرهەمهێنانەوەی ئەو مێژووە بەهەموو چەمك و ململانێ و پرسیارو گیروگرفت و خەمەكانییەوە، بەڵام رەخنە ئیسلامیەكە بۆئەوەیە بیسەلمێنی ئەوەی لەمێژوودا دەبینین بەتایبەتیش لەكایە سیاسیەكەدا لە زۆربەی كاتدا رەنگدانەوەی بەها ئیسلامیەكان و رۆح و سەرەتاكانی ئەم ئایینە نییە ئیسلام نەك هەر یەكسان نییە بەو مێژووە، بەڵكو زوڵمێكی زۆری لێكراوە لەسایەی ئەودا، بەڵام ئەمەش نابێ بگاتە ئاستی دەرهێنانی ئیسلام لەمێژوو، چونكە ئەمەش فۆرمێكی‌تری نابابەتی بوونەو واقیعی مێژوویش وەك پەنجەرەیەك لەناو پەنجەرەكاندا بۆسەیركردنی ئیسلام دەمێنێتەوە.

ماوەتەوە بڵێین ئەگەر ئیسلامییەكی لەوجۆرە هەبێت كەمەریوان باسی دەكات ئەوا لەهەردوو روی ئیسلامیی رووت و زانستیشەوە لەوەهمدا دەژی لەیەك كاتیشدا زیان بە ئیسلام و كۆمەڵگاكەشی دەگەیەنێت.

## کێشەی بەشداریی مێژوویی کورد

مێژووی سیاسی لە دنیای ئێمەدا هەموو مێژووە لۆکاڵەکانی‌تری کوشتوە، حەماسەت نەیهێشتووە مەنهەج دەست بەکار بێت و نەفیکردنی سادەگۆی سەرتاسەریانە شوێنی لێکدانەوەچەند لایەنی و دیدی ئاڵۆزو فرە رەهەندی دینی و دنیاو دیاردەکانی گرتۆتەوە).[١]

گەر ئەم قسە زیاتر بۆ سەدەیەك و لەسەر ئاستی لۆکاڵی کرابێت، ئەوا لەسەر ئاستەکانی‌تریش راستە کاتێ دەوترێت (تێکشکاندنی مرۆڤ بەژیاری خۆیەوە بەهەموو مانا سایکۆلۆژیەکانی تێکشکاندنی بنەماکانی کەسێتی دیاریدەکات)[٢] ئەمیش لەروویەکی‌ترەوە گوزارشتە لەگرفتی جۆری ئامادەبوون لەناو مێژوو و بەشداریی مێژوویی نەتەوەیەك و رەهەندو دورانەکانی لەبەرئەوەی لەئێستادا گرفتەکە واتە گرفتی کورد لەجەوهەردا سیاسیانەیە! دەخوازێت گەڕان بەدوای هەر بەشدارییەکی کوردیش لە مێژودا دەبێت لەفۆرمێکی سیاسیدا بێ و بەشداریەکی سیاسی بێت، تەنانەت دەبێت سیاسی بێت بەمانا هاوچەرخ و ناسیونالیستەکەی! لەم تێزەشدا گەر لە دەرەوەی سیاسەت هەندێ ئاماژە بۆژیار هەبێت دەیخاتە چوارچێوە ئایینییە زەردەشتییەکەو ئەمەش لەرووبەکەوە دەرکردنی کوردە لەچوارچێوی ژیارو شارستانێتی ئیسلامی و هەندێ جار هەر لەبنەڕەتیشەوە داننەنانە بەژیارو

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل٣٧.

[٢] ئیسماعیل حەمە ئەمی، بابەت و سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

شارستانییەتێکی لەوجۆرە. دیارە لەبەر نەبوونی دیدێکی فراوان بۆمێژوو بەشداری مێژوویی هەندێ لەرۆشنبیرانی ئێمە زۆر دەست و دڵ فراوان بوون لەدابەشکردنی بەشێکی گرنگ لە مێژووی ژیاری ئێمەو بەخشینەوەی و واز لێهێنانی بۆ نەتەوەکانیتر! ! زۆر قورسە لای زۆریێ لەرۆشنبیرانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەم چاوەڕێی ئەوەبین باسی بەشداری ژیاریانەی کورد لە ژیاری ئیسلامیی و ناوچەکە بێتە گۆڕی و بیکەن بەبابەتێ بۆ مشتومڕو تیشکی بخەنەسەر، چونکە لەو کاتەدا (ئایین و فکری ئایینی هێمابوون بۆ کۆنەپارێزی و دۆگمایی فکری و هەژاریەکی رۆشنبیری و فکری و رۆحی).[1]

ئەم مۆدێلە ناسیونالیزمە متوربەکراوە بەهەناسەکانی مارکسیزم، ئامادەیی سیاسیانەی کورد لە مێژوودا دەکات بەتاکە پێوەری کارایی مێژوویی و سەکۆیەك بۆشانازی کردن، پێشی وانییە دەوڵەتی ئەیوبی و دۆستەکی و شەدادی و چەندین دەسەلاتی‌تری کوردی، ئەو پێداویستییە رۆحییە نەتەوەییە تێر بکەن و رەمزی بەشداری سیاسی مێژوویی کوردبن لەمێژووی ئیسلامی ناوچەکەدا، چونکە کورد نەیتوانیوە لەسەردەمی دەسەلاتدارێتی‌یە ئیسلامیەکاندا لەسەر تەختی ئیمپراتۆریەت دابنیشێ، لێرشەوە ئەم ناسیونالیزمە شوناسێکی ناسیونالیزمانە بەئیمپراتۆریەتە ئیسلامیەکان دەدات و ئەو راستییە لەبیر دەکات کەئیمپراتۆریەتی ئیسلامی فەزایەکی فرە کلتورو رەگەزو ئایین بووە لەبەرئەوە کاتێ گوتاری ناسیونالیستی بالادەست بەتایبەتیش عەرەبی پرۆسەی بەموڵك کردنی ئەومێژووەو

---

[1] مەریوان وریا قانع، لەنێوان مۆدێرنەو ئیسلامی سیاسیدا، ل٤٠.

بەناسیونالْکردنی دەست پێدەکات و شارستانێتی ئیسلامی دەگۆڕێ بەشارستانێتی عەرەبی ئیسلامیی ئەمە لەکاتێکدا (ابن خلدون) هەر زۆر دەمێکە وتویەتی: (زۆربەی هەرەزۆری زانایانی نەتەوەی ئیسلامی غەیرە عەرەب بوون).[١]

ناسیونالیزمی کوردی لەباتی ئەوەی بێت ڕەوایی لەوگوتارە شۆڤێنیستییە دژی مێژووییە بسێنێتەوە کەهەوڵ دەدات ڕەنج و بەشداری چەندین نەتەوە لەدروستکردنی ئەو مێژوو شارستانێتییەدا (غصب) کات و مۆرکی نەتەوایەتی لێبدات و بێ بناغەبوونی تێزەکانی و ئایدیۆلۆژیا بوونی ئەم تێزە و بڕیارەکانی بخاتە ڕوو، تەسلیم بەم دۆگما و گوتارە دەبێت و ڕازی دەبێت بەوەی بخرێتە دەرەوەی ژیارێکی مێژوویی گەورە و بەشداریکردنی بەتاڵ بکرێت و دەستی بەسەردا بگیرێ، وەك ئەوەی لەبەرنجامی ئەو ستەمە نەتەوەییەی لەلایەن هەڵگرانی ئەو گوتارەوە تووشی دێت وای لێ بکات و بڵێ ئەو مێژووەی تۆبەشداربی لەگەڵمدا ئەوە هەر لە بنەڕەتەوە مێژوی من نییە؟ بێ گوێدانە ئەوەی کە گواستنەوەی ئەم حەساسیەتە ناسیونالیستیانە بۆپێش چاخی ناسیونالیزم سەراپای خزمەتە بەرەوتی پاوانخوازانەی ناسیونالیزمی زاڵ و سەردەست و بۆ کوردو ناسیونالیزمەکەشی گەمەیەکی دۆڕاوی‌ترە و نەك هەر هێزو شوناس و بەرچاو ڕوونی پێ نابەخشێ ، بەڵکو پانتایی گرفتە ڕۆحییەکانی فراوانتر دەکات.

کورد بەشداریەکی بەرچاوی لەژیار و شارستانێتی ئیسلامیدا هەیە ئەم بەشداریەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کردوویەتی بەئەندام و پارچەیەکی ڕەسەن

---

[١] الدکتور احمد محمود صبحی/ فی فلسفه التاریخ/ بیروت ١٩٩٤ ، ص١٥٠.

لەجەستەی ناوچەکە نکولی کردن لەو بەشداریە یاخود شاردنەوەو فەرامۆشکردنی لەبەر مەرامی ئایدیۆلۆژی و تێڕوانینی بەرچاو تەنگانەو خۆگرمۆڵەکردنێکی هەڵچووانە لە قازانجی کوردو بزاوتە نەتەویەکەیدا نییە،، چونکە (بەشداری شارستانیانەو رۆڵی شارستانیانەی کورد لە رابردوودا تەنیا لە سازدانی کانونی کولتوری ئێرانی و شارستانییەتی ئیسلامی و لەبنیاتنانی دەوڵەتی عوسمانی و کولتوری عەرەبیدا دەبینرێتەوە کاتێك کورد لەئێران و لەو کانونە کولتوریە مەزنەدا ببڕێت و بەفارس بڵێین شارستانێتی ئێرانی موڵکی تۆیەو ئێمە بێبەرین لێی بەعەرەب بڵێین شارستانێتی ئیسلامی کە بۆنی سمی ئەسپەکانی تۆی لێ دێت موڵکێکی قەڵبەو بۆخۆتی بەرەوەو ئێمە کارێکمان بەسەریەوە نییەو رۆڵێیشمان تێدا نەبینیوە، بەتورك بڵێین هەرچی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا روویدا تۆی تورك خاونییەتی و لێی بەرپرسیاری، ئێمەنە لەنزیك و نەلەدور پەیوەندیمان بەکولتوری تۆوە نییە بەڵێ هەقمانە بپرسین کە ئەمەمان کرد کورد چی بۆدەمێنێتەوە؟

بەرای من گەر ئەوە بکەین وەك چۆن کاك رەفیق مەبەستی کاك (رەفیق سابیر)ە لەکتێبــی ئیمپراتۆریەتی (لم)دا چەندین رۆشنبیری تازەی کورد دەیانەوێت ئەو هەوڵە بدەن ئەوا بەوشێوەیە کورد رووت دەکەینەوە لەهەموو دەستکەوتێکی شارستانی و رەوانەی شاخەکانی دەکەینەوەو بەم کارەشمان ئەو بۆچوونە دەسەلمێنین کەدەڵێ کورد کێوییە بۆچوونی ئۆرینتالیستە تازەکان دەچەسپێنین کە پێ لەسەر شاخاوی بوونی کورد دادەگرن.

بەمەش گورزی گەورە لە ڕۆڵی شارستانیانەی کورد لەمێژووی ناوچەکەدا دەدرێ[١]، بەڵام بەداخەوە بۆهەندێ ئەوەیان پێ باشترە کورد بەکێوی و بە نەتەوەیەکی بێ شارستانییەت بناسرێ، لەوەی لێساندنەوەی ئەم سیفەتە سەربۆ بوژاندنەوەی رابردوویەك بکێشێ کە کورد بەناوی ئیسلامەوەو لەچوارچێوەی شارستانییەتەکەی ئەودا بەشداری کردووە، ئەمەش کارێکە پێچەوانەی ئەو بیرکردنەوەیە دەیەوێت هەموو رابردوویەکی گەش لەداستانی بەشداری ژیاری ئیجابی کورد کە ناسنامەی ئیسلامی پێوەیە لەیاداوەری نەوەی نوێی کوردا بکاتە دەرەوەو ئەم نەوەیە تەنها لەدوو بازنەدا بیر لە ژیاری بکاتەوە: بازنەی پێش ئیسلام، کەکورد خۆی ژیاری خۆی دروست دەکرد و ئایینی خۆی بناغەی ژیاریەکەی بوو کە دیارە شتێکی وای لێ نەماوەتەوەو لەبەردەم شاڵاوی سوپای هێرشهێنی ئیسلامدا پوکاوەتەوە، بازنەی هاوچەرخیش، کەتاکە ژیار هەبێت ژیاری خۆرئاوایەو بونیشمان لەسەردەمدا کاتێ واتا پەیدا دەکات کە ئینتیمامان بۆئەو ژیارە بێت و لەرووی فکری و کلتورو جیهانبینییەوە درێژکراوەی ئەوبین هەرلەدیدی چەمکە بەرهەم هاتوەکانی ئەویشەوە بڕوانینە ژیان و گەردوون و مێژوو، ئەوچەمکانەش بەچەمکی گەردوونی بزانین و پێشمان وابێ زانستی بوون و بابەتی بوون ناوەرۆکیان پێکدەهێنن!

کاتێ دیدێك یاخود تێزێك هەموو مەبەستێکی لەلێدانی ئیسلامدا لە میانەی مێژووی نەتەوەدا بدۆزرێتەوەو ئامانجی یەکەمی دروستکردنی هۆشیاریەکی مێژوویی نەبێت، لای نەوەی نوێ، ناتوانێ مێژوویانە بچێتە ناو ماڵی مێژووەوەو تەنها هەندێ

---

[١] فاروق رەفیق خۆرئاواو (ئەو)ەکانی. موسڵمان وەکو (ئەو)ی خۆرئاوا، سەرچاوەی پێشوو/ل٧٤.

وێنەی نیوەچڵی لێدەگرێ و دوایی بەلێکدانی ئەو وێنانە لەیەکتر دەیەوێت وێنەیەکی گشتی مێژوومان نیشاندا، لەکاتێکدا پێویستە هەڵسەنگاندنی بزوتنەوە مێژووییەکان بەگوێرەی چەند پێوەرێك بێت ناشکرێ لەنێو ئەواندا سەرکەوتن و ژێرکەوتن هەبێت بۆئەوەی پێوەرەکان تووشی تێکچوون و تێکەڵ و پێکەڵی نەیەن، بەڵکو بزاوتەکانی مێژوو کردەوەی کەسێتییەکانی بەئەندازەی، بەشداری ژیاریان دەپێورێ،، چونکە ناشێ بڵاوکردنەوەی وێرانی و خوێنرێژی و خراپەنانەوە لەزەویدا ناوی خاوەنەکەی بەناوی سەرکەوتنەوە بەرزکاتەوە. تەنها دەستکەوتە رۆحی و فکری و ماددیەکانی کە پێویستە بکرێ بەپێودانگ، نەك هەربۆهەڵسەنگاندنی کردەوەکان، بەڵکو لەبەر ئەوەی تەنها ئەوە رۆڵی بەرچاوی لە رێرەوی مێژوودا هەیە)[١].

(توینبی) یش کاتێ تیۆرەکەی دارشت نەتەوەی وەك یەکەیەکی لێکۆڵینەوە وەرنەگرت، چونکە نەتەوە خۆی لەخۆیدا پارچەیەکی خود کەفانییە، بەڵکو پێویستی بەشتێکی هەمەلایەنەتر لەخۆی هەیە لەبەرئەوە یەکەی لێکۆڵینەوەی مێژوویی بریتییە لە ژیاری (الحچارە) کە چەندین نەتەوە دەگرێتەوە)[٢].

ئێمەی کورد بمانەوێ و نەمانەوێت بەشێکین لەقەڵەمرەوی جیهانی ئیسلام و نەتەوەیەکی ناوژیارەکەین خۆرهەڵاتناسی و تیۆرستەکانی خۆرئاوا لەوە زیاتر مان پێ نالێن، ناکرێ لەدابەشکردن و پۆلێنکردنەکەی هنتگتون بۆشارستانییەتەکان خۆمان بخەینە دەرەوەی ژیاری ئیسلامی نەك تەنها لەبەرئەوەی ئێمە بەکردەوە

---

[١] د. احمد محمود صبحی، فی فلسفه التاریخ ص١١١.

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦٢.

بەشێکین لەو فەرهەنگ و ژیارە، بەڵکو لەبەرئەوەش کە گوتاری خۆرهەڵاتناسی و سەنتەریزمی خۆرئاوایی لەم رووەوە جەبرێکی بەسەردا سەپاندووین، بەو واتایەی گەر تەوژم و تێزێ بشیەوێت خۆی وادەردەخات لەرووی رۆحی و فکری و ژیاریەوە هیچ ئینتیمایەکی بۆو ژیارە نەماوە ئەم قسەیە لەبازاڕی فکرێکدا کەسەنتەریزمی خۆرئاوا بەرهەمی دێنێ کەس نایکڕێ، بۆیە دەکرێ خەڵکانێك قایل بن بەمەسخ بوون، بەڵام ئەم مەسخ بوونە پێشەکییەك نابێ بۆچوونە ناو دنیاو ژیارو قەڵەمڕەوێکەوە کە زۆر بەزەحمەت ئامادەیە ئەندامێکی دەرەوەی خێزانە مێژوویەکەی خۆی لە ماڵەکەیدا قبوڵ کات، گەرگۆڕانکارییە چاوەڕێکراوەکانی ئاییندەش چوارچێوەکان فراوانترکات، لەوەی نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوە دەیخەنە روو لەجاران زیاتر بکات بەبەشێ لەسیماکانی ئەو جیهانەی لەحاڵەتی پێکهاتندایە.

ئەوا لێرەشەوە تۆبەکردن لەم گوناهەی هەندێ رۆشنبیر پێی هەڵدەستن و دەیانەوێت هەر رۆڵێکی ژیاری لەکوردبسێننەوە، لەژێر ناونیشانی بیانووی بێ ناوەرۆکدا دەچێتە ریزی بەشێ لەو خۆسازدانەی کورد بۆ روبەڕوبونەوەی ئاییندە ئەمەش نەك هەر دەرگا لەسەر خۆداخستن نییە لەناو ماڵی مێژوودا، وەك هەندێك دەیانەوێت وای بخەنە روو، بەڵکو رێك بەپێچەوانەوە مەبەست تیایدا بەشدارییەکی کاریگەری سەردەمانەیە لە پێگەیەکی بەهێزترەوە. خۆ ئامادەکردنێکی هۆشیارانەیە بۆ لەخۆگرتنی جەوهەری ژیاری هاوچەرخی خۆرئاوا.

### ئیشکالیەتی چەمکی ناسیونالیزم

وەك باسمان کرد ئەم دیدە گرفتێکی گەورەی لەگەڵ چەمکی ئیسلامدا هەیەو ناتوانێ لەگەڕانەوەیدا بۆ پەی بردن بە ناوەڕۆکی ئیسلام پەنا بباتە بەر سەرچاوە بنەڕەتی و ڕەسەنەکانی و ئامانجە باڵاکانی و پرەنسیپە گشتییەکان و ڕۆحی ئەم ئایینە، بەڵکو ئیسلام بەتەنها لەو فۆرمەدا دەبینێ کە گروپە مرۆڤییە جۆراوجۆرەکان لەناو مێژوودا مانای جۆراوجۆری پێ دەبەخشن، لەپاڵ ئەمەدا گرفتێکی گەورەیتری ڕۆشنبیری سەر بەم تێزە، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد، پەنابردنە بۆ چەمکی ناسیونالیزم و نەتەوەو نەتەوایەتی بۆلێکدانەوەی ئەو مێژووەی کوردو نەتەوە دراوسێکانی تیایدا ژیاوە.

ئەوان زۆر غەمبارن لەوەی (صلاح‌الدین) ناسیونالیست نەبوە... هەندێ ڕۆشنبیری ناسیونالیستی کوردیش پێیان وایە هەر لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیەوە (د.خ) کێشمەکێشی نەتەوەیی لە ئیسلامدا سەری هەڵداوە کاتێ هەندێ لە غەیرە عەرەبەکانی وەکو بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و سوهەیبی ڕۆمی و گاوانی کوردی پەیوەست بوون بەئیسلامەوە، پێغەمبەریش (د.خ) ڕێزی گەورەی لێگرتن و خۆشی ویستن و بەبەشێ لە بنەماڵەکەی خۆی دانان، بەڵام هاوەڵە عەرەبەکانی پێغەمبەر بێزاریان لەم هەڵوێستەی پێغەمبەر دەربڕی، پێغەمبەر بەرگری لێکردن!

پێشیان وایە ئەوەی واشی کردووە لە سەردەمی پێغەمبەردا کێشەی نەتەوایەتی نەبێتە کێشەیەکی گشتی ، بەڵکو تاکو پێغەمبەر بەگوێرەی سەرەتاکانی ئەو

ئایینەی هێنابووی چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە ئەوەبوو هێشتا تێکەڵاویەکی بەرفراوان لەنێوان عەرەبە مسوڵمانەکان و گەلە غەیرە عەرەبیەکاندا پەیدانەبووبوو، کێشەی نەتەوەکان کاتی فەتحی ئیسلامی بۆ دەرەوەی دوورگەی عەرەبی وەدەرکەوت و هاتەئاراوە، واتە لەسەردەمی خەلیفەکانی راشیدیندا دوای ئەوانیش رەهەندەکانی ئەم کێشە درێژەی کێشاو هەڵایسا.[١]

هەر ئەم نووسەرە دەڵێ ئەو راستییەی کە بەڵگەکان دەیسەلمێنن بریتییە لەوەی خەلیفەکانی راشدین و ئەمەوی و عەباسیەکان، هەرگیز نەیانتوانیوە چارەسەرێ بۆ کێشە نەتەوەییەکان بدۆزنەوە کە وروژاندبوویانە ، بەڵکو زیاتر ئاڵۆزو پڕ گرێتریان کرد.[٢]

دواتر لەکتێبەکەدا باس لە راپەڕین و شۆڕش و بەربەرەکانی و بەرهەڵستی نەتەوایەتی کوردە لە پێناو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیداو دەرپەراندنی زۆردارانی و داگیرکارانی خاك و نیشتمانەکەی.

نووسەرێتریش هەیە لەم چوارچێوەیە ناسیونالیزمی کردنی سەرجەم مێژووی ئێمەو پەیوەندیمان بە دەوروبەری خۆمانەوە بەپێچەوانەی ئەمەی سەرەوە واقیعە مێژوویەکە دەبینێ و پێی وایە (کورد وەکو نەتەوەیەك کەبۆتە هەڵگری پەیامی ئیسلام بەتەواوی لەنێو ئەم ئایینەدا تواوەتەوە بەتایبەتی لەبەرئەوەی کورد بۆتە سوننەی شافیعی و ئەم مەزهەبەش بە ئەهلی کیتاب دادەنرێت و هیچ ناکۆکییەکی

---

[١] جمال نبز/ المستضعفون الكرد واخوانهم المسلمون/ من منشورات كورد نامه، لندن، ١٩٩٧/ل١١

[٢] هەمان سەرچاوە، ل١١ – ١٢.

لەگەڵ مەرکەزی ئیسلامدا نییە، لەبەر ئەوە کورد لەناو ئیسلامدا هیچ ناڕەزاییەکی نەبووە هەتا ئەوە ببێتە هۆ بۆ جوڵاندنی کورد بەلای دروستکردنی کەسێتی ئیداری سەربەخۆی خۆیدا لەسایەی ئیسلامدا). [٣]

هەرئەم نووسەرە ئەو واتایە بەجۆرێکیتر دووپات دەکاتەوەو دەڵێ: (کورد لە بوون بەئیسلامیدا بەتەواوی بوونی نەتەوەیی خۆی لە بیرکردوەو وەکو ئیسلامێك لەخۆی روانیوە کە پێوستی بە بونی ناسنامەی نەتەوەیی نییە). [١]

کە دیارە ئەم قسە لەسەر ئەو گریمانە بەندە کە ئەو هەستە لەلای نەتەوە مسولمانەکانی دراوسێی کورد، عەرەب ، تورك، فارس ئامادە بووە هەر لەدوو توێی کتێبەکەشیدا ئاماژە بەوە دەکات، ئەم خاڵەش یەکێکە لەخاڵە هاوبەشەکانی نێوان زۆربەی ئەو نووسەرو رۆشنبیرانەی لەمەڕ پەیوەندی مێژوویی کوردو ئیسلام قسەیانکردووە، واتە بەقسەی ئەوان لەناو هەموو مسوڵمانەکاندا تەنها کورد وازیان لەناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بۆ ئیسلام هێناوەو بەمەش کورد دەکرێت بە (هەڵاواردەیەکی) مێژوویی یەکجار سەیر.

رەنگە ئەم هەموو زوڵم و ناهەقییە زۆرەی لە (١٥٠) ساڵی رابردوودا لەکورد کراوە و ئەو هەموو تاڵاوەی لەپێناو گەیشتن بەمافە نەتەوەییەکانی چەشتویەتی و نقومبوونی لەدەریایەك لەنائومێدی و کەسەرو شکست، وای لەهەندێ نوسەرو

---

[3] عەتا قەرەداغی، چەمکی دەوڵەت و بزوێنەری مێژوو لەکۆمەڵگای کوردیدا، سلێمانی ١٩٩٩/ل١٠٦ شایانی باسە لەوێدا کاك عەتا بەهەڵە دەستەواژەی (ئەهلی کتاب)ی بەکارهێناوە، چونکە ئەم زاراوە بۆ پێناسەی ئەو غەیرە موسڵمانانەیە کە خاوەنی ئایینی ئاسمانین و بۆ وەسفکردنی مسوڵمانان خۆیان بەکار نایەت.

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

رۆشنبیركردبێت رێگا بۆگوتاری حەماسەت خۆش بكەن و بەدەر لە هەر مەنهەجیەتێكی زانستی، كێشمەكێشی نەتەوایەتی بەناوەڕۆك و ڕەهەندو ئاڵۆزییە مۆدێرنەكەیەوە، بەرنەوە بۆ ناو ناخی مێژوو هەوڵدەن ململانێ نەتەوەییەكان بكەنە ئامرازێكی شیكاری و لێكدانەوەی مێژوو فۆرم و قۆناغ و بڕیارەكانی! پێ دەچێ هۆكارێكی‌تریش هەژاری ناوەندە رۆشنبیریە ناسیۆنالیستەكە خۆی بێت، كە لەرووی تیۆریەوە ئاسۆكانی مەعریفەو بیركردنەوەو ئیشكردنی زۆر تەسكەو ناتوانێ قۆناغە مێژووییەكان و جیاوازییە بونیادیەكانی نێوانیان وەك ئەوەی هەیە بخوێنێتەوە، لە روویەكی‌ترەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی كە ناوەندە رۆشنبیریەكە كەوتۆتە بەركارتێكردنی چەپ و ماركسیزم و ماركسیزمیش سەرهەڵدانی پرسی نەتەوەیی و ناسیونالیزم دەبەستێتەوە بەسەر هەڵدانی سەرمایەداری و خەملینی بۆرژوازی وەكو چینێ و پێویستیەكانی بازاڕەوە، بەڵام لەپاڵ هەموو ئەمانەدا واتە كە ماركسیزم نەتەوایەتی دەكاتە دیاردەیەكی نوێی دنیای مۆدێرن ئەم تەرزە رۆشنبیرە بازی بەسەر ئەو لێكدانەوە ماركسیەشدا داوە و لە سۆنگەی بۆغز بەرامبەر ئیسلامەوە گەڕاوەتەوە بۆ مێژوو خوێندویەتیەوەو بارگاوی كردووە..

بەكارهێنانی دەزگایەكی چەمكیی مۆدێرنەی وەك: نیشتمان، نەتەوە، نەتەوایەتی، بەرگری نەتەوەیی، هاووڵاتی، داگیركردن، دەوڵەت و قەوارەی نەتەوە، بۆلێكدانەوەی مێژوویەك كەمۆدێرنە وەك فكرو مەنهەج و ئامرازو میكانیزم بەشدارنییە لەدروستبوونیدا بۆقسەكردن لەسەر زەمەن و ساتێكی مێژوویی كە ئەم چەمك و دەستەواژانە لەفەرهەنگی ئەودا واتایەكیان نییە، بەمانا ناسیونالیزمەكەی، نیشانەی هەژاریەكی مەعریفی و بێئاگابوو نیشە لە ئاماژە راستەقینەكانی ئەم

چەمکانەو چۆنییەتی سەرهەڵدان و فۆرمەڵە بوونیان و هەروەها چۆنییەتی پەڕینەوەشیان بۆناو فەرهەنگی خۆرهەڵاتی و کوردی و ئەوساتە مێژووییەش کە ئەم پەڕینەوەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

لێرەوە بۆ ئەوەی هەر قسەکردنێك لەسەر پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیونالیزمی کوردی و کوردبوون بەواتا فەلسەفەییەکەی راست دەرچێت یاخود بڵێین لەچوارچێوە سروشتیی و مەنهەجییەکەی خۆیدا بکرێت و نەبێت بەشەڕە قسەو پڕکردنەوەی لیستی تاوانبارکردن و تۆمەت خستنەپاڵ و عەقڵی رەخنەیش تیایدا ئامادەبێ و تێڕامان و سەرنجەکانمان لۆژیکانە بن، دەبێت پێش هەموو شتێ ناسیونالیزم بگێڕینەوە سیاقە مێژووییەکەی خۆی و ئەو ریشە وەهمیانەی لێ بسێننەوە کە گوتاری حەماسەت و گرێی رق و ئایدۆلۆژیا لە دنیای رۆشنبیریی کوردیدا بۆی دروستکردووە،، چونکە گەر نەتوانین ناسیونالیزم وەك چەمك بەئاماژە مۆدێرنەکانی خۆیەوە (تبنی) بکەین، ناتوانین سەرەتایەکی راست دەسپێبکەین لەمەڕ قسەکردن لەسەر ئەم پرسە ئاڵۆزە.

ناسیۆنالیزم زادەی ئەوورپایە و بەشێکە لەپرۆژەی مۆدێرنەتی[1] ئیتر ناکرێت وابزانێت جیهان لە (ئەحمەدی خانی) کوردانەوە فێری ناسیونالیزم بووە، یەکێ لەو تیۆریستە خۆرئاوایانەی لەبارەی ناسیونالیزمەوە قسەی کردووە (گێڵنەر)ە ناوبراو ناسیونالیزم بە بەرهەمی مۆدێرنە دەزانێ، لای ئەم تیۆریستە ناسیونالیزم بریتیە لە (پرەنسیپێکی سیاسی گریمانی ئەوە دەکات کەدەبێت یەکیەتی سیاسی و یەکیەتی

[1] فاروق رفیق/ ناسیونالیزم وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژی، سەرچاوەی پێشوو، ل٥.

سەرزەمینی نەتەوەیی هاوشانی یەکدی بن، بەمانایەکی دیکە ناسیونالیزم ئەو بۆچونە سیاسیەیە کە پێی وایە سەرزەمینی هاوبەش و یەکگرتوویی نەتەوەیەکی دیاریکراو، دەبێت سیستمێکی هاوبەش و یەکگرتووی هەبێ، ناسیونالیزم ئەو هەوڵدانەیە بۆ ئەوەی کلتورو ئیدارە بەیەکەوە کۆببنەوە، ناسیونالیزم هەوڵی ئەوە دەدات کلتور سەرپۆشی سیاسی خۆی وەرگرێت، واتە سەرپۆشێکی سیاسیە وەك ئاشکرایە گێلنەر لەهەردوو بارەکەدا ناسیونالیزم وەك بزاوتێکی سیاسی پێناس دەکات ئامانجە سەرەکییەکەشی دەبەستێتەوە بەدروستکردنی کیانێکی سیاسیەوە بۆ نەتەوە یاخود کولتورێك یان سەرزەمینێکی نەتەوەیی یەکگرتوو.

لێرەوە ئەوە چەمکانەی لەگەڵ ئەو ئیدارە سیاسییە یەکگرتووەدا کە ئەم شتانە بەیەکەوە کۆدەکاتەوە دەبێتە چەتری سەرسەریان، بەم مانایەش کە گلێنەر بەچەمکی ناسیونالیزمی دەدات، ناتوانین قسە لەبوونی ناسیونالیزمی بکەین بەر لە رۆژگاری مۆدێرنە، چونکە ئەوە مۆدێرنەیە بنەمای ئەو هەموو شتە لەیەکچووانە دەرەخسێنێت کە ناسیونالیزم پێویستی پێیەتی بەباوەڕی (ئەندروسۆن)یش فەنتازیای نەتەوەیی فانتازیای گروپێکە کە لە ئیمپراتۆریەت بچوکترە، بەڵام لەخێڵ و گروهە بچوکەکانی بەر لە نەتەوەش گەورەترە.

بەبڕوای (ئەندرۆسۆن) دروستبوونی فانتازیای نەتەوەیی بەبێ مۆدێرنە مەحاڵە، چونکە لەسەرێکەوە مۆدێرنە (دەوڵەت ـ نەتەوە) دروست دەکات کەدەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی فۆرمی ئیمپراتۆرە گەورەکان لەسەرێکی دیکەوە کاپیتالیزمی چاپ و نووسین دادەهێنێ کە دەبێتە هۆی لە لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی بنەماکانی

فانتازیای گروهە بچوکەکانی وەك خێڵ، لێرەوە بۆئەوەی فانتازیەیەکی هاوبەش بێتەکایەوە پێویست بە بوونی میدیایەکی هاوبەش سیستمی سەربازی هاوبەش، رەمزی نەتەوەیی هاوبەشی وەك سەرباز بوون، خەزینەی نەتەوەیی، قامووسی زمانی نەتەوەیی، ئەتڵەسی نیشتمانی و ئاماری نەتەوەیی هەیە، هەموو ئەمانەش بەرهەمی مۆدێرنەن و بەر لە مۆدێرنەبوونیان نەبووە.[١]

بەم پێیەش ناسیوناليزم بوونێکی ئەزەلی و بێ سەرەتا نییە، بەڵکو هەروەك (ریچارد حاتم) دەڵێ: (دیاردەیەکە لە مێژوودا)[٢] واتە ئەندێشەی ناسیونالیزم و میللەتگەرایی و خودی واژەی میللەت یاخود نەتەوە، چەمکێکی تازەیەو کەمتر سەروکاری بەرابردوەوە هەیە).[٣]

بۆ ئەوەی باس لە ناسیونالیزم بکەین دەبێ گروهێکی بەشەری بدۆزینەوە کە کۆمەڵێ سۆز و پەیوەندی لەسەر بناغەی نەتەوە و نەژاد کۆی کردبنەوە و ئەم پەیوەندییەش پێش هەر جۆرە پەیوەندییەکیتر بخەن کە ئەمەش لەسایەی ئیمپراتۆریە فرە نەژاد و ئایین و نەتەوەکانداو لەچوارچێوەی دەمارگرژیی خێڵدا زۆر زەحمەتە دەستمان بکەوێت و لەپێش مۆدیرنەدا هەستێکی لەوجۆرە پەیدا ببێ و دواتر تەنزیری بۆ بکرێت.

---

[١] مەریوان وریا قانیع، ناسیونالیزمی دوور مەودا، رەهەند ژمارە ٩ – ١٠/٢٠٠٠، ل٧٠.

[٢] ریچارد حاتم/ ناسیونالیزم در ایران، ص٥

[٣] هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٢.

ناسیونالیزم وەك وترا دیاردەیەكی مێژووییە، دەركەوتێكی دنیای مۆدێرنەیە، بەو مانایەی كە دیاردەیەكە سەرهەتای سەرهەڵدانی هەیەو رەنگە تەمەنی ناسیونالیزمیش وەك پرەنسیپێكی سیاسی لە (٢٠٠) ساڵ تێنەپەڕێ و بگەڕێتەوە بۆ ساتەوەختێ كە لە ئەوروپادا ئیمپراتۆریەتەكان هەڵوەشانەوە و لەبەرەنجامی ئەو بۆشاییەی بەجێیان هێشت دەوڵەتە نەتەوەییەكان بۆ یەكەم جار لە مێژوودا لەوێ پەیدابوون.

(چەمكەكانی ئەتنییەت و نەتەوەو ماناكانیان چەمك و مانای نوێن و ناكرێت مێژووی كۆنی گروهە جیاجیاكانی پێ بخوێندرێتەوە كێشە نەتەوایەتی و ئەتنییەكان كێشەی تازەن و لە ئەنجامی خۆپێناسی كلتوری و سیاسی گروهێكەوە وەك نەتەوە پەیدا دەبێت، بەم مانایە كێشەی ئەتنی و نەتەوەیی لەم چەند سەدەیەی دوایی تێناپەڕێت، لەئەوروپادا لەسەدەی هەژدەهەمەوەو لەدنیایی ئێمەدا لەسەدەی نۆزدەهەمەوە ئەم كێشانە تا رادەیەكی زۆر وابەستەی لەدایكبوونی سیستمی دەوڵەتی نەتەوە و پەیدابوونی بزوتنەوە ناسیونالیستەكانن، بەر لە سیستمی ئەتنی و نەتەوەیی زەحمەتە بەمانا ئەتنی و نەتەوەیەكان قسە لەوكێشانە بكەین.

لەناو دنیای ئیسلامیشدا بیرۆكەی دەوڵەتی نەتەوە لەناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە لەناو كۆمەڵێك رۆشنبیری ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بڵاو دەبێتەوە.[1]

---

[1] مەریوان وریا قانیع، ناسیونالیزمی دورمەودا/ سەرچاوەی پێشوو،ل٧٩.

لەقۆناغ و سەردەمێکدا کە ناسیونالیزم بونی نەبووە ناکرێ بە (زمان و چەمك و زاراوەکانی نەتەوەو ناسیۆنالیزم لەسەر کێشەکانی ئەو رۆژگارە بدوێین).[١]

پرۆژەی دروستکردنی کۆمەڵگای سیاسی بەمانای دەوڵەتی نەتەوەیی بەو چەمکەی ئێمە لە مۆدێرنەدا دەبینین پرۆژەیەکی کۆلۆنییە، دەوڵەتی نەتەوەیی پرۆژەیەکی کۆلۆنیالی بوو، هەردەبینین هەموو ئەو بزوتنەوانەی کە لەپاشاندا دروست دەبن لەناو ئەو جەبرە جوگرافی و سیاسیە نوێیەی ناودەوڵەتی کۆلۆنیالیدا دەجوڵێنەوە کە کۆلۆنیالیزم سنورەکانی بۆکێشاون.[٢]

واتە ناسیۆنالیزم وەك مۆدیلی لە خۆرئاواوە دێت بۆ ناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەرباری قاجاری لەئێران و بەرەنجامی گەشەیەکی ناوخۆیی نەبوو ، هەڵبەتە ئەمە بۆ سەرجەم ناسیونالیزمەکانی ناوچە کەواتە تورك و عەرەب و فارس و کورد و نەتەوەکانیتریش راستە، بۆیە دەبینین سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لەناو هەر چوار نەتەوە گەورەکەی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا.. عەرەب، فارس، تورك، کوردبووە .

هاوکات و لەساتەوەختێکی مێژووییدا بووە، گەرچی دەتوانین تا ڕادەیەك بڵێین ناسیونالیزمی کوردی زیاتر پەرچەکردارە بۆ ناسیونالیستەکانیتر و بەتایبەتیش ناسیونالیزمی تورکی.

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل٨٠.

[٢] هەمان سەر چاوە، ل٤٣.

لەگەڵ باسی ناساندنی گیانی ناسیونالیستی و بڵاوبوونەوەی لەسەر ئاستی ئەوروپاو دواتر دەرەوەی ئەورووپاش ناکرێ ، باسی رۆڵی شۆڕشی فەرەنسی و دروشم و سەرەتاکانی و یەکێ لە تیۆریستەکانی واتە روسۆ نەکەین، ناسیونالیزم وك بیروباوەڕێکی سیاسی زیاتر لەدوای ئەم شۆڕشەوە پەرەی سەندو شوێنکەوتووی بۆپەیدا بوو، روسۆ جەختی لەسەر جۆشخواردن و لەدەوری یەك کۆبوونەوەی ئاپۆرەی گەلی دەکردو، جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە مرۆڤ دڵبەندی شوێن و زێدی لەدایکبوونی بێت، پێوستە نیشتمان ببێتە خولگەی خۆشویستنی و دڵسۆزی تاك و کۆمەڵگا، تەنانەت ڕۆسۆ ئەمەی گەیاندە ئاستی ئەرکێکی ئایینی پیرۆز، لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشدا زۆربەی پرەنسیپ و بناغەو تایبەمەندییەکانی ناسیونالیزم فۆرمەلە بوون و بۆ یەکەم جار بەشێوەی پراکتیك جێبەجێ کران وروژاندنی هەست و هەمان بەرامبەر نیشتمان و ئال ئەو رێز بۆدانان و بەگەورەگرتنی پاڵەوانە نەتەوەییەکان و تۆمارکردنی سرودی نیشتمانی و نەتەوەیی و جەخت کردنەوە لەسەر پیرۆزی زمان و رەگەزی فەرەنسی، داهێنانی بۆنەو جەژنە نەتەوەیە گەورەکان لەسەر شێوەی رێ و رەسمە ئایینییەکان، شانازی کردن بەمێژووی فەرەنساو باوەڕبوون بەپەیامی مەزنی گەلی فەرەنسی، هەموو ئەو پرەنسیپ و بنچینە سەرەکی و لاوەکیانەی بیرۆکەی ناسیونالیزم پێکدەهێنن لەسەروبەندی شۆڕش و دوای سەرکەوتنی بەدویەکدا پەیدابوون و سەریان هەڵدا[1] گەشەکردنی ناسیونالیزمی فەرنسی و دیدە فراوانخوازەکەی کاری کردە سەر خێراگەشەکردنی

---

[1] الدکتور علی محمد تقوی / الاسلام والقومیة/ تهران/ الطبعة الاولی، ١٤٠٤ هـ. ص١٧-١٨.

ناسیونالیزمەکانیتر لەوانەش ناسیونالیزمی ئیتالی و ئەلمانی، سەدەی نۆزدەش ناونرا بە (چاخی زێرینی ناسیونالیزم) لەم سەردەمەدا ڕێبەرە فکری و سیاسی ناسیۆنالیستەکان لەئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپای خۆرئاوا و هەندێ کۆلۆنی لە ئەمریکای باشوور وەدەرکەوتن و بیرۆکەی سەربەخۆخوازی نەتەوەیی گەشەی سەند. ئەم بیرۆکە پەڕیەوە ناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی، بەتایبەتیش ناو گەلانی مەسیحی بەلکان، ئەمەش پاڵی پێوەنان شۆڕشە نەتەوەییەکان دەستپێبکەن بۆسەر بەخۆبوون و پێکهێنانی قەوارەی نەتەوەیی ڕەنگە لە ڕاستی دورنەکەوینەوە گەر بڵێین ناسیونالیزم لەسەدەی نۆزدەدا لەئەوروپادا بووە هێزێکی تەکاندەری یەکجار گەورە جۆش و خرۆشی نەتەوایەتی فۆرمەڵەبوونی ناسیۆنالیزمەکانی ئەوروپا بەشێکی بنەڕەتی لەمێژووی ئەو قۆناغەی ئەوروپاو تا ڕادەیەکی هەندێ شوێنی دەرەوەی ئەوروپاش پێکدەهێنێ، هەر ئەم هەست و نەست و دەمارگرژیی و هەست بەشانازیەی ناسیونالیزم بوو لەپشت زۆرێ لەو شەڕو ناکۆکی و خوێنڕێژی و دەستدرێژی کاریانە بوو کە لەو ساتانەدا لەنێوان وڵات و گەلانی خۆرئاوا ڕوویانداو پاڵنەرێکی گەورەی بەربڵاوبوون و بەهێزبوونی دیاردەی کۆلۆنیالیزم و چاوبڕینە خاك و نیشتمان و خێر و بێری گەلانیتر و ڕوتاندنەوەیان بوو.

ئێمە گەر بەسەر پێیش بێ بگەڕێینەوە بۆ هەندێ لە پێناسەی لەسەدەی نۆزدەدا واتە سەدەی ناسیونالیزم لە ئەوروپادا بۆ ئەم چەمکەکراوە و ئەو ناوەڕۆکەی پێی دراوە ئەوکاتە دەتوانین لەڕوویەکی بزوتنەوەی داگیرکردنی وڵاتان و کۆلۆنیالیزم باشتر تێبگەین، بەڵکو بێ ڕەچاوکردنی پاڵنەرو ڕۆحە ناسیونالیستیەکە زەحمەتە بتوانین لەهۆکارەکانی هەر دوو جەنگی یەکەم و دووەم تێبگەین ،

ناسیونالیزمی ئەورووپی لەسەدەی نۆزدەدا مرۆڤی ئەورووپی و نەتەوەکانی خۆرئاوا دەباتە ئاستێکی هێندەبەرز لە نەرجەسییەت و تەنها خۆبینین و خۆبەسەنتەرکردن و دەرەوەی خۆبچووککردنەوەو بەتاڵکردن، کە چەندین کارەساتی گەورەی لێ بکەوێتەوە، چاوتێبڕینەکانی ناسیۆنالیزیمی خۆرئاوایی و ستراتیژە ئابوری و سیاسی و سەربازییەکەی تەنها لەچوارچێوەی سنورەکانی دەوڵەتی نەتەوەدا ناوەستێ، بەڵکو هەموو سەرزەمین دەکات بەپانتاییەکی کراوە بۆ وەدەرکەوتنی شکۆو رۆحی نەتەوەو گەیاندنی پەیامە گەردونییەکەی و پاراستنی سەروەرییەکەی، سیستمی سەرمایەداریش ئەو چوارچێوە رەخساوە بوو ناسیونالیزم تیایدا گەشەبکات و پێ بگات، کاتێ رژێمی سەرمایەداری چاوی تەماحی بڕیبووە خێرو بێری وڵاتان، ناسیونالیزم بیرۆکەیەکی لەباربوو بۆ ئەوەی وەك پاڵنەرێکی بەهێز نەك هەر چینە خاوەن سەرمایەکە، بەڵکو سەرجەم چین و توێژەکانی گەل لەچوارچێوەی ئەودا رێکخا و ستراتیژەکانی خۆی بێنێتە دی و لە راستیشدا هەستی خرۆشاوی شادی نەتەوەیی و هەستکرد بە بانتربوون (التفوق)ی رەگەزی و نەژادی و دەمارگرژی بۆ مێژوو ژیاری هەموو ئەمانە زەمینە خۆشکەربوون بۆ فراوانخوازی و مومارەسەی توندوتیژی دژی گەل و نەتەوەکانیتر.

بیرمەندێکی خۆرئاوایی بەناوی فرانسیس کۆکەر لەم بارەوە دەڵێ: (زۆربەی ناسیونالیستەکانی سەدەی نۆزدە لەدەرەنجامی هەستێکی نەتەوە پەرستانەی توندڕەوەوە قەناعەتیان بەوە بوو کە گەلانی پەرەسەندو ئەوانەی بەمێژوو کلتورێکی مەزن جیادەکرێتەوەو و بانتربوونی رەگەزی و نەتەوایەتیان هەیە، مافی ئەوەیان نییە هێزو تواناکانیان لەناو سنورەکانیان قەتیس بدەن، چونکە ئەرکی نەتەوەیی و

نیشتمانی تەنها لەبەرگری کردن لەسەروەرێتی نیشتمان و پاراستنی سەربەخۆییدا کورت نابێتەوە، بەڵکو پەیامێکی جیهانی لەئارادایە و پێویستە لەسەریان دەستڕۆیشتوویی سیاسی و ژیاری نەتەوەییان بەو گوێرەی بەرژەوەندی دەیخوازێ بەسەر هەموو دەوڵەتە دواکەوتووەکاندا بکێشن.

گەرچی ئەمە لەرێی بەکارهێنانی هێزو توندوتیژیشەوە مەیسەربێت و بێتەدی.[1]

هەر لەو سەردەمەدا و لە ناو تاقیگەی زانا بایۆلۆژیەکانەوە تیۆرەکانی رەگەزپەرستی سەری هەڵدا ، رەگەزپەرستی لەسەر بناغەی رەگەزو رەنگی پێست و دواتر لەسەر بناغەی نەتەوە، چونکە هەر لەو سەروبەندەدا زانست بوە ئامرازی پۆلێنکردنی تازەی مرۆڤەکان لەسەر بناغەی رەگەزو نەژاد ، هەربۆیە بیرۆکەی رەگەزپەرستی ـ کە کورد لەسەدەی بیستەمدا یەکێکە لە قوربانیانی ـ تەنها لە دوای پەیدابوونی مۆدێرنەوە دەتوانین تێی بگەین دوای دەرکەوتنی بیردۆزی داروینیزمیش دەگوازرێتەوە بۆ فەزا کۆمەڵایەتیەکەو دواتر پەیوەندی نێوان گەلان، لێرەوە شەرعیەت بەقەڵاچۆکردنی گەلان دەدرێت،، چونکە گەلانی دەرەوەی ئەورووپی سومبولی پاشکەوتوویی و بەربەریەت و ناشارستانییەتن و ئەرکی ژیاری گەردونی خۆرئاوایەو مافی خۆیەتی وەکو بابەت سەیریان بکات بۆ کارلەسەرکردن جا چەوساندنەوەو (استغلال) کردن بێت یاخود ریشەکێش کردن و سڕینەوە بێت لە نەخشەی بووندا و سپاردنیان بێت بەدنیای نەبوون و تاریکی، هەڵبەتە ناسیونالیزم هەر لەخۆرئاوا سەری هەڵنەدا، بەڵکو دەرهاویشتەی واقیعێکی فکری سیاسی ئابوری

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و رۆحی بوو، ناسیونالیزم لەناو هەناوی کۆمەڵگا خۆرئاواییەکانەوە سەری هەڵدا دەبێت لەروانگەی گێروگرفت و پێداویستی و داواکاریە رۆحی و سیاسی و ئابوریەکانی ئەوکاتەش لەئەرکەکانی رابمێنین،، چونکە گەرچی ناسیونالیزم لەهەموو دنیادا هەندێ پرەنسیپ و سەرەتاو ئادگاری هاوبەشی هەیە، بەڵام بەگوێرەی جیاوازی ژینگەی کارکردن و واقیعی نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەك و رەهەندە مێژوویی و ئایینی و کلتوری و سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتیەکەی رەنگی تایبەت بەخۆیەوە دەگرێت، دەشکرێ بڵێین یەکێ لەو لێکچوونانەی تووشی بەشێ لە هەڵگرانی بیرۆکەی ناسیونالیزم بووە لە خۆرهەڵاتداو لەناو کوردیشدا لەبەرچاونەگرتنی جیاوازیەکانی ئەرکەکانی ناسیونالیزم وەك بەرەنجامێ بۆ جیاوازی کایەی کارکردنی.

هەر بۆ نموونە ئێستا گەر سەیری هەندێ لەو ئەرکە مێژووییانە بکەین ناسیونالیزم لەسەدەی نۆزدەی ئەوروپادا جێبەجێ کردوون هەست دەکەین لەواقیعی کوردیدا ئەرکی لەوجۆرە بوونیان نییە، چونکە ئەرکەکانی ئەوێ بە شێکیان پەیوەندی بە پەرەسەندنی سیستمی سەرمایەداری و دیاردەی کۆلۆنیالیزم و ململانێی نێوان کەنیسەو دەوڵەت و ئەو شەپۆلە بێ باوەڕییەی ئەوروپای سەدەی نۆزدەی گرتەوە هەبوو، تەنانەت لەدیاریکردنی توخم و رەگەزەکانی نەتەوایەتیدا دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوو بێت کەتیۆرەکانی لەوبوارەدا بەشێ بوون لە چەکی ململانێ و ناکۆکی نێوان نەتەوەو دەوڵەتانی ئەوکاتەو هەروا لەهەلو مەرجێکی بان مێژووییەوە نەهاتوون و کۆمەڵێ چەمك و ئەحکامی تەجریدی نین، بەڵکو بەشێکی

رەنگدانەوەی ئەوململانێ نەتەوەیی و سیاسییە بووە کە ئەو کاتە شێوەی پەیوەندی نێوان دەوڵەتانی لە ئەورووپادا دەستنیشان کردووە.

بۆ نموونە گەر سەیری تیۆری فەرەنسی و ئەلمانی بکەین لەدیاریکردن و جەختکردنەسەر رەگەزەکانی نەتەوایەتی و ئەو توخمانەی پێویستن بۆ گروپێك پێیان بوترێ نەتەوە. هەست دەکەین بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانی هەر یەکێکیان بۆ مانەوەی هەریمێکی دیاریکراو یاخود لێکردنەوەی ئەو هەرێمە لەدیاریکردنی توخمەکاندا بەهێزەوە ئامادەیە ململانێی مێژوویی هەردوو دەوڵەت لەسەر هەردوو هەرێمی ئەلزاس و لورین شوێنەواری روونی بەسەر ئاراسەی بیرکردنەوەی بیرمەندانی هەردوولاوە داناوە.

تیۆری ئەلمانی بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە یەکیەتی زمان و رەچەڵەکی هاوبەش دوو هۆکاری بنەرەتی بوونی نەتەوەن، لەپاڵ یەکیەتی تاکەکانی لەنێوان خۆیاندا ئەمەش لەسەرئەو بناغەی کە دانیشتووانی ئەلزاس و لۆرین بەزمانی ئەلمانی قسە دەکەن، بەمجۆرەش کەواتە ئینتیمایان بۆ نەتەوەی ئەڵمانی هەیەو دەبێت بگەرێنەوە سەر ئەڵمانیا.

بەڵام تیۆری فەرەنسی پێی وایە هۆکاری یەکلاکەرەوە لەپێکهاتنی نەتەوەدا بریتییە لە ویستی بەیەکەوە ژیان Vauloitvivtecollectif هەر بۆیەش ناونراوە تیۆری ویست و ئیرادە).[1]

---

[1] الدكتور عبدالغني بسيوني عبدالله/ النظم السياسية اسس التنظيم السياسي الدولة ـ الحكومة ـ الحقوق والحريات العامة/ بيروت / ١٩٨٤ ص٢٤.

هەر لەم رووەشەوەیە قسەیەکی د. ئەمیری حەسەن پور تیدەگەین کەدەڵێ: سەرباقی ئەمەی دنیای ئەکادیمی بەشانازیەوە ئیدیعای بێ لایەنی دەکات بەتایبەتی زانستە کۆمەڵایەتیەکان قەت بێ لایەن نەبوون).[1]

بەڵام بەداخەوە زۆرجار لەکوردستاندا شایەدی حاڵەتێکین کەپێی دەوترێت گوێزانەوەی ئالی چەمك و تیۆرو ئایدیۆلۆژیاکان ئەگەر وانە بوایە نەدەبوو کورد تێگەیشنە ستالینییەکە بۆنەتەوە بۆماوەیەکی زۆر بکاتە سەرچاوەیەك خۆ خۆپێناسکردن وەك نەتەوە.

چونکە سەرەڕای بەخولگەیی کردنی گەشەسەندنی بازاڕی هاوبەش و فاکتەری ئابوری لەدروستبوونی نەتەوەدا دیدی ستالینیزم بۆنەتەوە بەهۆی پاشخانە فکرییە ماتریالیزمەکەو جیهانبینی مارکسیزم بەڵگە نەویستە کە ئایین ناکاتە رەگەزی نەتەوە، لەبەرئەوەی سەرەنجام شوناسدان بەنەتەوە بەشێك دەبێت لەستراتیژیەتی خوێندنەوەی هەمەلایەنی ئایدیۆلۆژیا مارکسیستیەکە بۆژیان وبوون و دیاردە مرۆییەکان، هەڵبەتە لەناو ئەو تێزانەی باس لە رەگەزەکانی پێکهێنانی نەتەوە دەکەن هەندێکیان جەخت لەسەر ئایینی هاوبەش دەکەنەوە وەك هۆکارێ بۆ بەنەتەوە بوون ئاگایان و خاون بیرەکان لەدەمێکەوە وتوویانە بوونی یەك ئایینی هاوبەش لەوڵاتێکدا دەتوانێ سەرچاوەیەکی بەهێزو بەگوڕمی ناسیونالیزم بێت.

هەروەها لەگەڵ ئەوەی بەشێ لەبەر رۆشنایی ئەم تەوژمە جەخت دەکەنەوە لەسەر رۆڵی بنەڕەتی و چارەنووسسازی ئایین لە بنیاتنانی ژیارو کلتورو ناسنامەی

---

[1] د. ئەمیری حەسەن پور/ بەرەو تێگەیشتن و بەریەرەکانی کردنی ئەنفال/ گۆڤاری ئەنفال/ ژمارە (١) ٢٠٠٠ ل١٥.

نەتەوەییدا ئەوەی کەلەئایینی زەردەشتیدا دەیبینین بەجۆرێ دەیکەنە تاکە سەرچاوەو فۆرمێ نەتەوە بتوانێ لەناو ئەودا بوون و رۆحی خۆی بسەلمێنی و گەشەی سروشتی بکات، کەچی ئامادە نین لە مامەڵە کردن لەگەڵ تیۆرەکاندا جەخت لەو تیۆرانە بکەنەوە کە ئایین دەکات بەتوخمێکی ناسیونالیزم یاخود خۆیان لەبەر رۆشنایی ئەو راستییەی کە زۆربەی هەرە زۆری ئەم گەلە مسوڵمانە ، بەڵکو ئەو زۆرینەیە پەیڕەوی یەك مەزهەبی فیقهیش دەکات کە شافعییەو ئیسلام لەژیانی رۆژانەی خەڵکی و واقیعی کۆمەڵایەتی دا بەشێوەی جۆراوجۆر گوزارشت لەبوون و ئامادەیی خۆی دەداتەوە بتوانن دیدێ دابرێژن ئەو راستییە لەخۆ بگرێت، بەمەش بەشێکی گرنگ و بنچینەیی لەکەسێتی مرۆڤی کورد کەئیسلام پێکی دەهێنێ لە جەنگی خۆسەلماندن و گەیشتن بەئامانجەکانی بزوتنەوی ناسیونالیزمی کوردی فەرامۆش دەکرێ و لەهاوکێشەی ململانێکان و هاوسەنگی هێزەکانداوە دەردەنرێ.

هەروەها ناتوانێ رەوایی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ناو خودی ئایینی نەتەوە بەم جۆرەش لەهەندێ قۆناغدا بزوتنەوە ناسیونالیزمەکە تەنها کار لەسەر وروژاندنی هەستی میللی دەکات و کەمتر دەتوانێ ناوەرۆکە کۆمەڵایەتی و ناسنامە فکرییەکەی خۆی لە ئاستی بنکە جەماوەریەکەدا بخاتە رو.[1]

خۆرئاواییەکان لەکاتێ خۆیدا بۆچون و تێڕوانینەکانی خۆیان دەربارەی ناسیۆنالیزم لەبەر رۆشنایی واقیعی خۆیاندا دیاری دەکرد، لێرەشەوە گەر بچینەوە سەر ئەرکەکانی ناسیۆنالیزم لەخۆرئاوای سەدەی نۆزەدەدا، پێویستە بوترێ جگە

[1] هەڵبەتە ئەم دابڕانە لەسیەکانی سەدەی بیستەم بەدواوە دەست پێدەکات.

لەو ئەرکانەی سەرمایەداری و ماشێنە ئابوریەکەی هێنابونییە کایەوە ئەرکێکیتری ناسیونالیزم پڕکردنەوەی جێگای (ئایین) بوو، سەرمایەداری لەرەوتی گەشەکردنی خۆیدا لەگەڵ سنورە هەرێمە دەرەبەگایەتییە زۆرەکان و باجی جۆراوجۆرو بازاڕە بچوکەکان هەڵی نەدەکرد هەربۆیە پێویستی بە یەکیەتیەکەی نەتەوەیی هەبوو تا بازاڕێکی گەورەی ساغ کردنەوەی کاڵاکانی دەستکەوێ کاتێ کاڵا زیادیش دێتە کایەوە واتە قەبارەی وەبەرهێنان و بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەوە گەورەتر دەبێت بازاڕە ناوخۆییەکان توانای لەخۆگرتنی هەبێت، بەرژەوەندی نیشتمانی و نەتەوەیی دەبێتە ئەو چەترەی لەسایەی ئەودا چاو لە دەرەوەی سنورەکان دەبڕێ بۆکۆکردنەوە و کەڵەکردن و بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج، بۆ ئەمەش خاکی وڵاتان و خێر و بێر و سامانی سروشتی و خواپێداوی گەلان دبێت بەو ئامانجانەی هەوڵی دەستبەسەراگرتنی بدرێت لە ناوخۆی وڵاتیش دیسانەوە بەجوڵاندنی هەستی نیشتمانپەروری سەرمایەداری هەوڵی دەدا رێ لەوە بگرێت کاڵا بیانییەکان کێبرکێ لەگەڵ بەرهەم و کاڵانیشتمانی و خۆماڵییەکاندا بکات.

لەوەش گرنگتر ناسیۆنالیزم وەڵامێ بوو بۆ ئەو بۆشاییە فکری و رۆحی و پاشاگەردانییەی مۆدیرنە و رۆشنگەری لە ئەوروپادا دروستی کردبوو، بەجۆرێ خەریك بوو ژیانی بەرەو چەقبەستوویی و وشکهەڵاتنێکی رۆحی و مەعنەوی گەورە دەبرد، مرۆڤی تووشی نامۆیی و غوربەتێکی قوڵ کردبوو، غوربەت و نامۆیی لە خودی خۆی و جیهان و دەوروبەری و بیرکردنەوە.[1]

[1] الدکتور علي محمد تقوی، الاسلام والقومیة ل١٩ ـ ٢٠ هەروەها سەیری سەردەم ژمارە پێنج ل ٦ بکە.

ماتریالیەکانی چاخی ڕۆشنگەری و بەخوداکردنی عەقڵ و لێدانی قورسی مەسحییەت وەکو ئەو ئایین و بیروباوەڕەی بۆچەندین سەدە لەوەو پێش خولگەی کۆبوونەوەو دروستکردنی سۆزو هاودەردی و پەیوەندی خەڵك بوو، بۆشاییەکی گەورەی لەژیانی خەڵکیدا دروستکرد، کە دەشیا لە ڕێی ئەمانەوە مرۆڤ چاڵ و چۆلیەکانی ڕۆحی پڕبکاتەوە یاخود هەست و سۆزی بجولێنێ.

سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە ڕوویەکیەوە بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشایی و ڕەواندنەوەی تەمی ئەو غوربەت و هەست بە تەنیایی و نائومێدیە بوو ناسیونالیزم بووە، ئەو چوارچێوەی کە خەڵك لەدەوری کۆببنەوەو یەکیەتیەکی ناوەکیش بۆکۆمەڵگا دروست بکاتەوەو ژیانی ڕۆحیش تارادەیەك تەڕو پاراو کاتەوە بەخۆڕاییش نییە سروت و ڕێ و ڕەسم و دروشم و بنەماکانی ناسیونالیزم ڕەهەندێکی عاتیفی و ڕۆحیان وەرگرت و لەشێوەی نیمچە ئایینێکداوە دەرکەوتن.

کەواتە لە ئەوروپادا شەڕی ناسیونالیزم شەڕی ئایین نەبوو، وەك لەلای خۆمان و هەندێ لە ڕۆشنیرانی سەر بە تەوژمی ناسیونالیزمی کلاسیکی کوردی دەیانەوێت ئەو شەڕە بەناسیونالیزمی کوردی بکەن. واتە شەڕی ناسیونالیزم بەئاقارێکیدا بکەن بەشەڕ لەگەڵ ئیسلام. ئەمە تێنەگەیشتنە لە ئەرکەکانی ناسیونالیزم لەخۆرئاوا و چۆنییەتی سەرهەڵدانی.

گەر سەرەتای ڕاستەقینەی ناسیونالیزم بگەڕێتەوە بۆچاخی هەژدەی زاینیی ئەوا بەجوانی دەردەکەوێت شەڕ لەگەڵ ئایین کە لە خۆرئاوادا لە دەزگای کڵێسادا بەرجەستە دەبوو لەبنەرەتدا بەناوی ناسیونالیزمەوە نەکراوە، گەرچی ئەو شەڕانە

دەوریان هەبوو لەخۆشکردنی زەمینەو دۆخێکی لەبار بۆ سەر هەڵدانی ناسیونالیزم، شەڕ لەگەڵ ئاین بەناوی رۆشنگەری عەقڵگەراییەوە کرا، تەنانەت زۆربەی فەیلەسوف و رۆشنگەرەکانی چاخی رۆشنگەری کە هێزی راستەقینەو سەرەکی شەرکەربوون لەگەڵ کلێسادا و لایەنگرێکی سەرسەختی عەقڵانییەت و دابڕینی ئاین بوون لەکایە زیندوەکانی ژیان شەرمیان لێ دەهات بەناوی نەتەوەو نەتەوایەتییەوە بدوێن ، بەڵکو خۆیان بەخاون فکرو ژیارو رۆشنبیریەکی کۆسمۆپۆلۆتی (گەردوونی) دەزانی کاتێ دوای شۆڕشی فەرەنسی ناسیونالیزم وەك بیروباوەڕێکی سیاسی دەردەکەوێ و بڵاودەبێتەوە گەر مۆدێرنە دابڕانێکی توندتربووبێت لەگەڵ رابردوودا ئەوا ناسیونالیزم بەجۆرێ لەجۆرەکان گەڕانەوە بوو بۆ رابردوو ئەگەر مۆدێرنەو بزوتنەوەی رۆشنگەری بانگەشەی بەعەقڵانی کردنی سەرجەم کایەکانی ژیانی دەکردو تەنانەت هەندێ لە بیرمەندانی گاڵتەیان بەسۆزو گیانی شیعری و خەیاڵی تەرپڕ دەکردو بەرەمزی دواکەوتوویی و ناشارستانی بوونیان دادەنا ئەوا ناسیونالیزم کەتێکەڵ دەبێت بەبزوتنەوەی رۆمانسیزم کودەتایەك بوو بەسەر ئەو عەقڵانییەتە وشکەداو هاوارێ بوو بۆگەڕانەوە بۆباوەشی سروشت و متوربەکردنی عەقڵانییەت بە مەعنەویەت و ئیعتیبارو سەنگ گێرانەوە بۆ سۆزو هەست و نەست و رووەمەعنەویەکەی ژیان و مرۆڤ و خەیاڵەداهێنەرەکەی.

ئەگەر مۆدێرنە بەرەخنەگرتن لەئاین و بەلەرزە خستنی پایەکانی مەسیحیەت لەژیانی خەڵکا بۆشاییەکی عەقیدەیی و رۆحی هێنایە کایەوە ئەوا ناسیۆنالیزم لەرەهەندێکیدا چارەسەرێ بوو بۆ ئەو قەیرانەی لەوبۆشایەوە دروستبووبوو، گەر عەقڵانییەت پرسی یەکەمی شەرکردن بووبێت لەگەڵ ئاین ناسیونالیزم لەچەندین

شوێندا ئایین دەکات بە توخمێکی بەهێزی خۆی بۆ نموونە ناکرێ ناسیونالیزمی ئەمریکایی لە ئایینزای پرۆتستانت دابڕین گەر مۆدێرنە پایەکانی ئیمراتۆریەتەکان بەرەو هەڵتەکان و روخان دەبان ناسیونالیزم دەبێتە ئەو فۆرمەی جارێکی‌تر و بەشێوەیەکی‌تر کۆمەڵگەی سیاسی رێکدەخاتەوە و شێوازێکی نوێ لە ممارەسەکردنی دەسەلاتی سیاسی و پەیوەندی نێودەوڵەتی لەگەڵ خۆیدا دەهێنی هەروەك وتمان راستە شەڕی مۆدێرنە لەبەرگە عەقلانییەتە توندڕەوەکەیداوە لە دۆزینەوە زانستییەکانیدا رێخۆشکەربوون بۆ دەرکەوتنی ناسیونالیزم لەپاڵ بزوتنەوەی ریفۆرمی ئایینی و دۆزینەوەی چاپ بووە هۆی برەودان بە بەکارهێنانی زمانە نەتەوەیەکان و بوژانەوەیان.

رونیشە زمان لەگرنگترین پایەکانی ناسیونالیزمە هەروەها شەڕ لەگەڵ کلێسادا دەسەلاتە ناوەندییە دامەزراوەییەکەی کلێسای لاواز کردبوو کەبوونی ئەو دەسەلاتە هەرەمییە ئایینییە نانەتەوەییە لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەییدا نەدەگونجا، بەلام سەرەڕای هەموو ئەمانە ناسیونالیزم بەئاماژە سیوسیولۆژی و زانستییەکانییەوە گەر لەروویەکەوە بەرەنجامی شەڕی نێوان ئایین و زانست و عەقڵ بووبێت لەروویەکی‌ترەوە کاردانەوە و رەخنەگرتن بوو لەو بارە نوێیەی زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ ململانێی ئایینی زەمەنی لەئەوروپادا دروستی کردبوو، هەموو ئەم قسانەمان بۆ ئەوەیە زیاتر ئەوە بخەینە روو کە تەمەنی ناسیونالیزم زۆر نییەو دەبێت لەناو مۆدیرنەی ئەوروپادا بۆی بگەڕێین و لەوێشەوە بەجیهاندا بلاودەبێتەوە و دەبێ بەو پرەنسیپ و رێبازەی هەموو جیهان بخاتە ژێر سێبەری خۆیەوەو سەرجەم سیستمی نێودەوڵەتی بەڕەنگی خۆی رەنگ بکات.

دەرکەوتنی ناسیۆنالیزم لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی و زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی ئیسلامیدا دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم، بۆ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی ناسیونالیزم بیروباوەڕێك نەبوو دەرەنجامی گەشەو رەوتی بەرەو پێشچوونی کۆمەڵگاو جێگۆڕکێی هێزە کۆمەڵایەتیەکان و بڕینی قۆناغەکان نەبوو، بەڵکو ئایدیایەك بوو لە خۆرئاواوە گەیشتبووە ئێرە، لەکاتێکدا بەهاکانی ناسیونالیزم بۆ خەڵکانی ئەمریکاو ئەورپای خۆرئاوا بەهای خولگەیی بوون زۆربەی هەر زۆری ئێرانییەکان شتێکیان دەربارەی ناسیونالیزم نەدەزانی تەنها لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بوو هەندێ لەئێرانییەکان ئاگاییەکی ناسیونالیستان هەبوو وەك هاوچەرخە فەرەنسیەکانی خۆیان هەستی ناسیونالیستیان بەرامبەر وڵاتەکەیان هەبوو، لەگەڵ بوونی دەسەڵاتێکی حکومەتی مەرکەزیی بەهێزو کۆتاییهێنان بەرژێمی فیودالی و گەندەڵی حکومەت و دژایەتی کردنی دەستەکانی بێگانە بوون کەدەیانویست دەست بخەنە ناو کاروباری ئێران و خێروبێرەکەی بەتالان بەرن.[١]

ئەوانەی بۆ یەکەم جاریش کەوتنە باسکردنی ناسیونالیزم لەناو تورك و عەرەبەکاندا زۆربەیان لەکەمینە ئایینییەکانی ناو ئەم نەتەوانە بوون، بەڵکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە یەکەم کتێب کە لە سەر ناسیونالیزمی تورکی نوسرابێت جولەکەیەکی ئینگلیزی بەناوی (لێکۆڵینەوە رێخۆشکەرەکان) لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا نوسیویەتی.. (ئارسەر لوملی دافید)ی نوسەری کتێبەکە لەم

---

[١] ریچارد حاتم، ناسوناليسم در ايران/ ل٣٥.

لێکۆڵینەوەیدا هەوڵی دابوو بیسەلمێنێ کە رەگەزی تورکی سەربەخۆیەو رێزیشی هەیە بەسەر عەرەب و گەلانیتری رۆژهەلاتدا.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزەدەدا فوئاد پاشاو جەودەت پاشا زۆربەی نوسینەکانی (دافید)یان وەرگێڕایە سەرزمانی تورکی ساڵی (١٨٦٩)یش نوسەرێ بەناوی (عیساوی) نامیلکەیەکی بەزمانی تورکی بڵاوکردەوە کە لە دنراوەکانی (دافید) وەرگیرابوو، قسەکردن لەم نامیلکەیە هەمووی دەرژایە خانەی باس کردن لە مەزنێتی و پلەوپایەی رەگەزی تورکی لەمێژوودا، ئەم نامیلکەیە سەرەتایەك بوو بۆ هەموو ئەو نوسینانەی دوای خۆی دەربارەی ناسیونالیزمی تورکی نوسراون، تا سەرەنجام نوسینەکان بوونە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ بزوتنەوەی سیاسی لەوێنەی لاوانی تورك و ئیتیحادیەکان، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا تەنانەت لەسەرەتای ئەم سەدەیەشدا عەرەبەکان زۆربەی هەرە زۆریان بەهۆی ئایینی هاوبەشەوە لایان کەمی نەبووە خۆیان بەبەشێ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بزانن، تورکەکانیش جگە لەو کەمینە شۆڤێنییە تازە پەیدابووە شانازیان بەعەرەبەکانەوە دەکردو زمانی عەرەبیان بەرەمزی پێشکەوتن دەزانی.[1]

هەر ئەوەندەی لەساڵی(١٩٠٨)یش ئیتیحادیەکان لە ئەستانە کودەتایان بەسەر سوڵتان (عبدالحمید)دا کرد و جڵەوی دەسەلاتیان گرتە دەست بەکردەوە لەناوەوە کۆتاییان بەدەوڵەتی عوسمانی هێنا و کەوتنە هێرشکردنە سەر پەیوەندیی عوسمانێتی و سیاسەتێکی ناسیونالیستانەی تورکانەیان دژ بە نەتەوەکانیتری ناو

[1] دکتور علی محمد تقوی ، الاسلام والقومیه ص٣٧ — ٣٨.

ئیمپراتۆریەت لەوانەش عەرەب و کورد پەیڕەو کرد، کۆڕ و کۆمەڵە ڕۆشنبیریەکانیان داخستن، وردە وردە سیاسەتی بەتورککردن سیما دزێوکانی خۆی بۆ دەوروبەرەکەی دەردەخستن.

ئەوەتا کاتێ ئەفسەرێکی عەرەب بەرامبەر وتارێکی مامۆستای کۆلیژی ئەفسەری کە باس لە مەزنی نەژادی تورکی و تورکبوونی جەنگەکان دەکات وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: (هەموو عوسمانییەکان تورک نین ئەگەر ئیمپراتۆری بەم شێوەیە تێبگەین هەموو ئەوانەی تورک نین لەباتی ئەوەی بەشێك لە پێکهاتەی سیاسی زیندووی ئیپمراتۆری عوسمانی پێك بهێنن بەبێگانە دەژمێردرێن.

بەڵام مامۆستا تورکپەرستە تۆرانییە عەلمانییە توندڕەوەکە بەتوند وەڵامی ئەفسەرە عەرەبەکە دەداتەوە و دەڵێ (بزانن واقیع لەگەڵ هەستی جوان جودایە و دروست نییە یەکێ لەباتی ئەوی دیکە بژمێردرێ مەگەر ئێوە و نەژادەکەتان رەعیەتی تورکان نین؟ مەگەر تورکان بەشمشێر وڵاتی ئێوەیان نەگرتووە عوسمانیگەری کە هێمای بۆدەکەی حیلەیەکی سیاسییەو ئێوە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانتان سوودی لێ وەردەگرن هەرچی(ئایین)یشە هیچ پەیوەندییەکی بەسیاسەتەوە نییە، ئێمە بەزوویی هێندەی پێناچێت بەنێوی تورکیا و ئاڵای تورکیاوە دەچینە نێوشەڕەوە.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئایین کە مەسەلەیەکی ویژدانی تاکە کەسییەو بەهەرحاڵ مەسەلەیەکی سەرەکی نییە.ئێوە و هاوولاتیەکانتان دەبێ لەمە تێبگەن، ئێوە تورکن و خەیاڵی وەك (میللەتی عەرەب) لەگۆڕێدا نییە.[1]

کاتێ پرسیاری تورك بون بەم توندییە دەوروژێ ئەوکاتە پرسیاری عەرەب بون و کوردبوون و نەتەوە ناتورکەکانی‌تریش دەبێتە کاردانەوەیەکی سروشتی، ئەوەی نەتەوەکانی لەسایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا کۆکردبۆوە ئیسلام و عوسمانیگەری بوو نەك تورکێتی کاتێ ئەم دوو بناغە دەبن بەپرسی لاوەکی گومانی تیانییە ئەو ئیمپراتۆریەتە دەبێت هەرەسبێنێ و ببێ بە بەشێ لەمێژوو.

کە تورکە تۆرانییەکان مێژووی نەتەوەیی دێننە گۆڕێ نەتەوەکانی‌تریش دەست دەکەن بەنوسینەوەی مێژوویی نەتەوەییان و بەدوای رەگەزو نەژادو رەچەڵەکی خۆیان دەکەون، ئەم واقیع و هەستەش کە دێتە ئاراوە بەروونی لەو پێشەکی‌یەدا دەردەکەوێت کە مامۆستا ئەمین زەکی بەگ بۆ (خلاصە تاریخ الکورد وکوردستان)ـەکەی نوسیویەتی: (کاتێ وشەی (عوسمانی)ی گشتی لە تورکیادا بوونی نەما، وشەکانی تورکی و تۆرانی شوێنیان گرتەوە منیش وەك تاکەکانی سەرجەم رەگەزەکانی‌تر جگە لەتورك هەستێکی بەهێزم لەو روەوە بۆ دروستبو کە من نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیاوازم لە تورك، ئەمەش هەڵینام بۆدەرخستنی هەستێکی نەتەوەیی خرۆشاو و ئیحساسێکی نیشتمانی بەهێز من زووتر بەبیرمدا

---

[1] زارە ڤاند، سەرچاوەی پێشوو،ل٥٢.

نەهاتبوو عەودالّی دوای مێژووی نەتەوەیی کوردی و بنەچە و رەچەڵەکی خۆم بم، چونکە (عوسمانییەت) هەموو رەگەز و نەتەوایەتییەکانی دەگرتەوە.[١]

لەبەرئەوە ئەگەر ئەمە مێژوی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم بێت ناکرێ لەسەردەمی پێش ئەم مێژووەدا باس لەپاشکۆیەتی فکری و سیاسی و کێشەی نەتەوەیی بکرێت، لەفەزایەکدا کەناسیونالیزم دروستی نەکردووەو پێناسەی شتەکانی نەکردووەو ناوی لێنەناون، ئەمە وەکو ئەوە وایە لەچاخەکانی ناوەراستدا باسی بۆرژوازی و پرۆلیتاریا بکەیت، ناسیونالیزم تەنها ناولێنان نییە بۆشتێکی ئامادە ناسیونالیزمی سیاسی و بەوئامازە هاوچەرخانەی هەڵیگرتووە بوونێ نییە دۆزرابێتەوە، بەڵکو دروستکراوە، یاسای "کێشندەی زەوی" کە لە لایەن (نیوتن)ەوە دۆزرایەوە یاسایەکە هەر لەوکاتەوەی گەردوون بەم جۆرە هەیە ئەویش هەبووەو بەشێك بووە لەرێکخستنە گەردوونییەکە (نیوتن) تەنها پەردەی لەسەر بون و جۆری ئیشکردن و رۆڵی لەگەردووندا هەڵداوەتەوە، بەڵام دۆزینەوەی (ماشێن) وانییە گەرچی سەرجەم کەرەسە پێکهێنەرەکانی ماشێن لەزەویدا وەك (توخم) وکانزا هەبووبن، بەڵام شتێ نەبووە بەناوی (ماشێن) ماشێن تەنها لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا دروست دەکرێ، ناسیونالیزمیش گەرچی وەك کەرەستەی خاو لە مێژوودا لەسەر ئاستی کلتورێکی سروشتی هەیە، بەڵام ئەوەی لە سەدەی هەژدەوە جیهان بەناوی ناسیونالیزم و دەوڵەتی نەتەوەوە ناسی، شتێکیتر و دورستکراوە، هۆشیاربونی گروپێکی بەشەری بە جیاوازییەکانی لەسەر بناغەی نەتەوە بوون داهێنراوێکی

---

[١] محمد امین زکی، المصدر السابق، مقدمه/ح..

خۆرئاواییە هەر وەك چۆن بیرۆکەی دەوڵەت لەشێوە مۆدێرنەکەیدا وەك فۆرمیٚ بۆ ڕێکخستنی ژیانی سیاسی داهێنراوێکی تازە و بەرهەمی فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنەیە.

پرۆسەی خۆ بەراوردکردنی کورد لە گەڵ عوسمانی بوندا لەحاڵەت بوونی شتێکی لەوجۆرەدا هەستی ناسیونالیزم و جیاوازبوونی لادروست ناکات.

هۆشیاری خەڵکیش بەرامبەر بەخاك پەیوەست بووە بەئیسلامی بوونەوە، خاك سەرزەمینی ئاین و کلتورێکی بان نەتەوەیی بووە لەگەڵ بونی کلتورە لۆکاڵییە سروشتییەکە ئەوکاتە پۆلێنکردنەکان لەسەر ئاستی ئاین و شارستانییەتەکان بووە، ئەو ئەحکام و یاسایانەی پەیوەندییەکانی خەڵکیشی لەسەر بنیاتنراوە ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعە بووە لەبەر ئەوە لەمێژوودا ئێمە لەگەڵ (دارالاسلام) و (دارالکفر) بەرەو ڕوو دەبینەوە، ئەوهێرشانەی لە دەرەوەش کراونەتە سەر قەڵەمڕەوی جیهانی ئیسلامی بە پلەی یەکەم ئایینی و مۆرکی ئایینیان پێوەبووە کە بەناوبانگترینیان جەنگی خاچپەرستەکان بووە.. کاتیٚ مەغۆلەکانیش شاڵاوە دژی شارستایەتی‌یەکەیان دەکەنە سەر وڵاتی ئیسلامی مۆرکی داگیرکردنی فدراسیونی خێڵەکی پێوە دیارە.. لەکاتێکدا شاڵاوی داگیرکاری نوێی خۆرئاوا و کۆلۆنیالیزم گەر ئایینیش وەك پاڵنەرێکی ناوەکی دەوری تیاهەبوو بێت بەناوی ئایینەوە نەبووە، بەڵکو شاڵاوی نەتەوەگەلێك و قەوارەیەکی جوگرافی دیاریکراوە بووە، هەرئەمەشە کار دەکاتە سەر ئاراستەی ئەو خەباتەی دژی کۆلۆنیالیزم دەخرێتە ڕیٚ لەوسۆنگەوە کە هێزە کۆلۆنیالیستەکان جۆراوجۆر بون و جیهانی ئیسلامیشیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردوەو هەریەکەشیان سیاسەتی تایبەت بەخۆی هەبووە دەرهەق بە

دانیشتوانی ناوچە کۆلۆنی کراوەکان، لەبەرئەوە دەبینین ئەم واقیعە مۆرکی خۆی بەسەر سروشتی ئەو بەربەرەکانییەوە دادەنێ کە دژبەبوونی کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایی لە وڵاتانی خۆرهەڵات و ئیسلامیدا بەڕێوە دەچێت، جۆراوجۆری هێزە کۆلۆنیالیەکان و دابەشکردنی وڵاتانی ئیسلامی لەپاڵ نەبوونی یاداوەریەکی ئومێدبەخش لەدوارۆژەکانی ئەو یەکیەتیە سیاسییە ئیسلامییەی لەقەوارەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا خۆی دەنواند، بەحوکمی ئەوەی تورکەکان کە ڕێبەرایەتی ئیمپراتۆریەتەکەیان بەدەستەوە بوو بەشێکیان بوونە ئاڵاهەڵگری ناسیونالیزمێکی داخراوو توندڕەوو دەستیان دایە دژایەتی کردنی ناسنامەی نەتەوەیی نەتەوە غەیرە تورکەکان و چەوساندنەوەیان هەموو ئەمانەو سەرهەڵدانی نوخبەیەکی نوێ لەم وڵاتانە دا کەلەسایەی ئەو واقیعە فکری و ژیاری و سیاسییەدا پێدەگەیشت ئیستعمار بەدیهێنابوو یاخود بە ئاگایی پەیداکردن بەسەر ژیاری تازەی خۆرئاوادا کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەوو بوو بووە پردێ بۆ گێڕانەوەی ئەوچەمك و ڕێبازو فکرو رۆشنبیرییەی کە مۆدێرنەی ئەورپا بەرهەمی هێنابوو .

ئەو ڕێخۆشکەریە مژدەبەخشانەی کۆلۆنیالیزم و پەیامهێنەرەکانی بڵاوبونەوەی ناسیونالیزم و بیرۆکەی نیشتمانپەروەری بەرتەسکیان کردبوو بە ئامراز بەمەبەستی لێکترازاندنی ریزی یەکگرتووی گەلانی رۆژهەڵات لەدژایەتی شاڵاوی دەستدرێژی و فراوانخوازی خۆرئاوا بۆسەر خۆرهەڵات دەرفەتیان لە بەردەم هەر تێکۆشان و بەرەڤانییەکی سەراسەریدا تەنیبوو، بەڵام سەرەڕای ئەمە زۆربەی هەرە زۆری بزوتنەوە کانی بەرەنگاری دژی کۆلۆنیالیزم ـ گەر نەڵێین هەموویان بەگیانێکی تێکەڵاوی ئیسلامی و میللیەوە ئەنجامدەدراو رۆحی ئیسلام ماتۆرو بزوێنەری

زۆربەی راپەڕین و بزوتنەوەکانی بەرهەڵستی بوو، هەروەك (العروی)یش ئاماژەی پێکردووە لەسەدەی نۆزدەدا جیهادو نیشتمانپەروەرێتی تێکەڵاو بەیەك بوبوون و یەك مانایان دەدا هێشتا ناسیۆنالیزم لەبازنەی نوخبەیەکی سنورداردا دەرنەچووبوو ئاپۆرەی گشتی خەڵك بەپلەی یەکەم لەژێر کارتێکردنی باوەڕی ئیسلامیدا بوون، تەنانەت بزوتنەوە بەرهەڵستییەکەی کەمال ئەتاتورکیش لەوەی پێی دەڵێن جەنگی رزگاری بۆ وەرگەڕخستنی وزەی جەماوەر و جۆشدانیان خۆی لەبەرگێکی ئایینی میللیدا دەخستە روو، مستەفا کەمال زۆرجار جل و بەرگی زانایانی ئایینی دەپۆشی و بەوجۆرە لە کۆڕ و کۆبوونەوە جەماوەریەکاندا بەشداردەبوو، جەنگی دژی داگیرکەرانی بێگانەی بە (جیهاد) دژی (کافران) و دوژمنی مسوڵمانان ناودەبرد، ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆرۆژگارێ کە ئیسلام وزەی بنچینەیی هەر بەرهەڵستی و رەتدانەوەیەك بووە.

ونبوونی تایبەتمەندی و سروشتی زەمەنی مێژوویی پێش مۆدێرنە لەبەرچاوی ناوەندە رۆشنرییە کلاسیکییەکەو ژمارەیەکی بەرچاو لەرۆشنبیران و نوخبە نوێیەکە لەکوردستاندا بەرەنجامی نێگەتیڤی لێکەوتۆتەوەو بووە بە هۆی ئەوەی زۆرجار دیاردەو شتەکان بەناوی خۆیانەوە ناونەرێن و تەنانەت بەناوی نەتەوایەتی‌یەوە دژایەتی مێژووی کورد بکرێت و بەخود نامۆیی و غوربەتی کوردیش لەرووی سایکۆلۆژییەوە قوڵتربێتەوە، تەنانەت بەدرێژکردنەوەی ئەو زەمەنەی شکستەکانی کورد لە خۆدەگرێت لەمێژوودا رەگی نائومێدی لەقووڵایی ناخ و کۆنەستی کوردیدا بنج داکوتراوتر کراوە بەمجۆرەش دەتوانیت بڵێین کەلەگەڵ هەموو ئەوهەوارو زەنایەی بەناوی ناسیونالیزمەوە لەدەیان ساڵی رابردوودا لەکوردستاندا کراوە یەکێ

لەهەرە گرفتە سەرەکیەکانی ناوەندە رۆشنبیری و سیاسییەکە نەبوونی دیدێکی ناسیونالیستی پێگەیشتوو بووە بۆ مێژوو ئەو رۆشنبیریەی لەدیارنەبوونی ئەم دیدەشدا بەرهەم هاتووەو بەناوی پیرۆزییەکانی نەتەوەوە دەرخواردی زیاتر لە نەوەیەکی کورد دراوە، تا ئەندازەیەکی دیار رۆشنبیریەکی ساختەی دەربارەی بەشێ لەمێژوو بۆکەسێتییە کوردیەکە دروست کردووە.

کوردبون و تورك بوون ، یەکسان نین بە ناسیۆنالیزم تەنانەت بوونی هەستێکی بەمانا نەتەوەیی کە بۆنی هەستکردنێکی سەرەتایی بەهاودەدری لێ بێت نابێ بەناسیونالیزم کە پرەنسیپەکە تێروانینی خۆی هەیە بۆگۆران و جێگۆرکێی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و گۆران لە سیستمی پەیوەندیەکان و پێورەکان لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا دەکات بەجێگرەوەی فۆرمەکانی پێش خۆی، سوڵتانەکانی عوسمانی نەگەراونەتەوە بۆ هۆلاکۆو جەنگیزخان و بیانکەن بەرەمزو شانازییان پێوە بکەن بەو جۆرەی دواتر تۆرانییەکان کردیان تاکوردو غەیری کوردیش پرسیاری گەران بەدوای رەمزە تایبتیەکانی خۆی لادروستبێ و مێژووی رابردوو هەڵکۆڵێ بۆدۆزینەوەی رەگ و ریشەیەك بۆخۆی وەك چۆن بینیمان لای مامۆستا ئەمین زەکی ئەم پرسارەو ئەم هەستە دروستبوو.

ناسیۆنالیزمی کوردی گەر خوازیارە گوتاری خۆی لەسەر بناغەیەکی مەعریفی و سیسیۆلۆژی پتەو و راست و دروست دابرێژێ، دەبێت ئازادبێت لەرەخنەگرتن لە ناوەرۆك و میکانیزمەکانی گوتاری لەمەوپێشی خۆی و خوێندنەوەیەکی تازەی دوور لە هەناسەکانی مارکسیزم و هەڵچوون و خوێن گەرمی و کاردانەوەی رۆمانسیانە

مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە بۆپرسیار دروستکردن لەسەر هەندێ دۆگمای ئەم گوتارە، یاخود بڵێین هەندێ لەبەڵگەنەویستەکانی کەلەراستید هەر لە بەراییەوە لاوازی هۆشیاری بەڵگەخوازی و لایەنگیریی ئایدیۆلۆژیانە کردونی بەبەڵگە نەویست بەجۆرێ باوەڕکردن بەم مەسەلە بکرێتە پێوەرێکی کوردایەتی و ئینتیما بۆنەتەوەو دۆزەکەی!. لەودۆگمایانەش گوتاری کوردایەتی باوو ناوەندە رۆشنبیریەکەی بەجۆرێکی یەکلاکەرەوەو مشت و مڕ هەڵنەگر باس لەوە دەکات ناسیونالیزمی فارسی ئایینزای شیعەگەری بەکارهێناوە وەك دۆزینەوەی پانتاییەك لەناو خودی ئیسلامدا بۆ نیشاندانی جیاوازی خۆو پاراستنی ناسنامە ناسیونالیستەکەی لەکاتێکدا ئەم خوێندنەوە بۆ پەیوەندی نێوان شیعەگەری و دەسەڵاتی سەفەویەکان و دواتر قاجاریەکان قسەیتر هەڵدەگرێ و دەکرێت لەچەند روویەکەوە بخرێتە ژێر پرسیار و گومان لێکردنەوە، گومانی یەکەم لەو راستییە سیسیۆلۆژییەوە دێت کە لەپێشەوە باسمان کرد واتە مێژوویی بونی دیاردەی ناسیونالیزم و پێناسکردنی وەك پرەنسیپێکی سیاسی مۆدێرنە، هەر وەك روونە رەگ و ریشەکانی شیعە گەرایی یەکەم جار لەناو هەناوی ململانێکانی سەرەتای ئیسلامەوە سەر دەردێنی کە هێزە بنەڕەتیەکانی مسوڵمانە عەرەبەکان بوون، واتە عەرەب بوونی ریشەی شیعەگەری راستییەکی مێژوویە موعارەزەی سیاسیانەی شیعەگەراییش لە شێوەی دەوڵەتدا لەسەر زەمینێکی یەکجار دوور لە لەوڵاتی فارس واتە (مصر) ی ئێستا بەرپا دەبێ کە فاتمیەکان بوون.

لەروویەکیترەوە دەوڵەتی سەفەویش سنوری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی پەیوەست نەبووە بەچوارچێوەیەکی جوگرافی دیاریکراو بەمانا تازەکەی دەوڵەتی نەتەوەیی،

بەڵکو پابەندی بەهێزی خۆی و لاوازی و بێ توانایی هێزە بەرامبەرەکانی بووە، لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەکانیش چەمکێکی وەکو گەل بەو جۆرەی لەدوای شۆڕشی فەرەنسی و لە فەلسەفەی سیاسی مۆدێرن دەیناسین، بەرچاو ناکەوێ و لەجیاتی ئەو (رەعیەت) هەیە (رەعیەت)یش ئاماژەکانی زیاتر لە دەوری دیاریکردنی پەیوەندی نێوان خەڵك و دەسەڵاتدا دەخولێتەوە، ناسنامەی ناسیونالیستانەی دەسەڵات دیار نییە، چونکە گەر بڕوا بەشتی وا بکەین دەبێت (رەعیەت) و (نەتەوە) بەناوەرۆکە تازەکەیەوە بەیەك بچوێنین ئەمەش کاریکی نازانستیانەیەو مەگەر تەنها سیاسەت و رۆشنبیریەکی سیاسێنراو ئەوجۆرە بەراوردو بەیەك گرتنانە بکات، لەو قۆناغەی مێژوودا ئەوەندەی بوونی حکومەت گرنگ بوە کە واتای رێکخستنی کۆمەڵگاو نەفیکردنی فەوزاو پاشاگەردانی دەگەیەنێ، هێندە دەوڵەت گرنگ نەبووە.

بەدەر لەوە راستییەکیتر هەیە نابێ لێمان بشاردرێتەوە ئەویش ئەوەیە (ئەوەندەی زنجیرە و بنەماڵە تورك زمان و تورك نەژادەکان بەسەر ئێراندا حکومەتیان کردووە زۆر لەو بنەماڵە و زنجیرانە زیاترە کە دەتوانین لەژێر ناونیشانی فارسی زمان و فارسی نەژاد ناویان بێنین).[١]

کەواتە ئایا ئەمە راستتر نییە بڵێین ئایینزای شیعە لەوێوە ئەو دەورە لە سەردەمی سەفەویدا پەیدا دەکات کە دامەزرێنەران و دەسەڵاتداران لەرووی بیروباوەڕەوە ئایینزاوە شیعەن و ئەو سەردەمەش ئایینزای سوڵتان زۆر دەوری بینیوە لەوەی ببێ بەئایینزای رەسمی وزۆربەی دانیشتوان لەسۆنگەی خودی

[١] ریچارد حاتم، سەرچاوەی پێشوو، ل٧ .

مەزهەبییەوە، هەروەها ئەوە راستتر نییە، کە بڵێین ئەوە ئایینزای شیعەیە سوود لە دەسەڵاتی سەفەوی وەردەگرێت وەك لەوەی بڵێین ئەوە ناسیونالیزمی فارسیە ئەو گەمە دەکات و ئەو ئەرکە دەدا بە شیعەگەرایی؟ ئایا لیکدانەوەی مەزهەبی (ئایینزایی) بۆململانێی نێوان سەفەوی و عوسمانی راستر نییە لەلێکدانەوەی ناسیونالیستی؟، چونکە ناکرێ بوونی هۆشیاری ناسیونالیستی لەو قۆناغدا بخەینە پاڵ فارس و نەیخەینە پاڵ تورك گەر بیشیخەینە پاڵ ئەمیش چەندین گیروگرفتی فکری و مەنهەجی مێژوویی دێتە پێشەوە و پرسیاری وەڵامنەدراوەی جۆراوجۆری پەیوەندیدار بەم پرسە خۆیان دەسەپێنن؟.

لێکۆڵینەوە تیۆرییەکان دەربارەی ناسیونالیزم و سووك بوونی قورسایی میردەزمەی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم لەم رووەوە بەسەر هۆش و بیری نەوەی نوێداو بیرکردنەوەیەکی بابەتی و زانستی و دورکەوتنەوە لەهەستی نەفرەتکردن هەقمان پێدەدن و دەشمانخەنە سەر ئەو رایەی چیتر بەبێ دەنگی و رۆحێکی تاساوەوە گوێ بۆ ئەو دەنگە نەگرین کە دەیانساڵە بەئێمە دەڵێ فارس و تورك و عەرەب ئیسلامیان (استغلال) کردوە بۆخۆیان، بەڵام کورد لەبەر توانەوەی لەناو ئیسلامدا (؟!) نەك نەیتوانی ئیسلام(استغلال) بکات بۆخۆی، بەڵکو (ئیسلامی بونە)کەی (ئیستیغلال) کراوەو بەمجۆرەش بۆتە قۆچی قوربانی موسڵمانبوونەکەی و پێکراوی پلەیەکی ناومێژووی ناوچەکە!! هەڵبەت لەمێژوودا ئایین بۆ مەرامی تاکەکەسی ئەم و ئەوو بۆگەیشتن بەپلەو پایەو دەسەڵات و شەرعیەتدان بەهەندێ دەسەڵات و خۆسەپاندن سودی خراپی لێوەرگیراوە، بەڵام لەحزەی سوود وەرگرتن و خراپ بەکارهێنان و (استغلال) کردنی نەتەوە پەرستانەو لەدیدێکی ناسیونالیستیەوەی

ئاین یەکێکە لە لەحزەکانی جیهان و قۆناغێکی مێژووی مرۆڤایەتی کە مۆدێرنە دەوری بنەڕەتی هەیە لە داهێنانی چەمکەکان و دروستکردنی دەزگاکان و پێکهێنانی ئاگایی و هۆشیاری و بەتایبەتیش هۆشیاری و ئاراستەی بیرکردنەوەی نوخبە، بۆیەکاتێ دەسەڵاتێکی ناسیونالیستی کارتی ئاین بەکاردێنی دژی نەیارە سیاسی و فکرییەکانی، ئەوە تاوانی ئاین نییە، بەڵکو تاوانی مۆدێرنەو ئایدۆلۆژیا مۆدێرنەکەیە کە هۆشیارانەو لەدیدی ناسیونالیستانەوە ئاین بۆ کۆمەڵە ئامانجێ لەدەرەوەی ئامانجەکانی ئاین خۆی بەکاردێنێ، ئەم پرۆسەو هەوڵە دەچێتە خانەی تەماشاکردنی ئاین وەك کەرەسەی ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگاو هاوسەنگی هێزەکان بەوجۆرەی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە مۆدێرنە کە دەیخوازن، بەڵکو لە دیوەکەیترییەوە دژایەتیکردنی خودی ئاین و بەسووك سەیرکردنییەتی،، چونکە ئاین لە هەموو رەهەندە عەقیدی و عیبادی و جیهانبینی و ئەخلاقی و رۆحییە قوڵەکانی روون دەکرێتەوەو تەنهاو تەنها وەك ئامرازێکی بەرژەوەندی رووت لەململانێی سیاسیەکاندا سەیری دەکرێت، تاوانباراکردنی ئایینی ئیسلام لەژیانی ئێمەدا بەم تاوانە هێرشکردنە بۆ سەر قوربانی و داماڵینی تاوانە لە گەردنی جەللادو تاوانبارانی راستەقینەو خستنە ئەستۆی قوربانییە، کە لێرەدا ئیسلامە کە ئەم لێکدانەوەش چوونە سەنگەری تاوانباران و پاساو هێنانەوەیە بۆرەفتارە دژی ئینسانییەکانیان.[1]

---

[1] مەلا بەختیار لە چەند کۆڕێك و وتارەکەی گۆڤاری ئەنفال ژمارە (١) یشدا بەشێ لەتاوانی ئەنفالکردنی کورد دەداتە پاڵ ئیسلام.

پشتگوێ خستنی رووە تیۆریەکەی ناسیونالیزم لەناوەندە کوردیەکەداو دابڕینی لە رەگەزە مەعریفیەکانی ئەم ناسیونالیزمە یاخود بڵێین تەژومێکی ئەم ناسیونالیزمە دەگۆڕێ بۆ ئامرازێکی شێوێنەر بۆ مێژوو، تەنانەت لەهەندێ رووەوە ئەوەی دوژمنانی کورد دەیانەوێ ئەمان بەناوی نەتەوەو کێشەکەی و بزوتنەوە ناسیونالیستی و رزگاریخوازەکەیەوە ئەنجامی دەدەن، ئێمە بالەم رووەوە تەنها (صلاح الدین) بەنموونە بێنینەوە. وەك بەهێزترین رەمزی مێژووی کوردی بەدرێژایی مێژووی خۆی و لەسەر ئاستی جیهاندا، ئەم تەوژمە لە ناسیونالیزمی کوردی دەمێکە ئامرازە پروپاگەندەییەکانی خۆی بۆ ناشیرنکردن و تاوانبارکردنی (صلاح‌الدین) لەویژدانی کوردیدا بەکاردەهێنێ و بەبێ لە ئەستۆگرتنی بچوکترین لێپرسراوێتی مێژوویی و نەتەوەیی و تەنانەت ئەخلاقیش هەوڵدات ئەم رەمزە لەمێژووی کورد بکاتە دەرەوە ! !، بەلام گەر تادوێنێ زۆر کەس نەیتوانیبێ لەحەرام و حەلاڵەکانی ئەم تەووژمە قسەبکات، یاخود قسەکردنەکان شەرمکردن و دوودڵیان پێوە دیاربووبێ، ئەوا ئەمڕۆ ئەو قۆناغە بەسەر چووەو کاتی ئەوەهاتووە بوترێ ئەوە (صلاح‌الدین) نییە تاوانبارە، بەڵکو ئەوە ئەو ناوەندەیە کە روپۆشی نەتەوایەتی لەبەر کردووەو کێشەکەی بۆ خزمەتی ئایدیۆلۆژیا بەکاردەهێنێ،ئەو ناوەندە نەك هەر تاوانبارە بەوەی زوڵم لەمێژووی خۆی دەکات و هۆشی نەوەکان سەقەت دەکات، بەڵکو دەریشی دەخات لەرووی مەعریفیەوە چەند هەژار و دواکەوتووە.

زوڵم لەمێژووی خۆی دەکات و دەیشوێنی بەوەی دەڵێ (صلاح‌الدین) هیچی بۆ کورد نەکردووە، لەرووی مەعریفیشەوە هەژارو دواکەوتووە کەداوا دەکات لەرۆژگارێکدا شتێ نییە لەم گەردون و سەرزەمینەدا بەناوی ناسیونالیزمەوە نەبووە،

ئەو ناسیونالیست و نەتەوە پەرست بێت بەو جۆرەی ئێستا ئێمە باسی دەکەین و لێی تێدەگەین.. داواکردن لە (صلاح‌الدین) بۆ ئەوەی ناسیونالیست بێت لەسەردەمی پێش لەدایکبوونی ناسیونالیزمدا داوایەکە نوقمە لە وەهم و نازانستی بوون، ئەوانەی قسەی لەم جۆرە دەکەن یان بێ ئاگان لە مێژووی سەرهەڵدانی ناسیونالیزم و گەشەکردنی مێژووییەکەی یاخود دەزانن وانییە، بەڵام ئەم رەفتارەیە هۆشیارانە ئەنجام دەدەن،، چونکە (صلاح‌الدین) رەمزێکی ئیسلامی کوردییە، کە ئەمەیان لای ئەوان تاوانەکە چەند قات دەکاتەوە.

رەخنەگرتن لە (صلاح‌الدین) لەسەرئەوەی ناسیونالیست نەبوە وەك گاڵتەکردن بەدانیشتوانی (قاهیرە)ی سەدەی (١٢)ەهەمی زاینی وایە کەبۆچی بەوشترو گوێدرێژ هاتوچۆیان کردوەو ئۆتۆمبێلیان بەکارنەهێناوە؟

داواکردنێکی لەوجۆرە لەرووی فەلسەفییەوە بەدیهاتنی مەحاڵە، چونکە ناسیۆنالیزم لەو رۆژگارەدا پرسێکی بیرلێنەکراوەبووە، ئەوە ناسیونالیزمە لەدوای سەرهەڵدانییەوە خوێندنەوەو ئاماژەکانی خۆی دەدا بەرمزەکانی پێش خۆی، کاتێ ناسیونالیزمی کوردی لەبەر پاشخانی فکری و هەژاریی مەعریفی خۆی ناتوانێ (صلاح‌الدین) وەك رەمزێکی خۆی بەکاربێنی و ئاماژەکانی خۆی پێ ببەخشێ و خوێندنەوەیەکی نوێی بۆ بکات، ئەوە تاوانی لاوازی خۆیەتی نەك رەمزەکە، هەڵەکەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ لە روانگەی کێشە هەنووکەییەکان و ململانێی نێوان بزوتنەوەی کوردایەتی و نەیارەکانیدا ئەرك بۆ (صلاح‌الدین) دیاری دەکات و لەسەر ئەو ئەرکانەش لێی دەپرسێتەوە! گەر مەسەلەی ناسیونالیزم و دەوڵەتی

نەتەوەیی لەبواری مشتومڕکردن دەربارەی ئەو قۆناغە لەمێژووی مرۆڤایەتی و ئێمەش چووە دەرەوە، ئەوکاتە (صلاح‌الدین) هاوشانی سوڵتانەکانی سەلجوقی و بووەیهی، سوڵتان بووەو بنەماڵەکەشی بۆ دەیان ساڵ فەرمانڕەوایی بەشێکی فراوان لەجیهانی ئیسلامیان کردووە، وەك سوڵتانێکیش لەگەورەترین دەروازەوە چۆتە ناومێژوو، بەجۆرێ لەسەر ئاستی جیهاندا ببێتە ناسنامە بۆکورد و مێژووی مرۆڤایەتیش بۆهەتاهەتایە نەتوانێ لەبیری کات[1] ئەویش لەبەرئەوەی ئەو رووداوەی (صلاح‌الدین) دەبێ بە خولقێنەری هێندە مەزن و ترسناك و چارەنوسسازدەبێت تەواوی بوونە دەسەلاتیەکانی سەردەمی خۆی لەجیهانی ئیسلامیدا دەخاتە ژێر پرسیارەوەو خۆشی دەبێت بە ناونیشانە گەورەکەی خۆرهەلات و ژیارە ئیسلامییەکەی، رووداوەکەش تەنها خوێن و شمشێرو سەرباز نایخولقێنێ، بەڵکو رووێکی گەورەو پرشنگداری ئەخلاق پێکی دێنێ، ئەو ئەخلاقە لوتکەی (صلاح‌الدین)ی کرد بە کەسێتییەکی وا تەنانەت رێزی بەسەر دوژمنەکانیشیدا بسەپێنێ.[2]

صلاح الدین خاوەنی بەهێزترین حکومەت و دەسەلاتی سەردەمی خۆی بووە گەر ئەم حکومەتە سەرناکێشێ بۆ ئیمپراتۆریەتی وەکو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و وەك ئەو ماوەیەکی درێژ نامێنێتەوە ئەوە بەئاڵ و گۆڕە رۆژهەلاتی و جیهانییەکانی ئەوکاتەو پەیوەندییەکانی هێز دەخوێنرێتەوە، نەك بە ناسنامە ئیسلامیەکەی

---

[1] وەك چۆن ساڵی (٢٠٠٠) لەخۆرئاوا بەکەسایەتی جیهانی ساڵ دیاریکرا.

[2] ئاماژەیە بە لێبوردەیی مەزنی ئەو بەرامبەر دیلە خاچ پەرستەکان و ستایشکردنی دەیان کەسێتی خۆرئاوا بۆ (صلاح الدین)ە لەسەر ئەم هەڵوێستەی.

صلاح‌الدین، چونکە ئیسلام لەرووی مەبدەئیەوە خیارێکی کراوە بووە بۆ هەموو لایەك، بەڵام با بەسەرپێی بەسەر ئەم مەسەلەشدا گوزەر نەکەین و تۆزێ قوڵتر رابمێنین، ئایا ناتوانین بڵێین بەهێزی هێزی رەمزیی (القوه الرمزیه)ی صلاح الدین لەئاستێکدایە کە شوێنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆکورد پڕ بکاتەوە گەر ناسیونالیزمی کوردی وەك ئەوەی پێویستە مامەڵەی لەگەڵ بکردایە یاخود بیکات؟ رەنگە زۆربەی هەرەزۆری گەلانی مسوڵمان و جیهانیش شتێکی وادەربارەی سوڵتان سەلیم و بایەزیدو مەحمودی دووەم و... هتد نەزانن یاخود هەر نەیانناسن، بەڵام چ گەلێ هەیە لەم سەر زەویەدا لانی کەم سەرجەم گەلانی مسوڵمان و گەلانی خۆرئاواش و سەرجەم گەلی خۆشمان، (صلاح‌الدین) نەناسێ و وەك یەکێ لە مەزنترین کەسێتیەکانی مێژووی ئیسلامی مرۆڤایەتی سەیری نەکەن؟

قسەکردن لەسەر ئەوەی کورد لەسایەی ئیسلامدا بێ قەوارەبووە، گەر لەرووی فکرییەوە سەرنجی بدەین خولانەوەیە لە بازنەی بۆشدا و حاڵ لێهاتنێکی ئایدیۆلۆژیانەی بسەر چووە،، چونکە ناوی (کوردستان) لەوساتەدا دەرکەوتووە[1] گەر کورد شێوە قەوارە و دەسەڵات و حکومەتدارێتیەکیشی هەبوو بێت هەردەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە[2] مۆدێرنە و دەوڵەتی مۆدێرن بۆکورد لەرووی نەتەوەییەوە گەڕانەوە بوو بۆ دواوە، چونکە نەك هەر سەردەمی هەرجۆرە قەوارەیەکی خۆبەڕێوەبەر و دەسەڵاتێکی لۆکاڵی کوردی نییە، جگە لە فەترەیەکی زۆر کەمی شێخ محمودو

[1] ناوی کوردستان بۆیە کەم جار لە کتێبی (نزهه القلوب)ی ( حمد لله مستوف )دا ئاماژەی پێکراوە.

[2] لەسایەی ئیمپراتۆریە ئیسلامیەکاندا چەندین دەوڵەتی ناوچەیی کوردی جگە لە دەوڵەتی ئەیوبی لەمێژوودا دەرکەوتوون لەوێنەی دەوڵەتی دۆستەکی کە (١٠٠) ساڵ تەمەنی فەرمانڕەوایی بووە.

کۆماری مەهاباد نەبێت کە لەرووی زەمەنییەوە زۆر شایانی باس نییە، بەڵکو سەردەمی مۆدیرنە سەردەمی یاساغ کردنی زمان و جل و بەرگ و کلتوری نەتەوەیی و، سەدەی راگوێزان و گۆڕینی سیمای دیموگرافی نیشتمانەکەی و سیاسەتی (تەعریب و تەتریك و تەفریس)ە سەبارەت بەکورد سەردەمی بوون بە کەمینەو ، بەڵکو وەك کەمینەش قبوڵنەکردنی و نکوڵی کردن بووە لەبوونی، سەدەی بیستەم کە سەدەی ناسیونالیزمە بۆخۆرهەلآت و کوردیش، بۆ کورد خوێناویترین و ترازیدیترین سەدەیە، سەدەی قەتڵ و عام و ویرانکردنی خاك و قڕکردن و کیمیاباران و جینۆسایدە، کورد لە سایەی مۆدێلێ لە مۆدێرنەو دەسەلآتەکانیدا بێ کەرامەترین مەخلوق بووە، چەوساوەترین و بێبەشترین گەل بووە، ئەوانەی رەگ و ریشەی ئەم بەش مەینەتی و مەرگەسات و کارەساتە نەتەوەیەش دەگێڕنەوە بۆ مێژوویەك کە هەڵگری سروشت و تایبەتمەندیەکی جیایە، بیانەوێ و نەیانەوێ بەرائەتنامە بۆ بەشێ لەتاوانی ئەوخوێنڕێژانە پڕ دەکەنەوە، کە بە هەناسەیەکی فاشیستانەوە دژایەتی کوردیان کردووە بە ستراتیژیەتێکی بنچینەیی دەسەلآتەکەیان.

بەلآم سەیرەکە لەوەدایە کە هەڵوێستی سەلبی بەرامبەر ئیسلام لای هەندێ گەیشتۆتە ئاستێك تەنانەت ئەم ئایینە لێپرسراو دەکات لە رەفتاری کۆمۆنیستێکی عەرەب بەرامبەر بەکورد! ئەمەش گاڵتە جاڕیەك لەلێکدانەوەی مێژوو هێزە بزوێنەرەکانیدا دەخولقێنی، کە بریتییە لەوەی لەرۆژگارێکدا کەباسێ لە ناسیونالیزم نییە پێش ناسیونالیزم رووداوەکان ناسیونالیزمانە لێکبدرێتەوە بۆ تاوانبارکردنی ئیسلام، لە قۆناغێکیشدا کەناسیونالیزمی تێکەڵ بەسۆشیالیزم و ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکانیتر لە پایەختەکانی ناوچەکەدا فەرمانڕەوایە، روداوەکان و رەفتاری

سیاسی دەدرێتە پاڵ ئیسلام دیسانەوە بۆ ناشیرینکردنی، ئەگەر پرسیار لە ئامادەنەبوونی کورد لە مێژووی نەبوونی دەسەلاتێکی ئیمپراتۆریانەی کوردیە لەپێش سەرهەڵدانی ناسیونالیزمەوە ( کورد بەواتای ئەوکاتەو واتە بنەماڵەیەکی کوردی فەرمانڕەوا بێت) ئەوا زۆر زەحمەتە ئەم ئامادەنەبوونە بگێڕێتەوە بۆ پەیوەندی نێوان ئیسلام وکورد، چونکە ئەگەر ئەم تەفسیری بۆحاڵەتە کوردییەکە بکەین ئەی چی لەرەوشی عەرەبەکان بکەین کە لەماوەی نزیکەی (٧٠٠) ساڵدا یان لانی کەم بۆ (٥٠٠) ساڵی رەبەق هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ کوردەکاندا نەبووە، دەتوانین بڵێین هەرلەنیوەی دوەمی چاخی عەباسییەوە توخمە عەرەبیەکانی دەسەلات لاواز بوون و دەسەلاتی فعلی کەوتە دەست تورك و فارس و تەنانەت کوردەکانیش.[1]

عەرەبەکان هەر لەسەدەی شانزەهەمەوە(١٦) بوونە بەشێ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەم حاڵەتەش نزیکەی تاکۆتایی هاتنی تەمەنی ئیمپراتۆریەت بەردەوام بوو.

عەرەبەکان وەکو کورد مەگەر لێرەو لەوێ میرنشینێکیان هەبووبێت، یاخود لێپرسراوی هەندێ ویلایەتەکان عەرەب بووبێت، بەگوێرەی ئەو لۆژیکەش دەکرێ ئەمەش بەوە راڤە بکەین کە ئیسلام کاریگەری خراپی بۆسەر ئیرادە و دەسەلاتی عەرەبەکان و ئامادەییان لەمێژوودا دروست کردووە لەبەر ئەوە پاشەکشەیان کردوە و رۆڵی سروشتی ئەوان گوێزراوەتەوە بۆ عوسمانییەکان و هەندێ هێزیتر؟!

[1] دەولەتی ئەیوبی و دۆستەکی هەر لەو سەروبەندەدا دروست بوون.

تەنانەت گەر بەوردی واقیعی دنیای عەرەبی سەدەی نۆزدەش بخوینینەوە، ناتوانیت بێ پەروا باس لەوە بکەین هۆشیاری و هەستی نەتەوە پەرستانە لای عەرەبکان لەپێش کوردەکانەوە سەری هەڵداوە! (جۆرج تەرابیش)ی سڵ لەوە ناکاتەوە بڵێ وەدەرکەوتنی هۆشیاریی ناسیونالیستی لای عەرەب دوادەکەوێ بۆسەرەتای سەدە بیستەم.[1]

دەبینین لەسەردەمی حوکمی ئیتحیادییەکاندا خاوەنی چەند کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری و نیمچە سیاسی بوون کاتێ ئەمانیش دێنە داخستن رایەڵەکانی پەیوەندی عەرەب بە قەوارەی عوسمانییەوە بەرەو کزی زیاتر دەڕوات، ناسیونالیزمی عەرەبی هەروەکو ناسیونالیزمی کوردی، پەرچەکرداری سیاسەتی ناوەندچێتی عوسمانی و سەر هەڵدانی تۆرانیزم و ناسیونالیزمی تورکە، بەش بەحاڵی خۆشم بەسەیرکردنی مێژوو گومانی جددیم لاپەیدا دەبێ لەوەی هەستی ناسیونالیستی عەرەبی و ئیرادەی دەسەڵاتی لەهی کورد بەهێزتر بووبێت، بۆیە ئەوان دەبن بەخاوەنی قەوارەی خۆیان و کورد بێ قەوارە دەمێنیتەوە یاخود بڵێین پەیوەندی خێڵایەتی لای عەرەبەکان لاوازتربووەو ئەمەش وای کردووە بازنەکانی ئەم دامەزراوە تێکبشکێنن و لەسەر ئاستی نەتەوە بیر بکەنەوە، بەپێچەوانەی کوردەوە لێکدانەوەی ئەو پرسە بەجوگرافیاو ئابوری و دانیشتوان و ستراتیژە نێودەوڵەتیەکە دەکرێت، هەڵکەوتەکەو شوێنی ستراتیژی جیهانی عەرەب و دوری لە تاران و ئەستەنبوڵ و فراوانی روبەری

[1] جۆرج تەرابیشی، زەمەنی عەرەبی و مێژووی جیهان، و: رێبین ئەحمەد هەردی، سەردەم، ژمارە (٥) ت (١٩٩٩)، ل٣٣.

نیشتمانی عەرەبی و زۆری ژمارەی دانیشتوانی و بوونی سەرچاوەی نەوت و کانزای‌تر.

خواستی داگیرکاری خۆرئاوایی (کۆلۆنیالیزم) لەپشت دروستبوونی چەندین دەوڵەتی عەرەبییەوەیە، ئەگەرنا چ شتێ چەندین بنەماڵەو خێڵ لەدنیای عەرەبیدا دەکات بەدەوڵەت؟ بۆیە نەبوونی دەوڵەتی کوردی بەبونی ئیسلام لە ناو کوردا لێکنادرێتەوە،، چونکە لەمێژووداو بەتایبەتیش هەر لەنیوەی دووەمی چاخی عەباسییەوە ئیسلام خیارێکی کراوە بووە بۆ هەموان ئەو (واتە ئیسلام) لەزمان و رەگەزو دەسەڵاتی نەژادێکی دیاریکراوەوە شەرعیەتی وەرنەگرتووە ، بەڵکو دەسەڵاتەکان هەرکەسێ بووبن شەرعیەتیان لەو وەرگرتووە.[1]

لێکۆڵەرێك کاتێ لەمێژوو رادەمێنێ سەیری لەدنیای عەرەبی دێت لەکاتێکدا هەڵکەوتی جوگرافی کوردستان هەر لەسەدەی (١٦)ـەهەمەوە دەورێکی گەورە دەبینێ لەوەی دەسەڵاتێکی بەهێز لەناو کورددا دەرنەکەوێ بەهۆی نزیکی کوردستان لەتاران و ئەستانەوە کەچی جیهانی عەرەبی لە کاتێکدا ئەم گیروگرفتەشی نییە ناتوانێ رەوشی لەکوردستان باشتر بێت، رەنگە بۆ لێکدانەوەی ئامادە نەبوونی ئیمپراتۆریانەی کوردی لەپێش مۆدێرنەشدا[2] لەپاڵ هەڵکەوتەی جوگرافی تارادەیەکی باش تیۆرەکەی (ئیبن خەلدون) سەبارەت بەدەمارگرژی وەك هۆکارێك بۆدروستبوونی دەوڵەت سودمان پێ بگەیەنێ،، چونکە ئەمە وادەکات

---

[1] با ئەو شەرعیەتە هەر بەرواڵەتی و لەرێی زۆر لێکردنیشەوە بووبێت.

[2] ئیمپراتۆریەت یەکی رێکخستنی سیاسی پێش سەرهەڵدانی مۆدیلی (دەوڵەت ـ نەتەوە) بووە.

سەنتەرێکی بەهێز لەکوردستاندا دروست نەبێت تاببێتە خولگەیەکی بەهێز[1] بالێرەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئیسلام و ناسیونالیزم و دەوڵەتی کوردی بگەڕێنەوە سەدەی نۆزدە،، چونکە لەم ساتەوەختە نەبێت باسکردن لەقەوارەی نەتەوەیی کوردی واتایەکی نییە، ئەم چاخەش بۆپرسیارکردن لەخۆنیشتمانکردنی نەتەوەیی درەنگ نییە،، چونکە نەتەوە گەورەکانی وەکو ئەلمانیاو ئیتالیا تەنها لەم چاخەدا دەتوانن یەکبگرن و قەوارەو دەسەڵاتی یەکگرتوی نەتەوایەتی خۆیان پێکەوە بنێن، لەسەدەی نۆزدەدا دەستێوەردانی دەوڵەتە ئەوروپەیکان بۆکاروباری ناوخۆیی ئیمپراتۆیەتی عوسمانی بەتەواوەتی پەرەدەسێنێ.

سەرەتاکانی مۆدیرنەی ئەوروپی دەگاتە ئەوێ و کارو هەنگاوەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا لەسەر شێوەو مۆدیلی خۆرئاوایی دەستپێدەکات، زۆرجار ئەوروپاییەکان راستەوخۆ سەرپەرشتی ئەم ریفۆرمانە دەکەن لەوانەش تازەکردنەوەو دامەزرانەوەی سوپای عوسمانی لە سەر شێوازێکی مۆدێرن بەشێ لەم بزوتنەوە ریفۆرمییەش بواری ئیداری و کارگێری و رێکخستنەوەی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی گرتەوە، چەسپاندنی مەرکەزیەتی کارگێری و بەستنەوەی یەکە

[1] بۆ تیۆرەکەی ئیبن خەلدون بگەڕێوە بۆ (المقدمه/ ابن خلدون) و فکر ابن خلدون، العصبية والدولة د. محمد عالد الجابري، في تطور الفكر السياسي القديم من صولون الى ابن خلدون، الدكتور مصطفى النشار.

هەڵبەتە کورد ئەو دەمارگرژییە ئایینەشی تیا پەیدا نەبووە کە تیۆرە خەلدونیەکە باسی دەکات. لەو قۆناغەدا دەسەڵاتەکان بەشێکی زۆری شەرعیەتی خۆیان لە غەزاو بەرەنگاری دوژمنی دەرەکی وەرگرتوە، عوسمانیشەکانیش سەرەتا هەریەو جۆرە بوون و لەشەڕکردن لەگەڵ رۆمە بیزەنتیەکان ناوبانگیان پەیداکردو دەسەڵاتیان زیادی کرد، تەنانەت بۆ نزیکەی (٢٠٠) ساڵ هێرش و فراوانخوازیەکەیان ئاراستەی ئەوروپا کردبوو دوایی بایاندایەوە بەلای رۆژهەڵاتا.

کارگێرییەکان بەئەستانەوەو لەقاڵبدان و تواندنەوەی دەسەڵاتە ناوچییەکان لەوانەش میرنشینە کوردیەکان بوونە بەشێ لە قوربانییەکانی سیاسەتی بوژاندنەوەی ئیمپراتۆریەت بەیارمەتی ئەورووپیەکان، ئەم سیاسەتە مەرکەزییەش بە زۆری لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دوەم و لەسیەکانی سەدەی نۆزدەوە دەرکەوت، سوڵتان مەحمود پەلاماری میرنشینە کوردیەکانیداو سەرۆکە کوردەکانی لابردو تورکی لە جێیان دانا.. هەروەها دەست کرا بەسەربازگیری لەناو کورداندا، ئەمەش لەگەڵ کاردانەوەی میرنشینە کوردیەکاندا روبەڕوو دەبێت.[1]

لەگەڵ هەستکردن بەم سیاسەتە نوێیە کە ئەورووپییەکانی لەپشتەوە بوو، بەڵکو هەندێ جار فشاریان دەخستەسەر ئەستانە بۆجێبەجێکردنیان بۆمەرامە تایبەتیەکانی خۆیان، روبەڕو بوونەوەی میرە کوردەکان لەگەڵ ئیمراپۆرتی عوسمانیدا دێتەکایەوە.

هەروەها جۆرێ لە هەستی نەتەوەیی سەرەتایی خۆی نمایش دەکات دیارە شەڕەکانیش ئەم هەستە بەهێزتر دەکەن، میرەکانی سۆران و بۆتان لەم ساتە مێژوویەدا دەیانەوێ پارێزگاری لەقەوارەی خۆیان بکەن، بەڵکو واهەست دەکرێت چاویان بڕیبێتە دەسەڵاتێکی بەهێزترو فراوانکردنی قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایی خۆیان.

---

[1] د. کاوس قەفتان/ چەند لێکۆڵینەوەیەك لەمێژووی بابان سۆران بۆتان، بەغداد/ چاپخانەی الحوادث/ ١٩٨٥. ل٦٠ ـ ٦١.

بەجۆرێ کە زۆربەی کوردستان یاخود بەشێکی زۆری بگرێتەوە، بەڵام ئەم خواستە رەوایەی کورد لەو رۆژەوە تا نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، بەڵکو دەتوانین لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەدا بڵێین تاکو ئێستاش، تەنها رووبەرووی دژایەتی کردنی دەسەڵاتەکانی ناوەند لەو وڵاتانەدا نەبۆتەوە کە کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە، بەڵکو بەردەوام لەلایەن دەوڵەتە خۆرئاواییەکان و ئەوروپاو دواتر ئەمریکاوە رەتکراوەتەوەو بەرهەڵستی کراوەو بەرێگای هەمەچەشن هەوڵی لەباربردنی ئەم خەونە کوردییە دراوە.

هەر لەمیری رەواندزو (عبدالرحمن) پاشای میری بۆتانەوە تاشۆڕشەکانی شێخ عوبەیدوڵلاو راپەڕینەکانی دواتر، راستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ فەرەنساو بەریتانیاو روسیاو ئەمریکا دەستیان لەکوژاندنەوەو تێکشکاندن و سەرکوتکردنی راپەڕین و سەر بەرزکردنەوەکانی کورداندا هەبووە تەنانەت لە کوژاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا هەست بەگەلەکۆمەیەکی بەریتانی فەرەنسی روسی ئێرانی عوسمانی دەکەین، رەنگە خوێنەر پێی سەیر بێت کە وڵاتانی ئەوروپا فشاری زۆریان خستبووە سەرئەستانە بۆ ئەوەی لە شکستپێهێنانی راپەڕینەکەی شێخدا هیچ جۆرە دوودڵییەك لەخۆی نیشان نەدا.

ئەگەر باس لە هۆکاری ئایینیش لەتێکشکاندنی راپەڕینەکەدا بکرێ و هیچ دەورێکی هەبێ دیسانەوە دەبێت لە ناو سیاسەتەکانی ئەواندا بۆی بگەڕێین، ئەویش کاتێ لەرێی مزگێنی دەرو کاربەدەستانی خۆیانەوە هەوڵی تێکدانی پەیوەندی نێوان

مسوڵمان و مەسیحیەکانی کوردستانیان دەداو کەمایەتیە ئایینەکانیان دەکرد بەگژی بزوتنەوە کوردیەکەدا.[1]

هەڵبەتە ئێمە لێرەدا دەمانەوێ لەسەر سروشتی پەیوەندیەکان بووەستین و ناکرێ وەك مێژوونوس بەدوای وردەکاری رووداوەکاندا بچین.

## ئیسلام و بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی

شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەڕووی سیاسی و حاجی قادری کۆیی لەرووی رۆشنبیرییەوە بەباوکی ناسیونالیزمی کوردی و سەرەتای بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد دادەنرێن، حاجی قادر قسە لە دەوڵەتی کوردی دەکات، هەمووشمان دەزانین کە دەوڵەت چەمکێکی نوێیەو سەر بە قۆناغی دروستبوونی مۆدیلی دەوڵەتی نەتەوەو بڵاوبونەوەی تیۆری ناسیونالیزمە، حاجی سەربەو گروپە رۆشنبیرییە ئایینییە کەدەخوازن مانای نەتەوەیی بەئایین بدەن و ئایین و ناسیونالیزم توند بەیەکەوە گرێ بدەن، دەشێت ئەم قۆناغە بەقۆناغی ناسین و چاندنی گوتاری ناسیونالیزم ناوببەین.

شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلا ئامانجی سەرەکی (دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ بوو)[2] کە ئەمەش لوتکەی ئامانجەکانی بزوتنەوەیەکی

---

[1] بۆباسی شەڕو پێکەوە ژیانی ئایینی و رۆڵی مژدەدەرە خۆرئاواییەکان و دەوڵەتانی خۆرئاوا لەتێکدانی تەبایی ئایینی لەکوردستاندا بگەڕێرەوە بۆ کوردو عەجەم/ صالح محمد امین .

[2] جرجیس فتح الله، مبحثان على هامش ثورة الشيخ عبيدالله النهري/ الطبعة الثانية/ دار اراس / اربيل ٢٠٠١ /ص٢٦، ص٢٦.

ناسیونالیستییه بەتایبەتی بۆ ناسیونالیزمێکی لەشێوەی کوردی، هەرئەم ساتە مێژووییەشە دەکرێ پرسی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیونالیزمی کوردی لێوە بوروژێنرێ و ئەوە بخرێتە روو کە ئاستی بەیەکداچوون و جیابوونەوەیان لەگەڵ یەکدا تاچەندەو لەکوێدایە.

لەراستیدا لەپرۆسەی بەنەتەوەبوونی کوردا (ئیسلام لە شەخسی پیاوە ئایینییەکانیدا، لەتۆڕی دەزگاکانیدا تەنانەت لەو ئایدیایانەشدا کە باس لەعەدالەتخوزای و مافی جیاوازبوون دەکات خزمەتێکی گەورەی بەناسیونالیزمی کوردی کردووە و ئەوزەمینە رەمزی و رێکخراوەیی و بەشەری و سەرکردایەتییەی بۆئامادەکردوە کە پێویستی پێی بووە، بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونانەوە کەپێیان وایە ئیسلام دژ بەکوردو دژ بە ناسیونالیزمی کوردی بووە. ئەگەر هاتوو ئیسلاممان لەدیدی دەزگایی و شەخسی و ئایدیاییەوە تەماشاکرد ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت چ رۆڵێکی گرنگی بینیوە لەهاتنە کایە و شکڵبەندیی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردیدا).[1]

ئیسلام هەمان ئەو بنچینە عەقلی و مەعریفیەشە کە زۆرجار خودی ناسیونالیزمی کوردیشی جۆشداوە[2] بەڵکو یەکەم شۆڕشی نەتەوەیی کورد ـ شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلا ـ لەهەمان کاتدا کە شۆڕشێکی نەتەوەییە و ئامانجی دروستکردنی

---

[1] مەریوان وریا قانع/ لە نێوان مۆدێرنە و ئیسلامی سیاسیدا/ سەرچاوەی پێشوو.

[2] بەختیار عەلی، سەدەی ناسیونالیزم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەییە، بزوتنەوەیەکی چاکسازی ئیسلامی و هەوڵێکە بۆ گێڕانەوەی پابەند بوون بەئەحکامە بێ گەردەکانی ئیسلام لە سەراسەری نیشتماندا.

ئێمە لەکوردستانی ئەو کاتەدا شایەتی هیچ بزوتنەوەیەك لە دژی ناسیونالیستی کوردی نین کە مۆرکێکی ئیسلامی لە خۆبگرێت و زانایانی ئیسلامی کوردی ڕێبەرایەتی بکەن و ئەم داوا ناسیونالیستەی کوردان ـ واتە دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی ـ بەحەرام بزانن و خەڵکی لە دژ هانبدەن.

ئەمەش شتێکی سروشتییە سەبارەت ئیسلام، هەروەها جیاوازی ئیسلام و ئەو زەمینە مەعریفییە جیاوازەشمان پێ دەناسێنێ کە ناسیونالیزم لەخۆرهەڵات و لەوانەش لەناو کورددا تیایدا سەرهەڵدەدات و گەشە دەکات، ناسیونالیزم لێرە وەك خۆرئاوا ئەرکی نابێتە پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆحی و چارەسەرکردنی ئەو نائارامی و نادڵنیاییەی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە ئیسلام خۆی پڕکەرەوەی ئەوبۆشاییە بووە.

ئەرکێکی سەرمایەدارانەش جێبەجێ ناکات بەو جۆرەی لەخۆرئاوادا بووە، مەبەستی شێخ عوبەیدوڵڵا و کورد لە گەڕان بەدوای قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەییدا زەحمەتە بەوە بخرێتە ڕوو و هۆکارەکانی دەسنیشان بکرێت کە سەرمایەداری و بۆرژوازیەت عەوداڵی لابردنی بەربەستییە گومرگیەکان و بازاڕێکی نیشتمانی ناوخۆیە و لەقۆناغێکی‌تریشدا بۆچارەسەرکردنی شتوومەکەزیادەکانی و کەڵەکردنی قازانجی زۆرتر، هەموو سەرزەوی بکاتە ئامانجی کۆنترۆڵ و دەستبەسەراگرتن و دەستدرێژی، وەك ئەوەی لەکۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایدا بەرجستەبوو لەو ڕۆژگارەدا لەکوردستاندا

شتێ نەبووە بەناوی چینی بۆرژوازی، هێشتا چینێکی وا لە کۆمەڵگای کوردیدا بەخاسیەتە تایبەتیەکانی خۆیەوە نەخەمەڵیبوو فۆرمەڵە نەبوو بوو. هەربۆیە لەکاتێکدا لەخۆرئاوادا بۆرژوازیەت دەبێتە هەڵگری ناسیونالیزم لێرەدا کەسایەتییە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان لەسەرەتاوە دەبنە هەڵگری.

چونکە ئیسلام ئەو گیر و گرفتە گەورەی لەگەڵ ناسیونالیزم و بەتایبەتیش ناسیونالیزمی گەلێکی مسوڵماندا نییە وەك ئەوەی کە دامەزراوەی کڵێسا لەخۆرئاودا هەیبوو، ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی زۆرسادە، لەپێش هەمووشیانەوە ئەوەیە کە ئەگەر ناسیۆنالیزم تێکشکاندنی فۆرمی ئیمراتۆریەت و خێڵ بێ، هێندە گرفتی گەورە بۆ ئیسلام دروست ناکات، چونکە ئیسلام وەك ئایین خاوەنی دەزگایەکی کارگێری نێونەتەوەیی وەکو کڵێسای سەدەکانی ناوەراست نییە تا قەوارە تازەکە ببێتە رێگر لە بەردەمیدا، رۆحی ئیسلام لەوە یاخیترە لە دەزگایەکی مێژوویی دیاریکراودا بەرجەستە ببێ و ئەو بەرجەستەبوونەش ببێ بەدوایەمین وێنەی نمایشکراوی ئیسلام کەمیکانزیمێکی دۆگمای هەیە بۆ رێکخستنی کۆمەڵ و نەبەدیهاتنی یەکیەتی مسوڵمانانیش دەبەستیتەوە بەتاقە فۆرمێکی دیاریکراوەوە، ئەوەی لای ئیسلام گرنگە بەهاو پرنسیپەکان و رۆحی پەیامەکەیەتی، نەك چوارچێوەکانی مومارەسەکردن و میکانیزمەکانی، کە مێژوو گۆڕانیان بەسەردابێنێ و تازەیان دەکاتەوە ئەمەش رویەکی نەمری پەیامەکەی دەخاتە روو.

ئیسلام وەکوو ئایین رۆژێ لەرۆژان دژی جیاوازییە سروشتیەکانی نێوان گەل و نەتەوەو کلتورەکان نەبووە (يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ

شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ). (وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ).

لەم دوو ئایەتەوە بەروونی دەردەکەوێت کە بوونی گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکان و جیاوازی رەنگ و زمان کە لەجیاوازی زمانیشەو جیاوازی فەرهەنگ و داب و نەریت دێتەکایەوە، دیاردەیەکی خواکردن، بەڵکو بەناوهێنانی لەگەڵ مەسەلەی بەدیهاتنی ئاسمانەکان و زەوی دەیکات بەدیاردەیەکی گەردوونی و بەشێ لەراستیەکانی ئەم بوونە.

بەم پێیەی لەگەڵ پرسی نەتەوایەتی بەو سیفەتەی ئینیتمایە بۆنەتەوەیەك لەروانگەی ئیسلامەوە تووشی هیچ گیروگرفتێك نابین، ئەی ئایا کاتێ نەتەوایەتییە سورشتییە دەگۆڕێ بۆ نەتەوەیەکی سیاسی و لەسەر ئەو بناغە دادەمەزرێ کەنەتەوە مافی خۆیەتی مافی چارەی خۆنووسینی خۆی دیارییکات و دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی پێکبێنێت لەرووی مەبدەئیەوە روبەڕووی هیچ ئیشکالیەتێکی تیۆری دەبینەوە؟

بۆکەسانێ کە پەیوەندی نێوان ناسیونالیزم و عەلمانییەت بەحەتمی دەزانن یاخود ناسیونالیزم بەئایدیۆلۆژیەتێکی کۆمەڵایەتیش سەیر دەکەن یاخود خۆئامادەکردنی بەردەوامی دەوڵەتی ناسیونالیزم بۆشەڕی دراوسێکانی و تاوسەندنی هەستی دوژمنایەتی بەرامبەر نەتەوەکانیتر بەبەشێکی جیانەکراوەی ناسیونالیزم دەزانن، بێگومان وەڵامی ئەم پرسیارە (ئەرێ) دەبێت.بۆ ئیسلامیەکیش کە فۆرمە مێژوویەکانی رێکخستنی سیاسی و خودی ئیسلام لێکجیا ناکاتەوەو پیرۆزی دەدا

بەو واقیعە مێژووییەو مامەڵەی حەرام و حەڵاڵی لەگەڵ دەکات و توانای دەرککردنی گۆڕانە قوڵەکانی جیهانی هاوچەرخی نییە و وێناکردنەکانی بۆدەوڵەتی ئیسلامی هاوچەرخ تارادەیەکی زۆر تەم ومژاوی و تەپ و تۆزی مێژووییان بەسەرەوە نیشتوە، دیسان هەربەو جۆرەیە.

بەڵام لەراستیدا بەسەرنجدانێکی وردو هەمەلایەنە، هەڵەی ئەم بۆچوونەمان بۆروون دەبێتەوە،، چونکە یەکیەتی سیاسی مسوڵمانان جگە لەوەی بۆ (١٠٠٠) ساڵ زیاترە نەماوە، خۆی لە خۆیدا بەرەنجامی رێکەوتنێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە، ئیسلام کاتێ شوناسێکی عەقیدی بان نەتەوەیی دەدا بە شوێنکەوتوانی و دەیانکات بەبرای یەکتر لە هەمان کاتدا سڕینەوەی جیاوازییە سروشتییەکانی نێوانیان ناکات بەمەرجی بەدیهاتنی ئەوبرایەتییە، ئەو بانگەشەی تواندنەوەی (شعوب) ناکات ، بەڵکو دوای یەکترناسین و دیالۆگی نێوان گەل و نەتەوەو گروپە بەشەرییە جۆراوجۆرەکان دەکات.

کاتێ کلتورێکی هاوبەش دەخولقێنێ زمانێکی دیاریکراو فەرز ناکات، بەڵکو لەئەحکامە فیقهیەکانی خۆیدا رەچاوی داب و نەریتە جیاوازەکان دەکات.

کۆبوونەوەی نەتەوەیەك بەدەوری نەتەوایەتی و کلتورو فەرهەنگی نەتەوەیی خۆیدا بەواتای خۆداڕنین لەئیسلام نایەت، گەر ئیسلام رویەکی ناسنامەی گەلانی مسوڵمان پێکبێنێ و ناسنامەی عەقیدییان بێت ئەوا نەتەوایەتیش روێکی‌تری ئەوناسنامە پێکدەهێنێ، نەتەوەی ئیسلامیش هەڵگری ناوەرۆکێکی عەقیدەییە نەك ئەتنیکی و رەگەزی و زمانی، ئینتیما بۆ نەتەوەی ئیسلامی ئینتیمایە بۆ بیروباوەڕو

ژیارێك، کەواتە چ ناکۆکیەك لەوەدا سەرهەڵدەدات نەتەوە مسوڵمانەکان بەناوەرۆکە هاوچەرخەکەی نەتەوەی ئیسلامی پێکبێنن ناوەرۆکە یەکیەتیخوازەکەی ئەم نەتەوە ژیاری و عەقائیدیەش لەکۆمەڵێ دام و دەزگای هاوچەرخی وەکو پەرلەمانی هاوبەش و ئەنجومەنی هاوبەش و بازاڕی هاوبەش و لابردنی فیزەی هاتوچۆو یۆنسکۆیەکی ئیسلامی و دراوی ئیسلامی و چەندین شتیتر لەم چەشنە لەوێنەی بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا بەدیبێنن؟

ئەوەی ئیسلام و رۆحی ئیسلام دژایەتی دەکات سەرەڕۆیی نەتەوەیی و شۆڤێنیزمە، ئەو توندڕەوەییە کە نەتەوایەتی لەهەر ناوەرۆکێکی ئینسانی بەتاڵ دەکاتەوەو دەیکات بە هەرەشەیەکی ترسناك بۆ سەرخۆی و دەوروبەری و گەلانیتر، لەبەرئەوە هیچ رێگریێك نییە دەوڵەتە ناسیونالیستەکان بەئاشتی لەگەڵ یەکدا بژین.

لەروویەکیترەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە ناسیونالیزم بەرهەمی عەلمانییەتی خۆر ئاواییە، بەڵام ئاسان نییە باوەڕ بەوە بێنین کەعەلمانییەت و ناسیونالیزم دوو چەمکی ئاوێتەن و لەواقیعیشدا بەبێ یەکتر هەڵناکەن، ناسیونالیزم راستە ئایدیایەکە خاوەنی دیدێکی تایبەتییە بۆ گۆڕان و رێکخستنی سیاسی لەهەندێ رووەوە، بەڵام خۆی لەخۆیدا هەڵگری فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو نییە، بۆیە لەرووی کۆمەڵایەتیەوە پێویستی بەفەلسەفەو جیهانبینییەك هەیە پێی بڕوانێتە کۆمەڵگا و بەگوێرەی ئەو سیستمی کۆمەڵایەتی خۆی رێکبخات، بەم رەنگە دەشێ بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی لەرووی کۆمەڵایەتییەوە هەڵگری جیهانبینی ئیسلامی

بۆ واتە ئیسلام ببێتە ناوەرۆکی ئەو نەتەوایە وەك چۆن لەزۆر شوێنی دنیادا سۆشیالیزم یاخود ئایدیایەکیتر بۆتە ئەو ناوەرۆکە.

ئەمەش سەبارەت بە ناسیونالیزمی کوردی راستە، تاشۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانیش کەس ناتوانێ بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی لەگەڵ ئیسلام لێکجیا بکاتەوە یاخود بەرگری نیشتمانی خەڵکی ئەفغانستان لە بەرامبەر داگیرکاری سۆڤیەتیدا لەناوەرۆکە ئیسلامییەکەی بەتاڵ کاتەوە.

ئێستاش هیچ بزافێکی ئیسلامی لە خەباتیدا بۆگەیشتە دەسەڵات واز لە پرۆژە ئیسلامییەکەی ناهێنی و دانانیشێ بەدیار ئەو رۆژەی دەوڵەتی جیهانیی ئیسلام دروست دەبێت ، بەڵکو لەچوارچێوەی دەوڵەتە مۆدێرنەکەدا سەرقاڵی پێکهێنانی دەسەڵاتی سیاسی خۆی دەبێت، لێرەوە ناسنامەی نەتەوەیی دەوڵەتێك لەدیدە ئیسلامییەکەوە زۆر گرنگ نییە هەڵوێست گرتن دەربارەی دەوڵەتی نەتەوەیی لەوسۆنگەوە نابێت کەدەوڵەت قەوارەی نەتەوەیەکی دیاریکراوە، بەڵکو لە روانگەی ئەو بنچینە فکرییانەوە دەبێت لەسەری دامەزراوەو تێڕوانین و وێناکردن و یاساکانی لەوێوە وەردەگرێت.

وەك وتمان دەتوانین بڵێین ناسیونالیزم بەرامبەر فەلسەفەو رێبازە کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی و ئایینییەکان تارادەیەکی بەرچاو بێ لایەنە، لەبەر ئەوە پێویستی بەوەیە بۆچوونێکی دیاریکراو هەڵبژێرێ کەپێی بڕوانێتە گەردوون و ژیان و فەلسەفەیەکی هەبێت لەسەر بناغەی ئەو ژیاری و سیستمە کۆمەڵایەتییەکەی دابڕێژێت پرسیاری ئیسلامی بوون پرسیار لەناسنامەی نەتەوایەتی دەوڵەت نییە،

پرسیاری بنەڕەتی ئەو بریتییە لە بنەما فکری و سیاسی و دەستوریەکانی سیاسەت لەگەڵ هاووڵاتیان و ئاشتی و دادپەروەری ئەو لەناوخۆو دەرهەق بەجیهانی دەرەوە.[١]

ئەوەی لەقۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا فەلسەفەیەکی عەلمانی دەکاتە ناوەرۆکی ناسیونالیزم لەناو گەلانی دراوسێ و کوردیشدا ئەو حەتمیەتەی نێوان ناسیونالیزم و سکیۆلاریزم نییە ، بەڵکو ئەو حاڵەتە دەگەڕێتەوە بۆرۆڵی کۆلۆنیالیزم و نوخبەیەکی ناوخۆ کەبەزۆر مۆدیلە دڵخوازەکەی خۆی دەسەپێنێ، هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئەوبۆشایی و دواکەوتن و چەقبەستنەی لەو قۆناغەدا فکری ئیسلامی بە دەستیەوە دەیناڵاندو ڕێگا خۆشکەربو بۆ ئەوەی ئایدیا و چەمك و ڕێبازیتر ئەوبۆشاییە پڕکەنەوە و ببنە ناوەرۆکی ناسیونالیزمەکانی ناوچەکە. ئەوە جگە لەوەی خۆرهەڵات لەو قۆناغەدا تووشی شکستێکی نیمچە هەمەلایەنە هاتبوو.

لەم سۆنگەوە کاتێ سەرەتای ناسیونالیزم لەناو ئیمپراتیۆریەتی عوسمانیدا وەدەردەکەوێ کوردیش هەرزوو پرسیاری کوردبوونی لێپەیدا دەبێت، خودی ئیسلامیش کە ئایینی زۆربەی هەرە زۆری نەتەوەی کوردە، ڕێگرنابێت لەوەی کوردبوون ببێتە خولگەیەکیتری کۆکردنەوەی هۆشیارانەی خەڵك، چونکە وەك وتمان کوردبوون و موسڵمان بوون دژی یەکتر نین و هەریەکەیان گوزارشت لە ڕەهەندێکی کەسێتی کوردی و ڕوویەکی ناسنامەکەی دەکەنەوە، مسوڵمانێکی کورد گیروگرفتی لەورووەوە بۆ دروست نابێ لەچوارچێوەی بەها ئیسلامیەکانیدا بەرامبەر

---

[١] ئەبوبەکر عەلی، ماف چارەنووس، دیدێکی ئیسلامیی هاوچەرخ، گۆڤاری هێشتا ژمارە(٢) هاوینی ٢٠٠٥، ل٥٦ ـ ٥٧.

نەتەوەکەی خۆی و بزوتنەوە ناسیونالیستەکەی وەفاداربێ و بازنەی (انتما)ی نەتەوەیی و عەقیدەیی و ژیاریەکەش لێكجیاکاتەوە و لەودیدەشەوە سەیریان بکات کە کۆمەڵێ بازنەن یەکتری تەواو دەکەن، ئەگەر هەل و مەرجێکی مێژوویی نائاسایی و ئەو هۆیانەش نەبوایە کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن، دەبوا بۆ پاراستنی ریزەکانی ناسیونالیزمی نەتەوەیەکی مسوڵمان و یەکیەتی ناوەوەی کۆمەڵگاکەی و دورخستنەوەی لەمەترسی دابەشبوونێکی ترسناك بەسەر مەرجەعیەتە جیاوازەکان و مەنزومە بەهاییە جۆراوجۆرەکاندا هەروەها بۆهاتنەدی ئاوێزانبوونی سروشتی و هەماهەنگی کۆمەڵگایی و تەبایی کۆمەلایەتی، بەها ناسیونالیستەکانی نەتەوە مسوڵمانەکانی لەناو فیکری ئیسلامیدا بگونجێنرایە وەك چۆن سەرەتاکانی ناسیونالیزمی کوردی تا بیستەکانیش تارادەیەکی بەرچاو بەو جۆرە بوو، ئێمە ئەم شلەژاوی و ناکۆکی و دابەشبوونە کۆمەڵگاییە لەبەرنجامی وەلاخستنی ئیسلام و بەزۆر فەرزکردنی بەهاو پێوەرەکانی مەرجەعیەتە خۆرئاواییەکە لەچەندین وڵاتی ناوچەکەدا دەبینین کە رەنگە حاڵەتەکە لەتورکیا لەهەمووی زەقتر بێت.

موسڵمان بوون و وەرع و تەقواکەی شێخی نەهری[1] نابێتە بەربەست لەبەردەمیدا بۆ ئەوەی باس لە جیاوازی کوردان بکات وەك گروپێکی نەتەوەیی و بڵێ (گەلی کورد کە زیاتر لە نیو ملیۆن بنەماڵە پێکهاتووە گەلێکی جیاوازە، ئایینییان جیاوازە (مەبەستی مەزهەب و شافعی بونی زۆربەی کوردە) داب و نەریتیان جیاوازە).[2]

---

[1] کە زۆر بەناو بانگ بووە لەو رووەوە.

[2] جرجیس فتح الله، مبحثان علی هامش ثورة الشیخ عبدالله النهري، ص٢٦.

لەوەش زیاتر بەحوکمی تێگەیشتنە ئیسلامییەکەی هەیەتی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کە خۆی وەك دەسەڵاتێکی ئیسلامی ناساندوە بەشەڕ لەگەڵ ئیسلام نازانیٚ،، چونکە بەدڵنیاییەوە گەر وای بزانیایە ئەو وەك کەسایەتیەکی ئیسلامی و مسوڵمانێك ئامادە نەدەبوو شەڕ لەگەڵ ئیسلامدا بکات، گەر بگەڕێینەوە بۆ ئامانجەکانی بزوتنەوە ئیسلامییە میللیەکەی هەروەك رونمان کردەوە یەکیٚ لەو ئامانجانەی هەڵی گرتبوو دووبارە پابەندبوون و خۆبەستنەوەو ئیش کردن بوو بەئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامی، ئەمەش لەو بارودۆخەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ئەورۆژانە بەسەر کوردستاندا حاکم بوو، رۆژانیٚ سیماکانی بە پاشاگەردانی و دیارنەبوونی نەزم و یاساو بڵاوبوونەوەی رەفتاری دزێوو هەڵکوتانە سەرخەڵك و دزی و تالآنی و رێگری دیاری دەکرێت لەبەرەنجامی ئەو فەراغەی لەهەڵوەشاندنەوەی میرنشینە کوردیەکان و گەندەڵیی کارگێڕی هەردوو دەوڵەتی فارسی و عوسمانی و قۆزتنەوەی لەلایەن هەندیٚ دەستڕۆیشتووی بچوك و سەرۆك خێڵ بۆ سودی ناڕەوا هاتبووە ئاراوە.

شێخ وەك لەراستیشدا هەروایە دەسەڵاتی ئیسلامی و پلەو پایەی خەلافەت بەموڵکی هیچ نەتەوەو بنەماڵەیەك نازانیٚ لەوانش تورکەکان و بنەماڵەی عوسمانی، لەبەرئەوە کاتێك ئەم حکومەتە دەستدەداتە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی مەرکەزی و دواتر فشار دەخاتەسەر نەتەوەکانیتروبارى کارگیری دەوڵەت و ژیان و گوزەرانی خەڵك بەرەو خراپی دەچیٚ، سڵ ناکاتەوە لەوەی ئەو دەسەڵاتە بەوە وەسف بکات کە (غصب)ی پلەوپایەی خەلافەت و دەسەڵاتدارێتی ئیسلامیان کردووە بەم جۆرەش شۆڕشەکەی ئەو دەبێتە شۆڕش دژی واقیعێکی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی

دیاریکراو چەکی دەستیشی خودی بەها ئیسلامییەکانە، ئەو بەهایانەی هی هەرکەس و نەتەوەیەکن ببنە هەڵگری و لەپێناویدا و بۆ ئەو تێبکۆشن، گەر سەیریش بکەین مێژووی کوردی لە شۆڕشەکەی شێخی نەهریەوە دوو دیاردەی تازە بەخۆیەوە دەبینێ:

یەکەم: بەپێچەوانەی میرنشینەکانەوە کەمیرەکان سەرۆك خێڵ و سەرۆکی بنەماڵەکان و کەسێتی‌یەکی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگای کوردی بوون، سەرکردایەتی یەکەم بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی و لەو ساتەی ناسیونالیزم لەناو کوردا سەرهەڵدەدا کەسێتی‌یەکەی ئیسلامی میللی دەبێتە رەمزو سەرکردەی.

دووەم: بۆ یەکەمجار لەمێژووی تازەی کوردا بزوتنەوەیەك سەر هەڵدەدا کەبازنەی خێڵ و ناوچەکە تێکدەشکێنی و واز لە ئەمبەر و ئەوبەرکردنی نێوان دەوڵەتی فارس و عوسمانی دێنێ و لەسەرو ئەو ململانێ مێژووییەوە ستراتیژیەتەکانی دادەڕیژێ، مەبەستمان ئەوەیە پشتی لایەك ناگرێت بۆلایەکی‌تر کە زۆر جار میرنشینە کوردیەکانی پێشوتر بەوجۆرە بوون.

خاڵی یەکەم جێگای سەرنجراکێشانە پێش ئەو مێژووە زانای مسوڵمانی کورد زۆر بە دەگمەن نەبێ ـ وەك نمونەی مەلا ئیدریسی بەدلیسی ـ رۆڵی دیار نییە، واتە رۆڵی سیاسی و کارگێڕی دیار نییە ئەمەش من دەیگێڕمەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی:

أ) ئەو جیابونەوەی هەر لەسەردەمی ئەمەوییەوە لەنێوان رێبەرایەتی فکری و رێبەرایەتی سیاسی لە جیهانی ئیسلامدا روویدا و زانایانی خستە دەرەوەی بازنەی دەسەڵات بە واتا تەسکەکەی.

ب) هەژاری زانای کورد و نەبوونی سەرچاوەیەکی دارایی لە بەردەستیدا کە پێویستیەکی دەوربینین و دەستڕۆیشتویی پەیداکردن بووە.

گرنگ ئەوەیە مێژووی وەدەرکەوتنی سەرەتاکانی ناسیونالیزم و گەشەکردنی هەستی نەتەوەیی و گۆڕان لە ستراتیژو شێواز و ئامانجەکان، جێگۆڕکێیە لەسەرکردایەتیشدا دیارە لەم ئاڵ و گۆڕەدا پەیدابوونی تەریقەتەکان لەکوردستاندا دەوری بنچینەیی دەگێڕن، چونکە تەریقەت دووکاری گرنگ ئەنجام دەدا:

یەکەم: گۆڕان لەڕێبەرایەتی ئیسلامیی کۆمەڵایەتیدا دێنیتەکایەوە، شێخ، مەلاو مامۆستای مزگەوت نییە، گەرچی مامۆستای مزگەوت هەردەمێنێ، بەڵام جۆرێکیتر لەرەمزی ئیسلامیی و ئایینی وەدیاردەکەوێ کە ئەویش شێخەو خاوەنی خانەقا یاخود تەکییەیە بەگوێرەی جیاوازی تەریقەتەکان.

دووەم: ئەم رەمزە کۆمەڵایەتییە یەکێ لەهۆکارەکانی لاوازی دەوری مامۆستای ئایینی لە ژیانی سیاسی و کارگێڕیدا لەپێش ئەوسەردەمەوە ناهێڵێ کەئەویش هەژاری و نەبوونی سەرچاوەیەکی ئابوری سەربەخۆو بەهێزە، شێخ کاتێ دەبێت بەخاوەنی دامەزراوەیەکی ئایینی کۆمەڵایەتی وەکو تەریقەت و موریدو دەروێشی دەبێت دەخوازێت خانەقاو تەکیە بکاتەوەو خاوەن موڵك و توانایەکی دارایی بەرچاویش بێت.

سێیەم: لەهەردوکیان گرنگتر سیستمی تەریقەت و لایەنگیری و موریدیەکەی سنورەکانی خێڵ و ناوچە تێدەپەڕێنی، چونکە کۆبوونەوە لەسەر تەریقەتێکی

دیاریکراو و بوون و بەموریدو دەروێشی شێخێ ناتوانێ لەو بازنە داخراوانەدا بمێنێتەوە.

هەر لە بەر ئەمە شۆڕشەکەی شێخی ئەهری بەهۆی ئەو بنکە ڕێکخراوەی لەناو دۆخە ئیسلامیەکەدا بۆی پەیدا دەبێ و ئەوسام و نفوزەی ڕێبەرەکەی بەهۆی پلەو پایە ئایینییەکەوە لەناو کوردا دەستی دەکەوێت، دەرچوونە لەشێوە کلاسیکییەکەی سەرۆکایەتی میرنشینەکان کەزیاتر خێڵ و بنەماڵەو ناوچە دەوری تیا دەبینێ.

وەدەرکەوتنی ڕەمزە ئیسلامییە کوردییەکە بەهۆی تەریقەتەوە ئەم سنورە تێدەپەڕێنێ و ڕەهەندە ئیسلامی و ڕۆحییەکە لەپاڵ نفوزی کۆمەڵایەتی کەشەرعیەت و ئەوناوەندەی لێیەوە هاتووە لە نفوزی کۆمەڵایەتی کۆن و دەرەوەی ئەمان جیاوازە دەبنە ڕێخۆشکەر بۆ وەرێکخستنی هەوڵی تاکو خێڵەکانیش لە فیدراسیۆنێك و لەبازنەیەکی فراوانتری (ولا ) ی ئیسلام و نەتەوەییدا کۆبکاتەوە.. کە لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەکۆنگرەی یەککرتنی خێڵە کوردیەکان بدەین کە شێخ نەخشەی بۆکێشاو سەرپەرشتی دەکرد بەمەبەستی کۆکردنەوەی سەرجەم توانا کوردیەکەو ئاراستەکردنی بەوجۆرەی قوڵبوونەوەی هۆشیاری یەککرتن و دەسکەوتنی ئامانجە نەتەوەیی باڵاکان دەیخوازێت و دیارە لە چوارچێوەی سیاقە مێژووکەداو ئەو ئاستەی گەشەی کۆمەڵگای تێدابووە.

لەبەر تیشکی ئەم چەند دێڕانەی دەربارەی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیونالیزم و ناسیونالیزمی کوردی نوسیمان دەتوانین گومان لەوبۆچوونەی

(بەختیار عەلی) بکەین کە (رەخنە گرتن لە رۆڵی ئاین لەدروستکردنی کاراکتەری مرۆڤەکاندا دروستبوونی فاسیلەیەك لەنێوان هۆشیاری ئایینی و هۆشیاری تاکەکان)[١] دەکات بەدوو مەرجی بوونی ناسیونالیزم و فەردێکی ناسیونالیست، بەختیار لێرەدا شوناسێکی نەگۆڕو دیاریکراوو جەوهەرێکی کۆنکرێتی دەدات بەهۆشیاری ئایینی و لەپێناسەکردنیدا زۆر گوێ بە جیاوازی ئایینەکان و ژیارەکان و قۆناغە مێژوویەکان و میکانیزمی کارکردنی ئایینە جۆراوجۆرەکان نادات، بۆیە وا بەرەهایی باس لە هۆشیاری ئایینی دەکات کەدیارە لای ئەو وێنایەکی چەسپاو نەگۆڕی هەیە، ئەگەر خۆشی ئەوە رەتنەکاتەوە کە شۆڕشەکەی نەهری بەسەرەتای بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی دادەنرێ وەك رەتی ناکاتەوە ئەوا ئەو کاتە دەخوازێت بەم بۆچوونەیدا بچێتەوەو تایبەمەندی ئیسلام و جیاوازی مێژوویی خۆرهەڵات و خۆرئاوا فەرامۆش نەکات،، چونکە ئیسلام لەدەزگایەکی کەهنوتی نێونەتەوەییدا بەرجەستە نەبووە نەلەرووی مێژوویەوە نەئێستاش، جگە لەوەی میکانیزمێکی وەکو (اجتهاد)ی لەبەر دەستیایە بۆ روبەڕوبونەوەی واقیعە نوێکان و ناولێنانیان و شوناس پێدانیان و وەڵامدانەوەی ئەوگیروگرفتانەی دەبنە دەرهاویشتەی ئەوان.

ناسیۆنالیزمیش لەگەڵ بوونی هەندێ سەرەتای گشتی هاوبەش مەرج نییە لە سەراپای جیهاندا یەك مۆدێلی هەبێ و لەهەموو رووەکانیشەوە هەمان ئەرکیش جێبەجێ بکات، بەدرەخستنی ئەم خەسڵەتانەی ئیسلام و ناسیونالیزمیش دروستبوونی فاسیلە لەنێوان هۆشیاری ئایینی و هۆشیاری تاکەکان نابێتە مەرجی

---

[١] بەختیار عەلی، سەدەی ناسیولیزم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٧.

بوونی ناسیونالیزم، بەڵکو راستتر ئەوەیە تازەکردنەوەی هۆشیاریە ئایینەکە و گونجاندنی لە گەڵ بەها ناسیونالیستی‌یەکەمان دەوێت، گەر یەکێکیش پێی وابێت ئەم گونجانە مەحاڵە ئەوا پێچەوانەی مێژووی سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کوردییەو گرفتی ئیسلام نەناسی و روانینە ئیسلام لە چاوی گوتاری خۆرهەڵاتناسی لەپشت ئەو بۆچوونەوەیەتی، لەکاتێکدا کاک بەختیار نکولی لەدەوری ئیسلام ناکات لەجۆشدانی بزوتنەوەی ناسونالیستی کوردیدا.[١]

هەر بەم جۆرەش دەبێ هەروا بەسانابەسەر ئەو رایەی (بەختیار عەلی)دا تێپەڕنەبین کە دەڵێ: ناسیونالیزم لەخۆرهەڵاتدا بەگشتی ولای ئێمەی کوردیش هۆکارو فاکتەرێکی گرنگی لەدایکبوونی هەستێکی رەخنەیی بووە بەرامبەر تەفسیری ئایینیانە بۆمێژوو و کۆمەڵگا.[٢]

نازانم دەبێت مەبەستی کاک بەختیار لەتەفسیری ئایینیانە بۆمێژوو و کۆمەڵگا چی بێت؟ تۆبڵێی لەدارشتنی دوو راییەکان و ناوەرۆکی ئەم تەفسیرە تەنها دەقێکی بان مێژوویی و (مجرد) ئامادەبێ و واقیعی ژیاری و کارلێکردنی مرۆڤ (زانا، رۆشنبیر) بێ دەورین؟ راستە جیهانبینی (یەکتاپەرستی) لەهێڵە گشتیەکاندا نەگۆڕی هەیە. مەگەر ئەو هۆشیارییەی لەبەرەنجامی کارلێکی دەق و واقیع و رۆشنبیردا لەدایك دەبێت و سەرەنجام ئەوتێزو چارەسەرانەی لەم دەکەونەوە بەهۆی گۆڕاوبونی دوو توخمی ئەو هاوکێشە واتە واقیع و مرۆڤ تازە نابێتەوە؟

---

[١] بەختیار عەلی، سەدەی ناسیونالیزم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢.

[٢] هەمان سەرچاوەی، ل١٧٧.

ئیتر هۆشیاری فکری بەرهەمهاتوو تەفسیری نەوەیەك و قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراو نەدەبێتە دواشێوەی هۆشیاری و نەدوا تەفسیریش، رەخنەگرتن لەهەندێ روالەت و مومارەسەی بەئایین روپۆشکراویش کە لەبنەڕەتدا بەرهەمی فکرێکی چەقبەستوەو ناتوانێ خۆی کارلێك بکات و ژیان دەوەستێنی و لە مەسەلە جەوهەریەکانی ئایین دووردەکەوێتەوەو شێوازی نامۆبەگیانی ئایینەکە تێکەڵ بەپەرستش و فەزا کۆمەڵایەتیەکە دەبێت، رەخنەگرتن لە هەڵوێستی هەندێ شێخ یاخود هەندێ مەلا خۆی لەخۆیدا نابێ بەرەخنەگرتن لە ئیسلام، هەڵبەت هەست دەکەم کاك بەختیار خۆشی لەدوای ئەوە ئاماژە بۆ ئەم راستییە دەکات و بەمەش پرسیار دەخاتەسەر بۆچوونەکەی پێشووی، بەختیار لەسۆنگەی باس لەشوناسی رۆشنبیری کوردو گۆڕانی ئەم شوناسە لەرۆشنبیری ئایینییەوە بۆرۆشنبیری تازە (دوای سەرهەڵدانی ناسیونالیزم) ئەم رۆشنفکرە نوێیە لەدەرنجامی جەنگ و جەدەلی فکرییەوە لەگەڵ ئایین و کۆمەڵگادا لەدایك نابێت واقیعی کوردی بەپێچەوانەی واقیعی خۆرئاواو تەنانەت تارادەیەك دەوروبەریشی بە جەنگی عەلمانییدا ناڕوات و ئەوجەنگە لەوەزیفە سەرەکی و ئۆرگانییەکانی رۆشنبیری ناسیۆنالیستی کورد نەبووە، ئەگەر سووکە جەنگێکیش دژ بە هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی دزێو کرابێت کە هاوشانی ئایین لە ئارادابوون بەشێکی هەر رۆشفکرانی دینی خۆیان کردوویانە.[1]

هەر لەمڕووەوە نەبوونی دیدێکی روون بۆ ئایین کە لێرەدا مەبەست(ئیسلامە) و جیانەکردنەوەی ئەودیاردە کۆمەڵایەتیە دزێوانەی شان بەشانی ئایین لەئارادا بوون

---

[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

یاخود بەدەست ئەنقەست تێکەڵاوکردنیان، وا لە (مەریوان وریا قانع) دەکات بڕیارێکی خێرا دەربکات و تێگەیشتنێکی بە بڕوای نووسەر نادروست بۆبەشێ لەمێژووی کورد بخاتە رو کاتێ دەڵێ: (لەخۆڕا نییە مێژووی رەخنەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی لەدنیای ئێمەدا مێژووی رەخنەگرتنە لەئایین لە (نالی)یەوە تاسەر شێرزاد حەسەن لە (مەحموی)یەوە تاسەر (بەختیار عەلی) لەرۆژنامەی کوردستانەوە تاسەر (گۆڤاری رەهەند) خەتێکی گشتی و بەهێزی رەخنەگرتن لە ئایین و لەوێناکردن و جیهانبینییەکانی ئایین لە ئارادایە.[1]

لەراستیدا ئەم خستنە پاڵ یەکەی نالی و شێرزاد حسن و مەحوی و بەختیار عەلی و کوردستان و رەهەند. سەلماندنی هەروا ئاسان نییە. نیمچە مەحاڵە (نالی) و (شێرزاد حەسەن) یاخود عارفێکی گەورەی وەك مەحوی و رۆشنبیرێکی عەلمانی و مۆدێرنی وەك (بەختیار عەلی) بخەیتە یەك تای تەرازووەوە، یاخود رۆژنامەی کوردستان و رەهەند بەیەك بچوێنی لەکاتێکدا (نالی و مەحوی) رەخنە لە ئیسلام ناگرن، بەڵکو رەخنە لە هەندێ مومارەسەی هەڵەو دیاردەی دزێوی شانبەشانی ئایین دەگرن و لەناو خودی بازنەی ئیسلامەوە رەخنە دەگرن، جگە لە (ئیسلام)یش مەرجەعیەتێکیتری فکری و ژیاریان نییە، ئێستاش لەزۆر شوێنی دنیاو لە کوردستانیشدا ئەو رەخنە گرتنانە لەهەندێ رووی کەلەپوری ئیسلامی و مومارەسەی رۆژانە و دیاردە دزێوەکان لەلایەن رۆشنبیرانی ئیسلامخوازەوە بەردەوامە و ئەوەش بەشێکە لە ئەرکە رۆشنبیرییە ئیسلامییەکەیان (نالی و

---

[1] مەریوان وریا قانع، لەنێوان مۆدێرنەو ئیسلامی سیاسیدا، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.

مەحوی) و رۆشنبیرانی ئەمرۆی ئیسلامخوازانیش لە کوردستاندا رەخنەکانیان چەند پەرۆشی‌یە بۆ واقیعە کۆمەڵایەتی و شارستانییەتە کە هەوڵی پێشخستنییەتی ئەوەندەش دڵسۆزییە بۆ خودی ئیسلام و شەڕە لەگەڵ ئەو دیاردە نامۆیانەی پرشنگدانەوەکانی حەقیقەتی ئایینەکە لەواقیعی ژیاندا کەم دەکەنەوە، کوفرێکی فکری گەورەیە (گەر بەزمانی خۆی بدوێم) نالی و مەحوی بکەیتە عەلمانی و شەڕی ئیسلامیان پێ بکەی لەکاتێکدا (بەختیار عەلی) و (شێرزاد حەسەن) لەمەرجەعیەتێکی فکری جیاواز و لە دەرەوەی بازنەی (ئیسلام)ەوە رەخنە لە ئیسلام دەگرن بۆ ئیسلامیشی لێناگرن، بەڵکو بۆحیسابی تەوژم و ژیار و شێوە ژیانێکی‌تری لێدەگرن، کەئیسلام لانی کەم لەسەر ئاستی سیاسی و کۆمەلایەتیدا دەخلی نەبێ بەسەر دیاریکردنی سیماکانی ئەوشێوە ژیانەو ئەو فەزا رۆشنبیری و ئەخلاقی و یاسایی و کۆمەڵایەتییەی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ. بەکورتی (نالی و مەحوی) و حاجی قادرو مەلای گەورە و چەندین رۆشنفکری‌تری ئیسلامییش داوای دابڕان دەکەن لەنێوان ناوەرۆك و پەیامە راستەقینەکەی ئیسلام و ئەو تەپ و تۆز و خۆڵ و غوبارەی رۆژگارو واقیعە ناهەموارەکان و دواکەوتویی عەقیدی و ژیاری و کۆمەڵایەتی بەدوریدا دروستی کردووەو وای لێکردوە هەندێ کەس سوود لەم حاڵەتەوە وەربگرن و خەڵکە سادەکەی پێ فریو دەن و بەدرۆو بۆنیازی خراپ یاخود لەبەر تێنەگەیشتوویی هەندێ شت بە ئیسلامەوە بلکێنین کەئیسلام بێ بەریە لەوشتانەو لەهەندێکاتیشدا بەشێ لە پەیامەکەی ئامانجی لە رەگ دەرکێشانی ئەو دیاردانەیە.

لەکاتێکدا (شێرزاد حەسەن) و (بەختیار عەلی) و (مەریوان) چەندین رۆشنبیری‌تر لە کوردستاندا بانگەشە بۆدابڕان لەگەڵ خودی ئیسلامەتیش بەتایبەتی وەك مێژوو، ژیار، تەموحی سیاسی دەکەن، شەڕی عەلمانییەت لەگەڵ ئیسلامدا دەکەن دەیانەوێ ئیسلام جگەلە بازنە تەسکە پەیوەندییە رۆحییەکە لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و فەرهەنگی دابڕن ئەمەش دوو دابڕانە بەقەد ئاسمان و رێسمان لەیەکتر جیاوازن، مەگەر تەنها لەیەك حاڵەتدا بخرێنە پاڵ یەك و یەك ناوەرۆکیان پێ بدرێ کە ئەویش گوتاری دابڕینە تازەکە و شەڕە تازەکە لەگەڵ ئیسلام (بەناوی مۆدیرنەوە) بەدوای رەوایەتیەکی مێژووییدا بگەڕێ لای کەم لە مێژووی نوێی کوردستاندا کەرەنگە ئەم کارەش هەروا شتێکی سانا نەبێت، چونکە تێکەڵاوکردنێکی ئاشکرای تیایەو ناشتوانێ خۆ لەبەردەم چەندین پرسیاری جۆراوجۆردا رابگرێت.. سەبارت بە رۆژنامەی (کوردستان)یش قسەکان هەر راستن (کوردستان) لە سەردەمی (میقداد بەدرخان) کاتێ دەردەچێ بۆرەخنەگرتن لە واقیعی دواکەوتووی کوردەواریە لە رووی ژیاری و زانستییەوە پشت بەگوتارێکی ئیسلامی دەبەستێ، واتە ئیسلام بابەتی رەخنەلێگرتنەکانی نییە ، بەڵکو بەشێکە لە کەرەسەی پرۆسەی رەخنەگرتنەکەو دادگایی کردنی واقیعە فکری و ئایینی و کۆمەلایەتییە دواکەوتووەکە.

ژمارە سەرەتاییەکانی کوردستان دەرخەی ئامادەبوونێکی ئیسلامی بەرچاون لەو گوتارە رۆژنامەنووسیەدا کە بەرهەمی دێنێ، لەو سەرەتایەوە دەستی پێکردوە کە ئیسلام لەگەڵ کلتورو فەرهەنگی کوردی تێکەڵ بەیەکتر بوون .

(نالی) و (حاجی قادر) و (مەحوی) و (ڕۆژنامەی کوردستان) بەڵگەی سەلماندنی گوتارێ نین کە دەیەوێت لەدەرەوەی ئیسلامەوە رەخنە لە ئیسلام بگرێت و کەرەسەی شەرعیەتپێدانیشی نین.

ئەمە جگە لەوەی جیاوازیەکی بنەڕەتی لەنێوان سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی نەتەوکانی دراوسێ و کوردا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ناسیۆنالیزمەکانیتر لەسەرەتاوە تارادەیەکی بەرچاو نامسوڵمانانەکان و کەمایەتیە ئایینییەکان (لەناو عەرەبە مەسیحیەکان و لەناو تورکەکان و جولەکەکان یاخود رۆشنبیرە غەریگەراکان - بەدەستەواژە ئێرانییەکە - لەناو فارسدا)، دەوری بنچینەیی دەبینن لە مزگێنیدان بەرێبازەکەو بانگەشە بۆکردنی و هەندێ جاریش سەرکردایەتی کردنی بزوتنەوە ناسیونالیستییەکە.

بەڵام لە کوردستاندا رەمزە ئیسلامیە میللیەکانی کۆمەڵگا دەبنە هەڵگری یەکەمی فکرەکە و تاماوەیەکیش هەرخۆیان دەبنە رێبەری بزوتنەوەی رزگاریی نەتەوەیی و نیشتمانی کوردستان ئەم خاڵە یەکێکە لەو خاڵانەی ناسیونالیزمی کوردی لە ناسیونالیزمەکانیتر جیا دەکاتەوە و سروشتێکی سەر بەخۆو تایبەتی پێ دەبەخشێ، رەنگە ئەمەش چەند هۆکارێکی لەپشتەوە بێت، وەکو ئەوەی کورد کاتێ تراژیدیای سایەی قەوارە مۆدێرنەکان تووش دێت و شەڕی مان و نەمانی لەگەڵ بەرپا دەکرێ بە بەراورد لەگەڵ قەوارەی ئەو مەرگەساتەدا کە ئایدیۆلۆژیا و دام و دەزگا مۆدیرنەکان بەسەری دێنن، یاداوەریەکانی رابردووی لەسایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەرووی نەتەوەییەوە هێندە تاڵ دەرناچن وای لێبکەن دابڕان لەگەڵ ئەو

رابردووەدا دروست بکات، هۆکارێکی‌تریشی بۆ واقیعی کوردی دەشێ پەیوەست بووبێ بەوەی بەبێ بنکەو ڕێکخراوە ئیسلامییەکە و گوتارە میللیە ئیسلامی‌یە تێکەڵەکە ئاسان نەبووە لەسەرەتاوە خەڵك بەشێوەیەکی تازە ڕێکخرێ و سازبدرێ و کار لەهەست و سۆزی بکرێت و بجولێنرێ، لەبەر دەرنەکەوتنی چوارچێوە مۆدێرنەکان لەوانەش پارتی سیاسی.

لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ململانێیەی شوناسی ناسیونالیزمی کوردی تۆخ دەکاتەوەو ئاراستە و مەودای شەڕەکانیشی دیاریدەکات، بەدرێژایی یەك سەدەی تەواو کە بەسەدەی ناسیونالیزمی خۆرهەلات دەادەنرێ واتە - سەدەی بیستەم - لەگەڵ کۆمەڵێ دەسەلات و ڕژێمی عەلمانی و نائیسلامیە، ئەوە ئیسلام و دەسەلاتی ئیسلامی نییە شەڕێکی بێ ئەمان و وەحشیانە لەگەڵ کوردا بەرپا دەکات و مافی بوون و ژیان و کوردبوونی لێ دەسێنێتەوەو دەیگۆڕێ بۆبونەوەرێکی مەسخکراوی ناو شارستانی و بێ مێژوو بێ ئاییندە، بەڵکو ئەوە ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکان و دەوڵەتی مۆدێرنەیە کورد دەخاتە بەردەم ئەو واقیعە مەرگەسات و خوێناوییەوە، ئیتر ئیسلامێك کە لەمەیدانی کارتێکردنی سیاسی و کۆمەڵگایی دورخرابێتەوەو وەکو کورد، کەوتبێتە بەردەم گوشارو پەراوێزخستنی سیستەمە تازە مۆدێرنەکە هەروەها دوایەمین پەنای دڵدانەوەو هێشتنەوەی تروسکایی و ئومێدبێت بۆ خەڵکە ڕەش و ڕوتەکە - لانی‌کەم لەسەر ئاستی - ڕۆحی و ناوەوەی خەڵکە موسڵمانەکە و شوێنەوارەکانی لەسەر تۆڕی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان، بۆ دەبێت ببێ بە دژە جەمسەری گوتاری ناسیۆنالیزمی و ڕۆشنبیری کوردو لەسەر دژایەتی کردنی ئەو، دامەزرێ و ڕەوایەتی وەربگرێت؟ بۆیە ڕاستتر ئەوەیە بوترێ ئەگەر لە دیدێکی

ناسیۆنالیزمی رووتەوە سەیری مەسەلەکە بکەین و گوتاری خوێنگەرمی و ئەدەبیاتی موقاوەمەتی چەکدارو فیزیك نزیکەی تەواوی پانتایی جولەی بزوتنەوە ناسیۆنالیستە کوردییەکەی داگیرنەکردایە، دەبوو رەخنەگرتن لەمۆدێرنەو بەتایبەتیش لە رووە ناشیرنەکانی مۆدێرنەی سیاسی و دامەزراوەکانی، بناغەیەکی بەهێزی رۆشنبیری کوردی و بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکەی پێکبێنێ، چونکە ئەگەر لەسەراپای سەدەی بیستەمدا سەدەی خوێن و کارەسات و ژینۆسایدی کورددا لە دەرەوەی ئیشکردنی میکانیزمەکانی دەسەلات و کۆنترۆڵ و دام و دەزگاکانی دەولەتی مۆدێرن و ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکە نەتوانین لەپاڵنەرەکانی ئەم پرۆسەی کورد قڕان و کوردسفرکردن و سەرکوتکردنی کوردە تێبگەین، ئەوکاتە رەخنە لە مۆدێرنە بەتایبەتیش لەبەرگە خۆرهەلاتەیەکەیدا دەبێتە پێویستییەکی یەکجار گرنگ ، بەلاَم ئەو رەخنەبەهۆی بە ئایدیۆلۆژی کردنی مۆدێرنە، بەڵکو بە ئایینکردنی لەدنیای ئێمەدا[1] و مامەڵەکردنی موریدانە لەگەڵ چەمك و بەهاو میکانیزمەکانی و زاڵبوونی مارکسیزم وەك تەرزێکی فکری و سیاسی مۆدێرنە بەسەر ناوەندی رۆشنبیری کوردیدا و مامەڵە لەگەڵکردنی وەك ئایدیۆلۆژیایەکی هەمەلایەنە و کارلێکی دەروێشانە لەگەڵیدا و مەرگەساتباربوونی واقیعی کوردی و نەپەرژانی کورد و دامەزراوەکانی (گەر هەیبوبێت) بەسەر هەندێ ئەرکی سەرەکی یەکجار درەنگ

[1] مۆدێرنەی بەئایینکراو وەك دەستەواژە، لە (د. بورهان غلیون)م خواستوە.

سەرەتاکانی و وەدەکەون[١] لەناو کورددا رەخنە لە ئیسلام وە ئایین نەك وەك تراديسیۆن و کەلەپوری ئیسلامی، وەك بیروباوەڕو عیبادەت و رەوشت و وەك مەرجەعیەتێکی ژیاری لەو لەحزە مێژووییەوە دەست پێدەکات کەمارکسیزم دەپەڕێتە ناو ناوەندە فکرییە کوردیەکەو تێکەڵ بەجیهانبینی رۆشنبیری کورد دەبێت و لەسەرو مەسەلە نەتەوەییەکەو لەمیانەی باسکردن لەململانێی چینەکان و ئامرازەکانی چینی دەسەلاتداری کۆمەڵ بۆ کۆنترۆڵکردنی خەڵك و ئەو وێنا نێگەتیفەی لەم رووەوە بەئایین دەدرێ دەڕوانێتە ئیسلام، واتە ئەو گۆشەنیگایەی مارکسیزم سەیری رۆڵی ئایینی پێ دەکات گۆشەنیگای پەیوەندی نێوان ئایین و ناسیونالیزم نییە، چونکە ناسیونالیزمیش لەدیدی فەرهەنگە مارکسیەکەوە ئامرازێکی‌تری چەواشەکردن و کەرت و پەرتکردنی ریزە یەکگرتووەکانی چینی بێبەش و پرۆلیتارە تاکو نەپەرژێتە سەر جەنگە سەرەکییەکەی خۆی کە جەنگە لەگەڵ چینی بۆرژوازی، بەڵکو سەیرکردنە کە لە گۆشەنیگای پەیوەندی ئایین و رێ و جێی چینە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە، بەم جۆرەش رەخنە گرتنە کە لەئایین گەرچی دەیەوێت شەرعیەت لەگوتارێکی ناسیونالیستانەوە وەربگرێت، بەڵام لە بنەڕەتدا رەخنەی ناسیونالیزم نییە لە ئایین، بەڵکو لەناوەرۆکدا رەخنەی ئایدیۆلۆژیایەکی بان نەتەوەیە لە ئایین، رەخنەی ئەو ناوەرۆکە کۆمەڵایەتیەیە کەلەقۆناغێکی دیایکراودا تارادەیەکی بەرچاو دەیەوێت ببێتە ناوەرۆکی ناسیونالیزمی کوردی،

---

[١] ئەم رەخنە بەشێوەیەکی فکری و بەرچاوو لەئاستێکدا لەتیۆرەکانی مۆدێرنە خۆی لە دەرچوونی گۆڤاری (رەهەند)ەوە دەست پێ دەکات. بەڵام لەم نێوەندەدا نابێ هەوڵە گرنگەکانی زانای گەورە (مەسعود محمد)مان لە بیر بچێت کە لە سەردەمێکی زۆر هەستیاردا خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی بۆ مارکسیزم خستنە ڕوو .

ڕەخنەگرتن لەم دوو گۆشە نیگا جیاوازەشەوە ناچنە ناویەك سەنگەرەوە، ڕەنگە تاکە (استثناء)ێکی کوردی زەق لەم ڕووەوە (د. عبدالله جودت) بێت، بەڵام دیسانەوە، خۆداڕنینەکەی ئەویش لەئیسلام و ڕەخنەلێگرتنی هەرگیز لە پێگەی ناسیونالیزم و خەمی ناسیونالیزمیانەوە نەبووە یاخود لانی کەم لەو ڕوانگەوە ئەم بۆچوونەی لادروست نەبووە.

چونکە ئەو یەکێ لەدامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی) تورکی بوو، ئەو کۆمەڵەی هەر ئەوەندەی دەسەڵاتیان گرتەدەست تاڵاویان بەکوردو نەتەوە غەیرە تورکەکان نۆشی و بوون بەزێوانەکانی دۆزەخێکی سەرزەمین بۆ کورد، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی کە هەستە دژی ئیسلامیەکەی جەودەت لەوێدا لە سایەی چەمك و ڕێنوێنی و فەزا ئایدیۆلۆژیەکەی ئەو کۆمەڵەیەدا گەشە دەکات، کۆمەڵەیەکی کوردی نەبوو، هێندەی پێ نەچوو سیما شۆڤێنیستی و تورانیزمەکەی بەجوانی وەدەرکەوت کەچۆن پرۆژەکەیان لەسەر تواندنەوەی نەتەوە غەیرە تورکەکان و بەسەنتەرکردنی ڕەگەزی تورکی داڕێژراوە و سەرجەم دروشمە ئاشکراکانیان بۆکات بەڕێکردن و شوێن پێ قایمکردن و چاوبەستکردن بوو، کەواتە ئەم (استثناء)ەی مێژووی سەرەتاکانی ناسیونالیزمی کوردی خەسڵەتی ناسیونالیزم بوون لە ڕەخنەکانی دژ بە ئیسلام دادەماڵێ و ڕەخنەکان دەبەستێتەوە بەپێگەیەکی فکریترو بەشداریکردن لەبزوتنەوەیەکی نانەتەوەییدا کە دواتر سەردەکێشێ بۆ بزاوتێکی دژ بە ناسیونالیزمی کوردی و سەرەنجام جەودەتیش فڕێ دەداتە دەرەوەی سنورە پیرۆزو بەمینچێنراوەکانی خۆی، ئەو ڕەخنەی ئەمڕۆش لەکوردستاندا لەئیسلام دەگێڕێ گەرچی بەشی هەرەزۆری هەوڵدەدات ڕەوایەتی لە ناسیونالیزم و دۆزی

ڕەوای کوردەوە وەربگرێت، بەڵام لەڕاستیدا شەڕی تەوژمێکی فکری سیاسی دیاریکراوی ناو کۆمەڵگایە، شەڕەکەشی بەگوێرەی پێوەر نەتەوەییەکان ئاراستەی دوژمنانی نەتەوەو نەیارە دەرەکیەکان نییە، بەڵکو ئاراستەی خودی کۆمەڵگای کوردی و تەوژمێکی‌تری فکری سیاسی بەرامبەری کوردییە کە ئیلهامی سیاسی خۆی لە ئیسلام وەردەگرێت و خوازیاری ئەوەیە ئیسلام بکاتە ناوەرۆکی بزوتنەوە ناسیۆنالیستیەکە.

## کورد لە زیندانی دەوڵەتی مۆدێرندا

کورد هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە[1] و بەتایبەتیش لەبیستەکانی ئەو سەدەیەدا لەبەرەنجامی پرۆسەیەکی تازەی دابەشکردنی خاك و خەڵکەکەی بەگوێرەی چەندین پەیمانی شوم و لەسەر دەستی کۆلۆنیالیزمی خۆرئاواو بەیارمەتی هاوپەیمانە هەرێمایەتیەکانی خەونەکانی کە لە دروستکردنی قەوارەی سەربەخۆ و یەککگرتنی نەتەوەیی و رزگاربووندا خۆی دەبینییەوە لەبارچون و بەکردەوە کەوتە چوارچێوەی کۆمەڵێ قەوارەی تازە و دەوڵەتی مۆدێرن کە لەسەر کەلاوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دروستبوون و هاتبوونە کایەوە[2] ئیتر لەو رۆژەوە ئەم قەوارە تازانە کە بەدەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم دەناسرێن دەبنە زیندانێکی گەورە بۆ کوردو دەرگای وەرزێکی خوێناوی و قۆناغێکی یەکجار سەخت و دژواری بۆ دەخرێتە

[1] سەدەی ناسیونالیزم لەخۆرهەڵاتدا.

[2] ئاماژەیە بەتورکیاو عێراق و ئێران و سوریا کە وەك چوار وڵاتی هاوچەرخ لەشێوەی مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە)دا دەرکەوتن.

سەرپشت، ئەو شانۆ تراژیدیایەی لەو ساتەوەختەوە لە کوردستاندا دەست بە نمایشکردنی دەکرێت تاکۆتایی هاتنی سەدەکەو تەنانەت تا ئەم لەحزەش دیمەنە جەرگبڕ و مەرگ هێن و خەماویەکانی بەردوامە.

ئەو دەوڵەتە لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی سروشتی پێکنایەت و هەر لەسەرەتاوە تووشی قەیرانی رەوایەتی دەسەڵاتەکەی دێت و نموونەی هەرەباڵاشی کە چاوی لێ بکات، دەوڵەتی نەتەوەیی سەدەی نۆزدەیە لە خۆرئاواو لەقۆناغێکیتردا و بۆهەندێ دەوڵەت، دەوڵەتە سۆشیالیستەکەی بلۆکی رۆژهەڵات و دیموکراسیە میللیەکانەو دەشیەوێت نەتەوە دروستکات ئیتر پێکهاتەیەکی زۆر ناسروشتی دەردەچێت.

ئەگەر چەمکی هەیمەنە لەگرامشی بخوازین لەبەرنەبوونی شەرعیەتێکی مێژوویی و کارکردن لەروانگەی رۆشنبیریەکی سیاسیەوە کە رەمزو بەهاو پێوەرەکان لەکۆمەڵگەی مەدەنی خۆماڵی وەرناگرێ و ئەو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژیەی نییە بتوانێ خەڵك قەناعەت پێ بکات و لەرێی ئەو قەناعەت پێکردنەوە هێزە کۆمەڵایەتیەکان تیایدا دەسەڵات بگرنە دەست بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوەی ستراتیژی دورستکردنی نەتەوەو سەپاندنی مۆدیلە خۆرئاواییەکەی ژیان پشت بە توندوتیژی دەبەستێ هەوڵدەدات ئەو هەیمەنەیە لەرێی ترس خستنەدڵ و تۆقاندن و هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەودام و دەزگا کۆمەڵگاییانەی بەجۆرێ لە جۆرەکانی رەمزن بۆبوونی پانتاییەکی بابچوکیش بێت لە دەرەوەی دەسەڵاتە هەمەلایەنەکەی دەوڵەت دروست بکات و دەستکەوتەکانی مۆدێرنەش لەم پێناوەدا بەجوانی بەکار دەهێنی.

سزاو کۆنترۆڵی ناوەکی واتە جەنگی دەروونی و پاکتاوکردنی جەستەیی وەکو دوو شێوەی بەڕێوەبردنی دەسەڵات و دروستکردنی هەماهەنگی گشتیی رواڵەتی دەگرێتە پێش.

نەك کورد کە هەر لەسەرتاوە دەبێتە بونەوەرێکی نامۆو مەترسیدار لەناو سنورە تەلبەندەکراوەکانی دەوڵەتدا مافی پرسیارکردنی لەدەسەڵات نییەو دەبرێتە ئاستی ئەو کۆیلەی کەهەرچی پێ بکرێت مافی (بۆ) وتنی لە بەردەمی سەردارەکەیدا لێ دەسەنرێتەوە، بەڵکو خودی نەتەوەی باڵادەستیش جگە لەو نوخبەیەی حاکمەو ئەو بازنەیەی پاشکۆی ئەمەو سیاسەتەکانی رەت ناکاتەوە، مافی پرسیارکردنی نییە.

تاکی کورد لەم دەوڵەتە نوێیەدا شانسی ژیانی لەسفر نزیك دەبێتەوە، چونکە هاووڵاتیەکی رەسەن نییە، بەڵکو خودی چەمکی هاووڵاتی شێوانێکی گەورەی بەسەردا دێت.

کورد دەرگاکانی دەوڵەتی بەروودا داخراوە هەر لەبنەڕەتەوە دەوڵەتی ئەونییەو نوێنەرایەتی ئەو ناکات، ئەگەر رێگایەك لەبەردەمدا بێت بۆ بەشداری و خۆدزینەوە لەناو دام و دەزگا سەرکردایەتی و کارگێڕییە بنەرەتی و سەرەکیەکانی دەوڵەت ئەوا ئەو رێگایە رێگای خوداڕنینە لەخودێتی نەتەوەیی و دەستبەرداربوون، لەکەرامەتی ئینسانی و گۆڕانی مرۆڤ لە کائینێکی خاوەن هەست و ناسنامەو شانازیکردن و کەرامەت و مافەوە بۆ ئامرازێکی بێ رۆح و بێگیان و هەربە پەیکەر ئینسان.

کاتێ دەوڵەت رەوایەتیەکی مێژوویی نابێ و دەسەڵاتیش بەرەنجامی رێکەوتنی کۆمەڵایەتی نییەو دەوڵەت کۆمەڵگا هەڵدەلوشێ و دەیەوێت هەڵیوەشێنێتەوە و بەو

جۆرە دروستی دەکاتەوە کە خۆی دیەوێت و پرۆژە نوێخوازیەکەی دەیخوازێت و سەرلەنوێ دەستکاری بونیادو رەمزو فانتازیاکان دەکرێت و دامەزراوەکان بەشوناس و ئەرکی نوێوە دادەمەزرێتەوە کە ئاماژە بەباڵادەستی نەتەوەیی و ئامادەیی ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنە کە بکات، هەر هەموو ئەمانەو چەندین پرۆسەیتری لەم جۆرە کورد لەچوارچێوەی دەوڵەتە مۆدێرنەکەدا دەکەن بەجەستەیەکی نامۆ، ئەم دەوڵەتە کاتێ هەموو بناغەکان و هەل و مەرجەکانی بەیەکەوە ژیانی پێش مۆدێرنە تێکدەشکێنی و دەیانسپێرێت بەمێژوو بەمۆدێلێکی بەسەر چوویان لە قەڵەم دەدات، نەك هەر ناتوانێ جێگرەوە یەك بۆ سەرەتای بەیەکەوە ژیان و هاوولاتێتی یاسایی بدۆزێتەوەو پێشکەش بکات، بەڵکو خۆی هەر وەك دەزگا ئایدیۆلۆژیەکانی بەڕێوەبردن دەبێتە گەورەترین هەڕەشە لەسەر هەرشێویەك لەشێوەکانی بەیەکەوە ژیانی ئارەزومەندانە، دەوڵەتی مۆدێرن لەم مۆدێلەیدا لەباتی ئەوەی هەڵگری پرۆژەیەك بێت بۆبەیەکەوە ژیانی تەواوکارانەی شوناس و رەگەزە جیاوازەکانی کۆمەڵگاو چوارچێوەیەك بێت بۆ لەخۆگرتنی فرە کلتوری و نەژادی و ئەتنێکی، دەگۆڕێت بەکورەیەك بۆتواندنەوەی سەرجەم جیاوازیەکان و شیکردنەوەی جەستەی کۆمەڵگا بۆ کەرەستە سەرەتاییەکانی و دواتر داڕشتنەوەی بەوجۆرەی وەك یەکەیەکی گشتیگر بنوێنێت و دەفری ئەو نەتەوە بێت کە نوخبەی دەسەڵاتدار دەیەوێت بەهۆی زەبرو زەنگ و هەڵکوتانە سەر دەسەڵات و بەکارهێنانی هەمەلایەنەی وزەو توانا و دام و دەزگاکانی دەوڵەت رێگای دروستبوونی کورت بکاتەوە، با ئەمەش لەسەر حیسابی کوشتنی خۆزگەو خەونی ئەوبەشە لەکۆمەڵیش بێت یاخود لەگەڵ بەمانادەستوری و سیاسیەکەی کە بەرژەوەندی لەم تواندنەوەدا

نییەو بوون و کەرامەت و مانەوەی وەك مرۆڤێکی خاوەن رێزو هاوولاتیەکی خاوەن ماف، بەندەبە دانپیانانی وەك خاوەن شوناس و کلتورێکی جیاوازو سەربەخۆ، لەرووی نەتەوەییەوە.

کاتێ دەوڵەتی مۆدێرن دەست دەکات بەپۆلێنکردنی هاوولاتیان لەسەر بناغەی رەگەزو ئینتیمای نەتەوەیی، لەم حاڵەتەدا لە بەردەم دوو ئەگەری ناهەموارو تاڵدایە گەر نکولی لە نەتەوەبوونی دەکرێت مەرگەساتەو گەر دانیشی پیابنرێ لەم حاڵەتەشدا زۆر لەو مەرگەساتەی کەم ناکاتەوەو رزگاری نابێت، چونکە دان پیانانەکە زیاتر لەوەی رێزگرتن لەو بووە جیاوازە بێت دەستنیشانکردنییەتی بۆسرپینەوەو پوکاندنەوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەوەی بەسەر کورددا هات ژینۆسایدی کلتوری بوو هەوڵدانی بەردەوامی نوخبە دەسەلاتدارەکان بووبۆشێواندنی کەسێتی و فەرهەنگ و کلتوری نەتەوەیی کوردی و بێ مێژووکردنی و یاساغکردنی زمانەکەی و کەمکردنەوەی ئەوپانتایی و رووبەندانەی دەکری کورد تیایاندا گوزارشت لەبوون و ئامادەیی سەبەخۆ و تایبەتی خۆی بداتەوە هیچ نەبێت لەسەر ئاستی کلتوریی، کاتێ کوردستان و سەرزەمینی کورد دەبێتە روبەرێکی جوگرافی چوارچێوەی دەوڵەتی مۆدێرن و دەسەلات دەیەوێت مومارەسەی دەسەلاتدارێتی تێدا بکات و بیکات بەنیشتمانی نیشتەجێ بوونی فۆرم و بەهاکانی و رەنگدانەوە یان، کورد لەسەر خاکی خۆی دەبێت بەبێگانە، بێگانەیەك مافی بیانییەکی نییە کەیاسای نێودەوڵەتی و عورفی نێودەوڵەتان دەیکات بەخاوەنی کۆمەڵێ ماف ئەمەش بەرەنجامێکی سروشتی ئەو گۆڕانکاریانەبوون روویاندا کاتێ فۆرمە کۆنەکانی بەیەکەوە ژیان هەڵوەشێرانەوەو هاوولاتی یەکسان لەماف و ئەرکیشدا پەیدانابێ

روبەرە کۆنەکانی پاراستنی خسوسیەت دەسرِێتەوەو روبەری تازەش والآناکرێن ، بەڵکو سیاسەتی نکولی کردن لەوخسوسیەتە پەیرەو دەکرێت ئینتیما بۆدەوڵەتە نوێکە بۆکورد هیچ مانایەکی واناداتـ بەدەستەوە نیشتمانەکەشی دەبێت بەبەشێ لەوخاك و نیشتمانەی دەوڵەتی مۆدێرن و ناسیونالیزمی باڵادەست بەنیشتمانی دەستوریی وجوگرافی خۆی دەزانێ و هەر کاتێکیش دەوڵەت بیەوێت لەرێی لێساندنەوەی ناسنامەو رەگەزنامەوە تاکی کورد لەسەر خاکی خۆی دەکات بەمیوان و تەنانەت بێ بەشی دەکات لە مافەکانی هاووڵاتیەکی ئاسایی، ئەمەش ئەگەر مانایەکی هەبێ برتییە لەپرۆسەی بێ خاك و نیشتمانکردنی کورد.[1]

کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی مۆدێرندا خۆی لە بەردەم دوژمنایەتیکردنێکی بێ بەزەییانەی دام و دەزگاکانی ئەم دەوڵەتەدا بینییەوە.

قوتابخانە دەبێت بەدەزگایەك بۆکوشتن و لەبیربردنەوەی زمان و کاڵکردنەوەی شوناسی، میدیا دەگۆرِێ بە میمبەرێ بۆنکولی کردن لەفەرهەنگ و ئامرازێکی جەنگی دەرونی و قێزەونکردنی کەسێتی و مێژوو بزوتنەوەی نەتەوەیی، ناوەندەکانی توێژینەوەو دام و دەزگا زانستیەکان دەکرێن بەو مەڵبەندانەی کوردی تیدابێ مێژوو و شارستانییەت دەکرێت و واتای نەتەوەی لێ دەسێنرێتەوە.

پەرلەمان ئەو یاسایانە دەردەکات کە باسکردن لەبوون و ماف و ئازادی و جیاوازبوونی ئەم بەتاوانی لێخۆشنەبوو هەوڵدان بۆتێکدانی یەکیەتی گەل و وڵات و

---

[1] بێ ئەوەی لەروانگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە ئەو مافەی هەبووبێت نیشتمانەکەی بەداگیرکراو بزانرێت.

ئیرهاب دەدانێ.[1] دام و دەزگا ئیداریەکان دەبن بە ناوەندێکیتر کە بالآدەستی رەهای ناسیونالیزمی فەرمانڕەوا نمایش دەکەن و کورد لە ناو خاکی خۆی پەراوێزدەخات و لەدەرەوەی بازنەکانی شارەزابوون و هاتنە ناو موممارەسەی ژیانێکی هاوچەرخانە دەهێڵێتەوە، دادگا یاساکانی سزادان پیادە دەکات و بڕیاری زیندانی کردن و هەڵواسینی تتێکۆشەرانی بۆدیاریدەکات سوپاش دەبێت بەو ئامرازە داپلۆسێنەرەی کە هەوڵدەدات بوونی فیزیکی کورد وێرانکات و سیاسەتی بەسوتماککردنی خاك لە کوردستاندا پیادەکات و بەسەرکوتکردنی وەحشیانەی راپەڕینەکان و کوشت وکوشتارو خوێنڕێژی تینوێتی ناسیونالیزمی سەردەست بۆدیتنی ساتە شکۆدارەکانی خۆی بشکێنێ، ئەمەش کاتێ سەربازەکانی لەسەرجەستەی لەخوێن هەڵکێشراوو قوربانیی بێ پەل و پۆی کوردا زەماوەندی سەرکەوتن دەگێڕن و دەگەنە لوتکەی چێژ وەرگرتنی فاشتیانەی خۆیان کەچی سەرەڕای هەموو ئەو واقیعە تراژیدیاو تاریکستانە کۆمەڵگاو یاسایەکی نێودەوڵەتی هەیە منی کورد تەنها بەم قەوارە خوێناوی و بکوژەی خەونەکای منەوە دەناسێتەوەو ئامادە نییە لەدەرەوەی ئەوەوە شوناسێکم پێ بدات. من عێراقیم یان تورکی یان ئێرانی و سوریم، بەدەر لەوە من هیچ نیم، چونکە من دەوڵەتی سەربەخۆو قەوارەی دانپیانراوی نێودەوڵەتیی خۆمم نییە، تەنانەت کاتێ دەڕۆمە ئەورووپاش و پەناهێندە ژیانی تاراوگە هەڵدەبژێرم لەوێش یاساکانی دەوڵەتی مۆدێرن بەدوامەوەن، لەوێش و لەسەر زەمینی غوربەتیش دەوڵەتە ئەورووپیەکە بۆ مامەڵەکردنم رەچاوی پەیمانە مۆرکراوەکانی لەگەڵ دەوڵەتە مۆدیرنەکە دەکات بەم

[1] زەقترین ئەم یاسایانە لەتورکیادابوون کە پارتی دادو گەشەپێدان لەئاستێکدا هەندێ گۆڕانی کردووە.

جۆرەش زیندانەکەی من دەبێت بەزیندانێکی گەڕۆك و کە کۆچیش دەکەم لەکۆڵم نابێتەوەو لەنیشتگای دووەمم ئامادە دەبێتەوەو فشاری رۆحی و جەستەییم دەخاوە سەر.[١]

بەم جۆرە فۆرمیٚ لە مۆدێرنەکە کە لە خۆرهەڵاتدا ئامادە بووە وا لە پشت لەبارچوونی خەونی کوردیی‌یەوە. خەونی ڕزگاری و گەیشتن بە ساتەوەختی دامەزراندنی قەوارە و دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی .

گەر باسێکیش لە ئایین (ئیسلام)یش لەم نێوەندەدا بێتە گۆڕیٚ بە حوکمی بوونی دەسەڵاتگەلێکی هەژمونگەرانە لەو دەوڵەتانەی کوردیان بە سەردا دابەشکراوە، دەبێت هەر لە چوارچێوەی ستراتیژی ئەو مۆدێلە لە مۆدێرنەی فکری و سیاسیی‌دا بۆی ئەوەی لە خوێندنەوەی مێژووی نوێی نەتەوەی کورد و داڕشتنی ستراتیژیەتێکی نەتەوەیی بۆ قۆناغی ئاییندە بە هەڵەدا نەچین تاکو لانی کەم بەشیٚ لەو بێبەشی‌یە ستراتیژی‌یەقەرەبوو بکەینەوە کە بیٚقەوارەیی لەقۆناغی ڕابردوودا بۆی‌دروستکردین.

---

[١] لێرەشەوە ناسیونالیزمی دورمەودا دروست دەبێت کە لە نمونەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی کوردستانی تورکیادا بەجوانی رەنگ دەداتەوە

## سەرەتایەك

دەخوازم ئەوە بەخوێنەرانی بەڕێز بڵێم کە نوسینی ئەم بابەتە چەند هۆکارێکی لەپشتەوە بوو لەوانەش:

١) پەرۆشیی قووڵی نووسەر بۆ بڵاوکردنەوەو و چەسپاندنی دیدێکی ڕۆشن دەربارەی نەتەوایەتی و کێشەی کورد و مەسەلە کوردستانییەکان لەناو بزاڤە ئیسلامییەکەی کوردستان بەگشتی و یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بەتایبەتی، کە بە گشتی لەرووی مێژووییەوە خودان دیدێکی تەقلیدیی حەرەکی ئیسلامی و (اخوان)یی بوو، چونکە ئەم کارەم بە ئەرکێکی روناکبیرانە و ئیسلامیانە و نیشتمانیانەی خۆم دەزانی.

٢) بۆ ئەوەی شان بەشانی دەست و پەنجە نەرمکردنی تەوژمە ئیسلامییەکە لەگەڵ مەسەلە نەتەوەییەکاندا بەحوکمی واقیعەکەو دروستکردنی ڕێکخراوی سیاسی ئاشکرای خۆی و پێداویستییەکانی کاری سیاسی و جەماوەریی، لە رووە تیۆریەکەشەوە ڕێنوێنی بکرێت و بتوانێت رۆشنتر گوزارشت لە دیدگا سیاسییەکان و گوتارو ئەرکە سیاسی و نیشتمانییەکانی بداتەوە.

٣) بۆ زیاتر قۆڵکردنەوەی ئاراستەی ئاشتیخوازی و دژە توند و تیژی لە ناو تەوژمەکەدا .

٤) بۆ رەتدانەوەی ئەو جەنگە دەروونییە گەورەی لەلایەن هەندێ ناوەندی تەوژمی بەرامبەرەوە دەکرایە سەر تەوژمەکەو لەوانەش یەکگرتوو، کە تۆمەتباری دەکرد بەپشت کردن لە ئەرکە نیشتمانی و نەتەوەییەکان و عەربچێتی و چەندین تۆمەتی‌تر، کە ئەمەش لەرووییەکەوە لە قووڵاییدا ئازاری ئەندام و لایەنگرانی تەوژمەکەی دەدا، بەتایبەتیش ئەوانەیان کە کێرڤی ناسیونالیستیەکەیان بەرز بوو، لە رویەکی‌تریشەوە زەمینەی سازدەکرد بۆ پێکدادانی تەوژمەکان لە ناوخۆدا و تامەزرۆییەکی زۆریش لای هەندێ هەبوو بۆ کردنە دەرەوەی ئیسلامییەکان و لەوانەش یەکگرتوو بۆ دەرەوەی بازنە نەتەوەییەکە کە مەترسی هەموو ئەم شتانەش بۆ سەر ناسیونالیزمی کوردی و هەرێم و کۆسپ دروستکردن بۆ زیاتر پێگەیشتنی دیدی ئیسلامی‌یەکان لەم ڕوەوە. روون و ئاشکرا بوو ئەوەندەی پێشمکرابێ هەوڵمداوە بابەتەکە ئەوەندەی بکرێت بەشێوەیەکی نیمچە ئەکادیمی و زانستی بنوسم و راکانم بە بەڵگە هێنانەوە لە ئەدەبیاتی حزبەکە پشت ڕاستبکەمەوەو وەك لێکۆڵینەوەیەکی لێ بێت دەربارەی روێکی ئاراستەی فکری لایەنێکی کوردستانیی.

### دەستپێك

رەنگە توێژینەوەو مشتومڕو باس‌وخواس لەسەر کێشەی کورد و سروشتی کێشەکە و جۆرە چارەسەر و ئاستەنگی بەردەم هەر رێگاچارەیەك کە بۆ کۆتایی پێ

هێنانی دەخرێتەروو، لەو بابەتانەبن کە پێویستیان بەخۆماندووکردنی زیاترو قوڵبوونەوە و کاری زانستی زۆرتر هەبێت .

چونکە پەرەسەندنی مێژوویی کێشەکەو دژواریی واقیعی کوردستان و ئاڵۆزی کێشەکە بەهۆی چەندەها هۆکاری ژیۆسیاسی و ئابوری و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەوەو، تێکەڵاوبونی بە بازنەی بەرژەوەندی جۆراوجۆرو دژ بەیەك، کارێکی وای کردوە دەورەدانی کێشەکە تەنەنات لە رووی تیۆریشەوە خوازیاری هەوڵ و رەنجی زیاتری شارەزایانی کورد و ئاگایانی کێشەکەبێت.

دیارە لێکۆڵینەوە تیۆری و مەیدانییەکان لەخودی خۆیاندا دەتوانن خزمەت بەقووڵبوونەوەی هۆشیاری گەل و رونکردنەوەی ئاسۆکانی بەردەم بزافی رزگاری نیشتمانی کوردستان بکەن و رای گشتیش لەقووڵایی مەرگەساتەکانی کورد و رەوایی و قووڵی کێشەکەی ئاگادار بکەنەوە.

تاوتوێکردنی دیدگای پارت و رێکخراو و بزوتنەوە کوردییەکانیش لەمەڕ سروشتی کێشەی گەلی کوردستان و تەرزی تێڕوانینیان بۆچارەسەرکردنی لەرووی گرنگییەوە هەر دەچێتە ئەو چوارچێوەیەی لەپێشەوە ئاماژەی پێکرا، لەورووەوە کە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی رۆڵەکانی کورد بەرچاو روون بن و بەروونی بەرنامە و دروشم و رێبازی سەرجەم پارت و رێکخراوە کوردیەکان بزانن لەرووی ئاگایی تەواوەوە هەڵوێست وەرگرن و هێزو لایەنەکانیش بەو جۆرە بناسرێن کەلەسەر زەوی واقیعدا هەن، بۆیە لەگەڵ (جدی) بوونی ئەو پرسیارەشدا کە دەڵێ: ئایا سەرەتاو دروشمە ئاشکراکانی (یەکگرتوو) و چەندان ساڵ خەباتی بێ درێخ و بێ منەتانەی بۆ

گەلەکەی لەناو گەلەکەیداو پابەندبوونی بە ئامانجە بالآکانی و سازش نەکردن لەسەر دەسکەوت و سەروەرییەکانی لەژێر هیچ بارودۆخێکدا و بۆهیچ بەرژەوەندیەکی تایبەتی نارەوا، بەس نین بۆ ئەوەی جەماوەرو ناوەندە فیکری و سیاسیەکان و رای گشتی کوردستان هەڵوێستی نەگۆڕی یەکگرتوویان لەم رووەوە بۆ دەربکەوێت؟ بەڵام چەندەها هۆکار وادەکەن کە زیاتر لەسەر نووسین و رونکردنەوەی روانگەی یەکگرتوو لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتیمانەوە بکەنە پێویستیەکی ئەم قۆناغەی کارو خەبات لەکوردستاندا.

بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی لەرووی خوێندنەوەی خۆیان و سەیرکردنی کارنامەی یەکگرتوو لەواقیعی چەند ساڵی رابردووی هەرێمی کوردستاندا، ئومێدیان بەئایندەیەوە بەستووە، لەرووی فیکریشەوە لەسەر رێبازە بەناوبانگەکەی (ابراهیم) - سلاوی خوای لێ بێت - (قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي) زیاتر هۆشیار و دڵنیاین، لە روویەکیتریشەوە هەندێ لەو تەم و مژەش کە دەشێ ئاسۆی بیرکردنەوەی هەندێ ناوەندو بەشێ لەجەماوەری لەم رووەوە لێڵ کردبێت، بڕەوێتەوەو یەکگرتوو وەك چۆن هەیە ئاوا بیناسن و کاریگەری پروپاگەندەی سیاسی و دەرهاویشتەی ململانێی نێوان هێزەکان بڕیاری هەڵەیان پێ دەرنەکات.

هەندێ لەو هۆکارە گرنگانەش کە دەشێ پرسیار بۆ لایەنێکی ئیسلامیی کوردستانی پەیوەست بەپرسی نەتەوەیی و کێشەی کورد دروست بکەن ئەمانەی خوارەوەن:

١) رۆشن نەبوونی دیدی ئیسلامیی لەمەڕ چارەسەرکردنی چەندان کێشەی تازەی دنیای هاوچەرخ لای جەماوەر، لەوانەش کێشەی نەتەوایەتی، چونکە فیکری ئیسلامیی کلاسیکی ئەم بەرپرسانەی لە بەردەمدا نەبووە تاکو قسەیان لەبارەوە بکات، بیری ئیسلامیی هاوچەرخیش لەم رووەوە گەرچی هەندێ گەشەی کردوە، بەڵام بەگوێرەی پێویست خزمەت نەکراوە ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەبەلایەنی کەمەوە لەنیو سەدەی رابردوودا لەکوردستاندا خەبات و خستنە رووی چارەسەرەکان بۆ کێشەکەو هەندێ گیروگرفت و کێشەیتری کۆمەڵگاش لەچوارچێوەی بیری خۆرئاواییدا جێگای کراوەتەوە، لەبەر ئەوە تێزو تێڕوانینە ئیسلامییەکان هێشتا ماویانە بەتەواوی بچنەوە ناو فەرهەنگی رۆژانەی خەڵك بەتایبەتیش ئەو تێزانەی پەیوەندییان بەژیانی سیاسییەوە هەیە.

٢) ئەوپڕوپاگەندە جۆراوجۆرانەی دژی رەوتی ئیسلامیی کوردستان دەکرێت کە گوایە هەڵگری پرۆژەیەکی نێو نەتەوەیی ئیسلامییەو ئیسلامخوازانی کوردستان لەپێناو بەئامانج گەیاندنی کاروانی خەباتی هەقخوازانەی گەلەکەیاندا تێناکۆشن و هەوڵی کپکردنەوە و خامۆشکردنی هەست و جۆشی نەتەوەیی و نیشتمانی کوردی دەدەن و دەیانەوێ کوردایەتی و مافی نەتەوایەتی نەتەوەکەمان لەدڵ و مێشکی گەلی کورددا بسڕنەوە!

٣) ئەو وێنەی لەهۆشی خەڵکیدا سەبارەت بەپەیوەندی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بەتایبەتیش خۆرئاواو بزاڤی ئیسلامی هاوچەرخدا هەیە، کە هەندێ

لەخەڵکی لەژێر کاریگەری پروپاگەندەی سیاسی و لێڵی دیدگاکاندا، وادەزانن ئەم بزاڤە ئیسلامییە کوردستانییەش وەك هەر بزاڤێکی‌تری هاوچەشنی خۆی هەڵوێست و هەنگاوەکانی لەبەر تیشکی ئەو ململانێ و ناکۆکیەدا دادەڕێژێت، نەوەك لەروانگەی ململانێی نێوان گەلی کورد و نەیارەکانیدا!

٤) ئەو دەسەڵات و دەوڵەتانەی کورد کێشەی لەگەڵیاندا هەیە دەسەڵات و دەوڵەتی چەند گەلێکی مسوڵمانی ناوچەکەن لەتورك و عەرەب و فارس، هەندێ خەڵکیش پێی وایە ئیسلامیەکانی کوردستان چارەسەری کێشەکە تەنها لەچوارچێوەی برایەتی ئیسلامیدا دەبیننەوە چەمکی برایەتی ئیسلامییش لای ئەوانە واتە بچوك کردنەوەی کێشەی کوردو وازهێنانە لەقەوارەو دەسەڵاتی نیشتمانی کوردی!

٥) خۆدورگرتنی (یەکگرتوو) لەدروشم بازی و موزایەدەی سیاسی و رەچاوکردنی هەل و مەرجی ناسکی کوردستان و واقیعی ململانێ و ناکۆکی هێزەکانی، کە هەندێ جار سەری کێشاوە بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان بەگوێرەی پێویست ئاگاداری باری سەرنجی یەکگرتوو نەبن دەربارەی کێشەو قەیران و رووداوە جۆراوجۆرەکان.

بەڵام بەدڵنیاییەوە بەشێك لەم تەرزە بیرکردنەوانە گەرچی پاساویشیان هەبوبێت، بەتایبەتی بۆ ئەو کەس و ناوەندانەی لەپەرەسەندنەکانی ناوەندی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخ لە کوردستاندا بەتایبەتی (اجتهاد)ە بوێرەکانی

یەكگرتوو لەو بوارەدا دوورن، بەئاگایی پەیداكردنێكی سەرەتایی بەسەر تێزو هەڵوێست و ستراتیژو بەرنامەو كاری یەكگرتووداو بەستنەوەی بەتۆماری چەند ساڵەی خەبات و تێكۆشانی ئاشتیخوازانەو عەمەلی لەهەرێمی كوردستاندا، دەگەنە ئەو قەناعەتەی كە یەكگرتوو وەك (فكر) و وەك (واقیع)یش ئیزافەیەكی چۆنایەتی گرنگە بۆ رەوتی خەباتی رزگاریخوازانەی گەلی ئارامگری كوردستان لەقۆناغێكی ناسك و مێژوویی و یەكلاكەرەوەی خۆیدا.

### پێگە فكرییەكانی تێڕوانینی یەكگرتوو بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و كێشەی كورد

یەكگرتووی ئیسلامیی كوردستان وەك رەوتێكی فیكری و حزبێكی سیاسی كوردستانی هەر لەسەرەتای ئاشكرابوونی چالاكی سیاسییەوە راشكاوانە روو بەرووی واقیع بۆتەوە وەك پارتێ كە مەرجەعیەتی فیكری و ژیاری ئیسلامیی خۆی بەجەماوەری كوردستان ناساندووە، دیدگاو هەڵوێستەكانیشی رەنگدانەوەی ئەو سەرەتا فیكریانە و رەچاوكردنی بەرژەوەندی گەلی كوردستان و بزاڤە نیشتمانییەكەی بووە.

گەر لەم روكارەوە سەبارەت بەكێشەی گەلی كورد و پرسی نەتەوەیی چاوێ بەئەدەبیاتی چەند ساڵی رابردووی(یەكگرتوو) دابخشێنین و بیخەینە بەر سەرنجی وردەوە، تێدەگەین كە تێڕوانینی بۆكێشەی رەوای گەلەكەی تەنها هەڵوێستێكی سیاسی رووت نییە، بەڵكو هەڵقووڵاوی كۆمەڵێ سەرەتا (مبادیء)و پێگە (منطلق)ی فكرییە، كە ئەمەش تێڕوانینە كە لەوە دەردەكات كە تەنها هەڵوێست گرتنێكی كاتی

و مەرحەلی و رووکەشی عاتیفی بێت، بەڵکو پەیوەستە بەو پێگە فیکری و عەقیدیانەی بەشێکی گرنگن لەبناغەو پایەکانی هەر پرۆژەیەکی ئیسلامیی رەسەن و بزافێکی ئیسلامیی راستەقینە، لێرەشدا ئاماژە بەگرنگترین ئەو سەرەتاو پێگە فکریانە دەکەین:

یەکەم: تیۆری جێنشینی و شکۆمەندی مرۆڤ لەسەر زەویدا لەروانگەی ئیسلامەوە مرۆڤ جێنشینێتی لەئەستۆدایە، خوای گەورە بۆیە بەدیهێناوە تاکو زەوی ئاوەدان بکاتەوە، هەموو بنەماکانی ژیانێکی سەربەرزانەو ئابڕوومەندانەشی لەزەویدا بۆ فەراهەم کردووە، ژیانێ شایستەی شکۆو پلەو پایەی مرۆڤ بێت[1] ئەمەش دەخوازێت مرۆڤ ئازادبێت و مافەکانی پارێزراوبن و رێگا لە بەردەم گەشەدان بەوزەو تواناکانیدا والابێت، بۆ ئەوەی لە دەوڵەمەندکردنی شارستانێتی مرۆڤایەتیدا بەکاریان بهێنێت و خۆشی بەختەوەرو ئاسودەبێت، مرۆڤی کورد کاتێ لەژێر باری گرانی بێ بەشی و چەوساندنەوەو ستەمدا بناڵێنی و لەمافە ئینسانییەکانی بێبەش بێت و توانا و لێهاتنەکانی تێکبشکێنرێن و هەوڵی سڕینەوەی تایبەتمەندی و ناسنامەی سەربەخۆی بدرێت و لەناو ماڵ و زێدی باب و باپیرانیدا حیسابی بێگانەشی بۆ نەکرێت، هەروەها تووشی چەندەها ماڵوێرانی و ئاوارەیی و کوێرەوەری و چەرمەسەری بێت و لەژێر سایەی باڵی رەشی سەرکوت و تۆقاندندا بژیت، دەبێت چۆن بتوانێت ئەرکی جێنشینییەتی راپەڕێنێ و بەشداری ئاوەدانکردنەوەی زەوی و پێشخستنی ژیانی مرۆڤایەتی بکات؟!

---

[1] الاتحاد الاسلامي في كوردستان. منطلقات ومواقف ص١٤.

ئیسلام کە وەکو مرۆڤ ڕێز لە مرۆڤ دەگرێت (ولقد کرمنا بني آدم) روون و ئاشکرایە کە نەك هەموو جۆرە بێڕێزی و سوکایەتییەك لەبەرامبەر بەمرۆڤ ڕەت دەکاتەوە، بەڵکو ئیدانەی توندیشی دەکات، هەمووش دەزانین کە چۆن ساڵەهای ساڵ بەپێچەوانەوەی ئەم سەرەتا قورئانییە مەزنەوە ستەم لە مرۆڤی کورد و شوناس و (مقدسات)ی دەکرێت، لەم ڕوانگەوەو ئەم واقیعە تاڵە تێکۆشانی هەمەلایەنە بۆکۆتایی هێنان بەم بارە ناهەموارەو ڕزگارکردنی مرۆڤی کورد لە چنگاڵی ڕەش و نەگریسی چەوساندنەوە بێ ماف، بۆ جوڵانەوەیەکی ئیسلامخوازی هەڵقوڵاو لەناخی میللەتەکەی دەکاتە ئەرکێکی دەستبەجێ و سەرەکی پیرۆز.

دووەم: بوونی گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکان ڕەنگدانەوەی ویستی خوای گەورە و ڕاستییەکی گەردوونییە خوای گەورە دەفەرموێت (وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأرْضِ وَاخْتِلاَفُ ألْسِنَتِكُمْ وَألْوَانِكُمْ)[1] واتە: لەنیشانەو بەڵگەکانی خوای گەورە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی ڕەنگ و زمانتانە، کەواتە پێکهاتنی گروپی مرۆڤایەتی جۆراوجۆر لە گەل و نەتەوەکان کە هەریەکەیان خاوەنی داب و نەریت و فەرهەنگ و خەسڵەتی تایبەت بەخۆی بێت و ئەمەش لە گروپەکانیتری جیا بکاتەوە، شتێکی خواییە[2].

واتە قورئان دان بەوەدا دەنێ کە گروپی مرۆڤایەتی جۆراوجۆر هەن لەسەر بناغەی زمان و فەرهەنگی هاوبەش و هەست کردن بەتایبەتمەندی خۆیان دروست

---

[1] الروم/٢٢

[2] پەیامی ڕاستی ژمارە (٥١) نیسانی ١٩٩٨ ل٦٤.

بوون[١] بەسەرنجدان لەم بنەڕەتە قورئانییە یەککگرتوو بەبایەخێکی زۆرەوە دەڕوانێتە ڕۆڵی زمانی کوردی وەك یەکێ لەگرنگترین توخمە پێکهێنەرەکانی نەتەوەی کوردو نەتەوایەتی کوردی، سەیردەکەین لەسەر زاری ئەندامێکی سەرکردایەتی خۆیەوە (مامۆستا عبدالرحمن صدیق) بەهەستێکی پاکی ئیسلامخوازانە و کوردانەوە و خوێنگەرمی و پەرۆشییەکی زۆرەوە و لەسۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی مێژووییەوە، بەداکۆکییەوە داوا لە ناوەندە ڕۆشنبیر و سیاسییەکان و کاربەدەستان دەکات کە هەنگاوی جددی بەرەو کاراکردنی ڕۆڵی سیاسی زمانی کوردی هەڵگرن.

هەر لەم میانەدا داوا دەکات:

١) بەرهەمەکانی ئێستا و داهاتوو بەزمانی کوردی تۆمار بکرێن.

٢) پێویستە وابیر بکەینەوە کە ئاخاوتن و نووسین بەزمانی کوردی ئەرکێکی شەرعییە و زیندوو ڕاگرتنی زمانی نەتەوەییمان بریتییە لەزیندوو ڕاگرتنی بەڵگەو نیشانەیەکی خوای گەورە، ئێمە کوردین و زمانمان کوردییە و کوردستانی بۆکردووین بەنیشتمان.

٣) پێویستە ئیسلامخوازان بەزمانی کوردی پەیامەکەی خۆیان ڕابگەیەنن.

٤) هەوڵ بدرێت گەلانی دراوسێ و کاربەدەستانیان تێبگەیەنرێت کە هەوڵدان بۆ سڕینەوەی زمانی کوردی لەهەر بەشێکی کوردستاندا وەك هەوڵدانە بۆ سڕینەوەی بەڵگەیەکی خوای گەورە و ئەمەش تاوانە.

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو

٥) زمانی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمی خوێندن لە قوتابخانەکان و سەرجەم دەزگا و فەرمانگەکانی هەرێمدا.

٦) بە ڕەسمی ناسینی زمانی کوردی لە گشت کۆڕ و کۆمەڵ و سیمینارە جۆراوجۆرەکان و دیدارە ڕۆژنامەگەرییەکان لە هەرێمی کوردستاندا.

هەروەها داوای پێکهێنانی زمانی یەکگرتووی کوردی دەکات و داواش دەکات وانەی زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا زیاتر بایەخی پێبدرێت و سەرکردە کوردیەکانیش لە چاوپێکەوتن و دیدارەکانیاندا لەگەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەناوخۆ و دەرەوەی هەرێمدا زمانی کوردی بەکار بهێنن.[1]

هەروەها نوێنەری یەکگرتوو لەدیالۆگی عەرەبی کوردیدا لە قاهیرە لەوتاری خۆیدا لە بەردەم ئامادەبوواندا داوای لەڕووناکبیرانی جیهانی عەرەبی بەگشتی دەکات وەك بەشێ لە پتەوکردنی پایەکانی دیالۆگی نێوان هەردوو نەتەوەی کورد و عەرەب هەوڵدەن بۆ کردنەوەی بەشی زمانی کوردی وەك یەکێ لەزمانە ڕۆژهەڵاتییە زیندوەکان لە کۆلیژەکانی زمان لەزانکۆ عەرەبییەکاندا.[2]

یەکگرتوو هەموو ئەو هەوڵانەی دراوە و دەدرێن بۆ گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی کورد و زمان و فەرهەنگی کوردی کە مەبەست تیایدا هەوڵدانە بۆ سڕینەوەی بوونی کورد وەك نەتەوە و لاوازکردنی هەست بەبوونی خۆکردنی ڕۆڵەکانی و کارکردن بۆ تواندنەوەیان لە بۆتەی زمان و فەرهەنگی نەتەوەی باڵادەستدا، بەهەوڵ و کارێکی

---

[1] ڕۆژنامەی (یەکگرتوو) ژمارە (٢١٢)، ١٩٩٨/١١/٦.

[2] ڕۆژنامەی (یەکگرتوو ) ژمارە (١٩٢)، ١٩٩٨/٦/١٩.

دژی ئیسلامیی دەداتە قەڵەم، چونکە بەحوکمی ئیسلامییبوونی بڕوای وایە (گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی گەلان و زمانیان وەستانە بەدژی ئیرادەی خوای گەورە)[1] و (یەکێ لەو ستەمانەی لەکورد کراوە ستەمکردنە لە فەرهەنگی کوردی و بێبەش کردنی رۆڵەکانییەتی لەبەکارهێنانی زمانی زگماکی خۆیان).

(يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)[2]

(بەئاماژە بەم ئایەتەی سەرەوە پەروەردگار گەل و نەتەوەکانی بەزمان و داب و نەریت و رەنگ و ژینگەی جیا جیاوە بەدیهێناوە بۆ ئەوەی پێکەوە بژین و هاوکارو تەبابن، رێز لەبوون و ژیان و ئازادی و تایبەتمەندییە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکانی یەکتر بگرن و لەپێناو تەواوکاری کاروانی ژیانی مرۆڤایەتیدا هەر لایەك بەگوێرەی ئەولێهاتن و لێوەشاوەییەی کە هەیەتی و وشەی (لتعارفوا)ش کە پەیامی پێکەوە ژیانی گەلان بەرجەستە دەکات. بەلای کەم واتای لێك نزیکبونەوەی دوو قەوارەی ئازاد و دوو بڕیاری ئازاد دەگەیەنێت.

چونکە لێکگەیشتن و یەکترناسین و هاوکاری و تەبایی هەرگیز لەنێوان دوو نەتەوەو هۆزی نابەرامبەرو ناهاوتا (یەکێك سەروەر و باڵادەست و یەکێك رەنجبەر و بن دەست) دروست نەبووەو نابێت.

---

[1] رۆژنامەی (یەکگرتوو) ژمارە (٢١٦)، ١٩٩٨/١٢/٤.

[2] الحجرات/١٣

سڕینەوە و تواندنەوەی نەتەوەیەك و بەسوتماککردنی خاکەکەی ڕاستەوڕاست پێچەوانەی فەرمانی (لتعارفوا)وە ئێمەی کورد گەلێکی ڕەوەندیان نەتەوەیەکی تازە پێکهاتوو نین، ئێمە نەتەوەیەکی گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نەتەوەیەکی ناوجەرگەی گەلانی مسوڵمانین و ڕەگ و ریشەمان بەقووڵایی مێژوودا ڕۆچووە).[1]

بەڵام بۆ یەکترناسین و هاوکاری ئەو ئازادییەی (بۆ مرۆڤێك بۆ میللەتێك پێویستە دروشمی ئێمەیەو بۆی تێ دەکۆشین، بڕوامان پێیەتی و بەبەشێکی گەورە لەئایینی خۆمانی دەزانین).[2]

کەواتە دەبێت (پێداویستی و (مترتبات)ی بونی گەلان گرنگیان پێبدرێت و بپارێزرێت، هەر مافێك کە ڕەوا بێت نەك هەر دەبێت کەدانی پیا بنرێت، بەڵکو دەبێت گەشەی پێ بدرێت و لەچوارچێوەی پڕاوپڕی خۆیدا هەقی پێ بدرێت، هەر لەپاراستنی زمان و شێوەو تادەگاتە مافی بەشداری لەهەر پرۆژەیەکی پەسەند لای خواو خەڵکی خوا)[3]

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٨٧) ١٩٩٦/٤/١٩ دەقی وتاری یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لە فیستیڤاڵی یادی ژینۆساید و کوردقڕان لە ئەنفالەکاندا و ڕێپێوان بۆ بەردەم بارەگای UN لەسلێمانی ١٩٩٦/٤/١٤.

[2] یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان (دید و هەڵوێست) کۆمەڵێ دیدار و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی مامۆستا سەلاحەدین ئەمینداری گشتی یەکگرتوو، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان زنجیرە (٢) چاپی یەکەم ١٩٩٧ ل٤١.

[3] تیشکێك لەسەر پرۆگرامی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بنەماکان، ئامانجەکان، هۆکارەکان، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان زنجیرە (٤) چاپی یەکەم ١٩٩٨ ل٦٤.

سێهەم: یەکسانی گەل و نەتەوەکان لەروانگەی ئیسلامەوە پێویست بەبەڵگە هێنانەوە ناکات لە ئیسلامدا گەلی هەڵبژێردراوی خوا بونی نییە، چونکە ئیسلام بۆ سەرجەم گەل و نەتەوەکانی جیهانەو پەیامێکی جیهانییە.

لەبەر ئەوە تایبەت نییە بەگەل و نەتەوەو گروپ و هەرێمێکی دیاری کراوەوە، هەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەندێ جار لەلایەن هەندێ کەسی گومان لێکراوەوە هەوڵی (استغلال)کردنی ئیسلام نەدراوە بەپێچەوانەوە لێرەو لەوێ زۆر روویداوە ئەو کەس و لایەنانە ویستویانە بەگوێرە بەرژەوەندی نارەوای خۆیان لێکدانەوەیەکی نادروست بۆدەقە ئیسلامیەکان بکەن و مێژوو ژیاری ئیسلامیی لەرێی ئەو تیۆرانەوە لێکدەنەوە کە بڕوایان پێیەتی، هەروەك ناسیۆنالیزمی عەرەب لەم سەدەیەدا هەوڵی دەدا بانگەشەکەی بەئارایشی ئیسلامی بشارێتەوە هەڵبەتە لەوشوێن و لەوبڕگە مێژوویيانەدا کە بەپێویستی زانیبێ.

بەڵام سەدان هەوڵی لەم جۆرە جگە لە ئاکامی هیچی بەدواوە نابێت و لە بەردەم چیای سەرکەشی راستییە مەزنەکانی ئیسلام و پەیامە یەکسانیخوازەکەیدا دەپوکێتەوە و سەرەنجام لەروو هەڵدەماڵرێت، ئیسلامیی بوون هەمیشە مۆرکی ئەو گەلانی بووە کە هەڵیان گرتووەو پەیڕەویان کردووە.

خوای گەورە زمان و رەنگ و رەگەزی نەکردووە بە تەرازو بۆ رێزدانی یەکێ بەسەر یەکێکیتردا، تاهەندێ کەس واحاڵی بن کە ستەمکردن لە کەسانیتر و بێبەشکردنیان لەمافەکانیان و بەکارهێنانیان لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا، رێ پێدراوە شتی لەوجۆرە نەشەرع و نەعەقڵ پەسەندی ناکات و دانیپیانانێت، بەڵکو

ئیسلام ئەمە بەبیرکردنەوە و هەستێکی نەفامانە دەداتە قەڵەم[١] کەچی وەك (منطلقات ومواقف)ی یەککگرتوو ئاماژەی پێ دەکات گەلی کورد لەکاتێکدا هیچی کەمتر نییە لەگەلانی دراوسێی، بەڵام سەرەڕای ئەوە لەمافە ئابوری و سیاسی و فەرهەنگیەکانی و تەنانەت مرۆڤی کورد لەمافە شەخسییەکانیش بێ بەش کراوەو چەندان پیلان داڕێژراوە بۆ سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوایەتییەکەی بەبێ ئەوەی تاوانێکی ئەنجام دابێت.[٢]

لەم روانگەوە یەککگرتوو هەموو (فکرە و رێباز و دەسەڵاتی رەت دەکاتەوە کە لەسەر بناغەی رێزدانی نەتەوەیەك بەسەر نەتەوەیەکیتردا، یاخود رەگەزپەرستی و ستەمکردن لە کەسانیتر و نکوڵی کردن لەمافە رەواکانیان لەسەر بنچینەی ئینتیمای نەتەوەییانەوە، داڕێژرابێت).[٣]

لەپاڵ ئەمەدا (هەموو خەباتێك بۆ بەدیهێنانی هەق و نەهێشتنی ئەو ستەمەی لەئارادایە بەرێگای مەشروعی خۆی رەوایە، بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەمووﻻیەکە، یەککگرتوو دان دەنێ بەوەی کە خوای گەورە دانی پیاناوە لەئازادی مرۆڤ و مافی گەلان. هەروەها ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە لە مافەکانی هەموو گەلێك، وەك بەشێ لە داواکاریەکانمان و ئامانجی پرۆژەکەمان داوای دەکەین.[٤]

---

[١] منطلقات و مواقف ص١٤.

[٢] هەمان سەرچاوە ص١٣.

[٣] هەمان سەرچاوە ص١٥.

[٤] هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

(هەرشتێکیش لەگەڵ ئەم بنچینەدا ناکۆك بێت، لە ستەم و کوشت و بڕو ئازارو سزاو جەزرەبەو بەعەرەب کردن و دەربەدەرکردن، بەشێوازی تایبەتی خۆمان و لەگەڵ سەرجەم ئەوانەی راستگۆیانە بۆبەدەست هێنانی ئەم مافانە تێدەکۆشن، تێدەکۆشین و خەبات دەکەین. ئەو مافانەی کە شۆڤێنییەتی عەرەبی و تورکی و فارسی و رووسی خواردوویانە و هەوڵدەدەین بۆ کۆتایی هێنان بەو زوڵم و زۆرەی لەئارادایە[1]. هەروەها یەککرتوو دژایەتی هەموو ئەوانەش دەکات کە کار بۆ رەگ داکوتانی ئەم ستەمە نەتەوەییە دەکەن و بەبیانووی جۆراوجۆر پاساو بۆ درێژەکێشانی دەهێننەوە[2]. چونکە (ئیسلام نەتەوەکان وەك برای یەك سەیر دەکات و مافی هەریەکەیان بەسروشتی دەبینێت[3]. هەر بۆیە یەککرتوو وەك لایەنێکی ئیسلامیی کوردستانی ناتوانێت بێدەنگ بێت و رازی بێت بەباڵادەستی هیچ نەتەوەیەکەوە بەسەر نەتەوەی کوردا، هەروەها بەرامبەر ئەو ناهەقی و ستەمەی لەرۆڵەکانی دەکرێت و هەندێ جار وەك هاووڵاتی پلە دوو و سێش سەیر ناکرێن،، چونکە نابەرامبەری و نایەکسانی نێوان گەلانی ناوچەکەو بەتایبەتیش گەلی کوردو گەلانی دراوسێی گەورەترین زەبری کوشندەی لە برایەتیان دەوەشێنێت و ئاشتی و هێمنی و گەشەکردنی هەرێمەکەش دەخاتە بەردەم. هەڕەشەو لەبارنە داخراوەکانی توندوتیژی و تەنگژە جۆراوجۆرەکاندا دەیهێڵێتەوە، هەر پرۆژەیەکی ئیسلامی

---

[1] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو

[2] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

[3] دیمانە: گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانی بەڕێز مامۆستا سەلاحەدین لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی راگەیاندنی یەککرتووی ئیسلامیی کوردستان (٥) ١٩٩٨ لاپەڕە ١٤.

کوردی و غەیری کوردیش گەر لەباریا نەبێت چارەسەرێکی ریشەیی بۆ ئەو نایەکسانی و نابەرابەرییە بدۆزێتەوە و نەتوانێت هاوسەنگی بۆ پەیوەندی نێوان گەلانی دەڤەرەکە بگێڕێتەوە، ناتوانین بڵێین پرۆژەیەکی رەسەن و واقیعییە و ئاییندەیەکی گەشیش چاوەڕێی ناکات.

**چوارەم: هەڵوێستی توندی ئیسلام بەرامبەر ستەم و دەست بەسەراگرتن (الظلم والاغتصاب):** گەر بڵێین جەوهەری ئیسلام بریتییە لە هەوڵدان بۆ رەگ دەرکێشانی ستەم لە بەرگە جۆراوجۆرەکانیدا، رەنگە زیادەڕەویمان نەکردبێت.

هیچ بیر و فەلسەفە و رێبازێك لەمێژوودا تا ئێستا ئەوەندەی ئیسلام دژی ستەم و ستەمکاری نەبووە و نییە، بەجۆرێك کاتێ مرۆڤ چاوێکی سەرپێیی بەقورئاندا دەگێڕێت سەری سوڕ دەمێنێ کۆمەڵێ خۆیان بەمسوڵمان بزانن و لە بەرامبەر ستەمەوە بێ دەنگ و بێ هەڵوێست بن یاخود ستەم لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا جێگای بێتەوە!

یەکگرتوو وەك بزاڤێکی ئیسلامخواز و لەبەر تیشکی ئەو راستییەدا چاك دەزانێت کە ستەم و ناڕەوایی لەئاییینی خوادا حەرامە (یاعبادي اني حرمت الظلم علي نفسي وجعلته بینكم محرما).[١]

گەلی کوردیش گەلێکی ستەملێکراوە (بەهۆی دابەشکردنی وڵاتەکەی بەسەر عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا و روسیادا، بەوجۆرەی کە بەرژەوەندی وڵاتانی

---

[١] بەیاننامەی راگەیاندنی یەکگرتوو، لیژنەی سەرکردایەتی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان ١٩٩٤/٢/٦.

ئیستیعماری و بەگوێرەی پەیمانی (سایکس بیکۆ) خواستویەتی، لەم سەردەمەدا تووشی ستەمێکی مێژوویی هاتووە و تاکو ئێستاکەش بەدەستییەوە دەناڵێنی.[١]

کەواتە کێشەی کورد کێشەی گەلێکی مسوڵمانی لێقەوماوە.[٢] هەر بۆیە بەدەمەوە چوونی کێشەکە ئەرکێکی ئیسلامیی و خواناسانەیە.[٣]

تێکۆشان لەپێناو رزگاری و سەرفرازی گەلی کوردو چارەسەرکردنی کێشەکەی خەبات کردنە دژی ستەم و چەوساندنەوە، کە ئەم خەباتەش مۆرکی جیاکەرەوەی هەر کۆمەڵ و کۆمەڵگاو بزافێکی ئیسلامخوازە لەم جیهانەدا (والذين اذا اصابهم البغي هم ينتصرون)[٤]

ئەمڕۆ کورد گەورەترین گەلی چەوساوەی سەر ئەم زەمینەیە.[٥]

قورئانیش تێکۆشان و شەرکردن لەپێناوی چەوساوەو رەش و رووتەکاندا بەتێکۆشان لەپێناو خوادا دەداتە قەڵەم بەتوندیش سەرزەنشتی ئەوکەسانە دەکات کە بەرامبەر زوڵم و نارەوایی و خۆسەپاندن بێخەم و بێ هەڵوێستن (وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنْ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ

---

[١] رۆژنامەی یەکگرتوو (١٥٣) ١٩٩٧/٩/٥.

[٢] یەکگرتوو ژمارە (٢٩)-١٩٩٥/١٠ چاوپێکەوتنی بەڕێز مامۆستا سەلاحەدین لەگەڵ رۆژنامەی یەکگرتوودا بەبۆنەی یەکەمین ساڵرۆژی ئیعلانکردنی یەکگرتووەوە

[٣] هەمان ژمارەی یەکگرتوو.

[٤] قورئانی پیرۆز سورەتی (الشورى) ئایەتی/٣٩.

[٥] رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (١٩٥) ١٩٩٨/٧/١٠ دەقی چاوپێکەوتنی بەڕێز مامۆستا (محمد فرج) ئەندامی مەکتەبی سیاسی و نوێنەری یەکگرتوو لەدیالۆگی (عەرەبی کوردی)دا.

رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا)[١].

بەئیلهام وەرگرتن لەم فەرهەنگە دەوڵەمەندەی دژایەتی کردنی ستەم، یەککگرتوو نەك هەرتێکۆشان لەپێناو رزگارکردنی نەتەوەکەی خۆی (کە نەتەوەیەکی مسوڵمان و رەسەنە) بەئەرکی خۆی و هەموو دڵسۆز و ئیسلامخوازێك دەزانێت، بەڵکو (پشتگیری کردنی لەگەڵ ستەملێکراوەکان و لایەنگری کێشە رەواکانیان[٢]ی بەدوور لەهەر ئیعتیبارێکی ئایینی و مەزهەبی و نەتەوەیی و تەنها لەسۆنگەی ستەملێکردنیانەوە، بەیەکێ لە ئامانجەکانی خۆی دیاری کردوە، چونکە هەڵوێستی ئیسلامی بەرامبەر ستەم روونە، ئەویش ئەوەیە ستەم هەر ستەمە بەرامبەر هەرکەس بکرێت[٣] لەم کلاورۆژنە مرۆڤ دۆستانەوەیە کە یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان دەنگی خۆی دەخاتە پاڵ دەنگی هەموو ئەو گەل و نەتەوە ستەم لێکراوانەی جیهان کە لە مافە سەرەتاییەکان بێبەش کراون و لەهەوڵ و خەباتدان بۆ سەندنەوەی مافەکانیان[٤].

پێنجەم: هەق بوون و عادیلانە بونی کێشەی کورد؛ مەسەلەی چەسپاندنی دادپەروەری کە راماڵینی شێوازەکانی ستەم و نابەرامبەری لەخۆ دەگرێت، لە ئیسلامدا مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ و ناوەندییە (تەنەنات ئامانج لەناردنی

---

[١] قورئانی پیرۆز سورەتی (النساء) ئایەتی / ٧٥.

[٢] بەپێرەوو پرۆگرامی ناوخۆی یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان (پەیرەوکراوی کۆنگرەی دووەم ) ئامانجەکان

[٣] تیشکێك ل٩٠.

[٤] هەمان سەرچاوە

پێغەمبەران لەدیدی ئیسلامدا هەڵگیرانی سەم و زۆرداریییە ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ)[1] واتە: بەراستی پێغەمبەرانمان بەچەندین پەیامی ڕێ ڕۆشنکرەوە ناردووەو نامەی خوامان لەگەڵ ناردوون و پێوانگ و تەرازووی ڕاست و ناراستمان پێداون بۆ ئەوەی دادپەروەری و یەکسانی لەناو خەڵکیدا دابمەزرێ، بەڵێ فەرموویەتی (لەنێو خەڵکیدا) نەك تەنها لەنێو موسڵماناندا[2] وەك لەئایەتەکەدا ڕۆشنبۆوە دادپەروەری لەئیسلامدا تەنها گەل و نەتەوەو خەڵکە مسوڵمانەکان ناگرێتەوە، بەڵکو دەبێ پەیوەندی نێوان سەرجەم گەل و نەتەوەو ئایین و ئایدیاکانی دنیا ڕێك بخات.

واتە (ئەسڵی پەیوەندی گەلانی مسوڵمان و غەیرە مسوڵمانە ئاشتی ویستەکان پەیوەندییە لەسەر بناغەی (چاکەکاری) و (دادپەروەری) (لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[3].

واتە: خوا قەدەغەتان لێ ناکات کەئێوەی مسوڵمان (چاکەکاری) و (دادپەروەری) بکەن لەگەڵ ئەوانەدا کە لەسەر دین شەڕتان لەگەڵ ناکەن و لەوڵاتاتی خۆتان وەدەرتان نانێن، چونکە بەراستی خوای گەورە دادخوازانی خۆش دەوێت.

---

[1] سورەتی (الحدید) ئایەتی / ٢٥.

[2] تیشکێك ل٩٠ ـ ٩١.

[3] الممتحنە/٨

هەر لەم رووەوە خوای مەزن روو دەکاتە باوەڕداران و دەفەرموێت (یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا کُونُوا قَوَّامِینَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ)[١].

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنا و زۆر بەباشی بەئەرکی دادپەروەری و یەکسانی هەستن، ئێوە شایەت بن و لەپێناو خوادا هەق و راستی بگەیەنن[٢].

بێگومان هەرکەسێك کەعەودالّی دادو یەکسانی و بەرقەراربونی عەدالەت بێت، ئازادی و نابەرابەری دژ بەهەر کەس، هەر وڵات و گەل و نەتەوەیەك رەت دەکاتەوە[٣].

لەم دەقانە و لەچەندەها دەق و رێنوێنی سەرەتاییتری ئیسلامیدا بەروونی ئەو راستیە دەردەکەوێت کەمرۆڤ و بزاڤێکی ئیسلامخواز یەکێ لە سیفەتە هەرە بنەڕەتیەکانی خەباتی نەپساوەو تێکۆشانی بوێرانەیە لەپێناوی چەسپاندنی حەق و دایەروەری و روخاندنی تەلاری ناحەقی و نابەرابەری، کێشەی کوردیش کێشەیەکی حەق و عادیلانەیە[٤].

لەژێر تیشکی ئەو راستییانەی سەرەوەدا یەککرتوو تێگەیشتنی خۆی بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی خەباتی مێژوویی و کێشەی رەوای گەلەکەمان دیاری دەکات.

---

[١] النسا /١٣٥

[٢] هەمان سەرچاوە لاپەرە ٩١.

[٣] هەمان سەرچاوە ل٩٢.

[٤] دیمانە ل١٧.

ئەوەتا مامۆستا (سەلاحەدین) ئەمینداری گشتی یەکگرتوو لەم بارەیەوە دەڵێت (ئێمە تێگەیشتنمان لە مەسەلەکانی نەتەوایەتی ئەوەیە کە ئەوە حەقێکی خواییە، خوا داوێتی، (جعل)ێکی ئیلاهییە لەئایەتی خوایە کە خەڵك جیاوازبن لە رەنگیان و زمانیان و کارێکی خوایە کە خەڵك بە (شعوب) و (قبائل) دروست بووە، ئینجا شەریعەتی خوا ئەوەی پشتگوێ نەخستووە، هەقی هیچ فەردێك بەسەر هیچ فەردێکیترەوە نەفەوتاوە، وەختێکیش وایە مەسەلەی نەتەوایەتی غەریب نییە لە عالەمی ئیسلامیی یان لەفیکری ئیسلامیی، بەڵام بەو مەفهومەی خۆی نەتەوەکە گەلێ بکەینە (شعب الله المختار) نەتەوەیەك تەفزیل بدرێت بەسەر لایەکیتردا، ئێمە وادەبینین کە میللەتی کورد کێشەیەکی هەیە، کێشەیەکی رەوا و (عادل)ی هەیە، میللەتێکی مسوڵمانەو کێشەیەکی هەیە ئەو کێشەیەی هەقە، بۆگەیشتن بەئامانجی هەقانییەت لەو کێشەیەدا، هەنگاو نراوە، بە واتایەکیتر (بزوتنەوەکان) و (کۆڕ و کۆمەڵەکان) هەوڵیانداوە، هەوڵەکان لەپێشدا تێکهەڵکێش بوون لەگەڵ ئیسلامەتیدا کەسایەتی ئیسلامیی هەوڵی دابینکردنی مافی میللەتیاندەدا، وەکو (شێخ عوبەیدوڵلا) و (شێخ محمود) و (شێخ سەعید) و (قازی محەمەد) و (مەلا مستەفا) و.. هتد - هەموویان بەر رەحمەتی خوا بکەون -، ئەو هەوڵانە سروشتییە کە تێکهەڵکێش بوون، هەوڵەکانی ئیسلامیی بوون لەهەمان کاتیشدا میللیش بوون، دوایی کەم کەم بەحوکمی بڵاوبونەوەی ئەفکاریتر هەوڵ و تێکۆشان بە تەعبیرێکیتر عەلمانی دروست بوو بۆ نەتەوەی کورد.

لێرەدا هەوڵەکان باسێکە، بزوتنەوەکانیش باسێکە و کێشەکەش خۆی باسێکە لە بەرامبەرییەوە (کاردانەوە) و شێوەی وەڵامدانەوەی حکوماتی ناوچەکە دروست بوو،

کە ئەو کوردە لەوسەردەمەدا کە دەزانین چی بەسەرهات و چۆن دابەش بوو بەسەر ئەو ولاتانەدا، ئەو ولاتانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەو هەولانە توندبوو وەکو کورد کوفریان کردبێ (طبعا) ئەوە مەوزوعەکەی ئالۆزکرد و هەموولایەکی تووشی هەڵەکرد، ئێمە دەبێت دان بەوەدا بنێین کە سەیر نییە لە بزوتنەوەی کوردیدا هەڵەی تاکتیکی و ستراتیژی کرابێت، بەلام ئەوە لەهەقانییەتی کێشەکە کەم ناکات، حکومەتەکانیش بەتوندوتیژیش و توندمامەڵەیان لەگەڵ مەسەلەکاندا کرد، بەشێوەیەك مەسەلەکەی ئەوەندە ئالۆز کرد گەیشتە ئەمڕۆ بۆ نموونە لەکوردستانی عێراق کە ئەنفالکردن بەتەعبیری ئیبادەکردن و بەکۆمەڵ کوشتن و کیمیاباران و هەمووشتیان بەرەوا زانی، ئەوە چ عەقڵێکە؟!

مەسەلەکە ئەوەندەیتر ئالۆز بوو خۆ مەسەلەی حەق نافەوتێ یەك زەلامیش بێت نەك میللەتێك ئێمە بەو شێوەیە دەڕوانینە مەسەلەکان.[1]

کاتێ لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم و وەك بەشێ لە میراتیەکانی جەنگ و بەپێی رێکەوتننامەی (سایکس بیکۆ) لەساڵی (١٩١٦) کوردستان پارچە پارچە کراو هەر پارەچەیەکی خرایە سەر یەکێ لەدەوڵەتە بەکرێگیراوەکانی دوولایەنی رێکەوتننامەکە واتە (بەریتانیا و فەرەنسا) و پیرۆزبایی رووسیای تزاری بەمەش بەدان نەنان بە قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورو دابەشکردنی ولاتەکەی و بەسەر دەوڵەتانی دراوسێدا لەهەموو مافە نەتەوایەتییەکانی بێبەش کرا.

---

[1] دیدو هەڵوێست ل٥١.

دەوڵەتە ناسیۆنالیزم و شوفێنی و دەستنێژەکانی ئیمپریالیزم هەوڵیاندا ناسنامەی گەلی کورد بسڕنەوەو تەنەنات لەمافە ئینسانییەکانیشی بێ بەش بکەن.

لێرەوە مەسەلەی کورد وەك کێشەیەکی ئینسانی عادیلانە سەری هەڵداو رۆڵەکانی ئەم نەتەوەش لەپیاوانی ئەهلی (عیلم و دین) بەشێوازی جۆراوجۆر تێکۆشاون بۆ بەدەستهێنان و گێڕانەوەی مافە نەتەوەیی و ئینسانییەکانیان.[1]

کەواتە یەککرتوو وادەڕوانێتە کێشەکە کە لەواقیعیشدا هەروایە، کێشەیەکە لەخودی خۆیدا هەق و رەوایە، بەپێچەوانەی پروپاگەندەی دەسەڵاتدارییە دوژمن بە کوردەکان بۆ مەرامی ئەم و ئەو نەخولقاوە، مەسەلەکە مەسەلەی چارەنووسی دەیان ملیۆن مرۆڤە کەساڵەهای ساڵە نکوڵی لەمافەکانیان دەکرێت و هەوڵی شێواندنی دیموگرافی و کەسێتی نەتەوەییان دەدرێت و سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزییان لەدژ پەیڕەو دەکرێت و لەمافە مەدەنی و سیاسیەکان بێ بەش دەکرێن.

هەڵەو رەفتاری نادروستی هیچ لایەن و هێزێکی کوردیش بەهیچ جۆرێك لەرەوایەتی کێشەکە کەم ناکاتەوە راستییەکان ئاوەژوو ناکاتەوە.

شەشەم: گشتیگری ئیسلام؛ بەو واتایەی رێبازێکە دەتوانێ لەبوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا مرۆڤ رێنوێنی بکات و رێگای راستی و رزگاری و بەختەوەری نیشان بدات.

مرۆڤ دەتوانێت بەئیلهام وەرگرتن لەگیانی ئیسلام و تێکۆشان لەبەر تیشکی سەرەتا مەزنەکانیدا، هەوڵی چارەسەرکردنی گرفت و کێشەو قەیرانەکانی بدات،

---

[1] منطلقات ومواقف ص١٢.

(ئیسلام بەرنامەی خوایە بۆ ئاسودەکردنی مرۆڤایەتی نێردراوە بەگشتی و گەل و نەتەوەکانییەوە[١].

هەربۆیە نەخشەو رێوشوێن و رەفتار و هەنگاوێك لەلایەن هەر هێز و دەسەلاتێکەوە بێت و ببێتە مایەی بێبەش کردنی گەلی کوردستان لەئاشتی و ئارامی و ئاسودەیی و کامەرانی و خۆشگوزەرانی گەر سەدجار بەرگی ئیسلامیشیان پێوە پێچرێت، لەبنەڕەتدا دژ بەسەرتاپاترین سەرتاکانی ئیسلام و گیان و پەیامەکەیەتی.

ئیسلام وەك بەرنامە و رێبازێکی خوایی بۆ هەموو مرۆڤەکان لەسەرانسەری زەویدا بۆ گشت گەل و چین و خەڵکییە، گرنگی زۆری بەماف مرۆڤ چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵ و گەلداوە، دەقە ئیسلامیەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن کە مافەکانی مرۆڤ و گەلان ئایەتی خواییەو قابیلی موناقەشەکردن نییەو بۆ زەوق و حەوسەڵەی خەڵك بەجێ نەهێڵراوە.

بەڵکو دەقی رۆشن و راست و رەوان دەستنیشان کردوە ئەمە وەك رێباز و بنەمای فکری و عەقیدەیی ئیسلام نەخشەی بۆدابین کردنی ماف گەل و مرۆڤەکان کێشاوەو بەبەشێك لە (ئایین)ی داناوە.[٢]

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییەی خەبات و هەوڵ و ئەرکی ئیسلامی هەمووی یەك خەبات و پێی دەوترێت (کار و خەباتی ئیسلامیی) بەشێکیش لەم خەباتە (ئەرکی داکۆکی کردن) و(ئەرکی پاراستنی نیشتمان) و (ئەرکی لەنێوبردنی ستەم و

---

[١] بەیاننامەی راگەیاندنی یەکگرتوو.

[٢] دیدو هەڵوێست ل٣٢.

ناڕەوایی) و (ئەرکی مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەل) و... هتد ئیتر ناکرێت کەسانێك بێن و خەباتی میللی و نەتەوەیی لەسەر خۆیان تاپۆ بکەن و بۆخۆیانی قۆرخ کەن، چونکە ئیسلام ئایینێکی گشتگیر و هەمەلایەنەیە (مافی مرۆڤ) و (پێناسەی گەلان) و (ئازادی میللەتان)یش بەشێکی فراوانی لەو چوارچێوە پێدراوە.[١]

باوەڕی قووڵی یەکگرتوو بەو سەرەتاو پێگە فکریانەی ئاماژەیان پێکرا وای لێکردووە کەهەر لەسەرەتاوە ستراتیژی خۆی لەسەر خزمەت کردنی گەلی کوردستان بەئیسلام دابڕێژێت بەتایبەتیش تێکۆشان بۆچارەسەرکردنی کێشە ناوەندییەکەی کە کێشەی نەتەوایەتییە، چونکە هەروەك پێشتریش باسکرا گەر پرۆژەیەکی ئیسلامیی کوردیی (استعاب)ی پرسێکی لەم جۆرە نەکات کاڵ و کرچ و ناتەواو دەبێت و توانای خوێندنەوەو دەرك کردنێکی دروستی واقیعی نابێت و تێگەیشتنی بۆ کێشەو قەیرانەکانیش و جۆری چارەسەرکرنیان ناتەواو و سنوردار و ناکاریگەر دەبێت.

## یەکگرتوو چۆن دەڕوانێتە سروشتی کێشەی کورد؟

دەستنیشانکردنی تێڕوانینی هێز و لایەنەکان بۆسروشتی کێشەی کورد بۆدەرککردنی بەشێوەو ڕێگاچارە پەسەندکراوەکانیان گرنگە و سەقفی باڵای داخوازی و داوکارییەکانیشیان دەردەخات، هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی ناوچەکەو دەوڵەتانی دونیاو کۆڕو ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان و بزوتنەوەو هێزو لایەنە

---

[١] تیشکێك ل٥٥ ـ ٥٦.

کوردیەکانیش لەجۆری پێناسەکردنیان بۆ سروشتی کێشەکەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆ نموونە ئەگەر مەلەفەی دەسەلاتدارانی عێراق هەڵبدەینەوە دەبینین بەنیمچە بەردەوامی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلی کوردیان لەپێناو ڕزگاری و سەرفرازیدا بە یاخی بوون و لەیاسای دەرچوون و کلکایەتی بێگانەو نۆکەرایەتی دوژمنانی عێراق و نەتەوەی عەرەب داوەتە قەڵەم، لەتورکیاش دوای دەیان ساڵ نکولی کردن لە بوونی نەتەوەیەك بەناوی کوردەوە! تاکو ئێستاش دان بەبوونی کێشەی کورددا نانێن و بەکێشەی تیرۆریزمی دەناسێنن! لەبارێکی لەم جۆرەشدا ناکرێ بەدەر لەچارەسەری ئەمنی و ڕووبەڕووبونەوەی خوێناوی و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ڕاستییەکان و سەرکوت و داپۆلسین بیر لە شتێکیتر بکرێتەوە.

واتە هەر گۆڕانێ لەڕێبازی ئەو دەسەلاتدارانەدا سەبارەت بەچارەسەرێکی ئاشتیانەو عادیلانەی کێشەی کورد، دەبێت لەوێناکردنیان بۆ کێشەکەو سەرلەنوێ پێناسەکردنییەوە دەست پێ بکات، حزب و بزوتنەوەیەکی کوردیش کە کێشەکە بۆ نموونە تەنها بەکێشەی زمان و فەرهەنگ یاخود بێ بەشیی لەبەشداری کردن لە بەڕێوەبەردنی دام و دەزگا میرییەکاندا بهێنێ، دیاریکردنی ئامانجەکانی خەبات و میکانیزمەکانی تێکۆشان و جۆشدان و ئامادەکردنی ئەندام و لایەنگران و ئاراستەکردنی جەماوەریش هەر لەسەر ئەو بناغەیە بەڕێوە دەبات.

هەر لەبەرئەمەشە جۆری پێناسەکردن و دیاریکردنی سروشتی کێشەکە بۆهەر هێزو لایەنێکی کوردی ئاسۆکانی ڕەسەنایەتی و ئامانجەکان و ئاستی پابەندبوونی بەمەلەسە جەوهەریەکانی دۆزی کوردەوە دەردەخات.

له روانگەی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانەوە وەك هێزێکی ئیسلامخوازو کورد پەروەری گۆڕەپانی بەرەڤانی و خەباتی رەوای کوردستان، کێشەی کورد (کێشەی خەڵك و خاکە)[١]. کەواتە (کێشەی گەلەکەمان کێشەیەکی سیاسییە پێویست بەوە دەکات گشت لایەنە سیاسییەکانی کوردستان هاوکارو هاوئامانج خەبات بکەن لەوپێناوەدا و کێشە ناوخۆییە لاوەکییەکان وەلانێن.[٢]

بەمەش کێشەکە لەروانگەی یەکگرتووەوە وەك واقیعیش وایە لەوەوە دەردەچێ کێشەی کۆمەڵێ خەڵکی برسی و رەش و رووتی پەناهێندەی ناو ئۆردوگای لێقەوماوو برسییەکان بێت. کە بەهەندێ لالێکردنەوەی خێرخوازانە و دابینکردنی نان و رێوشوێن بۆیان، بتوانرێت چارەسەر بکرێت.

کێشەی گەل و نەتەوەیەکە کە ساڵەهای ساڵە بەدوای ناسنامەو قەوارە و سەلماندنی بوونی خۆیدا وێڵەو لەم رێگایەشدا بەردەوام هەوڵیداوە و تێکۆشاوە، تاکو ئێستاش ئەو خەباتەی بۆبەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی و ئازادی و رزگاری و ئاشتی و ئاسایش هەر بەردەوامە، کێشەی نیشتمان و خاکێکی دابەشکراوە.

لەورۆژەوە دوای شەڕی جیهانی یەکەم (داگیرکارە هاوپەیمانەکان کوردستانیان دابەشکردو کەوتنە چاندنی گیانی رەگەزپەرستی و شۆڤێنێستییانە لەسەر بناغەی (سایکس بیکۆ) لەدراوسێکانیان کرد بەدوژمنامان و لەهەر یەکێ لەو وڵاتانە رژێمێکی

---

[١] ستراتیژییەکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، هەروەها یەکگرتوو ژمارە (١٢٦) ١٩٩٧/٢/٢١ یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لەوێوە بەرەو کوێ.

[٢] کێشە سیاسییەکانی کوردستان ل ٢، هەروەها منطلقات و مواقف ص١٣.

دژ بە کوردیان دامەزراند[1]، کێشەکە قوڵترو خوێناویتر بۆوەو رەهەندی تازەو بەرفراوانیشی بەخۆوە گرتووە، ئێستاش کێشەکە یەکێکە لەگەورەترین کێشە هەڵایساو و چارەسەر نەکراوەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین و ، بەڵکو تەواوی جیهان و نەتەوەی کورد گەورەترین نەتەوەی ئەم جیهانەیە کە تاکو ئێستا قەوارەی دان پینراوی تایبەت بەخۆی نییە و کێشەکەی چارەسەرێکی سیاسی و یاسایی رەواو مرۆڤانەی بۆنەدۆزراوەتەوە. کورد گەلێکی رۆژهەڵاتیی دێرینە و شوێنی نیشتەجێ بوونی کوردستانە[2] کوردان خەڵکانێکی بێ نیشتمان نین، تا لەهەر شوێنێ نیشتەجێ بن بەلایانەوە گرنگ نەبێت، لە لایەکیترەوە تێکەڵەیەکی ناهەماهەنگی رەگەز و زمان و رەچەڵەکی جۆراوجۆر نین کە تەنها شوێنی نیشتەجێ بوون و بەرژەوەندی هاوبەش و دەسەڵاتێکی سیاسی کۆی کردبنەوە، بەڵکو گەلێکن خاوەنی ناسنامەو رەچەڵەك و مێژوو زمان و فەرهەنگی خۆمانین.

ئەم تێڕوانینە هەموو سیاسەتێکی بەعەرەبکردن و بەتورك کردن و بەفارس کردن و راگوێزان و گۆڕینی سیمای دیموگرافی و سنوری جوگرافی کوردستانی مێژوویی و مەعالیمە شارستانی و مێژووییەکانی رەت دەکاتەوە، بەڵکو بەتاوانی دەداتە قەڵەم هەروەکو لەپێشەوە ئاماژەی پێکرا.

لەبەرئەوە یارمەتی مرۆڤ دۆستانەو دەستگیرۆیی و بەهاناوە هاتنی خێرخوازانە (لەگەڵ رێزمان بۆهەرکەسێ لەو روەشەوە ئاوڕ لەکورد دەداتەوە) چارەسەر

---

[1] دیدو هەڵوێست ل٣٤

[2] منطلقات ومواقف ص١١.

ناکرێت.. هەر لەم سۆنگەوە یەکگرتوو پێی وایە (کارکردنی زیاتر لەسەر بەسیاسی کردنی کێشەکەمان و خستنە رووی لایەنە چارەنووس‌ساز و هەمیشەییەکان هەوڵی زیاتر بۆ تێگەیاندنی کەسان و لایەنانی‌تری دەرەوە لەحەقیقەت و مەغزای گرفتەکانی ئەرکی سەرەکی و گرنگی هەموو لایەکە[1]، چونکە (یەکێ لەو گیروگرفتانەی کە هەمیشە گرێ و کۆسپ بووە لەرێگای گەیشتن بەمافە رەواکانی گەلەکەمان، ئەوەبوو کە لەدەیان ساڵی رابردوودا، دۆزی کورد لەسەر ئاستی رای گشتی جیهانی و نێودەوڵەتی وەك کێشەیەکی سیاسی گرنگ مامەڵەی لەگەڵ نەکراوە[2]. یەکگرتووش گەرچی یەکێ لە ئەرکەکانی خۆی لەم قۆناغەدا بەرامبەر گەلەکەمان لەهەرێمدا بەوە دیاری کردوە لەبواری تەندروستی و سەرپەرشتی بێ باوکان و بەهاناوە هاتنی کارەساتباران و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان لەرێی رێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکانەوە بەشداری جددی بکات وەك بەشداری کردنێکی عەمەلی لەسڕینەوەی شوێنەوارەکانی چۆڵکردنی نیشتمانی کوردستان لەگەلەکەی و بەسوتماك کردنی خاك و سیاسەتی دۆزەخیانەی راگوێزان و وێرانکردنی کوردستان، بەڵام وەك حزبێکی سیاسی ئیسلامخواز و کوردستانی تێکۆشەر هەوڵیداوە لەرێی خەملاندنی پرۆژەیەکی سیاسییەوە بەشدارییەکی جددی لە لەکێشەی کوردستان و عێراق دا بکات[3] و لەریزی پێشەوەی ئەو حزب و لایەنە

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (١٣٤) ٢٥/٤/١٩٩٧.

[2] بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بەبۆنەی چوارەمین ساڵرۆژی یادی ئیعلانکردنی (یەکگرتوو)ەوە رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (١٧٤) ٦/٢/١٩٩٨.

[3] کێشە سیاسیەکان، ل٣.

نیشتمانپەروەرانەدا بێ کە داوای چارەسەرێکی بنەڕەتی و ڕەوای کێشەی گەلی کورد دەکەن.

گەرچی لەم ڕووەوە بۆ بەرژەوەندی نۆزەکەو بەرەچاوکردنی ناسکی ڕەوشەکەو ئەو قۆناغە مێژووییەی بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی پیا تێپەڕدەبێت و ڕاگرتنی هەستی بەرامبەر لەرووی تیۆرییەوە لەئەدەبیاتی خۆیدا، زێتر بەوە ئامادەبوونی خۆی دەردەبڕێ کە یەکگرتوو بەشێکە لەحاڵەتی سیاسی کوردستان و لەم ڕوانگەیەوە دەڕوانێتە کێشەکانی عێراق و ناوچەکەو مامەڵەکردن لەگەڵ گۆڕاوەکاندا بەشداریکردنی وەفدی یەکگرتوو لەدیالۆگی عەرەبی کوردی لە قاهیرە لەپاڵ وەفدی لایەنە کوردستانییەکانیتردا وێنەیەکی بەرجەستەکراوی ئەو واقیعە بوو کە نیشانی جیهانی عەرەبیدا.

### هەوڵدان بۆ ناساندنی کێشەی گەلی کورد و پشتیوانی لێکردنی

یەکگرتوو لەکاتێکدا ئەرکێکی سەرەکی خۆی بەهەڵدان و تێکۆشان بۆچارەسەری ڕەوای گەلی دیاری کردوە، هەر لەو چوارچێوەیەداو وەك بەشێ لەو ئەرکە هەوڵیداوە بەهەرچی لەتوانایدا بێت و بۆی بڕەخسێت حەقیقەتی ئەم کێشە خوێناوی و چارەسەرنەکراوە بەوکۆڕو کۆمەڵ و ناوەندو گەلانی ناوچەکەو جیهان بناسێنێ کە ئەم دەتوانێ بیاندوێنێ و بیانخاتە بەردەم لێپرسراوێتی ئیسلامیی و مێژوویی خۆیانەوە، هەر لەم تێڕوانینەشەوە بۆ ڕۆڵی خۆی و ئەرکەکانی سەرشانی یەکێ کە لەستراتیژیەکانی پەسەندکراوی کۆنگرەی دووەمی خۆی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان

کردووەو دەڵێ هەوڵی بەردوام دەدەین بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی لایەن و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان و ڕای گشتی گەلانی مسوڵمان بۆکێشەی ڕەوای گەلەکەمان[1].

لێرەدا بۆکورتکردنەوە و ڕوونکردنەوەی زیاتری مەسەلەکە بۆ خوێنەر هەوڵ دەدەین جۆری هەوڵ و هەنگاوەکان ئەوەندەی شوێنەکە دەیخوازێت دەستنیشان بکەین:

یەکەم: ناساندنی کێشەکە ڕەنگە خەڵکانێ پرسیارکەن بەو ئاڵۆزی و خوێناوی بەو مێژووە دورو درێژەی هەیەتی، بەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕین و مەرگەسات و کاوڵکارییەی بەخۆیەوە بینیوە، بەو هەموو دەستتێوەردان و بەفیڕۆچوونی وزە و توانایەکی زۆری ماددی و مەعنەوەی ناوچەکە، هێشتاش خەڵك نەزانێ چییەو چی نییە؟

بەڵام لە ڕاستیدا هەموو دەزانین لەجیهانی دوای سنورە داخراوەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ و بنەما نێودەوڵەتییەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەو لەژێر سایەی شەڕی سارد و تا نەوەدەکانیشدا، جەماوەرێکی زۆر لە چەندەها کێشەی وەکو کێشەی کورد بێ ئاگا کراون.

سیاسەتی بێئاگاکردنی خەڵکی و وڕکردنی جەماوەرو گەمارۆدانی زانیاری تەواو ڕاست دەربارەی کێشەو ڕووداوەکانی دنیاو سنوردارکردنی ئاسۆکانی بیرکردنەوەو جیهانناسی سیاسەتێکی پەیڕەوکراوی زۆریەی ئەو ڕژێم و دەسەڵاتداریانە بووە کە

---

[1] ستراتیژەکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، یەکگرتوو ژمارە (١٨٣).

ناوچەکە بەخۆیەوە بینیوە، کارەساتەکە لەم رووەوە ئەوەندە قووڵ بووەو ئامرازەکانی کۆنترۆڵ کردنی خەڵك و دابڕین و ئابلۆقەدانیان و بەتایبەتیش راگەیاندن و دەزگا سەرکەوت کەرەکان لەئاستێکدا بوون کە زۆرجار لەناو وڵاتێکدا دانیشتوانی شارێ بەکارەساتی شارەکەیتری نەزانیوە هەموو لە بیرمانەچۆن لە هەشتاکاندا لەکاتێکدا چەندان هەڵمەتی قڕکردن و قەڵاچۆکردنی کورد و سەرکوتکردنی لەکوردستانی عێراقدا بەڕێوە دەبرا کەچی بەشێکی زۆری خەڵکی عێراق و تەنانەت هەندێ جار بەشێ لەدانیشتوانی کوردستانیش لێی بێ ئاگابوو!

هەربۆیە کێشەی کورد لە ناوەندە سیاسی و فەرهەنگی و میللیەکاندا و لەسەر ئاستی جەماوەرێکی بەرینی هەرێمەکەدا نەناسراوە، یاخود بەشێوێنراوی ناسێنراوە، کەم بوون ئەوانەی کێشەی گەلی کوردستان وەك کێشەیەکی رەواو عادیلانەی میللەتێکی مسوڵمانی ستەملێکراوو ئاشتیخوازی ناوچەکە بناسن!

بنەما نێودەوڵەتییەکان و چەمکی سەروەری دەوڵەتی ژێر سایەی جەنگی ساردو ململانێی بلۆکی رۆژهەڵات و جیهانی سەرمایەداریش کارێکی وای کردبوو کە زۆرێك لەم کێشانە و بەتایبەتیش کێشەی کورد وەك گیروگرفتی ناوخۆیی ئەو دەوڵەتانە سەیر بکرێت کە کوردیان تێدایە، لەناو ئەو دەوڵەتانەشدا لەبەر سروشتی پێکهاتەی دەسەڵاتی سیاسی قسەلێکردن و مامەڵە لەگەڵ کردن و پێناسەکردنی، زیاتر کاری تایبەتی دەسەڵاتداران بووە، لەسایەی پووکانەوەی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و کزبوونی هەستی ئیسلامخوازی رەسەن و سروشتی پۆلیسیانەی دەسەڵاتیش پێکهاتەکانیتری کۆمەڵگا داوای لێکراوە تەنها راپەڕاندنی ئەو ئەرکانەی

لەسەرشان بێ کە دەسەڵاتی سیاسی بەگوێرەی ستراتیژیەتی خۆی بۆی دیاری دەکات، گەر بگەڕێینەوە سەر مەسەلە بنەڕەتیەکەش ئەو ناوەندو خەڵکانەش کە کێشەی کوردیان بیستووە زۆر کەم هەستیان بەقەبارەی مەرگەسات و ستەم و زۆرداریەکان کردوە، زۆرکەم دەنگ و باسی هەزاران گوندی رووخاوو شێوەیتری سەرکەوت و داپلۆسین وەك ئەوەی پێویستە گەیشتووە بەگوێی جیهان بەگشتی و لەوانەش ناوچەکە بێ ئاگا لەقەوارەی ئەو هەموو زیانە ماددی و مەعنەویەی لەکورد کەوتووە، هەربۆیە لەچەندان کۆڕو سیمینار و دیدار و چاوپێکەوتنندا کاتێ نوێنەرانی یەککرتووی ئیسلامیی کورد[1] و دواتریش یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و ئیسلامخوازانیتری کوردستانیش باسی ئەو کارەسات و زوڵم و زۆرەیان کردووە، خەڵك زۆر لای سەیر بووە، هەندێ جار هەندێ کەس بڕوایان نەکردووە، ئەو زانیاریانە سەبارەت بەچەندان رێکخراوو بزوتنەوەو ناوەندو کەسایەتی و دامەزراوە میللیەکان و گەلانی ناوچەکە زۆر تازەو سەر سوڕهێنەربوون.

بەهۆی ئەو هەوڵانەشەوە لەچاو جاراندا لەلایەن کۆڕو بزاڤە ئیسلامییەکانەوە (تفاعل)ێکی باش هەیە و ئێستا باسی کێشەی کورد باسی میللەتی کورد باسی مافی رەوای گەلی کورد زۆر سروشتییەو لەکۆنگرە ئیسلامییەکان و لای لایەنە ئیسلامییەکان (مطرح)ە کە ئەوسا وانەبوو[2].

---

[1] دیارە هەڵدانەوەی دڕندایەتی دەسەڵاتدارانی داگیرکەری کوردستان هەر تایبەت بە حیزب و رێکخراوێك نەبووە.

[2] دیمانە، ل١٩.

بەڕێز ئەمینداری گشتی یەکگرتوو مامۆستا (سەلاحەدین) لەمیانەی دیدارێکی بۆ تورکیا و لەچاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (الوقت)ی تورکیدا لەم ڕووەوە گلەیی لەجیهانی ئیسلامیی دەکات و دەڵێت (مسوڵمانانی جیهان بەسەر لێکردنەوە (تحفظ)ەوە بەرامبەر کوردەکان رەفتار دەکەن، تاکو ئێستاش مسوڵمانانی جیهان لێمان تێنەگەیشتوون و نامانناسان، تائێستاش ستەم لێکراوین لەرێی میدیای دەوڵەتە ئیمپریالستەکانەوە ئێمە دەناسن[1].

لێرەدا ئەوەی جێی سەرنجە جگە لەزۆربەی دەوڵەت و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە زۆر لەبزاڤە ناسیونالیست و بەشێ لە ئیسلامییەکانیش هەر لەبنەڕەتدا دانیان بەوەدا نەناوە کە کێشەی کورد کێشەیەکی ناوچەکە و ڕۆژهەڵاتی ناڤین و جیهانی ئیسلامییە و دەخوازێت ئاوڕی دڵسۆزانە و جددی لێبدرێتەوە و بێتە چارەسەرکردن، دیارە ناسیۆنالیستەکان بەپاڵنەری هەستی نەتەوایەتی دەمارگرژانە کە کێشەکەیان بەدروستکراوی دوژمنانی نەتەوە زانیوە و ترساون لەوەی کێشەی کورد وەك کێشە بناسن، چونکە ئەو کاتە کورد لە بەرامبەر ئەمانەوە دەبێتە خاوەن ناسنامە و دەنگ و قەوارەی سەربەخۆ و جیاوازی خۆی بالەچوارچێوەی جەستە سیاسییە باوەکەشدا بێت.

ئەوەندەی نوسەری ئەم نامیلکەیش سەرنجی دابێ ناوەندە ئیسلامییە تەقلیدیەکان و بەشێکیش لە بزاڤ و جوڵانەوە سیاسیە ئیسلامیەکانی جیهانی ئیسلام لەسەر سنورداری ئاسۆی سیاسی و دواکەوتوویی فیکریان و هەڵوێست گرتن لەژێر

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٨) ٢٥/١١/١٩٩٤.

کاریگەری نەخشەکانی ئیستیعمار لەجیهانی ئیسلام و تێگەیشتنیان بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و بەستنەوەی بەیادەوەریەکانی داگیرکەرو کەموکوڕی بزاڤی رزگاری نیشتمانی کوردی لەم رووەو زۆر هۆیتر، زیاتر ئەو کێشانەیان بەکێشەی جیهانی ئیسلام زانیوەکە لایەکی کێشەکە مسوڵمان نەبێت، وەك جولەکە لە (فەلەستین و ئەرسەدۆکس و بۆسنەو کۆسۆڤا و هیندۆس لە کشیمر و هتد) کە ئەمە گەر نیازپاکی ئەو ناوەندو بزافانەشی لەگەڵدابێت خۆدزینەوەیە لەدانانان بەواقیع و بیرکردنەوەیەکی کاڵ و کرچ و شەرمنانەیە.

دیپلۆماسیەتی یەککگرتوو لەرستەیەکی نەپچڕاوو بێ گاڵەی چالاکییەکانی خۆیدا قورسایی و (مصداقیە)تی ئیسلامی خۆی لەم پێناوەدا بەکارهێناوەو خستۆتەگەڕ، بۆ ئەوەی ئەو ناوەندانە لەکۆت و بەندی ئەو بیرکردنەوە رزگاربن و وەك کێشەی گەلێ سەیری بکەن نەك (گیروگرفت)ی ناوخۆی هەندێ وڵات وەك چۆن لەمێژووی هاوچەرخدا چەوسێنەرانی کورد زیاتر دەستەواژەی گیروگرفتیان بۆ گوزارشت کردن لەکێشەکە بەکارهێناوە، چونکە کاتێ وەك کێشەیەك لەقەڵەمیاندا ئەوکاتە دەکەونە بەردەم ئەرك و بەرپرسیاریەتی ئیسلامی و مێژوویی خۆیانەوە.

دووەم: دەرخستنی رووی راستی کێشەکە؛ وەك هاتە وتن، لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامی تا ئەوەدەکانیش کورد نەك وەك ئەوەی پێویستەو وەك کێشەی رەوای گەلێکی ستەملێکراوو بێبەش ناوچەکە نەناسرابوو، بەڵکو زۆر ناشیرینیش کرابوو، چەندەها تۆمەتی ناڕەواو ناهەقی خراوتە پاڵ راگەیاندنی چەواشە و ئاوەژووی دەسەڵاتـدارانی ناوچەکەو سنووردارێبوونی راگەیاندن و دبلۆماسیەتی کوردی و بایەخ

نەدانی پێویست بەهەندێ ناوەندو بازنەو گرەوکردنی زیادەرەوانە لەسەر هەندێ هێزو لایەن و کەمتر روون بوونی ستراتیژیەت و هەلومەرجی نێودەوڵەتی و جوگرافیای ئایدیۆلۆژی و سیاسی تەوژمە کاریگەرەکان و بێدەنگی رێکخراوە نێودەوڵەتی و کۆڕو کۆمەڵە نێونەتەوەیی و دەوڵەتە بڕیار بەدەستەکانی جیهان لەئاست مەینەتییەکانی گەلی کوردستاندا و چەندان هۆکاری بابەتی و خودیتر، کارێکیان کردبوو کەشۆڕش و بەرەڤانی و بەرخودانی گەلی مێرخاسی کوردستان بۆرەهابوون لەدەست ستەم و گەیشتن بەترۆپکی ئازادی و سەرفرازی یاخود دابینکردنی لانیکەمی مافە نیشتمانییەکانی خۆی، بەهەڵگەڕانەوەو یاخی بوون و کلکایەتی کردن و ئاژاوەنانەوە و چەتەیی و رێگری تاوانبر بکرێت! بۆ نمونە هەر کە باسی کوردستانی عێراق کرابێت باسی جۆرێ لەچارەسەری کێشەکە لەئارادا بووبێ، یەکسەر عەرەبە ناسیۆنالیست و هەندێ ناوەندی تەقلیدی ئیسلامی ناوچەکە هاواریان لێ هەستاوە کە نەخشەی بەرپابوونی ئیسرائیلی دووەم دەکێشرێ، بەبێ بیرکردنەوە لەو راستییەی کەبەپێچەوانەی ئیسرائیلەوە کورد گەلێکی مسوڵمان و لەدێرنترین گەلەکانی ناوچەکەیەو لەسەر خاکی مێژوویی خۆیدا دەژی و بەشێکە لە پێکهاتەی ژیاری و فەرهەنگی و مێژوویی هەرێمەکە؟!

تەنانەت لەهەندێ برگەی مێژووییدا هەوڵدراوە یاری بەهەستی ئایینی گەلانی مسوڵمان بکرێت و خوێنرێژانی کورد بێ ئاگاییان لەکێشەکەو دواکەوتوویی هۆشیاری فیکری و سیاسییان بقۆزنەوەو لەبەرچاویان کورد بەگەلێکی لەئیسلام هەڵگەڕاوە بخەنە روو! بۆ ئەمەش بوونی هەندێ دروشم و سیمای مارکسیزمانەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیان لەدوای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە کردووە بەبەڵگەی

دەستیان لەکاتێکدا ئەو فەرمانڕەوایانەو ڕژێمەکانیان دوژمنی پلەیەکی ئیسلام بوون لەهەرێمەکەدا؟

هەربۆیەش یەکێك لەو شتانەی یەکگرتوو ئیشی لەسەر کردووە ڕزگارکردنی کێشەکە بووە لەپلانی ڕەگەزایەتی و بێدینی کە لەئاستێکدا مەسەلەی لای مسوڵمانان بزرکردبوو[١].

لەم ڕووەوە هەوڵی بێ وچانیداوە بۆ ناساندنی کێشەی گەلەکەمان بەجیهانی دەرەوە بەتایبەتی بەناوەندو لایەنە ئیسلامییەکان بەمەبەستی ڕاستکردنەوەی تێڕوانینان و دەستەبەرکردنی پشتیوانی ماددی و مەعنەوەی بۆگەلەکەمان[٢].

یەکگرتوو لە (١٠) ساڵی ڕابردوودا هەر لەساڵی (١٩٨٨)ەوە ئەو کاتەی (ڕابیتەی ئیسلامیی کورد) دامەرزا وەك بەخەمەوە بوونێکی کێشەی کورد کاری زۆری کردوە بۆ دەرخستنی گۆشە کپکراوەکانی کێشەکەو ڕاستکردنەوەی ئەو بۆچوونەی ئەو کێشەیەی بەدەرچوون لەدەسەلاَت و جوداخوازی و هتد دادەنا، ئەوشتانەی کە زۆر قسەی لەسەر کراوەو کێشەکەی پێ تۆمارکراوە یەکگرتوو لەو ڕوەوە ڕونکردنەوەی زۆری پێشکەش کردوە کە ڕەنگە لەهەندێ ناوەندا قسەی ئەو لەهی کەسانیتر زیاتر بیسترابێت[٣].

---

[١] یەکگرتوو ژمارە (٢٩) ١٩٩٥/٢/١٠.

[٢] بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکگرتوو بەبۆنەی چوارەمین ساڵرۆژی ئیعلانکردنیەوە

[٣] دیمانە لاپەرە١٨.

سەبارەت بە شۆڕشی گەلی کوردستانیش کەئیسلامخوازان بەشێکی کاریگەرن تیایدا یەکگرتوو بەهیچ شێوەیەك قایل نەبووە هەندێ هێزو لایەن بەهەڵگەرانەوە وەسفی بکەن،، چونکە شۆڕشی گەلەکەمان لەدژی زوڵم و زۆرداری رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بووە لەپێناو داکۆکیکردن لەمافە زەوتکراوەکانی گەلی کوردستان[1].

سێیەم: ئامانجی یەکگرتوو لەم هەوڵەیدا؛ یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، کاتێ ناساندنی کێشەی کوردی بەناوەند و کۆڕ و کۆمەڵە و رای گشتی جیهانی بەگشتی و بەتایبەتی ئیسلامی کردۆتە یەکێ لە ستراتیژیەتیەکانی ئەم قۆناغەی خۆی بۆ خزمەتکردن بەکێشەی گەلەکەی وێڕای هەوڵدان بۆ ئەوەی ئەو ناوەندانەی رای گشتی راستی کێشەکە وەك خۆی بناسن و بۆچوونیان راست بێتەوە، مەبەستێکیتری بەدەست هێنانی هاوسۆزی و پشتیوانی مەعنەوی و سیاسی و لالێکردنەوەی مرۆڤ دۆستانە[2] و بەهاناوە هاتنی گەلی کورد و بەشداری کردن لە ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی بووە.

وەك بەشێ لەهەوڵ و تێکۆشانی یەکگرتوو بۆ ناساندنی کێشەی گەلی کورد و واقیعی کارەسات بارو پڕکوێرەوەری و دەردەسەری گەلی کوردستان و رەوشی تایبەتی کوردستان و پێویستیان بەهەر جۆرە یارمەتی و کۆمەکییەکی مرۆڤدۆستانە و خێرخوازانە هەبێت بۆ ئەوەی بتوانن نیشتمانە کاولکراوەکەیان ئاوەدان بکەنەوەو

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٢٩٥) ١٠/٢/١٩٩٩.

[2] منطلقات ومواقف ص١٦.

لانیکەمی پێداویستیەکانیان دابین بکەن بەتایبەتی کەلەژێر باری دوو ئابلۆقەی گەورە دەیانناڵاند، توانی بۆ یەکەم جار لەمێژووی هاوچەرخی کورددا چەندان خەڵکی داراو رێکخراوو ناوەندی مسوڵمان و خێرخواز وا لێبکات کارلێکێکی باش لەگەڵ مەینەتی و ستەملێچویی بێ ئەندازەیی گەلەکەماندا بکەن، لەسنوری پەیام و کاری خێرخوازانەی خۆیاندا بەبەشداری کردن لە بەدەمەوە هاتن و یارمەتیدانی خەڵکی کوردستان هاوخەمی خۆیان بۆ کوردستان و گەلەکەی دەرببڕن، ئەم ئەرکە لەرێی رێکخراوە ئیسلامییە خێرخوازیەکانی وەك رابیتەی ئیسلامیی کوردو دەزگا فریاکەوتنی ئیسلامیی جیهانی و نەدوەی لاوانی مسوڵمان و چەند رێکخراوێکیتر بەجوانترین شێوە بەرێوە چووەو شوێن دەستیان بەئاشکرا بەکوردستانەوە دیارەو تاکو ئێستاش بەگەرمی لەچالاکییەکانی خۆیاندا بەردەوامن.

بەڵام بەپێچەوانەی هەندێ پروپاگەندەوە کە لەملاولەولا دەکرێت گوایە یەکگرتوو جگە لە هەندێ شتی خێرخوازی بەمەبەستی تایبەتی چی بۆ کێشەی کورد کردووە؟ یەکگرتوو تەنها بە بەدەستهێنانی ئەو پشتیوانییە خێرخوازی و مرۆڤ دۆستانەو بەهاناوە هاتنە وازی نەهێناوە، بەڵکو ئەم لەدیدگای ئیسلامیی بوون و کوردستانی بوونییەوە ئەمەی بەئەرکێکی بەپەلەی خۆی زانیوە کە ئەو قۆناغەی گەلەکەمان پێویستی پێی بووەو ئەمیش بەسورشتی بیرکردنەوەو هێڵی کارکردنی خۆی حەزی کردووە بەعەمەلی بەشداری لەخزمەتکردنی رۆڵەکانی ئەم گەلە رەسەن و بەش خوراوەدا بکات، بەدەر لەوە لەپێشەوە روونمان کردەوە لای یەکگرتوو کێشەی کورد کێشەیەکی سیاسییەو دەبێت چارەسەری سیاسی بۆ بدۆزرێتەوە، هەموو ئەو مەینەتی و ئاوارەیی و کوشت و برین و خوێنرێژی و ماڵوێرانییەش تووشی بووەو

تووشی دەبێ بەشێکی هەرە زۆری بەهۆی چارەنەکردنی ئەو کێشەوەیە هەر بۆیە چارەسەری بنەڕەتی مەینەتی و ئازارەکانی گەلی کوردستان دەخوازێت چارەسەرێکی سیاسی و یاسایی دادپەروەرانە بۆ کێشە مێژووییەکەی بدۆزرێتەوە، تاکو وەك گەلێ لەسەر خاك و نیشتمانی خۆی بتوانێت بەئازادی و ئارامی کامەرانی بژی و بەشداری لەپێشخستنی ژیان و شارستانییەتی هەرێمەکەدا بکات.

یەکگرتوو بۆ پەیداکردنی هاوسۆزی و پشتیوانی بۆکێشەی گەلی کوردستان و سنوردانان بۆ ئەو چەواشە کارییەی ساڵەهای ساڵەو تائێستاش دەرهەق بەماهیەت و سروشتی کێشەکەو هەق بوونی ئەنجام دەدرێت، هەر لەدروستبوونی رێکخراوی رابیتەی ئیسلامیی کوردەوە لە ساڵی (١٩٨٨)دا کە وەك رێکخراوێکی ئیسلامیی فەرهەنگیی و خێرخوازی ئیسلامیی گشتی هاتە کایەوەو ئەرکەکانی خۆی لەناساندنی کێشەی گەلی کورد بەمسوڵمانانی دنیاو بەهاناوە چوونی کارەساتبارانی کوردستان و پاراستنی مۆرکی کەسێتی مرۆڤی ئاوارەی کوردو پارێزگاری کردن لەناسنامەو بیروباوەڕو رەوشتی کورد کورت کردبۆوە، تاکو ئێستاش هیچ سەکۆو میمبەرو دەرفەت و کۆڕو کۆنگرەیەکی بۆ لواوی لەدەستنەداوە، بۆباسکردنی کێشەی گەلی کوردو واقیعی کۆمەڵگای کوردی و سروشتی بزافە رزگاریخوازەکەی و دام و دەزگا نیشتمانییەکانی.

نوێنەرانی یەکگرتوو وك دەرككردن بە ئەرکی مێژوویی سەرشانیان بەدور لەهەراو هۆریای دەزگاکانی راگەیاندن لە هەر شوێنێکی ئەو جیهانەدا بووبن لەناخی دڵیانەوەو بەکردەوەش نوێنەرێکی دڵسۆزو بەئەمەکی گەلەکەیان بوون و بەتاوانیان

زانیوه هەرچی بەمان دەکرێت دریغی تیا بکەن و لەبەر کەمتەرخەمی ئەمان ناوەندو کۆڕە ئیسلامییەکانی ناوچەکە تووشی بەدحاڵی بوون و بەهەڵەدا چوون بەن لەئاست ناسینی حەقیقەتی کێشەکەو داخوازیە رەواو عادیلانەکانی خەڵکی کوردستان.

بەجۆرێ بەرێز (دکتۆر عەلی قەرەداغی) وەك سەرۆکی رابیتەی ئیسلامیی کورد کە رۆڵی بەرچاوی هەبووە لەخزمەتکردنی جەماوەری گەلەکەیدا لەهەردوو رووی ماددی و مەعنەوییەوە لەموحازەرەیەکیدا بەجەختکردنەوە باسی ئەوەی کرد، کە جارێکیان تەنها (٥) دەقیقە بواری پێ دراوە سوڵتانی سەڵتەنەتی برۆنای بینی ئەو (٥) دەقیقەی قۆستۆتەوە بۆباسی کێشەی کورد و واقیعی کوردستان.

بەرێز مامۆستا (سەلاحەدین)یش لەکۆڕێکی ئیسلامخوازانی تورك لەتورکیا کە تەرخان بووە بۆباسی کێشەی مسوڵمانانی بۆسنە و شیشان و کۆسۆفۆ بەتوندی رەخنەی لەبەشداربوانی کۆڕەکە گرتبوو بەوە تاوانباری کردبوون کە پاڵنەری ئەو هەست و سۆزو پەرۆشەیان بۆکێشەی ئەو مسوڵمانانە هەمووی ئیسلامەتی نییەو بەشێکی بەرچاوی هاورەگەزی و نەژاد پەرستییە،، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو گەلانە بەبەشێ لەنەتەوەی خۆیان دەزانن و لەرووی مێژووییەوە وەك بەشێکی جیانەکراوە لە خۆیانی سەیردەکەن.

بەڵگەشی بۆ قسەکانی بەوە هێنابۆوە کە ئەگەر لەگوزارشت کردن لە هەستە ئیسلامیەکەتاندا راستگۆن، دەکرێ میللەتێکی مسوڵمان و برای (١٥) ملیۆنی لەبەردەستی خۆتان و لەوڵاتی خۆتاندا ئاوا فەرامۆش بکەن و ئاوڕی لێ نەدەنەوە،

هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەو گرفتەکانی نەدەن؟! روونە کە مەبەستی مامۆستا گەلی کوردە لەکوردستانی تورکیادا.

یەکگرتوو چەندین جار رەخنەی لەکۆڕو کۆنگرەو هەندێ بڵاوکراوەی لایەنی ئیسلامیی گرتووە کە لە کارنامەی خۆیاندا وەك ئەوەی پێویستە بایەخیان بەگەلی کوردو کێشەکەی نەداوەو تەفەهومی باروورەوشی تایبەتی کوردستانیان نەکردوە[١].

هەوڵی زۆر جددیانەشی داوە کە ئیسلامییە عێراقیەکان و بەتایبەتیش ئیسلامیەکانی ناوەند و بزافەکانی‌تری ناوچەکەش وەك خۆی لەمەسەلەی دروستی فیدراڵیزم پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و بزافی رزگاریخوازی کورد تێبگەن و لێکدانەوەی ناقۆڵاو دوور لەواقیع و پیلانگێڕانەی بۆ نەکەن و بەبیانووی هەڕەشەکردن لەیەك پارچەیی خاکی عێراق دژایەتی نەکەن و رێز لە خواست و ئیرادەی گەلی کوردستان و نوێنەرانی ئەم گەلە بگرن.

یەکگرتوو هێشتا لەسەرەتای تەمەنی چالاکی سیاسی ئاشکرای خۆیدا بوو وەك لایەنێکی ئیسلاخوازی کوردستانی کەبەشداری لەکۆنگرەی رێکخراوە ئیسلامییەکانی جیهان لە ئەستەمبوڵدا کرد زیاتر کە لە (٥٠) پارت و رێکخراوو لایەنی ئیسلامیی تیایدا بەشداربوون لەکۆنگرەکەدا لەمیانەی چەندان دانیشتنی دووقۆڵی لەگەڵ وەفدە جۆراوجۆرەکاندا لەنزیکەوە هەوڵی ئەوە دراوە واقیعی کوردستان و سروشتی

---

[١] بۆ نموونە رەخنەگرتن لەکۆنگرەی میللی عەرەبی و ئیسلامیی کە لەنیسانی ساڵی (١٩٩١)دا لە (خەرتوم) بەسترلو نوێنەری گەلی کورد بانگهێشت نەکرابوو باس لە کێشەکەی نەکرابوو بانگی هەق زمناحاڵی رابیتەی ئیسلامیی کورد العدد الاول محرم ١٤١٢ هـ یولیو ١٩٩١م.

کێشەکەی بناسن لەسەکۆی ئەو کۆنگرەیەشەوە داوای لە ئیسلامخوازانی جیهان کرد کە بەدەم کێشەی کوردەوە بێن و لەم پێناوەدا بەئەرکی ئیسلامیی خۆیان هەڵسن، وەفدی یەکگرتوو لەو کۆنگرەدا چەندان لایەنی کپکراوی کێشەی کوردیان بۆئامادە بووان روون کردەوەو بیریان خستنەوە کە دەیان ساڵە گەلی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی لەلایەن رژێمەکانی بەغداوە دەچەوسێنرێنەوەو مافیان پێشێل دەکرێ و بەدرێژی باسی قوربانیان و گوندو شارۆچکە خاپور کراوەکانی کوردستانیان بۆکردن، هەر لەم پێناوەشدا چەندان پەرلەمانتاری کوردی پەرلەمانی تورکیایان بینی[1] هەرلەو سەرەتایەوە رۆشن بووەوە کە یەکێ لە پایەکانی سیاسەتی یەکگرتوو بریتییە لە (هەوڵدان بۆ زیادکردنی دۆست و هاوکارو یاریدەدەری گەلی کورد[2].

لێرەدا ئەوەی جێی سەرنجە لەبەر چەند هۆکارێکی بابەتی و زاتی و لەبەر سروشتی جموجوڵی یەکگرتوو کەتائێستا کەمتر بەو ئاراستەکاری کردووە تیشکی زۆر بخاتە سەر چالاکییەکانی تاکو ئێستا رای گشتی کوردی بە گوێرەی پێویستە قەبارەی ئەو هەوڵانە نازانن، گەرچی هەرە زۆری خەڵکی وەفاداری کوردستان باوەڕیان وایە کە یەکگرتوو بە دڵێکی پاکەوە خزمەت بەئیسلام و میللەتەکەیان دەکەن[3].

---

[1] میهرەجانی فەتحی (قصطنطینیة) لە رۆژانی ٣٠ – ١٩٩٤/٥/٣١ سازدرا، یەکگرتوو ژمارە (٤) ١٩٩٤/٦/٣٠.

[2] یەکگرتوو سەروتار ژمارە (٤) ١٩٩٤/٦/٣٠.

[3] کاك خورشید هورمزیار ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان لەیادی دووەمین ساڵڕۆژی ئیعلانکردنی یەکگرتوودا، یەکگرتوو ژمارە (٧٩) ١٩٩٦/٦/٩.

چونکە یەکگرتوو توانیویەتی لەچەند ساڵی رابردوودا خۆی بگەیەنێتە ناو دڵی جەماوەر و توانی خۆی وانیشان بدات کە حەقیقەتەکەشی هەر وایە کە خزمەتگوزاری میللەتە لەهەموو مەینەتییەک[1]، بەڵام هێشتا لەم رووەوە پێوستیان بەزانیاری زیاتر هەیە.

هەندێ هەوڵ لەکۆتایی هەشتاکاندا دراون لەکاتێکدا کورد لە بەردەم گەورەترین هەڕشەی قڕکردن و چەوساندنەوەدابوو کە تائێستا پەردەی لەسەر هەڵنەماڵراوەو دەشێ لەئاییندەدا لەیاداشتی هەندێ سەربازی وون و خەڵکی دڵسۆزدا بێتە ئاشکرا کردن.

یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان ئەو دۆستایەتیەی لەگەڵ بزاف و لایەنە ئیسلامییەکانی ناوچەکە هەیبووە دۆستایەتییەکی ئامانجدار بووە وای لێنەکردووە کوێرانە پشتیوانی لەم و لەو بکات بەتایبەتی لەهەنگاو گەلێکدا کەپێی وابووە لەخزمەت کێشەی گەلەکەیەدا نییە،، چونکە پێوەرێکی سەرەکی و بنەڕەتی یەکگرتوو بۆ داڕشتنی سیاسەت و هەڵوێستەکانی هەمیشە بریتی بووە لە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردستان، ئەو دۆستایەتییەی بەدەرفەت زانیوەو سودی لێ وەرگرتووە بۆ قازانج و خێرو خۆشی ئەو گەلەی کە یەکگرتوو لەپێناو ئەواندا سەری هەڵداوەو بۆ ئەوانیش تێ دەکۆشێ و کامەرانی و سەرفرازای ئەوانیشی دەوێ، دەبینین کاتی پارتی (رەفاە)ی ئیسلامیی هەڵبژاردنەکان دەباتەوەو دکتۆر ئەربەکان دەبێتە سەرۆک وەزیرانی تورکیا بەڕێز ئەمینداری گشتی

---

[1] کاک نظام الدین گلی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، هەمان ژمارەو بەهەمان بۆنەوە.

یەکگرتوو وەك رێبەرێك لەناو گەلێکی ستەملێکراودا مامەڵە لەگەڵ رووداوەکە دەکات و وێڕای پیرۆزبایی لێکردن و دواندنی ئەو بەو کەرەسانەی ئەولێیان تێ دەگات لەبیری ناچێت کە داوای لێ بکات لەئاست چارەسەری کێشەی گەلی کوردابێت لەبەشە کوردستانی تورکیا[1] دەمێنێتەوە بڵێین راستە ئەم هەوڵانەو هەوڵی ئیسلامخوازانیتری کورد توانیویەتی شوێنەواری باش بەجێ بهێڵێ و هیچ کە نەبێ وەك بەڕێز ئەمینداری گشتی یەکگرتوو ئاماژەی بۆ کرد بیکات بەباس و خواسی ناو ناوەندو کۆڕو کۆنگرە ئیسلامیەکان و کێشەکە تاراردەیەکی بەرچاو لەو ناوەندانەدا لەنامۆیی دەرکاو بەشی خۆشی هاوسۆزی بۆ پەیدابێت کە تائەمڕۆ لەبەر چەندان هۆی بابەتی رووە مرۆڤ دۆستانەکەی زاڵە بەسەر رووە سیاسیەکەیدا.

بەڵام ئەم رووەی دووەمیشی رۆژ بەرۆژ لەبەرو پێش چووندایەو بەدڵنیاییەوە لەئاییندەدا دەبێتە هۆکارێکی گرنگ لەو هۆکارانەی خزمەت بەپێشخستنی دۆزی کوردو کەم کردنەوەی کۆسپ و بەربەستەکانی بەردەمی دەکات و چەندەها کارت لەدەست ئەو دەسەلاتدارێتییانە کە ستراتیژیەتیان لەسەر دوژمنایەتی کوردو چەوساندنەوەی و نکولی کردن لەمافە رەواکانی دامەزراوە دەسەلمێنێ، دیارە بەو ئەندازەی هێزە کاریگەرەکانی بزاڤی ئازادیخوازانەی گەلی کوردستان دەرك بەبایەخی ئەم هۆکار و ئەم دەورە بکەن و بەو جۆرە رەفتار بکەن کە هاوچارەنووسی سەرجەم تەوژم و هێزە سیاسیەکان لەکوردەواریدا دەیخوازێت، ئەوەندە کاریگەرتر دەبێت و بەرئەنجامی پرشنگدارتری لێ دەکەوێتەوە.

---

[1] یەکگرتوو ژمارە ١٩٦.

له هەندێ بارودۆخی چاوەڕوان كراویشدا دەشێ بایەخەكەی چەند قات بێتەوەو ڕێ لە بەردەم بلۆك بەندیەكی هەرێمایەتی دژ بەكورد بگیرێت و بەپێچەوانەشەوە رەهەندی موسڵمانێتی زۆرینەی هەرە زۆری گەلی كوردستان بكاتە پردێكی پەڕاندنەوەی بەرژەوەندیە رەواكانی گەل بۆ كەناری رزگاری..

خزمەتكردنی كێشەی كورد وەك ئامانجێكی سەرەكی یەكگرتوو

یەكگرتووی ئیسلامیی كوردستان هەر لە یەكەم رۆژی دەستكردن بەخەباتی سیاسی ئاشكراو، بەڵكو لەپێش ئەوەشدا سەبارەت بەواقیعی گەل و وڵاتەكەی و ئەو گۆڕەپانەی خەباتی تیا دەكات و ئەو ئەركانەی دەكەونە ئەستۆی بەرچاو رون بووە.

بەحوكمی ئەوەش كە (واقیعی بوون)ی وەك یەكێ لەجیاكەرەوەكانی هێڵی فیكری و سیاسی خۆی دەستنیشانكردووە، هەوڵیداوە دروشم و بنەماو ئامانج و هەنگاوو كارنامەی بەگشتی رەنگدانەوەی پێداویستیە فكری و رۆحی و سیاسی و كۆمەڵایەتیەكانی ئەم قۆناغە مێژووییەی گەلی كوردستان بێت كە تیایدا سەری هەڵداوە.

یەكگرتوو لە بەردەم روناكی واقیعە نەتەوەیی و نیشتمانی و ئیسلامییەكەی كوردستاندا جارێكیتر چەمكەكانی خوێندنەوە و بەیەكیەوە گرێدانەوە و سەرئەنجامیش لەچوارچێوەی پرۆژەیەكی فكری و سیاسی ئیسلامیی و كوردستانیی هاوچەرخدا جۆشیدان و بەجۆرێكی نەخشە بۆكێشراو ئاراستەی بەدیهێنانی ئامانجەكانی كردن.

دیاره گرێدان و جۆشدانی چەمکە ئیسلامیی و نەتەوەییەکان بەوجۆره لەکوردستاندا و هێنانەکایەی هێڵێکی نوێی بیرکردنەوە و سیاسەت کردن کە دەربڕی رەهەندە جیاجیاکانی کەسێتی و واقیعی ژیان و کۆمەڵگای کوردەواری بێت، بۆناوەندی روناکبیری و سیاسی کوردی تارادەیەکی زۆر شتێکی تازە بوون.

یەکگرتووی ئیسلامیی لەواتا قووڵەکانی کوردستانی بوون ئەو ئەرکانەی ئەم رەهەندە لەکارو تێکۆشانیدا بۆی دیاری دەکات تێگەیشتووە، لەبەر تیشکی ئەو راستییەوە ستراتیژ و دروشم و رێبازی تێکۆشانی خۆی دیاری کردووە، کە بزوتنەوەی ئیسلامخوازی گەلێکی مسوڵمان و بێ بەش و خاوەن کێشەیەکی رەوا و ئاڵۆزی چارەسەر نەکراوە.

هەربۆیەش دیدگاکانی بۆدیاری کردنی ئەرکەکانی وەك بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و حزبێکی سیاسی وەڵامدەرەوەی واقیعی کوردەواری بووە.

رۆژێ لە رۆژان دروشمێکی هەڵنەبڕیوە لە دەرەوەی سنورەکانی کوردەوارییەوە خوازراوبێت و هەڵقووڵاوی ئەو واقیعە نەبێت، یاخود زیان بە بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردستان و خەباتە هەقخوازانەکەی بگەیەنێت، خۆی دور گرتووە لەهەڵبڕینی دروشمی ناواقیعی و میسالیانە، میکانیزم و کلێشە شێواز و فۆرمەڵە مێژووییەکانی پێ پیرۆز نەبووە، هەوڵیداوە لەوساتە مێژوویی و هەل و مەرجە نەتەوەیی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەی کە هەیەو لە ئارادایە، بژی و تێزو چارەسەرو پرۆژەکانیشی سەردەمانەو وەڵامدەرەوەی خواست و هیواکانی خەڵك بن.

بۆیە زۆر بەسادە خۆی ئاوا پێناسە دەکات کە حزبێکی سیاسی ئیسلامییە و تێدەکۆشێت لەپێناو چارەسەرکردنی سەرجەم کێشە سیاسی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەدان، لەدیدێکی ئیسلامییەوە بەجۆرێ ئازادیە گشتییەکان و دادپەروەری کۆمەڵایەتی بۆ گەلی کوردستان فەراهەم بکات[١].

کارکردن لەپێناو مافی رەوای گەلەکەمان و چارەسەری کێشە عادیلانەکەی[٢] شی کردووە بە یەکەم ئامانجی پرۆگرامی پەسەندکراوی کۆنگرەی دووەمی خۆی.

لە (منطلقات و مواقف)ی یەکگرتووشدا هاتووە یەکەم ئامانج لەراگەیاندنی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان هەر لە یەکەم رۆژو لە بنەڕەتەوە برییە لە خزمەتکردنی گەلەکەمان و کارلێکردن لەگەڵ کێشە چارەنووسسازەکانی و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان لەدیدێکی ئیسلامییەوە هەروەها هەوڵ و تێکۆشان بۆگێڕانەوەی مافە رەواکانی و لابردنی ئەو ستەم و زۆردارییەتی تووشی هاتوەو بەدەستیەوە دەناڵێنی[٣].

یەکگرتوو شان بەشانی حزب و لایەنە سیاسییەکانیتری کوردستان لەپێناو بەرژەوەندی و خێرو خۆشی ئەم میللەتەی و چارەسەرکردنی کێشە رەواکەی و

---

[١] پەیڕەوو پرۆگرام/ مادەی یەکەم. دیارە لە پرۆگرامی نوێدا ئیسلامی نەماوەو بووە بەئیسڵاحی نیشتمانیی .

[٢] هەمان سەرچاوە مادەی پێنجەم/ ئامانجەکان.

[٣] منطلقات و ومواقف ص٦.

بەشداری کردنی ژیانی سیاسی و مەدەنی هاتۆتە سەر گۆڕەپانەکەو درێژە بەخەباتی خۆی دەدا[1].

خۆشی وەك هۆکارێ سەیر کردووە بۆ ڕەواندنەوەی عەقڵیەتی شۆڤێنی و گیانی خۆ بەزل زانین و زۆرداری هەروەها بۆ خزمەتکردنی گەل و بردنە پێشەوەی کێشە ڕەواکەی[2].

یەککرتوو پێی وایە نەعەقڵ و نەبەرژەوەندی ڕێگا بەوە نادەن کێشەی ئەو خەڵکانە فەرامۆش کات کە خۆی وەك حزبێکی سیاسی لەناو ئەواندا و بەئەوان و بۆ ئەوان سەری هەڵداوە، بەم جۆرە یەککرتوو بەوە جیادەکرێتەوە کە وەك گەل و خاك و ئاوات بایەخ پێدان، تایبەتمەندی کوردستانی هەیە[3].

هەر لە یەکەم ڕۆژیشەوە بەم گیانەوە هاتۆتە مەیدانی خەباتی سیاسییەوە، سەیر دەکەیت لەبەیاننامەی ڕاگەیاندنی یەککرتوودا لەمیانەی ئاماژەکردن بەستراتیژیەتی خزمەتکردنی بەگەلی کورد (پێ داگرتن و داکۆکی کردن بۆ دەستەبەرکردن و بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانمان لەسەر خاکی خۆماندا و بەرگری کردن لەبوون و مافەکانمان) دەکات بەبنەڕەتێکی مەزن و پایەیەکی گەورەی چالاکی و هەوڵ و تێکۆشانی ، دیارەکارێکی لەو جۆرەش بێ قوربانیدان و بەرەڤانی نایەتەدی.

---

[1] وتاری مەکتەبی سیاسی یەکگرتوو لەئاهەنگی کردنەوەی کۆنگرەی دووەمی حزبدا یەکگرتوو ژمارە (١٠٤) ١٩٩٦/٨/٢٣.

[2] یەکگرتوو ژمارە (١٠٤).

[3] منطلقات ومواقف ص١٥.

هەرلە روانگەی (یەککگرتوو)ەوە خزمەتکردنی گەل و تێکۆشان لەپێناو هۆشیارکردنەوەی رۆڵەکانی گەل و جۆشدانیان بۆ بەرهەڵستی کردنی ستەمکاران و دەستەبەکردنی مافە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان بەشێکە لەئەرکە شەرعی و بەرپرسیاریەتی مسوڵمانان بەرامبەر گەل و نیشتمانی خۆیان[1].

گەر ئەمەی وتمان رەهەندە کوردستانی بوونەکەی یەککگرتوو بخوازێت لەرووە ئیسلامییە رووتەکەشەوە شتێکی نامۆمان نەوتوە، چونکە کوردێکی مسوڵمان دڵنیایە لەوەی کە نەتەوەکەی خۆی لەپێش هەموو نەتەوەیەکیترەوە شایستەی خزمەت و چاکە خوازی خێرخوازییە و سەرمەشقیش لەوکارەیدا سەرجەم پێغەمبەرانە[2].

یەککگرتوو بەم چەمك و ئاراستەو سەرەتایانە ئەندامان و لایەنگرانی خۆی گۆش دەکات ئەندامانی خۆشی بۆ ئەوە پەروەردە دەکات لەبوارە جۆرەکاندا خزمەت بەگەلەکەیان بکەن[3].

ئاشکراشە کاتێك یەککگرتوو بەو جۆرەی باسکرا تێکۆشان لەپێناو چارەسەری کێشەی گەلی کوردو رزگاری و سەروەری ئەم گەلە دەکات بەئامانجێکی سەرەکی خۆی ئەوە خۆی لەخۆیدا خستنەگەڕی وزەی سەرجەم ئەندام و لایەنگرانی لەوپێناوەدا دەگەیەنێت.

---

[1] کێشە سیاسیەکان ص١٢.

[2] یەککگرتوو ژمارە (١٤٠) ٦/٦/١٩٩٧.

[3] یەککگرتوو پەیرەوی ناوخۆ (ماددەی پێنجەم) ئامانجەکان.

سەرەڕای هەندێ پڕوپاگەندەو تەم و مژی گومان و دوودڵی دروست کردنیش بۆخەڵکی کوردستان کارنامەو دۆسێی ساڵانی رابردووی بێ هیچ دوودڵیەك پابەندبوونی یەکگرتوو بەئامانجە راگەیانراوەکانەوە دەخاتە روو.

بەجۆرێك ئێستا یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان قوتابخانییەکی کوردستانییە لەبرەودان بەگیانی خزمەتکردن بەخەڵك و لێبڕان و خۆنەویستی لەپێناو ئامانجە باڵاکانی کۆمەڵگاو بەرژەوەندی گشتی و بڕوا بەخۆبوون و پشت بەخۆبەستن و راستگۆیی سیاسی ، هەمیشەییش بەوگیانەوە ئیشی کردووە کە باڵێکی بزافی رزگاری نیشتمانیی کوردستانە و بەدیدو تایبەمەندی ئیسلامیی خۆیەوە لەسەنگەری تێکۆشاندایە لەبوون و مان و ماق رەوای گەلەکەیدا.

شانازیش دەکات بزافێکی هەڵقووڵاوی ناخی گەلەکەیەتی و خزمەتکاری رۆڵەکانی ئەو گەلەو خاك و وڵاتەکەیەتی.

لەسەرەتاوە پێویستە ئەوە بوترێ کە چارەسەری یەکگرتوو یاخود دیدگای ئەم لایەنە ئیسلامییە بۆ رێگا چارەکان و کۆتایی هێنان بەکێشەکە رەنگە جیاوازی وای نەبێت لەگەڵ ئەو چارەسەرانەی هێزە نیشتمانییەکانی‌تری گۆڕەپانەکە دەیخەنە روو.

چونکە لە روانگەی یەکگرتووەوە (لەگەڕان بەدوای ماف و هەقدا هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئیسلامیی و غەیرە ئیسلامیدا نییە ، گێڕانەوەی حەق و ماف بۆ خاوەنەکەی مەسەلەیەکی ئینسانییە هەروەها لەبنەڕەتیشدا مەسەلەیەکی ئیسلامییە).

ئەم تێڕوانینەش بۆ یەکگرتوو شتێکی سروشتیە، چونکە لەلایەکەوە یەکگرتوو خۆی بەبەشێکی بزوتنەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان دەزانێ و نەیوستووەو ناشیەوێ خۆی لە (اجماع)ی کوردی جیا بکاتەوە لێشی روونە گەورەیی و ئاڵۆزی کێشەکە لەئاستێکدایە تێکەڵکردن و هاوتەریب کردنی رەنج و خەباتی هەموو لایەك و تێکرای جەماوەر دەخوازێت، لەروویەکیتریشەوە ئەو هەرچەندە لەروانگەی ئیسلامەوە دەڕوانێتە چارەسەری کێشەکان، بەڵام پێی وایە ئەم چارەسەرە لەرووی شێوازو میکانیزم و هونەرییەوە شتێك نییە لەئاسمانەوە دابەزیبێ ، بەڵکو بەشێکە لەئەزموونە خەملیوەکانی مرۆڤایەتی هەوێن کراو بەگیان و بەها باڵاکانی ئیسلام یەکگرتوو لەم رووەوە پەیوەستە بەتێڕوانینی بۆناسنامەی کوردەواری و رەهەندەکانی و جۆشدانی مرۆڤی کورد لەسەر رێی بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا.

### تێڕوانینی یەکگرتوو بۆ مافی دیاریکردنی چارەنووس و دەوڵەتی کوردی

رەنگە کەم کەس هەبێ نکولی لەوراستیە بکات کە چارەسەری بنەڕەتی و هەمیشەیی و یەکلاکەرەوەی کێشەی نەتەوایەتی گەلی کوردستان و کۆتایی هێنان بەستەمی نەتەوەیی بەیەکجاری لەسەر ئەم گەلە لەوەدا رەنگ دەداتەوە کەرۆڵەکانی گەلی کوردستان بەویستی ئازادی خۆیان مافی چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن و قەوارەی دڵخوازی خۆیان دروست بکەن، گەر مافی چارەی خۆنوسینیش زۆر بەکورتی ئەوەبێت کە گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو بەئیرادەی ئازادی خۆی و بەدوور لە (وصایە)ی ئەم و ئەو رێوجێ سیاسی و پەیوەندییەکان بەگەل و نەتەوەکانیترەوە دیاری بکات، ئەوا (یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بەحوکمی ئیسلامیی بوون و

کوردستانیی بوونیشی پێی وایە گەلی کوردمان وەك هەموو میللەتانی دنیا هەقی خۆیەتی بگات بەمافی چارەی خۆنووسین و لەو پێناوەشدا دەیان ساڵە خەبات دەکات و قوربانی دەدات[1].

ئەم داخوازییە مافی سروشتی و سەرەتایی هەر گەل و نەتەوەیەکە بەتایبەتی بۆگەل و نەتەوەیەکی وەکو کورد، چونکە نەتەوایەتی کوردی نەتەوایەتیەکی مافخوازییەو کێشەی کوردیش کێشەی گەلێکی مافخوراوە[2].

هەروەها یەککگرتوو لەرووی مەبدەئییەوە دامەزراندنی دەوڵەت بۆ گەلی کوردمان و لەسەر خاکی کوردستان بەرەوا دەبینێت و ئەم سنورانەی ئێستا بەموقەدەس و قەدەری خوایی نازانێت و دەستکاری کردنیشیان گوناە نییە[3].

لەم رووەوە یەککگرتوو لەچەندان بۆنەو لەسەکۆی جۆراوجۆرەوە ئەوەی داوە بەگوێی گەلانی ناوچەکەو کۆڕو بزافەکان و ناوەندە سیاسییەکانیدا کە بۆ دەبێ نەتەوەکانی تورك و عەرەب و فارس بەمافی خۆیانی بزانن دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان هەبێت، بەڵام ئەو مافە لەگەلی کورد حەرام بێت؟

گەر مەسەلە نەتەوایەتییە بەحوکمی ئەوەی کوردیش نەتەوەیەکی دێرین و رەسەنی ناوچەکەیە مافی خۆیەتی قەوارەی نەتەوایەتی خۆی هەبێت، خۆ ئەگەر ئیسلامیش مەترەحە هەموو کەس دەزانێ ئیسلام بەیەکسانی دەڕوانێتە گەل و

---

[1] چاوپێکەتنی مامۆستا محەمەد فەرەج لەگەڵ گۆڤاری (الدعوە)ی ئیسلامی، یەککگرتوو ژمارە (١٩٥) ١٩٩٨/١/١٠.

[2] یەککگرتوو ژمارە (١٨٤) ١٩٩٨/٤/١.

[3] کێشە سیاسیەکانی کوردستان ل٨.

نەتەوەکانی دنیا ئەمەش ئەوە دەخوازێت یان ئەوانیش دەست لەو مافە هەڵگرن یان بەحوکمی ئەو یەکسانییە کوردیش مافی خۆیەتی لەسەر خاك و نیشتمانی خۆیدا خۆی خۆی بەڕێوە بەرێت.

کاتێ گەلی کوردستان و نەتەوەی کورد لەبەر چەندەها هۆکاری هەرێمایەتی و نێو دەوڵەتی و ئەو هەلو مەرجە سیاسییەی لە ئارادایە ناتوانێ دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێ و هێزە سیاسییەکانیشی وەك ئامانجێکی خێرا داوای ناکەن ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەر لەبنەڕەتەوە ئەم مافە لەکورد حەرامە.

### یەککگرتوو و فیدراڵیزم

فیدراڵیەت لای ئێمە مەفهومە و بەمافێکی رەوای میللەتەکەمانی دەزانین[1].

لەسۆنگەی ئەو سیستمە نێودەوڵەتییەی لەئارادایە و تاکو ئێستاش بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی رێگا بەدروستکردنی دەوڵەتی کوردی نادات لەبەرئەوە فیدراڵیەت وەك شێوازێکی چارەسەر بۆدابینکردنی لانی کەمی مافە نەتەوەیی و ئینسانییەکانی گەلی کوردستان لەم قۆناغەدا، بووە بەدروشمێکی نیمچە ناوەندی زۆربەی هەرە زۆری هێزە کاریگەرە کوردییەکانی بزاڤی رزگاری خوازی کوردستان و بەتایبەتیش لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، پەرلەمانی هەڵبژێردراوی کوردستانیش کە بەنوێنەری گەلی کوردستان لەم بەشە لەکوردستان لەقەڵەم دەدرێت (تبنی) ئەم شێوە چارەسەری کردووە.

---

[1] کێشە سیاسیەکان ل١٠.

یەکگرتووش وەك پشتیوانی لەبڕیاری نوێنەرانی هەڵبژێردراوی گەلی کوردستان و هەماهەنگی لەگەڵ هێزە کوردییەکان و بەواقیعی بینینی ئەم شێوە چارەسەرە بۆ ئەم قۆناغەی کێشەکە، فیدرالیزمی کردۆتە دروشمی ئەم قۆناغەی خۆی و لەئەدەبیاتی خۆیدا بەردەوام لەناوەوەو دەرەوەی هەرێم داکۆکی لێ دەکات و لەپەیڕەوو پرۆگرامی خۆشیدا گونجاندویەتی خاڵێکی لەئامانجەکانی پرۆگرامەکەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە، کە دەڵێ (هاوبەشی کردنی هێزە نیشتمانییە عێراقییەکان بۆ بەرپاکردنی سیستمێکی دیموکراسی فیدراڵی تەعەددودی لەعێراقێکی یەکگرتوودا کە مافی هەموان، لەوانەش ماف گەلی کوردستان دابین بکات[١]. دیارە وەك ئاماژەمان پێکرد بوونی سیستمی لەو جۆرە لە چوارچێوی یەکێتی خاکی عێراقدا سەقفی باڵای سەرجەم باڵەکانی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستانە لەم قۆناغەدا خاڵێکی ستراتیژەکانی پەسەندکراوی کۆنگرەی دووەمی یەکگرتووش تایبەتە بەو مەسەلەو تیایدا هاتووە (کێشەی گەلی کورد وەك کێشەی خاك و خەڵك سەیر دەکەین سیستەمی فیدراڵیەت بەگونجاو دەزانین بۆ چارەسەر کردنی کێشەکە[٢].(یەکگرتوو فیدراڵیەت بەئەلتەرناتیفێکی گونجاوو واقیعی دەزانێت بۆ ئەم سیستەمەی ئێستا لەعێراقدا هەیە کەوا کەلەبەرێکی گەورەی لەنێوان خۆی و گەلەکەیدا دروست کردووە[٣]. بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوانەش کە بەناحەق دەیانەوێت پاساوی ئیسلامیی بێننەوە بۆ دژایەتی کردنی ئەم بڕیارەی خەڵکی کوردستان

---

[١] پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆ (ماددەی پێنجەم).

[٢] یەکگرتوو ژمارە (١٨٦) ١٩٩٨/٥/٥.

[٣] منطلقات ومواقف ص٢٠.

ئاماژە دەکات کە ئەم پاساوانە نیازی سیاسی خراپ و تێنەگەیشتن لەگیان و تەنانەت مێژووی ئیسلامییشی لەدواوەیە، چونکە (لەراستیدا سیستەمی ویلایەتەکان یاخود هەرێمەکان سیستەمی پەیڕەوکراوی دەوڵەتی ئیسلامیی بووە، ڕۆژێکیش ئەمە پێچەوانەی یەکێتی وڵات و نەتەوەی ئیسلامیی نەبووە[1]. نوێنەری یەکگرتووش لەدیالۆگی (عەرەبی کوردی) داو لەچاوپێکەوتنێکی خۆیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (الاهرام)ی قاهیرەو گۆڤاری (الدعوە)ی ئیسلامییدا ڕوبەڕووی ڕای گشتی عەرەبی جەخت لەسەر سێ شت دەکاتەوە:

١) مەسەلەی (تبنی) کردنی فیدرالیزم وەك میکانیزمێکی گونجاو بۆچارەسەرکردنی کێشەکە تایبەت نییە بەهێزو حزبێکی دیاری کراوی کوردی، یاخود شەپۆلێکی فکری تایبەتەوە ، بەڵکو شتێکە سەرجەم هێز و لایەن و تەوژمە کوردیەکان بەئینتیمای فیکری و سیاسی جۆراوجۆریانەوە لەسەر مەسەلەکە هاودەنگن[2].

٢) لەوەڵامی پرسیارێکیشدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەنابێ جیهانی عەرەب ئەو هەموو گۆڕانکارییە لەبەر چاو نەگرێ کە لەسەر ئاستی جیهانی و هەرێمایەتی و عێراقی و کوردیدا ڕوویانداوە، کە ناشێ میکانیزم و سەقفی خواستەکان هەروەك دوێنێ مابنەوە بۆیە هەر چارەسەرێ دەبێ لەگەڵ قۆناغەکەدا گونجاوبێت، هەربۆیە ئۆتۆنۆمی بەمانا کۆنەکەی ئەو میکانیزمە

---

[1] هەمان سەرچاوە ص٢٠.

[2] چاپێکەوتنی مامۆستا (محمد فرج) لەگەڵ ڕۆژنامەی (الاهرام)ی قاهیرەدا یەکگرتوو ژمارە (١٩٥).

ئەماوە بتوانێ چارەسەری كێشەی گەلی كوردستان بكات بەتایبەتیش لەكوردستانی عێراقدا[١].

٣) بۆیان دەسەلمێنێ و روون دەكاتەوە كە چاوەڕێی ئەوە نەبن یەكگرتوو وەك لایەنێكی ئیسلامیی لەكوردستاندا لەمەڕ چارەسەری كێشەی گەلی كوردەوە پێچەوانەی هێزو شەپۆلە نیشتمانییەكانیتر و پەرلەمانی كوردستان هەڵوێست بگرێت و لایەنە كوردییەكان داوای فیدراڵیەت دەكەن و ئێمەش جەخت لەسەر ئەوە دەكەینەوە دەبێت چارەسەرەكە لەگەڵ قۆناغەكەدا گونجاو بێت[٢].

جێگای وەبیرهێنانەوەیە كە لەكۆنگرەی (كۆلۆن)ی ئەڵمانیا كە تایبەت بوو بەچارەسەری كێشەی كوردو رابیتەی ئیسلامیی كوردی و هەندێ ئیسلامخوازیتر سازیان كردبوو چەندان برادەر و كەسێتی ئیسلامیی و سیاسی كوردی و غەیرە كوردیشی بۆ بانگهێشت كرابوو، لەوكاتەدا كە لەدوای هێرشەكانی كیمیابارانكردنی كوردستان و شاڵاوە بەدناوەكانی ئەنفال و پاشەكشەی هێزی چەكداری شۆڕشی كوردستان كورد كەوتبووە بەر هەڕەشەیەكی یەكجار گەورەو نائومێدی باڵی بەسەر ئاسۆی بیركردنەوەی رۆڵەكانیدا كێشابو، هەروەها لەكاتێكدا رژێمی عێراق لەلوتكەی زۆرداری و دەسەڵاتی خۆیدا بوو، ناوەندە بڕیار بەدەستەكانی دنیاو كۆڕو كۆمەڵە نێودەوڵەتیەكان و رای گشتی جیهانیش لە بەرامبەر هەموو ئەو تاوانانەدا نەك هەر بێ دەنگیان هەڵبژاردبوو ، بەڵكو یارمەتی رژێمیشیان دەدا، ئالەو كاتەداو

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢] هەمان ژمارەی یەكگرتوو.

لەوکۆنگرەدا سازدەرانی کۆنگرە لەساڵی (١٩٩٠) دا فیدرالیزم و سیستمی ویلایاتی ئیسلامییان بەچارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەی کورد دیاری کردبوو.

کەواتە پێش راپەڕین و پێکهاتنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستانیش وەك خۆی، یەککرتوو کە ئەو کاتە (رابیتەی ئیسلامی کورد) رۆڵی روکارە سیاسیەکەشی دەگێڕا داکۆکی لەسەر مەسەلەی فیدراڵیەت کردۆتەوە، ئەمەش بۆ مێژوو دروستکردن نییە بۆیە یەککرتوو، باس و خواسەکانی ئەو کۆنگرەیە لە ئەرشیفەکانی رابیتەی ئیسلامیی کوردا پارێزاروون[١].

یەککرتوو لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی‌تری عێراقدا هەوڵ دەدات بۆ دامەزراندنی عێراقێکی دوور لە ئیرهاب و تاکرەوی لەحزب و نەژادو نەتەوەو مەزهەبدا، بۆعێراقێکی دیموکراتی و فیدراڵی و تەعەدودی کەماف ئێمەی کورد و دۆستایەتی نەتەوەکانی‌تر پارێزراو بێت[٢].

سیستمێکی لەوجۆرە بەرێگاچارە دادەنێ بۆ کۆتایی هێنان بەنەهامەتییەکانی گەلانی عێراق و رێگرتن لە دیکتاتۆریەت و زامنکردنی بەشداربوونی هەمولایەك

---

[١] بانگی هەق العدد الاول ١٩٩١ کۆنگرەی ئیسلامی یەکەم لەشاری کۆلۆنی ئەلمانیا لەنێوان (١٩ – ٢١ /١/١٩٩٠) گیراو ناونیشانی کۆنگرەکە (القضية الكوردية من رؤية اسلامية) رابیتەی ئیسلامیی کورد دەورێکی گەورەی هەبوو لەزەمینە سازکردن بۆ بەستنی کۆنگرەکە چەندان وەفدی میللی ئیسلامیی لەرەوتە جۆراوجۆرەکانی لەوڵاتانی میسر، شام، عێراق، جەزائیر، سودان، ئێران، ئەورووپاو ئەمریکا بەشداربوون، هەروەها وەفدی هەندێ پارتی کوردی و عێراق بەشداربوون، کۆنگرەکە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە گەیاندنی کێشەی کرود بەویژدانی ئیسلامیی لەسنوری خۆیدا، لەوانەی بەشداربون لەعەرەبەکان (احمد بهجت) لە (الاهرام)و هزرڤانی ئیسلامیی. د. فهمی هویدی و هزرڤان حسن عاشورو کەسانی تر.

[٢] وتاری مەکتەبی سیاسی لە ئاهەنگی کردنەوەی کۆنگرەی دووەمی یەککرتوودا.

لەژیانی سیاسی و بڕیارە چارەنووسسازەکاندا هەروەها داوای دانانی دەستورێکی هەمیشەی دەکات بۆ عێراق کە شێوەی دەوڵەتی عێراقی و سروشتی دەسەڵاتەکان و سنوری دەسەڵاتی ناوەندی و هەرێمی تیا دیاری کرابێت[١].

بۆدیاری کردنی پەیوەندی هەرێمیش بەناوەندەوە پێی وایە پێش هەموو شتێ دەبێت لایەنە سیاسیەکانی کوردستان کێشە ناوخۆیەکان چارەسەر بکەن و ناوماڵی کورد ڕێکبخەنەوەو دوای ئەوە لەهەلو مەرجی گونجاودا بڕیارێکی هەمەلایەنەو یەکگرتووە حیوار لەگەڵ ناوەندا دەست پێ بکەن بەمەبەست دیاریکردنی ئاست و چۆنییەتی پەیوەندی هەرێم بەدەسەڵاتی ناوەندەوە لەسەر بناغەی جێگیرکردنی فیدراڵیەت بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق[٢].

لەم ڕووەوە یەکگرتوو ئەوە ڕەت دەکاتەوە حزب و لایەنێکی دیاری کراو بەتەنها بکەوێتە دانوستان لەگەڵ ناوەنداو خۆی بکات بەتاکە نوێنەری خەڵکی کوردستان، بەڵکو بڕیاردانی هەر شێوە میکانیزمێ بۆ گفتوگۆو دارشتنی کارنامەی گەلی کوردستان پێویستە ڕەنگدانەوەی ئیرادەی سیاسی یەکگرتووی خەڵکی کوردستان و هێزە سیاسییەکانی بێت و گەل بەتوێژە جۆراوجۆرەکانییەوە پشتیوانی لێ بکات.

---

[١] کێشە سیاسیەکان ل٥.

[٢] هەمان سەرچاوە ل ٨ ـ ٩.

**گەلی کورد لەبەشەکانی‌تری کوردستاندا**

یەککرتووی ئیسلامیی کوردستان گەرچی چالاکییەکانی لەهەرێمی کوردستانی عێراقدایە، بەڵام وەك هەر هێزێکی‌تری کوردستانی رەسەن و دڵسۆز بۆگەل و وڵاتە بەشکراوەکەی ناتوانێ لەئاست چارەنووسی گەلەکەمان لەبەشەکانی‌تری کوردستاندا بێ هەڵوێست بێت و لەسنوری قەوارەو تواناکانی خۆیدا بایەخی پێ نەدات و لەبەرچاوی نەگرێت (پشتگیری کردنی مافە رەواکانی گەلی کورد لەبەشەکانی‌تری کوردستانیشی[1] کردۆتە ئامانجێکی گرنگی تێکۆشانی خۆی.

لێرەدا روانگە و هەڵوێستی یەککرتوو لەم رووەوە لەچەند خاڵێکدا کورت دەکەینەوە:

١) یەککرتوو دابەشبوونی گەلی کوردو نیشتمانەکەی لەمێژووی نوێدا وەك بەرئەنجامێکی پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) و دواتر لۆزان سەیر دەکات، دەستی رەشی دوژمن و داگیرکەرانی ئیستیعماری خوێنمژی خۆرئاوای لەپشتەوەیەو کورد بۆتە قوربانی بەرژەوەندییە ناڕەواکانی ئەوان[2].

٢) بارودۆخی بەشەکانی‌تری کوردستانیش لەرووی نەتەوەییەوە خراپە[3].

---

[1] پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆ (ماددەی پێنجەم) ئامانجەکان.

[2] تیشکێك ل (٥٤٠) هەروەها دیدو هەڵوێست ل ٣٤

[3] تیشکێك ل٥٣.

٣) یەککگرتوو دوو دڵ نییە لەمافی رەوای گەلی کورد لەو بەشانەدا، هەربۆیە ئەوەندەی لەتوانایدا بێ هاوکاریان دەکات[١].

٤) هۆشیارکردنەوەی نەوەی نوێی کورد لەپلانی پارچە پارچەکردنی کوردستان و گەلەکەی لەو یەکتر دابڕینەی کە دوژمنانی ئەم گەلە کردیانە پردی پەراندنەوەی مەبەستە ئستعمارییەکەی خۆیان[٢].

٥) یەککگرتوو وەك ئەرکێکی سەرەکی و بەشێ لە ئەرکەکانی ئیدانەی ئەو زوڵم و ستەمانە دەکات کە لە میللەتی کورد لە هەموو پارچەکانیتری کوردستندا کراوەو تائێستاش لەقاڵبی جۆراوجۆردا بەردەوامە (ستەمی دان نەنان بەزمانی کوردی لەهەندێ وڵاتدا، ستەمی پێشێلکردنی هەموو مافەکان، مافی کورد وەك مرۆڤێك وەکو نەتەوەیەك وەکو خاوەن ئایینێك[٣].

٦) پێویستە ئەندام و تیکۆشەرانی یەککگرتوو ئەو بەشە لەخەباتی ئیسلامییان و ئەو عەڵقە گرنگە لە زنجیرەی هەوڵەکانیاندا جیاکەنەوەو توندوتۆڵ گرێی لێ بدەن[٤].

یەککگرتوو پێی وایە لەم هەلو مەرجەی سیستمی جیهانیدا دەبێت کێشەی هەر پارچەیەك لەکوردستان لەچوارچێوەی دەوڵەتەکەی خۆیاندا چارەسەر بکرێت،، چونکە لەئەنجامی تێپەربوونی دەیان ساڵە بەسەر ئەم حاڵەتەدا لەسایەی چەند سیستمێکی جیاوازدا هەربەشێ لەکوردستان تایبەمەندی خۆی بۆ پەیدا بووە

---

[١] هەمان سەرچاوە ل٥٣ ـ ٥٤.

[٢] هەمان سەرچاوە ل ٥٤.

[٣] هەمان سەرچاوە ل ٥٤.

[٤] تیشکێك ل٥٥.

کە بەئاسانی لەسایەی دەوڵەتێکدا کۆناکرێتەوە جگە لەوەش هیچ پشتیوانییەکی نێو دەوڵەتی بۆ پرۆژەی کوردستانی گەورە نابینرێ و هاوکێشە ئیقلیمییەکانیش رێگای پێ نادەن[١].

**سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەپارچەکانیتردا**

یەککگرتوو پێی وایە فیدراڵیەت پرۆژەیەکی گونجاوە لەم قۆناغەدا بۆ هەر بەشێ لەبەشەکانی کوردستان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی خۆیدا داوای بکات.

پێویستە لەو بوارەدا و بۆبەدیهێنانی ئەو ئامانجەش باڵەکانی بزافی رزگاریخوازی کوردستان هاریکاری یەکتر بکەن و ئاستەنگ بۆ یەکتر دروست نەکەن.

یەککگرتوو داوا لەلایەنە سیاسییەکانیتری پارچەکانیتری کوردستان دەکات کە پێویستە بەهەستی لێپرسراویەتیەوە بڕواننە کێشەی یەکپارچەیی کورد لەجیهانداو بەجۆرێك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن کە زیان نەدات لەتایبەتمەندی هیچ پارچەیەکیان و بتوانن لەسەر ئاستی بەرژەوەندی گشتی گەلی کورد و کێشە مێژووییەکەی بنەمای کارکردن و هاریکاری دابرێژن بەجۆرێ کەس زیانی تیا نەکات.

یەککگرتوو لانیکەمی تەنسیقی نێوان هێزە کوردیەکان لەسەر ئاستی نەتەوەییدا لاگرنگە هەر بۆیەهەر ئەوەندەی باس و خواسی مەسەلەی گرێدانی کۆنگرەیەکی نەتەوەیی هاتە گۆڕێ یەککگرتوو لەرێی بەیاننامەی کۆتایی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی شورای ناوەندی لە (١٩٩٦/٣/٢٧) دا ئامادەیی خۆی راگەیاند بۆ بەشداری کردن لەو

[١] کێشە سیاسیەکانی کوردستان ل١٠.

کۆنگرە نەتەوەییەی کە بڕیار بوو لە هەندەران ساز بدرێت بەمەبەستی هاوجوتکردنی هەوڵە جۆراوجۆرەکان.

یەکگرتوو هەر لەسەر ڕێی ئەم ئامانجەداو لە ڕوانگەی بڕوابوونی بە هاوچەرنووسی گەلی کوردستان لەهەموو بەشەکانیدا هەر لە یەکەم ڕۆژەوە هەوڵی داوە ئەوەندەی بەم بکرێت ناکۆکی نێوان باڵەکانی بزاڤی ڕزگاری کوردستان کەم بێتەوەو لەڕێگەی دانوستان و دیالۆگەوە بێنە چارەسەرکردن و دوژمنانی کورد بەقازانجی خۆیان نەیقۆزنەوەو دیوارێکی دەروونی ئەستووریش لەنێوان بەشەکاندا دروست نەبێت.

جگە لەوەی هەوڵیداوە ڕۆژێ لەڕۆژان خۆی نەبێتە فاکتەری گرژبوونی ئەو پەیوەندییانە لەهیچ هەوڵێکی خێرخوازانەو ئاشتیخوازانەش درێغی نەکردووە کە بەئەم ئەنجام درابێ و بەخزمەتی گەلی بێ بەش کوردستانی زانیبێ.

پشتیوانی لەو هەڵوێست و هەنگاوانە کردووە کەئومێدی ئەوەی لێکرابێ دەبێتە مایەی ئاشتبوونەوەی باڵەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازای گەلی کوردستان سنورێ بۆ خوێنی بەفیڕۆ ڕژاوو وزەی تیا چووی لایەنەکان دادەنێت.

هەوڵیشی داوە بۆ ئەوەی هەمیشە ڕۆڵی لەم بوارەدا ئیجابی بێت پەیوەندی لەگەڵ هێزو لایەنەکانی پارچەکانیدا دۆستانەبێت و لەسەر بناغەی ڕێز لەیەکتری گرتن دامەزرێت ئەوەندەی پێشی کرابێت بەدەم ئاوارەو لێقەوماوەکانیانەوە دەبێت خۆی دوورگرتووە لەهەڵوێستی بەزیان بۆسەر کێشەی کوردو هاوچارەنووسیی هێزە سیاسییە ڕەسەنەکانی گەرابێتەوە، بەڵکو نەك هەر ئەمە! هەر دەرفەتێکی بۆ

رەخسا بێت هەوڵی داوە لە خزمەت کێشەکەیاندا بێت، هەرپارت و ناوەندی و کەمایەتییەك لەتوانای ئەمدا بووبێ پەیوەندییان پێوە بکات داوای لێکردوون هەڵوێستیشیان بەرامبەر گەلی کردو کێشەکەی برایانەو بەرپرسانە بێت.

### هەڵوێست دەربارەی پشتگیری نێودەوڵەتی بۆ کێشەی کورد

رەنگە هەندێ کەس وابیربکەنەوە کە ئیسلامی بوونی یەکگرتوو رێ لەوە دەگرێت بە پیر ئەو یارمەتییە نێو دەوڵەتیانەوە بچێت کە بۆ پشتگیری لەکێشەی رەوای کورد پێشکەش دەکرێن؟ بەتایبەتیش کە زۆرێ لەو پشتگیریانە لەمرۆدا خۆرئاواو لەم دام و دەزگایانەوەیە کە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ ئەوان سەرپەرشتیان دەکەن و بەسەریاندا زاڵن، جا لەو روانگەیەوە کە خۆرئاوا دوژمنێکی کلاسیکی ئیسلامخوازانی جیهانەو ناکرێ بۆ لایەنێکی ئیسلامی هەڵوێستێکی ئیجابی هەبێت بەرامبەر هەر دەست پێشخەری و کۆمەکییەك کە لەوێوە سەرچاوە بگرێت، دیارە هەندێ جاریش ئەم خاڵە لەلایەن هەندێ ناوەندەوە وەك کەرەستەی پروپاگەندەی سیاسی دژی ئیسلامخوازانی کوردستان بەگشتی و یەکگرتوو بەتایبەتی بەکارهێنراوە.

بەڵام ئەوانەی یەکگرتوو لەنزیکەوە بناسن و شارەزای بیرکردنەوەو هەڵوێستی فیکری و سیاسی بن و چاودێری رەفتاری سیاسی و جۆری مامەڵەی لەگەڵ کێشەکاندا کردبێت، دەزانن کە یەکگرتوی ئیسلامیی کوردستان لەوپێگەوە هەڵوێست دەگرێت و ستراتیژو نەخشەکانی کاری سیاسی و جەماوەری و تێزەکانی

دادەڕێژێ کە بەشێکە لە حاڵەتی سیاسی کوردستان و بڕیاریداوە هاوکار و هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ هێزە سیاسیەکانی کوردستاندا[١].

هەروەها داکۆکی لەو مەرج و چۆنییەتی و پلان و پرۆژانە دەکات کە خزمەت بە ستراتیژیەتی کێشەی کوردو بارودۆخی کوردستان و ئاییندەی گەل و وڵات دەکەن[٢].

یەکگرتوو وەك هێزێکی سیاسی واقیع بین مامەڵە دەکات و بیردەکاتەوە دەزانێ کە (دنیای ئەمڕۆ سەردەمی ئاڵ و گۆڕی بەرژەوەندییەکانە)..

یەکگرتوو پێی وایە گەر خۆمان بین دەتوانین سوود لە گۆڕانکاری سیاسیەکان وەربگرین و هەلە سیاسیەکان بقۆزینەوەو کێشەکەمانی پێ بەرەو پێش بەرین، خۆمان لە زیانەکانی سیستمی نوێی جیهانی بپارێزین و سوود لە روە ئیجابیەکانی وەربگرین. دەبێت خۆمان بین و لەئاست کێشەو گرفتەکاندا هەستمان زیندوو بێت، پاشان هەوڵ بدەین بۆ جووت کردنی بەرژەوەندییەکانمان لەگەڵ بەرژەوەندی خەڵکانیتر داو بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی نەبێتە هۆی لەبەینبردنی ئامانجە گەورەکانمان.[٣]

وەك لایەنێکی کوردستانیش جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە (دەبێت بەهەر نرخێ بووە هاوتاییەك لەنێوان داوای لایەنانی بەرژەوەندیەخوازی ناوچەیی و دەولی و

---

[١] بەلاغی کۆتایی دانیشتنەکانی ئەنجومەنی شورای ناوەندی یەکگرتووی ئیسلای کوردستان لە ١٩٩٦/٢/٢٧ یەکگرتوو ژمارە (٨٤) ١٩٩٦/٢/٢٩

[٢] چاوپێکەوتنی بەڕێز مامۆستا سەلاحەدین ئەمینداری گشتی یەکگرتوو بەبۆنەی پێنجەمین ساڵڕۆژی یادی ئیعلانەوە

[٣] یەکگرتوو ژمارە (٦٧) ١٩٩٥/١١/١٧.

بەرژەوەندیی باڵاو سەرەکیەکانی خۆماندا ساز بکەین ئەویش بەهەوڵی دیبلۆماسیانە و خوێندنەوەی ئەگەرە چاوەڕوانکراوەکان.

ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە کە بەوردبیانەو دڵسۆزانە تەعامول لەگەڵ هاوکێشە سیاسیەکاندا بکەین و بەعەقڵیەتێکی سەردەمانەوە بچین بەدەم خواست و ڕووداوەکانەوە.[1]

یەکگرتوو لەم ڕووەوە لەرووی ڕەچاوکردنێکی وردی بەرژەوەندی گەلی کوردستان و هەستکردن بەلێپرساوێتی ئیسلامی و نیشتمانییەوە ڕەفتاری کردووە.

هەرگیز ڕێگەی بە خۆی نەداوە هەڵوێستێکی وا بنوێنی زیان بەدەستکەوتەکان و تێکڕای خواست و بەرژەوەندییەکانی میللەتەکەمان بگەیەنێ[2].

ئیسلامی بوونەکەی بەپێچەوانەی هەندێ لێکدانەوەی ڕووکەش و سادەوە، وای لێکردووە لەهەنگاونان و مامەڵ لەگەڵ ڕووداو دەرکەوتەکاندا زیاتر هەستیار بێت.

یەکگرتوو پشتیوانی لەهەر هەوڵ و هەنگاوێك دەکات مەبەست تیایدا کەمکردنەوەی ئەو ستەم و بێ بەشییە بێت کەتووشی کورد هاتووە.

هەر لەم سۆنگەشەوە نەك هیچ کارێکی وای نەکردووە لەگەڵ هەل و مەرجە سیاسیە نوێیەکەی کوردستاندا ناکۆك بێت ، بەڵکو وای بەباش زانیوە هەر دەوڵەت و ناوەندو لایەك لەهەر گۆشەیەکی ئەم جیهانەدا ئاوڕێکی ئیجابی لەکورد بداتەوە، سوپاس بکرێن و ڕێزی لێ بگیرێت.

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٦٨) ١٩٩٥/١١/٢٤.

[2] یەکگرتوو ژمارە (١٧٤) ١٩٩٨/٢/٦.

بۆ نموونە کاتێ دەوڵەتی ئیتالیا لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٩) دا مافی پەنابەری سیاسی بەکۆمەڵێ کوردی کۆچ کردوو بەخشی و داوای لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کرد رێگا چارەیەك بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسودەیی لەولاتی خۆیاندا بژین، وەك مرۆڤ و وەك نەتەوە مافەکانیان بۆدابین بکرێت، یەککرتوو داوای لە باڵەکانی بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کوردستان کرد لەرێی چەند هەنگاوێکەوە گرنگی بەم مەسەلەیە بدەن:

١) سوپاسی تایبەتی حکومەتی ئیتالیا بکرێت لەسەر ئەم هەڵوێستەی.

٢) هەوڵێکی هەمەلایەنە بخرێتەگەڕ بۆ ئەوەی دۆزی گەلەکەمان لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی بایەخێکی زیاتری پێ بدرێت و نەتەوە یەککرتووەکان چارەسەرێك بۆباری نائاسایی گەلەکەمان دیاری بکات.

٣) دەست هەڵگرتن لەشەڕی ناوخۆ تا بتوانین زیاتر سوود لە هەل و مەرجە نێو دەوڵەتیەکان وەربگرین.[1]

بەردەوامیش داوای کۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆی کردووە بۆ ئەوەی کێشەی گەلی کورد جارێکی‌تر نەکەوێتە ژێر پرسیارەوە و پشتیوانی لێکردنی لەلایەن دۆستەکانییەوە بەرەو کزی و لاوازی نەچێت و داوای لەلایەنە کوردیەکان ئەوە بووە واز لە ناکۆکی و ململانێی ناوخۆیی بهێنن و هەوڵەکانیان هەماهەنگ بکەن بۆ ئەوەی

[1] یەککرتوو ژمارە (١٧١) ١٩٩٨/١/٩.

هەوڵ بدرێت لەسەر ئاستی نەتەوە یەکگرتوەکان رێگا چارەیەك بۆدۆزی گەلەکەمان بدۆزرێتەوە.[١]

سەبارەت بە هەوڵە دەرەکیەکان و لەوانەش نێو دەوڵەتیەکان بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی کاولکاری ناوخۆ و گێڕانەوەی ئاشتی و ئارامی بۆ هەرێمی کوردستان.

یەکگرتوو گەرچی وەك هەر کوردێکی‌تری دڵسۆزو هێزو لایەنێکی نیشتمانپەروەری گۆڕەپانەکە حەزی کردووە لە رێی هەوڵە ناوخۆییەکانەوەو لەچوارچێوەی ماڵی کوردیدا کێشەکان بێنە چارەسەرکردن، بەڵام کاتێ لەبەر چەندەها هۆکاری ناوخۆیی و دەرەکی ئەو هەوڵانە بە بنبەست گەیشتوون ئەوا لەو کاتەدا پێشوازی لەهەر ناوبژیوانی و هەوڵێ کردووە کە بەمەبەستی کوژاندنەوەی ئاگری شەڕەکە خراوەتە گەڕو هێزو لایەنە شەڕکەرەکانی هانداوە کەسوود لە دەرفەتە وەربگرن و هەڵەکان لەدەست نەدەن، یەکگرتوو گەرچی زۆرجار گومانی هەبووە لەجدیەتی ئەو هەوڵانەو ئەو نیازانەی لەپشتیانەوەیە.

بەڵام سەرەڕای ئەوە بڕوای وابووە کە لایەنەکان دەتوانن سوودیان لێ وەبگرن و بیکەنە سەرەتایەکی باش بۆ دروستکردنی پردی متمانەو ئاگربەست و وتووێژو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان لە رێی دانوستان و دیالۆگ و لەیەك گەیشتنەوە.

دوایەمین رێککەوتن نامەش کە رێکەوتننامەی (واشنتۆن)ە و بەناوبژی و هەوڵی ئەمریکییەکان ئیمزا کرا یەکگرتوو پشتیوانی لێکرد و هیوای خواست هەردوولایەنی رێکەوتننامەکە بتوانن لە سەقفی زەمەنی دیاری کراودا ناوەرۆکەکەی پیادە بکەن.

---

[١] یەکگرتوو ژمارە (١٧٤) ٦/٢/١٩٩٨.

یەکگرتوو لەبەرئەوەی زیاتر دەپرسێ چی هەیە وەك لەوەی کێ دەیکات، هەر هەوڵ و هەنگاوێك لەباریا بێت کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکات و بنەماکانی دادو یەکسانی پیادە بکات لەناوەڕۆکدا کارێکی ئیسلامییە باخەڵکی مسوڵمانیش پێی هەڵنەستن.

هەربۆیە یەکگرتوو دەچێت بەدەم هەر بانگەشەیەکی خێرەوە کە مافەکانی گەلانی عێراق دەستەبەربکاو چارەی ڕۆشن و گونجاوی پێ بێت بۆ کێشەی کورد لە عێراقدا[1].

ڕاستە یەکگرتوو وەك هێزە نیشتمانییەکانیتری کوردستان هەمیشە بەدڵ ئاواتە خوازبووە، ئەو دەوڵەتانەی کوردیان بەسەردا دابەش کراوەو ناوەندە بڕیار بەدەستەکانیان جورئەتی ئاوڕدانەوەیەکی جددی لەکێشەکە بەخۆیان بدەن، ڕێگا چارەیەکی ئاشتیانەو عادیلانەی بۆ بدۆزنەوەو لەگەڵ کورد پێکبێن و تۆماری ڕەشی خوێنڕێژی و ستەمکردن لەدژی کورد بپێچنەوەو ڕێزیان لەئیرادەی گەلی کورد بگرتایە لەدیاری کردنی ڕێ و جێی سیاسی خۆی و ڕێگایان بدایە بەئاشتی و ئارامی لەسەر خاك و بژێوی خۆی ژیان بەسەر بەرێت.

بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەوەی بەدرێژایی مێژووی نوێ و هاوچەرخ کورد هەمیشە دەستی برایەتی ئاشتی و دیالۆگی بۆ بەرامبەرەکانی درێژ کردووە، ڕێز لەو هەڵوێستەی نەگیراوەو جار لەدوای جار ئابلۆقەی سەری توندتر بۆتەوەو کێشەکەی ئاڵۆزتر و خوێناویترکراوە، کە ڕەوشیش بەم جۆرە بوو شتێکی سروشتییە ڕێگا

[1] یەکگرتوو ژمارە (٧٨) ٢/٥/١٩٩٦ لێدوانی مامۆستا سەلاحەدین بۆ ڕۆژنامەکە.

لەبەردەم دەستێوەردانی ئەو هێزانە دابکرێتەوە کە چاویان بڕیوەتە خێرو بێری ناوچەکە، بەڵام ئەوەی بۆتە هۆکاری ئەم دەستێوەردانە کورد نەبووە، بەڵکو ئەو دەسەڵات و رژێمانە بوون کە ستراتیژیەتی خۆیان لەسەر نکوڵی کردن لەناسنامە و مافەکانی کورد دارشتوە.

داخوازی و خواستی رەوای کوردیان بەئاگرو ئاسن وەڵام داوەتەوە دەرگایان بەرووی پێکەوە ژیانێکی ئازادو ئارەزوومەندانەدا داخستووە، ئامادە نەبوون کێشەکە بەقازانجی برایەتی و هاوچارەنووسیی گەلانی هەرێمەکە چارەسەر بکەن ئەگەر دەسەڵاتدارانی ناوچەکە و گەلانی دراوسێ بەتەنگ چارەسەری کێشەکەوە بونایەو لەو رووەوە بۆشایی دروست نەبوایە کەسانیتر ئەو بۆشاییەیان پڕ نەدەکردەوە هەروەك نوێنەری یەككگرتوو لەدیالۆگی (عەرەبی کوردی)دا روبەڕووی عەرەبەکان وتی (لەبەرئەوەی رۆڵی عەرەب بزر بووە، رۆڵی ئەمریکی بۆشاییەکە پڕ دەکاتەوە).

یەککگرتوو هێزە نیشتمانییەکانیتریش چاك لەوە گەیشتوون کە دەوڵەتانی خۆرئاواو لەوانەش ئەمریکا لەسۆنگەی پەرۆشیان بۆمافی گەلانی چەوساوەو پشتگیری لەخەباتی رەوایان نەهاتوونەتە ناوچەکەو یارمەتی کورد نادەن، بەڵکو بەگوێرەی لۆژیکی سیاسەتی خۆرئاوا هاتنیان بۆپاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانە، هەموو ئەوەمان لەبیرە کاتێ کوردستان کیمیاباران دەکراو سیاسەتی بەکۆمەڵ کوژی دژی دانیشتوانەکەی پەیڕەو دەکرا خۆرئاوا نەك هەر نقەی لێوە نەهات ، بەڵکو لەسەنگەری یارمەتی دانی عێراقدا بوو، بەڵام سەرەڕای ئەمە

کوردیش وەك گەلێکی ستەم لێچوو خاوەنی کێشەیەکی رەوا، مافی خۆیەتی بەدوای بەرژەوەندیەکانیدا بگەڕێ و پارێزگاری لێ بکات، بۆ نموونە کاتێ کورد بەدەست شەڕی ناوخۆوە دەناڵێنێ و بەرژەوەندی لەوەدایە ئەوشەڕە کۆتایی پێ بێت و برایەتی و تەبایی بگەڕێتەوە بۆناو ریزەکانی و دەوڵەتێکی برپیار بەدەستی دنیاش دیسان بەرژەوەندی لەوەستانی ئەو شەڕەدایە لەوکاتەدا کورد ئەگەر پێشوازی لەهەوڵێکی ئەو هێزە کرد بۆ چارەسەری ململانێی ناوخۆو ئەویش بۆ ئامانجێکیترو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی وەڵامی دایەوە، شتێکی راست و دروستی کردووە.

کورد کاتێك دەخرێتە ژێر فشاری توندی مادی و مەعنەوییەوەو وڵاتەکەی لێ دەکرێت بەزیندانێکی گەورەو هەندێ جاریش بەدۆزەخی چەوساندنەوە مافی خۆیەتی بەپیر هەموو بانگەشەیەکی خێرخوازانەو مرۆڤ دۆستانەوە بچێت گەرچی لەبنەڕەتدا بانگەشەکەش بۆمەبەستی‌تر بێت.

یەکگرتووش وەك لایەنێکی ئیسلامخواز ئەوەی لەبەر چاو روونە کە لە فیکرو فیقهی ئیسلامیدا (احکام الضرورة) هەیەو حوکمی بارە نائاساییەکان دەکەن (والضرورات تبیح المحضورات).

لەسۆنگەی کوردستانبوونیشەوە لەبەر رۆشنایی ئەوبارە نالەبارو ناهەموارو نائاساییەی گەلی کورد تیایدا دەژیت پشتیوانی نێودەوڵەتی و بەتایبەتیش UN بە گرنگ دەزانێت بۆچارەسەر کردنی کێشەکە.

دیارە یەکگرتوو تاسەر ئێسقان دژی ئەوەیە کێشەی کورد بکرێتە کارتی سەر مێزی گەمەی سیاسی وازیکارە هەرێمایەتی و نێو دەوڵەتیەکان کەدەیان ساڵە بەو

جۆرە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بەڵام سەرەڕای ئەمە لەبەر تیشکی گۆڕانەکانی سەردەم و ئەو هەل و مەرجە نوێیەی هاتوەتە دی بەنێو دەوڵەتی بوونی کێشەکەو ناسینی وەك کێشەی چارەسەر نەکراوی گەلێکی دەیان ملیۆنی بەهەنگاوێکی گرنگ دەزانێت بۆپەرەسەندنی دۆزەکەو دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی گونجاو بۆی، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو ڕژێمانەش کە کێشەیان لەگەڵ گەلی کورد هەیە زیاتر لەجاران باوەڕ بەوەبێنن کەناکرێ تاسەر ڕێگا چارەی ئەمنی و لەبیربردنەوەی کێشەکە بۆیان بچێتە سەرو بۆخۆیان و هەموولایەك وا باشترە مرونەتی پێویست لەم ڕووەوە بنوێنن.

(یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان هەر لەسەرتاوە پێی وابووە کە دەبوایە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد حسابی جددی بکردایە بۆ ئەو پشتیوانییە نێودەوڵەتییەو سوودی زیاتریان لێ وەربگرتایە بۆ بەرژەوەندی باڵای ئەزموونەکە.. هەرچەندە لەوەش دڵنیایە ئەمریکاو بەریتانیا بەرژەوەندی و حساباتی خۆیان هەیە مەرج نییە لەبەرژەوەندی گەلی کورد بێت، بەڵام ئەوە بەدەر لەئیرادەی ئێمەیەو بەبێ تەسلیم بوون و بۆ سوود وەرگرتن لە هەلەکان و دژایەتی نێوان خاوەن بەرژەوەندییەکان دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەمری واقیع دا بکەین.[1]

بەم جۆرە یەکگرتوو پشتیوانی لەهەر هەوڵ و پشتیوانییەکی ڕاستەقینەی نێودەوڵەتی دەکات لە مەبەست تیایدا چارەسەرکردنی کێشەی کوردو یارمەتیدانی گەلی کوردستان بێت.

[1] کێشە سیاسیەکانی کوردستان ل١٢.

یەکگرتوو لەکاتێکدا لەگەڵ پاراستنی ناسنامەی ئیسلامیی گەلی کوردو بەها باڵاکانی کوردەواری و کەسێتی سەربەخۆی نەتەوایەتیدایە هەروەها بەتوندی دژی پاشکۆیەتی و داگیرکاری فەرهەنگی و خۆبەکەم زانین و لاسایی کردنەوەی کوێرانەیە، بەڵام بۆدابینکردنی دوارۆژێکی کامەرانتر بۆگەلەکەی و خێروخۆشی و سەرفرازی و سەربەرزی رۆڵەکانی لەگەڵ کارلێکی هۆشیارانە لەگەڵ سەردەم و ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندیەکان و سوودلێ وەرگرتنی تەواوی دەرفەت و هەلە سیاسییە رەخساوەکان و هەل و مەرجە نێو دەوڵەتیە گونجاوەکانە بەمەبەستی بەرەو پێشبردنی دۆزی گەلەکەمان و گەیشتن و شادبوون بەمافە رەواکانمان.

## یەکگرتوو.. کێشەی کورد.. برایەتی ئیسلامیی

لەم چەند ساڵەی رابردووداو لەسەر روپەڕی هەندێ رۆژنامەو گۆڤارو لەسەر زاری هەندێ روناکبیرو خەڵکی سیاسی و تاکو ئێستاش باس لەوە کراوەو دەکرێت کە تاکە چارەسەری ئیسلامخوازانی کورد بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەکەیان گونجاندنی کێشەکەیە لەچوارچێوەی برایەتی ئیسلامیداو گێڕانەوەیەتی بۆبازنە تەسکەکانی جاران، گوایە ئیسلامخوازانی کورد لەو دیدگایەوە کە مسوڵمان و گەلانی مسوڵمان هەموو برای یەکترین و پێویست بەخستنەرووی کێشەی نەتەوایەتی وماڵجیایی گەلانی مسوڵمان ناکات و دژی ئەوەن کورد لەسەر بناغەی کوردبوون، داوای داننان بەمافە رەواکانی و قەوارەی تایبەت بەخۆی بکات.

بەڵام لە راستیدا ئەم تێگەیشتنە بەوجۆرە نییە و لایەنگرانی کەوتوونەتە هەڵەیەکی گەورەوە ئەوەی واشی لەمانە کردووە بەمجۆرە بیر بکەنەوە چەند شتێکە کە گرنگترینیان ئەم سێ خاڵەی لای خوارەوەیە:

١) دووریان لەناوەندی فکری ئیسلامیی هاوچەرخ و تەنانەت نامۆبوونیان بەرێبازو میکانیزم و ئامرازو پانتایی و بوارەکانی، بۆیە سەیر کردنەکەیان سەیرکردنێکی مێژوویی رووتە.

٢) هەندێ لێدوانی جوزئی لێرەو لەوێ لەسەر زاری هەندێ کەس کە لەسەر تەوژمی ئیسلامخوازی کوردستان حیساب دەکرێن کە بەشێوەیەکی رواڵەتبینانەی رووکەش گوزارشتیان لەواقیع داوەتەوە.

٣) بەکارهێنانی ئەم قسانە وەك کەرەستەیەکی پروپاگەندەی سیاسی بۆئەوەی دڵی جەماوەری کوردستان لە رەوتی ئیسلامی ساردکەنەوە یان بەلایەنی کەمەوە رارابیان بۆدروست بکەن هەروەك لەسەرەتاشەوە ئاماژەمان بەم خاڵە کرد.

بەڵام یەککگرتوو لەگەڵ ئەوەی کە (برایەتی) بەیەکێ لە مەزنترین پایەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی و گەلە مسوڵمانەکان دەزانێ و خوای گەورەش لەقورئاندا جەختی زۆری لەسەر کردۆتەوەو رێنوێنی باوەڕداران دەکات و بیریان دێنێتەوە کەدەبێ لە راستییەکی گرنگ بێ ئاگا نەبن ئەویش ئەوەیە بە حوکمی شوێنکەوتنیان بۆیەك بیرو باوەڕو رێبازو ئایین کە ئەویش ئیسلامە دەبێت بەو گیانەوە مامەڵە

لەگەڵ یەکتر بکەن کە ئیسلام کردوونی بەبرای یەکترو ئەم برایەتییەش ئەرکیان دەخاتە ئەستۆو مافیان بۆدیاری دەکات.

بەڵێ لەگەڵ ئەمەدا و شانازی کردنی بەوەی دروشمێکی ناوەندی خۆی (برایەتی)یە و یەکێ لەئەرکە گرنگەکانی خۆشی لەناو کوردەواریدا بەوە دەداتە قەڵەم کە هەوڵ دەدات ئەم چەمکە باشتر زیندوو بکاتەوە و وەك چەمکێ بیخاتەوە ناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی، هەروەها ئەوەندەی پێشی بکرێت خزمەت بە برایەتی گەلانی هەرێمەکە دەکات.

بەڵام یەکگرتوو بەسیفەتی ئیسلامی بون و واقیعی بوونیشی چەمك و دەستەواژەکان دەخاتە چوارچێوە سروشتییەکەی خۆیەوەو بەبەکارهێنانیان لەدەرەوەی ئەو چوارچێوانە واتاو ناوەڕۆکیان ناشێوێنێ و ستەمیان لێ ناکات.

بەپێچەوانەی ئەوانەش کە هەروا بێ بەڵگەو هەندێکیشیان بۆمەرامی سیاسی دیاری کراو باس لەم جۆرە مەسەلانە دەکەن، یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان خودی خۆی ئەم چەمك و دروشمە مەزنە بەکاردەهێنێت بۆ دادگایی کردن و خستنەژێر پرسیارو لەروو هەڵماڵینی ئەو فکرو تێزو ڕێبازو لایەن و ناوەندو دەسەڵاتانەی ساڵەهای ساڵە بەناهەق و زۆرداری دوژمنایەتی گەلی کورد دەکەن و گوێ بەو پایە مەزنەی ئیسلام نادەن و ڕەفتارو هەڵسوکەوت و نەخشەیان بەجۆرێکەوە لەدورو نزیکەوە پەیوەندی بەم بارەیەوە نەبێت، بەڵکو کاریان بۆتە چاندنی تۆوی دوژمنایەتی و هەوڵدان بۆ روخاندنی پایەکانی برایەتی راستەقینەی نێوان کوردو گەلە مسوڵمانە دراوسێکانی.

یەککگرتوو دەزانێت هەر لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە (بەریتانیا و فەرەنسا) وەك دوو هێزی ئیستیعماری دەسەڵاتدارو دوژمنی گەلانی مسوڵمانی ئەوکاتە رۆڵی سەرەکیان هەبوو لەوەی کورد لەقەوارەی سیاسی خۆی بێ بەش بێت و کوردستانیشیان دابەشکرد بەسەر پێنج دەوڵەتداو لەوکاتەوەو تائێستاش دان بەوەدا نانێن کە کورد نەتەوەیەکەو شایستەی ئەوەیە قەوارەی خۆی هەبێت، بەمەش تۆوی دووبەرەکیان خستە نێوان گەلانی ناوچەکە.

چونکە کاتێ کورد دوای مافە رەواکانی خۆی دەکات و دەخوازێت قەوارەی تایبەت بەخۆی هەبێت، گەلانی مسوڵمانی تورك و فارس و عەرەب دەستبەرداری خاکی کوردستان نابن و وادەزانن قەوارە کوردییەکە لەسەر حیسابی ئەوان دێتە دامەزراندن.

بەمەش زلهێزانی جیهانخۆر زەمینەی شەڕی ئەو گەلانە یان یاخود بڵێین دەوڵەتەکانیان لەگەڵ کورد رەخساندووەو چەندین ساڵیشە هەروایە.[1]

کەواتە یەککگرتو وا دەڕوانێتە مەسەلەکە کە کێشەی کورد لەبنەڕەتدا دوژمنانی ئیسلام و گەلانی ناوچەکە دەوری سەرەکیان لەسەرهەڵدان و ئاڵۆزبوونیان گێڕاوە، بەشێکە لەنەخشە کلاسیکییە ریسواکەی ئیمپریالیزمی خۆرئاوا کە هەمیشە هەوڵیانداوە تۆوی دووبەرەکی و ناکۆکی لەنێوان رۆڵەکانی یەك گەل و نێوان گەلاندا بچێنن و بەمەش لاوازیان کەن و سەرقاڵیان بکەن بەخۆیانەوەو وزەو تواناکانیان بەفیرۆ بچێت و نەتوانن لە بەرامبەر نەخشەو پیلانەکانیان یەکبگرن و بوەستنەوە.

---

[1] تیشکێك لاپەرە ٢٣.

دابەشکردنی گەلی کوردو نیشتمانەکەی بەگوێرەی سیاسەتێکی ئیستعماری نەخشە بۆکێشراو بەوجۆرەی کە لەهەموو جیهاندا وێنەی کەمە، پشتیوانی بێ درێغ و بەردەوامیان لەو دەوڵەت و دەسەڵاتدارانەی کەپیشەیان بۆتە چەوساندنەوەی کوردو بێ بەشکردنی لەمافەکانی و وەستانەوە بەرووی خواستە ڕەواکانیاندا مەبەستێکی سەرەکی بریتی بووە لەقوڵکردنەوەی برینی نێوان گەلانی ناوچەکەو زەبردانی کوشندە لەبرایەتی و هاوخەباتی و هاوچارەنووسیان، چونکە برایەتی نێوان گەلانی هەرێمەکە بێ چارەسەرکردنی کێشەی کوردو داننان بەمافەکانیانداو شادبونی بەئاواتە دێرینەکانی هەرگیز واتا پەیدا ناکات، بەهەڵایسانی هێشتنەوەی کێشەکەو چارەسەر نەکردنی بەردەوامبونی لەسەر نکوڵی کردن لە مافەکانی گەلی کوردستان و خۆدزینەوە لەهەڵوێست گرتن بەرامبەر واقیعی تراژیدی و کارەساتباری ئەم گەلە ئامادەنەبوونی لایەنی بەرامبەر بۆ چارەسەرێکی ئاشتیانەی ئەم کێشەو کۆتایی پێهێنانی بەوجۆرەی دادپەروەری و پەیوەندی مێژوویی و بەرژەوەندی سەرجەم گەلانی دەڤەرەکە دەیخوازێت. بەردەوام هۆکارێکی گرنگ و بنەڕەتی قوڵکردنەوەی گیانی دوژمنایەتی و ڕق و تۆڵەو فراوانتر بوونی کەلەبەری نێوان ئەم گەلانەو زیاتر نامۆبوونیان بەیەکتر، بۆیە لەبارێکی لەو جۆرەدا (دۆزینەوەی چارەسەرێکی واقیع بینانە بۆکێشەی گەلەکەمان کە کێشەیەکی هەقەو هەنگاونان لەپێناو گەیشتن بەئامانجی هەقیانە ئەو کێشەیەش شتێکی پێویستەو ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە.[1]

---

[1] هەمان سەرچاوە ل ٢٣.

لەو روانگەشەوە کە ئەم سنوورە سیاسیانەی ئەمڕۆ وڵاتانی مسوڵمان نشینی لەیەکتری جیاکردۆتەوە دەستکردن و هیچ قودسیەتێکیان نییە، گەلانی ناوچەکە بۆیان هەیە لەهەر کات و رۆژگارێکدا ئارەزوومەندانەو بەبێ زیان گەیاندن بەیەکتر یان کەسانیتر ماف یەکتر بدەنەوە[1] لەو دوو پەرەگرافەی سەرەوە کە لە ئەدەبیاتی یەککگرتوو وەرمان گرت بۆمان دەردەکەوێت:

١) چارەسەری کێشەکە ئەرکی هەموو لایەکە لەناوچەکەدا هەموو ئیسلامخواز و ئازادیخواز و مرۆڤ دۆستێ، بەتایبەتیش ئەوانەی راستگۆیانە و دڵسۆزانە بەتەنگ ئاشتی و ئارامی ناوچەکە و پەیوەندی دۆستانە و برایانەی گەلانی ناوچەکەوەن.

٢) نابێت سنورە دەستکردەکان بکرێن بەبیانوو یاخود پاساوی بێبەش کردنی گەلێ لەگەلانی مسوڵمان کە کورد یەکێکە لەگەورەترین ئەو گەلانە،، چونکە سنورەکان بەرژەوەندی ئیستیعمار دیاری کردوون و لەبارێکی نائاسایی و بێ رەچاوکردنی راستییەکان رەنگرێژ کراون، بۆیە ئیرادەی گەلانی مسوڵمان دەتوانێ بیانگۆرێت، بەوجۆرەی ئیرادەی ئازادو پاراستنی مافی هەموولایەك دەیخوازێت.

٣) چارەسەرکردنی کێشەی کورد خزمەتێکی گەورە بەبرایەتی گەلانی ناوچەکە دەکات و نەخشەیەکی ترسناکی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا و وابەستەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە.

---

[1] هەمان سەرچاوە ل٢٤

یەککرتووی ئیسلامیی کوردستان کە بەمجۆرە دەڕوانێتە پەیوەندی برایەتی ئیسلامی بەچارەسەری کێشەی کوردو لەو سۆنگەوەیە کە سەبارەت بەدیاری کردنی بازنەکانی برایەتی لەبەرچاو روونە، دەزانێت کە مرۆڤ وەکو تاك لەدنیادا سێ بازنەی سەرەکی برایەتی دەوری داوە، کە بازنەی (برایەتی نەتەوایەتی) و بازنەی (برایەتی ئیمانی) و بازنەی (برایەتی ئینسانی)یە، لەم روانگەشەوە لە ئیسلامدا (نەتەوە)و (ئیسلام) دوو چەمکی بەرامبەر یەکتر نین تا بەراورد بێتە ئارا، بەڵکو پەیوەندییەکی ئۆرگانی بەهێز بەیەکیانەوە دەبەستێت، بۆیە پەیوەندی نێوان (نەتەوە) و (ئیسلام) پەیوەندییەکی (تکامل)یە نەك (تفاچلی). پێغەمبەرانیش بازنەی برایەتیان لەگەڵ نەتەوەکەی خۆیاندا بووە خێروخۆشی پەیامەکەشیان بەپلەی یەکەم یەکەمجار هەر بۆ وان ویستووە لێرەوە هەموو نەتەوەیەکی مسوڵمان دوو ناسنامەی هەیە.

ناسنامەی (نەتەوایەتی) و ناسنامەیەکی (عەقائیدی) ئێمەش وەکو نەتەوەی کوردو کوردبوونمان ناسنامەی نەتەوایەتیمانەو بەشێوەیەکی گشتیش مسوڵمان بوونمان ناسنامەی (عەقائیدی)مانە.

هەرلەبەر ئەمەشە ئیسلامخوازانی جیهان خەباتی نەتەوایەتیان بەبەرنامەی ئیسلام درێژە پێ دەدەن و خەباتی ئینسانیشیان هەر بەو جۆرە.[1]

هەندێ کەس لەوێوە سەری لێتێك دەچێ یاخود دیدگای بۆ مەسەلەکەی لێڵ دەبێت، کە چەمکی برایەتی تەنها لەچوارچێوەی پەیوەندییە شەخسی و

[1] کوردو ئیسلام ناسنامەی نەتەوایەتی و ناسنامەی عەقائیدی یەککرتوو ژمارە (١٠) ٢٢/١٠/١٩٩٨.

فەردییەکاندا دابنێ و کەمتر لەپەیوەندییەکی هاوسەنگی نێوان گەلان لەم سەردەمەدا بەدی دەکات.

مەبەستەم ئەوەیە بڵێم پابەندبوون و پاراستنی چەمکی برایەتی و ڕەنگدانەوەی لەپەیوندی گەلان مسوڵمان بەیەکترەوە تەنها لەیەك شێوازدا وەدەرناکەوێت و بەرجەستە نابێت تەنها بەیەك میکانیزم نایەتەدی و یەك وێنەی نییە، بەڵکو دەکرێت بەمیکاننیزمی جیاواز و لەشێوە و وێنەی جۆراوجۆردا بێتەدی.

پارێزگاری کردن لەگیانی برایەتی ئیسلامی و قوڵکردنەوەشی بەپاراستنی مافی وەك یەکی براکان و پارێزگاری کردن لەتایبەتمەندی سەربەخۆی هەر یەکێکیان دەبێت نابێت گەلێ مافی لەگەلێکیتر زیاتر بێت ئەوکاتەش کۆمەڵێ گەل و نەتەوەی مسوڵمان و سەربەخۆ هەریەك بەتایبەتمەندی خۆیەوە نەتەوەیەکی فکری نوێ پێكدەهێنێنن کە ئەویش نەتەوەی ئیسلامە.

یەکگرتووش لەبنەما گشتیەکانی ناو پرۆگرامی خۆیدا ڕاشکاوانەو بوێرانە ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات و تێڕوانینی خۆی بۆشوێن و ڕێ و جێی کورد لەچوارچێوەی ئەم نەتەوە فکرییەدا دەخاتە ڕوو دەڵێ: گەلی کورد بەشێکە لەنەتەوەی ئیسلامی وەك تەواوی گەلانیتری مسوڵمان مافی خۆیەتی بەسەرجەم مافە ڕەواکانی شاد بێت[1].

---

[1] پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆ (ماددەی چوارەم) سەرەتا گشتییەکان، کۆنگرەی دووەم.

کورد بەشێکە لەنەتەوەی ئیسلامی، بەڵام بەشێ نییە لەنەتەوەی عەرەب یاخود تورك و فارس هەر بۆیە (لێرەوە دەبێت لە خەمی دەستەبەرکردنی مافە رەواکانی نەتەوە کەماندا بین).

خۆنەگەر وەك گریمانەیەك رۆژێ لەرۆژان یەکیەتی نەتەوەی ئیسلامی و جیهانی و ئیسلام هاتەدی، ئەوکاتە دەبێ بەسوود وەرگرتن لەمیکانزیمە هاوچەرخەکان ئەو یەکیەتییە بەجۆرێ بێت تایبەتمەندی و ئیرادەی ئازادی میللەتانی مسوڵمان لەبەرچاو بگیرێت. بۆ نموونە وەك شێوازی لەوشێوازانە ئەو قەوارە کوردییە سەربەخۆ ئیسلامییە دروست دەبێت لەگەڵ تەواوی قەوارە نەتەوایەتییە ئیسلامییە سەربەخۆکانیتردا کۆ دەبنەوەو بازنەی (برایەتی ئیمانی) پێك دێن و بازنەی (برایەتی ئینسانی) دەرەوەی خۆیان دەدوێنن بۆرێنوێنی کردنیان و هێنانیان بەرەو بازنەی (برایەتی ئیمانی) و بەهێشتنەوەی ناسنامەی نەتەوایەتیان.[1]

لەبەرئەوە ئەگەر یەکێك لەژێر پەردەی ئیسلامەوەو بەناوی ئەوە دژایەتی ئەو قەوارە کوردییە بکات کەئیرادەی ئازادی کورد لەژیانێکی سەربەخۆو ئازاددا بەرجەستە دەکات ئێمە روبەرووی دەڵێین: (ئەگەر قسە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی و پارچە پارچە نەکردنییەتی ئەوا ئێمە بەخۆمان و خاکمانەوە هیچ لاریمان لەوە نییەو پارچەیەکین لە نەتەوەی ئیسلامی و پەیوەندی هاوعەقیدی و پێکەوە بەسترانی

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٢١٠).

سۆزو ویژدان و پەیوەندی برایەتی ئیسلامیمان هەیەو هیچ لە موڵکی ئوممەت و خەڵکی ئوممەت ناگۆڕێت ئەگەر ئێمە کیانێك یان شێوە کیانێکمان هەبێت.[١]

ئەمە ئەگەر وا دابنێین کەنیازی پاك و دەرك نەکردنی واقیع و راستییەکان لەپشت ئەم قسانەوەیە واتە ئەو قسەیەی داوای کورد بۆ قەوارەیەکی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی بەهۆکاری دابەشکردنی نەتەوەی ئیسلامی دەزانێت (خۆئەگەر یەکیەتی نەتەوەی ئیسلامییش دەمامکی حکومەتی حزبە قەومیەکان و پاساوی لایەنە ئیسلامییەکانی غەیری کورد و عەرەب، تورك، فارس... هتد بێت هیچ شەرعیەتێکی نییەو نابێت بچینە ژێر کاریگەری ئەو بیرو رایانەو دەبێت خۆمان قاڵبی فکری بۆداخوازیەکانمان دابرێژین ولەرووی ئەوەوە ئەندام و دۆست و لایەنگرانماندا گۆش بکەین و تووشی دڵەراوکێی بەدگومانی نەبن بەرامبەر بەداوای رەوای میللەتەکەیان واش دەزانین ئەمە هەنگاوێکی فکری جەریئانەیە.[٢]

یەکگرتوو وانازانێ تەنها بەبەرزکردنەوەی دروشمی برایەتی و (انما المؤمنون اخوة) بێ دیاری کردنی میکانیزمی گونجاوو پرۆژەی چارەسەرێکی رۆشن کێشەی کورد چارەسەر دەبێت وەك هەندێ کەس وابیر دەکەنەوە کە هەر ئەوەندەی دەسەڵاتێکی سیاسی ئیسلامی هاتە کایەوە یەکسەر کێشەکە لەچوارچێوەی (برایەتی ئیسلامی)دا خۆی چارەسەر دەبێت ناتەواوی ئەم بۆچوونە لەتێنەگەیشتن لە میکانیزمەکانی چارەسەرو خودی چەمکی برایەتیدایە:

---

[١] یەکگرتوو ژمارە (١٨٥) ١/٥/١٩٩٨.

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو

١) برایەتی ئیسلامی پێکبەستێکی ئیمانی و ویژدانی و مەعنەوی گەورەی قورئانییە، بەڵام کێشەی کورد کێشەیەکی حقوقییە دەبێت لەم میراتی خەلافەتی بەشەرەدا لەسەر زەوی من و برا عەرەبەکەم و تورك و فارسەکەم شەرع بکەین و هەریەکەمان هەقی خۆمان ببەین ئەمە دژی برایەتی بوونمان نییەو برایەتیمان ئەو هەقانە ناشواتەوە.

٢) لەشۆڕشی بەدرخانەکانەوە بۆ ئەمڕۆ یان لەجەنگی جیهانی یەکەمەوە بۆ ئەمڕۆ ئەو خوێنبەربوونەی تووشی ئەم گەلە هاتووە پێشینەیەکی قورس و ئاڵۆزو پڕ گرێ و زامی دروست کردوە هەرلەخۆوەو بەبێ هیچ پرۆژەو رێکخستنێکی یاسایی و بەتەنها پشت بەست بەچەمکی برایەتی چۆن چارەسەر دەکرێت؟

٣) گەلی کورد تەنها لەگەڵ گەلانی عەرەب و فارس و تورك برا نییە، بەڵکو لەگەڵ سەرجەم گەلانیتردا بەو واتا ئیسلامییە برایە، گەلانی مسوڵمانیتریش برای یەکترن، بەڵام رێز لە ماف و ئیرادەی ئازادو خواستی مەشروعی یەکترو قەوارەی یەکتر دەگرن.

٤) راستە برایەتی ئیسلامی چەمکێکی ئیسلامی و دەقێکی قورئان و سوننەتە، بەڵام خۆ ئەو دەقانە راستەوخۆ حوکم ناکەن، تا بڵێین هەق و عەدلی موتڵەقن، بەڵکو وەك دەزانین لە رەفتاری دەسەڵاتێکی دیاریکراو دامەزراوە سیاسیەکاندا بەرجەستە دەبێت بۆیە دەکرێت بەناوی خودی برایەتییەوە دەسەڵاتێکی سیاسی دیاریکراو هیچ رێزێ بۆ ئیرادەو کەرامەتی براکان دانەنێت.

٥) بۆ ئەوانەش کە بوونی قەوارەیەکی کوردی و مافی چارەی خۆنووسینی گەلی کورد و بەمایەی پارچە پارچەبوونی جیهانی ئیسلامی و نەتەوەی ئیسلامی دادەنێن و ئامۆژگاریی کورد دەکەن بیر لەو شتە نەکاتەوەو هەموو بۆهێنانەدی خەلافەتێکی ئیسلامی هەوڵ دەدەین و ئەوسا هەموومان رزگارمان دەبێت لە راستیدا تێزەکەیان بەبێ لە ئارا دابوونی پرۆژە و چوارچێوەیەکی سیاسی و یاسایی رۆشن بۆ دابینکردنی مافەکانی نەتەوەی کورد ناواقیعییە لەبەر چەندان هۆ:

أ) ئێمە ئێستا بەکردەوە دەکوژرێین و پاکتاودەکرێین و (تعریب و تفریس و تەتریك) دەکرێین، ئیتر چۆن چاوەڕێی هاتنەدی خەونێ بکەین هێشتا زەمینەو میکانیزمی هاتنەدی روون نییە؟ رەنگە تا ئەو کاتە ئێمە بەکەڵکی ئەوە نەمێنین تۆزقاڵێ لەو دەسەڵاتە پێك بێنین، ئەمە لەکاتێکدا وادانانێین لەئاییندەدا دروست دەبێت.

ب) یەککگرتنەوەو جیابوونەوە لەئیدارەو حوکم و دەسەڵاتدا پەیوەندی بەئیرادەو ویستی ئازادی گەلان خۆیانەوە هەیە، بەشێوەی پێکەوە ژیانی دەستووری یان جیابوونەوەو حوکمی سەربەخۆ هیچ لادان و کزیەك لەدین و ئیمانی هیچ نەتەوەیەکدا دروست ناکات.

ج) ئەزموونەکانی جیهانی ئەوەیان سەلماندووە کە یەکیەتی و یەکبوون بەزۆر ناکرێ هەر یەکبوونێکی لەوجۆرەش تاسەر نابێ و هەرەس دەهێنێ، با ئەو یەکیەتیەش لەو گەل و نەتەوە مسوڵمانەوە دەست پێ

بکات کە هێز و دەسەڵات و قەوارەی تایبەت بەخۆیان هەیە نەك ئەو شمشێرە بەناڕەوا دژی گەلێکی پارچەپارچە کراو و بێ بەش وك کورد بەرز بکرێتەوە.[1]

بەم جۆرە دڵسۆزی هەر گروپ و لایەن و هێزێ لەهەرێمەکەدا بۆبرایەتی ئیسلامی و پەرۆشی بۆیەکرینزی گەلانی مسوڵمان پەیوەستە بەرادەی هەوڵ و تەقەلای بۆچارەسەر کردنی کێشەی مێژوویی گەلی کورد، چونکە بەبێ چارەسەری ئەم کێشە گرنگە لەناو دڵی جیهانی ئیسلام و شوێنێکی ستراتیژی وەك خۆرهەڵاتی (ناڤین)دا زۆر ئەستەمە باس لەبرایەتی و هاوچارەنووسی گەلان و ئاشتی و ئارامی هەرێمەکە بکرێت، یەککگرتووش بەسەرچاوە گرتن لەم راستییەوەو بڕوای بەتینی پێی خەبات و تێکۆشانی نەپساوەی خۆی لەپێناو رزگاری و سەرفرازی گەلی کورد و بەدیهێنانی ئامانجەکانیداو چارەسەری کێشەکەی بەئەڵقەیەکی گرنگ و سەرەکی خەباتی خۆی دەزانێت بۆچالاکردنەوەی چەمکی سرپی برایەتی لەپەیوەندی نێوان گەلانی ناوچەکەو هاوکاری و هاریکاریان بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەو مەترسییە هاوبەشانەی روویان تێ دەکات و ئەو نەخشەو پیلانانەی لەدژیان دادەرێژرێت هەروەها بۆخێرو خۆشی و گەشەکردن و بەرەوپێش چوونی هەرێمەکە بەگشتی کە وەك هەمووما دەزانین قەوارە بچوك و دژ بەیەکەکان و جەستەی دەوڵەتە ماندووەکان بەدەست کێشمەکێش و ناکۆکی و گیروگرفتە ناوخۆییەکانەوە نەك هەر توانای گەشەیەکی

[1] هەمان سەرچاوە.

چۆنایەتی بەرچاویان نابێت لەئاییندەدا، بەڵکو توانای خۆپاراستن لە بەپەراوێز بوون و لاکەوتنیشیان نابێت.

### یەکگرتوو.. کێشەی کورد... واقیعی هەرێمی کوردستان

دوای ئاماژەکردن بەهەندێ سەرەتا و دیدگای یەکگرتوو لەمەڕ مەسەلەکانی پەیوەندیدار بەکێشەی کوردەوە لێرەدا واچاکە چاوێکی خێرا بەدۆسییەی ٥ ساڵ زیاتر خەباتی سیاسی ئاشکرایدا بخشێنین، وەك حزبێکی سیاسی کوردستانی، بۆ ئەوەی لەسەر زەوی واقیعیش (مصداقیە)تی ئەو دروشمانە هەست پێ بکەین کە یەکگرتوو دەربارەی کێشەی گەلی کورد بەرزی کردونەتەوە هەڵبەتە ئەو ٥ ساڵەی کە یەکگرتوو وەك لایەنێکی سیاسی لەسەر گۆڕەپانی هەرێمدا ئامادەیی هەبووەو چالاکی نواندوەو هەڵوێستی گرتووە، وەك هەموو لایەك دەزانین ساڵانێك بوون پڕ لەگیروگرفت و تەنگژەی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر، هێشتا چەند مانگێ زیاتر بەسەر تەمەنی کاری ئاشکرای یەکگرتوودا تێنەپەڕیبوو کە ئەزموونی گەلی کوردستان تووشی هەڕەشەو مەترسی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆهات. بەمەش زۆربەی دام و دەزگا نیشتمانییەکان یان لەکارکەوتن یاخود نەیانتوانی رۆڵی خۆیان بگێڕن و بەکردەوە یەکیەتی خاك و گەلی کوردستان تووشی زەبرێکی کاریگەر هات و شەڕی براکان لەمیانەی چەندەها جەولەی خوێناویدا درێژەی کێشا.

شانبەشانی ئەمیش و بەپێی ئاڵۆزبونی بارودۆخەکەو قووڵبوونەوەی قەیرانەکانی هەرێم دەستێوەردانی هەرێمایەتی نێو دەوڵەتیەکانیش بەشێوەیەکی مەترسیدار

زیادی کردو کوردستان بووه گۆڕەپانی یەکلایی کردنەوەی ململانێی ئەم و ئەو ئاشکرایە لەوەها بارودۆخێکی نەخوازراوو دژواردا ئەنجامدانی چالاکی سیاسی تووشی چەندەها فشارو ڕێگری هەوڵی لەرێ لادان دەبێت، بەتایبەتی بۆهێزێکی بێ میلیشیای وەکو یەکگرتوو کە لەهۆش و بیرکردنەوەی خەڵکدا ئاسان نەبوو مانەوەی هێزێکی مەدەنی وێنا بکرێت.

هەڵبەتە بایەخی بنەڕەتی بۆخودی درێژەدان بەچالاکییە سیاسیەکان نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە بوو چۆن هێزێك لەهێڵی بنەڕەتی خۆی لانەدات و سەربەخۆیی بڕیاری سیاسی و ڕێکخراوەیی خۆی بپارێزێ و نەکەوێتە کایەی ستراتیژی ئەم و ئەو، بەڵام یەکگرتوو بەحوکمی ئیسلامیی بوونی و بەسروشتی پێکهاتەی فکری و ڕێکخراوەیی و جۆری بیرکردنەوەی بۆ کاری سیاسی و جەماوەری توانی لەماوەی تەمەنی ئاشکرای خۆیدا لەم بارە نائارام و شڵەژاوەی هەرێمدا دەست لە (پوابت)ەکانی خۆی بەرنەدات و بەهەموو شێوەیەك لەکێشمەکێشی کوردستان و ململانێی دەسەڵاتدا، سەربەخۆیی و بێ لایەنی ئیجابی خۆی بپارێزێت و بەدرێژایی ئەو ماوەو بەبێ ئەوەی نائومێدو ماندووبێت دەنگێکی زوڵاڵی ئاشتی و برایەتی و یەکڕیزی گەلی کوردستان بێت و لەسنوری تواناکانی خۆیدا درێژە بەخزمەتەکانی بدات، هەڵبەتە بۆ ئەوەی هەڵوێستی لایەنێك لەچەند ساڵی رابردوودا دەربارەی کێشەی گەلی لە هەرێمی کوردستاندا بخەینە روو دەبێ سەیری هەڵوێستی ئەو لایەنە بکەین دەربارەی کۆمەڵێك مەسەلەی وەك (دەستکەوتەکانی گەلی کوردستان، شەڕی ناوەخۆو دەرهاویشتەکانی و تێڕوانیی بۆئاشتی و ئاشتبوونەوەو یەکریزی گەل و هێزە سیاسیەکان، تەعەدودیەت و پرەنسیپی وتووێژ، یاسا سەروەری، یەکیەتی خاك و گەلی کوردستان).

گرنگە ئەم باسو خواسانەش لەوەدایە کە بەرەوپێش چوونی دۆزی کورد لەم بەشەی کوردستاندا پەیوستە بەئەندازەی جێگیر یاخود جێگیرنەبوونی ئەم چەمکانە یا بلێین رادەی بوون یان نەبونیان ، لەبەر تیشکی ئەم راستییەشدا لەخوارەوە بەکورتی هەڵوێست یەکگرتوو دەربارەی هەریەکێ لەو مەسەلانە دەخەینە پێش چاوی خوێنەری بەرێز.

## یەکگرتوو و پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی کوردستان

وەك هەموو دەزانین لەبەرئەنجامی راپەرینی جەماوەری تێکۆشەرو خەڵکی بەش مەینەتی کوردستان توانرا لەئاڵ و گۆرێکی چۆنایەتی بێ وێنە لەمێژووی هاوچەرخی کورددا دام و دەزگا دەیان ساڵەییەکەی دەوڵەت و دەسەلاتداریێتی عێراقی لەکوردستاندا رابماڵی و گەل کۆمەڵێ دەسکەوتی گرنگ بەدەست بهێنێ کەلەپاڵ ئازادی سیاسی و فکری پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان لە گرنگترین ئەو دەسکەوتانە بوون، هەڵبژاردنی یەکەم پەرلەمانی کوردی و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم وەك دەسەلاتێکی نیشتمانی دەسکەوتێکی گەورەی کوردستان بوو، هەنگاوێ بوو کە هیوای ئەوەی لێ دەکرا گەشەی پێ بدرێت و پارێزگاری لێ بکرێت و ببێتە مایەی سەقامگیربوونی کۆمەڵێ دام دەزگای نیشتمانی و میللیترو، وردە وردە پەیوەندییە کوردییەکان لەرێی یاساوە رێك بخرێتەوە.[١]

---

[١] یەکگرتوو ژمارە (٢٢٥) ١٢/٢/١٩٩٩.

یەکگرتوو لە یەکەم بەیاننامەی خۆڕاگەیاندندا پاراستنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و دەستەکەوتەکانیتری بەیەکێ لە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی دانا.[١]

(پارێزگاری کردن لەماف و گەشەدان و بەو دەستکەوتانەی گەلەکەمان لەکوردستانی عێراق بەدیهێناوە[٢] کرد بەیەکێ لەئامانجەکانی کۆنگرەی دووەمی کە لە یەکەم کۆنگرەشدا هەمان خالێ وەك یەکێ لەئامانجەکان بڕیاری لەسەر درابوو، لەکۆنگرەی دووەمدا پەرە بەو خاڵە دراوە کە یەکگرتوو هەربەشێوەیەکی سەلبی نارِوانێتە بابەتەکە. واتە تەنها پارێزگاری کردن لەو دەسکەوتانە بەبەس نازانێ، بەڵکو دەبێ هەوڵی پەرەپێدان و گەشە پێدانیان بدرێت.

هەروەها ڕێزگرتنی دام و دەزگاکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و حکومەتی هەرێم و هاوکاری کردن لەگەڵیاندا بۆچەسپاندنی رژێم و کۆتایی هێنان بەباری پاشاگەردانی و تێڕوانینی تەسکی حزبایەتی[٣] وەك بەشێ لە ستراتیژیەتی خۆی بۆ خزمەتکردن بەکێشەی رەوای گەلی کورد داناوە.

(یەکگرتوو کاری زۆری کردووە لەسەر پاراستنی دەسکەوتەکانی راپەڕینی وای داناوە گەشەدان بەم حاڵەتەی ئێستا ئەزموونی کورد بەرەو پێش دەبات.

بۆیە زۆر بەشەوقەوە بەشداری هەڵبژارنەکانی ساڵی (١٩٩٢)ی کردو پێشوازی لەیاسای حزب و رێکخراوەکان کرد، پشتگیری ژیانی مەدەنی کرد، دەنگی خستە

---

[١] بەیاننامەی راگەیاندنی یەکگرتوو ١٩٩٤/٢/٦.

[٢] پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی یەکگرتوو ماددەی پێنجەم ئامانجەکان.

[٣] منطلقات ومواقف ص١٦.

پالْ دەنگەکانی دژ بەژیانی میلیشیاگەری، لەتێزو پێشنیارو پرۆژە شارستانێتیەکاندا بەشداری چالاکانەی کرد[١].

یەکگرتوو پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی کوردستان بەئەرکی هەمووان دەزانێ و داوا دەکات و وا دەزانێت کە (پێویستە لەسەر هەموان لەپێناو پارێزگاری کردن لە دەسکەوتەکانی گەلە ستەملێکراوەکەمان و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتە لێقەوماوەکەمان خەبات بکەین، هەروەها پشتیوانی لەحکومەت و پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بکەین بۆ بەدیهێنانی دادپەورەری و ئازادی مرۆڤ و پارێزگاری کردنی ئاسایش و بەهێزکردنی برایەتی رۆڵەکانی گەلەکەمان[٢].

مانشێتی ژمارە (١٢٨)ی رۆژنامەی (یەکگرتوو) دەڵێ (پاراستنی دەسکەوتەکانی راپەرین ئەرکی لایەنە سیاسیەکانی کوردستانە).

یەکگرتوو وەك لایەنێکی کوردستانی کە هەلقوولاوی واقیعی رابردوو نوێی کوردستانە، بەچاکی هەستی بەئێش و ئازاری گەلەکەی کردووە، بۆ ئەو مەبەستەش پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلەکەمان و ئەزمونەکەی لەریزی ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی داناوە.[٣]

---

[١] تیشکێك ل٣٤ ـ ٣٥.

[٢] بەیاننامەو راگەیەنراوەکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان ١٩٩٤/٢/٦، ١٩٩٨/١٢/٢٧ لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی راگەیاننی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان ژمارە ١١ لاپەرە ٣٣.

[٣] بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکگرتوو بەبۆنەی چوارەمین ساڵرۆژی یادی ئیعلانکردنەوە رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (١٧٤) ١٩٩٨/٢/٦.

یەکگرتوو داوا دەکات (ئەو هێزو تواناو لێهاتنەی لەبەردەستماندایە بۆپاراستنی ئەزمون و دەسەتکەوتەکان بەکاری بهێنین و ئاگاداربین کە دوژمنی راستەقنییە ستراتیژیەتمان نەگۆرێت بەوەی هێزەکان دژی یەك بەکار بێنێت.[1]

مێژووی چەند ساڵی رابردوو داکۆکی بەردەوامی سەرکردایەتی یەکگرتووش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان هەردەم هۆکارێکی ئیجابی و دڵسۆزو گیان فیدابێت لەپێناو پاراستنی دەستکەوتکانی گەلەکەمان و خزمەتکردنی وڵات و بەدیهێنانی مافە رەواکانیدا.[2]

یەکگرتوو ئەو دەسکەوت و دام دەزگایانەی بەموڵکی خەلی کوردستان و بەری رەنجی خەبات و ماندووبوونی ئەو گەلە داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەپێی وابوە موڵکی هیچ حزب و لایەنێکی دیاریکراو نین، پێشی وابوە بەقوڵبونەوەی ئەزمونەکە مرۆڤی کورد لەسنوری تەسکی (خێڵ) و (حزب) دەردەهێنێ،هەروەها رێ لەو دەستانەش دەگرێت دوبەرەکی و ناکۆکیان لەنێواندا دەچێنێت.[3] پشتیوانی یەکگرتوو لە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەستەکەوتەکانیتری گەلی راپەڕی و پەیوەست نەبووە بەباوردۆخێکی دیاریکراوو مەرجداریش نەبووە بەبەدیهێنانی بەرژەوەندی حزبیانەی خۆی.

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٩٤) ١٩٩٦/٦/١٤ ، سەروتار.

[2] یەکگرتوو ژمارە (١٧٤) ١٩٩٨/٢/٦.

[3] یەکگرتوو ژمارە (١٤٢) ١٩٩٧/٢/٧.

هەر لە یەکەم ڕۆژەوە پشتیوانی کردنی ئەزمونی کوردی ستراتیژیەتێکی نەگۆڕ و چەسپاوی بووە، سەرەتایەك بووە هەڵقوولاوی قەناعەتی قووڵی بەبایەخی مەزنی ئەو دەسکەوت و دام و دەزگایانە بووە، کاتێ ساڵی (١٩٩٢) گەلی کوردستان و هێزە سیاسیەکانی بڕیاری هەڵبژاردنیاندا، ڕۆڵەکانی یەکگرتوو هێشتا ناوێکی ئاشکرایان نەبوو، لەژێر (واجهە)ی جۆراوجۆردا کاریان دەکرد لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان وەك بەشداری کردنێکی ئیجابی لەژیانی سیاسی هەرێم و دەربڕینی هەڵوێستی ڕوون دەربارەی دام و دەزگا نیشتمانییەکان لەمیانەی (لیستی ئیسلامی)دا بەشداری هەڵبژاردنی کرد هەر لەساڵی (١٩٩٤) یشەوە کە وەك حزبێکی سیاسی ئاشکراهاتە گۆڕەپانی خەباتی سیاسی و جەماوەری کوردستان ئەوە بەکردەوە پابەندی ئەو ئامانجە بووە کە تیایدا جەختی لەسەر پاراستنی دەسکەوتەکانی کوردستان کردۆتەوە، لەورۆژەوە بەشایەتی کاربەدەستانی حکومەت و ئەندامانی پەرلەمان و حزبە سیاسیەکان و جەماوەرو گەل لەهەرێمدا هەڵوێستێکی نەگرتووە بەزیانی دەسکەوتەکانی خەڵك تەواو بێت، ڕۆژێ لەڕۆژان کارێکی نەکردەوە مەبەست تیایدا لاوازکردنی ئەزمونی کوردی و لەکەدار کردنی بێت.

پشتیوانی کردنی لەخودی دام و دەزگاکە بوە زۆر گوێی بەوە نەداوە ئەم حزب یان ئەو حزب دەسەلاتی بەدەستەوەیە یاخود خۆی چەند بەشداری بەڕێوەبەرایەتی دەسەلاتی سیاسی کراوە یان نەکراوە، بەڵکو یەکگرتوو ، بەڵکو یەکگرتوو ئەو حزبەیە کە نەك تائێستا هیچ گیروگرفتێکی بۆ پەرلەمان و حکومەتی هەرێم نەناوەتەوە، بەڵکو ئەو گیرو گرفتانەش کە هەندێ جار لەلایەن هەندێ دەزگای

حکومەتەوە بۆی هاتۆتە پێش نەیکردوە بەگیروگرفت و لەچوارچێوەی گیانیی هەست بەلێپرسراویدا رێگرەکانی بەردەم پەرلەمان و حکومەتی هەرێم بکات و لەچارەسەرکردنی قەیرانی دەسەلات و دوور خستنەوە هەرەشەکانی سەریان رۆڵی خۆی بەو جۆرەی ئیسلام و هەستی نیشتمان پەروەرێتی راستەقینە دەخوازێت وای لیَ بکات.

یەکگرتوو لەئێستاو ئاییندەشدا بەباوەڕێکی بەتینترو ئومێدێکی زۆرترەوە لەسەر ئەم هەڵوێستەی سوور دەبێت بەجۆرێ کە پشتیوانی بەشداری کردن لەگەشەپێدانی لەمەودوای لەگەڵ قەوارەو رۆڵی روو لەگەشە کردووی تازەیدا بگونجێت.

هەڵوێستی شەڕی ناوخۆ چ مەترسییەکی گەورەی خستەسەر دەستکەوت وبەری رەنج و خەباتی چەند ساڵەی گەلی کوردستان و ناوو ناوبانگی خەباتە رەواکەی بۆئازادی و سەرفرازای، ئەو شەڕە وێڕای بەفیرۆدانی وەزەو توانایەکی زۆری ماددی و مەعنەوی رێگاشی کردەوە بۆدەست تێوەردانی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی و لەیەك هەڵوەشاندنی یەکیەتی ریزەکانی گەل و هێزە شۆڕشگێڕەکانی.

یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان هەر لە یەکەم رۆژی ئەوشەڕەوە هەڵوێستی روون و ئاشکرا بووە، هەڵوێستی مەحکومکردنی شەڕەکەو هەوڵدان و داواکردن بۆکۆتایی پێهێنانی و سڕینەوەی ئاسەوارە شوم و خراپەکانی بەسەر ژیانی تاك و کۆمەڵگاو تێکڕای بارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوریەکەی هەرێمەوە بووە.

لەروانگەی یەکگرتووەوە شەڕی ناوخۆ (هۆی سەرەکی ئاڵۆزبوونی بارودۆخی کوردستان و سەرچاوەی گشتی نەهامەتیەکانی گەلی کوردستان و هۆی لاوازبونی

بڕواو متمانەی گەلە بەلایەنە سیاسیەکان و مایەی لەدەستدانی دەستکەوتەکان و گەردەلولی بن کەن کردنی ئەزمونەکەمانە، بۆیە بەهەموو شێوەیەك دژی رادەوەستێت و نەفرینی لێ دەکەین و خوازیاری هەرچی زووتر کۆتایی پێهێنانی دەبین و بۆی تێکۆشاوین و بۆشی تێدەکۆشین[١].

یەکگرتوو لەو سۆنگەوە دژی شەڕی ناوخۆ بوە کە (شەڕەکەو ئاسەوارەکانی نەك هەر وزەو لێهاتنەکان و بەری هەڵبژاردنی بەبادا، بەڵکو کێشەی گەلەکەشمانی و پێناسی خباتی هاوچەرخی کوردی خستە ژێر پرسیارەوە[٢].

هەروەها، چونکە (شەڕی ناوخۆ هەمیشە دوژمنان سوودیان لێ وەرگرتووە و رۆڵەکانی گەلەکەمان بوونەتە سووتەمەنی ئەم شەڕە و گرفتەکانیش بەشەڕ چارەسەر ناکرێت[٣].

لەپاڵ ئەمەدا لەدرێژەدان بەشەڕ مەترسی گەورەتر رووبمان تێ دەکات مەترسی لەدەستدانی ئەزموونی ئازادی و قەوارەی سیاسی کورد، هەڕەشەو پەلاماری دوژمنان نەزیفی ئابوری و دەستێوەردان و بێزاری پەیدابوون لەخەباتی سیاسی ریشەداکوتانی گیانی رق و تۆڵەو دووبەرەکی[٤].

---

[١] بەیاننامەی مەکتەبی سیسی یەکگرتوو، یەکگرتوو ژمارە (١١٢) ١٩٩٦/١١/١٥ هەروەها بەیاننامەو راگەینراوەکان ل٧٥.

[٢] یەکگرتوو ژمارە (٩٠) ١٩٦٦/٥/١٧.

[٣] یەکگرتوو ١٩٩٥/١١/١٧.

[٤] یەکگرتوو ژمارە (٣) ١٩٩٤/٦/١٦ سەروتار.

یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان هەڵوێستی لەشەڕەکە هەڵوێستێکی ئیسلامیی و نیشتمانیی رەسەن بوو،، چونکە نەلە روانگەی ئیسلامەوەو نەلە روناگەی سەرەتاکانی کاری نیشتمانییەوە ناتوانرێ پاساو بۆ ئەو شەڕە بهێنرێتەوەو خوێنی بەناهەق برێژرێ و وزەو تواناکان بۆکاولکردنی بەکارببرێن.

لەشەڕەکەدا نەك هەر بەشدار نەبووە لەکاتێکدا رەوش لەبارە بووە بۆهەر کەسێ بیویستایە بەشداری بکات، بەڵکو بەهەرچی پێیکرا بێت و ویستویەتی سەرەڕای ئەوەی خۆی وەکو هێزێك توخمی ئارامی و هێمنی بێت هەروەها هەرچی لەدەستیشی دێت بۆکوژاندنەوەی ئاگری ئەوشەڕە درێغی نەکردووە، لایەنەکانی لەمەترسی درێژەدان بەشەڕو ئاسەوارە خراپەکانی ئاگادار کردووەتەوە بێلایەنی ئیجابی خۆی پاراستووەو لەژێر هیچ گوشارو هەڕەشەو رەوشێکدا ئەو بێ لایەنییەی لەدەست نەداوە، گوتاری سیاسی و راگەیاندنی داواکردن بووە بۆ ئاشتی و ئاشتبوونەوە و چارەسەری کێشەکان بەرێگا چارەی ئاشتیانە.

تێڕوانینی یەککگرتوو بۆ مەسەلەی ئاشتی تێڕوانینێکی قووڵ و پشت ئەستوورە بەچەمك و بنەما ئیسلامی و قورئانییەکان، ئەوەتا لەبەیاننامەی مەکتەبی سیاسی بەبۆنەی یەکەمینساڵڕۆژی راگەیاندنی یەککگرتووەوە دەڵێ (یەککگرتووی ئیسلامیی کوردستان ئاشتی و ئاسایش وەك پێویستییەکی حزبی سەیر ناکات، بەڵکو ئاشتی وەك نیعمەتێکی خوا دەزانێ و خوای پەروەردگار بەرەحمەتی خۆی داناوەو هەر کاتێك هەڕەشەی فەوتانی لەگەڵێك کردبێت لەرێی هەڵگرتنی ئاسایشەوە بووە بۆیە ئاشتی مەسەلەیەکی مەبدەئییەو جێبەجێکردنی مەفهومێکی قورئانی و دروشمێکی بەرزی یەککگرتووەو هەرچی لە دەستی بێت بۆ ئاشتی و ئاسوودەیی گەل و

ئاشتبوونەوەی نیشتمای دەیکات و پێی وایە هەنگاوێکی مبدەئی ناوە، بۆیە لەم ڕۆژەدا بەگەرمی داوا لە لایەنە ئاشتیخوازو دۆستی بەرقەراربوونی یاساو ئارامی دەکەین کول نەبن و کۆڵ نەدەن و گلەیی و تەنانەت زویر بوونیش ساردیان نەکاتەوەو بەدڵێکی ساف دوور لە نەفعی بوونەوە باهەوڵی کوژاندنەوەی ئاگری شەڕی ناوخۆ، شەڕی کورد کوژی بدەین، داوا لە هەموو حزبەکان بەتایبەت دوولایەنە شەڕکەرەکە دەکەین رەحم بە خەباتی خۆیان و لێقەوماوی میللەت بکەن و دەست هەڵگرت و ئاشتی بەر قەرار بکەن.

هیوادارین تەبایی و هاودەنگی حزبەکان بۆ وەستان لەدژی دیاردە سیاسیە چەوتەکانی کۆمەڵگا بەردەوام بێت و بەرژەوەندی کوردستان و گەلی کورد پێوەری راستی و ناڕاستی کارەکانمان بێت نەك حزبایەتی و قەناعەتی شەخسی[١].

یەکگرتوو لەدرێژایی شەڕی ناوخۆدا ئاشتبونەوەی نیشتمانی لەکوردستاندا بە ئەرکێکی زەروری و هەنووکەیی زانیوە پێش هەر هەنگاوێکیتری چارەنووسساز، چونکە وادەزانێت ئەوشاتبوونەوەیە زامنە بۆ هەر پرۆژەیەکیتر لە کوردستان و عێراقدا[٢].

لە ئاهەنگەکانی یۆبیلی زێرینی (پارتی دیموکراتی کوردستان)یشدا مەکتەبی سیاسی یەکگرتوو دوای دەربڕینی ئەو راستیە کەشەڕی ناوخۆ فرسەتی لە بەردەم

---

[١] بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان بەبۆنەی ساڵڕۆژی ئیعلانکردنیەوە ١٩٩٥/٢/٦ بەیاننامەو راگەیانراوەکان ل٥١.

[٢] ڕوونکردنەوەیەك لەمەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانەوە دەربارەی باروئۆخی کوردستان لە ١٩٩٦/١١/٩دا رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (١١٢) ١٥/١١/١٩٩٦.

هەوڵ و تێکۆشانی دڵسۆزانی گەل و نیشتماندا کەم کردوەتەوە بواری داوە بە دوژمنان و هەلپەرستان بۆدەستتێوەردان لەوەزعی کوردستان.

دواتر ئاشکرای دەکات کە یەکگرتوو بەئەرکی هەموو لایەکی دەزانێت لەم قۆناغەدا بەتایبەتی پارتی کە هەوڵی جددی بەردەوام بدات لەپێناو نەهێشتنی ئەو شەڕەو ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کوردستان و وەدیهێنانی ئاشتبوونەوەیەکی گشتی و سەرانسەری لەکوردستاندا بۆتیمارکردنی برینەکان و رێکخستنەوەی سەر لەنوێی ناوماڵی کوردستان و پاراستنی لەدەستتێوەردان و پیلانی ناحەزان.[1]

لەراگەیەندراوێکی (مەکتەبی سیاسی)شدا دەربارەی ١/ ئەیلول رۆژی ئاشتی جیهانی وێڕای پیرۆزبایی کردن لە ئاشتی خوازانی کوردستان و جیهان هیوا دەخوازێت هەموو هێزە سیاسیەکان و تێکڕای جەماوەری کوردستان ببنە پشتیوانی دڵسۆزی ئاشتی، لە پێناوی یەکخستنەوەی یەکجارەکی ناوماڵی کوردی و یەك دەنگی هێزە خەباتگێڕەکانی کوردستان و بەخشینی گوڕوتینێکی نوێ و کاریگەر بەبزاڤی رزگاریخوزای گەلەکەان و رامالینی ئەو کەندو کۆسپانەی کەلەئاکامی دەرهاویشتەی شەڕی ناوخۆوە کێشەی گەلەکەمانی ئالۆزکردو رەوتی هەڵەکانی خزمەت و ئاشتی پێشکەوتنی خاو کردوە.[2]

لەروویەکی‌ترەوە بەپیرەوە چوونی هەر هەوڵێکی ئاشتی لەپاریس بێت یان لەندەن و ئەنقەرە یاخود عەممان و دبلن یان هەر جێگیەکی دی بەمەرجی پاراستنی

---

[1] بەیاننامەو راگەیاندراوەکان ل٨٨.

[2] راگەیەنراوی یەکگرتووی ئیسلامیی بەبۆنەی رۆژی ئاشتی جیهانییەوە ١٩٩٨/٩/١ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١١٠.

سەروەری و خوێندنەوەی بەرژەوەندی باڵای میللەت و دوور لە هەر مەرج و گوشارێکی ناعادیلانە بەئەرکێکی شەرعی و نەتەوەیی و مێژوویی هەردوو حزبی حوکمڕان زانیوە لە کوردستاندا، بەڵام پێشی وا بووە ئەگەر ئەو شوێنە کوێرە دێ و کونجێکی پەرلەمان و بەشداران و چاودێرانی خۆماڵی بن ئەوە شەرەفێکی مێژوویی و سەربەرزییەکی نەتەوەییە بۆ هەردوولایەن و هەموو میللەت و مێژووی سیاسی هاوچەرخی کوردستان بەگشتی.[١]

هەر بۆیە یەککگرتوو لەگەڵ (تحفظ) دەربڕین لەسەر هەندێ لەمەرجە سەپاوەکانی هەندێ لەو رێکەوتننامانە کەبەقازانجی گەلی کوردستانی نەزانیوە، هەروەها لەگەڵ ئەوەش کەپەرۆشی ئەوە بووە نیازی پاك و ئیرادەی جێبەکردن لەپشت ئەو هێزە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییانەوە نەبێت کەبەشداری ئەو رێکەوتنانەیان کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەوە پشتیوانی لەو هەوڵانە کردووە، کاتێ زانیویەتی بارەکە لەوە دەرچووە هەوڵە ناوخۆییەکان کێشەکان بەلادا بخەن ئەوکاتە ئاشتی لەسەر دەستی هەرکەس بێتە دی هەر بەشایانی ئەوەی زانیوە پشتیوانی لێ بکرێن دوایەمین رێکەوتننامەش رێکەوتننامەکەی (واشنتۆن)ە کە یەککگرتوو پشتیوانی لێکردو هیوای جێبەجێ کردنی بۆخواست.

یەککگرتوو هەروەك خۆی لە پەرۆشییەوە بۆئاشتی لەکوردستاندا خۆی رۆژی لەرۆژان کارێکی وای نەکردووە ئاشتی و ئارامی لە خەڵکی کوردستانی ئاشتیخواز بشێوێنی هەروەها لەپاڵ ئەوەشدا لەیەکەم رۆژی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆوە

---

[١] یەککگرتوو ژمارە (٧٦) ١٩/١/١٩٩٦.

لایەنە بەشداربوەکانی ئەوشەڕە هەرلایەن و هێزی بوو‌بێت، بیَ ماندوبوون و نائومێدبوون، بیَ وچان و بیَ درێغی کردن بانگەشکەرێکی کۆڵنەدەری ئاشتی و ئاشتبوونەوەی گشتی بووە ئەوەی بەتەنها بەباشی زانی بێت کردوویەتی هەر لە لیژنەی ئاشتی و برایەتیشەوە کەلەسەرتای شەڕەوە بۆرێگەگرتن لە تەشەنەکردنی شەڕەکەو کۆنترۆڵکردنی هاتەکایەوە تا (١٧) حزبەکەو حەوت حزبەکەو لیژنەی هاریکاری نیشتمانی و چەندین چوارچێوەی‌تری خەبات بۆئاشتی وەك هێزێکی کاریگەر بەشداری گەرم و نەپساوی کردووە و بەدڵ و بەگیان لەوپێناوەدا تێکۆشاوە و قوربانی بۆ داوە، بەجۆرێ کەئاشتی خوازیی لە چەند ساڵی رابردوودا لە هەرێم بۆتە یەکێك لە سیما ناسێنەرو جیاکەرەوەکانی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان. کەناوی یەکگرتوو دێت خەڵکی بیری ئاشتیخوازی و هەڵوێستی نەگۆڕیان بەرامبەر بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانی بیردێتەوە، گەرچی هەندێ کات ئەو سووربونەوەی یەکگرتوو لەسەر هێڵی ئاشتیخوازانەو بانگەشەی بەردەوامی بۆرێگا چارەی کێشەکان لێکدانەوەی نادروست و نیازخراپانەو خراپی بۆکراوەو هەوڵدراوە گومانی بەدەوردا هەڵچنرێ.

بەڵام ئەم شتانە یەکگرتووی لەو رێبازە پەشیمان نەکردۆتەوەو دوودڵیشی بۆدروست نەکردووە، چونکە خێروخۆشی گەلەکەی و رۆڵەکانی ئەم وڵاتەی لەسایەی ئاشتی و تەبایی و رەوینەوەی‌تەمی شەڕو ناکۆکی و ململانێی نابەجێدا بینیوەتەوە.

شەڕ و ناکۆکی و خوێنرێژی بەمایەی لەدەستدانی سەروەری و سەربەرزی و دەستکەوتەکانی خەڵك زانیوەو دژایەتی کردنی ئەو شەڕەو نەفرین لێکردنی و هەوڵدان

بۆبەرپێگرتن و کۆتایی هێنانی بەئەرکێکی ئیسلامیی و نیشتمانیی گەورەداوەتە قەڵەم.

هەڵوێستیشی لە خودی شەڕەکە گرتووە،، چونکە وەك دەریش کەوت ئەوە هەڵوێستێکی دروست و بەجێیە، گەر نەشی توانیبێ لەبەر چەندەها هۆکاری بابەتی پەیوەندیدار بە ڕەوشی هەرێم و ناوچەکەو سروشتی هێزەکانییەوە، لەکوژاندنەوەی شەڕەکەو چەسپاندنی ئاشتیدا سەرکەوتووبێت، ئەوا لانی کەم خۆی لەوە پاراستوە، لایەنێکی ئەو شەڕەبێت بەمەش تا رادەیەك پانتایی شەڕەکەی تەسك کردۆتەوە واش بیری کردۆتەوە کە کێشەو ناکۆکی و تەنگ و چەڵەمەکان بەشەڕ چارەسەر ناکرێن، بەڵکو قەیراناویترو ئاڵۆزتردەبن، لایەنە ناکۆکەکان زووبێت یان درەنگ دەبێت لەرێی گفتوگۆی راستەوخۆوە ئەو کێشانە چارەسەر بکەن،، چونکە جیۆسیاسی کوردستان و هاوکێشە سیاسیەکان رێگا بەوە نادەن لەکوردستاندا هێزێ بتوانێ هێزێکیتری بەرامبەری بەیەکجاری لەگۆڕەپانەکە وەدەرنێ و هەڵوێستەکە بەقازانجی خۆی یەکلایی ببێتەوە.

لە روانگەی ستراتیژی ئاشتی پەیڕەوکراو لەلایەن یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستانەوە یەکگرتوو بەردەوام بانگەشەی ئەوەی کردووە کێشەکانی هەرێم، بەڵکو ناکۆکی و کێشەکانی نێوان سەرجەم باڵەکانی جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانیی کوردستان لەرێگای گفتوگۆی بابەتیانەو هێمنانەو لەیەکتری تێگەیشتن و رێگاچارەی سیاسی و ئاشتیخوازانەوە بێنە چارەسەرکردن لەدیدی یەکگرتووەوە (هەرچەندە سروشتی بیرکردنەوەو دیدگا ئایدیۆلۆژیەکان و پێگە فیکرییەکان جیاوازبن هەرگیز

ڕەوا نییە کەسەر بکێشن بەرەو پێکدادان و ململانێی شەڕانی و نیازی (تصفیە)و ڕامالێنی یەکدی.

خەڵکانێ ئەمەیان لێ دەوەشێتەوە بڕوایان بە دیکتاتۆریەت و تاکڕەوی هەبێت نەك دیموکراسیەت و ئازادی بیروڕاو تەعەدودیەت.[1]

دەبێت لەهێزو شەپۆلە فیکری و سیاسیەکان لەجیاتی دوژمنایەتی کردنی یەکترو بەیەکدادان لەوتووێژدا بن لەگەڵ یەکتردا، چونکە (تەنها هێزی دانوستان وتووێژو گفتوگۆی هێمنانە گرێی گیرو گرفتەکان دەکەنەوە و گەل و وڵات لەتەنگانەی چەندین قەیرانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی قوتار دەکەن و ڕوسووری مێژوویی پڕ سەروەری سیاسەتمەداران تۆمار دەکەن[2] یەکگرتوو لەسەروتاری ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی یەکگرتووی زمانحاڵی خۆیەوە هەمیشە ئاواتە خواز بووە کەهەموو لایەك لەفیکری حیوارێکی ڕاستەقینەو گەرم و گوڕدابن و چاوی جەماوەر بەئاکامە ئیجابیەکان و سەرکەوتنی هەنگاوەکان و برایەتی و تەبایی ڕۆشن بێتەوە[3].

نەفرەتی یەکجارەکی لەناکۆکی و شەیتانی تۆڵەو ڕق و کینە بکرێ و بەرژەوەندی باڵا لەبەرچاو بگیرێت و گیانی لێبوردەیی و چاوپۆشی بکرێتەوە بەبەر لاشەی سڕو ماندوماندا.[4]

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٦٧) ١٩٩٥/١١/١٧.

[2] یەکگرتوو ژمارە (٦٨) ١٩٩٥/١١/١٢

[3] یەکگرتوو ژمارە (١) ١٩٩٤/٥/١٩.

[4] یەکگرتوو ژمارە (٢) ١٩٩٤/٦/٣.

له بەلاغی کۆنگرەی دووەمی یەکگرتوودا داوا له هێزه خەباتگێڕەکانی کوردستان کراوه که هاوخەباتیان پێکەوه بەردەوام بێت کۆبوونەوه لەسەر چەمك و خاڵه هاوبەشەکان بکرێته سیمای خەباتی سەردەم.[١]

لەرێ و رەسمی یادی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفا)ی بارزانیشدا مەکتەبی سیاسی داوا له رێبەرانی بزاڤی رزگاریخوازی گەلەکەمان دەکات کەریزەکانیان یەکبخەن و تەبایی و ئاشتی خوازی بکەنه هەوێنی هەوڵ و خەباتی سیاسیان لەپێناو پاراستنی بەرهەمی خەباتی گەل و رەنجی پێشەوایان وخوێنی شەهیدان.[٢]

یەکگرتوو رێزگرتن لەتەعەدودیەت وەك دیاردەیەکی پێکەوه ژیانی شارستانی و ئینسانی هەروەها پشتگیری کردن له سەروەری یاساو بەرقەرابوونی ئاسایش و دوروکەوتنەوه له پاشاگەردانی بەیەکێ له ستراتیژەکانی خۆی له هەرێمدا دیاری کردووه[٣] راگەیەندراوی کۆتایی کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجومەنی شورای ناوەندی داوا له سەرجەم خوشکان و برایانی یەکگرتوو و لایەنگران و دۆستانی و جەماوەری گەلەکەمان دەکات بەردەوام بن لەسەر پاراستنی هێمنی و ئارامی و هۆکارێکی باش و کاریگەر بن بۆ بالآدەستی یاساو بەرقەراربوونی ئاشتی و ئارامی لەهەرێمی کوردستاندا.[٤] بەڵکو هەوڵ و کۆششی شێلگیرانەی بۆ گێڕانەوەی ئاشتی و

---

[١] یەکگرتوو ٣/٨/١٩٩٦.

[٢] یەکگرتوو ژمارە (١٢٨) ٧/٣/١٩٩٧.

[٣] یەکگرتوو ژمارە (١٨٦) ٨/٥/١٩٩٨.

[٤] بەیاننامەو راگەیەنراوەکان ل٢٢

بەرقەراربوونی دەسەڵاتی یاساو کۆتایی هێنان بەپاشاگەردانی و چارەسەرکردنی باری گوزەرانی خەڵك و درێژە پێدانی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی ئەم دەڤەرە وێرانەی لەهەل و مەرجی دوای راپەڕین و بەتایەتیش ئەو چەندساڵەی شەڕی کاولکاری ناوخۆ درێژەی کێشا، بەقەیرانی راستەینەی سەرجەم غەمخۆرانی گەلەکەمان لەریزی تەواوی حزب و رێکخراوو لایەنەکانی سەرگۆڕەپنەکەدا زانیوە.[1]

دووپاتیشی کردۆتەوە ، بەڵکو چەند پاتی کردۆتەوە کە (هاکاری و دەست لەناو دەست نانی هەموو خەباتگێڕانی کوردستان جگە لەوەی کە زەروورەتێکی لەبەرچاوە تاقە کلیلی چارەسەری کێشەکانی ئەم وڵاتەشە، بەجۆرێك کەس لەبوونی خۆی نەترسێ و بیرکردنەوە لەچارەسەری قەیرانەکانی کوردستان بکرێتە خەمی هەموولایەك[2].

هەرلەسەرەتاوە رایانگەیاندووە تەنها رێگەی چارەسەری کێشەکان لەهەرێمدا وتووێژی عادیلانەو گفتوگۆی (منگق)یەو وازهێنانە لەشێوازی تۆقاندن و توندوتیژی.[3]

یەکگرتووی ئیسلامیی سەبارەت بەچارەسەری قەیرانی دەسەڵات لەهەرێمدا باوڕی وابووە کەسەرەتا شەڕی ناوخۆ کۆتایی پێ بێت و ئاشتی و هێمنی باڵ بەسەر کوردستاندا بکێشێ و بارەکە ئاسایی بکرێتەوە ئەنجا زەمینە بۆ هەڵبژاردنێکی پاك و بێ گەرد خۆش بکرێت، یەکگرتوو هەڵبژاردن لەکوردستاندا بەکارێکی پێویست و

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (٧٩) ١٩٩٦/٢/٩.

[2] هەمان ژمارەی یەکگرتوو سەروتار.

[3] یەکگرتوو ژمارە (٣) ١٩٩٤/٦/١٦.

هۆکارێکی شارستانی زانیوە بۆدیاری کردنی نوێنەرانی راستەقینەی گەل و بریاردان لەمەسەلە چارەنوسیەکان هەروەها بەچاکترین سەنگی مەحەکی زانیوە بۆیەکلایی کردنەوەی کێشەکان و بەگیانێکی دیموکراسییانەو لەکەش و هەوایەکی فرە حزبی و دوور لەمیلیشیاگەری و تۆقاندن.[1]

چونکە (هەڵبژاردنی گشتی دەتوانێ کۆتایی بە کێشەی دەسەڵات و قەیرانی ناکۆکییە ئیدارییەکان بهێنێ، چونکە سندوقی هەڵبژاردن سنورو ئاستی بەشداری حزبەکان دیاری دەکات و ژیانی سیاسی و ئیداری و فرە حزبی کوردستان دەباتە ئاستی باڵای کۆمەڵگایەکی مەدەنی و ئازاد، کارتی هەڵبژاردن نمرە بۆ ئەم خەڵکە سیاسیانە دادەنێ و پۆست و پایەو پلەیان بۆدیاری دەکات، کارتی هەڵبژاردن حەکەم دەبێت و پابەندبوونی لایەنەکانیش بەئەنجامەکانییەوە ئاستی دیموکراسی بوون و کوردپەورەری و حەز لە خزمەتگوزاری و یاسا سەروەریان دەستنیشان دەکات، هەڵبژاردن چارەسەرێکی حەتمی کێشەکانە، پرۆسەی هەڵبژاردن زەقترین ئەزموونی خۆناسین و ناسکترین وەڵامی میللەت و رونترین ئاوێنەی خۆبینین و بەسۆزترین باوەشکردنەوەی جەماوەر یا بە پێچەوانەوە جوابکردن و تەمێکردنە[2].

دیارە هەڵبژاردنیش کاتێ رۆڵی کاریگەری خۆی دەگێرێت کە لایەنەکان پابەندبن پێیەوە، پەرلەمانێکی دەسەڵاتدارو حکومەتێکی بنکە فراوان و ئیئتیلاف لێبکەوێتەوە، کە ئەم جۆرە حوکمە بۆ هەرێم و بارەکە گونجاوە، یەکگرتوو لەژیانی سیاسی هەرێمدا

---

[1] رونکردنەوەی مەکتەبی سیاسی یەکگرتوو، یەکگرتوو ژمارە (١١٢) ١٩٩٦/١١/١٥.

[2] چاوپێکەوتنی بەرێز مامۆستا سەلاحەدین لەگەڵ رۆژنامەی یەکگرتوو ژمارە (٢٢٤) ١٩٩٩/٢/٦.

توخمێکی گرنگی ئارامی و هێمنی بووه رۆڵی کاریگەری هەبووه لەوەی حاڵەتی ئیسلامی و رەوتی ئیسلامخوازی لەکوردستاندا بەرچاو روناتەو لەچوارچێوەی رەچاوکردنی واقیع و باری سیاسی کوردستاندا رەنگرێژی سیاسەتی خۆی بکات و بێت بەکەناڵێکی‌تری خزمەت و خەبات بۆکێشەی رەوای گەلی کوردستان ، لەرووی فیکری و سیاسی و تەنەنات کۆمەڵایەتیشەوە ئەوەندەی پێی کرابێ درێغی نەکردووە کە گیانی خوێندنەوەی یەکترو رێزگرتن لەرای بەرامبەر گوێ لە یەك گرتن و وازهێنان لە نەریتی خۆسەپاندن و هەوڵدان بۆ سرینەوەی بەرامبەری ببێ بە بەشێك لەکەلتوری سیاسی و کۆمەڵایەتی هاوچەرخی کورد، ئەندامانی خۆی لەسەر ئەم شێوازە بیرکردنەوەو رەفتار کردنە پێگەیاندنووە ، بەڵکو هەر لەم پێناوەدا قوربانیشی داوەو بەرگەی زۆر فشاری دەروونی و تەنانەت لەهەندێ کات و جێدا ماددیش گرتووە.

دانی بەخۆدا گرتووەو کارێکی نەکردووە باری کوردستان بەرەو ئاڵۆزتر بچێت کێشەکانی خۆی لەگەڵ دەوروبەردا لە رێی ئارامگرتنی شۆرشگێرانەو گفتوگۆی راستەوخۆوە چارەسەر کردوون، مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەریدا مامەڵەیەکی راستگۆیانەو راشکاوانە بووە بۆیە ئەگەر بڵێین لە ئەمرۆی ژیانی سیاسی هەرێمدا یەکگرتوو قوتابخانەیەکی سەربەخۆی (حیوار)ە زیادەرەویمان نەکردووە،، چونکە ئەو کۆمەڵگایەی کە یەکگرتوو دەیەوێت دروستی کات کۆمەڵگایەکی هەمە رەنگی یەك دەنگی لێبوردەو کراوەیە.

## دژایەتی کردنی دەستێوەردانی دەرەکی

هەموو کوردێکی ئەم کوردستانەو رۆڵەیەکی ئەم وڵاتەو ئاگاداریەکی کاروباری کوردی دەزانێ کەدەستێوەردانی دەرەکی لەساڵانی رابردووی دوای راپەریندا چ رۆڵێکی گەورەو کاریگەری لەئاڵۆزکردنی بارەکەدا گێڕاوە، چۆن کێشەکانی قووڵ کردوەتەوەو چارەسەرەکانی لەبار بردوون، یەکگرتوو وەك لایەنێکی ئیسلامیی نیشتمانیی سەر گۆڕەپانی سیاسی و جەماوەریی کوردستان و لەروانگەی هەستکردنییەوە بەبەرنجامە مەترسیدارەکانی ئەو دەستێوەردانە دەرەکیانەو رۆڵیان لەقوڵکردنەوەی ناکۆکی و قەیرانەکاندا هەر لەسەرەتاوە هەڵوێستێکی رۆشن و راشکاوی بەرامبەر ئەم مەسەلە هەبووەو دژی هەمو دەستێوەردانێکی دەرەکی بووە لەکاروباری ناوخۆی هەرێم بەهەر بیانویەکەوە بێت.[1]

هەروەك لەبەیاننامەی کۆتایی دووەمین کۆنگرەی خۆیدا ئاماژەی پێکردوەو داوای کردووە گرنگی تایبەت بەپرۆژە ناوخۆییەکان بۆکۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆ بدرێت و زەمینەی دەستێوەردان ساز نەکرێت، تاماف و ئەرکی دراوسێیەتی هەرێم لەگەڵ دەوروبەریدا پارێزراو بێت.[2]

یەکگرتوو لەماوەی رابردوودا شەڕی ناوخۆی بەهۆیەکی سەرەکی ئەو دەستێوەردانانە زانیوە، هەربۆیە بەردەوام و بێ پسانەوە داوای وەستاندنی شەڕەکەو

---

[1] یەکگرتوو ژمارە (١١٢) ١٩٩٦/١١/٥.

[2] یەکگرتوو ١٩٩٦/٨/٣٠.

بەلاداخستنی ناکۆکیەکان و ئاشتبوونەوەی نیشتمانی کردوە، بۆ ئەوەی دەرگا بەرووی ئەو دەستانەدا دابخرێت کە دەیانەوێت بۆمەرامی تایبەتی خۆیان هەرێم و بزاڤی نیشتمانی کوردستان بخەنە تەنگژەیەکی سیاسی، ئابوری، کۆمەلآیەتی و ئەمنی قولەوەو نەتوانن گەشە بە توانازاتیەکان و دام و دەزگا نیشتمانییەکانیان بدەن.

یەکگرتوو هەلۆیستی بنەڕەت و نەگۆڕی لەم رووەوە هەمیشە ئەوە بووە لەجیاتی سەودا سازشی سیاسی بۆ ئەم و ئەم پێویستە هێزو لایەنە کوردستانییەکان لەناو خۆیاندا رێککەون و دوای ئەوەش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ دراوسێکاندا لەسەر بناغەی رێزی بەرامبەرو سەرەتای دراوسێیەتی باش و بەرژەوەندی هاوبەش دابمەزرێنن، ئەوەندەی پەیوەندی بەخۆشیەوە بووبێت لەداڕشتنی جۆری پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ دەوروبەر هەولێداوە لەوچوارچێوەی سەرەوەدا بێ کە باسمان کردو عەودالّی دوای دەستکەوتی کاتی نەبووە.

سازشی بەسەر ئامانجە بالآکان و (ثوابت)ەکانی کوردەواری و کاری نیشتمانی کوردستانییەوە نەکردووە، شێوازێکی تێکۆشانی وای هەلّبژاردووە بۆخۆی کە ناچار بە (تنازل) نەبێ لەم روەوە تا رادەیەکی بەرچاو سیاسەتێکی (خۆبژێوی) گرتۆتە پێش.

نەشی ویستوە ئالآی دوژمنایەتی ولآتانی دراوسێ و نێودەولەتی بەرز کاتەوە کە لە حالەتی ئاساییدا هیچ هێزێکیتری کوردیش ئەوەی ناوێت،، چونکە وەك هەموومان دەزانین بۆ ئەمڕۆی کورد لەهەرێمدا هەلۆیستێکی لەوجۆرە لەقازانجی گەلی کوردستان و کێشەکەیدا نییەو کوردستان دەکاتە گۆڕەپانی یەکلایی کردنەوەی ململانێکانی ئەم و ئەو و ئەمەش بەجۆرێکیتر هەڕەشە لەئاشتی و ئاسایشی هەرێم دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لەساڵانی رابردوو تەمەنی سیاسی خۆیدا چەندان جار بە هەڵوێستی رەسمی و ئاشکرا دەستێوەردانەکانی بۆکاروباری ناوخۆی هەرێم رەخنە کردووە، بەڵام لە هەمانکاتدا لەئاستێکی دیاری کراودا پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەو هێزو دەوڵەتانە ئاسایی بووەو هەوڵیداوە توخمێکی دڵنیاکردنەوەیان بێت بەرامبەر ئەو قەوارە کوردییە دیفاکتۆیەی لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا دامەزراوە، بەجۆرێ کە هەڕەشە نییە بۆسەر هیچ وڵاتێك، بەڵکو خزمەتێکی باش بە ئاشتی و ئاسایشی هەرێم دەکات، کوردیش وەك گەلێکی مسوڵمان و دێرینی ناوچەکە، هەروەها وەك گەلێك کەلە مێژوو لە ژێر باڵی ستەم و زۆرداریدا دەناڵێنێ، هەقی خۆیەتی لەسەر خاکی مێژوویی خویدا بەئازادی و ئارامی بژی و لەم رەوشەوە چاوەڕێی لالێکردنەوەی مسوڵمانان و مرۆڤ دۆستانەی دراوسێکانی بێت، چ وەك دەوڵەت یاخود وەکو گەل و بزاڤەکان بەم جۆرە گەر دۆسیەی ساڵانی رابردووی یەکگرتوو هەڵبدەینەوە دەبێت هەڵوێستی یەکگرتوو لەمەڕ دژایەتی کردنی دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی هەرێم و هاندانی چارەسەرە ناوخۆییەکان بۆکێشەی شەڕی ناوخۆ هەوڵدان و داواکردن بۆ لە رەگ و ریشە دەرکێشانی ئەو هۆکارانەی لەپشت دەستێوەردانەکانەوەن، هەروەها دامەزراندنی پەیوەندییەکی رۆشن و راشکاو لەسەر بناغەی سەرەتای دراوسێیەتی باش و ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی هەڵوێســتێکی مەبدەئی بووە.

ئەمە لە روکارێکەوە تێڕوانینی یەکگرتوو بۆئاییندەی پەیوەندییەکانی نێوان گەلانی ناوچەکە دەخاتە روو لەرووییەکی‌تریشەوە سەربەخۆیی بڕیاری سیاسی یەکگرتوو بەرجەستە دەکات.

پێویست بەوە ناکات باسی بایەخی لەرادده بەدەری یەکیەتی و یەك دڵی رۆڵەکانی گەل بکەین، لەپێناو سەرکەوتن و گەیشتن بە ئامانجەکان هەروەها ئەو زیانە زۆرەی لە بەرنجامی ناکۆکی و دووبەرەکی و هەڵوەشاوەیی ریزەکان تووشی دەبین.ناکۆکی و دوو بەرەکی هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی چەندان راپەرین و سەرهەڵدانی کوردبووە، بەداخێکی زۆریشەوە بەپێچەوانەی چاوەڕوانی رۆڵەکانی گەلی کوردستان لەدوای راپەرینەوە هەرێمی کوردستان بووە گۆڕەپانی ناکۆکی و ململانێی قووڵی نێوان هێزو لایەنە کوردستانییەکان، بەتایبەتیش نێوان هەردوو هێزە گەورەکە یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکرات، ئەمەش هەڕشەیەکی جددی لە دەستکەوتەکان کردو چەندان دەرفەتی لەدەستداو زەمینەی بۆ دەستێوەردانی دەرەکیش خۆشکرد، یەکگرتوو بۆتەواوکردنی چوارچێوەی خزمەت بە کێشەی کورد بەردەوام تێکۆشاوە بۆ یەکخســـتنەوەی ئەو دەنگە دڵسۆزانەی لەپێناوی میللەتدا هەوڵ دەدەن و هەوڵیداوە کە لەســـەر خاڵە هاوبەشەکان کۆببنەوە بۆ ئەوەی بەهەموویان رێگاچارەیەکی گونجاو بۆ کێشەی گەلەکەمان بدۆزنەوە.[1]

یەکگرتوو بڕوای وایە یەکبوون و یەکیەتی هێزو لایەنە کوردستانییەکان و توێژەکانی جەماوەر مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ وەستانەوە بەرووی ئەو مەترسی و هەڕەشانی روودەکەنە گەلی کوردو بزوتنەوە نیشتمانی و دەسکەوتەکانی.

مەبەستی یەکگرتووش لەیەکبوون و یەکیەتی ریزەکان واتای سڕینەوەی رەنگە جۆراوجۆرەکان ناگەیەنێت، بەڵکو هەر رەنگێ بۆی هەیە شانازی بە خۆیەوە بکات و

---

[1] تیشکێك ل٤٠.

بانگەشە بۆتێزەکانی بکات، بەڵام دەکرێت دەنگی خاوەن رەنگەکان یەککەون و لە کۆرسێکی رەنگاورەنگ و ئاوازێکی یەکگرتووی پێکەوە گونجاودا هەڵبڕین.[١]

یەکگرتوو واقیعی بوونی ململانێی نێوان رەوت و شەپۆل و لایەنەکان رەتناکاتەوە، بەڵام بەو جۆرە دەڕوانێتە مەسەلەکە لەباتی پەتای دووبەرەکی و رق و کینە گیانی پێشبڕکێی لەمەیدانی خزمەتکردندا پەرە بستێنێ.[٢]

هەربۆ ئەم ئامانجەش هەوڵیداوە پەیوەندی دۆستانەیخۆی لەگەڵ سەرجەم هێزو لایەنە نیشتمانییەکان پەرە پێ بدات و چاو لەزۆر شت بپۆشێ و ئاراستەی پەیوەندییەکان سەرەڕای چەندان کۆسپ و بەربەست بەئاقاری گەشەکردندا بەرێتە پێش و تووشی تەنگژە نەبن.

کاتێ لێرەو لەوێش بەهەر هۆیەکەوە بووبێت خراوەتە ژێر فشار، ئارامگرانە روبەڕووی بۆتەوەو بەشێوازی تایبەت بەخۆی و لەچوارچێوەی بەخەمەوە بوونی باری ناسکی کوردستان و برایەتی و یەکیەتی ریزەکانی گەل و هێزە تێکۆشەرەکانی، هەوڵیداوە لەرێی دیالۆگ و لەیەکتری تێگەیشتنەوە چاوپۆشی لەهەندێ دەستکەوتی تایبەتی، گیروگرفتەکان چارەسەر بکات و رێ لە ئاڵۆزبوونیان بگرێت و بەجۆرێ ململانێ سیاسی و حزبییەکان بەڕێوەبەرێت کە ئەم قۆناغەی خەباتی گەلی کورد و بزاڤە نیشتمانییەکەی دەیخوازێت.

---

[١] تیشکێك ل٤١.

[٢] تیشکێك ل٤٨.

هەوڵیشیداوە رەفتاری رۆژانەی رەنگدانەوەی دروشمە ناوەندییەکانی بێت لەوانەش دروشمی (برایەتی) بەجۆرێ کە (برایەتی) وەکو چەمکێکی ئیسلامی جارێکیتر زیاتر لەناو فەرهەنگی کوردەواریدا ببوژێتەوەو ئیسلامیش وەك ئایین و بیروباوەڕی زۆربەی هەرە زۆری گەلی کورد رۆڵێکی بنەڕەتی ببینێ لە یەکخستنی ریزەکاندا، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بەرامبەر کوردەواری بەر چاوروون بووە، هەوڵی ئاژاوەنانەوەی فکری و ئایدیۆلۆژی نەداوە بەگشتی کۆمەڵگای کوردستانی لەگەڵ هەموو ئەو لادان و کەم و کوڕییانەی لەو رووەوە لە ئارادان بەکۆمەڵگایەکی مسوڵمان زانیوە.

ئەرکی خۆشی لەوەدا دیاری کردوە کە لە روانگەی بیرو باوەڕی خەڵکەوە خزمەت بەرۆڵە بەشخوراوەکانی گەل بکات و هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی بدات.

ئەندام و دۆست و لایەنگرانی خۆی لەسەر ئەوە گۆش کردووە کە خەڵکیان خۆش بوێت و رێز لە رای بەرامبەر بگرن و هۆکاری قووڵبوونەوەی گیانی برایەتی و لێبوردەیی بن لەناو کۆمەڵدا، لەداڕشتنی گوتارو میکانیزم و شێوازی کارو خەباتدا بازنە و کۆت و بەندە دواکەوتوەکانی تێپەڕاندوە بەتوندی دژی دەمارگرژی و ناوچەگەری و شتی لەم چەشنە وەستاوەتەوە کەهەمیشە هۆکارێکی دابڕان لەیەکتری و ناکۆکی بووەو دوژمنانی کوردیش قۆزتویانەتەوەو سوودیان لێ وەرگرتووە، لەروویەکیترەوە بە کردەوە نەك بەقسە باوەڕی خۆی بە تەعەددودیەتی فکری و سیاسی خستۆتە روو.

لەپرۆگرامی خۆیدا داکۆکی لەهاووڵاتیانی غەیرە مسوڵمان و نەتەوەکانی غەیرە کورد کردووە لەگەڵ هێزو لایەنە جیاوازەکان لە ئینتیمای فکری و سیاسیاندا بەدوای

خاڵە هاوبەشەکاندا گەڕاوە لە ڕووی تیۆری و بەکردەوەش لەگەڵ کوردستانێکی یەکپارچە و حکومەتێکی یەکگرتوو و گەلێکی هاوچارەنووس و کۆمەڵگایەکی کراوە و لێبوردە و خۆشگوزەران و گەشەکردووە فرە ڕەنگدابووە، بێ لایەنی و سەربەخۆ بوونیشی لەشەڕی ناوخۆی هەرێم و کێشمەکێشی نێوان لایەنە دەسەڵاتدارەکان و خەباتی نەپساوەی بۆ ئاشتی و ئاشتبوونەوە بەشێ بووە لە ستراتیژیەتی خزمەتکردنی.

## کۆتایی بەشی یەکەم

## پێشەکی

ئەم کتێبە ئەڵقەی دووەمی زنجیرەی ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردییە. بەجۆرێ لەجۆرەکان تەواوکەری ئەڵقەی یەکەمە. لەخۆگری چەند فەسڵ و کۆمەڵێ بابەتی جۆراوجۆرە کە هەریەکەیان بەحوکمێك و لەگۆشەیەکەوە دەچنە ناوبازنەی ناسیۆنالیزمی کوردی و مەسەلەیەکی ئەو تاوتوێ و چارەسەر دەکەن. لەناونیشانی کتێبەکەوە دیارە کە بەشی زۆری فەسڵ و بابەتەکانی بۆ خوێندنەوەیەکی مەیدانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی تەرخان کراوە. واتە سەیری کۆسپ و کێشە و ئیشکالیەت و سروشت و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ناسیۆنالیزمەکە لەناو مێژوودا کراوە. خوێندنەوەی مێژووییانەی لەم جۆرەش دروشم و خۆمۆبیلیزەکردنی هێزە ناسیۆنالیستەکان ملکەچ دەکات بۆ پێدراو و ڕەنگدانەوەکانی مێژوو. خوێندنەوەی مێژووییانەی بزاڤ و ئایدیاو فکرێك لەمێژوودا کە نوسەر بەخوێندنەوەیەکی مەیدانی گوزارشتی لێداوەتەوە زەمینەی بەخۆداچوونەوەو گەشانەوەی بیری ڕەخنەگرانە خۆش دەکات. هەڵبەت لێرەدا مەسەلەیەك جێگای سەرنجەو نابێت لەبیری هەموو لایەك بچێت، ئەویش ئەوەیە کە وروژاندنی مەسەلەی خوێندنەوەی مەیدانی سەبارەت بەبزاڤی ناسیۆنالیزمی کورد واتای سەلماندنی ئەوە نیە کە ئەم ناسیۆنالیزمە لەسەر ئاستی تیۆری و فکریدا بێکێشەیە و جەوهەری

کێشەکە لە پراکتیکدایە نەك لەفکردا. هەروەك مارکسیەکان و ئیسلامیەکانیش ئەم جۆرە پاساوە بۆ شکستی نمونە مەیدانیەکان دێننەوە. بەخوێندنەوەی فەسڵەکانی کتێبەکەو کۆمەڵێ کتێب و توێژینەوەی زانستی نوسەرانیتر لەم بارەوە بەجوانی ئەوە دەردەکەوێت کە بەشێ لەم گرفتانە سەرچاوەکەیان ڕۆشن نەبوونی دیدی فکری و لاوازی پێکهاتە فکرییە ناسیۆنالیستییە کوردیەکەیە. لێرەشەوە خوێندنەوەی مەیدانی و مێژووییانە دەبێتە ئاوێنەی دەرخستنی بەشێ لە ناتەواوی و کەموکورتییە تیۆریەکان. لەڕاستیشدا ئایدۆلۆژیا و جەبرە سیاسییەکان لەڕووی مێژووییەوە ڕۆڵی گەورەیان هەبووە لە ڕێگرتن لەهاتنەدی دیدێکی ناسیۆنالیزمانەی فکری تۆکمەتر.

ئەم کتێبە بەشداری کردنە لەو بانگەشەیە بۆ نوخبە فکری و سیاسییەکە کە لەسەر هەردوو ئاستی تیۆری و مەیدانی بەخۆیدا بچێتەوە و دیدێکی نوێ سەبارەت بەئەرکی ناسیۆنالیستەکان لەبەر تیشکی گۆڕان و ئاڵوگۆڕەکاندا بنیاتبنێ و چیدیتر دیلی دەستی قەناعەت و بۆچوونە کۆنەکانی نەبێت چ جای ئەوەی هەوڵدات پیرۆزیی بەبەشێ لەو قەناعەتانە بدات و بیانکات بەبەشێ لەمیراتێکی شۆڕشگێڕانەی بەشکۆی دەست لێنەدراو. بۆئەوەی ئەمە مانای کوشتنی هەستی مێژوویی ناسیۆنالیستانە بێت.

هەر لەم گۆشە نیگاوەیە نوسەر فەسڵی یەکەمی کتێبەکەی خۆی تەرخان کردووە بۆ دەستنیشانکردنی بەشێ لەو کێشەو گرفتە حەرەکیانەی ناسیۆنالیزمی کوردی بەدەستیانەوە دەناڵێنێ و کاریشیان کردۆتەسەر ئاستی کارایی و ئەنجامدانی ئەرکەکانی. لەم لێکۆڵینەوەدا نوسەر گەڕاوەتەوە بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی

ناسیۆنالیزمی کوردی و تایبەتمەندییەکانی ئەو سەرەتایەو ئەو دابڕانەی لەچلەکانەوە لەئاستێکدا لەگەڵ هەناسەکانی ئەم قۆناغە ڕوودەدات. نوسەر لەڕوانگەی ئەو تیۆرە هاوچەرخانە ناسیۆنالیزم لێکدەدەنەوەو ئەرکەکانی بزاڤێکی ناسیۆنالیستی ناسیۆنالیزمی کوردی خوێندۆتەوە و دەستنیشانی بەشێ لەو ڕەگەزە دژی ناسیۆنالیزمانە کردووە کە لەخودی بیری کوردایەتی و بزاڤ و هێزەسیاسییەکانیدایە. هەروەها ئاماژەی بەهە ندێ خەسڵەت کردووە کە لەماوەی ڕابردوودا ئەم ناسیۆنالیزمەی پێناسراوەتەوە. لەوێنەی ڕاڕاییبوون، نائومێدی، لەسەر خاڵێکی جەوهەریش وەستاوە کە پێوەرێکی سەرەکییە بۆ دەستنیشانکردنی کارایی هەرناسیۆنالیزمێك کە ئەویش توانای کۆکردنەوەو کێشکردن و یەکیەتیخوازییە.

فەسڵی دووەمی کتێبەکەش خوێندنەوەی ڕوێکیتری خۆنمایشکردن و مەیدانی بوونی ناسیۆنالیزمی کوردییە کە ئەویش لە پەیوەندیەکانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی و ئەمریکادا بەجەستە دەبێت. نوسەر لەم فەسڵەدا ئاماژەی بە بەشێ لەسەرەتاکان و سروشتی ئەو پەیوەندیانەو هەڵکشان و داکشانەکانی کردووە. ئەم بابەتە بەماوەیەکی زۆر کەم پێش هەڵگیرسانی جەنگی کەنداوی سێهەم نوسراوەو گەیەنراوە بەدەستی بەشێ لە بڕیار بەدەستانی کوردیش. ئەم بابەتە لەبەشێکیدا ئاماژە بە مامەڵەیەکی دژی ناسیۆنالیستانەی هێزە کوردییەکان دەکات لەگەڵ ئەم پەیوەندیانە. ئەویش بەبەکارهێنانی پەیوەندیەکان لەدژی یەکتر. ئەوەش ئەوەبوو کە لەسایەی ناکۆکی هێزە ناسیۆنالیستەکان و شەڕی ناوخۆی نەوەدەکان بەزەقی ڕوویدا. لەپاڵ ئەمەدا هەوڵدانە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو سەقفە لەچاوەڕوانی کە دەشێ لەعێراقی نوێدا کورد لەئەمریکای هەبێت تاکو ئێستاش بەشێوەیەکی

گشتی بەشێکی زۆری پێشبینی و بۆچوونەکان وەك خۆیان هاتوونەتەدی و ئێستاش مەسەلەیکەرکوك ناونیشانێکیتری پشتڕاستکردنەوەی بەشێ لەو بۆچوونانەیە.

فەسڵی سێهەمیش هەوڵدانێکە بۆتێگەیشتن لەناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی لەسایەی دۆخی جیهانگیری و پەیوەندیان بەهەندێ چەمکیتری وەکو ڕۆشنگەری، عەقڵانیەت، دیموکراسی، ئەم فەسڵە کە لەدووتوێی چاوپێکەوتنێکدا خراوەتەڕوو، سروشتی پەیوەندی نێوان چەمکی ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی لێکدەداتەوە، هەروەها وەڵامی کۆمەڵێ پرسیار دەداتەوە لەوانەش ئایە دەکرێت لەسایەی پێوەرو جەبرەکانی جیهانگیری باس لە ناسیۆنالیزم بکەین؟ ئەگەر دەکرێت چۆن و ئەو گۆڕانانە چین دەشێت بەسەر ئەم چەمکەدابێت؟ ئەگەر ناسیۆنالیزم لەڕووی مێژوویی و زەمەنییەوە لەچاخی ڕۆشنگەریدا سەری هەڵدابێت، ئایا دەکرێت ناسیۆنالیزمێکی وەکو ناسیۆنالیزمی کوردی کە کۆمەڵگای کوردی بەقۆناغی ڕۆشنگەریی بەناوەڕۆکە ئەورووپییەکەی نەڕۆیشتووە، چۆن ناوەڕۆك پەیدا دەکات؟ شوێنی عەقڵانیەت لەدیدی ناسیۆنالیستانەو پرەنسیپی ناسیۆنالیزمدا لەکوێدایە؟ ئایا ئاین و ناسیۆنالیزم لەکوێدا یەکدەگرنەوەو لەکوێشدا لەیەك دادەبڕێن؟ سۆسیالیزم و ناسیۆنالیزم لە چ پەیوەندیەکی ناوەکیدان لەگەڵ یەکدا؟

فەسڵی چوارەمیش خوێندنەوەی هەندێ پرسی تایبەت بەناسیۆنالیزم و کۆمەڵگای کوردییە، کە ئایدۆلۆژیا ڕۆڵی لەڕوودان و شکڵ پێدانیاندا گێڕاوە. سەرەتا ئاماژە بەشوێنی ئەنفال کراوە لە ئایدۆلۆژیای ترسناك و هەمەلایەنەی بەعسیزمدا. ئەم بابەتە هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە شاڵاوەکانی ئەنفال و ناوهێنانی هەڵمەتەکان لەڕێی شیکردنەوەو تێگەیشتن لە میکانیزمەکانی و وێناکردنی بەعسیزم. بابەتی

دووەمیش خستنەڕووی چەند دیمەنێکی تراژیدیای نوێی کوردو ناسیۆنالیزمەکەیەتی کە لەسایەی مۆدێرنەی سیاسی و عەلمانیەتی بەئایدۆلۆژیاکراوی ناوچەکەو ناعەدالەتی دەسەڵاتە عەلمانیە جیهانییەکاندا تووشی هاتووە. هەڵبەت نابێت خوێنەر پێیوابێت ئەم بابەتە لەدیدی ئیسلامیەکی تەقلیدییەوە نوسراوە بۆ تاوانبارکردنی تەوژمی عەلمانی لە کوردستاندا بەڕەفتاری دەسەڵاتە عەلمانیە دواکەوتووەکانی ناوچەکە کە بەشێکیان کوردیان چەوساندۆتەوە لەگەڵ سیاسەتی نادادپەروەرانەی ئەزموونە عەلمانیە دێرینەکانی خۆرئاوا بەرامبەر بەکورد لە (١٠٠)ساڵی ڕابردوودا، چونکە دیدێکی لەوجۆرە واتە یەکتر تاوانبارکردنی شەپۆلەکان بەڕەفتاری هاوبیرەکانیان لەناوچەکەو جیهاندا ناڕاست و لەناوەڕۆکیشدا دژی سەرەتاکانی ناسیۆنالیزمە. ئەوەی نوسەر لەم بابەتەدا مەبەستیەتی ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە، هەوڵدانە بۆ تێکوەشاندنەوەی پەیوەندییەکی ئۆرگانیی ناڕاست کە بۆ پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی هەقخوازانەی کوردو عەلمانیەت دەخرێتەڕوو. لەبابەتی هەڵەبجە لەدۆزەخی ئایدۆلۆژیاشدا مەرگەساتەکانی شاری هەڵەبجە لەسایەی بەعس و جەولەکانی شەڕی ناوخۆ لەدوای ڕاپەڕین وەك ڕووکارێك وەرگیرا کە تاوانەکانی بەعسیزم و خراپەکارییەکانی ئایدۆلۆژیا عەلمانی و ئیسلامیە ڕادیکاڵیە ناوخۆییەکە لەبڕگەیەکی مێژوویدا بەرجەستە دەکات و هەموو ئەم مەسەلانەش دەبەستێتەوە بەسروشتی ناسیۆنالیزمی کوردی و تواناکانی.

فەسڵی پێنجەمی کتێبەکە هەوڵێکیترە بۆ خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزمی کوردی و پێگەی ئیسلامییەکانی کوردستان لەناو ئەو ناسیۆنالیزمەدا. لەم فەسڵەدا نوسەر ئەوەی خستۆتەڕوو کە ئیسلام لەسەرتاکانی

خەملێنی ناسیۆنالیزمی کوردیدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لەبڵاوکردنەوەی بەهاکانیدا. لە چلەکانیشەوە کاتێك لەبەر چەندەها هۆ ئیسلام ئەو ڕۆڵەی سەرەتای نامێنی بەڵام لەئاستیتردا وەك پشکۆی ژێر ژیلەمۆ دەمێنێتەوە. بەگشتیش ئیسلام لەمێژووی بزاڤی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستاندا نەبۆتە ڕێگرو ئیشکالیەتێك بۆ ئەم بزاڤەو ناسیۆنالیزمی کوردی. ئیسلامییەکانی کوردستانیش جگە لەدەستەیەکی بچووکی پەڕگیر بەگشتی (تبنی) دروشمە ناسیۆنالیستەکانی قۆناغەکەیان کردووە. لەبابەتێکی تەواو گەرمیشدا نوسەر مەسەلەی (ئیسلامی)بوونی کێشەی کوردی لێکداوەتەوەو ئەمەش جیادەکاتەوە لە (ئاینی)بوونی کێشەی کوردو دەیکات بەدەربڕینێکیتر بۆ ناوەڕۆکی بەسروشتی حاڵ نەتەوەییانەی کێشەی کورد.

فەسڵی شەشەمیش بەگشتی دەتوانین بڵێین تەرح کردنی ڕێگای سێهەمە لەنێوان مۆدێلی عەلمانیەت و ئیسلامی بوونی زاڵ و باوی (٥٠) ساڵی ڕابردووی ناوچەکە، کە بەکردەوە هەردووکیان نەیانتوانیوە ئاوات و خواستی گەلانی ناوچەکە بێننەدی و دەبێت گەلی ئێمەو تەوژمە سیاسی و هێزە کۆمەڵایەتییەکانی سوود لەو مێژووە وەربگرن و هەمان ئەزموون دووبارە نەکەنەوە. بابەتەکانی ئەم فەسڵە بەگشتی بانگەشەیەکە بۆ پاراستنی یەکیەتی ناوخۆیی کۆمەڵگا لەڕێی چوونەناو پەیوەندیەکی نوێی بەیەکەوە ژیان و ڕێزگرتن لەتایبەتمەندییەکانی یەکتر و نەگۆڕەکانی کۆمەڵگاو وازهێنان لەخەونی حوکمکردنی ئایدۆلۆژیاکان و گەیشتن بە ڕێککەوتنێکی مەدەنی لەدوتوێی دەستوورێکی هاوچەرخدا کە مافی هەمووان بپارێزێ و زەمینەی گەشەکردنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیش سازبکات.

فەسڵی حەوتەم و ئەو بابەتانەی لەخۆیگرتووە هەوڵێکی نوسەرە بۆ تێگەیشتنی لەواتایەکی نوێی چەمکی نیشتمانپەروەری لەسایەی ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەر زەوی و بەسەر پێوەرەکانیشدا هاتووەو گەشەکردنی کۆمەڵگاو ناسیۆنالیزمی کوردیش دەیخوازێت. هەروەها سەرنج ڕاکێشانی ناوەندی ئەکادیمی کوردی و سەرکردایەتی بزوتنەوە ناسیۆنالیستە کوردییەکەشە بۆ بنیاتنانی دیدێکیتر بۆکەسێتی نێودەوڵەتی کوردی وەك قۆناغێکی ڕاگوزەری و زەمینەخۆشکەر بۆ گەیشتن بە بەدەستهێنانی مەرجەکانی بوون بەکەسێتی نێودەوڵەتی بەوجۆرەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی و بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان داوای دەکات، کە ئەویش لەبوونی دەوڵەتی کوردیدا بەرجەستە دەبێت. دوو کورتە بابەتیش تایبەتن بە تێڕوانینی نوسەر بۆ مەسەلەی ڕیفراندۆم و بزوتنەوەی ڕیفراندۆم (ڕاپرسی) لەکوردستاندا کەماوەیەکی زۆر ئەندامی لیژنەی باڵاو ئێستاش ئەندامی ئەنجومەنی گشتی ئەو ڕێکخراوەیە. نوسەر لەو دوو بابەتەدا کاراکردنی ویستی هاوڵاتی و قسەکردن لەسەر چارەنووسی خۆی و کۆمەڵگاکەی دەخاتەڕوو، هەروەها ئاماژە بەوەدەکات کە ئەوەی ئەمڕۆ بیرۆکەیەو هۆشیاریە دەکرێت لە وەرچەرخانێکدا ببێتە واقیع و ئەوەی ئێستاش بێتە پێشنیارێك و سەرەتایەکی بەبایەخ لەگەڵ هەموو کەموکورییەك کە بزوتنەوەکە هەیبووە و چالاکەکانی ناویشی لێی بێئاگانەبوون.

فەسڵی هەشتەم دووبابەت لەخۆدەگرێت یەکێکیان پرۆژەیەکە کە کاتی خۆی نوسەر پێشکەشی بەناوەندەکانی دەسەڵاتی لەکوردستاندا کردووە وەك بەشدارییەك لەخەباتی هەمەلایەنە بۆگێڕانەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بۆسەر هەرێمی کوردستان. بابەتی دووەمیش هەوڵدانە بۆ تێگەیاندنی ئەمریکییەکان و عەقڵی

ئەمریکی کە جەوهەری کێشەی کەرکوک لەڕووە نەتەوەییەکەیدا شاراوەتەوەو چارەسەرکردن بۆ پرسی ئەم شارە کاتێ واتای هەیە ببێتەهۆی چارەسەری کێشەی نەتەوەی کورد لە عێراقدا گەرچی لەفۆرمی فیدرالّیەتیشدابێت.

بەگشتی ئەمە ئەو فەسڵ و بابەتانەن لاپەڕەکانی ئەم ئەڵقە پێکدەهێنێ کە دەتوانین بەچەند هێلێکی گشتی بەیەکیانەوە ببەستینەوەو بەهەوڵێکی نوسەریان دابنێین بۆ قسەکردن لەسەر ڕێبازو نمونەی سێهەم. ڕێبازێك کە لەسایەدا ململانێ ئایدۆلۆژیاکان لەپێکدادان دوورخرابنەوەو هیچ ئایدۆلۆژیایەکیش تەماحی هەژموون و وەلانانی ئەویدی ئایدۆلۆژی و فکری سیاسی نەبێت. کە ئەمە خۆی لەخۆیدا تێگەیشتنێکیش بۆ ناسیۆنالیزم لەئێستای جیهان و کوردستاندا دەخاتەڕوو، کە دەبێت خۆی تازەبکاتەوەو بتوانێت جیاوازیەکانی کۆمەڵگا لەخۆبگرێت و بەکورتی ئەو مۆدیلەبێت لەناسیۆنالیزم کە تەماحی ئەوەینیە ببێت بە ئایدۆلۆژیا بەڵکو وەك سەرەتای سیاسی دەمێنێتەوەو ڕشێگاش نادات ئایدۆلۆژیایەك لەبەرگی ئەودا شەڕی ئایدۆلۆژیاکانیتر بکات و دەشبێتە چوارچێوەیەك بۆ خەملّینی دیموکراسی و بەیەکەوە ژیان. بەو هیوایەی ئەم ئەڵقەش بەشداریەکیتری نوسەربێت بۆ خستنەڕووی دیدێکی ڕۆشنتر لەمەڕ ئێستای ناسیۆنالیزمی کوردی و کۆمەڵگەی کوردستان و گەشەکردنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا و قوڵکردنەوەی گیانی هاوچارەنووسی و هاوکاری و بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی نێوان پێکهاتە و تەوژم و هێزەکانی گەلی کوردستان.

نوسەر / هەولێر

٢٠٠٨/٥/٢٨

## پێشەکی

لە کوردستاندا لەگەڵ بوونی بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستیدا بەڵام مەعریفەی ناسیونالیستانە زۆرکەم بوونی هەبووە، رەنگە هۆکارێکی ئەم حاڵەتەش لەدەرەوەی ئیرادەو توانا کوردییەکەوە بووبێت و نەچێتە چوارچێوەی پێدراوە نیشتمانی و رۆشنبیرییەکانەوە، چونکە ناسیۆنالیزم تەنانەت لەسەر ئاستی جیهانیشیدا بەوە ناسراوە کە زۆرکەم نەبێ تا ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی رابردوو تیۆریستی تایبەت بەخۆی نەبووە یاخود زۆرکەم بووە ئەوە تەنها لەهەشتاکانی کۆتایی سەدەی بیستە کەکۆمەڵێ تیۆریست بۆ ناسیۆنالیزم پەیدا دەبن و هەوڵی تیۆریزەکردنی دەدەن[1] هەروەها ناسیۆنالیزم دەبێتە بابەتێکی گەرمی ناوەندە فیکری و فەلسەفی و ئەکادیمیەکەی جیهان و بەتایبەتیش خۆرئاوا.

هۆکاری دووەمی ئەم غیابە مەعریفی و زانستییە دەگەڕێتەوە بۆ خودی بزوتنەوەی ناسیونالیستی‌یە کوردییەکە و ئەو ناوەندە رۆشنبیرییەی هاوشانی بووە.. واتە بەدیوەکەی‌تریشدا بەشێکە لەو بەجێماوی و پەککەوتەییەی ناوەندە رۆشنبیرییە کوردییەکە پێوەی ناسراوە و گیرۆدەی بووە، ئەم ناوەندە لەو ساتەوەختەشدا کەناسیۆنالیزم دەبێتە کایەیەکی گرنگی مەعریفی و تێڕامانی

---

[1] مەریوان وریا قانع/ ناسیونالیزمی دوور مەودا (رەهەند) ژمارە (٩ ـ ١٠)/٢٠٠٠ لا٦٨.

فەلسەفی و لێکۆڵینەوەیەکی زانستی، ناتوانێ چەمك و میتۆد و دیدەکانی ئەم کایە لەبونیادی رۆشنبیریی خۆیدا جێگا بکاتەوە بەمەش قووڵاییەکی مەعریفی و زانستی بەبزوتنەوە ناسیونالیستەیە کوردییەکە بدات و پەنجە بخاتە سەر ئەو نەخۆشی و پەککەوتەیی و ناتەواویانەی وای لێکردووە، نەهێڵێت بەرووی ئاسۆیەکی کراوەترو ئومێدبەخشتردا بکرێتەوە و بچێتە پێش و خۆی تازە بکاتەوە. ئەم دواکەوتنە فیکری و مەعریفەیەش وا دەکات ناوەندە رۆشنبیریەکە تەنانەت بەشە شۆرشگێرییەکەش دەورە تەقلیدیەکەی خۆی بەنیمچە بەردەوامی بەرهەم بێنێتەوە کە ئەویش لەرووی مێژووییەوە بریتی بووە لە جۆشدانی حەماس و هەستی میللی و ناسیۆنالیستی و تێکەڵاوکردنی بەسۆزی بنکە جەماوەریەکەو تاکی کوردی و بەخشینی عەقڵی رێکخستن و رێبەرایەتیەکردن بەحزبی کوردی لەئاستێکی دیاریکراودا.

لێرەدا نابێت تێپەرین و باسی رۆڵی ئایدیۆلۆژیاو دیدە باڵادەستەکەی نوخبە فیکری و سیاسیە کوردییەکەش لەهێنانە دی ئەم حاڵەتەو ئەو دواکەوتووییەدا نەکەین، کە بەشێوەیەکی گشتی مارکسیزم پێکی هێناوە. مارکسیزم وەکو ئایدیۆلۆژیاو دیدێکی فەلسەفی هەمەلایەنەو ئامرازی خەباتی شۆرشێکی چینایەتی رادیکاڵ لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکان، دەروێکی زۆری هەبوە لە دیاریکردنی دیدو ئاسۆو مەوداو چاوەروانیەکانی رۆشنبیری کورد.

مارکسیزمیش گەرچی لەفۆرمە لینینیەکەیدا خۆی وا دەنوێنێت کە بەمەسەلە ناسیونالیستیەکە موتوربە بووەو دەتوانێ رێبەرایەتی خەباتێکی نەتەوەیی بکات، لانیکەم گەر لە روانگە مارکسیەکە خۆشیەوە بێت وەك قۆناغێکی زەمینە سازکەر

بۆ فەراهەمکردنی هەلومەرجی سەرکەوتنی شۆڕشی سوشیالیستی و بە تەوەرەکردنەوەی ململانێی چینەکان وەك ماتۆڕی گۆڕانی مێژوو و ناوەرۆکدان بەرژێمی کۆمەڵایەتی و شوێن و ڕێی مرۆڤ و پێکهاتەکانی کۆمەڵ لەپاڵ ئەمەشدا ئەو میکانیزمەشی وەدەستکەوێت کە لەڕێیەوە بتوانێت.

ئەوە خۆی ڕێگرێك بوە لەوەی دیدێکی ڕەخنەگرانەی لەو جۆرەی ئێمە باسی دەکەین بتوانێ لەدایك بێت. بەتایبەتی لەسایەی ئەو دۆخە فیکری و ڕۆشنبیری و سیاسییەی وڵاتی ئێمەدا، کە بە شێوەیەکی گشتی مەنزومە فیکری و فەلسەفییەکان لەهەندێ دروشم و ئامرازی پەروەردەکردنی ئایدیۆلۆژیانەی تاك و ڕێنوێنی سادەی فیکری و سیاسیدا کورت کراوەتەوەو نەیتوانیوە بگاتە ئاستی بەکارهێنانی وەك میتۆدێکی خوێندنەوە و بەدیهێنانی ڕەچڵەکانی مەعریفی دیدی تەقلیدی مارکسیزم بەرامبەر ناسیۆنالیزم مامەڵە لەگەڵ کردنیەتی وەك دیفاکتۆیەك لەسەرەڕێی بەسەرکەوتن گەیاندنی شۆڕشی چینی زەحمەتکێشی کۆمەڵگا، دانانیەتی بە هۆکارێکی لێکدابڕان و لەیەکترکردن و لاوازکردنی ریزەکانی کرێکاران کە بورژوازیەت وەك چەکێ بەم رووکارەدا بەکاریدەهێنێ، دیارە ئەو دیدەی مارکسیزم و ناسیۆنالیزم کۆمەڵ و چین و هێز و کلتورەکانی پۆلێن دەکەن، هەر لەبنەڕەتەوە لەیەکتر جیاوازە، ناسیۆنالیزم جەخت لەسەر بایەخی نیشتمانیی و ناسیونالیستی دەکاتەوە بۆ بەسەرکەوتنی پرۆژەکەی خۆی و خەمڵینی ماناکانی نەتەوەو پێکهاتی دەزگاکانی بەم جۆرەش سنورە سیاسی و کلتورییە نەتەوەییەکان دەکاتە خاڵی جیاکردنەوەی نێوان گروپە بەشەرییە جۆراوجۆرەکان.

هەروەها لە روویەکی‌ترەوە مەبەستیەتی تێکڕای توێژ و چین و پێکهات و شوناسە جیاوازەکانی نەتەوە لەبۆتەی گشتێکدا یەکانگیر و یەکگیر بکات کەئەویش بۆتەی نەتەوەیە بەمەش شوناسێکی نوێیان پێ بدات بەمەبەستی دروستکردنی ئیرادەی گشتی بەپێی ئەو سەرمایە رەمزیەی بەکاری دەهێنێ، مامەڵەکردنی ناسیۆنالیزم لەگەڵ مێژووشدا دیسانەوە لەگەڵ مارکسیزمدا لێك جیاوازە، گەڕانەوەی ناسیۆنالیزم بۆمێژوو، گەڕانەوەیەکی کەرنەڤاڵی و رومانسیانەیە بەمەبەستی دروستکردنی ئەفسانەو قووڵایی مێژوویی بۆ بووەکەی ئێستاو دۆزینەوەو بەگشتی کردنی ئەو رەمزانەی هەموو ناسیۆنالیزمێك پێویستی پێیەتی لەپاڵ هەموو ئەمانەدا ناسیۆنالیزم ئەوەندەی هەست و سۆزو هەستکردن بە (انتما)یە و تێکەڵاوە بە ئەدەب و سیاسەت و پرەنسیپێکی سیاسییە، ئەوەندە دیدێکی فەلسەفی گشتگیرو تێروانینێکی هەمەلایەنە نییە بۆگەردون و مرۆڤ و ژیان و رێکخستنی کۆمەڵگاو بنەما دەستوری و یاساییەکانی دەوڵەت. هەر بۆیە هەمیشە پێویستی بەفەلسەفە و جیهانبینیەکە بیخوازێ و لەروانگەی ئەوەوە کۆمەڵ رێكبخات و ئیدارەی دەوڵەت و ناسیۆنالیزمی جیاوازمان هەبێ[1] ئەم رەخنانەی مارکسیزم لە ناسیۆنالیزم کە وای لە مارکسیزمێکی مام ناوەندیش کردووە بڕوای بەوە بێت کە لەکۆتاییدا ناسیۆنالیزم لەناوەرۆکدا بە بەربەستێکی بەردەم خەباتی جیهانیی سنور نەناسی چینی کرێکار و کاڵکردنەوەی هێڵی جیاکەرەوەی نێوان چینەکان دابنێت لای ناوەندە رۆشنبیریەکەش وای کردوە کە ناسیۆنالیزم و بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بە

---

[1] شوناسی هەندێ ناسیونالیزمی وەك پاکستان و ئێران و ئەفغانستان و شیشان و کشمیر زیاتر بە ناسیونالیزمێکی ناوەرۆك ئیسلامی لەقەڵەم دەدرێن لەکاتێکدا سۆسیالیزم ناوەرۆکی هەندێ بزوتنەوەی ترەو بەم جۆرە.

گوێرەی پێویست نەبێتە کایەیەکی ئیشکردنی فکری بە ئاقاری رێبەرایەتی‌کردن و دەوڵەمەندکردن و راستکردنەوە و پێشخستن‌دا چونکە تەنها لە ناوەندێکی رۆشنبیریدا ئەرکێکی لەم جۆرەوە دەبێتە جێگای بایەخ‌پێدان و بیرمەند و لێکۆڵەر و رەخنەگری تایبەت بەخۆشی بۆ دروست دەبێت کە ناسیۆنالیزم لە بیرکردنەوەیەدا رەسەن بێت و ئەولەویاتی پێ درابێت، بەڵام هەر وەك دەزانین کاتێ رۆشنبیرێکی ئاسایی لەچوارچێوەی چەمك و گوتەزاو ئامرازە مەنهەجیەکانی مارکسیزمدا بێت و بچێت و هەر ئەمەیش ئاسۆکان و چەشمەندازەکانی بیرکردنەوەو دنیابینی و داوەریکردنە فیکری و سیاسی و واقیعییەکانی بۆ دیاری بکات، لەبیرکردنەوەی ئەم ئاستە لەرۆشنبیرو ئەم جۆرە رۆشنبیریەدا بایەخدان بەناسیۆنالیزم دەبێتە بایەخدان بەئامانجێ لەخانەی ئامانجە دووەمەکاندا، هەڵبەتە گەر ئەو واقیعەش لەبەرچاو بگرین کە پێوەری بۆ دەستنیشانکردنی پەرۆشی بۆ نەتەوەو ناسیۆنالیست بوون بەگشتی بریتی بووە لە هەندێ کاردانەوە لەخۆنیشاندانی دەروونی و عاتیفی و دروشم بەرزکردنەوە هەڵوێستگرتن لە بەرامبەر رژێمێکی سیاسی دیاریکراوەوە - ئەوسا زیاتر لەراستی ئەم بۆچوونەی سەرەوە نزیك دەبینەوە.

دیارە لەفەزایەکی لەم جۆرەدا هەرجۆرە چاوەڕوانی کردنێك بۆ دۆزینەوەی کلتورێکی رەخنەگرانەو میتۆدێکی هەڵسەنگاندنی زانستی لەجێی خۆیدا نابێت، بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمەکەش لەبەرئەو هەژاریە فیکری و مەعریفییە ناوخۆییەو ئەو فشارە تاقەت پروکێنەش لەلایەن دەسەڵاتەوە خراوەتە سەری و ئەوپاشخانە فکرییەی ناوەندە رۆشنبیرییەکە کەهەندێ ئاماژەمان پێکرد، دەبێت بەسەر زەمینی تێکشکان و هەڵسانەوەی بەردەوام و کەوتنە ژێر کاریگەری دۆخە لەناکاوەکان

بەمەش لەڕووی (اداء)ی سیاسی و توانای گەشەکردن و چونەوەیەك هەڵکشان و بون بەسەنتەری کەمەندکێشی فیکری و سیاسی و ساردبوونەوە تارادەیەکی بەرچاو دەبێتە ناسیۆنالیزمێکی لەناکاو.

مەبەستیشمان لەناکاو لەم شوێنەدا نەبوونی کەڵەکەبونێکی بەردەوامە لەرەوتی بەرەو پێشچوون و مێژووی ناسیۆنالیزمی کوردیدا (غائب)بونی دیدێکی ستراتیژی نەتەوەییانەیە لەپشت ساتەوەخەت و جۆری هەڵگیرساندنی شۆڕشەکان و نزمی ئاستی خوێندنەوەی سیاسی بۆدیاردەو دەرکەوتەکان، هەروەها سەنگەر گۆڕینی بەلێشاوی خەڵکە گشتییەکەو تەنانەت بەشێ لەنوخبەشە بۆ نموونە لەقۆناغێکدا سەنگەرەکانی شۆڕش هەزاران تێکۆشەر بۆ ناوخۆی کەمەندکێش دەکات کەچی لەقۆناغێکی‌تردا سەدان هەزار چەکداری سەر بەرژێم لەعێراقدا دەبنە کەرەستەکانی سیمادان بەبڕگەیەکی مێژوویی کوردستان.[1]

ئەم هەڵبەز و دابەزینە سایکۆلۆژی و ئیداری و هەندێ جارو بۆ هەندێ کەس فیکری و ئەخلاقیش گەر لەڕوویەکەوە دەرخەری ئەو نائومێدیە بێت کە لە هەندێ ساتەوەختی مێژوویدا بەرامبەر ئایندەی ئەم ناسیۆنالیزمە و تواناکانی بۆگەیشتنی بەدۆخی رزگاربوون و شکاندنی تەوقەکانی ئابلۆقە دروست بووە، لەڕوویەکی‌ترەوە هەژاری فیکری و ئایدیۆلۆژی و دەزگا پەروەردەیی و رێنوێنیکەرەکەی ناسیۆنالیزم و شۆڕشیش دەردەخات کە جگە لە بازنەی نوخبەیەکی سنودار بەگشتی لەسەر ئاستی وروژاندنێکی سادەی هەستی میللیی ئیشی کردووەو کەمتر توانیویەتی (فکر)

---

[1] کوردستانی هەشتاکان شانۆی بەرجەستەکردنی ئەم راستیە بوو، ژمارەی چەکدارەکانی رژێم لەفۆرمی مەفرەزە تایبەتەکان و فەوجەکانی خەفیفە گەیشتە نزیەی (٣٠٠) هەزار چەکدار.

بکاتە چەکێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژواریەکان و لێکدانەوەی واقیع و خۆبەستنەوەیەکی چارەنووس‌سازانەی مرۆڤی کورد بەبزوتنەوەکەوە بۆ ئەوەی شکستەکان بەشکستی سەربازی و هەندێ جاریش سیاسی سەربازی بێڵێتەوەو نەهێڵێ ببن بەشکستی رۆحی و ئەخلاقی و وجودی.

لە ئارادانەبوونی دەزگایەکی هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەو رەخنەگرتن و نامۆبوونی رۆشنبیریی رەخنەگرتن و شیکردنەوە و قەتیسدانی ئەم مەسەلە گرنگە لەهەندێ گوتەزای وەکو (رەخنەو رەخنە لە خۆگرتن) بەمجۆرەی جاران لەئەدەبیاتی مارکسیزم و شۆڕشگێری و چەپداباوبوو، واتە نەبوونی هۆشیاری بەگرنگ بینینی رەخنەو ئیشکردنی فیکری زانستی لەپاڵ خەباتە سیاسی و پێشمەرگایەتیەکەدا و یەکسانکردنی رەخنە بەهەوڵدان بۆ تێکدان و ئاژاوەنانەوە و لاوازکردنی ریزەکانی ناوخۆو، بەردەوام دواخستنی گرفتەکان بۆ دوای سەرکەوتنێکی نادیاری شۆڕش و ناسیۆنالیزمەکە، بوونە هۆی ئەوەی رەخنەیان هەر نەبێت یاخود ئەگەر هەیشبێت زمانحاڵ و کەرەسەی قسەکردن و شیکردنەوەی لە زمانی سیاسی و رۆژانە و سەنتەرکردنی هەندێ نموونەی شۆڕشی جیهانی و وەسفکردنێکی رووکەشانەی رووداوەکان و شۆڕ نەبوونەوە بۆ بونیادە قووڵەکانی دیاردە و قەیرانەکان و بەکارهێنانی هەندێ چەمکی فەرهەنگی مارکسیزم تێپەڕ نەکات.. ئێمە هەر بە نموونە سەیری هەندێ لەو نووسینانە بکەین کە وەك هەڵسەنگاندنێك بۆ شۆڕشی ئەیلول و هەرەسی (١٩٧٥) خراونەتە روو[١] هەستدەکەین تارادەیەکی زۆر

---

[١] تاريخ الفكر الاوروبي الحديث/ رونالد سسترو مبرج/ وەرگێڕانی ئەحمەد ئەلشەیبانی / لا ٤٨٥ و دواتر.

لەروانگەی مملانێی ئایدیۆلۆژی و سیاسەتە نێودەوڵەتی و هەرێمایەتیەکانی ئەوکاتە مەسەلەکان تاوتوێکراون بەمەش گەر لەدیاریکردنی هەندێ هۆکاری شکستەکەشدا سەرکەوتوو بووبن ئەوا لەدیاریکردنی ستراتیژو ئاسۆکانی ئایندەو دۆزینەوەی رەگی شکست و کلتورو سروشتی دەوڵەت و سنورداربوونی (خیار)ەکانی شۆڕش سەرکەوتوو نەبوون، واتە گەر توانیبێتیشی هەندێ هۆکار دیاری بکات کەدەوریان هەبووە لەوەی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزم و شۆڕشەکەی بەوئاکامە تراژیدیایە بگات، نەیتوانیوە وەڵامی ئەوپرسیارە بداتەوە کە ئەم هۆکارانە بۆ بەم قورساییەوە ئامادەییان هەیە؟ یاخود میکانیزمی ئیشکردنیان کامەیەو چۆن دەتوانرێ رۆڵیان لە داهاتووی بزاڤەکەدا کەم بکرێتەوەو رێ لەوە بگیرێ مێژوو لە بەرگە مەرگەساتبارەکەیدا، خۆی دووپات بکاتەوە، دەبێ بوترێت تەنانەت کە لەم ئاستەشدا واتە بوونی رەخنەیەکی سیاسی ئەخلاقی وەسفیش ناسیۆنالیزمی کوردیی نەیتوانیوە نیوەی لانیکەمی ئەوەی پێویستە ئەنجام بدات، لەم دواییانەدا نەبێت زۆر کەم نەبێت سەرکردە کوردەکان یاداشتەکانی خۆیان نەنوسیوەتەوە، هەندێ لەوکارە ئەنجامدراوانەش لەگەڵ بوونی لایەنێکی باش کە پەردە لەسەر راستی هەندێ لە رووداوەکان هەڵدەماڵێ و کاراکتەر و بکەرە مێژووییەکان و سەرەداوەکانی هەندێك لەگەمەکان دەخاتە روو، بەڵام هێشتا لەداوی جەمسەرگیریی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و تەنانەت حزبیش رزگاری نەبووە، کە دەشێ ئەمەش بەشێکی لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە پاشماوەی ململانێکان تائێستاش درێژەیان هەیەو بەشەکەیتریشی لەلاوازی فکری ناسیۆنالیستی کوردیەوە بێت، کەتەنانەت لەکاتی نوسینەوەی مێژووشدا ناتوانێ ئابلۆقەکانی دەوری عەقڵ و رۆح ویژدانی رۆشنبیرو

سیاسی کورد تێکبشکێنێ و ڕووداوەکان لەدیدێکی فراوانتر لەدیدگاکانی حزب و بەرژەوەندییەکانی حزب و ئیعتیبارە شەخسیەکان بگێڕێتەوەو تۆمار بکات.

بەڵام لەدوای نەوەتەکانەوە هەست دەکرێت سەرەتاکانی گۆڕان لەم دۆخە وەستاوەدا سەرهەڵدەدات، ناسیۆنالیزم وردە وردە دەبێتە کایەیەکی نوێی مەعریفی ناو ڕۆشنبیری کوردی، ئەوەی لەم هەنگاوەشدا دەستپێشخەر بوو بەپلەی یەکەم گۆڤاری ڕەهەند بوو، نووسەرانی گۆڤاری ڕەهەند، توانیان لەرێی ئاشناکردنی خوێنەری کورد بە هەندێ چەمك و میتۆدو دید کە لەئێستای دونیادا وەك ئامرازێکی مەنهەجیی، ناسیۆنالیزم و مەوداو دەرکەوتەو ڕەهەند و ڕەنگدانەوەی ئەویان پێ دەخوێنرێتەوە و دەخرێتە ژێر سەرنج و تێبینی زانستیەوە خزمەتێکی بەرچاو بکەن، ڕەهەندیەکان توانیان لانیکەم لەناو بەشێ لە نوخبەدا ناسیۆنالیزم لەبارستاییەکی لەرۆمانسیەت هەڵکێشراو و شین و پیاهەڵدان و شانازی کردنی میللی و باسی شەهید و مەرگەسات و ستەم لێچوویی لە فەزایەکی سروت ئامێزدا، بگۆڕن بۆ کایە و بابەتی بۆ قسە لەسەرکردن ورەخنەلێگرتن و هەڵوەشاندنەوەی بۆ ڕەگەزە سەرەتاییە پێکهێنەرەکانی.. بەمەش لەئاستی فکریدا ناسیۆنالیزم چییە؟ بووە پرسیارێکی ڕەوا و پاساودراوی جددی. ئەم پرسیارە جارێکیتر ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسیەکەی خستە بەردەم گومانکردن لە دۆگماکانیان، خستنیە بەردەم ئەو واقیع و بیرکردنەوەی کەوا نەزانن هەر ئەوەندەی بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی لەکوردستاندا هەبووە لەرووی فیکری و مەعریفیەوە توانراوە وەڵامی پرسیاری ناسیۆنالیزم چییە؟ بدرێتەوە، بۆسەلماندنی ئەم ڕاستیەش کە نەکردنی ئەم پرسیارەو وەڵام نەدانەوەیەکی فیکری پێی زیانی گەورەی لەناسیۆنالیزمی کوردی

داوەو وروژاندنی پرسیارێکیتریش گرنگ بوو کە ئەویش بریتی بوو لەوەی ئەدی ناسیۆنالیزمی کوردی خۆی چییە؟

لەبەر رۆشنایی تیۆرەکانی ناسیۆنالیزم و بەپشت بەستن بەپێشکەوتنەکان لەبواری زانستە کۆمەڵایەتیەکانداو بەکارهێنانی ئامرازەکانی فیکری جیهانی لەم کایەدا، داخۆ ئەم بزوتنەوە تاچەند سروشتی ناسیۆنالیزمانەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە؟ ئەو هێزانەی لەڕووی مەیدانیەوە باسی ئەوە دەکەن کە نوێنەرایەتی ئەو دەکەن و بەها و فۆرم و خواستەکانی لەخۆیاندا بەرجەستە کردوە و دەکەن، تا چەند لەم باسکردنەدا راست دەکەن؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەخوازرێت کە کۆی بزوتنەوە ناسیونالیستیەکە بکرێتە بابەتی توێژینەوەی زانستی و رەخنەلێگرتنی فەلسەفی بۆ ئەوەی ئەمکارەش لەڕووی پراکتیکیەوە مەیسەر بێت، دەبێت رەخنە و خوێندنەوەکان لە رواڵەتەوە بۆ ناوەرۆك و جەوهەر لە وەسفی روکەشانەوە بۆ دۆزینەوەی یاسا رێکخەرە ناوەکیەکانی لە وازهێنان بەرەخنەگرن لەسەر ئاستی رەفتاری ئاشکراوە بۆ خاپورکردنی بەهاکان، بەرزببنەوە، لێرەشەوە دیاریکردنی مەرجەعێك بۆ رەخنەگرتن و خوێندنەوەکان دەبێتە پێویستیەکی گرنگی هەرکارێکی زانستی و مەنهەجی لەم رووەوە، جارێکیتریش (اعتبار) گێڕانەوە بۆ واقیع دەبێتە پرسێکی قسە لەسەرکراو، بەو واتایەی هەڵسەنگاندن و حوکمدان بەسەر بزوتنەوە ناسیۆنالیستی و هێزە پێکهێنەرەکانیدا لەئاستی دروشمە بەرزکراوەکان و سەرەتا نەزەریەکان و پەیڕەوو پرۆگرامی حزبەکان و هەندێ لە ئەدەبیاتی ئەوان و کەرنەڤاڵ و ئاهەنگە سیاسی و چڵەکانی ماتەمینی و ژمارەی

شەهیدو ئەم جۆرە شتانەدا ناوەستیٚ، بەڵکو سەرنجەکان و خوێندنەوەکان دادەبەزن بۆسەر ئەو واقیعەی ئەوهێزانە خولقاندویانەو شوناس و ناوەرۆکیان پێدراوە.

واقیع دەبێتە هۆڵی تاقیگای پێوانەکردنی (اداء)ەکان لەواقیعیشدا پرسیارەکان لەوە تێدەپەڕن کەتەنهاپرسیاربن لەوەی چی کراوە؟ بەڵکو دەبن بەپرسیار لەمەڕ ئەوەی بۆهەر ئەوەندە کراوەو بۆبەو جۆرە کراوە؟ دوای ئەوەش ئەوشتانە چین کە پێویست بوو بکرێن و نەکراون؟ سەرنجەکانی ئێمەش لەو وتارەدا دەچنە ناو ئەو چوارچێوە تیۆریەی باسمان کرد واتە تێڕامانێکی واقیعە کوردییەکە لەپەیوەندی بەناسیۆنالیزمی کوردیەوەو بەدیاریکراویش لەم بەشەی کوردستاندا کەئێستا لەبارترین زەمینەی بۆگەشانەوەی ناسیۆنالیزم و بەهاکانی تێدا رەخساوە، هەروەها بۆتە ئەزمونگایەکیش بۆ لەسەنگی مەحەکدانی بزوتنەوە سیاسییە کوردیەکەکاتیٚ بەجۆریٚ لەجۆرەکان دەگاتە ئاستی گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی لەسەر بەشیٚ لەخاکی نیشتمان، ئێمە کاتیٚ ئەگەڕێینەوە بۆلای ئەو تیۆرانەی ناسیۆنالیزممان بۆلێکدەدەنەوە لەگەڵ بیروڕای تیۆریست و لێکۆڵەرانی، بەشێوەیەکی گشتی چوارچێوەیەکی تیۆری و میتۆدێکمان دەستدەکەوێت کە دەکرێت سوودیان لێوەربگرین بۆ دیاریکردنی سروشتی ئەو یاساییانەی لەناوەوە بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بەڕێوەدەبەن و دیاریکردنی ئەوەی داخۆ تاچ رادەیەك دەرکی بەوەزیفەکانی بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی کردووەو لەئاست راپەراندنیاندا بووە؟ خۆ ئەگەر بەوجۆرە نەبووە چی وای کردووە ئەومۆرکە بەخۆوە بگرێت کەئێستا پێوەی دەناسرێتەوە؟ بەمەش هەندیٚ پێوەرمان دەستدەکەوێت کەناچارین بۆیان بگەڕێینەوە.

وەك روونەو خوێنەرێکی مامناوەندیش ئاگای لەوەیە کەناسیۆنالیزم لەرووی مێژووییەوە چەمکێکە لە رێی فەرهەنگی خۆرئاواوە تێکەڵ بەفەرهەنگ و ژیانی سیاسی ئێمەی خۆرهەلاتی بووە، لەئەورویاو خۆرئاواشدا وەك چەمك و بزوتنەوەش تەنها لەکۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزەدا سیماکانی دەردەکەون و بەرەو پێگەیشتن و ناسینەوە دەچن تا دەگاتەئەوەی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بەتەواوی پەرەدەسێنێ و بەسروت و دروشم و سەرەتاکانیەوە دەبێتە هۆکارێکی گرنگی سازدان و جولاندنی ملیۆنان کەس هەر بۆیە سەدەی نۆزدە لە ئەورویادا بەسەدەی زێرینی ناسیۆنالیزم دێتە ژماردن.[1]

چەمکەکە لەخۆرئاوادا لەگەڵ ئاوابوونی زەمەنی فۆرمەکۆنەکانی دەسەلات و چوارچێوە سیاسی و یاساییەکانی و هاتنەکایەی دەوڵەتی مۆدێرن و گەشەکردنی بیری سیاسی هاوچەرخ و داهێنانی بیرۆکەی سەروەری و رەمزە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی ناسیۆنالیزم سەرهەڵدەدات، وەك دەزانین پێش ئەوقۆناغە پرەنسیپی رێکخەری نێوان مرۆڤەکان زیاتر ئاین و عورف و پەیوەندییە ئیمپراتۆریەکان بووە.

ناسیۆنالیزم هاوشان لەگەڵ چەندین چەمك و تیۆری‌تردا لەخۆرئاوادا گەشە دەکات و بەشێوەیەکی سروشتی گەشەی ناوەکی خۆی دەست پێ دەکات ئیتر لەدوای سەرهەڵدانی مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە) وەك یەکەی بنچینەیی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی و نیزامی دەولی نوێ، ئەم دەوڵەتە کەلەرووییەکەوە خواستە ناسیۆنالیستیەکان بەرجەستە دەکات دەبێتە فۆرمێکی تازەی مافپێدان و

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دیاریکردنی ڕێ و جێی تاك لە کۆمەڵدا و پەیوەندی ئەو بەدەوڵەتەوە، ناسیۆنالیزم لەم نێوەندەدا هەرلەئاستی پێکهاتە سیاسی و یاساییەکەدا دەور نابینێ بەڵکو لەئاستی ڕۆحی و سایکۆلۆژیشدا دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ و مەخزونێکی ڕەمزی و سروت و بەهاو جۆشدانی مرۆڤەکان و ڕۆڵەکانی نەتەوەیەك و پەیوەندییەکی نوێ لەناو تاکەکانی کۆمەڵدا دروست دەکات هەر لەم میانەشدا بەهێنانە گۆڕێی مەسەلەی ئیرادەی نەتەوەو دروستکردنی بلۆکێکی بەشەری، چەمکی جەماوەر وەك خۆی بێتە کایەوەو ناوەرۆك پەیدا بکات و ئەمەش وایکردووە بەشێکی گرنگ لەلێکۆڵەران ڕەگەزەکانی ناسیۆنالیزم لەخۆرئاوادا بگێڕنەوە بۆ ئەو تەوژمە ڕۆمانسییەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم کە وەکو پەرچەکردارێ بەرووی توغیانی عەقلگەراییەکی وشك و برنگ و بێگیاندا هاتبووە کایەوەو (ڕۆسۆ)ش یەکێ بوو لە ڕەمزەکانی.

لە خۆرئاوادا ناسیۆنالیزم لەو لەحزەوە دەست پێدەکات کە مرۆڤ تێڕوانینی بۆخۆی و پەیوەندیەکانی و مێژوو خاك و دەوڵەت گۆڕانی بەسەردابێت، لەوساتەی گروپێکی بەشەری لەپەیوەندییان بەژیان لەسەر زەمینێکی هاوبەشدا کەناو دەنرێت بە (نیشتمان) ژیان بەسەر دەبەن و لەرێی کۆمەڵێ یادگار و یادەوەری و بەهای هاوبەش و باڵاوە ئەزمونێکی ڕۆحی دەستەجەمعی تاقیدەکەنەوەو بەهۆی سیستمێکی حقوقی نوێشەوە بەدەوڵەتەوە دەبەسترێنەوە، لێرەدا تێڕوانین بۆ (خاك) وەك سەرزەمینێ بۆ ژیانێکی ئاسایی دەگۆڕێت.

(خاك) چیتر مەملەکەتی سزادانی ڕۆحی مرۆڤ نامێنێت هەر وەك کەنیسە دەیویست شوێنکەتوانی واتێبگەیەنێ کە ئەم سەرزەمینە مەنزڵگای خۆقوتارکردنە

لە تاوانی ئەبەدی بۆگەیشتن بەمەلەکوتی خوا[1] هەروەها (خاك) ئەو زەویە نامێنێ کە جوتیار ببێتە پاشکۆی و لەگەڵ ئەودا کڕین و فرۆشتنی پێوە بکرێت[2]... ناشبێتە پانتاییەك بۆ دیاریکردنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرە گەورەکان و دیاریکەری قەڵەمڕەو و دەسەڵاتی ناوچەیی میر و دەرەبەگ و سەرۆك خێڵەکان، ناسیۆنالیزم لەڕوویەکەوە تێڕوانینی مرۆڤ بۆ (خاك) لەفۆرمی نیشتماندا فراوان دەکات، واتە ئەو خاکەی پەیوەندی بەمەوەیە تەنها کێلگەکەی یاخود سنوری میرنشینێ نیە، بەڵکو دەبێت بەسەر زەمینێکی بەرفراوانی نوێ کە سەراپای قەڵەمڕەوو پانی و بەرینی خاکی نیشتمان و سنورە سیاسیەکەی دەوڵەت دەگرێتەوە، نیشتمان بەتەنها وەك شوێن و مەڵبەندێ نامێنێتەوە بۆ ژیان و مردن و شەڕکردنەکان و دابینکردنی پێداویستیەکانی ڕۆژانەی مرۆڤ، بەڵکو کۆمەڵێ دەلالەتی رەمزی پەیدا دەکات و دەبێتە هێما بۆ چەندین شتی نوێ لەژیاندا، پیرۆزییەکانیش لەخاکێکەوە کەتارادەیەکی زۆر ئاین مانای پێ دەدات و رازو نهێنیەکانی بۆدیاریدەکان، دەگۆڕێت بۆ فۆرمی نوێ لەپیرۆزی، لێرەوە چەندەها رەمزو دام و دەزگا و بەهاو چەمك دێتە کایەوە، لەوێنەی ئاڵا، سنوری نیشتمانی، سرودی نیشتمانی، بەرژەوەندیە باڵاکانی نەتەوە،

---

[1] کەنیسە باوەڕی وابوو کە گوناهی سەرپێچیکردنی (ئادەم) بەرامبەر بەخوای گەورە لەگەردنی هەموو مرۆڤێکدایە، واتە مرۆڤ بەگوناهباری لەدایك دەبێت، بۆیە دەبێت ئامانجی ژیانی لەوەدا چڕبکاتەوە چۆن گیانی پاك بکاتەوەو لەم گوناهەو گوناهەکانی تر رزگاری ببێ، بۆ ئەم کارەش کەنیسە مرۆڤی مەسیحی واباردەهێنا کە بڕوای وابێت هەتا جەستە زیاتر لەسزاو ئازادا بژی، ڕۆح پاکتر دەبێتەوە، ژیانی ئەم دنیایەش ئەوەندە نیە مرۆڤ بیر لەخۆشیەکانی بکاتەوە، شوێنی راستەقینەی ئەوێرە نییە بەڵکو مەلەکوتی ئاسمان و خوایە.

[2] لەسەدەکانی ناوراستدا بەشێ لەجوتیاران بەکویلەی زەوی ناو دەبران و بە دەستا و دەستکردنی ئەوزەوییەی کاریان تێدا دەکرد لەرێی کڕین و فرۆشتنەوە یاخود هەرهۆیەکیترەوە ئەوانیش لەگەڵ زەویەکە دەگویزرانەوە بۆژێر دەستی خاوەنە تازەکەیاخود بڵێین خاوەن موڵك و فیوداڵەکە.

سوپای نیشتمانی، ئاسایشی نەتەوەیی،.. هتد ئەم رەمزو دام و دەزگایانەش لەیەك کاتدا دوو ئەرك رادەپەڕێنن، یەکەمیان لەنێوخۆدا خەریکی دروستکردنی شوناسێکی دەستە جەمعی نوێ و تێپەراندنی جیاوازییەکانی پێش ئەم قۆناغەو کاڵکردنەوەی شوناسی ئەو جیاوازیانە دەدەن کەلەفۆرمی جیاوازی خێڵەکی و مەزهەبی و میرنشینی و شتی لەم جۆرەدا بوونیان هەبووە. بۆیە ناسیۆنالیزم لە خۆرئاودا رێگایەك بوو بۆ یەکیەتی و یەکبوون، بۆ تێپەراندنی ناکۆکی و جیاوازییە ناوخۆییەکان و فرەدەسەلاتی لەچوارچێوەی سنورەکانی کلتورێکی نەتەوەییدا، ئەمەش بەجوانی لەئەزموون و نموونەی ئەڵمانیا و ئیتاڵیادا وەدەر دەکەوێت، کە چۆن لەکۆمەڵێ دەسەلاتی لەگەڵ یەك ناکۆك و لاوازی میرنشینی و دەرەبەگایەتیەوە توانیان یەکێتیەکی نەتەوەیی پێکبهێنن و دەوڵەت و قەوارەیکی بەهێز دروست بکەن، واتە ناسیۆنالیزم لەناوخۆدا لەرێی پێدانی شوناسێکی دەستەجەمعی کە لە سەر بناغەی کلتور و یەکیەتی دەسەلاتی سیاسی و هاوبەشی لەکۆمەڵێ رەمزو بەهادا دامەزراوە، خەریکی گشتیکردن و سڕینەوەی هەموو ئەو سنورانەیە کە بەجۆرێك لەجۆرەکان پەیوەندییان بە مومارەسەی دەسەلاتەوە هەیە بە مانا فراوانەکەی، هەوڵی دروستکردن و قوڵکردنەوەی ئینتیمایەکی نوێ دەدا، کە ئەویش بریتیە لە ئینتیما بۆ نیشتمان و دەوڵەتی نەتەوەیی و نەتەوە، بەم جۆرەش چەمکی هاونیشتمانی یاخود هاوولاتی لەدایك دەبێت کە پێناسەکردنێکی نوێیە بەبەراورد لەگەڵ ئەو پێناسە کۆنانەی لەوەو پێش بۆی کراوە.

مرۆڤ گەر لەرووی تیۆریشەوە بێت لەدوای سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمەوە مافەکانی لەرێی ئینتیما بۆنیشتمان و نەتەوەو دەوڵەتەوە وەردەگرێت نەك کەنیسە یاخود

میرنشین وخێڵ و بنەماڵە، بۆ سەرکەوتنی ئەم گشتیکردنەی کلتور و بەها و پێوەرانەش ناسیۆنالیزم سودی لە چەندین میکانیزمی وەکو سەربازگیری و پێکهێنانی سوپای نیشتمانی و دامەزراندنی سیستمێکی هاوبەشی خوێندن و بەمیللی کردنی راگەیاندن و میدیا وەرگرتووە هەڵبەتە نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ناسیۆنالیزم لەم پرۆسەی بەگشتی کردن و وەك یەك کردنە ناوخۆیەدا لە بەرگە نازیزم و فاشیزم و بەعسیزم و کەمالیزمەکەیدا تۆتالیتاریزم یاخود دەسەلاتی پۆلیسی بەرهەم دەهێنێ و مانای سڕینەوەی جیاوازیەکانی بەر لە قۆناغی ناسیۆنالیزم لەسەر ئاستی پێکهێنانی دەسەلات و پۆلێنکردن لە بەرامبەر ماف و ئەرکەکانەوە سەردەکێشێ بۆ سڕینەوەی بنەڕەتی هەندێ لەو جیاوازییانەی کە لەبەرگی نوێدا وەدەر دەرکەونەوەو پێویستە رێزیان لێ بگیرێت، وەك جیاوازی ئینتیمای ئەتنیکی و ئاینی تاك، لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییە زۆرانەی کە لەسەر ئاستی فیکرو دنیابینی سیاسی و فەلسەفی و کۆمەلایەتی پرۆسەی بەمۆدێرن کردن لەگەڵ خۆی دەیانهێنێ، لەرووی مێژووییشەوە ئیتالیا و ئەلمانیا کەلەرێی بەکارهێنانی هێزەوە یەکێتی نەتەوەیی دروست دەکەن و گۆڕانەکان پلە بەپلەو بەسروشتی نایەتە دی، دواتر هەر ئەوان دەبنە سەرزەمینی سەرهەڵدانی فکرو مۆدێلی تۆتالیتارو سەرەڕۆی وەکو فاشیزم و نازیزم.

ئەو فکرەش کەلەسایەی لاوازی و نەبوونی یەکیەتی دەسەلاتی سیاسی و ناکۆکی ناوخۆیی لەو وڵاتەدا بەرهەم دێت، دواتر دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی نازی و فاشیەکان و دەسەلاتە زۆردارو پۆلیسیەکان لەشوێنەکانیتری دنیاشدا، ئێمە ناتوانین بیروباوەڕەکانی ماکیافیلی لەمەڕ پەیوەندی ئەخلاق بەسیاسەت و شوێنی

هێز لەو نێوەندەدا لەگەڵ تێزە موتڵەقگەراکەی رۆح و تێڕوانین بۆ دەوڵەت لای هیگل لەواقیعی پارچەپارچەکراوی ئیتاڵیاو ئەڵمانیای سەردەمی ئەو دوو بیرمەندەو فەیلەسوف جیابکەینەوە، کەدواتر وەك وتمان بیروڕاکانیان دەبنە سەر مەشقی زۆریێ لەوانەی پیرۆزکردنی هێز دەکەنە تێزی دڵخوازی خۆیان، گەر ناسیۆنالیزم لەناوخۆی نەتەوەدا نەزعەیەکی یەکیەتیخوازانەو ئاوێزانبوون و وەك یەککردی هەبێ و جیاوازیەکۆنەکان و شوناس و فۆرمەکانی پێش خۆی تێپەڕێنێ، بۆ خۆپێناسەکردنەوەیەکی فەردی و دەستەجەمعی و بەرهەمهێنانی جیاوازی نوێ لە بەرگە دیموکراسیەکەیدا کە ناکۆك نین لەگەڵ یەکیەتی نەتەوەیدا، ئەوا لەکاتی ئیشکردنی بەئاراستەی زەقکردنەوەی جیاوازیەکاندا بەتایبەتیش بەرامبەر ئەوی نەتەوەیی کار دەکات.

لە راستیدا هەرخودی پرۆسەی دروستکردنی شوناسە دەستەجەمعییەکە لەناوخۆدا لەسەر بناغەی زمان و فەرهەنگ ومێژوو دەسەڵاتی هاوبەش، هەستی جیاوازبوون لای تاك و کۆمەڵیش دروست دەکات، ئەودۆخە سیاسی و یاسایی و نێودەوڵەتییەی لەبەرەنجامی ئەم گۆڕانانەشدا دێتە کایەوە، هەستکردن بەو جیاوازییە دەدات بە فەزاو واقیعێك کە مرۆڤ تێیدا بژی و لێی جیانەبێتەوە.

دوالیزمی هاووڵاتی و بێگانەش هەر لەم نێوەندەدا دێتە کایەوە، گەر مرۆڤ هەتا دوێنێ لەسایەی ئیمپراتۆری‌یەکاندا تارادەیەکی فراوان هەستی بەقورسایی و گرنگی و رێگری سنورەکانی نەکردبێ و لەسایەی دواکەوتنی هۆیەکانی گەیاندن و راگەیاندن و پەیوەندیکردن لەو سەردەمەدا، هەروەها ئەگەر زیاتر لەسەر سنوورە نەمەیوەکانی

کلتورو ئاین و شارستانیەتەکاندا، یاخود ئاینزاکاندا، هەستی بەمانای جیاوازبوون کردبێت، رەگەزنامەو شوناسی مرۆڤ زۆر جار بیروباوەڕو ئاینەکەی، یاخود رەنگ و روخسارو جل و بەرگی بووبێت، ئەوا دوای دروستبوونی دەوڵەت و دەسەڵاتی نەتەوەیی و گەشەکردنی زانست و ئەو گۆڕانەی دەستکەوتەکانی بەسەر جیهاندا هێنایان، دەچێتە واقیعێکیترەوە، دوای ئەوە ئیتر مرۆڤ رەگەزنامەو پێناسی باری مەدەنی بۆ پەیدا دەبێت، جیاوازی شوێنی نیشتەجێ بوون و زمان و فەرهەنگی کاردەکاتە سەر رێ و جێی مەعنەوی و یاسایی ئەو، ئیتر چی دی لە دەرەوەی سنورەکانی دەوڵەتی نەتەوەییەوە، وەکو برایەکی هاوئاین مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت گەرچی ئەو دەوڵەتەیتریش خەڵکەکەی هەڵگری هەمان ئاینی ئەوبن، چونکە چی دی مرۆڤەکان و سیستەمەکانی ماف و شەریعەت لەسەر بناغەی ئاین پۆلێن ناکرێن بەڵکو لەسەر بناغەی ئینتیمای نەتەوەیی دادەڕێژرێن، لێرەوە مرۆڤ هەستدەکات کە ئیتر لەدەرەوەی سنورەکانی وڵاتەکەی خۆیەوە حیسابی کەسێکی بێگانەی لەگەڵ دەکرێت.

جگە لەمە دەبینی ئاڵاکان و سرودە نەتەوەییەکان و بەگشتی رەمزەکان لێکجیاوازن، نەخشەکان وەك یەکدی نین، ئەم جیاوازیانەش تەنها رووکەش نین بەڵکو رەنگدانەوەی قووڵ و قورساییان لەسەر زەویدا هەیە، بەم جۆرە هەر وەك وتمان ناسیۆنالیزم لەکاتی ئیشکردنیدا بەئاقاری دەرەوەی خۆیدا دەبێتە سەرچاوەی دروستکردنی هەستی جیاوازی و هێڵێکی جیاکەرەوە بەنێوان هاونیشتمانی و ناهاونیشتیمانیدا دەکێشێت.

ئەم هەستی جیاوازییەش بەسەر کۆی پانتایی ژیانی تاك و نەتەوەدا گشتگیر دەکرێت، لەم پێناوەشدا سەرلەنوێ مێژوو دەنوسرێتەوە، یاخود راستر بڵێین دەشێوێنرێ و دەکرێت بەکەرەسەیەکی پروپاگەندەی ئایدیۆلۆژی و بەهەندێ هەناسەو هێما و ناوەرۆکیش بارگاوی دەکرێت کەتەنها لەسایەی ناسیۆنالیزم و پێویستی ئەو بۆ پەیداکردنی قووڵاییەکی مێژوویی و رەمزو هێمای پێویست بۆ کۆنترۆڵکردنی دەروونی و دروستکردنی هەستی ئینتیماو وروژندنی هەستی شانازی کردن و بۆغزاندن بەمانا نەتەوەییەکەی ئەم نووسینەوە مانا پەیدادەکات، کەواتە جەختکردنەوەی ناسیۆنالیزم بەتایبەتیش لەهەرەتی جۆش و خرۆشیدا لەسەر ئەو شتانەیە کە ئێمەو ئەوان لێکدی جودا دەکاتەوە، کە لە فۆرمە توندڕەوەکەی ناسیۆنالیزمیشدا گوتاری جیاوازبوون دەگۆڕێت بەبانگەشەکیەکی ترسناك بۆسڕینەوەی بەرامبەرو بەسوك سەیرکردنی و بە رەوا بینینی ملپێکەچکردن و تەنانەت ژینۆسایدکردنیشی، هەڵبەت بەهەڵەدا چووین گەر وابزانرێت فاشیزم و نازیزم دوو (استثناء)ی ژیانی خۆرئاوان، نابێت وابزانین تەنها ئەم دوو سیستمە فیکری و سیاسیە ناسیۆنالیزمیان گەیاندۆتە ئاستێ لەبەتاڵکردنەوەی هەموو ئاماژەو ناوەرۆکێکی ئینسانی، کەژێر دەستەکردنی ئەوانی دی بەبەشێ لەئەرکە پیرۆزو مێژووییەکانی خۆی بزانێ و کۆمەڵگاش لەسەر ئەو بناغە جۆشدان و ئاراستە بکات بەڵکو پێش هاتنە سەرکاری ئەو دوو رژێمەو دەرکەوتنی ئەو دوو رێبازە فکرییە لەشێوەی دام و دەزگای سیاسی و دەوڵەتیدا نەتەوەو دەوڵەتانی‌تری ئەوروپا لەئاستی جۆراوجۆردا بەهەمان ئاراستە ئیشییان کردووە.

کۆلۆنیالیزم چییە جگە لەبەکارهێنانێکی سەرمایەداریانەی ناسیۆنالیزم بۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەوی نفوزو بەرژەوەندییەکانی؟ سەرمایەداری لەقۆناغی کۆلۆنیالیزمدا سەرزەمینی بەرژەوەندی و مەودای ستراتیژی شکۆمەندییەکانی خۆی و وەدیهێنانی ئەرکە کلتوریەکانی بۆسەدان و هەزاران کیلۆمەتر دوورتر لەسنورەکانی خۆی و ناوجەرگەی نەتەوەو وڵاتانیتر درێژکردەوە واتە بەپێچەوانەی ئەوپێناسە (گیلنەر)یەی کەسنورەکانی سیاسی ناسیۆنالیزم دەبەستێتەوە بەیەکانگیربوونی لەگەڵ سنورە کلتوریەکانی[1] ناسیۆنالیزمی متوربەکراو بەسەرمایەداری لەو قۆناغەدا دەخوازێت سنورە کلتوریەکانی درێژ بکاتەوە بۆ ڕۆخی سنورە سیاسی و سەربازییەکەی ئەمەش هەندێ جار بەداننەنان بەکلتوری بەرامبەرداو هەندێ جاریتریش وەسفکردنی بەوەی لەئاستێکی ئەوەندە نزمی ژیاریدایە کە خۆی ناتوانێ خاوەن ئەزموونی خۆبەڕێوەبردن و بەشداری ژیاری و سیاسی بێت[2] کۆلۆنیالیزمی سەرمایەداری سودێکی زۆری لە ناسیۆنالیزم بینی بۆ فەراهەمکردنی پێداویستی لەشکرکێشییەکانی و داگیرکردنی گەل و وڵاتانیتر چونکە هەروەك وتمان ناسیۆنالیزم لەسۆنگەی تێکەڵاوبوونێك بەبزوتنەوەی ڕۆمانسیەتی کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە لەوە دەرچوو بوو کە تەنها پرەنسیپێکی سیاسی رووت بێت، بەڵکو ڕەهەندێکی سروت ئامێزو شیعری و کەرەنەڤاڵیشی بەخۆوە

[1] ارنست گیلنەر/ ماهي الامة / القومية مرض العصر ام خلاصه / فالح عبدالجبار لا ٣٧.

[2] هەندێ لەو فەیلەسوف و بیرمەندانەی خۆرئاوا کەئاماژەیان بەمەسەلەی ناسیونالیزم و ژیاری خۆرئاوایی کردووە بە روونی ئەم هەناسەیان تێدا دەردەکەوێت بۆ نموونەن (هیگل) دەڵێ: ( تەنها مافی نەتەوە بەهێزو دەسەڵاتدارەکان بژین و گەلە لاوازو دواکەوتووەکانیش تێکبشکێنن و تیابچن، (کارل بیرسون)یش پێی وایە (البقاء للاصلح) یاسایەکی سروشتییە لەپەیوەندی نێوان گەلاندا / الاسلام والقومية / الدكتور علي النقوي/ چاپی ١٩٩٧ لا ٢٥.

گرتبوو. ناسیۆنالیزم لەخۆرئاوای سەدەی نۆزدەدا لەپاڵ ئەرکە سیاسیەکەیدا ئەرکێکی ئاینی و رۆحیش دەبینێ بۆ پڕکردنەوەی بەشێ لەو فەراغە رۆحییەی کە لە بەرەنجامی پاشەکشەکردن بەمەسیحیەت و بڵاوبوونەوەی تەوژمێکی بێباوەڕی و گومان و دوو دڵی لەئەورووپای ئەو کاتەدا هاتبووە کایەوە لەو سۆنگەیەوە کەناخ و قەوارە عاتفی و رۆحی و دەرونیەکەی مرۆڤ هەمیشە ئاتاجی جۆرێ لە رۆحانیەت و مەعنەویاتە ناسیۆنالیزم بۆ سازدانی جەماوەرو بزواندنی جۆش و خرۆش و خوێنگەرمیان تا رادەیەکی بەرچاو شوێنی باوەڕو حەماسی ئایینی گرتبۆوە.

لێرەدا ناسیۆنالیزم نزیك دەبێتەوە لەوەی نەتەوە لەرووی دڵ پێوە بەستن و سۆز جوڵاندنەوە بخاتە جێگای خوا، یاخود بڵێین رۆڵەکانی نەتەوە خۆیان بکەونە پەرستنی خۆیان، ناسیۆنالیزم لەخۆرئاوادا میوانێکی ناکاو نەبووە لەنێوماڵی کلتورێکی نامۆ دابەزیبێ.. بەڵکو بەرەنجامێکی سروشتی ئەو ئاڵوگۆڕە گەورانە بووە کە ژیانی کۆمەڵگا خۆرئاواییەکانی گرتۆتەوە، دیدی زانستی ناتوانێ ناسیۆنالیزم لەگەشەکردنی بزوتنەوەی ئەزموونگەرایی و زانست و دەستکەوتە زانستیەکان و ئەو مشتومڕە گەورانەی بزوتنەوەی رۆشنگەری بەرپای کردوون دابڕێت، چونکە هەروەك ئێستا دەبینین نیمچە کۆدەنگیەك لەنێو تیۆریستە هاوچەرخەکانی ناسیۆنالیزمدا هەیە کە لەسەر ئەوەی ئەگەربێت و پێشکەوتنەکانی زانست و تازبوونەوەی سیستمی یاسایی و پەروەردەیی و سەربازی و کلتوریی نەبوایە ئاسان نەبوو ناسیۆنالیزم بتوانێ مۆدێلێکی دیاریکراو لەزمان و کلتورو مەنزومەیەکی رەمزی بەسەرکۆی نەتەوە دابسەپێنێ.

بەکورتی ناسیۆنالیزم دیاردەیەکی دابڕاو نەبوو لەکۆی ژیانی فکری و رۆحی و ژیاری خۆرئاوای ساتەوەختی سەرهەڵدانی بەڵکو روکارێکی دیاریکراوی مەنزومەیەکی تێروتەواو بوو بەپێچەوانەی ناسیۆنالیزم لەخۆرهەڵاتدا کە دەیەوێت لەهەل و مەرجێکی کلتوری و رۆحی و زانستی و سیاسی یەکجار جیاوازدا نمونەی خۆی ئەزموون کات و ببێتە هۆکارێکی تازەکردنەوەی کۆمەڵی نیشتمانی ناسیۆنالیزم لەهەرێمەکەی ئێمەدا لە فەزایەکدا دەپەڕێنە نێو ئەدەبیاتی سیاسی و فەرهەنگی نوخبەو دواتر جەماوەرەوە کە تا ئەم ساتەوەختەش لە دەرەوەی ئیسلام خاوەن هیچ میراتێکی یەکێتیخوازانەی جددی نییە.

### ناسیۆنالیزمی کوردی

ئێستا ئەگەر لەبەر رۆشنایی ئەوئامازانەی سەرەوەدا بمانەوێ سەرنجێ لە ناسیۆنالیزمی کوردی بدەین و بیخوێنینەوەو هەندێ تێبینی مەیدانی لەم رووەوە تۆمار بکەین، هەستدەکەین ئەم ناسیۆنالیزمە هەرلەساتەوەختی سەرهەڵدانیەوە تاکو ئێستا کۆمەڵێ ئیشکالیەتی تایبەت بەخۆی هەیە دیارە دەتوانین بڵێین کە بەشێ لەو قەیران و ئیشکالیەتانە لەسەر ئاستی ناوچەکەدا گشتین و تەنها پەیوەست نین بەناسیۆنالیزمی کوردییەوە، بەڵکو گرفتی زۆرێ لە ناسیۆنالیزمی گەلانیتری ناوچەکەشە واتە گرفتی ناسیۆنالیزمە لە پەیوەندی بەکەلتورو شارستانیەتی ناوچەکەو ئیسلام و ئەو ناوەرۆکە فکرییەی هەڵیگرتووە لەگەڵ دەوڵەتی دوای کۆلۆنیالیزم، واتە گرفتی ناسیۆنالیزمێکە دەستەو یەخەیە لەگەڵ

کلتورێکی ناناسیۆنالیستی و ڕووی دووەمی عەلمانیەتەو لەزۆر کاتیشدا خۆی خاوەنی ئەزموونی دروستکردنی دەوڵەت نییەو بەڵکو لەچوارچێوەی دەوڵەت و قەوارەیەکدا سەر دەردێنێ و دەیەوێت بەهاوپێوەرەکانی بەگشتی بکات و کۆمەڵگا ناچار بەپابەند بوون پێیانەوە بکات، کە یا ڕاستەوخۆ نوێنەری ناسیۆنالیزمێکیتر واتە کۆلۆنیالزم دروستی کردووە، یاخود پاشماوەیەکی لاوازی شەڕەکان و دابەشکردنەوەی سیاسی و جوگرافی وڵاتانی ناوچەکەیە. گرفتی ناسیۆنالیزم لەدنیای ئیسلامدا جۆراوجۆرن و لەسەر ڕاوەستانی زۆری دەوێت ئیش لەسەرکردنیشی گرنگە بۆ دەرخستنی میکانیزمەکانی ناسیۆنالیزمی گەلانی مسوڵمان و دیاریکردنی ئەوشێواویانەی لەڕووی سیاسییەوە ئەم کۆمەڵگایانە بەدەستیانەوە دەناڵێن.

کە تائێستاش ناوچەکە باجی قورسی ئەو حاڵەتە دەدات، مەسەلەی ئامادەیی دوژمن و بیرۆکەی جیاوازی و سەرلەنوێ خوێندنەوەی مێژوو، شوناسی دەستەجەمعی و سنورە نیشتمانیەکان و ژێرخانی کلتوری و گشتی کردنی نمونەکان و زۆرشتیتر بۆ چەندان کۆمەڵگای مسوڵمان بەتراژیدیایەکی گەورە شکاوەتەوەو کۆتایی پێهاتووە، نمونەکانی عێراق و تورکیاو میسرو زۆر شوێنیتر شایەتی بوونی ئەم تراژیدیایەن، ئەم مۆدێلە لەناسیۆنالیزم هەر لە یەکەم لەحزەوە دەبێتە ئەسیری ستاندارکردنی نمونەیەکی دەرەکی کەبەداخەوە زۆرجاریشدا نموونە دەرەکیەکە نمونەیەکی توندوتیژ بووەوە[١] بێگوێدانە جیاوازییە کلتوری و ئاینی و مێژووییەکان و

---

[١] تێگەیشتنی بەعس بۆناسیونالیزم ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەری نموونە ئەلمانیەکە دابوو لەو سۆنگەوە کەجیهانی عەرەبیش پارچە پارچە کراوەو دەیانویست هەمان ئەزموونی یەکیەتیخوازی ئەلمانەکان و بسمارك دووبارە بکەنەوە، ناسیونالیزمی تورکیش دیسانەوە لەژێر کاریگەری نموونە ئەلمانیەکەدا بووە.

پەیوەست بوونی توندوتۆڵی هەر مۆدێل نمونەیەکی ناسیۆنالیزم بەواقیعی نیشتمانی و ئەو گەشە مێژووییەی هەر نەتەوەو کۆمەڵگایەکی دیاریکراو کردویەتی و دەیکات، دەرك نەکردنی ئەم جیاوازیانە لەنێوان ئێرەو ئەوێ بەتایبەتیش لەنیوەی سەدەی بیستەمدا کەناسیۆنالیزم لەدنیای ئیسلامدا بڵاودەبێتەوە، دەرك نەکردنی سروشتی ئیسلام و جیاوازییەکانی لەگەڵ کەنیسەی مەسیحیدا لەخۆرئاوادا بەرەنجامی زۆر خوێناوی لێکەوتەوە، تەنانەت لەسەر ئاستی خودی ناسیۆنالیزمدا مەسەلەکە بەپێشکەشکردنی پرۆژەیەکی تێکشکاوی ناکامڵ و شێواندنی ناسیۆنالیزم کۆتایی پێهات. ئێمە لێرەدا لەم بارەوە لەوە زیاتر ناڕۆین چونکە قسەکردن لەسەر تایبەتمەندبوون لەم بازنەدا فراوان دەبێت بۆ ئاستی دنیای ئیسلام و خۆرهەڵات کە ئەمەش مەبەستی ئێمە نییە لەم نوسینەدا و تەنها بەوئەندازە نزیکی دەبینەوە کەبرژێتە ناو سنوری ئەو تایبەتمەندیە تایبەتەیتر کەوابەستەیە بەناسیۆنالیزمی کوردییەوە.

ئەوەی پەیوەستە بە کوردستانەوە ئێستا نیمچە کۆدەنگیەك لەنێوەندە رۆشنبیریەکەدا پەیدابووە کە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لەساڵی (١٨٨١) بەسەرەتای چەکەرەکردن و سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی دادەنرێت، چونکە ئەدەبیاتی شۆڕشەکە بەشێوەیەکی سەرەتایی چەمکە ناسیۆنالیستەکانی نەتەوەو جیاوازبوون بەکاردەهێنێ، رێبەرایەتی شۆڕش بۆ پاساودانی و شەرعیەتدان بەو تێکۆشانەی دەستیان دابوویەو ئەو ئامانجانەی هەڵیانگرتبوو بەتایبەتیش خودی شێخ عوبەیدوڵڵا کە رۆڵی سەرکردەیەکی رەمزی دەبینی، بیرۆکەی جیاوازبوونیان

هێنابووە کایەوە[١] هەروەها باسی سەربەخۆیی کوردستانیش یاخود کۆکردنەوەی کوردەکان لەژێر دەسەڵاتێکی ئیسلامی کوردیی سەربەخۆدا لەبەرنامەی شۆڕشدا بوو، بێگومان بەگەڕانەوە بۆ کێشمەکێشەکانی ئەوقۆناغەی ناودەوڵەتی عوسمانی و قاجاری لەئێراندا هەروەها تاوتوێکردنی هەندێ لەلێدوان و پەیوەندی کردنەکانی شێخی نەهری و ئەو شتانەش کە خەڵکانی بێگانەی پەیوەندیدار بەدۆخەکە و بەدواداچوونی شۆڕش لەسەر شۆڕشەکە و ئامانجەکان و پاڵنەرەکان و سەرکردەکەی نووسیویانە، دەگەیننە ئەو قەناعەتەی کە ئەو سەرەتایانەی ناسیۆنالیزمی کوردی هاوکاتە لەگەڵ پرۆسەی مەرکەزیکردنی دەسەڵات لەناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا وەك بەشێ لەو ریفۆرم و مۆدێرنەکردنی دەسەڵات کە لەئارادا بوو، هەندێ جاریش بووە داخوازییەکی دەوڵەتانی خۆرئاوا و بەڵکو دەشسەپێنرا و دەکرا بەمەرج بەسەر ئیمپراتۆریەتەوە، هەروەها هۆشیاریەکی سەرەتاییش سەبارەت بەرۆڵی هێزە ناسیۆنالیستە خۆرئاواییەکان و ئەو رۆڵەی لەجیهاندا دەیانبینی هەستی پێدەکرێت، سەرکردایەتی راپەڕینەکەش لەسەر بناغەی خۆرێکخستنەوەیەکی تازە کە باس قەڵەمڕەوی سەرزەویە کوردنشینەکان واتە کوردستان هەوڵی بەدەستهێنانی پشتیوانی کورد و ئەو هێزە کارایە نێودەوڵەتیانە دەدات کە لە ئارادابوون، بەواتایەکیتر ئەم پەیوەندیکردنە بە دەوڵەتە دەست رۆیشتوەکانی ئەو کاتە کە بەگەرمی تێکەڵ بەمەسەلەی خۆرهەڵات بووبوون، کوردیش بەشێکی گرنگی

---

[١] شێخی نەهری لەنامەکەیدا بۆ مژدەدەری ئەمریکی (کوچران) دەنووسێ (گەلی کورد کەزیاتر لەنیو ملیۆن بنەماڵەیە، گەلێکی جیاوازە، ئایینیان جیاوازە، مەزهەبیان جیاوازە نەریتیان جیاوازە لەداب و نەریتی کەسانی تر، جرجیس فتح الله مباحپ علی هامش پورە الشیخ عبیدالله النهری ل٢٦.

پێکهاتەی دیموگراف و سەربازیی ناوچەکە بووە، نیشانەی بوونی هۆشیاریەکی نوێیە لەروویەکیترەوە بەشێ لەسەرتاکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە پەیوەندی بە کێشمەکێش و ترس و دوودلّی بەرامبەر ناسیۆنالیزمی ئەرمەنی دەخەملێ و دێتە بوون، لەپالّ ئەمانەدا بەسەرنجدان لەدۆخی شلّەژاو و نیمچە پاشاگەردانی و بەرەلایی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و یاسایی ئەوکاتەی کوردستان و ئەو دەرەنجامە سایکۆلۆژی و ژیانیانەی لێی کەوتۆتەوە، تێدەگەین کە هەولّدان بۆدروستکردنی دەسەلاتێکی لە روویەکی گرنگیدا بە پلەی یەکەم وەلامدانەوەی واقیع و خواستێکی مەیدانی بووە، واتە هەولّدانی پەیداکردنی چوارچێوەیەکی سیاسی و دەسەلاتی بووە بۆ ئەنجامدانی ریفۆرم و سنورردانان بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارو دژوارەی گەیشتبووە کەناری داڕووخان.[1]

ئێمە لەم سەرەتایانەدا لەرووی ناوەرۆکی فکریی بزاڤە ناسیۆنالیزمەکەوە هەست بە عەلمانی بوون ناکەین بەپێچەوانەوە مەسەلەی سەربەخۆبوون و پێکەوەنانی قەوارەیەکی کوردی بەتوندی دەبەسترێتەوە بەزیندووکردنەوەی رۆحی شەریعەتی ئیسلام و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی لەپەیوەندییە فەردی و کۆمەلایەتیەکاندا، واتە پاساوێکی سەرهەلّدانی جولانەوەکەو هەولّدان بۆ بەدەسەلات گەیشتنی ئەوەبوو کەهەردوو دەولّەتی عوسمانی و ئێرانی لەرووی ئیداری و یاساییەوە بەرەو گەندەلّی چوون بەتایبەتیش لەکوردستاندا ئیشکردن بەشەریعەتی ئیسلامی تارادەیەکی زۆر (غائب) بووە هەر لەبەر ئەم هۆکارانەش پشێوی هەموو بوارێکی ژیانی گرتۆتەوەو دزی و جەردەیی و راووڕووت پەرەی سەندوەو خەلّك لەگەلّ نەمانی هێمنی و

[1] سەیری هەمان سەرچاوە بکە لەگەلّ راپەڕینی کوردەکان لەسالّی ۱۸۸۰ی دکتۆر جەلیلی جەلیل / چاپی۱۹۸۷.

ئاسایشدا رووبەڕووبونەوە سیمای حکومەتداری لە ناوچە کوردیەکاندا بەرەو کاڵبوونەوەی تەواو چووە کورد نائومێدیش بووە لەوەی کاربەدەستانی ئەم دوو دەوڵەتە بتوانن هیچ گۆڕانێکی وا لەرەوشەکەدا بێتە دی.

لێرەشدا ناسیۆنالیزم دەبێتە هەوڵدان بۆ بوژاندنەوەی رۆحی ئیسلامخوازی و ئیشکردن بە ئەحکامەکانی و بەهاکانی لەوێنەی دژایەتی کردنی زوڵم و داکۆکی کردن لەعەدالەت و پشتیوانی کردن لەکەم دەست و بێهێزەکان، لەو قۆناغەدا ناسیۆنالیزم بوون و کوردبوون و ئیسلامی بوون هێندە بەچڕی بەناو یەکدا چوون لێکجیاکردنەوەیان هەروەها کارێکی ئاسان نەبێت لەم رووەوە گۆڕانێکی گرنگ دەبینرێ کە بەرهەمی کۆی ئەو گۆڕانکاریانەیە بووە لەئاستی جیهان و ناوخۆی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێرانیدا روویانداوە کە لەگەڵ خودی رۆحی ئیسلام خۆی و تێگەیشتنەکەی شێخیش سازگار بووە کە ئەویش بریتی بووە لە جیاوازی کردن لەنێوان ئیسلام وەك ئایین و ژیارو مەنزومەی بەهاکان لەگەڵ ئیسلامێکی بەدام و دەزگایی کراوی مێژووییدا کە لەدەزگای سەڵتەنەدا خۆی دۆزیوەتەوە، واتە پچڕاندنی پەیوەندی مرۆڤی موسڵمانە کەلێرەدا زیاتر مەبەست مرۆڤی مسوڵمانی کوردە بەدام و دەزگایەکی ئیسلامیی دیاریکراوەوە کەبەناوی ئیسلامەوە دەدوێت و قسە دەکات، بەڵکو دەیەوێت قۆرخی نوێنەرایەتی کردنی ئیسلام و سەرجەم موسڵمانەکان بکات بێئەوەی لەو ئاستەدا بێت و پێداوستیەکانی فەراهەم کردبێت بەو مانایە لەکوردستاندا هەستێ پەیدا دەبێت کەپێی وابێ دەکرێ کورد راستەوخۆ بەشێ نەبێت لەرەعیەتی سوڵتانی عوسمانی و لەدەرەوەی ئەودا ئەزموونی موسڵمانبوونی خۆی بکات، ئەوەی ئەم کارەشی ئاسان کردبوو

لەکوردستاندا خراپیی دەسەڵات و گەندەڵی ئیداری و بوونی ستەمی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆرو ئەو پێگەئاینی و ئیسلامییە میللییە بەهێزەبوو کەشێخی نەهری وەك رابەرێکی ئاینی لەکوردستاندا هەیبوو، بەجۆرێ هەندێ کات لەرووی رێزو پلەو پایەی رۆحی و کۆمەڵایەتیەوە لەناو کورد لەسوڵتانی عوسمانی زیاتر نەبوو بێت کەمتر نەبووە[١] ئەوەش یەکسان بوو بەلابردنی مۆرکی عەقیدەیی لەدەسەڵاتێکی زەمەنی دیاریکراو کە پەیوەندیەکانی هێزو کارلێکردنە کۆمەڵگایی و شارستانیەکان لە قۆناغێکی مێژوویی ناوچەکەدا دروستی کردبوو، خۆشی لە بنەڕەتدا بەشێکی بەعەقیدەیی کراوە نەك مەسەلەکە لەئیسلامدا بەوجۆرەبێت، لەوساتە بەراییانەدا (خێڵ) وەك فۆرمێکی خۆڕێکخستن و چوارچێوەیەکی (حقوقی) و (ئینتیما) و ئەو بەسەربەخۆدا داخرانەی دروستی دەکرد لەمپەرێکی بەرچاوی شکڵگرتنی بزاڤێکی سەراسەری شێوە هاوچەرخ بوو، بەڵام (موقع)ی ئاینی شێخ و ئەو تۆڕو رێکخستنە سوننەتیەی لەبەردەستیدابوو هەروەها هێزی رەمزبوونی هۆکاری یارمەتی دەرو کاریگەربوون بۆ ئەوەی لەداخراوی و رێگریی ئەم بەربەستە کەم بکاتەوە، گەرلێرەشەوە لەم سەرتایانەوە بگوازرینەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم و روونتریش دوای جەنگی جیهانی یەکەم و رووخانی دەسەڵاتی عوسمانی و هاتنەکایەی ئەو مۆدیلە لەدەسەڵات و دەوڵەت کە بە دەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم ناسراوە، چونکە سەرەتای دووەمی ناسیۆنالیزمی کوردی و گەلانیتری ناوچەکەش لێرەوە بەئاشکرایی دەست پێدەکات، ئەوا لەم مێژووە بەدواوە واتە لە بیستەکانی سەدەی رابردووەوە ناسیۆنالیزم لەرووی فکریشەوە وردە وردە خۆی مەترەح دەکات

[١] محمد عبدالجبار/ الاسلام والدولة القومية ، رۆژنامەی (الحیاه) ژمارە ١٢٦٦٤.

گەرچی لەم قۆناغەدا ئەم چەمکە زیاتر لە فۆرمی سەرەتای نیشتمانپەروەرێتیدا بەرجەستە دەبوو.. ناسیۆنالیزم لەم قۆناغەدا دەبێ بەشوناسی فکری بەشێکی دیاریکراوی ئەو نوخبە فیکری و سیاسیەی سەرەتاکانی پرۆسەی بەدۆمێرنەکردنی سیستەمی خوێندن و سەربازی و سیاسی بەرهەمی هێنابوون گەرچی هێشتا زووبوو بۆ ئەوەی لەئاستی بنکە جەماوەریە بەرینەکەدا ببێ بە بەشێکی گرنگ لە شوناس و (ولاء)ی خەڵك بۆ ئیسلام و خێڵ و مەزهەب و تەریقەت و هەندێ شوناسی ناوخۆییتر لاواز بکات بەڵام هەرچۆنێك بێت مۆدیلێك لە دەسەڵات و خۆرێکخستنی سیاسیی تازە لەناوچەکەدا هاتە کایەوە کەلەزۆر رووەوە لەبەر گیراوەی نموونە خۆرئاواییەکەبوو. ئەم مۆدێلەش لەپاڵ ئەوەی خواسترابوو بەرهەمی گەشەی سروشتی کۆمەڵگا نەبوو بەڵکو سەپێنرابوو، سەپاندنەکەشی بەشێکی گرنگی پەیوەست بوو بە بەرژەوەندی کۆلۆنیالیزم خۆیەوە ئەو هێزانەی دواتریش کە بەناوی سەربەخۆیی نیشتمانیەوە هاتن بێ تواناتربوون لەوەی بتوانن گۆڕانێکی چۆنایەتی گرنگ لەم فۆرم و قەوارەیەدا دروست بکەن، بۆیە تا ئەم ساتەوەختەش لەزۆربەی ناوچەکەدا ئەم کائینە نامۆیە بەدەست قەیرانی شەرعیەت و پێکهێنانی نەتەوەو ناهامۆجینی کۆمەڵگایی و دەستەبەرکردنی مەرجەکانی تازەبوونەوەیەکی راستەقینەو هاوسەنگ و گەشەیەکی ئابوری و سیاسیەوە دەناڵێنی و بوەتە بەربەست لە بەردەم خەملاندن و شکل گرتنی هەر پرۆژەیەکی بوژانەوەو راپەرینی شارستانی هەمەلایەنەو مەزن، کەبتوانێ جیاوازییەکانی نێوان ئەم دنیایەو دنیای یەکەم پڕبکاتەوە[1] وەستان لەسەر سەرەتاکانی دەستپێکردنی دووەمی

[1] دوای جەنگی جیهانی یەکەمیش هەرکەسێتی یە ئیسلامییە میللیەکان بەتایبەتیش شێخەکانی تەریقەت رێبەرایەتی

ناسیۆنالیزمی کوردی بۆ دەستنیشانکردنی سروشت و گرفتەکانی ئێستای ئەم ناسیۆنالیزمە پێویستە، چونکە پرۆسەی مۆدێرنەکردن لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و دواتر لەناو قەوارە مۆدێرنەکاندا لەرووی فیکری و دام ودەزگایی و سەرکردایەتییەوە گۆڕان بەسەر بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردیدا دەهێنێ. چەمك و رێبازو فکرە و هاوچەرخەکان وردە وردە دەپەڕنە نێو بەشێ لە بیرکردنەوەی نوخبەوە، توێژی نوێ لە کۆمەڵگادا سەرهەڵدەدەن، حزب و رێکخراوی سیاسی وەك فۆرمێکی خۆرێکخستنی سیاسی و جەماوەری نوێ تێکەڵ بەبزاڤە ناسیونالیستیەکە دەبێت، سەرکردایەتی کردنەکەشی تا رادەیەك گۆڕانی بەسەردا دێت[1] لە روویەکیترەوە ناسیۆنالیزمی کوردی دەکەوێتە ناو واقیعێکەوە کە کۆمەڵێ جەبری سیاسی و سەربازی و نێو دەوڵەتی حوکمی دەکات، شۆڕش و راپەڕینی چەکداری دەبێتە فۆرمی باڵادەست و زاڵ و باوی بزوتنەوە ناسیۆنالیستییەکە بەجۆرێك چەك تێکەڵ بەزۆر رەهەندی ژیانی مرۆڤی کوردوکۆمەڵگای کوردی دەبێت و ئاراستەش بۆ جوڵانەوەکەدیاری دەکات، بەڵکو کار دەکاتە سەر جۆری دیاریکردنی دروشمەکان و دارشتنی پەیوەندیەکان و پۆلێنکردنی دۆست و دوژمنەکان.

جا ئەگەر فەزای قەوارە و دەوڵەتی پۆست کۆلۆنیالیزم بۆ ناسیۆنالیزمی نەتەوەکانی رۆژهەڵات بەوانەشەوە کەبوونە میراتگری راستەقینەی قەوارەکانی

شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکان دەکەن بۆ نموونە وەك شێخ محمود و شێخ سەعیدی پیران، بەڵام لەهەمان کاتدا هەندێ خەڵکی تری ئەفسەر و رۆشنبیری و پێگەیشتوانی سیستمی نوێی خوێندنیش بەشداری لە کاروبارەکانی شۆڕش و لەئاستێکیشدا بەشداری لە رێبەرایەتی کردنیدا دەکەن.

[1] ئەم نموونە بەزەقی لەتورکیای کەمالیداو لەسەردەمی شای ئێرانیشدا لەئارادا بووە لەکوردستانی عێراقیشدا ناوچە تەعریبکراوەکان بەدەستی هەمان چەوساندنەوەوە ناڵاندویانە مەسەلەی گۆڕینی شوناسی نەتەوەیی لەکەرکوك و هەندێ شوێنیتر رەنگدانەوەی ئەم سیاسەتەیە.

پێشوو واتە وەك فارس و تورك و عەرەب بەگشتی فەزایەکی ئاسایی نەبوو بێت بۆ گەشەکردن و شێوە پێ بەخشین و بڕینی قۆناغەکانی بەرەو پێگەیشتوویی و جێگیری سیاسی و یەکانگیری کۆمەلایەتی، دەبێت بۆ ناسیۆنالیزمێکی وەکو ناسیۆنالیزمی کوردی چی لێ بێت کە جگە لە مەحکوم بون بەو چوارچێوە تەقلیدییە قەیرانی دانپیانەنان و نەبوونی سەرزەمینێ بۆ خۆنمایشکردن لەشێوەی دەسەلاتی سیاسی و دەولەتیشی هەبووە؟ بەلکو هەوڵ دراوە هەر بەتەواوی مەسخ بکرێت و بتوێنرێتەوە و بهاڕدرێت. دیارە هەر وەك مێژووی خوێناوی کارەساتباری کوردایەتی و بزاڤی نیشتمانی کوردی دەیخاتە روو ئەم واقیعە زۆر بەگران لەسەر کورد و کۆمەلگا و ناسیۆنالیزمی کوردی کەوتۆتەوە.

## گرفتەکانی فۆرمۆلەبوون

وەك وتمان سەرەپای بزوتنەوەی ناسیۆنالیزم لە رۆژهەلاتدا بیرۆکەیەکی خوازراوی دەرەوەی ژینگە فەرهەنگی و سیاسیەکەی خۆیەتی ناسیۆنالیزمێکی لەو جۆرەش کەبەشێ نیە لە پرۆژەیەکی رێنیسانس و بوژانەوەی هەمەلایەنەو ناچێتە خانەی تەرحکردنی چوار چێوەیەکی نوێی مێژوویی بۆ گەشەکردنی کۆمەڵی سیاسی و پەیوەندیەکانی دەبێتە هێمایەکی ئەوقەیرانە قووڵەی ئەم ناوچەی تێکەوتبوو کەتاکو ئێستاش بەدەست رەنگدانەوەکانیەوە دەناڵێنێ. لەسایەی ئەم دۆخە ناهامۆجین و بەتاڵ لەهەر ستراتیژیەتێکی فیکری یاخود سیاسی نیشتمانیدا ناسیۆنالیزمی کوردی جگە لەوەی لەسەرەتای قۆناغی شکڵ گرتنی خۆیدا

کەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم تا سیەکانی ئەوسەدەیە دەخایەنێ لەگەڵ خودی کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایی دەرگیربووە شەڕی دیاریکردنی جێ و ڕێی خۆی دەکات لەو جیهانەی کە لەحاڵی دارشتنەوە دابوو، دواتریش دەبێتە ئەسیری چوارچێوەو جەبرەکانی ئەو قەوارە نوێیانەی بەرژەوەندییەکانی هێزە کۆلۆنیالیزمە خۆرئاواییەکان دایاندەمەزرێنن. کاتێ دوای جەنگی جیهانی یەکەم بێبەش دەکرێت لەپێکهێنانی قەوارەی نەتەوایەتی خۆی و ئەو هەلومەرج و چوارچێوەی کەبێ ئەو هیچ ناسیۆنالیزمێ ئاسان نییە قۆناغەکانی گەشەکردن و پێگەیشتنی خۆی ببڕێت بەتایبەتیش لەناوچەیەکی وەکو ناوچەی ئێمەدا ئەوکاتە ناسیۆنالیزمی کوردی ئەو سەرزەمین و پێگانە لەدەستدەدا کە بۆ هەر ناسیۆنالیزمێ پێویستن، هەروەك ڕوونە لەئەزموونی خۆرئاوادا دام و دەزگاو میکانیزمەکانی چوارچێوەی دەوڵەتی هاوچەرخ ئەوهۆیانە بوون کەلەڕێی ئەوانەوە بەهاکانی ناسیۆنالیزم گشتی دەکران و دەکران بەبەشێ لەفەرهەنگ و واقیعی ژیانی رۆژانەی خەڵك. قوتابخانەو میدیاو سوپاو دەزگاکانی توێژینەوەو چەندین دام و دەزگایتر هەر یەکەو وەیزفەیەکی تایبەتی لەم رووەوە ئەنجامداوە بۆ تەواوکردنی ئەرکێکی گشتی کە دروستکردنی بەهایەکی هاوبەشی گشتییە کە ئیلهامی لەسەرەتا ناسیۆنالیزمەکانەوە وەرگرتبێت هەر ئەم دام و دەزگایانەش دەزگایەکی چەمکی بەکاردەهێنێت، کە موفرەدەکان جارێکیتر بۆتاکو کۆمەڵگا راڤە دەکەنەوەو ناوەرۆکی نوێیان پێ دەبەخشن، بێ بوونی دەوڵەت و سیاسەتێکی ناسیۆنالیستانەی دەوڵەتیش ئەودەزگایانە مانایان زۆر نامێنێ سیستمی خوێندن و میدیاو سەربازی بەشێکن لەپێداویستیەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ هەر لە چوارچێوەی ئەویشدا دادەمەزرێن و گەشە دەکەن و ئەو رۆڵە دەبینین

کەبۆیان دیاریکراوە دەوڵەتیش خۆی سەرپەرشتیاری ئەم دەزگایانە دەکات، لەئەزمونی ئەورووپیدا زمانی یەکگرتوو سوپای نیشتمانی و بەکۆمەڵایەتی کردنی رەمزە نەتەوەیەکان و زۆرشتیتر، هەر بەم جۆرە ئەنجام دراون، گەر دەوڵەتی هاوچەرخی فەرەنسی نەبوایە زمانی ئێستای فەرەنسی بەمجۆرەی ئێستا نەدەبوو، کەلەسەروبەندی سەرکەوتنی شۆڕشی گەورەی فەرەنسادا بەشێکی زۆرکەم لە فەرنسیەکان نەبێت قسەیان پێ نەدەکرد.

قوتابخانە وەك بەشێ لە میکانیزمەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ ئەرکی تەنها فێرکردن و پاراستنی زمان دروستکردنی زمانی یەکگرتوو نیە، بەڵکو بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری نیشتمانی و پێگەیاندنی خوێندکارە لەسەر کۆمەڵی بەهاوشێوە بیرکردنەوەورەمزو شانازی کردنی هاوبەش و بەستنەوەی مرۆڤە بەمێژوویەکی دیاریکراوەوە. هۆشیارکردنیەتی بەجوگرافیاو نەخشەنوێەکان و ئەو رۆڵەی ئەم نەخشانە لەدیاریکردن و جیاکردنەوەی جیاوازیەکان و پیرۆزیدان بەسنورەکان و سەیرکردنی دنیا وەك سەرزەمینێ بۆ کۆمەڵێ نەتەوەو دەوڵەتی لەیەکدی جیاواز دەبینن، دەزگا ئەکادیمی و زانستیەکان لەرێی خۆیانەوە (تأصیل)ی رەمزو هێماکان دەکەن و شەرعیەتیان پێ دەدەن لەناو مێژوو زمان و جوگرافیاداو بۆ رەوایەتی و قووڵایی و رەسەنایەتی و شانازیکردن و خاوەن ماف بوون و شکۆمەندی و مەزنێتی دەگەرێن، لەولاوە نیشتیمان دەبێتە ئەوتاکە سەرزەوییەی کە مرۆڤ لەوێدا هەست بەنامۆیی و دابڕان و بێرەگ و ریشەیی ناکات.. نیشتمان سەرزەمینی بەدیهاتنی خەونەکان و بەرجەستەکردنی بەهاو شکۆمەندییەکان و بنیاتنانی ئەزموونی سەربەخۆوهەست بەکەرامەتکردنە.

نیشتمان لەفۆڕمە ناسیۆنالیزمیەکەیدا تەنها خاك و خۆڵ و شاخ و دۆڵ و بەردێکی بێهەست و نەست نیە، بەڵکو دەگۆڕێت بەمەزرایەکی دەروونی و کلتوری و تەنانەت رۆحیش دەبێت بەسوکە خواوەندێك کە قوربانی لە رۆڵەکانی دەوێت، بەمەعشوق و دەبێ هەمووان ئەویندار ئەوبن، چونکە ئەوخێرو بێرو فەڕی خۆی بۆ ئێمە واڵاکردوەو لەوەش زیاتر لەساتەوەختێکی رۆمانسی قووڵدا نیشتیمان دەکرێت بەدایك، وێکچوواندنی نیشتمان لەگەڵ دایك لە ئەدەبیاتی ناسیۆنالیستی دنیاو کوردیشدا، رەگ و ریشەیەکی رۆحی و سایکۆلۆژی و کلتوری قوڵ دەبەخشێ بەو سەرزەمینە. لەروویەکیترەوە ریشە ئایینیەکانی ناسیۆنالیزمیش دەردەخات ئەوە دەخاتەروو کەهەمیشە رەهەندێکی ناسیۆنالیزم لەگەڵ ئاین تەماهی دەکات بەڵکو زۆرجار میکانیزم و فۆرمیش لەئاین وەردەگرێت بەڵام لەبەرگی نوێ و بۆئامانجی نوی مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، دایك لەئاینەکان و کلتورە دینیەکاندا بەگشتی سەرچاوەیە بۆ ژیان و هێمای بەرائەت و میهرەبانییەو دنیایەکە لەسۆزو ئەوین و پاکێتی.

دایك رەمزی خۆشەویستیەکی بێمەرامە، وێکچواندنی نیشتمان بە دایك تاکتیکێکی ناسیۆنالیزمیشە بۆ بەکارهێنانی سەرجەم ئەو واتاو ئاماژەو هەست و هێمایانەی مرۆڤ لەپەیوەندی بەدایکییەوە هەستی پێ دەکات، تەوزیفکردنی ئەو غیرەتەیە مرۆڤ بەرامبەر دایکی هەستی پێ دەکات. لەگەڵ ئەو هەستەی کە پێی وایە دایك شایانی هەموو ناخ پێ بەخشین و قوربانی دان و چاکە لەگەڵ کردن و پادشات دانەوەیەکە. کاتێ ناسیۆنالیزم نیشتمان دەخاتە شوێنی دایك دەیەوێت هەموو ئەم چەمك و واتاوئاماژەنەش راستەوخۆو ناراستەوخۆ لەگەڵیدا بگوازرێتەوە، لەولاوە

تەوزیفکردنی رووە سلبیەکەی پەیوەندیەکەشە مەبەستمان لەرووە سلبیەکەش ئەوەیە کە نەبوونی دایك واتە بیٚنازی، کەساسی و هەست بەکەمی کردن، کەوتنە ژێردەستی ئەم و ئەو هەست نەکردن بە میهرەبانی و خۆشەویستی و ئامێزی گەرم. ناسیۆنالیزم بەلەپێشگرتنی ئەم میکانیزمە سایکۆلۆژیانە دەیەوێت بڵێت ئێمەبوون و ژیان و خۆشگوزەرانی و هەستکردن بەهێمنی و گەورەیی لەنیشتمانەوە وەردەگرین.

ئەوەی نیشتمانی نیە، بوون و ژیان و کەرامەت و سەربەرزی نیە، گەر سەیری ئەو ئەدەبەش بکەین کە بەهەناسەو دیدێکی ناسیۆنالیستانەوە یاخود لانیکەم بەکارلێکردن لەگەڵ جەبرەکانی ئەو واقیع و دنیایەی ناسیۆنالیزم (دەوڵەت — نەتەوە) دروستی کردووە بەرهەم هاتووە، دنیایەك ئاماژەی بۆ ئەو شتانە تێدایە کە باسمان کرد. رەنگە جوانترین قەسیدەکان کە شاعیران نوسیبێتیان ئەوانە بن کە لەسەردەمی بەهەمووشتکردنی دەوڵەتی نەتەوەو زۆریٚ لەبەهاکانی ناسیۆنالیزمدا لەژێر کاریگەری داگیرکردنی نیشتمانەکەیان وتبێتیان و نوسیبێتیان ئەو ویکچوواندن و مامەڵە رۆمانسیە لەگەڵ نیشتماندا، کە دواتر دەبێتە هەوێنی بەشیٚ لەپەروەردەی نیشتمانی بەسەیرکردنی ئەو واقیعەی کە ناسیۆنالیزم و بیرۆکەی نیشتمان و نەتەوەو دەوڵەتی هاوچەرخ و ئەوپەیوەندی و یاسا نێودەوڵەتیەش کە لە روانگەی ئەوەوە بەسەر جیهاندا حاکم بووە، ئەوماناو مامەڵەیە (مصداقیە)تێکی زۆری وەرگرتوە، چونکە ئەم چەمك و لێکدانەوەو مامەڵە دەروونی و سیاسی و کلتوریانە هەروا لەخۆڕا نەپەڕیونەتە ناو فەرهەنگی خەڵکەوە بەڵکو لەدایکبووی هەل و مەرجێکی سیاسی و نێونەتەوەیی و کلتوری دیاری کراون، بەتێرامان لەو گەلانەی نیشتمانەکەیان داگیرکراوە، یاخود دەوڵەتی خۆیان نییەو کەوتونەتە ژێر چنگاڵی داگیرکردن و

چەوساندنەوە، واتاکانی بوونی نیشتمانێکی ئازاد زیاتر درەوشاوەتەوە. بەسەرنجدان لەبیری سیاسی هاوچەرخ و واقیعە نێودەوڵەتیەکەش لەوە تێدەگەین کە چەمکی نیشتمان تاڕادەیەکی زۆر لە پەیوەندی لەگەڵ بوونی قەوارەی نەتەوەییدا ناوەرۆك پەیدا دەکات.

لەم چوارچێوەدا نیشتمان دەبێتە ئەو پارچە زەویەی کەگەل و نەتەوەیەکی دیاریکراوی لەسەر دەژی و پایەیەکی بوونی دەوڵەتەو دەسەڵاتێکی سیاسی مومارەسەی دەسەڵاتی لەسەر دەکات، بەواتایەکی‌تر چەمکی نیشتیمان لەپەیوەندیەکی جەدەلی و راستەوخۆدایە لەگەڵ چەمکی گەلداو، هەردووکیشیان لەپەیوەندیەکی ئۆرگانیدان لەگەڵ چەمکی دەسەڵات بۆپێکهێنانی قەوارەی دەوڵەت کە جارێکی‌تر هەموو ئەو چەمکانە پێناس و شوناس لەمەوە وەردەگرنەوە، چونکە نیشتمان لە روویەکی‌ترەوە وەزیفەیەکی سیاسی یاسایی تیکەڵاوی کاری دەبینێ کەئەویش بوون بەسەر چاوەیە بۆ سەرهەڵدانی چەمکی هاونیشتمانی.

هاونیشتمانێتیش چەمکێکی بواری زانستە سیاسییەکان و کایەی سیاسەتی هاوچەرخە، کەدەبێتە ژێرخانی سیستەمێکی دیاریکراوی مافپێدان و دیارکردنی شوناس و (انتیما)، بەواتایەکی‌تر نیشتمان تەنها ئەو سەرزەمین و چوارچێوەو شوێنە جوگرافییە نیە کە ئێمە کۆدەکاتەوەو لەپەلامارو دەستدرێژی دەرەکی دەمانپارێزێ، بەڵکو ئەوشوێنەشە کەهەستێکی هاوبەشمان لەنێواندا دروست دەکات و شوناسێکی دەستە جەمعیمان پێ دەبەخشێ و وەك تاکیش پێناسەی نوێمان پێ دەبەخشێت، لەدوای سەرهەڵدانی بیرۆکەی نیشتمان ئیتر هەموو ئەوانەی لەسەر ئەو خاکە دەژین لانی‌کەم لەرووی تیۆرییەوە یەك رێ و جێی سیاسی و یاساییان هەیە،

لەرووی ماف و ئەرکەکانەوە یەکسانن بەواتای مرۆڤ بەدەر لەئاین و خێڵ و تەنانەت زمان و ئەتنیك و بیروباوەڕی سیاسی، لەو روانگەوەکە ئینتیمای بۆ نیشتمان هەیە، هاونیشتمانیەو لەوێوە خاوەن ماف یەکسانە لەگەڵ سەرجەم هاونیشتمانیەکانیتری ناو سنوری دەوڵەت و سەر خاکی نیشتمان، کەدیارە لێرەدا رووی دووەمی (ئینتیما) بۆنیشتمان ئینتیمایە بۆ دەوڵەت.

هەر لەم میانەدا واتە لەگرێدانی چەمکی نیشتمان بەبوونی دەسەلاتی سیاسی و هاونیشتیمانی بوونەوە ئاوارەبوونیش دەبێتە دەرهاویشتەو رەنگدانەوەی بێنیشتمانی یاخود نیشتمان داگیرکراوی واتە هەر بەوجۆرەی گەر مرۆڤ دایکی نەبێت و نەزانرێ کێیە یاخود بزانرێ و لەدۆخێکی رسوایدا بژی هەست بە کەمی و سوکی و بچوکی دەکات، هەر بەوجۆرەش نەبوونی نیشتمان و داگیرکەرانی نیشتمان جگە لەوەی وەك (اغتصاب)کردنی دایك دەردەکەوێت، هەروەها دنیایەك هەستی بێبەشی و ستەملێچوویی و غوربەت لای مرۆڤ دەخولقێنێ. مرۆڤ لەسایەی سیستەمە هاوچەرخەکاندا هەر ئەوەندەی لەسنوری نیشتمانەکەی خۆی دەرچوو، هەستی بێگانە بوونی لاسەر هەڵدەدا، لەباشترین دۆخدا هەست دەکات جگە لەمیوانێ لەنیشتمانێکیتردا هیچیتر نیە، گەر بشیەوێ لەنیشتمانە نوێیەکەدا لە رێی ئینتیما بۆنیشتمان متمانەی پێ بدەن و بەهاونیشتمانی لەقەڵەمی بدەن، کەنیشتمان لەم فۆرمەدا بۆ مرۆڤی کۆچکردوو یاخود ئاوارە دەبێت بەمەنفاو تاراوگەو بەرگە رۆمانسی و هەناسە ئەفسانەیی و جادوو ئامێزانەکان و بۆن و بەرامەکانی نیشتمانی بنەڕەتی لەگەڵ خۆی هەڵناگرێ. نیشتمانی تازەئەوەندەی هەڵگری مانایەکی جوگرافی و سیاسی و یاساییە، بەو ئەندازە بەرجستەکەری گەشەیەکی نەتەوەیی و

سەرزەمینی خەونە مێژووییەکان نیە، ئەوەندەی وەزیفەی ڕێکخستنی پەیوەندی مرۆڤی تاراوگەیە بەدەزگایەکی سیاسی یاسایی رووتەوە ئەوەندە پرکردنەوەی ئەوبەشە لەپێداویستیە دەرونیەکانی نیە، کەپێویستی بەخۆراکی هێماو رەمزو ئاماژەکانە ئەوەندەی دەرککردنی مرۆڤ بەمانا سیاسی و یاسایی و فیزیکییەکەیە ئەوەندەی هەست بەرەگ و ڕیبەشکردن و خۆماڵی بوون و هەماهەنگی نیە بەمانا کلتوریەکەی، بۆیە مرۆڤی دورە نیشتمان زۆرجار دور لە نیشتمانی رەسەنی خۆی لەرووی رۆحی و سایکۆلۆژیەوە نابێ بەکوڕێکی شەرعی ئەم ماڵی دووەمە.

بەڵکو ئامادەبوونی دووەم لەهەندێ ساتدا زیاتر دەبێتە ئامادەبوونێکی فیزیکی، دەنا هەست بەغوربەت کردن و سۆزی گەڕانەوە بۆ سەرزەمینی یەکەمجار بەهێزی خۆیەوە بەردەوام دەبێت و ئاراستەی بەشێ لە قەوارەی رۆحی و عاتفی و دنیابینی و رەفتاری ئەم کائینە دەکات. بەم جۆرەش نیشتمان دەبێتە سەرزەمینێکی سروشتی هەست بەیەکانگیری و هارمۆنی کردن لەگەڵ ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا. دەگۆڕێ بەشوێنێ بۆنمایشکردنی بوون و رۆڵ بینین و لەناو مێژوودا ئامادەبوون، بێنیشتمانیش یاخود بوونی نیشتمانێ کەنەتوانێ ئەو شوێنەو سەنتەرەی لەنگەرگرتن و شوناس و ژیان واتای نەبوونی هەموو ئەو شتانەو زۆرشتیتریش دەگەیەنێت، یەکێ لەو شتانەش هەست بەبێ ئاڵایی کردن لای مرۆڤ پەیدا دەکات ئاڵاش جگە لەو دەورە رەمزییەی لەناوخۆدا دەیبینێ لەسەر ئاستی جیهانیشدا رۆڵێکی هێمایی گەلانی خاوەن دەوڵەتە، واتە هێمایە بۆ ئەندام بوون لەنەتەوە یەکگرتوەکان و کۆمەڵی نێودەوڵەتی و بوونی باڵیۆزخانەو کونسوڵ و

پەیوەندی لەگەڵ وڵاتان، کە هەموو ئەمانەش لە پەیوەندیدان لەگەڵ هاووڵاتی و مافەکانیدا.

گەر لەم واقیعەوە سەیر بکەین ئەوساکە هەست بەئاستی ترسناکیی ئەو بەربەست و هەڕەشەو دژوارییانە دەکەین، کە هەر لەسەرەتاوە یەخەی کورد دەگرن و ڕەنگە بتوانین بە گەڕانەوە بۆ ئەم ئاستانە لەشیکردنەوەو دەستنیشانکردن بتوانین بەشێ لەو نائومێدی و خۆخواردنەوەو ناکاراییەی ناسیۆنالیزمی کوردی لەساتەوەختی ئێستادا لێك بدەینەوە، وە تێبگەین بۆچی ئەم ناسیۆنالیزمە بەم جۆرەیە کەلێرەدا من بەناسیۆنالیزمی ئاسۆ سنوردار یاخود نائومێد ناوی دەبەم. قەدەری ئەم ناسیۆنالیزمە وابوو گەشەکردن و بەرەو پێشچوون و خۆنمایشکردن و بڵاوبوونەوەی بکەوێتە ناوزیندانی ئەوقەوارە مۆدێرنانەی کوردیان بەسەردا دابەش کرا، لەبەرەنجامی ئەوەش دەبێتە خاوەنی نیشتمانێکی دابەشکراو دابەشکردنەکەش دابەشکردنێکی یەکجار ئاڵۆز بوو، هەروەها قەدەری وابوو بکەوێتە ناوچەیکەوە کەلە قەیراناویترین ناوچەکانی جیهانە کەئەویش خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. هەر لەسەرەتاوە بکەوێتە بەردەم ستەمی مێژوو جوگرافیاو سیاسەت و جیهان.

هەرزوو دنیایەك کۆسپ و ڕێگری گەورەی بۆ بێتە پێش و ئەرکی جۆراوجۆر ڕووی تێ بکات کەهێشتا لەتوانای ئەودا نەبوو ئەو ئەرکانە هەڵبگرێت و ئەوکۆسپانە تەخت بکات و لەناو ئەو واقیعە مینرێژکراوە یەکجار ناهەموارەدا ڕێگایەك بۆ پەیوەندی مانەوە بەئایندەیەکی ڕوونەوە پەیدا بکات و بدۆزێتەوە ناسیۆنالیزمی کوردی دەبێ بەو ناسیۆنالیزمەی نکولی لەبوونی دەکرێت، شەڕکردنیش بۆبەدەستهێنانی ماف

بوون دواتر ئاسەواری قووڵ بەسەر تێکڕای بزوتنەوەکەوە بەجێ دێڵێ بەجۆرێك هەر دانپیانان و ماف و سەلماندنی گەرچی لەسەر ئاستی هەندێ ماف رۆشنبیری و ئیداری زۆر سادەش بێت، بەگەورەبزانێ، لە پەیوەندی بەجیهانی دەرەوەش هەموو ناوهێنانێکی کوردو کێشەکەی لەدەنگ و باسی رادیۆیەکی بیانیدا یاخود گۆشەی رۆژنامەیەك بەدەسکەوتێ بزانێ دڵی پێ خۆش بکات و بیکاتە کەرەسەیەکیتری ئیزاق بۆسازدانی جەماوەرو ئومێد نانەبەرو هەست بەبوونی خۆکردن!!

کورد لەناوچوارچێوە سیاسیە مۆدێرنەکاندا بەحوکمی یاساو لەرووی رەسمییەوە دەگۆڕێت بەگەلێکی بێنیشتمان.. بەڵکو وێنەی نیشتمان لەزهن و هۆشیاری مرۆڤی کورددا تووشی شێوان دێن و جۆرێ لەسەراسیمە بوون بۆ تاك و کۆمەڵگای کوردیش دروست دەکات، چونکە ئەو واقیعەی لەئارادابوو کە تائێستاش لەزۆربەی کوردستاندا لەئارادایە فشاری گەورەی دەخستە سەر ئەم مرۆڤە بۆ لەبیربردنەوەی یادەوەری و وێنەیەکی تایبەت بەنیشتمان بۆ ئەوەی وێنەیەکیتری جێگرەوە جێگای بگرێتەوە، ئەمەش لەئاکامدا بە پارچە پارچە بوونی هۆشیاری و رۆحی ناوەوەی تاکی کورد کۆتایی پێ دێت. واتە ئەم تاکە بەشێوەیەکی گشتی چی دی توانای (ترکیز)و خۆکۆکردنەوەیەکی رۆحی و هۆشیاری و خۆبینینی تەواوی نامێنێ و شێوەیەك لەشێوەکانی شپرزەیی رووی تێ دەکات.. شپرزییەك کە لەهەندێکاتدا توانای (خیار) لە ئەم و بزوتنەوە ناسیۆنالیستییەکەی دەستێنێتەوە، بەمەش لەپاڵ جەبرە سیاسی و جوگرافی و ئەمنیەکاندا جەبری فیکری و ئیدۆلۆژیش دەبێتەکۆت و بەندێکی نوێ و ناهێڵێ ناسیۆنالیزمی کوردی لەناوخۆدا بەرەو خۆکۆکردنەوە بچێت و ببێتە خاوەنی ستراتیژیەتیەکی ئیشکردن.

ستراتیژیەتێکی ئیشکردن، بەهەر دوو ئاراستەی ناوخۆو کارکردن لەسەر تاك و کۆمەڵگای کوردی و بەئاراستەی ناوەندە دژەکانی دەسەڵات لەو دەوڵەتانەی کوردیان بەسەردا دابەشکراوە..(طغیان)کردنی مارکسیزم وەك ئایدیاو جیهانبینیەکی بان نەتەوەیی لەقۆناغێکی مێژوویدا بەسەر پانتاییەکی زۆریبزوتنەوەی کوردایەتیدا روکارێکی ئەو شپرزەیی و ناتەواویەیە کەئاماژەمان پێکرد.

بەگوێرەی سەرەتاکانی ناسیۆنالیزمی کوردی، کوردستان نیشتمانی نەتەوایەتی کوردە. کەواتە بەگوێرەی ئەوەی ناسیۆنالیزمیش دەیخاتە رووهەر ئەو خاکەش شایستەی ئەوەیە قوربانی لەپێناودا بدات و (انتما)ی بۆ هەبێت و بەپیرۆزی بزانێت.

لەسەر ئەودا هەست بەژیان و کەرامەت و شکۆمەندی بکات، کوردستان ئەو سەر زەمینەیە کە لەرووی تیۆرییەوە دەبێت تەنها کوردستانیەکان بەسەریەوە فەرمانڕەوابن و هیچ نەتەوەیەکیتر دەستدرێژی نەکاتە سەری و بەسەریەوە فەرمانڕەوایی نەکات، بەڵام ئەم خەونانە بۆ کورد جگە لە تەزوویەکی راچڵەکێنەری رۆمانسیانەو وێناکردن لەسەر ئاستی بیرکردنەوە هی چیتری بەداوەوە نابێت و واقیع شتێکی تەواو جیاواز لەوەی پێکهێناوە.

چونکە بەحوکمی بوونی قەوارەگەلێکی هاوچەرخی سیاسی بەناوی عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا ئیتر خاکی ئەو وڵاتانە دەبنە نیشتمانی یاسایی و دیفاکتۆی کورد، مادام کورد سەرەنجام هاونیشتمانیەکی عێراقی تورکی و ئێرانی سوریە کەواتە لەرووی رەسمی و لەروانگەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی و کۆمەڵگای

نێودەوڵەتیشەوە شتێ نیە بەناوی کوردستان کە رۆڵی نیشتمان بەناوەرۆکە سیاسی و یاساییە سەردەمیەکەی بۆکوردو گەلی کوردستان بگێڕێ.

بەمەش کورد دووچاری خۆخواردنەوەو لێکدابڕانێکی گەورەی رۆحی و واقیعی دەبێت لە روویەکەوە لەدنیای خەیاڵ و فەنتازیادا کوردستان بەنیشتمانی خۆی دەزانێ و ئەو بیرکردنەوەو قەناعەتەش بەشێکە لەهەستکردن بەلانیکەمی کەرامەتی نەتەوەیی کەچی لەو لاوە دەبێت سەراپای قەڵەمڕەوی دەوڵەت بەنیشتمانی خۆی بزانێ ئەمە لەکاتێکدا مۆدێلی لەناسیۆنالیزم لەم قەوارانەدا باڵادەست بووە کە لەسەر بناغەی نیشتمانپەروەرێتی ئیش ناکات و ناجوڵێتەوە بەڵکو بە رۆحێکی نەتەوایەتی توندڕەوەو روانیویەتە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوەو جیاوازی و ئیدارەکردنی کۆمەڵگا لەم نێوەندەشدا کورد کەوتۆتە بەر هەڕەشەی تواندنەوەو نکوڵی لێکردن، واتە لەسەر بنچینەی (انتما)ی نەتەوەیی تاك رێ و شوێنی یاسایی بۆدیاریکراوە نەك (انتما)ی نیشتمانی.. لێرەشەوە تەلەزگە کەسەبارەت بەکورد ئەوەندەیتر سەختتر دەبێت ئەم سەختی و دژواریەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە دەبێت نکوڵی لە (انتما) بۆ کوردستان بکات وەك نیشتمانی نەتەوەیەکی جیاواز چونکە لەسایەی دەسەڵاتێکی سیاسیدا تەنها یەك نیشتمان هەیە کەیەك گەل لەسەری دەژی بەتایبەتیش لەسایەی دەسەڵاتێکی سیاسی وادا کە هەر لەبنەڕەتەوە لەسەر کوشتنی شوناسە جیاوازەکان و وەلانانی هەموو فۆرمێ بۆ یەکگرتنی ئارەزوومەندانە دامەزرابێت.

تاکی کورد لەسێبەری ئەم دۆخەدا ئەو هەندە مافەی پێشی رەوا دەبینرێ هەیەتی پەیوەستە بە لەبیرکردنەوەی ناوی کوردستانی نیشتمان و هەموو خەونێکی

سەربەخۆبوون تەنانەت جیاوازبوونیش لەچوارچێوەی هەمان قەوارە و رژێمیشدا واتە هەموو داکۆکی کردنێ لەسەرناوی کوردستان و پەیوەستکردنی ئەم ناوە بەلانیکەمی هەندێ مافی نەتەوەییەوە مرۆڤی کورد دووچاری سزاو راوەدونان و زیندان و ئەشکەنجە و بەنەفرەت کردن کردوە، مافی هاوولاتیەکی پلە دووی سادەشی لێسەندۆتەوە و بە بەکرێگیراو و یاخی و نۆکەرایەتی کردنی بێگانەش تاوانبار کراوە و خراوەتە بەردەم لێپێچینەوەی توندەوە بەڵکو تراژیدیایەکە لەوەش قوڵتر دەبێتەوە ئەویش بەوەی کە وازهێنان لەخەونی کوردستانی بوون بەمانا سیاسیەکەی و داننان بەو ئەمری واقیعەی دروست ببوو واتە قەوارە مۆدێرنەکان نابێتە هۆی ئەوەی تاکی کورد بگات بەمافی هاوولاتێتی یەکسان و بەهرەمەندبوون لەمافەکانی هاوولاتیەکی ئاسایی ولاتەکە چونکە هەروەك وتمان مەرجی گەیشتن بەسەرجەم مافەکانی هاوولاتی لەسایەی دەسەلاتێکدا کەلەدیدێکی بەرتەسکی نەتەوەپەرستانەوە دەڕوانێتە نیشتمانێ کەزیاتر لەنەتەوەیەکی لەسەر دەژی تەنها (انتما) نیە بۆنیشتمان و ئەو دام و دەزگا سیاسییەی لەسەری دامەزراوە، یاخود بۆدەوڵەت بەڵکو (انتما) بۆ نەتەوەی بالادەست دەبێتە بناغەی پێدانی لانیکەم و بەشێ لەمافەکان، کەواتە لەپاڵ نکوڵیکردن لە خەونی کوردستانی نیشتمان دەبوا تاکی کورد نکوڵی لە کوردبوونیش وەك هێما بۆزمان و نەژادێکی جیاواز بکردایە، بۆ ئەوەی لەو هەلاواردن و جیاکاریە رزگاری بێت کە بەرامبەری پەیڕەو دەکرێت[1]

---

[1] ئیسماعیل بێشکچی لەمبارەیەوە دەڵێ: زانست ئەرکی سەلمانی تورکبوونی کوردی خرایە سەرهەرچی دەوڵەتیشە راسپێرۆدرا ئەم مەسەلە بەو شێوە ببات سەبارەت بە (تێزی تورك لەمێژوودا/ سەردەم ژمارە (٥/١٩٩٩) لا ١٣٠ لەئێرانیشدا چەند هەوڵێکی لەمجۆرە هەبوو کە دەیانویست زمانی کوردی بکەن بەپەلێکی زمانی فارسی و لەنێو عەرەبەکانیش دیسانەوە شتی لەم جۆرە دەبینین.

لەوساتەوەختەشەوە کە لەبەر چەندەها هۆکاری بابەتی و ئایدیۆلۆژی کورد واز لە خەونی سەربەخۆیی دێنێ و ناسیۆنالیزمی کوردیش ئامانج و دروشمەکانی لەچورچێوەی گەیشتن بە هەندێ مافی دیاریکراو لەچوارچێوەی دەوڵەتەکاندا کورت دەکاتەوەو بەگشتی دروشمی ناوەندیی ئەو دەبێتە دیموکراسی بۆ ناوەندو خودموختاری بۆ کوردستان گرفتێکیتر بۆفۆرمەڵەبوون و شکڵ گرتنی ناسیۆنالیزمی کوردی دێتە پێشەوە کەتارادەیەکی بەرچاو دەیکات بەناسیۆنالیزمێکی (پەرێشان) و (قلق) مەبەست لەمەش ئەوەیە کە ئەگەر ناسیۆنالیزم بەشێوەیەکی بنەڕەتی کار لەسەر بیرۆکەی جیاوازبوون بکات بۆ خۆ پێناسەکردن و خۆنمایشکردن و بەشێکی گرنگ لە شوناسی نیشتمانی ئەویش لەرێی ئەم میکانیزمەوە پێکبێنێ ئەوا ناسیۆنالیزمی کوردی لەژێر جەبرەکانی واقیعدا تەسلیم بەزۆرێ لەبەرنجامەکانی پرۆسەی وەك یەك لێکردن و سڕینەوەی جیاوازییەکان دەبێت کەدەسەڵاتە ناسیۆنالیستە باڵادەستەکانی ناو دەوڵەت ئەنجامیانداوەو پیادەیان کردووە، گەرچی بەتەواویش واز لەپرسی جیاوازبوون ناهێنێ و پێداگری لەسەربوونی کوردەکان وەك بوونێکی جیاواز لە نەتەوەی زۆرینە یاخود دەسەڵاتدار دەکات، بەڵام جیاوازیەکان بۆ ئاستێکی یەکجار نزم دێنێتە خوارێ کە رەنگە جیاوازی لەئەم ئاستەداو ئەو ماف و داواکاریانەش کە لەسەر بناغەی ئەو دیاریدەکرێن و داوادەکرێن لەهەندێ رووەوە بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی لەبەشێکی گرنگ لەناوەرۆکەکەی خۆی بەتاڵ کاتەوەو نەتەوەش لەشێوەی (ئەتنیك) ێکدا تەرح بکات کەهێشتا خەسڵەتەکانی نەتەوەی تێدا نەهاتۆتە دی، چونکە گەر ناسیۆنالیزم لای تیۆریستێکی وەك گلێنەر پرەنسیپێکی سیاسی بێت و داوای درێژکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی کات بۆ

سنورەکانی کلتوری نەتەوەیی، ئەوکاتە هەر داواکارییەك مۆرکە سیاسیەکەی زاڵ نەبێت و داواکاری سیاسی نەبێت کەمتر دەچێتە ژێر چەتری داواکاریە ناسیۆنالیستییەکانەوە بەتایبەتیش لەژێر هەژموونی مۆدێرنەیەکی سیاسیدا کەلەسەدەی رابردوودا هەلومەرجێکی هێنابووە کایەوە ئەوبوونە جیاوازە نەتەوەییانەی رووپۆشی سیاسی سەربەخۆیان نەبوو بێت کەوتونەتە بەرفشاری جۆراوجۆرەوە بەمەبەستی وازهێنانی لەخەونی جیاوازبوون و قبوڵکردنی مەرجەکانی ئاوێزانبوونی زۆرە ملە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەك کە رەنگدانەوەی سێبەرەکانی عەقڵیەتێکی ناسیۆنالیستی پاوانخوازو هەمەلایەنەخوازو هەژمونخواز بێت.

هەموو ئەو شتانە تێکچوونێکی گەورە لە وێناکردنی نیشتمان لای مرۆڤی کورد، لانیکەم لای زۆرینەی کورد دروست دەکات، ئیتر نیشتمان کە چەمك و واقیعێکە بەتوندی بەچەمکی ناسیۆنالیزمەوە گرێدراوە، بەڵکو بێبوونی نیشتمان زەحمەتە بوونی ناسیۆنالیزم بێنینە پێش چاوی خۆمان دووچاری شێوان دێت. گەرچی لەرووی مێژوویی و ماددیەوە کوردستان وەك خاك، سەرزەمین، شوێن، بوونی فیزیکی هەیە کاتێ ئەم شوێن و خاکە دەگۆڕێ بەسەرزەمینێکی سیاسی و لەوێشەوە دەبێ بەنیشتمان دەبێت بەبەشێ لەنیشتمانێکی گشتیتری ناو سنورەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ و رازی بوونی کوردیش بەجەبرەکانی ئەو واقیعەو مامەڵکردنی (قطر)یانە لەگەڵ مەسەلەی نیشتمان و کوردستانی بوون و کوردایەتی لەلایەکەوەو وێناکردنی نیشتمانی گەورەی کوردان واتە کوردستانی مەزن لەلای مرۆڤی کورد کاڵ کردەوە یاخود کردی بە رەگەزێکی کپکراوو سڕکراوی ناوهۆشیاری و نەستی ئەم مرۆڤە، بۆیە دوای ئەم ساتەوەختە ئیتر مەبەست لەکوردستان لای

کوردی هەر پارچەیەك راستەوخۆو بەشێوەیەکی بنەڕەتی مەبەست لێی دەبێتە ئەو بەشە لە خاکی نەتەوەی کورد کەلەسنوری ئەو دەوڵەتەدایە، هەر ئەمەشە دواتر سەردەکێشێ بۆ لەقاڵبدانی چەمکی نەتەوە واتە لەو کاتەوە ئەو دابەشکرانە سیاسییە نوێیە دەبێتە دابەشکردنی حزب و تاکتیك و ستراتیژو گوتار لەنێو کورددا ئیتر چی دی مەبەست لەنەتەوەی کورد تێکڕای نەتەوەی کورد نامێنێ چونکە حزبەکان و ناسیۆنالیزمی کوردی لەهەر پارچەیەك وازدەهێنن لە (تبنی)کردنی گوتارێ کەسەراپای کەینونە کوردیەکە بەجیاوازی شوێن و باری سیاسییەوە بدوێنێ و ئاراستەی سەرجەم پێکهاتەکانی نەتەوە بکرێت، بەڵکو باسکردن لەکورد لەسەر ئاستی هەموو پارچەکان و نیشتمانە دابەشکراوەکەیدا تایبەت دەبێت بەهەندێ بۆنەو نووسینی مێژوویی و لاپەڕەی هەندێ کتێب و بڵاوکراوە، لێرەشەوە خەونی یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان و نەتەوەی کورد لەم پارچانەدا بۆ دوارۆژێکی نادیاری بێئاسۆ دوادەخرێ و تەنها مامەڵەیەکی ویژدانی و رۆمانسی لەگەڵدا دەکرێت، ئەم سەرەتاو واقیعەش واتە ئەوەی کە ئێمە ناتوانین یەکبکەوینەوەو لێکدابڕانمان بۆتە قەدەرێکی مێژوویی گەورەو جاویدانی، هەربەوە ناوەستێ کەبزوتنەوەی کوردایەتی بەرەو چوارچێوەی پارچەکانی پاشەکشە پێ بکات، بەڵکو بەتێپەڕینی رۆژگار گەشەکردنی شارستانی و رۆشنبیری و نەتەوەیی لەهەریەك لەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدا دەژی و هەر پارچەیەك لەپارچەکانی کوردستان، رەنگدانەوەی خراپ بەسەر ناسیۆنالیزمی کوردیەوە بەجێ دێڵێ رووداو و پەرەسەندنەکان رۆڵی هاتنەناوەوەی ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکان و ئەولۆژیك و پێوەرە سیاسیانەی ئیشیان پێکراوە لەگەڵ (غائب)بوونی دیدێکی ستراتیژی بۆ دوارۆژی

بزوتنەوەکەو کێشەکانی کورد کاریگەریان کرد کە باڵەکانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردی لەسەر بناغەی ئەو دابەشبوونە بکەونە ناو ناکۆکیەکی قوڵ لەگەڵ یەکتردا. هەر لەسایەی ئەم ناکۆییەشدا خودی دابەشکردنە ئیتسیعماریەکە بۆکوردستان کراوەتە پاساوی دژایەتی کردنی هێزەکان بۆیەکترو خۆجیاکردنەوەیان لەیەکدی.. و بێدەنگ بوون لەسەر مەینەتیەکانی یەکتر بۆ دەستخستنی پشتیوانی و دەستکەوتێکی کاتی رژێمەکان واتە مەسەلەکە هەر بەوەوە ناوەستێ ناسیۆنالیزمی کوردی واز لە خەونەکانی بێنێ لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەدا، بەڵکو دەشبێتە بەشێ لەو گەمە قێزەونەی نێوان ئەم دەوڵەتانەو وەك کارتێکی گوشار لەسەر شانۆی سیاسی ناوچەکەدا مەترەح دەبێت، کە دیارە ئەمەش بەرەو هەڵدێران چوونێکی ترسناکە چونکە ناسیۆنالیزمی کوردی گەرواداینێین ناچاریش بوایە واز لەگوتارێکی یەکگرتووی کوردی بێنێ لەسەر ئاستی پارچەکاندا نەدەبوو واز لەسەرەتای یەکتری تەواوکردنی باڵ و هێزەکانی پارچەکان لەناو یەکتر بێنێ، خۆئەگەر لەم ئاستەشدا شکستی بخواردایە، لانیکەم دەبوایە پەیوەندییە کوردی ـ کوردییەکان لەناوخۆدا مۆرکی دژایەتیکردن و نەفیکردنی یەکتر و سازش کردن بەسەریەکەوە وەرنەگرێت، دیارە گەر سەیری مێژووی سەرهەڵدانی حزبی کوردیی بکەین لە فۆرمە هاوچەرخەکەیدا دەبینین هەر لە چلەکان بەدواوە ئەم مۆدێلە لەخۆرێکخستنی سیاسی، گەرچی لەسەر ئاستی پارچەکاندا دەتوانێ ئیش لەسەر بوژاندنەوەی هەستی ناسیۆنالیستانە بکات و بێتە ئامرازێکی خەبات و بەرەنگاری و رێکخستن و هۆشیارکردنەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆتە ئامرازێکی روخان و تێکدانی پەیوەندییەکان و بەسەرخۆدا داخران و قەبەکردنی باری تایبەتی هەر پارچەیەك

لەسەر حیسابی پەیوەست بوونێکی رۆحی و ویژدانی بە مەسەلە گەورەو چارەنووسسازەکە و سەبارەت بەکورد وەك نەتەوەیەکی گەورەو سەربەخۆی خۆرهەلاتی ناوەراست.

دواتر و لە قۆناغێکیتردا ئەم پاشەکشەکردنەی گیانی هاوکاری و هاریکاری و یەکترکێش کردنە ناوخۆییەی باسمان کرد، دادەبەزێ بۆئاستی هێزەکانی بزوەتنەوە ناسیۆنالیستیەکە لەپارچەیەکی دیاریکراویشدا پەیوەندی نێوان حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و پەکەکە و هێزەکانیتری کوردستانی تورکیا و پارتی و یەکێتی لەساڵانی رابردوودا هەرهەمووی بەڵگەن لەسەر لاوازی توانا کۆکەرەوەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لەناوخۆدا جگە لە شێوەی دابەشکردنی کوردستان و دانپیانەنانی وەك کۆلۆنیالیەکی نێودەوڵەتی لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە لەلایەکیترەوە هێزە کوردیە (هەرێمیەکان) بەرەسمی باسی داگیرکردنی کوردستان ناهێننە گۆرێ، گرفتی گەورەش لەم نێوەندەدا لەوەدا بوو کەیاسای گشتی نێودەوڵەتی و نیزامی دەولی کوردستان بەسەر زەویەکی داگیرکراو ناناسێ بەوسیفەتەی هەر لەسەرەتای دروستبوونی قەوارە مۆدێرنەکانی ناوچەکەوە پارچەکانی کوردستان دەبن بەبەشێ لەم دەوڵەتانە نەك دواتر بەشەڕو داگیرکردن بخرێنە سەریان ئەمەش لای خۆیەوە مەسەلەی سەلماندنی بوونی داگیرکردن بەکۆمەڵێ گرفتی جۆراوجۆر بارگاوی دەکات.

ئەم حاڵەش دژواری و سەراسیمەبونێکی گەورە دەخولقێنێ و دیدرۆشنی و بەرچاوروونی و داکۆکی کردن و جورئەت و یەکلابوونەوەش تارادەیەکی بەرچاو لەناسیۆنالیزمی کوردی زەوت دەکات ئەویش لەو سۆنگەوە، کە ئەم ناسیۆنالیزمە

باس لە رزگارکردنی خاکێ دەکات کە داگیرکراو نییە، کاتێ مەسەلەی داگیرکردنیش لەنێودا نامێنێ چەمکی (رزگاری نیشتمانی)ش بەشێکی زۆر لە ماناکانی ون دەکات ناسیۆنالیزمیش میکانیزم و کەرەسەیەکی گرنگ لەدەستدەدا کە بۆ شکڵێ بەخۆدان و بڵاوکردنەوەی پێوەرو بەهاکانی پێویستی پێیەتی لەم دۆخەدا مانای رزگاری لە فەرهەنگی ناسیۆنالیزمی کوردیدا لەگەڵ ماناکەی لەفەرهەنگی زۆربەی ناسیۆنالیزمەکانی‌تری دنیا جیادەبێتەوە، لای کورد رزگاربوون یەکسان نابێ بەدەرپەڕاندنی هێزێکی داگیرکەر لەنیشتمان و پێکەوەنانی قەوارەی سەربەخۆو تایبەت بەخۆ دروستکردنی پەیوەندیەکی نوێ نییە کەسەرچاوەیەکی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی بێ و شەرعیەت لەوێوە وەربگرێت نەك یاسا ناوخۆییەکان، بەڵکو مەبەست لە رزگاربوون بەشێوەیەکی گشتی دەبێت بەکەمکردنەوە لە وەحشیگەرێتی دەوڵەت و سنوردانان بۆ چەوساندنەوەیەکی بێ‌بەزەییانە و ژیان لەسایەی ئاشتی و هێمنی‌یەکی رێژەیی لەپاڵ بەکارهێنانی زمانی کوردی و گەشەدان بەفۆلکلۆری کوردی و بەشداریکردن لەهەندێ دام و دەزگای حکومی‌یەکان و پێکهێنانی هەندێ دام و دەزگای ناوخۆیی لەکوردستاندا.

هەموو ئەم داوکاری و ئامانجەش لەحاڵەتی بەدیهاتنیشیاندا تەنها ئەوەیە کورد لەتواندنەوەی فیزیکی و مەسخبوونی یەکجارەکی و نکوڵی لێکردن و رەشەکوژی و بەجەهەننەم کردنی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵگا، رزگار دەکەن دەنا هەرگیز ئەوە نین بەمانا ناسیۆنالیزمەکە ناوی رزگاریان لێی بنێی یاخود بەشایستەی ئاکامی خەباتێکی خوێناوی و دورودرێژی بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی دابنرێت.

گەرگەشەکردنی ناسیۆنالیزم بەگشتی تێکەڵ بەرفەمەنگی خوێن و جەنگ بێت چونکە تارادەیەکی زۆر لەسەر دروستکردنی وێنەی دوژمنێکی نیمچە بەردەوام ئیشی کردووە بۆ تۆخکردنەوەی خەسڵەت و جیاوازییەکانی خۆی و بەرەو پێشبردنی پرۆسەی وەك یەك لێکردنی نەتەوەیی و پاراستنی یەکیەتی ریزەکانی ناوخۆ، ئەوا ناسیۆنالیزمی کوردیش بەهۆی چەندەها هۆکاری بابەتی و لەوانەش سروشتی ژیۆسیاسی کوردستان و نەبوونی پەراوێزێ لە دیموکراسی لەو وڵاتانەی بەسەریاندا دابەشکراوە، هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ چەکدا بەناویەکدا چوون، دیارە کورد هەر لەمێژەوە چەکداربووە گەر زۆر نەڕۆینە قووڵایی مێژووشەوەو تەنها لەساتەوەختی هاتنی ئیسلامەوە بڕوانینە مەسەلەکە کورد وەك مسوڵمان و بابانی و ئەردەڵانی و عوسمانی و سەفەوی و خێڵ بەردەوام چەکی پێ بوە، بەڵام چەکی ناسیۆنالیستی مۆدێلێکی تازەی چەك هەڵگرتنە، چونکە چەکی ناسیۆنالیزم وەزیفەکەی تەنها لەشەڕکردن یاخود پارێزگاری لەخۆکردن و سەرکوتکردنی دەستدرێژیکار و دوژمندا کورت ناکرێتەوە، بەڵکو بەو ئەندازەی بیرکردنەوە و هەستێکی ناسیونالیستانەی لەپشتەوە ئامادە بێت چەکی ناسیۆنالیزم تەفسیرکردنەوەیەکی نوێی مردن و شکۆمەندی و پیرۆزی و قوربانیدانە لەژیانی مرۆڤدا، گەر چەك بەردەوام لە قۆناغە جۆراو جۆرەکانی مێژوودا و لای گروپە مۆفایەتیە جۆراوجۆرەکان پەیوەست بوبێت بەجۆرێ لە تێگەیشتنی مرۆڤ لە مردن و هێمادان بەو مردنە، ئەوا لە قۆناغی ناسیۆنالیزمیشدا بەهەمان شێوەیەو وێنایەکیتر بۆ گیانبەخشین و مردن لای مرۆڤ دروست دەکات. گرێدراوە بە وەڵامی ئەو پرسیارەی بۆ بمرین و لەپێناو چیدا بمرین؟ ناسیۆنالیزم بەحوکمی ئەو رەهەندە رۆحی و رۆمانسیەی کە هەر لە بنچینەوە

هەیەتی و کاری لەسەر دەکات، زۆر مەبەستیەتی مردن بەکۆمەڵێ ماناو ئاماژەو رازو ئەفسونی تایبەت بەخۆی بارگاوی بکات، چونکە هەر گۆڕانێ لە مانای مردن و سروتەکانی مەرگ و بەخشینی گیان راستەوخۆ لە پەیوەندیدایە لەگەڵ گۆڕان لەئاراستەکانی ژیان وچۆنیەتی گوزەراندن و بەسەر بردنی واتە تێگەیشتن لەمردن رووی دووەمی تێگەیشتنە لە ژیان، وەك لەوێشەوە ئاماژەمان پێکردن چەکی نیشتمان و دامەزراندنی سوپا نیشتمانیەکان و پرۆسەی سەربازیگری میکانیزمێکی دەستی ناسیۆنالیزم بووە بۆگشتی کردنی بەهاکانی و تۆخکردنەوەی وێنەکانی و گۆڕینی پێوەرەکان و دارشتنەوەی پەیوەندیەکان و (انتما)ی تاك و کۆمەڵگا.

دیارە ئەم میکانیزمە لەبەرگە رەسمییە دەوڵەتیەکەیدا سەبارەت بە ناسیۆنالیزمی کوردی کاریگەری پێچەوانەی هەبووەو بەئاراستەی دژە ناسیۆنالیزمی کوردی کاری کردووە. چونکە سوپای دەوڵەت سوپای کوردی نەبووە، بەڵکو زۆرجار سوپای سەرکوتکردنی خەڵکی کورد بووە، بەشداری کورد لەو سوپایەدازیاتر لەوەی هیچ پاڵنەرێکی هەست بەشانازیکردن و ئەنجامدانی ئەرکێکی لەپشتەوە بووبێت، کارێکی زۆرەملێ بووە هەر بۆیە فەزای ناوەوەی ئەم سوپایەو ئامانج و دام و دەزگاکانی ئەوشتانە بوون کەتاکی کوردیان ناچارکردووە لەزۆر کاتدا دژی خواست و هیواو ئەو (مثل)انەی بڕوای پێیەتی بجوڵێتەوە.. کورد لەباتی ئەم سوپایە شۆڕش و راپەڕینەکانی هەبووە، شۆڕش و راپەڕینە چەکدارەیە کوردیەکان ئەم فۆرم و چوارچێوانە بوون کە ئاراستەیەکی نوێیانداوە بەچەکی کوردی و لانیکەم لەئاستێکدا جۆرێك بووە لەتێکەڵکردن و هاوکاری کە ئەگەر بەرواڵەتیش بووبێت فۆرمی خێڵی

تێپەڕاندوە، بەڵام هەرگیز ئەم شۆڕش و راپەڕینانە نەیانتوانیوە شوێنی سوپایەکی هاوچەرخ بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی بگرنەوە.

ئەمیش لەبەر چەندین هۆ لەوانەش: ئەم راپەڕین و شۆڕشانە هەندێ جار ناوچەیی بوون، خۆ ئەگەر لەهەندێ قۆناغدا مۆرکێکی نیشتمانی و نەتەوەییشی لەسەر ئاستی پارچەیەکی کوردستاندا بەخۆوەگرتبێت، تەنها بەشێ لەرۆڵەکانی نەتەوەی تێدا بەشداربووە، بەهۆی باری تایبەتی شۆڕش و (متواضع)بوونی دەزگای فیکری و رێکخستنە تەکنیکیەکەیەوە نەتوانراوە فەزای ناوەوەی شۆڕش بکرێتەوە.

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانە گومان لەوەدا نییە کە چەمکی ناسیۆنالیزمی کوردی رۆڵی خۆی هەبووە لەدروستکردنی هەستی جیاوازبوون و وروژاندنی هەست و نەستی میللی و لەئاستێکیشدا بەگشتیکردنی دروشم و خواستە ناسیۆنالیستیەکان لەناو کۆمەڵگادا. مەسەلەی رێژەیەکی زۆری نەخوێندەواریش لەناو کورددا بۆتە هۆی ئەوەی (چەك) وەزیفەیەکی نەتەوەیی گەورەتری بکەوێتە ئەستۆ چونکە لەحاڵێکدا کەخەڵك دووربێ لەناوەندەکانی خوێندن و فێرکردن و میدیا، بەتایبەتیش رۆژنامە ئەو کاتە موعاناتی رۆژانە لەگەڵ چەکی شۆڕش لەناو ریزەکانی هێزی پێشمەرگەدا هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ دروستکردنی سۆزی نەتەوەیی و وەرگرتنی لانیکەمی ئەو بەهاو دروشم و پێوەرانەی بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی هەڵگریەتی و پێویستی پێیەتی جگە لە مە چەکی کوردی لەهەندێ قۆناغدا بۆتە هێمای ریزی جیاوازی نیشتمانی و گوزارشت بووە لە یاخی بوونی کورد لە بەرامبەر پرۆسەی ملپێکەچکردن و لەقاڵبدان و (تعریب و تتریك و تفریس) و تواندنەوەی لە رێی دەزگاو میکانزیمەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ و ئەو دەزگاو میکانیزمە مۆدێرنانەی کە گەر لەناو

نەتەوەیەکی خاوەن قەوارەدا ئامرازی ناسیۆنالیزم بن بۆ باڵادەستبوون و جێگیربوون سەبارەت بەکورد لەزۆربەی کاتدا هۆیەك بوون بۆ کوشتنی هەموو هەست و بیرکردنەوەیەکی ناسیۆنالیستانە لە هۆش و دڵ و دەروونی مرۆڤی کوردا لەناو ئەو دەوڵەتانەی کوردیان بەسەردا دابەشکراوە بەشێوەیەکی گشتی و لەسەراپای سەدەی بیستەمدا قوتابخانەو زانکۆو دەزگاکانی لێکۆڵینەوەو سوپاو پۆلیس و ئاسایش و دادگاو تەنانەت هەندێ دام و دەزگای بەرواڵەت دیموکراسی وەکو پەرلەمان و سەندیکاو یەکێتییە پیشەیی و جەماوەرییەکان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش لەچوارچێوەی هەل و مەرجێکدا کەتاکڕەوی و سەرەڕۆیی سیاسی و ناسیۆنالیزمێکی توندڕەوی دواکەوتوو فەرمانڕەوا بووە، گۆڕاون بە ئامرازگەلێك بۆ نکوڵی کردن لە جیاوازییە سروشتیەکان و وەك یەك لێکردنێکی ساختەو زۆرەملێیانەو تەزویرکردنی ئیرادەی گشتی کورد لە قوتابخانەدا جگە لەوەی لەزۆربەی کاتدا زمانێکیتر بەسەر منداڵەکانیدا سەپێنراوە بۆخوێندن هەروەها قەدەغەش بووە باسی مێژووی نەتەوەکەی وە جوگرافیای نیشتمانە رەسەنەکەی خۆی بخوێنێ، بەڵکو مێژووی نەتەوەو ناسیۆنالیزمی باڵادەستی ناو دەوڵەت بەزۆرکراوە بەمێژووی ئەمیش.

ئەمەش وای کردوە بەدەستهێنانی هەر پلەوپایەکی کۆمەڵایەتی و ئیداری پەیوەست بووە بەپەراوێزخستنی زمانی کوردی و زاڵکردنی زمانی رەسمی لەزۆربەی پانتایی ژیانی تاکەکەسی و دام و دەزگا هاوچەرخەکاندا، ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەش ویستویانە بیسەلمێنن کەزمان و فەرهەنگی کوردی هیچ رەگ و ریشەیەکی مێژوویی

سەربەخۆی وای نییە ببیّ بەبناغەی نەتەوایەتیەکی جیاوازو سەربەخۆ[1] دادگاش یاسایەکی پیادەکردووە کە کوردبوون لە بەرگە سیاسی و ئامادەییە کلتوری و واقیعییەکەدابی بەتاوان لەقەڵەمداوە، هەر ئەم دادگایانەش بووە سەدام هەزاران مرۆڤ و تێکۆشەری کوردیان رەوانەی زیندانەکان کردووە وەك ئامرازێکیتری کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات لەدەوڵەتی نوێدا وەزیفەیەکی خراپیان ئەنجامداوە.

چەکی کوردی بەدرێژایی دەیانساڵ لەشۆڕش و بەرەنگاری و دەست و پەنجە نەمرەکانی مرۆڤی کورد لەگەڵ سەنگەرو خوێن و دژواریەکانی خەباتی چەکداریدا، کاری کردۆتە سەر یادەوەری کوردی واتە یادەوەری وردە وردە بەشێکی لەسەر بناغەی کوردبوون بە مانا ناسیۆنالیستەکەیدا دارێژراوە و پێکهاتوە ئازار و مەینەتیەکانی سایەی بۆمباران و سوتانی گوند و رەز و باخ و دەردەسەریەکانی ئاوارەبوون و بێبەشبوون لە سەرەتاییترین مافە ئینسانیەکان و سزای بەکۆمەڵ و چەندین شتیتر، چوونەتە ناوپانتایی سۆزو هەست و بیرکردنەوەی تاکی کوردو یادەوەری دەستەجەمعیەوە، هەر لەم میانەشدا چەمکی شەهید بەناوەرۆکە نەتەوەییەکەوە دەردەکەوێت و دێتەناو فەرهەنگی رۆژانەی خەڵك و ئەدەبیاتی کوردایەتیەوە بەڵام چەکی کوردی تەنها یەك رووی نەبووە، هەروەها تەنها وەزیفەیەکی ئیجابیشی جێبەجێ نەکردووە بەڵکو بەرووە سەلبیەکەشیدا رۆڵی خراپی لەشێواندنی ناوەرۆکی چەمکی ناسیۆنالیزم و سیمای کوردایەتیدا گێڕاوە، چەکی کوردیی دوای ئەوەی تێکەڵ بەگەمەی ئادیۆلۆژیاو پاشماوەکانی کارتێکردنی خێڵ و سیاسەتی ناکۆکی هەرێمایەتی دەبێت و واتاکەی بچوك دەبێتەوە بۆچەکی

[1] لە (سەدەی ناسیونالیزم) کەیدا رەمەند ژمارە (٩ ـ ١٠/٢٠٠٠).

حزب ئەوکاتە نەك هەر بەشێ لەو رەونەق و جادووە لەدەستدەدا کە لەگەڵ دەنگدانەوەی ناوی پێشمەرگەدا ویژدانی کوردیدا تێکەڵ ببوو، بەڵکو بەتێپەڕینی رۆژگارو درێژبوونەوەی باری بارکەوتوویی کوردو هەڵنەهاتنی خۆری ئازادی نەتەوەیی، دەبێتە ئامرازێکی تێکشکاندنی بەشێکی بەرچاو لەو وێنەو رەمزو بەهایانەی کەهەموو ناسیۆنالیزمێك بۆ مانەوەو بەردەوامبوون و خۆنمایشکردنی خۆی پێویستی پێیەتی. چەکی کوردیی لەناو حزب و دەزگاکانی کوردایەتیدا پەنتاییەکی هێندەفراوان داگیر دەکات کەسەرەنجام نەزعەیەکی عەسکەرتاریەتی ترسناك لەو نێوەندەدا زاڵ و باڵادەست دەکات و کاردەکاتە سەرپووکانەوەی روە فیکریەکەی ناسیۆنالیزمیش کەوا چاوەڕوان دەکرا ئەرکی دارشتنەوەی کەسێتی کوردی و ئاراستەکردنی شۆڕش و جوڵانەوە سیاسیەکەی لەئەستۆ بگرتایە، بەهۆی (غائب)بوونی ئەم باکگراوەند و ستراتیژییە ـ فکرییەی شۆڕش و مامەڵەکردن لەگەڵ تاکی کورد لەسەر ئاستی وروژاندنی (احساسات) و سۆزو غەریزە کە زۆرجار خودی چەمك و بەهاو نەزعە خێڵەکیەکە بۆ سازدانی پێشمەرگە بەکارهاتووە.. بەدرێژایی دەیان ساڵ ویژدانی بەشێکی بەرچاوی کۆمەڵگا دووچاری دارزان دەکات، کاتێکیش چەکداربوون دەبێ بەجۆرێ لەخولیا یاخود هۆکارێکی خۆپاراستن و لەگەڵ بارودۆخەدا خوگونجاندن ئەوکاتە بۆدەیان هەزار کورد ئاسایی دەبێت کەهەتا دوێنێ چەکی شۆڕیان لەشاندا بووە چەکی دژە شۆڕو جاشایەتی بکەنە شان وهەست بەهیچ سزایەکی ویژدانی واش نەکەن هەڵوێستیان پێ بگرێت.

ئەم (مطاطي)بوونەش هەستی بەخۆداچوونەوە لای مرۆڤی کورد ناهێڵێ بەخۆداچوونەوەیەك کە مرۆڤ بخاتە بەردەم دووڕیانێکی چارەنووسساز و

یەکلاکەرەوە کە هەڵبژاردنی ڕێگایەك لە ڕێگاکان ببێتە هۆی پێدانی شوناسێکی جیاوازو پێگەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو لەناو کۆمەڵگەدا، لێرەوە ئەو هویلامی بوونە لەناوەرۆکی چەکی کوردیدا هەروەك (بەختیار عەلی)یش ئاماژەی پێ دەکات دەست پێدەکات و لەهەندێ کاتیشدا هێڵەکانی نێوان خیانەت و دڵسۆزی بۆئاستێکی ترسناك دەپوکێنێتەوە[1] ئەو کەرتبوونەش کەلەناوەراستی شەستەکانەوە تووشی شۆڕش دێت بووە ژەهرێکی درێژخایەن و تائێستاش لەجەستەی بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکەدا کاری خۆی دەکات و دێت و دەچێت بەڵکو سنوری بزوتنەوەکەی بەزاندووە بۆفەزای گشتی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا، کەدوایەمین عەقڵەکانی ئەم تراژیدیاو گەمە ترسناکە جەولەکانی شەڕی ناوخۆبوون لەنێوان پارتی و یەکیەتی و هەندێ هێزیتردا لە هەرێمی کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا، کەزەبرێکی گەورەی لەبنەماکانی کوردایەتی و کۆی ئەو ڕەمزو هێماو میکانیزم و وێنە بەهایانەدا کە بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بێ ئەوان ناتوانێ ئەرکەکانی بەئەنجام بگەیەنێت.

[1] مەبەست کەرتبوونەکەی ساڵی (١٩٦٤)و ئەو بەرنجامانەیە بەدوایدا هات و دروستبوونی یەکێتی نیشتمانی و هەڵسەنگاندن و هەڵوێستەکانی پارتی و یەکیەتیە هەر لەسەرەتای ئەوەی پێی دەوترێت زەمەنی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان.

### لەشێواندنی وێنەکانەوە تا تێکشکاندنی ڕەمزەکان

ئێمە لەو چەند ساڵەی شەڕی ناوخۆ لە هەرێمی کوردستاندا شایەتی دابەش‌بوونێکی ترسناکی ڕەمزو سەرمایە ڕەمزی و بەهاکان بووین، شایەنی گواستنەوە لەهاوشێوەیەکی ڕێژییەوە بووین، بۆدابەشکردنی هەموو شتێ کەرتبوونی ماددی خاکی نیشتمان، دەبێتە ژێرخانی جیاکردنەوەو دابەشکردنی نفوز و دەسەڵات و ئیدارەو مێژوو هێماکان و دوبارە شوناس دانەوە بەو پیرۆزیانەی لەپێشەوە شوناسیان پێدرابوو. لێرەدا بەکورتی لەسەر شێواندنی وێنەی نیشتمان نەتەوە، دوژمن، تێکشکاندنی زۆرێ لە ڕەمزە نەتەوەییەکان دەوەستین کە وەك دەزانین ئەم چەمك و وێنانە ئەوشتانەن کەناسیۆنالیزم لەمێژووی خۆیدا کاری لەسەر کردوون و بوونەتە سەرچاوەی زۆرێ لەبەهاکانی و پێکهێنەری گوتارەکەی و کەرەسەی داڕشتنەوەی هۆشیاری و میکانیزمی پیادەکردنی ستراتیژەکانی.

لەژێر سایەی میرنشینە حزبیەکان و حاکمیەتی دەڤەر و نفوزی تاك حزبی و هەژمونی هەمەلایەنەی ئەوداو دابەشکردنی ئیداری و سیاسی و یاسایی هەرێم و جیاکردنەوەی سنورەکان و سەنگەر لەیەکگرتن لەسەر بناغەی بوونی ئەو سنوورە ناوخۆییانە وێنەی نیشتمان و نەتەوە گۆڕانی ترسناکیان بەسەردا دێت، کوردستان و هەرێمی کوردستان چ جای وێنای کوردستانی مەزن لەسەر زەوی واقیعدا دەگۆڕێن، بەقەڵەمڕەوو پانتایی دەڤەرە حزبیەکان، واتە هەرێمی کوردستان وەك خاکێکی تەرحکراو بۆ بەنیشتمان بوون نابێتە ئەو نیشتمانەی بێتە بنچینەی سەرهەڵدانی

چەمکی هاوولاتی، کەدیارە ئەم چەمکە ئاسان نییە لەسایەی هەلومەرجی خۆرێکخستنی سیاسی و ئەخلاقیی و ئیداری دەڤەری حزبیدا بخەملێت و ناوەرۆك پەیدا بکات.

گەر وێنەی نیشتمان لەبنەڕەتەوە لەچوارچێوەی قەوارەی دەولەتی نەتەوەدا مانا راستەقینەکانی خۆی پەیدا کردبێت، ئەوا هەر بەو جۆرەی لەبەشێکی ئەم وتارەدا ئاماژەمان پێکرد لەچەرخی ناسیۆنالیزم و دروستبونی دەولەتی پۆست کۆلۆنیالیزم لەم ناوچەی جیهانەدا کە کوردی تێدا دەژی، کورد نابێتە خاوەن قەوارەی سەربەخۆی خۆی تەنانەت لەدەرەوەی خەونی سەربەخۆیشداو لەچوارچێوەی یەکپارچەیی ئەو قەوارانەشدا کەکوردیان بەسەردا دابەشکراوە شەراکەتێکی مام ناوەندیش لەناوەڕۆك دان بەنیشتمانێکی هاوبەش واتە ناسیۆنالیزمی لەسەر بناغەی هاوبەشی لەنیشتماندا دابڕێژرێت بەکورد رەوا نابینرێت.

گەر بزاڤی ناسیۆنالیزمی کوردی و گوتارەکەی لەوەدا سەرکەوتوو نەبووبێت کەکوردستان وەك کۆلۆنیالیەك و خاکێکی داگیرکراو بناسێنێ و نەتەوە لەسەر پرۆژەیەك بۆ تێکشکاندنی داگیرکردن کۆبکاتەوە و جۆشدات کەش وەهوا نێودەولەتیەکەش یارمەتی ئەوەی نەدابێ، ئەوا ئەم گوتارەوواقیعە مادەیەکە هەمیشە هۆشیاری تاکی کوردیان تووشی لێکدابڕان و جۆرێ لەدژواری و ناکۆکی بەسوێ کردوە، ناسیۆنالیزمی کوردیی لەرووی تیۆری و جۆشدان و بزواندنی ئیحساساتی ناسیونالیستانەوە کوردستانی وەك نیشتمانێ بۆتاکی کورد تەرح کردووە و داوای لێکردووە لەرووی (ولاء) و (انتما)ەوە لەگەڵ ئەم نیشتمانەدا

لەپەیوەندیدا بێت، بەڵام هەروەك باسمان کرد لەرووی عەمەلیەوە هەمیشە مرۆڤی کورد هاووڵاتیەکی نەك ئاسایی بەڵکو پلە دووی عێراقی و تورکی و ئێرانی سوری بووە، راستە ئەم راستییە مێژووییە لە روویەکیترەوە بەرهەمی جەبری سیاسی ئەو یاسای نێودەوڵەتیەیە کەدەوڵەت کەسێتی بنچینەیەتی و لەدەرەوەی قەوارەی دەوڵەتەوە ئامادە نییە پێگەیەکی یاسایی وادانپیابنێت، بەڵام ئەوە کارتی پێ خەتایی ناداتەوە دەست بزاڤە ناسیۆنالیستەکەو لەلاوازی و ناکۆکیە ناوخۆییەکانی ببورێت، ئەوەتا دەبینین لەساتەوەختێکی مێژوویی دیاریکراوو بەهۆیبارودۆخی چاوەڕوانکردووی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی بزاڤی ناسیۆنالیستیەکە پانتاییەکی خود بەڕێوەبەری دەست دەکەوێت بۆ خۆنمایشکردن و ناڕەزایی دەربڕین لەواقیعە مێژووییەکەو ئەزموونکردنی تواناو سەلیقەکانی و واتا بەخشین بەبوونی سیاسیانەی کورد، با زۆر بەرێژەیش بێت، کە ئەمە لێرەدا مەبەست لەناوچە رزگارکراوەکانی ژێردەستی شۆڕشە لەسەرەتای هەفتاکان و هەشتاکان.

ئەوبەشە لەسەر زەوی نیشتمان گەر بۆ ماوەیەکی دیاریکراویش بووبێت دەبێتە مەڵبەندی هەڵگیرساندنی شۆڕش و بەگژداچوونەوەی ستراتیژیەتی بێ ناونیشانکردنی کوردو مێژووناسنامە نەتەوەییەکەی ئالەو بەشە دابراوو دوورە دەستەی نیشتمانیشدا کە گەر بەزمانە ناسیۆنالیستی بەرۆمانسیە باوەکە گوزارشت لەدیاردەو دەرکەوتەکان و شتەکان بدەینەوە، پێویستە چری پیرۆزییە نیشتمانی و نەتەوەییەکەی بگاتە ئاستێکی بەرز، هەروەها ببێتە شانۆیەکی خۆماڵیی بۆ رواندنی ئیرادەیەکی یەکگرتووی پتەوی واکە باوەڕبوون بەئایندەو رزگاری و ژیانی لێ بچۆڕێ و سەکۆی جەژنگرتنی مەرگی خۆپەرستی و مردنی فۆرمە بچوك و رزیوەکان و

ئەهریمەنی ناکۆکی و خۆبەنەفرەت کردن بێت، کەچی لەوێشدا لەسایەی حوکمی ڕێژەیی بزافەکە بەسەر هەندێ ناوچەدا وێنەی یەکگرتووی نەتەوەو نیشتمان تووشی کەرت بوون دێت وەك ئەوەی پەرتبوون قەدەری هەتا هەتایی کوردبێت و بەشێکی گرنگ لە جەوهەری کلتورو کەسێتی ئەو پێکبهێنێت؟! خودی بزاوتە کوردیەکەش وێنەیەکی لەبەرگیراوەی تراژیدیای کەرتبوونە مێژوویەکە بێت، لێرەدا واین لەحاڵەتی ئاماژەکردنێکی گشتی بەدۆخی هەشتاکانی کوردستانی عێراق و شۆڕش و بزافە ناسیۆنالیستییەکەو هێزەکانی، کەچەندین ناوچەی کوردستانیان لەژێر دەستدا بوو.

لەسایەی ئەوەی لەئەدەبیاتی سیاسی هاوچەرخی کوردا ناو دەبرێ بەشۆڕشی نوێی گەلی کوردستان لەم بەشەی کوردستاندا بەداخەوە هەر لەسەرەتاوە ئەم دابەشبوون و کەرتبوونە ناوخۆییەو دابەزینی بۆئاستی نیشتمان و نەتەوە نەك هەر مانای ساتەوەختە مێژووییە واقیعییەکەی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش دیاری دەدات، بەڵکو زیاد لەوە هەوڵیداوە بەناو جەستە مێژووییەکەی کوردستانی نوێشدا بچێتە خوارەوەو کەرت کەرتی بکات، بەشی زۆرمان ناوچە پاوانکراوەکانی هەشتاکانمان لەشاخدا لەبیرە کەچۆن هەر حزبەو بەتایبەتی پارتی و یەکێتی ناوچەیەکی دیاریکراوی بۆخۆی پاوان کردبوو جاری وابو هێزەکانیتر بۆماوەیەکی زۆر بۆیان نەبوو بچنە ئەو ناوچەو بارەگای تیا بکەنەوەو چالاکیی سیاسی و جەماوەری و سەربازی تێدا ئەنجام بدەن، کاتێ هێزی بێ‌پرس ئەو سنورە وەهمیانەی بەزاندبێ و ویستبێتی بچێتە ئەو ناوچە پاوانکراوانە دوچاری ڕوبەڕوبونەوەی توند هاتووە و مامەڵەی دوژمنی لەگەڵ کراوە!، بۆیە ئەو بەشە لەکوردستان کە دۆخێکی دیاریکراوی سیاسی سەربازی خستبوویە ژێر دەستی هێزە کوردییەکانەوە و

دابەشکرابوو بەسەر هەندێ ناوچۆکەی لە یەکدابڕاوی حزبی پاوانکراو، کە هەندێ جار بۆ کردنەوەی سنورەکانی ئەم ناوچۆکانە پەنا براوەتە بەر سازش و پێکهێنانی بەرەی تاکتیکی و مەرج سەپاندن و چەندین شتی‌تری لەم جۆرە، هەر لەو ساتەوەختەدا مۆدیلی گفتوگۆکردنی یەکلایەنەی هێزەکان لەگەڵ رژێمی بەعس لەئارادابوو، هێزێکی کوردی ئەو مافەی بەخۆی دەدا بەتەنها بچێتە ناوگەمەی وتووێژ لەگەڵ رژێم و بەناوی هەموو کوردیشەوە قسە بکات و داواکاریەکانی پێشکەش بکات و ئەو دەرفەتەش بقۆزێتەوە بۆ لاوازکردن و تۆمەتبارکردنی هێزەکانی‌تر کە لەگەڵ چارەسەری ئاشتیانەی کێشەدا نین یاخود گرێدراون بەم لاولاوە و سەربەخۆیی بڕیاری سیاسیان لەدەستداوە، لای هێزەکانی‌تریش وا سەیری ئەم هەنگاوە کراوە کە جۆرێکە لەسازش لەسەر پرەنسیپەکان و خیانەت کردن لەگەڵ دروشمەکان و دەستبەرداربوونی رێبازی نیشتمانپەروەری و کەوتنە باوەشی دوژمنی کوردەوە دەبێ لێرەدا بوترێت کەرتبوونەکە لەوقۆناغەدا هێندە قوڵ و خوێناوی بوو کە گومان دەخاتە سەر ئەو قەناعەتەی پێی وایە کوردەکان لەکاتی هەستکردن بەمەترسیەکی هاوبەشی گەورە بەکاتیی یەکدەگرن بۆ روبەڕوبونەوەی مەترسیەکە، چونکە کێ گومانی لەوەدا هەیە کەنیوەی دووەمی هەفتاکان و هەشتاکان ساتەوەختی تراژیدی و مەرگەساتە گەورەکانی کوردە.؟

پرۆسەی بەعەرەبکردن و راگوێزان و خاپورکردنی هەزاران ئاوایی و زەبری گەورەدان لەبونیادی ژیانی کۆمەڵایەتی و کلتوری کۆمەڵگای کوردی و سیاسەتی لەناوبردنی رەگەزی و ئیشکردن لەسەر تێکشکاندنی ئەخلاقیی مرۆڤی کورد لەوماوەدا بوونی دوژمنێکی گەورەی وەکو بەعس و هەلومەرجێکی دژواری

نیشتمانیی و نەتەوەیی بەو چەشنە نەبووە هۆی وەلانانی ناکۆکیەکان و پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی و نەتەوەیی وا بتوانێت سەرجەم وزەو تواناکان بەئاراستەی بەرگرییەکی سەر سەختانەتردا ئاراستە بکات و نەهێڵێ ئەو نائومێدییەی لە ناکۆکیانەوە بۆتاك و کۆمەڵگای کوردی پەیدا دەبێت، ببێتە هۆی ئەوەی هەزاران کەس بەویژدانێکی نیمچە ئارامەوە چەکی رژێم بکەنە شان و بەو ئەمرە واقیعە سەرشۆڕکەرە رازی بن کە بەعس لەکوردستاندا دروستی کردبوو.

دوای ماوەیەك سڕبوون و دواخستنی ناکۆکیەکان و لەخۆپیشاندانی وێنەیەکی نیمچە یەککگرتوو لەبزاوتی کوردایەتی کە لەبەرەی کوردستانی دا بەرجەستە دەبوو، جارێکیتر لەدۆخێکی هەستیارو ناسکتردا واتە لەکەش و هەوای دوای راپەڕین و دوای دروستکردنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و پێنانە ناوقۆناغێکی چۆنایەتی گرنگ بەبەراورد لەگەڵ قۆناغە مێژووییەکانیتری مێژووی کورد ناکۆکیە مێژوویەکان چوارچێوە ئاساییە نەخەملیوە مەدەنیەکان و میکانیزمە لاوازەکانی یەکگرن تێکدەشکێنن و چەکی حزبی کەئامرازی پیادەکردنی سیاسەتی حزبە دێتەوە مەیدان و جارێکیتر یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکان بەو دەسپێردرێتەوە لێرەوە نەفەسی نەفیکردنی بەرامبەرو خۆ بەهەموانکردن و دروستکردنی تەماهی لەنێوان حزب و نەتەوەدا حزب و نیشتماندا حزب و مێژووی نیشتمانیدا بەترسناکی و قورساییەکی زۆرەوە پەردە لە رووی سیمای دزێوی لادەدات. ئەو تەماهییەی لەنێوان حزب و کەینونەکانی نیشتمان و نەتەوەو مێژوودا باسمان کرد هەروا داوەریەکی ئایدیۆلۆژی نییە چونکە دەبینین کەرتبوون لەجەستەی رێکخستنە سیاسیەکەدا، واتە لە حزبی پێشڕەوی نیشتمانیدا لەسەرەتاوە گەرچی بۆماویەکی کەم باڵێکی کەرتبوونەکە

وێنەی خۆی تێکەڵ بەوێنەی دوژمن دەکات بەمانا ناسیۆنالیزمیەکەی بەڵام جگە لەوەی لەوکاتەشدا واز لەقسەکردن بەناوی کوردایەتیەوە ناهێنێ و ئەوهەنگاوەی خۆی بەتاکتیکێکی ناچاری پێ ناسە دەکات بۆ پێگەیشتنی زیاتری هەلومەرجەکان و تەواوبوونی سیماکانی ئەو نەوە نوێیەو ئەوچینانەی کەدەتوانن وەزیفەی مێژوویی خۆیان لەسەرکردایەتی کردنی بزوتنەوەی سیاسی نیشتمانیی ئەنجام بدەن، هێندەی پێ ناچێ پەرەسەندنەکانی سەرزەوی دابەشکردن و پۆلێنکردنەکانی ئەو قۆناغە دەسرێتەوەو بۆشاییەك دێتە کایەوە بەم جۆرەش ئەو باڵەی کەلەوەوپێش بە (مجروح) دانراوە هەوڵ دەدات دەستپێشخەری بەدەست بێنێتەوەو تاسەر ئێسقان داکۆکی لەسەر پێشەنگایەتیکردن بکات.[1]

چەکی کوردی و حزبی کوردیش وەك دامەزراوەیەکی مۆدێرنە نەك ناتوانن لەهەلومەرجە نوێیەکە دەستبەرداری کلتوری شاخ ببن و خۆیان لەژێر دەسەڵاتی مێژوویەکی ناهەموار دەرباز بکەن و هەستی وێکچوون دروست بکەن و کەناڵەکانی رۆشنبیریی هاودەردی و هاوچارەنووسیی پەرەپێبدەن و سەر زەمینێ بۆکاری هاوبەش تەرح بکەن و بدۆزنەوە بەڵکو تارماییەکی دوێنێ و لاوازی ئیرادە لە بەردەم بارستاییە هەڵچنراوەکانی غەنیمەتێکی سیاسی و ئابوری تازە بوونە هۆی ئەوەی جارێکیتر هێزە لێکدورخەرەوەکان بەسەر هێزەکانی کەمەندکێشکردن و بەرەو یەکبوون سەربکەون و کوردستان دووبارە لەسایەی دەسەڵاتێکی کوردی و هێزە کوردیەکاندا دووچاری دابەشبوونی ئیداری و سیاسی و دەروونی بێت، بەمەش

[1] القومية مرض العصر ام خلاصه/ ٢٥٢

سەرلەنوێ وێنەی ناوچەی کۆنترۆڵکراوی حزبی و دەڤەر، فشار دەخاتە سەر وێنەی نیشتمان، ئەم واقیعەو دەرهاویشتە نێگەتیڤەکانی شەڕی ناوخۆو گەورەبوونی ناسروشتی قەوارەو جەستەی حزب لەسەر حیسابی دەزگا نیشتمانیە تازە دامەزراوەکان و گەڕانەوە بۆ یادەوەری و پێوەرەکانی پێش ئەو دەزگایانە، لەهەلومەرجێکی ناسك و لەئارادانەبوونی هیچ پاساوێکی لۆژیکی و عەقڵانی بۆ کێشمەکێشی خوێناوی و دابەشبوونەکە، زەبرێکی‌تری گەورەی لە (انتما)ی مرۆڤی کورد بۆ نیشتمان و سەرەتای نیشتمانپەروەرێتی لای نەوەی نوێ و تێکڕا کۆمەڵگا دەدا.

لەسایەی ئەمری واقیع و دەرهاویشتەکانی شەڕی ناوخۆدا لەناو بەشێ لەنیشتمانە مێژوویەکەدا کە ساڵەهای ساڵ کورد خەو بەوەوە دەبینێ رزگاری ببێ و دەسەڵاتێکی کوردی خۆماڵی بەسەرەیەوە حاکم بێت، کەچی دوای هاتنەدی ئەو خەونە هێندەی نەبرد هەستی کرد زاڵگەو بازگە حزبیەکان کە رەمزی لێکجیاکردنەوەو تراژیدیای سنوری دەڤەرەکان بوون.. بەهۆی جیاوازی (انتما)ی حزبییەوە مامەڵەی بێگانەی لەگەڵ دەکرێت، بەڵکو زۆر جاربەچاوی دوژمن سەیر دەکرێ بۆیە هەر لەبنەڕەتەوە ناتوانێ زاتی ئەوەی هەبێت خۆی لەبازگەکان بدات، زاڵگە حزبیە حەیابەرەکان بوو بوونە شوێنگەی گومانکردن لەشوناس و نیازی هاووڵاتی و گۆڕابوون بەشێوە ژورێکی لێکۆڵینەوەی دەزگا ئاسایشیەکان و بوو بوونە شوێنی ئازاردانی هاونیشتمانی و گوزەراندنی ساتەوەختانێ کە مرۆڤی کورد هەستی بەنائومێدیەکی قوڵ و هەست بەبچوك بوونەوەیەکی ترسناك دەکرد، بەردەمی بازگەکان شوێنی هەست بەعەدەمیەتکردن بوون، شوێنی هەست بەئاگر تێبەربوونی

خەرمانی مێژوویەکی خوێناوی دەیان ساڵە بوون، شوێنی وازهێنان لەچەندین خەونی لەوەو پێش بوون.

شەڕی ناوخۆو کەرتبوونی هەرێم واقیعێکی نەهەمواری وایان هێنایە پێشەوە کەمرۆڤی کورد هەست بکات هیچ حەسانەیەکی وای نەماوە، کەوتۆتە بەردەم واقیعێکەوە لەنێوان شارێك و شارێکی‌تری کوردستانەکەیدا ناتوانێ بەشداری پرسەی ئازیزانی بکات و بۆمەتا هەتالێك دیدار ئاخر دەبن. دەیان هەزار کورد لەناو خاکی خۆیاندا بوونە ئاوارە، ئیتر چیدی ئاوارە تەنها بەو کەسانە نەدەوترا کە بەعس لەسەر خاك و نیشتمانی خۆیان وەدەری دەنان، یاخود خۆیان ناچار بەبەجێشتن دەکران، بەڵکو ئاوارەکانی سلێمانی و ئاوارەکانی هەولێرو شوێنانی دی پەیدا بوون و بەدەیان دانیشتنی دووقۆڵیش ئەنجامدران توانرا بەشێ لەو گرفتە بێتە چارەسەرکردن!

کوردێك هەر گەرچی دەیان ساڵ خەباتی کردبێ و باوك و دایکی شەهید بووایە، دڵسۆزترین تاکی کۆمەڵگا بوایە، هیچێ لەمانە تکای ئەوەیان بۆنەدەکرد توانای تەی کردنی شاروشارۆچکەکانی ئەو بەشەی لەنیشتمانەکەی هەبێت کەلەدوای راپەڕینەوە دۆخێکی تایبەتی نێودەوڵەتیی خستبوویە ژێر دەسەڵاتی هێزە کوردییەکانەوە.

ئیتر کوردستان (هەرێم) لەسایەی دابەشکردنە حزبییەکاندا بووە ئەو سەرزەمینەی هەلومەرجەکانی پێش دروستبوونی نەتەوەو پەیدابوونی چەمکی نیشتمان بەمانا مۆدێرنەکەی تیایدا باڵادەست بن کوردستانی بوون شوناسی

دەستخستنی ماف و ئازادی هاتوچۆو بازرگانی و هەوڵی خەملاندنی گیانی هاوکاری و هاوچەرنووسی نەما بوو.

بازرگانیێ دەبوا سنوری دەڤەرەکان لە بەرامبەر بردنی کالا بۆ ژێر دەسەلاتەکەیتر گومرگ بدات، وەك ئەوەی لەسنوری نێوان دوو دەوڵەت و قەوارەی بێگانەوە تێپەڕیێ!!

هاوولاتی شەوانیی لەتاریکیەکی تەواودا نوقوم دەکرێت، چونکە سەرچاوەکانی وزەی کارەبا دەکەونە دەرەوەی سنورەکانی دەڤەرو دەبێتە کەرتی فشاری سیاسی بۆسەر دەسەلاتە لۆکاڵیەکەی بەرامبەر.. ئەم ساتەوەختانە بەسوێترین ساتەوەخت بوون، ئەوساتەوەختانە بوون هاتوچۆی هاوولاتی و مرۆڤی کورد بۆ بەغدا ئاسانتر بوو تا بۆ هەولێر و سلێمانی.

لەم دۆخەشدا ئیتر چۆن داوا بکەین وێنەی نیشتمان نەشێویێ و تاکی کورد ئیرادەی خەوبینین بەژیانێکی هێمن و خۆشگوزەران و ئازاد لەسەر ئەم نیشتمانە لەدەست نەدا؟ گەر بەشێ لەشوناسی ناسیۆنالیزم لە پەیوەندی بەبوونی دوژمنەوە دەستبکەوێت و گوتاری ناسیۆنالیزمیش زۆربەی کات بۆ بەهێزکردنی یەکیەتی ناوخۆیی و قوڵکردنەوەی هەستی جیاوازبوون کاری لەسەر داهێنانی چەمکی دوژمن کردبێت و، لەقۆناغی ناسیۆنالیزمدا شوناسدان بەدوژمن لەسەر بناغەی بوونی هەرەشە بۆسەر نەتەوەو نیشتمانی نەتەوەیی بێت، ئەوا شەڕی ناوخۆی نێوان هێزە ناسیۆنالیستییە کوردەکان لەهەفتاو هەشتاکانەوە بۆ ئێستا کار لەسەر شێواندنی ناوەرۆکی ئەم چەمکە دەکات، یاخود راستتر بڵێین رەنگدانەوەیەکی لەسەر ئاستی

سایکۆلۆژی و مەیدان و رۆشنبیری تێکەڵکردنی وێنەی بەشێ لەخودە بەوێنەی دوژمن.

بەدرێژایی شەڕی ناوخۆ و تا دوایەمین جەولەی ئەو شەڕە، هێزە بەشەڕهاتووەکان شوناسی دوژمنانیان داوە بەیەکتر، بەڵکو لەخستنە پاڵی هەندێ خەسڵەت و وێنەی ناشیرین بەکارەکتەری یەکتر بە بەراورد لەگەڵ دوژمنە راستەقینەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی زۆر دڵرەقانەتر هاتوونەتە پێش چاو، داتاشینی وێنەی دوژمن لە ئەوی حزبی و لەناو هێزە کوردیەکان خۆیاندا لەدەیان ساڵی رابردوودا، تەنانەت وەك نەریتی لێهاتووە، لەزۆربەی کاتیشدا هەوڵدراوە ئەو وێنە داتاشراوانەی بەرامبەری حزبی لەگەڵ وێنەی دوژمنی راستەقینەدا بۆ نموونە لەعێراقدا لەگەڵ بەعس و تابوری پێنجەم و هێزی دژەشۆڕش پێناسەکراون و هەڵوێستیان لەبارەوە دیاریکراوە، ئەگەر بیرۆکەی بوونی دوژمن لەچوارچێوەی گوتاری ناسیۆنالیزمدا لەگەڵ بیرۆکەی جیاوازی تێکەڵ و یەکانگیربێت و لێی جیا نەبێتەوە ئەوا لەشەڕی راگەیاندنی نێوان هێزە ناسیۆنالیستییە کوردییە ناکۆکەکانیشدا، بەهەمان ئاراستە کاریان پێکراوە بەم پێیەش بیرۆکەی جیاوازیش کە چەمکێکی بنەڕەتی گوتاری ناسیۆنالیزم و لەهەمانکاتدا یەکێ لە میکانیزمەکانی پێکدەهێنێ دەکەوێتە ژێر رەحمەتی دوبارە (تکیف)کردنەوەیەکی واوە، بتوانێ بەدەوری فشار خستنە سەر بەرامبەرە حزبیەکە بخوا، هەڵبەتە لێرەدا ئەگەر واز لەو پێناسەکردنانە بێنین کە ئایدیۆلۆژیا دەوری تێدا بینیون یاخود لانیکەم گوتەزاو چەمك و پۆلێنکردنەکانی ئەوی تێدا بەکارهاتووەو بەمەش هێزێ هەوڵیداوە شەرعیەتی بوون و کارکردن و نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندیەکانی نیشتمان و گەلی کوردستان لەهێزێکیتر بسێنێتەوەو بەوە

تاوانباری بکات کە بەحوکمی شوناسە فکریی و پێکهاتە ئایدیۆلۆژیەکەی، ئۆتۆماتیکی دەبێتە هاوپەیمانی دوژمنەکانی کورد، یاخود گەر لە رووی ئۆرگانیشەوە نەبێت دەبێتە رێگرێکی گەورە لە بەردەم گەشەکردنی کۆمەڵگای کوردی و تازەبوونەوەی بزوتنەوە نیشتمانیەکەی، لێرە بەدواوە جیاواز بوون تەنها لەسەر ئاستی کوردبوون تەرح ناکرێت، یاخود لانیکەم کوردستانی بوون بەوجۆرەی تیۆرەکانی ناسیۆنالیزم لێکی دەدەنەوەو گیان و سەرەتاکانی ئەو دەیخوازن، بەڵکو چەمکی جیاوازبوون لەسەر ئاستی کورد بوون دادەبەزێ و شۆڕدەبێتەوە بۆ ئاستی پەیوەندییە حزبیەکان و جیاوازی نێوان تەوژمە فیکری و سیاسییەکانی کۆمەڵگا.

گەرتا پێش کەرتبوونی رێکخراوەیی و سیاسی و جەستە حەرەکیە ناسیونالیستە کوردییەکە بۆ دیارییکردنی ناوەرۆکی چەمکی جیاواز بوون لانیکەم لەسەر ئاستی سیاسی کوردستانی لەسەر ئاستی پێناسەکردنی چەمکەکە بوو بێت لە پەیوەندی بەکوردبوونەوە.

واتە ئێمە کوردین لەبەرئەوە جیاوازین، لەگەڵ ئەوی عەرەب و فارس و تورك، ئەوا لەو مێژووە بەدواوە هەروەك وتمان دەبێتە کەرەسەیەکی پۆلێنکردن و ناولێنانی ناوخۆیی و رێك بەئاراستەیەکی دژە ناسیۆنالیبستی کاردەکات و جیاوازبوونیش لەم ئاستە و لەم فۆرمەدا دەبێتە هێزێکی کێشکردن بەئاراستەی دەرەوەو پەرتکردن. جیاوازبوون لەم ئاستەدا بەجۆرێ بەکار دەهێنرێت کە چەمکەکە لەسەر هەردوو ئاستی ناسیۆنالیزم و پلۆرالیزمیشدا دەشێوێنی و سیمایەکی تارادەیەك تۆتالیتاری وەردەگرێت، واتە گەرچی لە روالەتدا وەك جیاوازی دەخرێتە روو، بەڵام لەناوەرۆکدا مەبەست لێی کوشتنی جیاوازی و داننەنان بەجیاوازەکان و بەناشیرین و دوژمن

دانانیان و سەیرکردنیانە وەك بابەتێ بۆپوکاندنەوەو تواندنەوە، ئیتر هاوکێشە کە لە ئەرکە ناسیۆنالیستیەکانیەوە دەگۆڕێت و بەم جۆرەی لێ دێت ئەوان پارتین و ئێمە یەکێتی کەواتە ئەوان لەئێمە جیاوازن و بەپێچەوانەشەوە لەسەر ئاستی هێزەکانیتریش تەنانەت لەهەندێ ساتەوەختی بێمانابوونی هەرچی پێی دەوترێت پێوەرو بیری نەتەوەی کار دەکاتە جیاوازی لەسەر بناغەی سۆرانی و بادینی ! !

گومانیشی تێدانیە کە لەکەش و هەوایەکی شپرزەو قانگدراوی لەم جۆرەدا عەشیرەتیش گەر بە روپۆشێکی سیاسیشەوە بێت جارێکیتر خۆی دەکات بە کەرەسەیەکیتری دروستکردنی جیاوازی و خولقاندنی هاوسۆزی لەم حاڵەتەشدا روانینە بیرۆکەی جیاوازیش لەم فەزایەدا ناتوانرێت لەفەوزا جیابکرێتەوە، فەوزایەك کەتیایدا نەگۆڕ (ثوابت)ە نیشتمانی و نەتەوەییەکان تیایدا هەرەس دەهێنن و هیچ شتێ نامێنێ هێزەکان لەسەری جیاواز نەبن، واتە ناکۆك نەبن، دوپاتیشی دەکەینەوە کە گرفتەکە لەخودی بیرۆکەی جیاوازبووندا نییە جگە لە بەرگە فاشیزم و نازیزم و بەعسیزم و کەمالیزمەکەیدا، بەڵکو لەوەدایە کەهێزەکان لەکارەکتەرێکی سیاسی کێبرکێکەرەوە بگۆڕین بۆ غەنیمەیەك بۆ یەکتر.. جیاوازی ببێتە هۆی ناشیرینکردنی چەمکەکەو شێواندنی وێنەی ناسیۆن و تێکەڵکردنی ئەوراقەکان و دیاریکردنی دوژمن لەناو ماڵی خۆدا باس لەو مەترسیەیە کە ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەجیاوازی لەسەر خودی بزاوتە ناسیۆنالیزمە کوردیەکە دروستی دەکات و هەزارو یەك پرسیاری لەسەر دادەنی، گەر باسکردن لەناسیۆنالیزم باس لەوێکچوون و هاوشێوەیی و بوونی ئیرادەی بەیەکەوە ژیانی پێکهاتەو جیاوازەکانی گروپێکی بەشەری بکات کەپێان دەوترێت نەتەوە، گەر نەتەوە کاراکتەری مەعنەوی هەمووئەم

خەڵکانەن کەلەسەر بناغەی بوونی زمان و فەرهەنگ و مێژووی هاوبەش و هاوچارەنووسیی، یاخود ژیان لەسەر نیشتمانێکی دیاریکراودا بڕیاری بەیەکەوە ژیان لەسایەی دەسەڵاتێکی نیشتمانیدا دەدەن، لەچوارچێوەی پەیمانێکی کۆمەڵایەتیدا، ئەوا بەخولگەیی کردنی جیاوازیەکان لەنێوان پێکهاتەکانی پێش دروستبوونی نەتەوەدا، پێدانی سیمایەکی خوێناوی بەم جیاوازییە بەو جۆرەی لەدەیان ساڵ ناکۆکی ناوخۆیی هێزە کوردییەکاندا بینیمان روویدا، گومانی تێدا نییە کە مەرجەکانی بەرەو پێگەیشتن چوونی رۆحی نەتەوایەتی نەتەوەیەك تێکدەشکێنێ و ئەوەیلەواقیعدا دەمێنێتەوە تەنها هەندێ رواڵەتی ناسیۆنالیزم دەبێت لەگەڵ تێکەڵەیەك لەبەهاکانی خێڵ و هەندێ ئایدیۆلۆژیاو هەستی سەرەتاییتر کە زیاتر غەریزە دەیجولێنێ نەك بیرۆکەیەك لەمەڕ بەسیاسیکردنی بۆنە کەلتوری و سروشتییەکەی نەتەوە.

گەر ناسیۆنالیزم کار لەسەر بەگشتی کردنی بەهاو پێوەرەکانی بکات، حزبی کوردی لەشەڕی ناوخۆدا کاری لەسەر ئەو خاڵانە کردووە کە ئەو هێزەکانی دی ناو بزوتنەوەی کوردایەتی لەیەکدی جیادەکاتەوە، لەوەش ترسناکتر ئەم دیدە دەبێتە کەرەسەی پێگەیاندن و پەروەردەی سیاسی ئەندام و لایەنگرانی حزب و جۆشدانی سایکۆلۆژی و گەڕان بەدوای جیاوازیەکان لەناوەداو گەورەکردنیان و لافلێدانی پاوانکردن و نوێنەرایەتی کردنی رەهای رۆح و ئامانجەکانی نەتەوەو، گومان دروستکردن لەسەر (انتما)ی جیاوازییە فیکری و ئایدیلۆژی یاخود دیالکتیکیەکان و بوونی حەزێکی قووڵ بۆ وەدەرنانیان بۆ ئەو دیوی حەساری کوردایەتی و

نیشتمانپەروەرێتی، لەدەیان ساڵی رابردووی کوردستاندا جەستەی ناسیۆنالیزمی کوردیان بەرەو لاوازی و پەککەوتیەکی زۆر برد.

ئایدیۆلۆژیا مۆدێرنەکان بەخودی ناسیۆنالیزمیشەوە (کە لەناو کورددا زیاتر وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی تەواوکەر سەیرکراوە) کاریان کردووە لەسەر پێناسدان بەهێزە کەرتبوەکان و تەوژم و کەس و برگە مێژووییەکان. کاتێ پرۆسەی بەدوژمنکردنی یەکتر و مامەڵەی دوژمنکارانە لەگەڵ یەکدیدا بەم جۆرە بوو بێتە شێوە رۆشنبیرییەکی سیاسی کوردیی، گومانی تێدانیە ئەوەی ماوەتەوە لەو میکانیزمانە، یاخود رەمزو بەهایانەی ناسیۆنالیزم کە بۆ دروستکردنی کاراکتەری نەتەوەیی بەکاریان دەهێنێ، ئەوانیش دووچاری شالاوێکی ناشیرینکردن و بێناوەرۆککردن دەبنەوە، حزبی کوردی لەشەڕی هێزێکی‌تری کوردیدا کاتێ هەوڵیداوە سەرجەم سەرمایە رەمزی و مێژووییە نەتەوەییەکان لەچوارچێوەی جەنگی راگەیاندن و جەنگی دەروونی و بەمەبەستی رەوایەتی لێستاندنەوەو سەلماندنی خیانەتکاری بەرامبەرەکان بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکار بهێنێ و پرۆسەی خۆ بەخاوەنکردنی تایبەتی ئەو مێژوو و رەمز و سەرمایە رەمزییە بەرێوە بەرێت و بەشێوەیەکی دێوانە ئاساو بێرەحمانە دەست بۆ سەرجەم پێکهێنەرەکانی یاداوەریی مرۆڤی کورد دەبات بەمەبەستی نیشاندانی راستبوونی خۆی و بەهەڵەو لەرێ لادراوو بە (خائن) لەقەڵەمدانی بەرامبەرەکەی روونە، لەهەلومەرجێکی لەم جۆرەدا شەڕەکان تەنها لەنێوان کۆمەڵێ جەنگاوەری حزبی و میلیشیادا بەرێوە ناچن بەڵکو بەشێ لەمەیدانەکانی ئەو شەڕە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوقووڵایی ئەو مێژووەی کە لەکوردستاندا ناسیۆنالیزم پێکی‌هێناوە یاخود لانی‌کەم بەشداری لەپێکهێنانیدا

کردووه و شانازی پێوه دەکات و بەمێژووی خۆی دەزانێت واتە کەرتبوونەکە تەنها چرکە ساتی ئێستا و کەرتبوونێکی سیاسی رووت ناگرێتەوە، بەڵکو لەوسۆنگەوە کە هەر لایەك دەیەوێت شەرعیەتی ئەوی دی لەمێژوودا هەڵبوەشێنێ و تیرۆر بکات دەست دەبات بۆ پێکهێنەرەکانی مێژووی ئەم قۆناغە لەمێژووی کوردیش کە هەر لەخۆیدا لەرووی گیانی هاوچارەنووسی ناوخۆییەوە مێژوویەکی نەخەملیوە دابڕ دابڕ دەکات. بەمەش مێژووی کوردایەتی و ناسیۆنالیزم کە رەگەزێکی گرنگی پێکهێنانی هۆشیاری ناسیونالیستی و سەرچاوەی کۆمەڵێ لەبەهاکانیەتی لەچەندین رەهەندیدا لەرێی هەوڵی تیرۆرکردنی مەعنەوی کاراکتەری ئەو هێزەی بووە بە رەمز یاخود ناونیشانی دروستبوونی مێژووەکە، دەکرێت بەمێژووی خیانەت و ناپاکی ئەم هێزو ئەوهێزی ناسیۆنالیستی. مێژوویەکی داڕزاو بەناجوامێری و نادڵسۆزی و درۆی ناسیۆنالیستانە ئەگەر هەوڵەکانی تێکشکاندنی مێژووی کوردیی لەقۆناغی ناسیۆنالیزمدا ببەستینەوە بەو هەوڵە ئایدیۆلۆژیانەی هاوکات لەئارادابوون بۆتێکشکاندنی سەرجەم مێژووی کورد، لەپێش ئەو قۆناغەدا، کەمێژووی ئیسلامیی کوردە، ئەوا دەگەینە ئەوراستییەی کەناسیۆنالیزمی کوردی یەکێ بووە لەو ناسیۆنالیزمانەی تارادەیەکی بەرچاو بێبەش بووە لەکەرەسەیەکی گرنگی پەروەردەو ئاراستەکردنی ناسیۆنالیستانە کە ئەویش بریتییە لەمێژوو نەبوونی هۆشیاریی مێژوویی دڵڕەقی بەشێ لەنوخبە کوردییەکە لەدزێوکردنی جەستە مێژووییە کوردییەکە بەدرێژایی سەدەی ناسیۆنالیزمی خۆرهەڵات (سەدەی بیستەم). بەردەوام بووە و تائێستاش هەر لەو کایەدا دیدگا لێڵی و شپرزییەکی زۆر حاکمە و، تێکشکاندنی رەمزە نەتەوەییەکانی سەردەمی سەرهەڵدانی حزب وەکو دیاردەیەکی

مۆدێرن لەکوردستاندا سەرەتا لەرێی بەحزبی کردنیانەوە ئەنجامدراوە کەبەوە ڕەمزەکە بچووك کراوەتەوە گەرچی ئەو هێزەی ئەوەی کردووە ڕۆژێ لە ڕۆژان نەچۆتە ژێرباری ئەم حوکمدانەوە، چونکە ئەو خۆی بەمیراتگری ڕاستەقینەو بێمونافیسی ڕەمزەکەو سەرجەم کلتوری شۆڕشگێڕی و ناسیۆنالیستی کوردی داناوە، دواتر بەکارهێنانی وەك کەرەسەیەکی پروپاگەندەی سیاسی لەشەڕە ناوخۆییەکانداو هەوڵدان بۆبێ بەریکردنی لایەنی بەرامبەر لەم ڕەمزە هەنگاوی دوای ئەوەش هێزەکەی بەرامبەر لەپێگەی کاردانەوە ڕەنگە لەسەرەتاوە هەوڵی دابێت هەندێ لە ڕەمزەکان لەدەست بەرامبەری بسێنێتەوە و وا لە جەماوەر بگەیەنێ کە ئەویش هاوبەشێکی ڕەمزەکەیە، بەڵام لە قۆناغێکیتری خەستبوونەوەی ناکۆکی و قووڵبوونەوەی لەئەندازە بەدەری برینەکاندا وازی لەمەش هێناوەو هێرشی کردۆتەسەر ڕەمەزەکەو هەوڵیداوە لە هەموو ئەو خەسڵەتانە دابڕنێ کە کردوویانە بە ڕەمزێکی نەتەوەیی، بەڵکو لەوەش زیاتر ڕۆڵێکی دژی نەتەوەیی لەمێژوودا پێ بدات و بیکاتە کاراکتەری خیانەتی نەتەوەیی هێزێ لەرێی بەحزبیکردنی ڕەمزەکانەوە لەرەهەندە نیشتمانی و نەتەوەییەکەی کەمکردوتەوە هێزەکەیتریش لەرێی هەوڵدان بۆ وردوخاشکردنیان ویستویەتی لەیادەوەری جەماوەری کوردستاندا وەك سەرمایەیەکی ڕەمزی و هێمایەکی نەتەوەیی بیانکاتە دەرەوە بەم جۆرە و لەسایەی حەزێکی شێتانە بۆ حزبیکردنی کۆی ژیانی کوردەواری و لاوازبوونی پایەکانی نیشتمانپەروەرێتی و ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی ڕۆشنبیری ناسیۆنالیستانەو جیاوازی ئایدیۆلۆژی، نەك هەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێردەسەڵاتی هێزەکانی پێکهێنەری بزوتنەوەی کوردایەتی بەڵکو مێژوو یاداوەری و ڕەمزەکانیش دوچاری کەرتبوون و

دابەشکردن هاتن، بۆیە لەزۆر کاتدا یادکردنەوەی لەدایکبوون و مردنی رەمزەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی دوای سەرهەڵدانی حزبی کوردی بەگوێرەی دابەشبوونیان بەسەر هێزو لایەن و تەژومەکاندا کاری هێزو لایەنێکی دیاریکراوە، کەدێینە سەر دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان لەدوای هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول کەلەسەرەتای هەفتاکاندا بوو بووە چوارچێوەیەکی رێژەیی بۆ یەکیەتیەکی کاتیی بۆ دیاریکردنی مێژوو بەراوردێك بۆئەو چرکەساتە مێژووییە، زیاتر لەمێژوو بەراورێکمان هەیە، شۆڕشی گوڵانی نوێی نەتەوەیی و شۆڕشی نوێی گەلی کوردستان هەر یەکەیانساڵیادو دروشم و یادەوەری و سەرکردایەتی خۆیان هەیەو بەیەکیەتی و پارتیش هەریەکەو بەویۆنەیەوە بەجیا ئاهەنگ دەگێڕن و ئاماژە ناوەکیەکانیشی لەوە خاڵی نییە هەرلایەك ویستویەتی شانازی دەستپێشخەری بەشی خۆی بێت و بیشیسەلمێنێ کە ئەو نوێنەری راستەقینەو مێژوویی شۆڕشی نوێیە لەکوردستاندا بەمەش مێژووی شۆڕش لەجیاتی ئەوەی مێژووی حزب وەگەڕکەوتنەوەی ستراتیژیەتێکی نەتەوەیی یەکگرتوو بێت دەبێت بەمێژووی هێزە ناکۆکەکان و مێژوویەکی یەکگرتوومان نامێنێ کەبتوانێ هەستێکی هاوبەشی شانازیکردن دروست بکات و بۆهەموانیش وەك یەك ببێتە سەرچاوەی ئیلهام لێ وەرگرتن و جۆشدانەوە.. بۆیە کاتێ ئاهەنگێران بەو بۆنانەوە وەك ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەو حزبییە تایبەتیەکانیان لێهاتووەو جەماوەر بەگشتی جگە لەجەماوەری (حزب)ی ئاهەنگێڕ کارلێکی وای لەگەڵدا ناکەن و نابێتە وێستگەیەکی خۆتازەکردنەوەی رۆحی و قوڵکردنەوەی (انتما).

لەوەش خراپتر بەشێ لەمێژوو شوناسی ئەوەی پێی دەوترێت شۆڕشی نوێی گەل لای هەریەك لەدوو هێزەکەی کوردستانی عێراق لە پەیوەندی بەناکۆکی و شەڕ لەگەڵ هێزەکانی‌تردا پێکهاتووە.

*** *** *** ***

گەر ئەرکێکی ناسیۆنالیزم لەمێژووی خۆشیدا پێناسەکردنەوەی مەرگ بووبێت بەتایبەتی لەفۆرمی کوشتندا بۆئینسان و ئاراستە پێدانێکی نوێی بێت واتە داهێنانی بیرۆکەی مردن بێت لەپێناو رزگاری نەتەوەو بوون بەشەهیدی نیشتمان و، شەهید بەمانا نیشتمانی و نەتەوەییەکەشی ئەوکەسە بێت لەسەنگەری بەرگریکردن لەخاك و نیشتمان و نەتەوە بکوژرێت و خوێنی برژێ و گیانی خۆی بکات بەقوربانی، ئەوا بەدرێژایی شەڕەکانی ناوخۆ لەنێوان هێزە خۆبەناسیۆنالیست زانە کوردیەکاندا چەمکی شەهیدیش بەدەردی چەمکی نیشتمان و دوژمن و نەتەوەو مێژوو چووەو لەزۆریێ لەئاماژەو جادو و پەیام و ناوەرۆکەکەی خاڵی کراوەتەوە. لەدەرەنجامی ئەو تەماهیکردن و بەیەکدی تێکەڵکردنە ترسناکەکەی نێوان حزب و نەتەوەو نەهێشتنەوەی هیچ مەودایەکی شایانی باس لەو نێوەندەداو کاڵکردنەوەو سادەکردنەوەی مانای شەهید بۆگوزارشتدان لەکوژرانی هەر مرۆڤێ کەناوی پێشمەرگەی لەخۆی ناوە شەهیدەکان لەفەرهەنگی هێزەکانی ناسیۆنالیزمی کوردیدا لەوە دەرچوون کە ئەو کەسانەبن وەك وتمان لەسەنگەری بەرگری لەخاك و گەلی کوردستاندا گیانیان کردۆتە قوربانی، بەڵکو هەموو کوژراوەکانی شەڕی ناوخۆ هەریەك لای خۆیەوە بەشەهیدی داوەتە قەڵەم بەدەر لەقوربانیدانی زۆری شەڕی

ناوخۆی نێوان هێزە کوردیەکان لەپێش راپەڕین لەدوای راپەڕینەوە نزیکەی تێکڕای ئەوەی ناوی شەهیدی لێنراوە لەراستیدا شەهیدی حزب و لەدەرەوەی سەنگەرەکانی بەرگریەکی راستەقینەو لەجەولەکانی شەڕی ناوخۆدا تیاچوون.

لەجەنگی دژایەتی کردنی یەکترو شەڕکردنی لایەنەکان لەسەر دەسەڵات و پارەو نفوز کوژراون گەر مەسەلەکەش بەم جۆرە بێت، دەبێت بەگوێرەی چ پێوەرێکی نەتەوەیی بتوانین ئەم کوژراوانە بکەین بەشەهیدی نیشتمانی؟ لەکاتێکدا خودی ئەو سەرکردانەی لەپشت شەڕەکانەوە بوون وەسفی شەرەکەیان بەشەڕی نەگریسی ناوخۆو کورد کوژەو شەڕ لەسەر پارەو دەسەڵات کردووە؟!

گرفتەکەش لە رووی مەبدەئی و سایکۆلۆژی و نەتەوەییەوە هەر لەمەدا کورت نابێتەوەو کۆتایی نایە کەئەوانەی لەجەولەکانی شەڕی ناوخۆدا تیاچوون بەمانا نیشتمانیەکە شەهید نین، بەڵکو رەهەندیتریشی هەیە، یەکێ لەو رەهەندانەش ئەوەیە کە لەپاڵ ئەوەی هۆشیاری مرۆڤی ئاسایی کورد پێویستە لەسەری ئەوسەرکردەو لێپرسراوانەی هەتا دوێنی بەخیانەتکراو دوژمنی کورد لەقەڵەم دەدران دەبێت ئەمرۆ بەدڵسۆزو رابەریان بزانێ لەپاڵ ئەمەدا لە بەردەم پرسیارێکیتریشدایە ئەویش ئەوەیە کە چۆن دەبێت ئەو قوربانیانەی کە لەفەرهەنگی شەڕی ناوخۆدا بەجاش و سەرلێشێواو و ناپاك و کرێگرتە دراونەتە قەڵەم، ئێستا مرۆڤی کورد.. چۆن سەرلەنوێ بتوانێ دەستکاری عەقڵ و ئیحساساتی خۆی بکات و نەك لەسەر زمانی بەڵکو لەویژدانیدا ئەمانە بەشەهید بزانی؟

دەبێت چی چاوەڕێ بکەین لەهۆشیاری و یاداوەری مرۆڤی کورد، لەکاتێکدا کەسەرکردەکانی ئەمڕۆ داوای لێ بکەن فلان بەناپاك بزانێ، کەچی کەدەکوژرێ بەیانی تەواو بەپێچەوانەی ئەوەوە هەمان کەس بەشەهید بزانێ؟ لێرەدا تاکی کورد لەژێر فشاری ئەو واقیعەدا چۆن بتوانێ مەنزومەی پێوەرەکانی دانەرمێ و (نەگۆڕەکان)ی لێ نەشێوێ و لەدیدێکی کوردانەو هۆشیارانەی سیاسی راستەقینەوە پۆلێنی هێزەکان بکات و شوناسیان پێ بدات؟ یاخود باوەڕی بەو کلتورە کوردییە لاوازانە بێت کەبۆماوەی دەیان ساڵ نەتوانێ یەکێتیەکی ناوخۆیی لەنێوان هێزە کوردیەکاندا دروست بکات و بەیەکەوە ژیان ئەوەندە بەهێزکات ئەم هێزانە لەسەر بەرنامەیەکی نیشتمانیی یەککرتووی نیشتمانیی راستەقینەو پایەدار کۆبکاتەوە؟ دیارە قسەکردنەکانی ئێمە تارادەیەکی زۆر لەسەر ئاستی بەشە کوردستانیی عێراق بوو بەڵام گەر وێنەکە بگوازینەوە بۆبەشەکانیتریش لەپەیوەندی بەو هێزانە بەیەکترو بەهێزە ناسیونالیستییەکانی کوردستانی عێراقیشەوە، لێکدانەوەکە راست دەردەچێت و لەهەندێ رەهەندیشەوە وێنەکان تۆختر دەبنەوە و ئیزافەیتریان دەچێتە سەر؟ لە راستیدا ئەوهەستە دژی ئیسلامییە بەهێزەش کەلەناو بەشێ لەناوەندە سیاسی و رۆشنبیرییەکەی کوردستانی عێراق هەیەو تۆخکردنەوەی مەسەلەی عەلمانی و ئیسلامی و پێشنیارکردنی پێکدادانێکی ریشەیی و یەکلاکەرەوە لەنێوانیاندا، رەنگدانەوەیەکی ئەو قەیرانەیە کەبیری نەتەوایەتی کوردیی بەدەستیەوە دەناڵێنی، لاوازی ئەو ئیرادەی بەیەکەوە ژیانەیە کەئێستا لای هەندێ تیۆریست بوون یاخود نەبوونی هەست و گوتارو پرۆژەی نەتەوەیی پێ دیاریدەکرێت. سستی توخمە یەکێتیخوازەکانی ناو ریزەکانی بزوتنەوەی

ناسیۆنالیزمی کوردی و لەهەمانکاتدا نەبوونی قەناعەتێکی تەواو بەرۆشنبیریی جیاوازی قبوڵکردن، کە ئەمڕۆ لەسایەی پێدراوەکانی جیهانگیریدا گرنگییەکی لە رادەبەدەری هەیە بۆ هێنانە دی واتای یەکیەتی نەتەوەیی بەو جۆرەی گیانی قۆناغەکە دەیخوازێت لە رابردوودا زەبری کوشندەی لە بزاوتی کوردایەتی دان، ئەو واقیعە مێژووییەی کە لەم وتارەدا لەسەر هەندێ لەرووکارەکانی وەستاین و پاشماوەکانیش تائێستا لەناوماندا دەژین، ئەرکی بیناکردنەوەیەکی نوێی رۆشنبیریی نیشتمانیی و گیانی هاوچارنووسی نەتەوەیی لەوە دەردەکات کەبتوانرێت تەنها لە رێی هەندێ هەنگاوی روکەشی سیاسی و سیاسیەکانەوە ئەنجام بدرێت، بەڵکو ئەرکێکە دەبێت وزەو توانای کۆی کایەکانی کۆمەڵگای کوردی و لەپێش هەموویشیانەوە کایە فکرییەکەی بۆ بخرێتەگەڕ، بەڵام ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ریفۆرم لەسەر ئاستی ناسیۆنالیزم و رۆشنبیریی نیشتمانیی بە ریفۆرم لەخودی کایەکانیتری کۆمەڵگادا دەست پێدەکات، کە دەکرێت ئاسانتر ئەنجام بدرێت بەتایبەتیش کایە رۆشنبیری و سایسیەکە بۆ ئەوەی ئیرادەی بەیەکەوە ژیان لەئاستێکی ماقوڵدا بتوانێت هەماهەنگی نیشتمانیی و نەتەوەیی و هاوسەنگی کۆمەڵگایی بەدی بێنێت.

*گۆڤاری هەژان ژمارە ().

## سەرەتایەك

هەروەك دەبینن ئەمڕۆ ئەمریكی یەكان لە هەر كاتێكی‌تر زیاتر هاتونەتە كوردستان و پێیانەوە دەردەكەوێت كە بایەخ بە دۆزی كورد دەدەن. دیارە بەو جۆرەی خۆیان لە سروشتی ئەم دۆزە تێگەیشتوون و لەو چوارچێوەشدا كە ستراتیژیەتە داڕێژراوەكانیان لە سەراپای خۆرهەلاَتی ناوەڕاستدا دەیخوازێت. سەركردە كوردەكانیش لە ئاستی جۆراوجۆردا بە حەماس و گرنگی و پەرۆشیەوە دەڕوانن بۆ پەیوەندی نێوان كوردو ئەمریكاو وا هەست دەكرێت كە ئومێدێكی زۆریان بەم پەیوەندییەوە گرێدابێت و گرەوی زۆریان لە سەر كردبێت. بۆیە لەو ساتە وەختە هەستیارو ناسكانەی كە كورد و بزاڤە نیشتمانیەكەی و عێراقی پیا تێپەڕ دەبێت پێویستە ڕۆشنبیران و خاوەن باری سەرنجەكانی كوردو ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسی یەكە زۆرترین قسە لە سەر ئەم پرسە بكەن. چونكە هەر وێنا كردنێكی هەڵەو گرەو كردنێكی ناڕاست لەم بوارەدا بە شێوەیەكی یەكجار خراپ بە سەر كۆی ژیانی سیاسی و دەروونی و نەتەوەیی كوردا دەشكێتەوە. ڕەنگە هەر خوێندنەوەیەكی زانستیش بۆ هەڵوێستی ئەمریكی لە مەڕ كێشەی كورد لە گەڵ لە بەرچاوگرتنی هەموو ئەو گۆڕانانەی ڕوویانداوە، بخوازێت ئەو پەیوەندیە و گەشەكردنی و سروشتی و ئاستی گرەولەسەركردنی لە مەوداكانی مێژوو ئەمڕۆو

ئایندەدا سەیری بکرێت و شیبکرێتەوە. مەسەلەیەکی گرنگیش کە هەر دەچێتە ئەم چواچێوەوە هەڵوێستە کردنە لە سەر شێوەی بیرکردنەوەی سەرکردە کوردەکان و ناوەندە سیاسی و ڕۆشنبیری‌یە کوردستانیەکە و مامەڵەکردنیان لە گەڵ ئەو پەیوەندی و هەڵوێستەدا، چونکە هەندێ جار خودی هەڵوێستەکەو ڕەنگدانەوەکانی چەند گرنگە بەو ئەندازەش جۆری پێشوازی لێکردن و تێگەیشتن و ئەو مامەڵە نیشتمانیەی کە لە گەڵیدا دەکرێت گرنگە. دیارە هەق وایە دەسنیشانکردنی مێژوو و پەرەسەندن و سروشتی پەیوەندی ئەمریکا بە کوردەوە ببێتە کەرەسەی کاری زانستی و لە لایەن دەزگاو ناوەندە ئەکادیمی‌یەکانەوە بایەخی پێ بدرێت و لەم ساتە مێژووییەشدا کۆڕ و سیمینار و مێزگردی جۆراوجۆری لە سەر ساز بکرێت و ئەوەندەی دەکرێت ئەوانەی دەتوانن لەم بارەیەوە شتێ بڵێن هەوڵدەن بیرو رای خۆیا دەربڕن و گوێیان لێ بگیرێت لە سەرەتاشەوە دەبێ ئەوە بڵێین کە مەبەست لەم قسەکردنانە قسەکردن نیە لە سەر ئەو پرسیارەی کە ئایە ئێمە لە گەڵ ئەمریکا پەیوەندیمان هەبێت یان نەمان بێت ؟ چونکە پرسیارێکی لەم جۆرە لەم ساتە مێژووییەداو بۆ بارودۆخی کوردو ئەم هەرێمە تا ڕادەیەك بە سەر چوو دەچێت، با ئەگەرێکیش بێ نەتوانرێ ڕەت بکرێتەوە.

بەڵکو هەر پرسیار کردنێکی لەم جۆرە لە گەڵ ڕەوایی پرسیارکردنەکەشدا دەبێتە هۆی داخستنی ئاسۆکان بە ڕووی هەر مشتومڕ و هەڵسەنگاندنێکی جدی پەیوەندی‌یەکان و کەوتنە ناو بازنەیەکی داخراوی یەکتر تۆمەتبار کردن و جەمسەر گیری سیاسی و ئایدۆلۆژی. دەتوانین ئامازەش بەوە بکەین کە ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی بەرچاو کۆدەنگێکی نیشتمانی هەیە لە سەر بوونی پەیوەندییەکە و تەنانەت گرنگی

بونیشی چونکە ئەمڕۆ کورد ناتوانێ بێپەیوەندی بێ لە گەڵ ئەمریکا، لە کاتێکدا ئەو وڵاتە بە هەموو قورسایی خۆیەوە هاتۆتە سەر خەت بۆ دارشتنەوەی باری ناوچەکەو رێکخستنەوەی سەر لە نوێ پەیکەری دەسەڵات لە عێراقدا کە ئێمەش لە هەرێمدا بە چاك و خراپ دەکەوینە ژێر ئاسەوارەکانی ئەو گۆڕان و رێکخستنەوانە، بەڵام قسە کردن لە سەر جۆر و سروشت و ئامانج و ڕەهەند و میکانیزم و کارلێکردن لە گەڵ پەیوەندییەکەدا هەتا بڵێی پێویستە ببێتە تەوەرەی ئاڵ و گۆڕ کردنی بیرو ڕاو دیالۆگ و هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی زانستی و مشت و مڕی گەرم.

### ئەمریکا و کورد و سەرنجێ لە مێژوو

ئەمریکا گەر لە زۆر شوێنی دونیادا بووبێتە میراتگری کۆلۆنیالزیمی ئینگلیزی دەتوانین بڵێین لە عێراقیشدا تا ڕادەیەکی بەرچاو هەر بەو شێوە بووە. هەروەك دەزانین ئینگلیزەکان هەر لە سەرەتای دامەزراندنی قەوارەی عێراقی نوێوە تا کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی رژێمی پادشایەتی لە عێراقدا رۆڵی بنەڕەتیان لە روداوەکانی ئەم وڵاتانەدا بینیوە. بەڵکو لێپرسراوێکی بنەڕەتیشن لە جۆری پێکهاتنی قەوارەی عێراقی و دارشتنی یاساکانی و رێکخستنی پەیکەری دەسەڵات و کارگێڕییەکەی چونکە هەر لە بنچینەوە خۆیان ئەندازیاری پێکهێنانی قەوارەی عێراق بوون بەم جۆرەی ئێستا.

لێرەدا ناچینە سەر هەڵوێستی ئینگلیز بەرامبەر بە کورد و جووڵانەوەکەی چونکە ئێرە جێگای نیەو لەوەش ڕوونترە قسەکردنی زۆری بوێت کە بە گشتی

هەڵوێستی کۆلۆنیالزمی بەریتانی بەرامبەر بە گەلی کورد و کێشە ڕەواکەی هەڵوێستێکی دوژمنکارانە بووەو راستەوخۆ و نا راستەوخۆش بە کردەوە و مەیدانی بەشداربووە لە سەرکوتکردنی شۆڕش و راپەڕینەکانی کوردو چەسپاندنی بارودۆخێکی سیاسی و یاسایی و سەربازی وا لە عێراقدا سەرەنجام ئەو بارودۆخە ببێتە زیندانی لە بار چوونی خەونەکانی گەلی کورد و لە قاڵبدانێکی ترسناکی ئامانج و هیواو داواکاریەکانی. گەر زۆر لە سەرەتا سادەکان نەپرسیت ئەمریکا لە دوای کودەتاکەی قاسم و هاو ڕێبازەکانیەوە و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لەو پەرەسەندنەی دراماتیکی رووداوەکان لە عێراق و کوردستاندا وردە وردە زیاتر لە جاران تێکەڵاو بە مەسەلەی کوردی دەبێت یاخود بڵێین دەبێتە بابەتێك بۆ بیرلێکردنەوەی گەرچی لە پانتایی یەکی سنورداریشدا بوو بێت. تا لە سەرەتای حەفتاکاندا لە چوارچێوەی سیاقی سیاسی و نێودەوڵەتی و بلۆکبەندییەکانی ئەو کاتەی دنیادا دەگات بە لوتکەی خۆی. ئەوەی جیگای سەرنجێکی خێرا بێت لە سەر ئەو پەیوەندی یانە لەو قۆناغە مێژووییەدا دوو خاڵی گرنگە یەکەمیان ئەوەیە کە پەیوەندیکردنی ئەمریکی‌یەکان بە کورد و جوڵانەوەکەیەوە لەو قەناعەتەوە نەبووە کە کورد خاوەنی کێشەیەکی ڕەوای چارەسەر نەکراوەو پێویستە لەم ڕوانگەوە مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت. بەڵکو وەك سەرجەم ئەو هێزانەی‌تر کە مامەڵەیان لە گەڵ ئەجێندەی کوردیدا کردووە تەنها وەك کارتێکی گوشارو چۆنیەتی بە کارهێنانی لە سەر مێزی گەمەی سیاسی ناوچەکە بەکار هێنراوە. کە دەبێت ئەم مەسەلەش لەمیانەی تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا و هەردوو بلۆکەکەو هەوڵدانیان بۆ وەدەستخستنی پێگەو (**نفوذ**)ی زیاتر لە دنیادا و تەنگ

هەڵچنین بە یەکتر لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا ببینن و تێیبگەین. دووەم سەرنجیش ئەوەیە کە ئەمریکا راستەخۆ مامەڵەی لە گەڵ کورد نەکردووە بەڵکو لە میانەی دۆستەکانی لە ناوچەکەداو بەرژەوەندییەکانی ئەوانەوە سەیری کردووەو کێرڤەکەی بەرزو نزمیی کردووە.کە گرنگترین دۆستی ئەمریکا یش لەو کاتەدا لە ناوچەکەدا ئیسرائیل و رژێمی پادشایەتی ئێران بوون. ئەو گرفتە مێژوییەی کە تاکو ئێستاش کورد لە دەستی رزگاری نەبوە باجەکەی دەدات، کورد و جووڵاندنەوە سیاسییەکەشی لەو برگە مێژووییەدا هەوڵی داوە پەیوەندی لە گەڵ هەردوو دۆستەکەی ئەمریکا توندو تۆڵ کات دیارە بەو نیازەوە کە ئەمان نفوزی خۆیان بە قازانجی کورد لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا بەرهەمی خۆی بدات و بتوانێت بگات بە لانیکەمی داخوازی و داواکارییەکانی[1]، بەڵام دواتر کورد لەوە تێگەیشت کە ستراتیژیەتی خودی ئەمریکا و دۆستەکانی و دۆخە جیهانی و هەرێمایەتییەکە و سات و سەودا سیاسییەکان و بەرژەوەندییە تێکپڕژاوەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترن کە کورد و سەرکردایەتیە سیاسیەکەی وێنایان کردووە و ستراتیژیەتی دیپلۆماسیەت و پەیوەندییەکانی خۆی لە سەر دامەزراندووە.

هەروەك وتمان ئەمریکا تا ئەو کاتە پێویستی بە کێشەی کورد و یارمەتیدانی شۆڕشەکەی بوو تا ئەو کاتەی بتوانێ ئەوەی بەم دەکرێت لە دژایەتیکردنی نفوزی سۆڤیەت و بەو جۆرەی دۆستەکانی پێویستیانەو دەیانەوێت وەك کارتێ بە کاری

[1] هەرچی پەیوەندی بە پەیوەندی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردەوە هەیە لە گەڵ ئێراندا جگە لەوەی باسمان کرد هاوسنووری ئێران بە عێراقەوە و بەکارهێنانی ئێران وەك بەرەیەکی پشتەوەو ڕێگایەك بۆ پەیوەندیکردن بە دنیای دەرەوەش مەسەلەیەکی گرنگ بوون لەم پەیوەندیەدا جگە لە هەوڵدان بۆ سوود وەرگرتن لە ناکۆکی ئێران لە گەڵ عێراق لە سەر چەندین مەسەلەی جۆراوجۆر.

بهێنێت. هەربۆیە هەروەك بینیمان دوای ماوەیەك ئەمریكا دەستی لە كورد بەردا و بە گورگان خواردووی‌دا. بەڵكو زیانێكی لۆجستی و رۆحی و رێكخستنی گەورەشی لە كورد و شۆڕش و جوڵانەوە شۆڕشگێرییەكەی‌دا كە ئەو كاتە بارزانی رەحمەتی رێبەرایەتی دەكرد. ئەمیش لەو سۆنگەوە كە شۆڕش بە هۆی تێكەڵاوبوونی بەو پەیوەندییانە و ناچاربوونی مامەڵەكردنی لە گەڵ ئێرانی شاو رێكخستنی شۆڕش لە سەر بناغەی شەڕی بەرەیی و چەكداركردنی دەیان هەزار كەس و بوونی ناوچەیەكی ئازاد كراوی فراوان و ئاوارەبوونی سەدان هەزارو بوونی چەكی قورس و یارمەتیەكی دەرەكی بۆ شۆڕش. كە هەموو ئەمانە بواری مانۆڕیان بە شێوازی‌تر لە بەردەم رێبەرایەتی شۆڕشدا بەرتەسك كردبۆوە دیارە ئەم واقیع و حاڵەتە لە خۆیدا رۆشنبیری و بیركردنەوەو رۆحیەتێكی دیاریكراویش بەرهەم دەهێنێت كە دوا جار دوای گۆڕانی ستراتیژی و هاوپەیمانیەتیەكان و نەمانی یارمەتی‌یەكان ئەو حاڵەتە دەبێتە هۆكارێكی‌تری هەرەس و ڕووخان و نائومێدی.

لە پاڵ ئەمەدا ئەم هەڵوێست گۆڕین و سازش و سەودا سیاسیە چەپەڵە بەسەر كورد و بزوتنەوەكەیەوە نائومێدی‌یەكی قوڵی لە ناو جەماوەر و هێزی پێشمەرگە و تەنانەت سەركردایەتی شۆڕشیشدا دروست كرد و خەڵك هەستێكی بۆ دروست بوو كە كورد جگە لە چیاكان هیچ دۆستێكی‌تری لەو دنیایەدا نی‌یەو هیچ كەس ئامادە نییە لە ڕوانگەی بەرگریكردن لە ماف و كەرامەتی ژێر پێدراوی ئەوەوە دۆستایەتی بكات و پەیوەندی لە گەڵدا ببەستێت و دروست بكات یاخود پیی وابێ كورد دەتوانێت بەرژەوەندییەكانی بۆ بپارێزێ یاخود زیانی قورسیان لێ بدات.

بەگوێرەی ستراتیژیەتی داڕێژراوی ئەو کاتەی ئەمریکا پێویست بوو یارمەتی دانی کورد لە ڕووی ماددی و مەعنەوی و بارو زەمینەشەوە یامەتیدانێکی سنووردار بێت. ئەندازیاری داڕێژەری ئەو ستراتیژیەتە (هنری کیسنجەر) بوو مەسەلەی کوردی لە چوارچێوەی تێکڕای بارەکە لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا دانابوو ستراتیژی پەیوەندی کردن بە شۆڕشی کورد و یارمەتی دانی وەك دواتر لە دانپیانانەکانی کیسنجەرو ناوەندەکانیتری ئەمریکیدا ئاشکرا کران بریتی بوو لە:

سوود وەرگرتن لەو یارمەتی دانەی کورد بۆ سەرقاڵکردن و ماندووکردنی سوپای عێراق لە بەر ئەوە نابێت یارمەتیەکان بگاتە ئەو ڕاددەی کوردەکان لە شۆڕشەکەیاندا سەرکەون. واتە یارمەتیدانی کورد تا نزیکی سەرکەوتن و لەوێوە دەست لێبەردانیان و گێڕانەوەیان بۆ خاڵی هەوەڵ.

هەروەك لە سەر زاری کیسنجەرەوە وتراوە دەست هەڵگرتن لەو یارمەتیانە بە مەبەستی بەکارهێنانی عێراق دژی سوریا بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل هەروەك بە حەرف دەڵێ: ئێمە دەست لە کۆمەکی کوردەکان هەڵدەگرین بۆ ئەوەی عێراق بتوانێت بیپەرژێتە سەر سوریەکان و حسابی خۆیان لە گەڵدا بکات. چونکە دەوڵەتی سوریا ئامادە نیە لە دووەمین قۆناغی سنووردانان بۆ هێزەکان لە خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بەشداری بکات).[1]

[1] ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا لە سەر زاری کیسنجەر شتێکی باوەو شاراوە نیە و بۆ ئەم مەبەستە سەیری ڕۆژنامەی (اطلاعات) ی ژمارەی ڕۆژی ١٣٥٨/٦/٢ بکە.

(دکتۆر حسێن هەیکەل)یش لە سەر زمانی بەرپرسێکی ئەمریکی‌یەوە دەربارەی هەڵوێستی ئەمریکا لە شۆڕشی ئەیلول دەنووسێ: ((مەبەست لە کۆمەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ کوردەکانی عێراق ئەوە نەبوو کە بتوانن سەرکەون و لە بەرەنجامی ئەمەشدا بگەن بە خودموختاری چونکە شتێکی لەم جۆرە ئەگەری ئەوەی لێدەکرا کار لە کوردەکانی ئێران بکات و شا تووشی گێروگرفت بکەن لە بەر ئەوە دەبێت بڕی کۆمەکان بۆ کورد لە سنورێکی دیاریکرودا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بەسود وەرگرتن لەو کۆمەکە بتوانرێ سوپای عێراق لاوازو سەرقاڵ بکرێت لە لایەکی‌ترەوە ئەوەندە نەبێت کوردەکان بگەیەنێتە سەرکەوتن))(٣).

کەواتە ڕوونە ڕوانگەی ئەمریکاو ئامانجی کۆتایی دەوڵەتی ئەمریکا لەو کاتەدا لەیارمەتی دانی کوردو شۆڕشەکەی جگە لەوەی هیچ (منطلق)ێکی مرۆڤ دروستی و بەرگریکردن لە ئازادی و هەق پەروەریەکی لە پشتەوە نەبووە بەڵکو ئەو قەناعەتەشی لە پشتەوە نەبووە کە کورد گەر سەربکەوێت دەتوانێت دۆستێکی گرنگ بێت بۆ ئەمریکاو دەتوانێ ببێتە پارێزەری بەشێ لە بەرژەوەندی‌یەکانی ئەو.

بۆیە لە ڕێی زیاتر دڵسۆزی نواندن بۆ دوو دۆستە بنچینەیەکەی خۆی واتە ئیسرائیل و ئێران ئەمریکا بە کارهێنانی کورد وەکو کارتێکی گوشار بۆ زیاتر پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانی ئەوان لە بیری زۆرتر قایمکردنی شوێن پیی خۆی و وەدیهێنانی ئامانجەکانیدا بوو.

بەم جۆرە بۆ ئەوەی ئێران و ئیسرائیل (امتیازی)ی زۆرتریان دەست کەوێت لە عێراق و سوریاوە وڵاتانی‌تری ناوچەکەو مەترسی‌یە ئاسایشیەکانیشیان لە سەر

کەمتر بێتەوە، ئەمریکا لە ساتەوەختێکی دیاریکراوداو لە دیدێکی پراگماتی سیاسی ڕووت و بێگوێدانە دەریایەك خوێنی ڕژاو و مەینەتی و کوێرەوەری دەیان ساڵەی گەلێ بە زەمینە خۆشکردن بۆ ڕێکەتنامەی شومی جەزائیرو بڕینی کۆمەکییەکانی بەشداری لە ڕووخاندنی شۆڕشی ئەیلولدا کرد. هەڵبەتە ئێستا بۆچونێك لە ناو هەندێ ڕۆشنبیری توێژەرەوەی کورد لە ئارادایە کە پێی وایە مەسەلەی تواندنەوەی شۆڕشی ئەیلول پەیوەندی دارە بە ڕێکەوتنامەی (کام دیڤید) نێوان (ئیسرائیل و میسر) ەوە واتە لە بەرامبەر ئەوەی (میسر) لە بەرەی بەرەنگاری عەرەب دژ بە ئیسرائیل بکشێتەوە سەرزەوییە داگیرکاوەکانی سینای وەربگرێتەوە، ڕووخاندنی شۆڕشی کورد کراوەتە دەستخۆشانەو بژاردنی ئەمریکییەکان بۆ دنیای عەرەب تاکو میسر هەڵوێستی بەهێزتر بێت لە بەرامبەر دنیای عەرەب و ئەمریکاش بێ مەرامترو دۆستتر دەربکەوێ.

ئەم ئەزمونە تاڵەی کورد لە گەڵ ئەمریکییەکان کاردانەوەی جۆراوجۆری لە سەر واقیعی کوردی بە جێ هێشت لە لایەکەوە بەشێ لە جەماوەر توشی ڕوخاندنی دەروونی هاتن و تێکەڵاو بەو واقیعە (فاسد) ە بوون کە حیزبی بەعس و دەوڵەتی عێراق دوای ڕوخاندنی شۆڕش لە کوردستاندا هێنابویە کایەوەو مەبەستی بوو تاکو کۆمەڵگای کورد لە ناخەوە بپێکێ و خاڵەکانی هێزو بەرگری تیا بشکێنێ و (کیبریا)ی نیشتمانی تا سەر ئێسقان بریندار بکات و توشی زەلیلی و سەر شۆڕی ڕۆحی و دەروونی بکات، لە لایەکیتریشەوە بێ متمانەیی و دوودڵیەکی گەورەی بەرامبەر ئەمریکاو (مصداقیە) تی ئەمریکا لە هۆشیاری ئەو نوخبە سیاسی و

فکریەدا چاند کە دواتر هەر ئەوانە ئەرکی درێژەدان بە شۆڕش و بەرگرییان کەوتە ئەستۆ.

ڕەنگە هەڵەشمان نەکردبێت گەر هۆکارێکی گرنگی زاڵبونی مارکسیزم بە سەر جوڵانەوەی سیاسی و کوردی و ناوەندە فکرییەکەدا و تەشەنەکردنی بەو جۆرە لەحەفتاکان تا نیوەی هەشتاکان لە کوردستاندا هەر ئەمە بوو بێت و دەرخەری ئەو بێ ئومێدیە قوڵە بوو بێت کە بەرامبەر ئەمریکا وە تێکڕای خۆرئاوا لە ناو توێژە جۆراوجۆرەکان و بە تایبەتیش نوخبەی فکری و سیاسی‌دا بڵاو بۆوە. دەکرێت (تبنی) کردنی بەشێکی بەرچاوی نوخبە کوردیەکە بۆ مارکسیزم بەو جۆرەی بینرا لە پەیوەندی هەڵوێستی ئەمریکاو خۆرئاوا بەرامبەر شۆڕشی کورد سەیر بکرێت، لە پاڵ ئەوەی (تبنی) کردنی بەشێ لە نوخبە کوردییەکە بۆ مارکسیزم لە پاڵ ئەوەی کە ئەو کاتە مەدێکی شۆڕشگێڕی چەپ لە ناوچەکەدا بەهێزبوو ئەمیش چۆتە ژێر کاریگەری ئەو مەددەوە، ئاماژەیە بە چەند ئامانج و پاڵنەری‌تریش لەوانەش:

١) تۆڵە کردنەوە لە ئەمریکا وەك نوێنەری لیبڕالیزمی سەرمایەداری بە هەڵگرتنی ئایدۆلۆژیایەك بۆ شۆڕش کە لە سەر ئاستی جیهانیدا دوژمنی ئەمریکاو سەرمایەداریە.

٢) پەیداکردنی فەنتازیا و هێز و هێمایەك لە ڕووی مەعنەوی‌یەوە، کە ئەویش یەکیەتی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆسیالیستی بووە، ڕەنگە هەر ئەمەش بەشێ لە واقیعی پڕ لە ناکۆکی‌یەکەمان بۆ لێك بداتەوە کەلە کاتێکدا سۆڤیەت و زۆرێ لە وڵاتانی سۆشالیستی پشتیوانی عێراق بوون، کەچی شۆڕشی کوردی و نوخبە

فکری و سەرکردایەتی سۆڤیەتی و بزوتنەوەی کرێکاری جیهانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلان کە ئەم دوانەی دوایشیان بۆ ئەو کاتە زیاتر هەر لە سەر تەوژمی چەپ حساب کراون بە دۆستی خۆی دیاری بکات.[1]

٣) گرەوکردن لە سەر ڕۆڵی ئایدۆلۆژیا بۆ دروستکردنی گیانی بەرگری و قوربانی دان لە پێشمەرگەو تێکۆشەری سیاسی کورددا کە ناچار بووە دوای ڕووخانی شۆڕشی ئەیلول لە هەل و مەرجێکی دژوارداو بێ چاوەڕوانیەکی ئەوتۆ بۆ پشتیوانی دەرەکی ئاڵای دژایەتیکردنی هێزی زەبەلاحی دەوڵەت هەڵگرێت و سەر لە نوێ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش ڕابگەیەنێتەوە.

ئیتر لەو قۆناغەدا واتە لە قۆناغی دووبارە دەست کردنەوە بە شۆڕش بە هۆی ئاسەوارە فکری و سایکۆلۆژیەکانی پشتکردنی ئەمریکا بۆ شۆڕشی ئەیلول جولانەوەی مەشرەب چەپی کوردی لە ئەدەبیاتی سیاسی خۆیدا ئەمریکا وەك ئیمپریالیزم و دوژمنێکی خۆی دەناسێنێ.

ئیمپریالیزم و لەوانەش ئەمریکا و زایۆنیزم و کۆنەپەرستی ئەو دوژمنە نوێیانە بوون چووبوونە پاڵ ڕژێمی (بۆرژوا فاشیەکەی بەعس) لە دوژمنایەتی کردن و وەسفکردنیان بە خراپترین شێوە. ئەم حاڵەش بەردەوام دەبێت تا ناوەڕاستی هەشتاکان و بیرۆستریۆکای گورباتشۆف و بە لەرزە کەوتنی پایەکانی مارکسیزم و دۆگماکانی لە جیهان و کوردستاندا.

---

[1] گەڕانەوە بۆ بەیاننامەو بڵاوکراوەو ئەدەبیاتی هێزە چەپەکان لەو کاتەدا ئەمە دەخەنە ڕوو دیارە نابێ ئەوەشمان لە یاد بچێت کە چەپی کوردی لەم بەشەی کوردستاندا لە ژێر کاریگەری چەپی عەرەبی و بە تایبەتیش چەپی فەلەستینیدا بووە، هەربۆیە پۆلێنکردنەکانی ناو چەپیش بەشی خۆی شوێنەواری بە سەر ئەمەوە داناوە.

بۆیە دوای ئەوە ڕەنگە (هاجس)ی جارێکیتر پەیوەندی کردنەوە بە ئەمریکا سەری هەڵدابێتەوە کە بۆ ئەم خاڵە پێویستە سەرکردەکانی ڕاپەڕینی چەکداری کورد لەو کاتەدا بێنە قسەکردن و زیاتر مەسەلەکە ڕۆشنبکەنەوە. ئەم حاڵەتە کە قۆناغی ڕوخانی نموونەکانە لە سەر ئاستی ئایدۆلۆژی و سیاسی و وەدەرکەوتنی ئاماژەکانی سەرکەوتنی یەکجاریی خۆرئاوای سەرمایەداریە بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا لە جەنگی ساردا تا داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە بەردەوام دەبێت دوای ئەوە وەك دەزانین بارودۆخێکی تەواو نویێ لە عێراق و کوردستان و ناوچەکە و جیهانیشدا دێتە کایەوەو زۆریێ قەناعەت و پێوەرە پێشوەکان هەرەس دەهێنن و ئەمری واقیعی نویێ دێتە کایەوە، بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە هەڵوێستی ئەمریکا تا ساڵی (١٩٩٠) یش بەرامبەر بە کورد هەڵوێستێکی تەواو سلبی بووە بەڵکو زۆر کات یارمەتیدەری ڕژێم بووە بۆ بەرگرتن لە شەپۆلی شۆڕشی ئیسلامخوازی ئێران لە ناوچەکەدا هەر بۆیە ڕوونە کە هاوکاری ئیسلامی ئێران و هێزە کوردییەکان لە کاتی شەڕی عێراق ـ ئێراندا کەلە دوایدا گەیشتە ئاستی ئەنجامدانی عەمەلیاتی سەربازی هاوبەش، جێگای دڵخۆشی و ڕەزامەندی ئەمریکییەکان نەبووە، ئەمریکا لەو ڕۆژەدا لە بەر ئەو پێویستییە زۆرەی بە هێزێکی شەڕخوازی عێراق هەیبوو، چاوی لە تراژیدیای ژینۆساید و مەرگەساتی گەلی کورد نوقاندبوو، لە کۆنفرانسەکەی ساڵی (١٩٨٩) لە پاریس بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیاوی ئەمریکا ڕازی بوو ناوی عێراق بهێنریێ وەك هێزیێ کە چەکی کیمیاوی قەدەغە کراوی لە دژی ئێران و کوردەکان و بە تایبەتیش لە هەڵەبجەدا بەکارهێناوە.دواتر وەك لە ڕاپۆرتێکی حکومەتی ئەمریکیدا هاتووە سەبارەت هێرشی ئەنفالەکانی سوپای دڕندەی عێراقی

ئەمریکی‌یەکان ئەو سەرکوتەیان بە مافی ڕەوای حکومەتی عێراق داناوە بۆ سەرکوتکردنی یاخی بووە کوردەکان، ڕاپۆرتەکە باس لەوە دەکات کە گەرچی لە عێراقدا بە شێوەیەکی ترسناك مافەکانی مرۆڤ پێشێل دەکرێت و دیکتاتۆریەت فەرمانڕەوایە بەڵام پێویست ناکات ئێمە ئەم مەسەلانە بە بەربەست لە بەردەم بەدیهێنانی بەرژەوەندی‌یەکانی خۆمان لەم وڵاتەدا دابنێین.[1]

کەواتە دەتوانین بڵێین قۆناغی نیوەی دووەمی هەفتاکان و هەشتاکان قۆناغی بێ متمانەیی کورد بووە بە ئەمریکا و فەرامۆشکردنی بووە وەك هێزێ چاوەڕیی وەك هێزێ پشتیوانی بۆ شۆڕش لێبکرێن هەندێ جار مەسەلەکە گەیشتۆتە ئاستی دوژمنایەتی کردنیش چونکە هەشت ساڵ شەڕی خوێناوی عێراق ـ ئێران ئەمریکای لە عێراق نزیك کردەوە و ئەم نزیکردنەوەیەش گەیشتە ئاستی هاوکاری هونەری و تەکنیکی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەو کاتە ئەمریکا هەموو سەرقاڵکردن و لاوازکردنێکی عێراقی بە دژی بەرژەوەندی‌یەکان خۆی و دۆستەکانی لە ناوچەکەدا سەیر کردووە. هەر بۆیە بە جۆرێ لە جۆرەکان شۆڕشی کوردی لەم بەشەی کوردستاندا لە خانەی هەوڵدان بۆ زیانگەیاندن لە بەرژەوەندی‌یە ستراتیژەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دوژمنەکەی واتە کۆماری ئیسلامی ئێران داناوە. بە مانایەکی‌تر لەو ماوەدا ڕژێمێکی دژی ئەمریکا لە بەغدا لە سەر کار نەبووە تا ئەمریکا تەنانەت وەکو کارتیش پێویستی بە کورد و جوڵانەوەکەی بوو بێت بۆ فشار خستنە سەری، هەڵبەتە بەدەرلەوە لەو کاتەدا بۆ ئەمریکا ئاسان نەبوو داوا لە

---

[1] هەر لەو ساڵەدا سوپای پاسدارانی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش هاتنە سەر بارەگاکانی دیموکرات لە کۆیە و لە شەڕەکانی مانگی دەی هەمان ساڵیشدا تێکەڵاو بە شەڕەکان بوون.

کورد بکات واز لە دۆستایەتیکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران بێنێ چونکە جگە لەوەی جێگرەوەیەکی وا نەبوو بۆ ئەو هاوکاری و دۆستایەتییە، جولانەوەی کورد گرەوی لە سەر شەڕەکە کردبوو بۆ ڕوخاندنی ڕژێم لە عێراقدا لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا برینی دەستی ئەمریکییەکانی شۆڕشی ئەیلول سارێژ نەبوو بوو، تا کورد ئامادەیی هەبێت لە ژێر سایەی هەمان بارودۆخی جیهانیدا جارێکیتر بچێتە مەیدانی تاقیکردنەوەیەکیتر لە گەڵ ئەو وڵاتەدا.

بەم جۆرە گرەوکردنی کورد لە سەر هەڵوێست و پشتیوانی ئەمریکا لە سەرەتای حەفتاکان و سەردەمی شۆڕشی ئەیلول دا بەکارەسات بۆ کورد تەواو بوو، دوای ئەو قۆناغەو تا کۆتایی هەشتاکانیش وڵاتەیەکگرتووەکان لە دەرەوەی بازنەی هێزە دۆستەکان کوردو شۆڕشەکەی حسابی بۆ دەکراو چ جای ئەوەی گرەو لە سەر هەڵوێستی بکرێت.

### قۆناغی نەوەدەکان،هاتنە ناوەوەی دووبارەی واشنتۆن بۆناو ژیانی سیاسیکورد

هەروەك دەزانیت جەنگی کەنداوی دووەم و داگیرکردنی کوێت لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە لە زۆر ڕووەوە بە خاڵێکی وەرچەرخان دادەنرێت لەوانەش بۆ پەیوەندییەکانی ئەمریکا و کورد. ئەو گۆڕانانەی لەسەرەتای نەوەدەکاندا ڕوویاندا لە هەموو یان گرنگتریش هەرەس هێنانی بلۆکی خۆرهەلات و سەرکەوتنی دنیای سەرمایەداری بە ڕێبەرایەتی ئەمریکا بەسەر بازنەی کۆمونیزم دا هەروەها ئەو هاوپەیمانییە جیهانییەی دژی عێراق دیسان هەر بەسەرکردایەتی ئەمریکا

هاتەکایەوە، نەك هەر کاری کردە سەر گۆڕانی بەشێ لە چەمك و پێوەرەکان و ڕۆشنبیری سیاسی بەڵکو لە ڕووی مەیدانیشەوە لە چەندین ڕووەوە واقعێکی تازەی خولقاند. لێرەوە ئەم جارەیان پەیوەندی کورد بە ئەمریکاوە لەوە دەردەچێت وەك جاران پەیوەندی‌یەکی ژێربەژێر یاخود نیمچە ئاشکرا بێت و تەنها لە ڕێی هەندێ دام و دەزگای هەواڵگری و تایبەتەوە بێت، بەڵکو بەهۆی ئەو ئەمری واقیعەی لە عێراق و کوردستاندا هاتنەکایەوە ئەو پەیوەندی‌یانە نەك هەر هاتنە ڕوو، بەڵکو گەیشتنە ئاستێکی بەرز، لانی‌کەم لە ڕووی ئامادەیی و ئاستی پێشوازی کردنی سەرکردە کوردەکان لە واشنتۆندا. کە هەر ئەمە بەس بوو بۆ زانینی ئەوە کە پێوەرە کۆنەکان گۆڕانی زۆریان بە سەردا هاتووە. نوخبە سیاسی‌یە کوردییەکە کە بەرهەم هێنەری گوتاری شۆڕش و پۆلێن کردنی دۆست و دیاریکەری ئایدۆلۆژیای جوڵانەوەی سیاسی‌یەکە بوو لە بەرامبەر ئەم گۆڕانە گەورەوە هەر زوو کاردانەوەی لە خۆی نیشاندا ویستی بە (١٨٠) پلە خۆی لە گەڵ بارودۆخە نوێیەکەدا بگونجێنێ بە جۆرێ هەندێ جار لە سنوری ئاسایی و عەقڵانی خۆشی دەربچێ کە دواتر هەندێ قسە لەسەر ئەم ڕووکارە و پەیوەندییەکان دەکەین.لە پێش هەموو شتێکەوە بەشێکی گرنگ لە سەرکردایەتی شۆڕش و نوخبە سیاسی‌یەکە کە لە ڕووی مێژوویی‌یەوە لە سەر بیری مارکسیزم و چەپ حسابی بۆ دەکرا هەوڵیدا بە زووترین کات و بە هەر نرخێ بووە ئەو ناونیشانە لە خۆی بکاتەوە و لە ڕووی فکری و سیاسی‌یەوە سیمایەکی نوێ لە خۆی نیشاندا و بۆ ئەمریکای بخاتە ڕوو چونکە وای بیر دەکردەوە کە ئیتر لە چەپ بوون و مارکسی بوون بە واتا کۆنەکەی لە ڕوویەکەوە بۆتە تۆمەت و ڕێگا دەگرێت لەوەی بتوانێ بەتەواوی دەبینێ و دەستکەوتەکانی بە

گوێرەی قەبارەو ئامادەیی سیاسی و سەربازی و جەماوەری خۆی بێت. لە ڕوویەکیتریشەوە گۆڕانەکەیان لەوە گەورەترن دۆگما ئایدۆلۆژیا کۆنەکان بتوانن تەفسیریان بکەن و ڕێنوێنی هێزە کۆمەڵایەتیەکە بکەن بەرەو گەشەکردن و دەسکەوتی زیاتر و سەرەنجام سەرکەوتن.

هەر لەو سەروبەندەدا یەکیەتی نیشتمانی کوردستان و هەندێ هێزێ چەپیتر (تبنی) ڕێبازی سۆسیال دیموکراتیان کردوو هەندێ جار بە پەرۆشی و گەرمییەکی زیاترەوە بە بەراورد لە گەڵ هەندێ هێزیتری گۆڕەپانەکە باوەشیان بۆ چەمك و پێوەرە نوێکان کردەوە و موجامەلەی بارە نوێکەیان کرد لە سەر ئاستی ناوەندە فکریەکەش کە دیارە ئەویش لەو کاتەدا تا ڕاددەیەکی زۆر لە گەڵ کایە سیاسییەکەدا تەماهی کردبوو مەسەلەو چەمك و تێزی نوێ هاتنە ناو فەرهەنگی ئێمەوە. وەك پێداگرتن لە سەر بە سەرچوونی سەردەمی ئایدۆلۆژیاو بانگەشە کردن بۆ وەدەرنانی ئەم چەمکە لە ژیانی فکری و سیاسی و قسەکردن لە قۆناغی پاش ئایدۆلۆژیا هەروەها قسەکردن لە سەر بازاڕی ئازادو سیستمی نوێی جیهانی و دیموکراسی و کۆمەڵگای مەدەنی و....هتد بەڵام ئەگەر توێژەرێکی ڕەخنە گر بگەڕێتەوە بۆ ئەو نوسینانەی لەو کاتانەدا لە سەر ئەو بابەتانەو هەندێ مەسەلەیتریش نوسراون زۆر بە ئاسانی لەوە تێدەگات کە ئەو نوسینانە پاشخانێکی فکری قوڵ و ستراتیژیەتێکی ڕۆشنبیری یاخود سیاسی تاووتوێکراویان لە پشتەوە نەبووە، بەڵکو زیاتر کاردانەوەیەکی بە پەلەپڕوزە و لە خێرا و تەنانەت ڕوکەشیش بوون بەرامبەر ئەو بارودۆخە تازە و هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەوەی کە دەتوانین لە

گەڵ گۆڕان و پەرەسەندنەکاندا خۆمان بگونجێنین و ڕۆشنبیری و دیدگاکانمان تازە بکەینەوە. واتە زیاتر وەك مۆدێلیّ مامەڵە لە گەڵ ئەو چەمکانەدا دەکرا.

ئەم مامەڵەش بیّ پەیوەندی نەبوو لە گەڵ ئەو پاشخانە فکرییە کۆنەی ئەو نوخبە کە بە شێوەیەکی گشتی مارکسیزم پێکهێنەری بوو واتە هەروەك چۆن لە سەردەمی برەوی مارکسیزم و سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕدا پێشکەوتن خۆی بوو بووە ئایدۆلۆژیایەکی فەرعی و هەڵگرتنی هەندیّ دروشم و بەرگریکردن لە هەندیّ تێزو پرەنسیپ و تەنانەت وڵات و بلۆکیش ببوونە ڕەمزی ئەو پێشکەوتنەو هەر ئەمەش وەك پێوەری زاراوەی دواکەوتن و کۆنە پەرستی هێنابوە کایەوە هەر بەم جۆرەش بەڵام لە پرۆسەیەکی تەواو پێچەوانەدا کۆمەڵیّ چەمك و پێوەری نویّ لانیکەم سەبارەت بە ناوچەکەو ئێمە - بەم ناوەڕۆکە تازەیەوە - ئەم دەورەیان دەبینیّ ئیتر ئەگەر تا دوێنیّ ئەوانەی باوەڕیان بە سەرەتا مارکسیستییەکان نەبووایە دەچونە بەرەی کۆنەپەرستی و دژی شۆڕش و پێشکەوتنەوە، ئەوا دوای ئەم قۆناغەش هەر کەس گومانی لەم چەمکە نوێیانە بکردایە یەکسەر دەچووە خانەی کۆنەپەرستانی قۆناغە نوێکەوە. دیارە خوێندنەوەی میکانیزمەکانی کارکردنی ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسییەکە لە ساتە وەختێکی ڕاگوزەری نیمچە پاشا گەردانی وا ناسکدا لە سەر ڕاوەستانی زۆری دەوێت و دەبێت توێژەر بە چەکە زانستییەکانی خۆیەوە بۆی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو بونیادو ڕەگەزە کارایانەی ئەو ڕۆژگارە کەشف بکات و دەستنیشانی سروشتی کارو قەیرانی پرۆسەی گواستنەوەکەو نیمچە فەوزا فکرییەکە بکات.

هەڵبەتە پێش وەستان لە سەر ئەو ڕەنگدانەوانەی ئەم پەیوەندییانە لە سەر ئاستی فکرو ئایدۆلۆژیا و شوناسی سیاسی هێزەکان دروستیان کرد هەروەك ئامارەمان پێکرد دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لەحزەی ڕاپەڕین و ئەو چەند مانگەی پێش ڕاپەڕین. ئەو کاتەی کە ڕژێمی عێراق کەوتە ناو زەلکاوی کوێتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ قەیرانەکانی لە ڕووی سیاسی و سەربازی و ئابوری و کۆمەڵایەتی‌یەوە بەرەو قوڵبوونەوە دەچوون و بڕیارە یەك لە دوای‌یەکەکانی نەتەوەیەکگرتوەکان و ئەنجومەنی ئاسایش لە دژی ئابلۆقەیەکی توندیان خستبووە سەری. ئاساییە لە دۆخێکی وادا جارێکی‌تر کورد گەر بە سیفەتی کورد بوون و خاوەن کێشەیەکی نەتەوەیش نەبێت بە سیفەتی ئەوەی بەشێکی گرنگە لە موعارەزەی عێراقی و ڕژێم بچێتەوە ناو بازنەی بایەخ پێدانی ئەمریکاوە، واتە گەر بەگوێرەی سەرەتای (دوژمنی دوژمنەکەم دۆستم)ەش بوایە هەردووکیان پێویستیان بەوە بوو کەناڵێکی نوێی پەیوەندی لە گەڵ یەکدا بکەنەوەو دابمەزرێنن و دوای پچڕان و لە یەك دووری و ڕاڕاییەکی چەندین ساڵە وورده وورده هەوڵی دروست کردنەوەی ئەو پردانەی نێوانیان بدەنەوە. دیارە سەرکردایەتی کوردی پێویستی‌یەکی زۆتری بە ئەمریکا بوو بە سیفەتی ئەوەی کە ئەم خاوەنی کێشەیەکی سیاسی ئاڵۆزەو ئەمریکاش بۆتە تاکە زلهێز و لەوەش گرنگتر بەهۆی دەست درێژی ڕژێم بۆ سەر کوێت و ئەو ئاسەوارانەی لێی کەوتۆتەوە تێکەڵاو بە دۆسیێی عێراق بووە. بەڵکو پەیوەندی عێراق و ئەمریکا گەیشتۆتە ئاستی دوژمنایەتی کردنی یەکتر. ئەمەش بۆ کوردو جوڵانەوە سیاسی‌یەکەی کە لە کۆتایی هەشتاکاندا دووچاری شکست و کارەساتێکی گەورە هاتبوو بە دەرگا لێکرانەوەیەکی گرنگ دەهاتە ئەژماردن.

بەدەر لەم پێویستیەش مەسەلەی مامەڵە کردن لە گەڵ ئەمریکا بوو بووە ئەمری واقیع، ئەمریکا هاتبووە بەردەمی مامەڵەکەمان. ئەمریکا چیتر ئەو دەوڵەتە نەمابوو لە دوورەوە سەیری ڕوداوەکان بکات و لە ڕێی لایەنی دووەم و سێیەمەوە کار لە دۆخەکان بکات بەڵکو خۆی ڕاستەخۆ هاتبوە ناوجەرگەی ڕووداوەکان و هێڵە گەرمەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە. کەدواتر ئەم ئامادەبوونە لە پاڵ هەندێ دەوڵەتی‌تری خۆرئاوایدا لە پێش هەمووشیانەوە بەریتانیا و دواتر فەرەنسا شوێنەواری ماددی لە سەر زەوی بە جێهێشت و هەلومەرجێکی تەواو تازەی سەبارەت بە کورد لەم بەشەی کوردستاندا هێنایە کایەوە. ئەمریکا دوای شکست هێنان بە سوپای عێراقی و لە کوێت و بەڵکو پێش ئەوە و لە کاتی شەڕەکە و پێشتریش بە ئاشکرا داوای لە گەلی عێراق بەکورد و شیعە و پێکهاتەکانی‌تریەوە دەکرد، تا ڕاپەڕن و بەڕووی دام و دەزگاکانی ڕژێمدا بچنەوە و دڵنیاش بن لەوەی ئەمریکا پشتیوانی لە ڕاپەڕینەکەیان دەکات بە مەبەستی ڕزگار بوون لە دیکتاتۆریەت و فەرمانڕەوایی بەعسیەکان لە عێراقدا. لە بەرەنجامی قوڵبوونەوەی ناکۆکیە مێژووییەکانی نێوان گەل و دەسەڵات کە ستەم و چەوساندنەوە و سەرکوت دروستی کردبوو، هەروەها بەهۆی لاوازبوونی سوپای عێراق و کەمبوونەوەی سامی دەوڵەت و تێکۆشانی هێزە نەیارەکان و هەستکردن بە پشتیوانی و پێ خۆشبوونی تازە زلهێزی دنیا بۆ ڕاپەڕین. سەرەنجام گەلی عێراق لە باشورو کوردستاندا ڕاپەڕینی خۆی بەرپا کرد، بەڵام بەهاری ڕاپەڕین تەمەنی کورت بوو بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی سەرکردایەتی سیاسی موعارەزەوە لەوانەش کورد و چاوەڕوانی خەڵك لە ئەمریکا، کاتێ خەڵکی ڕاپەڕیو گەمارۆی سەر ڕژێمیان تەنگ کردەوەو لە هەرەسی یەکجاری نزیکیان کردەوە، ئەمریکا لە ترسی

ئەوەی رژێمێکی نوێی وا نەیەتە سەر کار کە جێگای دڵخوازی ئەو نەبێت، هەروەها لە روانگەی پێویستی‌یە ستراتیژە دوور مەوداکانیەوە بۆ هێشتنەوەی رژێم بۆ ماوەی چەندین ساڵی‌تر بەم جۆرە، نەك هەر ئامادە نەبوو هیچ یارمەتیەکی راپەڕیوەکان بدات، بەڵکو بە رێگا پێدان و چرای سەوز هەڵکردن بۆ رژێم بۆ هەڵساندنی فرۆکە جەنگی‌یەکانی بەتایبەتیش هەلیکۆپتەرەکان و هەروەها بەکارهێنانی تانك و زرێپۆشەکانی بووە هۆی ئەوەی راپەڕین شکست بێنێ و دووبارە رژێم دەسەڵات بە سەر زۆربەی عێراقدا پەیدا بکاتەوە و مەسەلەکە بە کوشتنی دەیان و سەدان هەزار کەس و ئاوارەبوونی ملیۆنانی‌تر کۆتایی پێ بێت. ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا سەر لە نوێ گومان و دوو دڵی بۆ سەرکردایەتی کورد و جەماوەریش درووست کردەوە. ئەو قەناعەتەی بوژاندنەوە کە تەنانەت دوای هەموو ئەو گۆڕانانەش کە ڕویانداوە هێشتا سروشتی ئەمریکا زۆر نەگۆڕاوە و گرەو لە سەر پشتیوانی ئەو ناکرێت و ئامادەیە لە پێناو بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیدا هەموو کارێ بکات و لە ناسکترین قۆناغ و باردا پشتمان بەربدات و بەمەش توشی کارەساتمان بکاتەوە، بەڵام ئەم بێ‌متمانەییەی ئەمجارە وەك شۆڕشی ئەیلول درێژخایەنی بە جێ نەهێشت نەبووە هۆی ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ ئەمریکاو جووڵانەوەی کورد لە یەکتر دابڕێت. ئەویش هەروەك ئامازەمان پێکرد لە بەر ئەوەی گۆڕانی چۆنایەتی گرنگ لە ناوچەکە و دنیادا ڕوویاندابوو، هەرێمی کوردستانیش بەشێ بوو لەو عێراقەی کە ئەمریکا لەوێدا سەرقاڵی داڕشتنی ستراتیژەکانی و داڕشتنەوەی ناوچەکەو چەسپاندن و بەهێزکردنی پایەکانی سیستمە جیهانیەکەی بوو لەبەرئەوە نەدەکرا ئەمریکا بەتەواوەتی واز لە کورد بێنێ چونکە گەر وەك و کارتێکی فشاریش بێت بۆ سەر

دەسەڵاتدارێتی عێراقی پێویستی پێی بوو ئەمە جگە لەوەی کێشەی کورد چووبووە قۆناغێکی نوێوە ئەمریکا لەوە دەترسا کە ئەو بۆشاییەی لە فەرامۆشکردنی ئەمەوە پەیدا دەبێت هێزە هەرێمایەتی‌یەکان و تەنانەت هەندێ هێزی ئەورووپیش پڕی بکەنەوە. سەرەنجام ئەم حاڵەتەش ببێتە کۆسپ لە بەردەم بەرەوپێشچوون و ڕاپەڕاندنی سیاسەتەکانی واشنتۆن لە عێراق و ناوچەکەشدا. گەر چی پێ ناچێ ئەو ئەمری واقیعەی دواتر لە کوردستاندا هاتە کایەوە، واتە کشانەوەی هێزەکانی عێراق و کشانەوەی دام دەزگا ئیداریەکان و دواتر زەمینە ساز بوون بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حوکمەتێکی خۆماڵی و بەشێ بوو بێت لە نەخشەکان ئەمریکا لە عێراق و کوردستاندا چونکە جگە لەوەی بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ سەلماندنی ئەمە لەبەردەستدا نییە، هەروەها پەرەسەندنی ڕووداوەکانیش لەو ساتە وەختانەدا دووبارە ئەوەمان بۆ دووپات دەکەنەوە کە شتێکی لەم جۆرە هەنگاوێکی بیر لێکراوەی نەخشە بۆ داڕێژراو نەبووە لە لایەن واشنتۆنەوە ئەویش لە بەر هۆیەکی زۆر سادە بریتی‌یە لەوەی ئەمریکا بەناوی بەرگریکردن لە گەلی کوردستان و کەمکردنەوەی مەینەتی‌یەکانی چارەسەر کردنی کێشەکەی نەهاتبووە ناوچەکەو عێراقەوە. بەڵکو دەستدرێژی عێراق بۆ سەر کوێت و ستراتیژە دوور مەوداکانی خۆی لە دوای لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی بلۆکی ڕۆژهەلات و سەرکەوتنی لە شەڕی ساردا ئەو هۆکارانە بوون کە ئەمریکایان وا لێکردبوو بەو جۆرە بێتە سەر خەت. بە واتایەکی‌تر مەسەلەی کورد و ئەو واقیعە نوێیەی لە هەرێمی کوردستاندا هاتبووە کایەوە دەرهاویشتنێکی تێکڕای ڕەوش و گۆڕانکاری‌یە خێراکان بوو. نەك بەرئەنجامی داڕشتنی ستراتیژیەتێکی کاربۆکراو لە لایەن ئەمریکاوە.

بەڵکو لەوەش زیاتر ئەوەی لەو سەروبەندەدا لە زاری سەرۆککۆمار بۆشەوە دەبیسترا ئەوەبوو کە ئەو ئامادە نی‌یە لە پێناو گەلی عێراق و گەلی کوردستاندا خوێن لە لوتی سەربازێکی بێت. ئەو واقیعە تازەی هاتەکایەوە تا ڕادەیەکی زۆر بەرهەمی کۆڕەوە ملیۆنی و مێژوویی‌یەکەی خەڵکی کوردستان بوو. کۆڕەوەکە بۆ یەکەم جار لە ئاستێکی بەربڵاودا کوێرەوەری و بێ مافییەکانی کوردی گەیاندە میدیای جیهانی و ڕای گشتی بە ئاوڕلێدانەوەو شێوە چارەسەرێکی خێرا دەکرد.

لەو کاتەدا ئەمریکاو هاوپەیمانە خۆرئاواییەکانی لە زۆر ڕووەوە بوونە جێگای سەرزەنشت کردن بە تایبەتیش لەو ڕووەوە کە ئەمریکی‌یەکان هانی کوردەکانیان دابوو بە ڕووی ڕژێمدا ڕاپەڕن، کەچی کاتێ ڕاپەڕین و دام دەزگاکانی ڕژێمی عێراقیان لە هەرێمەکەیان دەرپەڕاندن و گەل بووە سەروەری هەڵوێستەکە، نەك خیانەتی بەو خەڵکە کرد، بەوەی دەستی لێبەردان و وادە و بەڵێنەکانی لە گەڵدا نەبردنە سەر، بەڵکو بە کردەوە چرای سەوزی بۆ هێزە سەرکوتکەرەکانی دەسەڵاتدارانی بەغدا هەڵکرد بۆ ئەوەی ڕاپەڕینەکە داپڵۆسن سەرکوتی بکەن. بەمەش کوردەکان دووچاری ئەو مەرگە سات و ئاوارەیی و تراژیدیا گەورەیە بوون کە لە کۆڕەوی ملیۆنی خەڵك و بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵ و زێدی خۆیاندا بەرجەستە بووبوو. لەو کاتەدا شارەزایی مێژووی ئینگلیزییەکان فریای ئەمریکی‌یەکان کەوت و پێشنیاری دیاریکردنی ناوچەیەکی دژە فڕین لە کوردستاندا بوە ئەو هۆکارەی لێرەوە هەندێ لە (احراج) ییەکان لەبەردەم ڕای گشتی و دۆستەکانیدا کەم بێتەوەو جارێکی‌تریش سەرەداوەکانی مەسەلەی کورد لە عێراقدا بگێڕێتەوە دەستی خۆی بۆ ئەوەی هیچ پرسێ لەم وولاتەدا نەبێت لە دەرەوەی ویستی سیاسی ئەوەوە ئاراستە بکرێت.

هەڵبەتە ناوچەی ئارامیش لە سەر بناغەی چارەسەری کێشەی کورد وەك کێشەیەکی سیاسی نەهاتبوە دامەزراندن چونکە تەنها بەشێکی کوردستانی دەگرتەوە تەنانەت شارێکی سەرەکی کوردستان کە سلێمانی‌یە نەدەکەوتە سنووری ئەو هێڵانەی ناوچەکەی دیاریدەکرد. واتە لا لێکردنەوەکە بۆ کورد لە لایەن خۆرئاواوە لالێکردنەوەیەکی مرۆڤ دۆستانە بوو نەك سیاسی. هەر لەو میانەدا فەرەنساش بە پێشنیار کردنی بڕیاری (٦٨٨) ڕەهەندێکی‌تری بەخشییە پرۆسەی لالێکردنەوە و یارمەتیدانی بە ئەندازەیەکی سنوورداریش هەندێ مۆرکی سیاسی بە کێشەدا،[1] بەڵام ئەگەرچی یارمەتیدانەکەی خۆرئاوا مرۆیی بووە ناوچەی ئارام زیاتر لە ئۆردوگایەکی پەناهەندەکان دەچوو بۆ پاراستنیان لە دەست هێرشی هێزەکانی ڕژێم لە کۆتایدا بەرەنجامی سیاسی لێکەوتەوە. جارێ هەر لە بنەڕەتەوە گەرچی پاڵنەری دروست کردنی ناوچەی ئارام لە لایەن ئەمریکاوە سەبارەت بە کورد، سیاسی نەبوو بەڵام خودی پرۆسەکە واتە بە زۆر دابڕینی ناوچەیەك لە وڵاتێکی خاوەن سەروەری و قەدەغەکردنی هاتنە ناوەوەی هێزەکانی ئەو وڵاتە بۆ ئەو ناوچەیە لەم ڕووەوە لە

---

[1] ڕاستە (جندالاسلام) هەر لە سەرتاوە شەڕیان دژی هێزە عەلمانیەکان و بە تایبەتیش یەکێتی ڕاگەیاند و هەڵوێستێکی دوژمنانەیان نیشاندلو هەڕەشەی بەرپا کردنی شەڕیان دەکرد، هەروەها ئەوەش ڕاستە کە بەعەقڵێکی تەکفیرییەوە دەیانڕوانیە جیهان و دەوروبەری خۆیان بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا لە قۆناغەکانی پێشووتری شەڕی ناوخۆدا گەر بەو خەستیەش نەبوو بێت تەکفیرکردن هەر هەبووە. هەوڵی تیرۆرکردنی لێپرسراوانیش لە لایەنە بەشدارەکانی شەڕی دژی یەکتر لە ئارادا بووە چەندین کەسیش لەو نێوەندەدا تیرۆر کراون بەڵام هەموو ئەوە نەبوتە هۆی هاتنە ناوەوەی زاراوەی ترۆرو بەو بەربڵاوی‌یە بۆ ناو ئەدەبیاتی سیاسی کوردی بەو جۆرەی ئێستا دەیبینین. بۆیە پێموایە ڕووداوەکانی ( ١١/ سێبتەمبەر ) و ئەو دەست درێژی‌یە تیرۆرستیەی کرایە سەر ( نیۆرك و واشنتۆن ) و ئەو دۆخەی دوای ئەو هاتە کایەوە دەوری زۆریان هەبوو لە سەر ئەو کارکردنە بەر بڵاوەو بە کوردی کردنی باسی تیرۆرو پێدانی پانتاییەکی بەرچاو لە میدیای کوردی و بە تایبەتیش لە ڕاگەیاندنی یەکێتی نیشتمانیدا. پێم وایە هەر ئەمەش کاری کردە سەر ئاڵۆزترکردنی چارەسەرەکان بە جۆرێ گیانی سەدان خەڵکی بێ بەشی ئەم وڵاتە لەم نێوەندەدا بوونە قوربانی.

ناوەڕۆکدا سیاسی بوو بەڵکو گۆڕان بوو لە چەمکە سیاسی‌یەکان و یاسای گشتی نێودەوڵەتی و بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا و پێشینەیەك بوو بۆ دەستێوەردان بەناوی دەستێوەردانی مرۆڤ دۆستانە لە کاروباری ناوخۆی وڵاتاندا. بۆ کوردیش کە خۆی لە ڕێی ڕاپەڕینی دووەمەوە بەشدار بوو لە هێنانەکایەی ئەو ئەمری واقیعە هاتە کایەوە. بەرەنجامی سیاسی گرنگی لێکەوتەوە هەر ئەو کاتە بوو بۆ یەکەم جار لە مێژووی هاوچەرخی کوردستان و دوای دەیان ساڵ خەباتی شاخ بەشێکی زۆری نیشتمانەکەی لەوانەش سێ پارێزگای گەورەی کوردستانی کەوتە دەست و سەر زەویەکی ئازاد کراوی دەسەڵاتی ڕژێم بۆ پەیدابوون کە دواتر بە هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی حکومەت ئەمری واقعێکی نوێتری تێدا هێنایە کایەوە.

لێرەوە جارێکی‌تر ئەو هەستە لە کوردستاندا دروست بوەو کە خۆرئاواو بەتایبەتی ئەمریکیەکان ئێمە دەپارێزن و لە سایەی ئەو ناوچە ئارام و دژە فرینەی ئەوانیش سەپاندوویانە دەتوانین بەم جۆرە لە هێرش و پەلاماری هێزەکانی ڕژێم پارێزراو بین و مومارەسەی حکومڕانیەکی خۆماڵی بکەین.

بەڵام ئەو (هاجس)ەی کە ئەمریکا و خۆرئاوا لە دیدێکی سیاسیانەوە ناڕواننە کێشەی کوردو تەنها لە دیدێکی مرۆڤ دۆستانەو خێرخوازیانەوە مامەڵەی لە گەڵ دەکەن هەر ئامادە بوون. سەرەڕای ئەوە کوردو جوڵانەوە سیاسی‌یەکەی هەر دڵخۆش بوون بەو کرانەوەی بەڕوو ئەمریکا و ئەورووپادا هاتبووە کایەوە ئەو هەستەش لایان سەری هەڵدابوو کە کێشەی کوردستان لە فۆڕمە کۆنەکەی جارانی هاتۆتە دەرەوەو جارێکی‌تریش ناچێتەوە ناو ئەو فۆڕمە. ئیتر ئاسان نیە

دەسەڵاتێکی زۆردار کورد دووچاری کۆمەڵکوژی کات و پرۆسەی ژینۆسایدی بەسەردا جێبەجێ بکات و کەسیش دەنگی نەبیستێ بە تایبەتیش کە بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای داماڵینی چەکە کۆکوژەکانی عێراقی دەکردو لە سەردەمی دەستێوەردانی مرۆڤ دۆستانەی دەستکەوتەکانی جیهانگیری ڕاگەیاند و پەیوەندییەکان و شاردنەوەی گەورەکان و پرۆسەی بە کۆمەڵکوژیەکان دەبێتە کارێکی یەکجار قورس. بەس ئەو قەناعەتە هێشتا بەو ڕەهاییەش نەبوو کە بوار بۆ دوودڵی نەهێڵێتەوە یاخود ترس لە ئەگەرو پێشهاتە چاوەڕوان کراوەکان لە لایەن دەسەڵاتێکی دڕندەی وەکو دەسەڵاتی بەعس بەتەواوەتی لای کورد بڕەوێنێتەوە یاخود بە تەواوی دڵنیا بن لەوەی لە ساتە وەختێکی دیاریکراودا ئەمریکییەکان وەکو جارانیتر وازیان لێناهێنن و یاخود هیچ نەبێت ئامادە نابن لەم ئاستەی ئێستادا مامەڵە لە گەڵ کورد و جوڵانەوە سیاسییەکەی بکەن. ئەوەش کە دوودڵی بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد و ناوەندە جەماوەرییەکە دروست دەکرد، نا ڕۆشنی هەڵوێست و سیاسەتەکانی ئەمریکا بوو لە مەڕ عێراق هەروەها مەترسی بوو بەرامبەر ڕۆڵی تورکەکان چونکە بڕوا وابوو ئەمریکییەکان لە چاوی تورکیاوە دەڕواننە کوردستانی عێراق و تورکەکانیش چاویان بەم ئەزمونەی کوردستانی عێراق هەڵنایەو لە پەرەسەندنی کێشەی کورد لە وڵاتەکەی خۆیاندا دەترسن. هەر بۆیە دەیانەوێ لە کوردستاندا بناغەی هیچ جۆرە قەوارە و تاقیکردنەوەیەکی خۆبەڕێوە بردن و هەستی جیاوازبوون دروست نەبێت. دواتریش هۆکارێکیتر هاتە پاڵ ئەو هۆکارانە کە ئەویش شەڕی ناوخۆی نێوان دوو هێزە دەسەڵاتدارەکەی کوردستان واتە پارتی و یەکیەتی بوو. هەروەها ئەو دەستێوەردانە هەرێمایەتی و پەشێوی و شپرزەییەی ئەو

شەڕو ناکۆکییە خوێناویە لە گەڵ خۆیدا هێنای. شەڕو ناکۆکی ناوخۆو ڕۆشن نەبوونی هەڵوێست و ستراتیژیە نێودەوڵەتی‌یەکەی لە مەڕ عێراق یاخود بڵێین حساب بۆ کردنی وەك ئەگەرێك چونکە لە قۆناغێکدا هەست دەکرا سیستمی سزاکان وردە وردە بەرەو پوکانەوەو داخوران دەچێت و ڕۆژبەڕۆژ ئەو دەنگانەش کە داوای هەڵگرتنی ئابلۆقەی سەر عێراق دەکەن لە زیادبووندان و پەیوەندییە هەرێمایەتیەکانیشی بەرەو باش بوونەوە دەچێت، هەموو ئەمانەی باسمان کردن و هەندێ هۆکاری‌تریش، کارێکیان کردبوو کە هێزە کوردیە سەرەکییەکان کە لێرەدا مەبەست پارتی و یەکێتیە وەك دوو هێزی دەسەلاتدار هەوڵی هێشتنەوەی جۆرێ لە پەیوەندی لە گەڵ ناوەندا بدەن. تەنانەت وەکو کارتێکی یەدەگی یەکلایی کردنەوەی ناکۆکی‌یە ناوخۆکانیش حسابی بۆ بکەن کە بەکردەوەش لە ناوە ڕاستی نەوەدەکاندا عێراق بە مەیدانی لە ڕێی هێزە چەکدارەکانیەوە بە گەرمی هاتە ناو ناکۆکی و ململانێکانی ئەو کاتەی شەڕی ناوخۆو تانك و زرێپۆشەکانیشی سنوری هەرێمی کوردستانیان بڕی و هاتنە ناو پایتەختی هەرێمی کوردستانەوە، دیارە لێرە هەڵچوون و داچونی ئەو پەیوەنیانەو جیاوازی هێزەکان و جۆراوجۆری پاڵنەرەکان بواری قسەکردنی ئێمە نین.

**گرەو کردن لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا و بەکارهێنانی پەیوەنییەکان لە گەڵیدا وەك کارتێ لە ململانێی نێوان هێز و تەوژمە ناوخۆییەکاندا**

ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد تا ڕادەیەکی زۆر باسکردن بوو لە گرەوکردن لە سەر هەڵوێستی ئەمریکاو هەوڵدان بۆ دروستکردن و بەهێزکردنی پەیوەندی لە گەڵیدا لە سەر ئاستی کێشەی کورد و مەسەلە نیشتمانیە گەورەکان. یاخود لانیکەم کە هێزێکی دیاریکراویش لەم میانەدا چالاك بووبێت لە ژێر ناونیشانی دۆست پەیداکردن بۆ کێشەی کورد و خەباتی دیپلۆماسی کوردی ئەنجامی داوە. واتە سەیر کردنی مەسەلەکە و باڵانسی پەیوەندییەکە لەو سۆنگەوە بووە کە ئەمریکیەکان دەتوانن چی بکەن بۆ کورد؟ یاخود لانیکەم تا چەند ئامادەن لێی تێبگەن و دژی خواستە ڕەواکانی نەوەستنەوەو لە ڕێی ڕاگەیاندن و زانیاری دەزگا هەواڵگری و بەرپرسی ئەو ناوەند و دەوڵەتانەوە نەڕواننە کێشەکەی کە لە ڕووی مێژوویی و واقعی یەوە دوژمنی کوردن و ستراتیژی بنەڕەتیان شێواندنی ڕاستی کێشەی عادیلانەی گەلی کوردستان و گومان دروست کردنە لە سەر دروشم و شوناس ئەنجامەکانی جوڵانەوە سیاسیەکەی، بەڵام لە دوای ڕاپەڕین و هاتنە ناو شاری هێزەکان و سەر هەڵدانی ململانێی سیاسی لە سەر دابەشکردنی دەستکەوتەکان و جیاوازی دیدگاکان لە سەر هەڵسەنگاندنی واقیعەکە و پۆلێنکردنی دۆست و دوژمنەکان و جۆری ئەو سیاسەتەی کە پێویستە بگیرێتە پێش لە پاڵ جارێکیتر سەربەرز کردنەوەی هۆکار و کینە و مێژووییەکان و چەندین شتیتر بوونە هۆی ئەوەی کە ئیتر مامەڵە کردن لە گەڵ

ئەمریکا بە تەنها لە سەر ئاستی ململانێی کورد لە گەڵ داگیرکەرانی عەمەلی نیشتمانەکەیی و ڕژێمە سەرکوتکەرەکانی دەستی بەڵکو شۆڕ بێتەوە بۆ ئاستی پەیوەندییە حیزبییەکان و کێشمەکێشی تەوژمە کۆمەلایەتی و فکرییە جۆراوجۆرەکان، بەڵام سەرەڕای بوونی ئەم واقیعە کە لە هیچ چاودێرێکی باری کوردستان لەو چەند ساڵەی ڕابردوودا شاراوە نیە کەچی ئەم فۆڕمەش لە پاڵنەرو مامەڵە کردن لە گەڵ ئەمریکادا دیسانەوە لە زۆربەی کاتدا هەر ژێر پەردەی پێداویستی کاری نیشتمانی و ئیش کردن بۆ کورد و کێشەکەی بازاڕی بۆ پەیدا کراوەو پاساوی بۆ داتاشراوە. بە تایبەتیش ئەگەر ئەو واقیعە تاڵەمان لە بیر بێت کە لە حیزبی کوردی گەر ترازیدیاشی خولقاندبێ لە هەموو لەحزەو ساتەکاندا تەماهی لە نێوان خۆیی و نیشتمان و گەلدا دروست کردووەو سەرجەم هەنگاوەکانی بەو بیانووەوە ناوە کە گوایە نیشتمان و گەل و جوڵانەوە سیاسییەکەی وا دەخوازن: (جۆرە گرەوکردنی هێزەکان کە وەك ووتمان لێرەدا زیاتر مەبەست یەکیەتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتە چونکە هەر ئەوان بوون کە ڕایەڵەکانی پەیوەندی کوردیان لەم هەرێمەدا لە ژێر کۆنترۆڵدا بووەو باری مەیدانیان و ئەمری واقیعەکەی کوردستان و مێژووش ئەو زەمینەی بۆ ڕەخساندبوو کە لە پێگە ڕەسمی و یا نیمچە ڕەسمییە دا ئەو ڕۆڵە سیاسییە ببینن).

حیزبی کوردی لەم قۆناغەداو لە سۆنگەی ڕاکێشانی سۆزی ئەمریکا بە لای خۆیدا لە کێشە ناوخۆییەکاندا هەوڵیداوە لای ئەمریکا بۆ حیزبەکەیتر تێبینی و گومان لە سەر (مصداقیە) تی دروست بکات و بیسەلمێنێ کە لە بازنەی ستراتیژیەتی هێزێکی هەرێمایەتی دژی ئەمریکی و لە ژێر هەژموونی ئەودایە یاخود پەیوەندی لە گەڵ

بەغدا لە پێش پەیوەندییەکانی لە گەڵ واشنتۆن‌دا سەیر دەکات و پێی وایە کە سەرەنجام کێشەی کورد دەبێت لە ناوەندە چارەسەر بکرێت و دیالۆك لە گەڵ ئەم ڕژێمە ئێستا ڕەت ناکاتەوە کە سەرەنجام ئەم بیرکردنەوەش جارێکی‌تر کێشەی کورد لە بە نێودەوڵەتی بوونەوە دەگەڕێتەوە بۆ نێو سنوورەکانی عێراق، ئەمەش پێچەوانەی ستراتیژییەتی ئەمریکایە لە عێراق و ناوچەکەدا کەدەیەوێت کێشەو مەرگەساتی کورد وەك کارت و بەشێ لە قەیرانی عێراق بۆ درێژەدان بە سیاسەتەکانی خۆی و درێژ کردنەوەی سزاکان و شەرعیەتدان بە هەر ڕێ وشوێنێ کە دەیەوێت لە دژی ڕژێم بگرێتەبەر و بەکاری بهێنێت. بەکارهێنانی کارتی پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکا لە نێوان دوو هێزەکەی کوردستاندا هەر لەم سنورەدا نەوەستا واتە لە چوارچێوەی هەوڵدان بۆ قایل کردنی ئەمریکا کە هەریەکە لەوی‌تر زیاتر دەتوانێ تێگەیشتنی بۆ بەرژەوەندی‌یەکانی هەبێت وەك لە هێزەکەی‌تر بەڵکو ئەو سنورە دەبەزێنێ بۆ بازنەی هێزە هەرێمایەتیەکان بەڵام هەر بەهەمان پاڵنەرو لە چوارچێوەی هەمان سیاسەتدا واتە سیاسەتی گرەوکردنی هێزەکان لە سەر پەیوەندی ئەمریکاوە بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستی سیاسی و سەربازی و مەعنەوی خۆی.

ئەگەر لەپەڕەکانی شەڕی ناوخۆ هەڵبدەینەوەو لە سەر برگە مێژووییەکان و تاکتیك و مانۆڕە سیاسی و سەربازی و دیپلۆماسی و ڕاگەیاندنەکانی بوەستین هەست دەکەین کارتی پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکاو ترساندن بە نزیك بوونەوە لە گەڵ ئەمریکا لە لایەن هەندێ هێزەوە بەرامبەر هەندێ هێزوو دەوڵەتی هەرێمایەتی بەرز کراوەتەوە. واتە کاتێ ئەو هێزە کوردیە هەستی کردبێت کە هێزێکی هەرێمایەتی

مەیلی بە لای ئەمدا کز بووە یاخود بە گوێرەی پێویست کۆمەکی ناکات یاخود تەشقەڵەی بۆ دەسازێنێ ئەو کاتە زیاتر لە هێزە خەنیمەکەی نزیکتر بۆتەوە کە لێرەدا مەبەست لە ئەمریکایە. ئەو کاتە بە باسکردن لە ئەمریکا و ئاماژە کردن بەم پەیوەندییانە وەك کارتێ هەوڵی داوە بە ڕای خۆی فشار بخاتە سەر ئەو هێزەو جارێکیتر قایلی بکات بەرگری لە هەڵوێستەکانی ئەم بکات و سنوری باشتر بە ڕوودا والا بکات و نەبێتە هۆکارێکی فشار دروست کردن بۆ سەری. دیارە بە ڕوەکەیتریشدا مەسەلەکە هەر ڕاستە واتە کاتێ هێزێ لەو دوو هێزە زانیبێت و ئەو باوەڕەی لا دروست بووبێت کە ئەمریکا ڕاستەوخۆ یاخود لە ڕێی دۆستێکی هەرێمایەتییەوە یارمەتی لایەنی بەرامبەر دەدا دژی ئەم یاخود لە مەسەلەیەکی دیاریکراودا زیاتر (تبنی) هەڵوێستی ئەوی کردووە ئەو کاتە بەفراوانکردنی هاوکاری و بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لە گەڵ هێزێکی هەرێمایەتی دیاریکراوی دژ بە سیاسەتەکانی واشنتۆن هەوڵی داوە ناڕەزایی و بێزاری خۆی لەو سیاسەت و هەڵوێستە لە شێوەی پەیامێکی سیاسیدا دەرببڕێت و بە کۆشکی سپی ڕابگەیەنێت ئەم جۆرە گەمەکردنەش لە نێوان ئەمریکاو هێزە هەرێمایەتیەکان و خودی ڕژێمی عێراق، لە قۆناغێکی جەنگ و ململانێ ناوخۆییەکاندا بەرەنجامی مەیدانی خوێناوی و چاوەڕێنەکراوی لێکەوتەوە کە ئەویش لە شەڕەکانی ساڵی (١٩٩٦) دەستێوەردانی سوپای عێراقی لە شەڕەکەو هاتنی تانکەکانی بۆ ناو هەولێر و وەدەرنانی یەکێتی نیشتمانی لە شارەکە دواتر پاشەکشەیان لە شار و شارۆچکەکانیتر و دەرهاویشتەکانیدا بە جوانی وەدەرکەوتن تەنانەت لەوەوپێشیش بەشداری سوپای تورك (٨) لە هەندێ لە شەڕەکاندا دژی هێزەکانی یەکیەتی تا ڕاددەیەك بە بەشداری

ناڕاستەوخۆی ململانێکان لە لایەن خودی ئەمریکاوە لێکدرایەوە. هەڵبەت هەر لەو ساڵەدا گرەو کردنی لایەنێك لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا کە لە ژێر هیچ بارودۆخێکدا ڕێگا نادات هێزە عێراقی‌یەکان سنورەکانی هەرێم ببەزێنن بە هاتنە ناوەوەی ئەو هێزانە و سارد و سڕی ئەمریکا لە بەرامبەر هەڵوێستە تازەکە و جۆرێ لە چاوپۆشینی بۆ هێزەکان دەرکەوت کە تا چەند حسابکردنەکانی ئەم هێزە و خوێندنەوەی بۆ ئاڕاستەی سیاسەتەکانی ئەمریکا لەو کاتەدا هەڵەن و چۆن متمانەی زیاد لە پێویستی بە بەڵێنەکانی ئەمریکا و دارشتنی نەخشەی سیاسی و سەربازی و ئیعلامی لە سەر ئەو بناغە ئاڕاستە، تووشی شکستی سەربازی و سیاسی گەورەی کرد.

ئەمریکی‌یەکان هەر لەم ڕووەوە تێکەڵاو بە بارودۆخی کوردستانی سەردەمی شەڕی ناوخۆ نەبوون، بەڵکو چەند جارێك بە تایبەتیش لەو ساتەوەختانەی کە ئەمریکا هەستی کردووە شەڕەکە بە شێوەیەکی ترسناك بەرەو قوڵبوونەوە ڕۆیشتووە و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی زیاتر بوونی دەستێوەردانی هێزە هەرێمایەتی‌یەکان بۆ کاروباری ناوخۆی هەرێم کە ئەمەش لە گەڵ ستراتیژیەتی واشنتۆن لە عێراق و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ناگونجێت، لە ڕوویەکەوە هەوڵی داوە وڵاتە هەرێمایەتیەکان بە تایبەتیش ئێران عێراق لەوە ئاگادار بکاتەوە کە کۆشکی سپی ڕازی نیە هاوسەنگی هێزەکان لە کوردستاندا تێکبچێ و ئەو هێڵە سنورانەش ببەزێنن کە بە هێڵی سوری خۆیانی دەزانێ. لە ڕوویەکی‌تریشەوە بە ناردنی وەفد بۆ کوردستانی هەوڵی داوە و داوای لە هەردوولا کردووە لەگەڵ یەکتریدا بکەونە وتووێژ و لە ڕێی ڕێکەوتنی نێوانیان چارەسەری سیاسیانەو کێشەکانیان بخەن بە لاداو

سنور بۆ ئەو کێشمە کێشمە دابنێن کە لە ئارادایە و ئاشتی و ئاسایشی هەرێمەکەی خستۆتە بەردەم هەڕەشەو مەترسی جدییەوە هەر وەك دەزانیین هەندێ لەو هەولانە ڕێکەوتنامەیان لێکەوتەوە کە دیارترینیان ڕێکەوتنامەی واشنتۆن بوو لە سالی (١٩٩٨) دا کەلە واشنتۆن و بەسەرپەرشتی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەردوولای شەڕەکە ئیمزایان کرد، بەلام ئەوەی ڕەخنە بوو لە سەر هەلوێستی ئەمریکا لەم میانەدا لە ناو ناوەندە سیاسی و فکری و جەماوەریەکەشدا ئەوە بوو کە ئەمریکا لە ڕوانگەی پشتیوانی کردن لە کێشەی کوردەوە نەهاتۆتە ناو ناکۆکی‌یەکان و ناوبژیوانیەکانی لە سەر ئەم بناغە دانەڕشتووە. بەلکو مەسەلەکە وەك بەشێ لە ئۆپۆزسیۆنی دژی صدام حسێن لە باکوری عێراقدا دەبینێ و ئامانجیش چارەسەرکردنی ڕیشەیی ناکۆکی نێوان یەکیەتی و پارتی و کۆتایی هێنانی یەکجارەکی شەڕەکە نیە، چونکە ئەوەی مەبەستی ئەوەو بەشی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەو دەکات ئەوەیە کە شەڕەکە نەگاتە قۆناغ و ئاستی ئەو ئەمری واقعیەی کوردستان و عێراق بخاتە بەردەم مەترسیەوە هەرکە گەیشتە ئەو ئاقارەش فشاری بەکاردێنێ بۆ وەستاندنی شەڕەکە. بە واتایەکی‌تر ئەوەی ئەو مەبەستیەتی ئەوەیە کە شەڕ نەبێت بۆ ئەوەی سەریەشە بۆ ئەمریکا دروست نەبێت و کۆنترۆلی بارەکەی لە دەست دەرنەچێت و ڕێگا بۆ هیچ هێزێکی‌تری هەرێمایەتی تەنانەت ئەورووپیش خۆش نەبێت لە هەرێمەکەدا ململانێی ئەو بکات یاخود هەلی پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییە بدات کە دەستی بێ‌هەلوێستی سلبیەتی زیاد لە پێویستی ئەم دروستی بکات. بەدەر لەوە دوو هێزە کوردییەکە دەتوانن کێشەکانی ناوخۆیان بە تەواوەتی چارەسەر نەکەن.

کوردستان دوو ئیدارەی هەیە یاخود حکومەتێکی یەکگرتوو.....هتد زۆر جێگا بایەخی ئەمریکا نیەو مەسەلەیەکە پەیوەست بە کوردەکانەوە خۆیانەوە کە لە چ ڕوانگیەکەوە سەیری سەرجەم ڕووداو هەنگاوو میکانیزم و هەڵوێستەکان دەکەن. لێرەشەوە مەرج نیە لە هەموو کاتێکدا بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە گەڵ خواست و بەرژەوەندیەکانی کوردا یەك بگرێتەوە لانیکەم لە هەندێ برگەی مێژوودا. هەر لەو کاتانەشدا بوو خەڵك دەیپرسی ئەگەر ئەمریکا لە ناوبژوانەکەیدا جدیەیە بۆچی لە کاتێکدا کە دەتوانێ زۆر بە ئاسانی فشار بخاتە سەر لایەنە ناکۆکەکان و شەڕەکە بە یەکجاری کۆتایی پێ بێنێ و ڕێکەوتنامەکان جێ بەجێ بکرێن کەچی ئەو کارە ناکات؟

بۆچی ڕێکەوتنامەکان دەمرن و مردار دەکرێنەوەو جێ بەجێ ناکرێن کەچی ئەمریکا بێ باکانە دەڕوانێتە ئەم واقیعەو لە جێی خۆی ناجوڵێ ؟ دیارە ئەم پرسیارانە ڕاستن بە تایبەتی لەو کاتانەی سیاسەت لانیکەمی پرەنسیپە ئەخلاقیەکان ڕەچاو نەکات و سەرجەم دیدگاو مەسەلەو ئامانجەکانی لە بەرژەوەندیە ئابووری و ستراتیژیەکانی هێزێکدا کۆنەکاتەوە، بەڵام ئەوەی ڕوونە سنوردانانەکانی سیاسەت و کارایی و مەوداکانی و ڕووەکانی بەشێوەیەکی گشتی ئاستی هێزو وەدیهاتنی بەرژەوەندی و دەستکەوتەکان ڕەنگی دەڕێژن و دەینەخشێنن نەك سەرەتاکانی مرۆڤ دۆستی و پرەنسیپە ئەخلاقیەکان. بە تایبەتی لای وڵاتێکی وەك ئەمریکا کە فەلسەفەی پراگماتیزم ئاڕاستەی ڕەفتار و ستراتیژیەتە سیاسییەکەی دەکات.

بەڵکو هەر لەو ڕوانگەوە لە ناوەندە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکەدا قەناعەتێکیتریش بڵاوبوو کە پێی وابوو هەر لە بنەڕەتەوە بەرژەوەندی ئەمریکا لەوەدایە، کە بارەکە بەم جۆرە بمێنێتەوە واتە باری نە شەڕ نە ئاشتی بە هەڵپەسێردراوی هێشتنەوەی بەشێ لە کێشەکان بۆ ئەوەی مەسەلەی کوردی لە قەوارەی خۆی گەورەتر نەبێت و حیزبە کوردیەکانیش تەنها وەك بەشێ لە ڕێکخراوە سیاسیەکانی ئۆپۆزسیۆنی سەرانسەری عێراق حسابیان بۆ بکرێت نەك نوێنەری کێشەیەکی تایبەت و سەربەخۆ ئەمە جگە لەوەی بەم خەم ساردی و ئیدارەکردنی ململانێکان وەڵامی خواستێکی تورکیاش دەداتەوە کە دۆستی دێرینی خۆیەتی لە ناوچەکەدلو ئەویش دژایەتی هەر جۆرە پەرەسەندێکی مەسەلەی کورد لەم بەشەی کوردستاندا دەکات. هەر لەم میانەشدا لە هەندێ کاتدا کار گەیشتۆتە ئەوەی دان بە سیاسی بوونی ڕیکخراوە سیاسییە کوردیەکانیشدا نەنێ و بە کۆمەڵێ خێڵی باکوری عێراق ناویان بەرێ. ئەم بارەش درێژەی کێشا تا دوای (١١)ی سبتەمبەر و جارێکیتر گەرم بوونەوەی دۆسیەی عێراق و توندبوونی ستافی نوێی ئیدارەی کۆشکی سپی بەرامبەر ڕژێم و تێکەڵاوکردنی چارەنووس و مانەوەی بە ڕەنگدانەوەکانی ئەوەی ناویان ناوە جەنگی دژە تیرۆر.

لێرەدا دەبێ بووترێت هاوکات لە گەڵ سەیرکردنی مامەڵە کردن لە گەڵ ئەمریکا لە ڕوانگەی ململانێی نێوان دوو هێزەکە و ئەو ناکۆکیە توندوتیژە مەیدانیەی لە ئارادا بوو هێزەکان هەریەکە لای خۆیەوە ئەمریکا و پەیوەندی بە دۆخی لە ئارادا بووی کوردەوە بە ئامادەیی نیمچە بەردەوام لە گوتاری ڕاگەیاندن و سیاسی خۆیاندا دەهێشتەوەو ناو بەناو بیری جەماوەریان دەهێنایەوە کە کێشەی کورد گەورە بووەو ئەمریکا بڕیاری پاراستنی کوردی داوەو دەست لەم پاراستنەش هەڵناگرێو ڕێگە نادات جارێکیتر

تراژیدیای ئەنفال و کیمیاباران و کاول کردنی گوند و شارۆچکەکانی کوردستان بە سەر کوردا بێتەوە.

ئەمەش بەشێکی بۆ هێشتنەوەی لانیکەمی وورەی جەماوەر بوو کە جەولەکانی شەڕی ناوخۆ تووشی بێهوودەیی و نائومێدییەکی زۆری کردبوو دەشترسا لەوەی شەڕەکە پەرەبسێنێ و ببێتە هۆی تێکچوونی ئەم بارە و دەسەلاّتدارانی بەغداش دۆخەکە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە و دووبارە شانسی خۆیان لە ڕێی سەرکێشیەکی سەربازییەوە تاقی بکەنەوە و ئەمریکاش چاوی لێ بپۆشێ دیارە دوای هێرشەکانی بۆ سەر واشنتۆن و نیۆرك و ئەو دۆخە نوێیەی لە دونیادا سەرکردە کوردەکان هەستیان کرد هەل ومەرجێکی لە جاران ڕەخساوتر هاتۆتە پێشەوە بۆ بردنە پێشەوەی پەیوەندی لە گەڵ خۆرئاوا بەگشتی و بەتایبەتیش ئەمریکادا ئەوەی ئەم بۆچوونەشی لە ڕاستی نزیك دەکردەوە هاتنە ئارای باسی گۆڕینی ڕژێمی سیاسی و فەرمانڕەوا لە عێراق دا بوو. ئەمریکیەکانیش روونە لە حالێکی لەم جۆرەدا پێویستییەکی زیاتریان دەبێت بە سیفەتی بەشێکی گرنگ لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و لە ژێر دەستا بوونی هەرێمێکی تا ڕادەیەك بەرفراوان کە دەتوانرێ لە رووی سەربازی و سەربازیشەوە ببێتە پێگەیەکی گرنگی هەر هێرش و دەستبەکاربوونێکی مەیدانی بۆ ئاڵ و گۆڕ لە عێراقدا.

لێرەوە دوای تێپەرینی سێ ساڵ بە سەر ڕێکەوتنامەی واشنتۆندا و ئەو بەربەستەی تووشی جێبەجێ کردنی بەندو برگەکانی هاتبوو سەر لە نوێ جۆرێ لە (انفراج) لەم پەیوەنیانە دێننەکایەوە سەردانە یەك لە دوای یەکەکانی تاڵەبانی بۆ سەری ڕەش و ئامارژەکانی ئەمریکا و ئامادەیی پارتی دیموکرات بۆ کارلێکردن لە گەڵ ئەوەی بۆتە واقع

دەبنە پاڵنەرێکی جدی بۆ جێ بەجێ کردنی بەشێ لە ماددەکانی ئەم ڕێکەوتنامە. لە ژێر سایەی ئەو قەناعەتەدا کە ئەگەر بارەکە هەروەك کۆن بمێنێتەوە یەکیەتی و پارتی لە ئاست چاوەڕوانیەکانی ئەمریکادا نابن و بەمەش بەرژەوەندییەکانی خۆیان و جووڵانەوەی سیاسی کوردیش دووچاری گیرو گرفتی جدی دەبێت و دەشێ بە بچووك بوونەوەی کێشەکە و پەراوێز کەوتنی خۆیان کۆتایی پێ بێت یاخود لانیکەم لە قۆناغی دوای گۆڕاندا و لە ژێر کاریگەری ئەو هەل و مەرجە نوێیەی دێتە کایەوە خەڵك دۆسیەی قۆناغی ڕابردوویان بەڕوودا بکاتەوە و ئەمەش بیانخاتە بەردەم هەڵوێستێکی مۆلەقەوە.

**ڕوویەکی‌تری بەکارهێنانی پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکا و خۆرئاوا بە گشتی لە ململانێی نێوان تەوژمەکاندا**

لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ ئاستی دووەمی بەکارهێنانی پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکا کرد کە پەیوەست بوو بە دوولایەنە بنەڕەتیەکەی شەڕی ناوخۆ و دوو هێزە دەسەڵاتدارەکەی کوردستان لە پێناو بەهێزکردنی هەڵوێستی سیاسی و سەربازی و مەعنەوی و جەماوەریی خۆیاندا، بەڵام ئەم بەکارهێنانە نێگەتیڤەی گرەوکردن لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا و بەکارهێنانی لە ڕاگەیاندندا ڕووکارو مەیدانێکی‌تریشی هەیە کە ئەویش سوود لێوەرگرتنی بووە بە پڕو پاگەندە کردن لە دژی تەوژمی ئیسلامی و بەکارهێنانی وەك چەکێ بۆ شەڕی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی کە لەم ڕووەوە کار گەیشتۆتە دەست بردن بۆ پێکهاتەکانی فەرهەنگی و نەتەوەیی و ڕۆشنبیری نیشتمانی.

ئەم بەکارهێنانە هەر لە سەرەتای نەوەدەکانەوە سەر هەڵدەدا لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستاندا لە ساڵی (١٩٩٢)دا زیاتر وەدەرکەوتوو بەشێ لە پڕوپاگەندەی هێزەکان لە ناوچەماوەردا لە دژی ئیسلامی‌یەکان ئەوە بوو کە ئەگەر ئەمان سەر بکەون یاخود دەنگی زۆر بهێنن ئەوا ئەمریکا چاو دەخشێنێتەوە بەو مەسەلەی پاراستنی کوردستان و هەڵوێستی خۆی لە مەڕ کوردو کێشەکەی دەگۆڕێت ! !

ئەم پڕوپاگەندە بۆ چەند ساڵێ درێژەی کێشا بەڵکو لێرەو لەوێ هەر بەردەوامی هەبووەو هەیە تەنانەت لە هەندێ هەڵبژاردنی فەرعی قوتابیان و شارەوانیەکانیشدا ئاماژە بەم مەسەلەیە کراوە. وەك ئەوەی دەیان ساڵ لەوەو پێش ئیسلامیەکانی کورد کاریان لە هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر کوردو کێشەکەی کردبێ تابگاتە ئەو ئاستەی لەسلبیەت و دوژمنایەتی کردن تائاستی پیلانگێڕان لە شۆڕشی گەلی کورد و بەشداریکردن لە روخاندنی و دواتر دەستێکەلاوکردن لەگەڵ دوژمنەکانی کوردا ! جەنگی دەروونی لەم ڕووەوە دژی تەوژمی ئیسلامی و هەندێ جار خودی ئیسلامیش ڕەهەندی جۆراوجۆری‌تری بەخۆوە گرتووە لەوانەش بەردەوام بیر هێنانەوەی ئەوەی کە جیهانی ئیسلام و وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی هیچیان بۆئێمە نەکردووە و ئەمریکا و خۆرئاوا دەمانپارێزن هەر بۆیە دەبێ ئێمە تەنها ئەوان بە دۆستی خۆمان بزانین.ئەم جۆرە گوتارە لە ڕووی مێژوویی‌یەوە پاشخانێکی فکری سیکۆلەریستی لە پشتەوە بوو کە دەیویست بوغز و کینە بەرامبەر تێکڕای فەرهەنگ و شارستانیەت و مێژوو ئێستاو گەلانی ناوچەکە لە هۆش و ویژدانی تاکی کوردیدا بڕوێنێ و لانی‌کەم لە ڕووی هەست و سایکۆلۆژیاوە لە ناوچەکەی خۆی دابڕێ و وا هەست کات کە تاقمەکە سەرپشك و ڕێگای دەرباز بوون ڕوو کردنە خۆرئاوا و هەوڵدانە بۆ بوون بە بەشێکی ئۆرگانی گەر لە

سەر ئاستی ژیانی کۆمەڵایەتی و بیرکردنەوەی سیاسی و شوناسی ژیاریش بێت. کە دیارە لە ڕووی زانستی و عەمەلیەوە کارێکی لەم جۆرە بێ هودەو نیمچە ئەستەمە. ئەم گوتارە و ئەم جۆرە (تەوزیف) کردنە بۆ پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکاو خۆرئاوا و پرۆسەی ناوچەی ئارام و دژە فڕین لانیکەم لە دوو ڕووەوە بە خراپ بۆ سەر کۆمەڵگا دەشکایەوە ڕوویەکەمیان قەڵبکردنی هۆشیاری خەڵك و سادەکردنەوەیان بوو لە ڕێی جەنگێکی دەروونی بەردەوامەوە چونکە هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر بە کورد لە مێژووی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و کورددا لە ئاستە جۆراو جۆرەکاندا لەو دوورو نزیکەوە پەیوەندی بە بوون و نەبوونی ئیسلامیەکانی کوردەوە نەبووە. هەر لە بنەڕەتەوە ستراتیژیەتی ئەمریکای بۆ ناوچەکەو عێراق و کوردستان خاوەنی هەندێ پایەی نەگۆڕی خۆیەتی و ئەم مەسەلانەش زۆر لاوەکی و تەنانەت لە هەندێ قۆناغدا حساب بۆ نەکراویش بوون لە داڕشتنی ئەو ستراتیژەدا بە واتایەکیتر ئەوە هۆکار و کارتێکەر و ئامانجیترن سیاسەتی دەرەوەیی ئەمریکا دادەڕێژن نەك تەوژمێکی ئیسلامی کوردی تازە سەرهەڵداو. چونکە هەروەك ووتمان ئەگەر مەسەلەکە بەم جۆرە بێت ئەی دەبێت ئەو پشت کردنە مێژووییەی ئەمریکا لە کورد کە هەندێ جار گەیشتۆتە ئاستی خەنجەر لێدان لە پشتەوە بە چی لێك بدەینەوە ؟ لە ڕوویەکیترەوە چەواشەکردنی جەماوەر بوو لە سەر ئاستی واقیع چونکە ئەمریکا ڕۆژێ لە ڕۆژان بۆ بەرگریکردن لە کوردەوە نەهاتۆتە ناوچەکە کێشەی کوردی وەك کێشەیەکی سیاسی عادیلانە بە ڕەسمی نەناسیوە تەنانەت بە بڕوای من تا ئەم لەحزەش ناوەرۆکی ئەو هەڵویست و تێڕوانینەی ئەمریکا گۆڕانی زۆریان بەسەردا نەهاتووە کاتێ کورد ئەنفال دەکراو کیمیایی بەسەردا دەباری و کۆمەڵ کوژە دەکرا ئەمریکا و هیچ وڵاتێکیتری خۆرئاوایی دەنگی لێوە نەهات

لەبەر هۆیەکی زۆر سادە کە ئەویش ئەو بوو کە ئەو کاتە بەرژەوەندیان لەوە دا نەبوو ئەو مەسەلانە بووروژێنن.گرەویان لە سەر عێراق کردبوو بۆ لاوازکردنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و (احتوا) کردنی لە سنوورەکانی خۆیدا و ڕێگرتن لە پەرەسەندن و تەنینەوەی. ئێستاش ئەوەی لە سەر زەوی واقیعدا هەیە بەهەرێمی کوردستانیشەوە بەرهەمی ڕاپەڕینی خەڵك وە دەرهاویشتەی شەڕی کەنداوی دووەمە: ئەمریکا لە ڕووی مەبدەئی و ئەخلاقی‌یەوە نەهاتووە بەرگری لە ئێمە بکات بەڵکو بۆ خۆی هاتووە ئیتر چ پێویست دەکات ئێمە پاساوی ئەخلاقی و ئایدۆلۆژی بۆ سیاسەتەکانی بێنینەوە هەر لەبەر ئەوەی پێمان وابێ بەمە دژایەتی تەوژمێکی فکری سیاسی و کۆمەڵایەتی دیاریکراو دەکەین ؟ یاخود وا بیر بکەینەوە بەمە عەلمانیەت لە وڵاتی خۆماندا پەرە پێ دەدەین و سەرەنجام دەتوانین سەرسام بوون بە نمونە خۆرئاواییەکە لە سەر ئاستی سیاسی‌یەوە بگوازینەوە بۆ سەر ئاستی فکر و سۆزی ئەخلاق و ژیانی فەردی و خێزانی و خۆ داڕشتنەوەی کۆمەڵایەتی ؟! هەڵبەت ئەمە مانای ئەوە نیە سەرکردایەتی جووڵانەوە سیاسی‌یەکە سوپاسی ئەمریکا و خۆرئاوا نەکات یاخود لەم ئاستەدا پێزانینی خۆی بۆ ئەو هەڵوێستە دەرنەبڕێت یا ئەوەی هەشە ئەمری واقیع بێت و لە بنەڕەتەوە لە بەر خاتری ئێمە نەبوبێت و تەنها بە یەکگەیشتنی بەرژەوەندیەکان بێت لە برگەیەکی مێژوویی دیاریکراودا. نەخێر بەڵکو کارێکی لەو جۆرە پێویستە وەهەوڵدان بۆ پەرەدان بەو ئەمری واقیعە بۆ ئاستی دانپیانانی سیاسی بە کێشەکەدا و دۆزینەوەی جێگایەك لە ناو دۆسیەی سیاسەتی دەرەوەی زلهێزەکەی دنیا و نەتەوەیەکگرتووەکان و وڵاتانی ئەورووپاش ئەرکێکی دیپلۆماسیەتی کوردی‌یە.

چونکە ڕەنگە هەموومان بزانین لە چ سەردەمێکدا دەژین و پێویستە لە چەند بازنەدا هەڵسوڕێین و بازنە کاریگەرەکانیش کامانەن هەروەها لانیکەم بەشێکی باشمان لەوە تێبگەین کە سەردەم سەردەمی ئەوە نیە بەربەستە ئایدۆلۆژییەکان ڕێگامان لێبگرێت لە مامەڵەیەکی واقیعبینانە لە گەڵ هێزەکان و لێکدانەوەیەکی زانستی ڕاست و دروست بۆ واقیع و هەلومەرجە نیشتمانی و نێودەوڵەتیەکە، ئەمە مەسەلەیەکی جیاوازە لەوەی ناوەندێ یاخود تەوژم و کەسێك بێت گیانی خۆبەکەم زانین و گرێی هەست بەکەمی کردن بەرامبەر ئەمریکا و خۆرئاوا بە گشتی لە دڵی تاکەکانی کۆمەڵگادا بروێنێ بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەی ستراتیژیەتی بزافێکی نیشتمان پەروەری ڕاستەقینە و نەتەوایەتی دەیخوازێت کار لە سەر هەڵوەشاندنەوەی ڕۆشنبیری نیشتمانی بکات و هانی خەڵکی بدات نەفرەت لە بەشێکی بەرچاو لە کەلتووری خۆیان بکەن و شێوازێ لە ژیان و بیرکردنەوەی بۆ نەوەی نوێ تەرح بکات کە زۆر کەم نەبێت ڕەنگدانەوەی فەرهەنگی نیشتمانی و تەنانەت کارلێکێکی هۆشیارانەلە گەڵ کەلتوورە جیهانیەکەش نەبێ کە ڕوونە سەرجەم ئەم کارە نەوەیە تووشی جۆرێ لە نامۆیی ڕۆشنبیری دەکات و قەیرانی شوناسیش بە مانایەك لە ماناکانی دەچێتە سەر گیروگرفتە جۆراوجۆرەکانیتری کۆمەڵگا وئەم نەوەیە. بەرەنجامێکیتری نێگەتیڤی ئەم گوتارە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بە گەورەکردنی زیاد لەپێویستی وێنەی جوانی ئەمریکا و کۆمەکی و پشتیوانی ئەمریکا و سروشتی ئەو جیهانەی ئەمریکا ڕێبەرایەتی دەکات لەسەرئاستی تاك وکۆمەڵگادا پەرەی بەرۆشنبری پشتلێکردنەوە و پشت بەغەیری خۆبەستن و بێمتمانەیی بڵاوکردۆتەوە.

ڕەنگە بتوانین بڵێین تا رادەیەکی بەرچاویش ئەم شێوازە لەدواندنی مرۆڤی کوردی لەم بەشەی نیشتمانەکەیدا قەناعەتێکی لا دروستکردووە کە ماف و ئازادی وسەرکەوتن و ژێر کەوتن بەنیمچە ڕەهایی پەیوەستە بەهەڵوێستی ئەمریکا لەئێمە و ئەندازەی ئەوپشتیوانیەی لەکێشەکەمانی دەکات نەك بەخودی خۆمانەوە.دەکرێت بەشێ لەو بێباکیەی بۆ زیاتر لەچەند ساڵێ دەچێ لەکوردستان هەستی پێ دەکرێت وە لەکاتی شەڕی ناوخۆدا باوبوو هەربەمە لێکدەدرێتەوە. کە لەوەدا خۆی دەبینیەوە پارتی و یەکیەتی بەگوێرەی پێویست بەوجۆرەی سەرەتاکانی گیانی نیشتیمانی و نەتەوەیی ئەخلاقی لێیان دەخواست ئەو ئیرادە سیاسیەیان نەبوو نەهێڵن ناکۆکی نێوانیان ئەو هەموو ڕەهەندە جۆراوجۆرانە بەخۆوە بگرێت و ئەو کاتە زۆرەبخایەنێ و ئەو هەموو توانا زۆر و زەوەندە ماددی و مرۆیی‌یەش بەفیڕۆ بدات تاکو بتوانرێت دەرفەتەکان بەشێوەیەکی باشتر بەقازانجی گەل و چەسپاندنی ماف و دەسکەوتەکان و ڕۆشنتر کردنەوەی ئاسۆکانی ئایندەو خۆشگوزەرانی توێژەکانی کۆمەڵ و قوڵکردنەوەی ئازادی زیاتر سودیان لێ وەربگیرێت و ئەو قەناغەتەی کەپێی وابوو سەرەنجام چارەنووسی ئێمە ئەمریکا دیاری دەکات نەك خۆمان و بەپشت بەستن بەخۆمان هەرلەم کلاوڕۆژنەشەوە ڕووداوەکانی شەری ناوخۆ هەرچەندە پەرەبسێنن و قوڵ ببنەوە ئەمریکی‌یەکان ناهێڵن لەو هێڵە سورانە دەرچێت کە بۆ تێکڕایی دۆخ و ناوچەکەیان کێشاوە لێرەشەوە هەوڵدان بۆ پەرەدان بە دەستکەوتە حیزبی‌یەکان و فراوانتر کردنی قەڵەمڕەوی دەسەڵات و دەست ڕۆیشتوویی حیزب لە ڕوانگەی بەشێ لە سەرکردایەتی‌یەکەوە پاساوی بۆ پەیدا دەبێت بەو هیوایەی لە چوارچێوە و لە سایەی چەتری ئەو ئەمری واقعیەی لە هەرێمدا هەیە حیزب بتوانێ ئەمری واقعێکی نوێ لە ڕێی دروستکردنی گۆڕان لە هاوکێشەکان و

پێگەکانی دەسەلات و کاریگەر بوونەوە بسەپێنێ بۆ ئەوەی لە گەڵ دووبارە هەڵدانەوەی دۆسێی عێراق و کوردستان پشکی شێری بەربکەوێت و بگاتە ئاستی مەرجەع بوون بۆ هێزە سیاسی‌یەکانی دیکەو سەرجەم جووڵەی کۆمەڵگا.

گەر ئەمە زۆر بەکورتی ڕەنگدانەوەی خاڵی‌یەکەم بێ لە واقیعدا مەترسی خاڵی دووەمیش هیچی وای لەم کەمتر نەبوو. چونکە ئەو جۆرە مامەڵەکردنە لە گەڵ مەسەلەی پەیوەندی بە ئەمریکاو خۆرئاواوە لە پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە لە قوڵبوونەوەیدا لە بارییایەتی کۆمەڵگا لە سەر بناغەیەکی ناڕاست پۆلێن و دابەش بکات ئەو کاتەش بۆ دابەشکردنەکە دەبێت بە ئەوانەی لە گەڵ ئەمریکان و ئەوانەی لە گەڵ ئەمریکا نین. کە هەموو دەزانین ئەم دابەشکردنە ئایدۆلۆژی و سیاسی‌یە کورتبین و کرچ و کاڵە بە چ زیانێ بۆ سەر ئێستا و ئایندەی گەلی کوردستان و کێشە نەتەوەیی یەکەی دەگەڕێتەوە. بە تایبەتیش لە ساتە وەختێکی مێژوویی وادا کە چەندین ناکۆکی جۆراوجۆری خوێناوی و ناو لە یەکتر نانی دوژمنانەو دەست خستنە ناو کارو باری هەرێم لە لایەن دەوڵەتە ناحەزەکان بە ئایندەیەکی گەش بۆ کورد کارێکی کردبێت پرسیاری لە سەر بە کۆمەڵگا مانەوەی کۆمەڵگای کوردی دروست کردبوو. هەڵبەتە چەواشە کردن و مەترسی ئەم دابەشکردنە هەر لێرەدا ناوەستێ بەڵکو چەندین شتی‌تری خراپی لێدەکەوێتەوە کە هۆشیاری سیاسی تاك و کۆمەڵگا بەرەوساختە بوون دەبات وەك ئەوەی هەرچی لە گەڵ ئەمریکا نەبێت و (تبنی) گوتار و سیاسەتەکانی ئەو نەکات لە گەڵ کێشەی کوردا نیە واتە لە گەڵ ئەمریکادا بوون یەکسان دەبێت بە لە گەڵ کورد بوون کە ئەمەش بەرەنجامگیرییەکی ناڕاستە. چونکە هێزێکی کوردی ئەرکی ئەوەیە لە چوارچێوەی خزمەت کردن بە کێشەی کوردا لە گەڵ ئەمەریکی‌یەکان لە پەیوەندی دابێت و باری

سەرنجی خۆیان بۆ ڕوونکاتەوە و هەوڵدات سەرنجی زیاتری ئەمریکا لەو سۆنگەوە بەلای پشتیوانی کردن لە کورد و کێشەی ڕابکێشێ، کە کورد دەتوانێ بەشێ بێ لەو بارە نوێیەی (تبنی) هەڵوێستی دوژمنایەتی ئەمریکا ناکات بەڵکو خوازیارە لە سەر بناغەی ئاڵ وگۆڕی بەرژەوەندیەکان لە گەڵیدا لە پەیوەندییەکی دۆستانەدا بێت.

لە ڕاستیشدا یارمەتی دانی ئەمریکا بۆ کورد زۆر پەیوەندی نیە بەوەی هێزوناوەندێ ببێ بە پۆلیسی ئەمریکاو (تبنی) سەرجەم موفرەدەو چەمك و میکانیزمەکانی گوتاری سیاسی و ڕاگەیاندنی ئەمریکا لە سەر ئاستی دنیادا بکات، بەڵکو (تبنی) هەڵوێستی هەڵۆکانی ناو کۆشکی سپی بکات.

مەسەلەی یارمەتی دانی ئەمریکا بۆ هێزو کێشەی لایەنێك وەك هەمووما‌ن دەزانین پەیوەستە بە (ثوابت)ە سیاسی‌یەکانی و بەرژەوەندی‌یەکانی‌یەوە تەنانەت زۆر پەیوەست نیە بە شوناسی فکری و ئایدۆلۆژی هێزەکانەوە وەك هەندێ لای ئێمە دەیانەوێت ئەمە تۆخ بکەنەوە. هەر بۆیە ئەمریکا یارمەتی موجاهیدەکانی ئەفغانستانی داوەو پێشوازی لە نوێنەری جەنگاوەرانی شیشان دەکات و ئامادەی هاوکاریە لە گەڵ حکومەتەکەی ئۆردۆغان... هتد گەرچی ئەم هێزانەش لە ڕووی شوناسەوە ئیسلامین کەچی لە دەیانساڵی ڕابردوودا نەك هەر یارمەتی کورد نادات لە پێش نەوەدەکان و تا ئێستاش لە بەشەکانی‌تری کوردستانا بەڵکو لە زۆربەی کاتدا دوژمنایەتیشی کردووە و یارمەتی دوژمنەکانی داوە گەرچی کەوا زۆربەی هێزە کوردییەکان لەڕووی شوناسی فکری و ئایدۆژییەوە لەپەنجا ساڵی ڕابردوودا عەلمانی بوون.پێم وایە گرفتی کورد لە زۆربەی مەسەلەکاندا لەوەدایە (ثوابت)ە نیشتیمایەکانی سنوورەکانی سیاسەتی

هێزەکانی دیاری ناکات و کوردستان و وەك سەرزەمینێکی نیمچە (مباح)ی لێ هاتووە بۆ زۆر هێز و دەوڵەت و لایەن و تێزی جۆراوجۆر بۆیە دەبینین چەندین بزوتنەوەیتر هەبوون و هەن لەگەڵ ئەمریکیەکان پەیوەندی دەبەستن و هەوڵی بەدەستهێنانی پشتیوانی سیاسی و مەعنەوی ئەوانیش دەدەن بێ ئەوەی ئەم لەسەر حسابی تێکشاندنی رۆشنبیری نیشتیمانی خۆیان تەواوبێت. هەروەها پێیان وانیە ئەمە لێیان دەخوازێت بەرگری لەکۆی سیاسەتەکانی ئەمریکا بکەن و بەهەموو شتێکی بڵێن راستە و رەفتاری سیاسی ئەو لەسەر ئاستە جۆرا وجۆرەکاندا بە ڕەوا ببینن یاخود ڕاستی و ناڕاستی کێشە و مەسەلەکان لایان بووبێتە پشتیوانی کردن یاخود نەکردنی ئەمریکا لەو کێشە و مەسەلەیە.

بابگەڕێینەوە بۆسەر بنەڕەتی بابەتەکەی خۆمان بڵێینن ئەو دابەشکردنە کەمەسەلەی دژی ئەمریکایی بوون بەگوێرەی ئەو (منطق)ی باسمانکرد لەدژی ئەمریکایی نەبوون دەردەکات، بۆ لەگەڵ ئەمریکا نەبوون. بەڵکو هەندێ جار لەگەڵ بوون و نەبوونی سیاسییەوە دەباتە ئاستی لەگەڵبوون یاخود لەگەڵ ئەمریکا لەچوارچێوەی شارستانیەتەکان پێشنیاری دەکات و هەوڵی سەپاندنی دەدات تەنانەت لەوەش زیاتر لەبەشێ لەم گوتارەدا لەگەڵ ئەمریکا نەبوون پەیوەست نیە بەهەڵوێستی سیاسی و مەیدانی و ئامادەیی بۆمامەڵەکردن لەگەڵ ئەمریکادا بەڵکو ئەم خەسڵەت و هەڵوێستە دەکرێت بەجەوهەری نەگۆڕی تەوژمێکی فکری و سیاسی دیاریکراو هێزی دۆگمایەك کەقابیلی هیچ نەرمی نواندن و گۆڕانێك نەبێت. لەکاتێکدا واقیع و لە کوردستاندا بەم جۆرە نیە چونکە لەگەڵ ئەوەی لایەنە ئیسلامیەکانی کورد رەخنەیان لەسیاسەتی ئەمریکا هەیە لەزۆر شوێنی جیهان و لەناوخۆشدا بەڵام ئەوەندە دەرکی ئەرکە

نیشتمانیەکانی خۆیان کردووە کە ئاڵای دوژمنایەتی کردنی ئەمریکا بەرزنەکەنەوە ئامادەی مامەڵە کردن بن لە گەڵیاندا. هەر بۆیە لەو سۆنگەوە کە لایەنە ئیسلامیەکان خۆیان بە بەشێ لە ماڵی سیاسی کوردستان زانیوە بەشداری زۆربەی ئەو کۆبوونەوەو کۆنگرانەی موعارەزەی عێراقیان کردووە، لە خودی ئەمریکا و دەرەوەی ئەوێدا بەستراون گەرچی ئاگاداریش بوون لەوەی کە زانیویانە لە ژێر چەتری ئەمریکا و بە سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی ئەو دەبەسترێن. هەروەها ئەم لایەنانە بە تایبەتیش یەککرتووی ئیسلامی کوردستان کە لە ڕووی جەماوەریەوە هێزی بنەڕەتی حاڵەتە ئیسلامی‌یەکە پێکدەهێنێ سەیرکردنی بۆ پەیوەندی لە گەڵ ئەمریکا سەیرکردنێکی عەقیدی و ئایدۆلۆژی نەبووە بەڵکو سەیرکردنێکی سیاسی و بەرژەوەندیخوازانەیە واتە دیاریکردنی ئاستی پەیوەندییەکە پەیوەستە بە هەڵوێستی ئەمریکا دەربارەی کێشەی کورد و گەلی کوردستان و عێراق و تەوژمی ئیسلامی بە پێوەرکردنی ئەم گوتارە بە (تبنی) کردنی گوتار و لۆژیك و پێوەرەکانی ئەمریکا لە سەر ئاستی دنیادا واتە ئەوەی ئەمریکا بە جوان و ڕاست و ئینسانی دەزانی و بە پێچەوانەشەوە لە ناوخۆدا، ڕەنگدانەوەی خراپی دەروونی بە جێ هێشتووە. چونکە ڕابردوو دەری خستووە ئەو جۆرە مامەڵە کردنەش دیسانەوە خوێندنەوەی ڕووداوەکانی جیهانە لە ڕوانگەی ململانێی تەوژمە فکری و سیاسی‌یەکانی ناوخۆوە ئەم مامەڵە کردنەش لە پاڵ ئەوەدا کە مەترسی جەنگی (بە وەکالەت) لە دژی تەوژمێکی دیاریکراو دروست دەکات، بە تایبەتیش لە بارودۆخێکدا کە سەرەتاکانی نیشتمان پەروەری بە مانا سیاسی و یاسایی و ئەخلاقیەکەی لە کوردستاندا لە ئاستێکی نزمی خۆیدایە و مرۆڤ وەك تاك و لایەن و تەوژمیش لەو ڕوانگەوە هەست بە حەسانەیەکی جدی و دڵنیاکەرەوە ناکات، کە بتوانێ

ڕێبگرێت لەوەی بەرژەوەندی‌یە حیزبییەکان جیاوازیە فکری و ئایدۆلۆژیەکان و ململانێی نێوان تەوژمەکۆمەڵایەتیەکان کاریێ ناکەن سازشی بە سەرەوە بکرێت، (چونکە هەندێ جار هەست بەوە کراوە هەر بۆ نموونە دوای ڕووداوەکانی (١١) ی ئەیلول لە ئەمریکادا هێزێکی کوردی هەر بۆ ئەوەی وای بخاتە ڕوو دەتوانێ بەشێ بێ لەو بەرەو بارودۆخە نوێیەی جیهانیەی لە ئارادایە. هەوڵی (تکیف) کردنێکی نوێی کێشەیەکی لە ئارادابووی بە جۆرێ داوە کە لە گەڵ وێنەو مۆدێلە ئەمریکی‌یەکەدا بگونجێت. بەمەش چارەسەرکردنی کێشەکە و مامەڵە لە گەڵ کردنی لە چوارچێوەی مەسەلەیەکی ناوخۆیی دەربکات بۆ ئاستێکی جیهانی بە مەبەستی (کسب)ی سیاسی و شوێن پێ قایم کردن و ناردنی پەیامی سیاسی.

## ئێستای کێشەی کورد و گرەوکردن لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا

ڕەنگە ئەو پێداچونەوە خێرایەی پێشوو بە پەیوەندییەکانی ئەمریکاو کوردو جۆرێ مامەڵە و چاوەڕوانی هێزەکان و ڕەنگدانەوەکانی لە واقیعەکەدا بەشی خۆی یارمەتیمان بدات لە خوێندنەوەی ئێستای ئاستی ئەو پشتیوانیەی چاوەڕێ دەکرێت واشنتۆن لە کێشەی کوردی بکات هەڵبەت بە هێنانە ناوەوەی هەموو ئەو گەز و پێوەر و دۆخە نوێیانەی هاتونەتە کایەوە بۆ ناو پرۆسەی شیکردنەوە سیاسیەکە و دیاریکردنی چەشمەندارەکانی ئاینده. گرنگیشە لەو نێوەندەدا گۆڕانە ڕووکەشەکان لە پەیوەندی ئەمریکا بە کێشەی کوردەوە بەڵکو لە مەڕ ئاستی جیهانیشدا لە گۆڕانە گرنگ و چۆنایەتیەکان جیابکەینەوە. پێشمان وانەبێت کورد لە سەر ئاستی جیهاندا (استثناء)ێك

پێکدەهێنێ هەربۆیە دەبێت ڕەوتی پەیوەندییەکانی ئەمریکا لە گەڵ هەندێ نەتەوە و بزاڤ و هێزی هاوشێوەی ئێمە ئەوانیش کە ڕەنگە هەڵکەوتەی جوگرافی و مێژوو، ئاین و سەرچاوە سروشتییەکان و چەندین شتیتر پێکی بێنن بە جوانی دیاری بکرێن. هەروەها بە وردی دەستنیشانی ئەوەش بکەین کە ئەو گۆڕانکاریانەی ڕوویانداوە چەندیان بە ناوی ئێمەوە بووەو چەندیشیان ئێمە ئامانج نەبووین تیایدا بەڵکو بەشێکین لە بەرەنجامەکانی لە گەڵ وەستانی تەواو لە سەر ئەو هۆکارو کارتێکەرانەی ئاڕاستەی سیاسەتەکانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە جیهاندا دەکەن دەبێت تایبەتمەندییەکانی جیهانی ئیسلام و لە نێو ئەویشدا خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و کێشە مێژوویی یەکانی سروشتی ململانێ و کێشمە کێشەکانی بناسین هەروەها بزانین ئەو هۆکارە کاتیانە کامانەن پەیوەندییان بە باری نائاسایی عێراقەوە هەیەو وایان کردووە ئەمریکا ئاوڕی زیاتر لە هەرێمەکە بداتەوەو بە نەمانی بارە نائاساییەکە نامێنن و تەنانەت ئەگەری ئەوەش هەیە گەچی ئەگەرەکە بەهێزیش نەبێت کە دواتر بە ئاڕاستەی پێچەوانە بکەونە کار ؟ هەر لەم میانەدا تێگەیشتن لە گوتاری خۆرهەڵاتناسی و فەلسەفەی پراگماتیزممان پێویستە کە یەکەمیان میکانیزمێکی خۆرئاوایە بۆ وێناکردنی دەرەوەی خۆی و لە هەمان کاتدا ڕوانینە خۆ لە بەرامبەر ئەوی شارستانی و کولتوری و جیاوازدا بە تایبەتی ئەوی موسڵماندا دووەمیشیان پاڵنەرەکانی سیاسەتی ئەمریکا و هەروەها حەقیقەتی دیاریکردنی چی ئەخلاقی و عەدالەت و شەڕ و خراپەیە و بە پێچەوانەشەوە لە ڕوانگەی ئەمریکییەکانەوە بە ئێمە دەناسێنێ. لەو سۆنگەشەوە کە (اسرائیل) و بەرژەوەندییەکانی کاریگەریەکی یەکجار گەورەیان بەسەر دیاریکردنی ستراتیژیەتی ئەمریکا و مەوداکانی و گوتاری سیاسی میکانزمەکانیە و هەیە، دەبێت لەئاستێکدا توانای خوێندنەوەی عەقڵی

ئیسرائیلیشمان هەبێت بەتایبەتیش پەیوەندی ئەو عەقڵە بەڕابردووی جوولەکە و زایۆنیزم و ئامانجە دوورەکانی و لەهەموو گرنگتر سەبارەت بەئێمە جۆری سەیرکردنی بۆ دەرەوەی خۆی و ئەو پێوەرانەی لەم رووە بەکاریان دەهێنێت.

پەندەوەرگرتن لەمێژووی دوێنێی خۆمان و کاریگەری کێشەی کورد لە پارچەکانی‌تری کوردستاندا وەڕەنگدانەوەی بەسەر واقعی هەرێمی کوردستانی عێراقیش،لەو مەسەلانەن کەناکرێ لەم میانەدا نادیدەبگیرێن بە خوێندنەوەی چەندینە ئەزموونی جۆراوجۆر لەدنیاشدا زوویی دەرکی ئەوە دەکەین کە ئەم جۆرە قسە و داواکاریانە بێ پاسا ونین، چونکە ئێمە کێشەکانی فەلەستین و بیابانی خۆر ئاوا و کەشمیرو چەندینی‌ترمان لەبەرچاوە کەسەرەڕای ئەوەی بۆدەیان ساڵ دەچێت رێگای نەتەوەیەکگرتوویەکانیان دۆزیوەتەوە و چەندین بڕیار لەم رێکخراوە نێودەوڵەتیەوە سەبارەت بە چارەسەرکردنیان دەرچووە و ڕابەر و پێشوازی لەبەرپرس و سەرکردە سیاسیەکانیان کراوە بە کورتی کێشەگەلێك لەمێژە بەنێودەوڵەتی کراون و تێکەڵ بەبەرژەوەندی چەندین دەوڵەت و ناوەندی جیاوازیش بوون، کەچی هێشتا جەستەیان لەشێوەی نەزیفێکی بەردەوامدا خوێنی لێدەچۆڕێ و نەگەیشتوون بەفۆڕمێ لەچارەسەر کە لانی‌کەمی مافی گەلانی خاوەن کێشە دەستەبەر بکات و دەرگای ڕۆژێکی نوێی پڕلەئازادی و خۆشگوزەرانی بەڕوویاندا بکرێتەوە یاخود هیچ نەبێ لەداگیرکردنی راستەوخۆ ڕزگاریان بێت.

کاتێ ئەوە دەڵێم وەنەبێ ئاگام لەجیاوازییەکانی هەریەك لەو کێشانە نەبێ لەگەڵ کێشەی کورددا بەتایبەتیش کێشەی فەلەستین لەپەیوەندی بەشوێنی ئیسرائیل لەستراتیژیەتی خۆرئاوا و ئەمریکادا.بەڵام جیاوازییەکان هەرچەند گەورەبن لەو سۆنگەوە

کەسەرەنجام هەموومان سەر بەهەمان بلۆکی سیاسی و شارستانی و ئابورین چەندین خاڵی وێکچوو لەنێوان سەرجەم کێشەکانی سەربەم جیهانەدا هەیە و دەبینرێت وە دیدێکی گشتی هەیە کەلەچوارچێوە فراوانەکانی ستراتیژیەتی واشنتۆن لەم روەوە دیاری دەکات.بەتایبەتیش لەم ساتە مێژووییەدا کەتەوژمێکی ئاینی سیاسی توندڕەو بەناوی بزوتنەوەی مەسیحی زایۆنی لەوڵاتە یەکگرتووەکان لەهەڵکشاندایەو ئەمەش رەهەندێکی نوێی بەسیاسەتی ئەمریکا بەخشیوە و کاریگەری راستە و خۆشی بەسەرسیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە هەیە.

ئێمەی کورد لەبەر ئەو ستەمە مێژوویی‌یە ناوخۆیی و جیهانیەی لێمانکراوە هەروەها لەبەر ئەو ئاستە ترسناکەی سەرکوتکردنمان گەیشتویەتیە کە بۆ دەیان ساڵ لە دۆزەخی قەوارە مۆدێرنەکانی ناوچەکەدا ئەوانە وا کوردیان بە سەردا دابەش کراوە سوتێنراوە. بێ ئەوەی هاوارمان بە کەس بگات یاخود کەس ئامادە بێت هاوارمان ببیستێ گەر وریا نەبین ئەو هەندە کرانەوەی ئێستا بە ڕووماندا لە ئارادایە گرەوی زیاتر لەوەی لە سەر دەکەین کە دەتوانرێ لە سەری بکرێت و هەڵیبگرێت. تەنانەت دەبێت ئاگامان لەوەش بێت کە هەندێ چالاکی دیپلۆماسی کە بە ناوی کوردەوە ئەنجام دەدرێت لە پێناو هەندێ دەستکەوتی حیزبی لە ناوخۆدا کارێ نەکات پێویستی‌یەکانی پڕوپاگەندەی سیاسی حیزبی ببێتە ڕێگر لە بەردەم هەڵسەنگاندنێکی ورد و زانستیانەی بەرەنجامەکان و ئەو گرەنتیانەی دەکرێت لە پشت ئەم چالاکیانەوە چاوەڕونیان بین.

پرسیاری گرنگ بۆ ئێمەی کورد لە پەیوەندی بە ئاستی گرەوکردنمان لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا لەوێوە دەست پێدەکات کە ئایە ئەوەی لە چەند ساڵی ڕابردوودا وای

له ئێمه کردووه بچینه ناو بازنه‌ی بیر لێکراوه‌کانی سیاسه‌تی ئه‌مریکاوه چی‌یه ؟ هه‌روه‌ها ئه‌مریکا بۆ به درێژایی جه‌وله‌کانی شه‌ڕی ناوخۆ به چ لۆژیکێکی سیاسی و میکانیزمێ ئێمه‌ی دواندوه‌و مامه‌ڵه‌ی له گه‌ڵ ئێمه‌دا کردووه ؟ به‌ڵکو له‌مانه‌ش بنه‌ڕه‌تتر ئایه ئه‌مریکا هه‌ر له بنه‌ڕه‌ته‌وه دانی ناوه به کێشه‌ی کوردا وه‌ك کێشه‌یه‌کی سیاسی چاره‌سه‌ر نه‌کراوی نه‌ته‌وه‌یه‌کی گه‌وره‌ی خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست ؟ ئایه دۆستایه‌تی ئه‌و بۆ ئێمه چی ده‌گه‌یه‌نێت ؟ باسی کرانه‌وه‌ی سنووره‌کان و سنوورداربوونی سه‌ره‌وه‌رێتی ده‌وڵه‌تی ناسیونالیستی و گۆڕانی چه‌مکه‌کان له‌م ڕوه‌وه چه‌ندیان له په‌یوه‌ندی به خواست و ئاواته‌کانی ئێمه‌وه هاتوونه‌ته دی یاخود سه‌یرکراوه یان ده‌شێ کاریگه‌ری یه‌کلاکه‌ره‌وه و له سه‌ر ئاینده‌مان دابنێن؟

**ئه‌مریکا و داننان به کێشه‌ی کوردا**

ئێمه گه‌ر سه‌یری موفره‌داتی گوتاری سیاسی ئه‌مریکی و لێدوانه سیاسیه‌کان و هه‌ڵوێستی ڕه‌سمی ئه‌و وڵاته‌و جۆری مامه‌ڵه‌کردنی بکه‌ین و به چاوێکی بابه‌تیانه‌وه شییان بکه‌ینه‌وه و بیخه‌ینه چوارچێوه سروشتی‌یه‌که‌ی خۆیه‌وه ده‌توانم بڵێم تا ئێستا ئه‌مریکا به ڕه‌سمی له دۆسیه‌کانی خۆیدا دانی به کێشه‌ی کوردا نه‌ناوه.

واته وه‌ك کێشه‌یه‌کی سیاسی چاره نه‌کراو له کاتی باسکردنی کێشه‌ی خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاستیشدا هێشتا ئێمه وه‌ك خاوه‌ن کێشه دانمان پیا نه‌نراوه. ئه‌مه‌ش موعاناتێکی نیمچه به‌رده‌وامی ناوه‌نده سیاسی و فکری و جه‌ماوه‌رییه‌که‌ی کوردستان بووه‌و له ماوه‌ی چه‌ند ساڵی ڕابردووشدا له سه‌ر ئاستی جۆراوجۆرو بۆنه‌ی جیاوازدا جه‌خت له

سەر ئەوە کراوەتەوە کە ئەمریکاو خۆرئاوا بە گشتی تاکو ئێستا بە چاوی کێشەیەکی سیاسی سەیری کێشەکەمان ناکەن و تەنها لە دیدێکی خێرخوازی و مرۆڤ دۆستانەوە تێی دەڕوانن چونکە ئەمریکا هەر لە سەرەتاوە لە دەروازەی کێشەی کوردەوە نەهاتۆتە ناو مەسەلەی عێراقی و ناوچەکەوە بەڵکو لەڕێی مەسەلەی داگیرکردنی کوێت و نەوت و ئیسرائیلەوە هاتووە.

مەسەلەی کورد لەم نێوەندەدا بە سیفەتی مەسەلەیەکی سەربەخۆ سەیر نەکراوە لە دۆسیەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و کۆشکی سپی‌دا ڕەسەن و چەسپاو نەبووە، بەڵکو بەم فۆرم و شێوە تازەی وەك شتێکی لە ناکاو و (طاريء)ێك پەڕیوەتە ناو بازنەی بایەخپێدانی واشنتۆنەوە. لە پێشەوە ئەوەمان ڕوون کردەوە کە چۆن چەند مانگێ لە پێش داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە ئەمریکی‌یەکان هەڵوێستی زۆر سلبیان بەرامبەر کێشەی کوردو ژینۆسایدی گەلی کورد هەبووە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کێشەی کورد لەم بەشەی کوردستاندا پەرەسەندنەکانی و ئەو بەرەنجامە مەیدانی و سیاسی و ئیداری و نەتەوەییانەی لێی کەوتۆتەوە بەشێکە لە دەرهاویشتەکان و ڕەنگدانەوەکانی جەنگی کەنداوی دووەم و ئەو دۆخە نوێیەی دوای سەپاندنی ئابلۆقەی ئابووری بە سەر عێراقدا لەم وڵاتەدا هاتۆتە کایەوە. گەر ئاستی بایەخدان بە کێشەی کورد لە لایەن ئەمریکاوەو لەم قۆناغەدا بە ئەندازەی ئەو پشتگیری‌یەی بپێوین کە لە فیدراڵیەتی دەکات وەك دروشمی ناوەندی جوڵانەوەی سیاسی کورد لە هەرێمدا، دیسانەوە گومانمان لەوە بۆ دروست دەبێت کە ئەمریکا بە ڕەسمی (تبنی) مەسەلەی فدراڵیەتی کردبێت و ئامادەبێت پشتیوانی لێبکات. یاخود

بڵێیت وەك توخمێكی چەسپاوی سیاسەتی خۆی لە عێراقدا مامەڵەی لە گەڵ بكات. چونكە پێم وایە ئەوەی بۆ ئەمریكی‌یەكان گرنگە گۆڕینی ڕژێمی ئێستای عێراق و هاتنە دی ستراتیژ و ئامانجەكانیانە لەم وڵاتەو تێكڕای ناوچەكەدا نەك فۆڕمی دەوڵەتی عێراقی كە داخۆ بە سادەیی دەمێنێتەوە یاخود دەگۆڕێ و دەبێ بە دەوڵەتێكی فیدراڵی. ئەم مەسەلە پێناچێت ئەو هێندە بە لای ئەمریكی‌یەكانەوە گرنگ بێت بە تایبەتیش كە مەسەلەی كورد تێكەڵاوە بە دۆسێی پەیوەندییەكانی ئەوە بە هێندە لە وڵاتانی‌تری ناوچەكەوە لە پێش هەمووشیانەوە توركیا. لە كەسیش شاراوە نیە كە ئەمریكی‌یەكان ئامادەی ئەوەیان تێدا نیە ڕەچاوی لە ئاستێكدا خواستی دۆستە توركەكانیان بكەن. هەر وەك دەشزانین هەڵوێستی توركیاش لە مەڕ پرۆسەی فیدراڵیەت ڕوونە.

واتە هیچ بەڵگەیەك نیە ئەوە بسەلمێنێ كە بە فیدراڵی كردنی عێراق بەشێكە لە ئامانجە دیاریكراوەكانی ئەمریكا لە عێراقداو هەوڵی بە دیهێنانی بۆ دەدا ئەو پەڕی ئەوەی لەم ڕووەوە بتوانین بیڵێین ئەوەیە كە لەگەڵ ئەگەری ڕازی بوونی عێراقیەكان لە ناوخۆیاندا بەم گۆڕانە لە شێوەی دەوڵەتی عێراقیدا ئەمریكی‌یەكان ڕێگری ناكەن و ناڕازی نابن. گەرچی لەم ڕووەشەوە نابێت بە ڕەهایی قسە بكەین چونكە مەسەلەی كەركوك كە بەشێكی گرنگ و ئاڵۆزە لە مەسەلەی سنووری هەرێمی كوردستان و لەولاوە تێكەڵە بە گیروگرفتی توركمان و چاو تێبڕینەكانی توركیاو دیدەكانی ناسیۆنالیستی عەرەبییەوە تێڕوانینی ئەو بۆ دوارۆژی شارەكە دەشێت یەكێ بێت لەو مەسەلانەی دیدی ئەمریكی‌یەكان بۆ چارەسەركردنی لە گەڵ چاوەڕوانیەكانی كوردا جیاواز بێت. بەڵكو دەشێ هەر لە سەرەتاوە ئەمریكا دژی ئەوە بێت لە گەڵ پرۆسەی گۆڕان لە عێراقدا هێزە كوردەكان هەوڵی سەپاندنی ئەمری واقیعێكی نوێ لەو شارەدا بدەن. بەم

لێکدانەوەش مەسەلەی فیدرالّیەت کە فۆرمی پێشنیارکراوی هێزە کوردییەکان و جولاّنەوەی سیاسی کوردە بۆ چارەسەری کێشەی کورد لەم بەشەی کوردستاندا لە ڕوانگەی ئەمریکییەکانەوە دەبێتە مەسەلەیەکی ناوخۆیی عێراقیەکان و بۆ ئەوان بەجێ هێلّراوە... هەر ئەم قەناعەتەشە وای کردووە گوتاری سیاسی ئەمریکی لە سالاّنی ڕابردوودا دەربارەی عێراق و کێشەکانی و ئایندەی چۆنّ بێت لە ئاماژەکردن بە مەسەلەی فدرالّیەت و مامەلّە کردنێکی سەریەخۆ لە گەلّ کێشەی کوردا. بەلّکو دەبێت لەوەش بترسین سنووردار کردنی خواستەکانی کورد و لە قالّبدانی کێشەی کورد ببێتە کەرەسەی سەلماندنی نیاز پاکی ئەمریکا جگە لەو بێدەنگییەی چەند سالّەی لە بۆنەیتریشدا هەستی پێکراوە بۆ نموونە لە کاتی چوونی وەفدی شەش لایەنە عێراقییەکە بۆ واشنتۆن و کۆبوونەوەیان لە گەلّ بەرپرسانی ئەمریکا بۆ تاوتووێ کردنی ڕەوشی عێراق و شوێنی هێزە بەرهەلّسکارە عێراقی دەکات و جۆری هەماهەنگی پێویست لە نێوانیاندا لە کۆتایی کۆبوونەوەکاندا ڕاگەیەندراوێك دەرکراو لەو ڕاگەیەندراوەدا ئاماژە بە فدرالّی بوونی عێراقی ئاینده کرابوو. دواتر یەکێ لە سەرکردە کوردە بەشدارەکانی کۆبوونەوەکە باسی ئەوەی کرد کە ئەمریکییەکان جۆرێك لە سەرسامیان پێوە دیاربوو کە لە ڕاگەیەندراوەکەدا ئاماژە بە فدرالّیەت کرابوو پرسیویانە ئایە ئێوە ڕازین بەو ئاماژە پێکردنە کاتێ لایەنەکانی ڕازی بوونی خۆیان نیشانداوە ئەمریکییەکانیش بێ دەنگ بوون کە بێدەنگیەکەیان ڕەزامەندی ئەوان لە سەر فیدرالّیەت نیشان دەدات. لێرەدا دوو خالّی زۆر گرنگ هەستی پێدەکرێت یەکەمیان بریتییە لەوەی کە ئەمریکییەکان نەك هەر لە ئاستی پێشنیارکردنیشدا دەستپێشخەر

نەبوون بۆ گونجاندنی فدراڵیەت لە ڕاگەیەندراوەکەدا بەڵکو لە سەرەتاشەوە بە جۆرێ لە جۆرەکان پێشیان سەیر بووە لەو ڕاگەیەندراوەدا هێما بە فدراڵیەت کراوە.

دووەمیشیان بێ دەنگی ئەوان لە بەرامبەر ناوهێنان و هێما کردنەکە بە ڕەزامەندیان لە سەر فدراڵیەت لێکدراوەتەوە، د. محمود عوسمانیش لە کۆنفرانسەکەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە لەندەن بە دوودڵیەوە لە هەڵوێستی ئەمریکای ڕووانی و هۆشیاریدا کە دەبێت کورد وریا بێت ئەمجارەش ئەمریکا وەکو جاری پێشووی کارەساتی بە سەر نەهێنێ و حساب بۆ ئەوە بکات کە واز لەو پشتیوانیە بێنێ کە ئێستا لێی دەکات.

د. محمود بەوە ئەم ڕایەی خۆی بەهێز کرد کە د. زاڵمای خلیل زاد سەفیری دانراوی نائاسایی ئەمریکا لای ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە ووتەکەی خۆیدا کە (٢٠) خولەکی ڕێکی خایاند بۆ تاقە جارێکیش ئاماژەی بە کێشەی کورد و فدراڵیەت نەکرد تەنانەت ناوی کوردیشی نەهێنا. هەر لە هەمان کۆنفرانسیشدا خانمە پەرلەمانتاری بەریتانی بەشداربوو لە کۆنفرانسەکەدا سەرنجی کوردەکانی ڕاکێشا کە دەبێت ئاگایان لە خۆیان بێت و بە وادەی بێبناغە هەڵنەخەڵتێن.

جا ئەگەر ئەمریکا لە ئێستادا کە هەڵوێستی هێزە کوردییەکانی وەك بەشێکی گرنگ لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لا مەبەستە ئەمە ئاستی پشتیوانیکردنی بێت لە سەرەتای فیدراڵەیەت و ئاوا بە مەسەلەیەکی ناوخۆی ماڵی عێراقی بزانێت ئاخۆ دەبێت کاتێ ڕژێم دەگۆڕێ و ڕژێمێکی فەرمانڕەوای دۆستی ئەمریکا لە بەغدا دەبێتە جێنشینی و ئەو پێویستیەی ئێستای بە کورد نامێنێ ئەو کاتە هەڵوێستەکە چی بەسەر بێت وە چاوەڕوانیەکانی کورد لە پەیوەندی بە هەڵوێستی ئەمریکاوە بە گوێ بکەن ؟.

پێم وایە هیچ شتێ نیە گرەنتی ئەوەمان بداتێ کە ئەمریکا لەوکاتەدا بە قازانجی کوردو بە دەستووری کردنی مافەکانی لە فۆرمی فیدرالّیەتدا هەڵوێست بگرێت و لەم پێناوەدا گوشار بخاتە سەر دەسەلاّتدارانی نوێی بەغداد بەڵکو ئەو پەڕی ئەوەی لە ئەمریکا چاوەڕوان بکرێت لەو ڕۆژەدا بیکات ئەوە دەبێت لە گەڵ سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان جووڵانەوەی کورد و ڕژێمە نوێکەدا لە سەر ناوەڕۆك و جۆری فدراڵیەتە کە پێشنیارکردنی ناوبژیوانی کردن و سەرپەرشتیکردنێکی گشتی هەندێ گفتوگۆی سیاسی بێت کەلەسەر پەرشتیکردنی گفتوگۆکانی نێوان پارتی و یەکیەتی لەکاتی شەڕی ناوخۆدا بینیمان.

مەسەلەیەکیتر لەوێنەی ئەوەی کەپێویستە ئاماژەی پێ بکەین و پەیوەستە بەهەڵوێستی ئەمریکا و ئایندەی عێراق و کێشەی کوردەوە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کەئەگەر چارەسەری فدراڵی بەشێك بێت لەچارەسەری دیموکراسی بۆ سەرجەم عێراق ئاخۆ دەبێت ئەمریکا تاچەند ڕێ بەبنیاتنانی ئەزمونێکی دیموکراسی عێراقی وابدات کەرژێمی داهاتوو توانای چارەسەرکردنی کێشەکان و نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندی پێکهاتە عێراقیەکانی هەبێت؟

دەشێ هەندێ کەس و ناوەند لەم نێوەندەدا و بۆ بنیاتنانی دیدێکی گەشبینتر باس لە نامەکەی کۆڵن پاوەڵ بۆ دانیشتنی یەکەمی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان ـ ماوەی ڕاگوزەری ـ و سەردانی بەرپرسی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا و سەناتۆرێکیتری هاوڕێی بۆ کوردستان و ئەو پشتیوانیەی بۆ کورد دەریانبڕی بێننە کایەوە بۆ ئەوەی دیدێکی پێچەوانەی ئەوەی ئێمە دەرمان بڕی بخەنە

ڕوو بیسەلمێنن کەپشتیوانی ئەمریکا بۆ کورد ئەو سنورانەی تێپەڕاندوە کە لەم وتارەدا وەك خۆی باسکرا، بەڵام لەڕاستیدا لەگەڵ گرنگیی مەعنەوی ئەو نامەو سەردانە لەناوەڕۆکی نامەکە و وتەی بەرپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا لەپەڕلەمان واتێدەگەیت ئەمریکییەکان بەگشتی کێشەی کورد و چارەسەرکردنی مەینەتیەکانی گەلی کوردلەچوارچێوەی هاوولاتێکی یەکسان و دیموکراسی و یاساسەروەری و ڕێزگرتن لەمافەکانی مرۆڤ سەیر دەکەن و تەرح دەکەن. ئەوە ڕاستە کەهاوسۆزیان دەربڕیووە لەگەڵ ئەوەی بەسەر کوردا هاتووە وەستایشی ئەو نمونەیان کردووە کە کورد لەهەرێمەکەدا نیشانی خەڵکی عێراق و ناوچەکە و دنیاشیان داوە و باسی شەراکەتی کوردیان وروژاندووە لەمەسەلەی ئەوەی ناویان ناوە جەنگی دژی تیرۆر هەروەها دۆستایەتی ئەمریکایان بۆ کورد دەربڕووە ئاماژەیان بەوەداوە کەئیتر کورد چی دی تەنها چیاکان دۆستی نین بەڵکو لەدنیادا دۆستی زۆری هەن و لەوانەش ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا بەلام هیچ کام لەنامەکە و وەفدە ئەمریکی‌یەکەی ئەنجومەنی پیران تەنانەت لەم کاتە ناسك و یەکلاکەرەوەشدا ئامادەنەبوون لەمینبەرێکی وەکو تەلاری ئەنجومەنی نیشتیمانیەوە پشتیوانی ڕوونی ئەمریکا بۆ فدرالیەت وەك سەقفی ئەم قۆناغەی داخوازییەکانی کورد دەربڕن هەڵبەت ئەوە ڕاستە کە بەراورد لە گەڵ پێشوودا ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بە بەرەو پێشچونەکانی لە پەیوەندی‌یەکانی کورد بە ئەمریکاوە بەلام شاگەشکە بوون بەم بەرەو پێشچونە و ستایشی زیاد لە پێویست نابێ بمانخاتە سەر ئەو کەلکەڵەی کە ئەم ئاستە لە پەیوەندییەکان گەیشتۆتە ئاستی دانپیانانی سیاسی و جیاکردنەوەی دۆسیەی کوردی وەك دۆسێی کێشەیەك کە دەیان ساڵ پێش جەنگی کەنداوی دووەم هەیەو بەردەوامە لە سەر ئاستی عێراقدا.

دەبێت لە لێکدانەوەکانمان بۆ ناوەڕۆکی نامەکەو ووتەی وەفدەکە (توقیت) و پێویستی‌یە ئیعلامی و سیاسی و مەیدانیەکانی ئەمریکامان لە مەسەلەی عێراقدا لە بیر نەچێت. زۆریش پاساو بۆ ناڕۆشنی هەڵوێستی ئەمریکا لە مەڕ مەسەلە سیاسی یەکەی کێشەکەمان نەهێنینەوە کە ناچارە لە پەڕتووکەکان و ئەو هەستیاریەی هەڵوێستێکی لەم جۆرە لای ئەوان دەیجولێنێ بەم زمانە دیپلۆماسیە بدوێن و هەموو جارێکیش دڵمان بە دان پیانانی (ضمن) ی خۆش ئەکەین ناوەڕۆکێکی زیاد لەوەش کە هەڵیدەگرن نەدەین بەو پەیامە سیاسیانەی لەم جۆرە هەڵوێست و لێدوانانەوە دەخوێنرێتەوە.

هەروەها دەبێت بە جوانی لە مەغزای دۆستایەتی ئەمریکا بۆ کورد یاخود ئامادەیی بۆ بەرگریکردن لێی تێبگەین. گەر خوێندنەوەیەکی قوڵمان بۆ هەڵوێستی ئەمریکا هەبێت ڕەنگە بگەینە ئەو قەناعەتەی کە ناردنی نامەکەو هاتنی وەفدەکە و قسەکردنەکەی لە پەڕلەمان (اعتراف)ی (ضمن)ی ڕەسمی ئەمریکا نیە بە ڕەمزیەتی پەڕلەمان لە پەیوەندی بە کێشەی کورد و ئایندەی ئەم کێشەوە بەڵکو زیاتر لەوە ئاماژەیە بە ئایندەی عێراق، ئاماژەیە بە مەسەلەی دیموکراسی لە عێراقدا بەدەر لەوە مامەڵە کردنی ئەمریکا تاکو ئێستا لە گەڵ هەرێمدا مامەڵە کردنە لە گەڵ (ئەمری واقیع) دا.

پەڕلەمانیش بەشێکە لەو ئەمری واقیعە. دۆستایەتی ئەمریکاش بۆ ئێمە لە ئایندەدا مەرج نیە بەو مانایە لێکبدەینەوە ئامادەیە پشتمان بگرێت بۆ گەیشتن بە مافەکانمان و هاتنە دی ئاواتەکانمان بەو جۆرەی ساڵەهای ساڵ خەباتی بۆ دەکەین و ڕەنجی بۆ دەکێشین. بەڵکو پێ دەچێت ئەوە ڕاستتر بێت کە ناوەڕۆکی ئەو دۆستایەتی‌یەی ئەمریکا بۆ کورد لەم قۆناغەدا بەوە لێکبدەینەوە کە ئیتر کورد وەکو جاران تووشی

ژینۆساید و ئەنفالکردن و کیمیابارن و کوشتنی بە کۆمەڵ و وێرانکردنی هەزاران گوند و شارۆچکە نابێتەوە. ئەو قۆناغە بەسەرچوو کورد بەم جۆرە مامەڵەی لە گەڵ بکرێت و ئەمریکاو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بێدەنگ بێت واتە تەرح کردنی مەسەلەکە لە سەر ئاستی مافی هاولاتی. هەموو ئەمانەش ئەوەمان بۆ دەخەنە ڕوو کە پرسی کورد بە مانای ووشە هێشتا زیاتر بە نێودەوڵەتی نەبووە ئەوەی بە نێودەوڵەتی بووە مەسەلەی عێراقە نەك مەسەلەی کورد مانای بەنێودەوڵەتی بوونی مەسەلەی عێراقیش کتومت واتای بەنێودەوڵەتی بوونی کێشەی کورد لە کوردستانی عێراقدا ناگەیەنێت چونکە خۆی وەکو کێشەیەکی سەربەخۆ سنوورەکانی نەبڕیوە بەڵکو وەك بەشێ لەکۆی کێشە عێراقیەکە ئەو سنوورانەی بڕیوە. پێشوازی کردن لە سەرکردە کوردەکان لە لایەن بەرپرسە باڵاکانی وڵاتان و لەوانەش وڵاتە بڕیار بەدەستەکان و ئەمریکا یەکسان نیە بە نێودەوڵەتی بوونی کێشەی کورد بە واتای یاسایی و سیاسیەکەی چونکە هێزە کوردییەکان لە مەسەلەکانی پەیوەند بە عێراقەوە تاکو ئێستاش وەك بەشێ لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بانگ دەکرێن و مامەڵە دەکرێن و بانگ کردنەکانیش بۆ کۆبوونەوەو چالاکیە سیاسی‌یەکانی ئۆپۆزسیۆن و ئەمریکاش لە سەر ئاستی حیزبە کوردیەکان و بە تایبەتیش دوو حیزبە گەورەکەدا ئەنجام دەدرێت نەك کێشەی کورد. هەرچی پەیوەندی بە کرانەوەی سنوورەکان و گۆڕانی چەمکەکان و کاریگەریەکانی جیهانگیریشەوە هەیە دەبێت تەنها لە سەر ئاستی جیهاندا سەیریان نەکەین و لەوێوە ڕەنگدانەوەیان بۆ سەر کێشەکەی ئێمە دیاریدەکەین، بەڵکو تایبەتمەندی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕووی سیاسی و مێژوویی و جوگرافی و ئەمنی‌یەوە لەبەرچاو بگرین چونکە مەرج نیە ئەوەی لە یەکیەتی سۆڤیەت و یۆگۆسلافیای جاراندا ڕوویدا بەهەمان شێوەش لە

خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوویدات و دووباره ببێتەوه دەبێ بزانیت تاکو ئێستاش لەم ناوچەدا ئەمریکا لە شوێن و کاتی جیاجیا پەیڕەوی لە یەکێ لە پرەنسیپە کۆنەکانی سیاسەتی دەرەوەی خۆی دەکات کە بریتی‌یە لە ئیدارەکردنی ململانێکان نەك چارەسەرکردنیان لە فەلەستین تاکو ئێستاش بەو جۆرەیە لە شەڕی ناوخۆی کوردستاندا بەو جۆرە بوو لە (١٠) ساڵی ڕابردووی عێراقیشدا هەر هەمان شت بوو کە ڕەنگە ئەگەر ڕووداوەکانی (١١)ی ئەیلول نەبوایە جاریٚ مەسەلەکە هەر بەو جۆرە بوایە. بۆیە دەبێت حساب تەواو بۆ پاشماوەکانی ئەم سەرەتایە لە سیاسەتی ئێستای ئەمریکا ڕابکەین.

## کێشەی کورد هێشتا ڕێگای بەرەو نەتەوەیەکگرتوەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی نەبڕیوە.*

تاکە بڕیارێك لە ئەرشیفی نەتەوەیەکگرتووەکاندا ناوی کوردی تێدا هاتبێت بڕیاری (٦٨٨) ی ئەنجومەنی ئاسایشە. کە تایبەتە بە چەوساندنەوەی شیعە و کوردەکان لە عێراقدا و ڕێگادان بە گەیشتنی کۆمەکە مرۆڤ دۆستییەکان بە خەڵك. ئەو بڕیارەش وەك دەزانین لە نێو هەموو ئەو بڕیارانە ئەنجومەنی ئاسایش کە دەربارەی عێراق دەرکراون (ملزم) نیە و تەنها بۆ کورد دەرنەکراوە. کەچی کێشەیەکی وەکو کێشەی کشمیر سەرەڕای ئەوەی کە لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕێی دەنگدانێکی ئازادی گشتی‌یەوە مافی چارەی خۆنووسینی خۆیان دیاری بکەن کەچی ئێستاش ئەوە

---

* لە مانگی ٢٠٠٣/٢ دا لە دووتوێی نامیلکەیەکدا بڵاو کراوەتەوە.

حاڵیانە کە دەیبینن. لە کاتێکدا دەوڵەتێکی وەکوو پاکستان بە گەل و حکومەتەوە کێشەکەیانی (تبنی) کردووە و هەموو پشتیوانیەکی ماددی و مەعنەوی لێدەکەن، بەڵام کێشەکەی ئێمە تاکو ئێستا بەم جۆرە نەچۆتە ناو دۆسیێ ی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە چوارچێوەی بەڵگەنامەی ئەو ڕێکخراوەو دامەزراوەکانیدا مامەڵەی لە گەڵ ناکرێت. ڕاستە کە ئێستا ئەمریکا تا ڕاددەیەکی بەرچاو لە ڕووی مەیدانیەوە ڕۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان هەر گرنگی خۆی هەیە.

دیپلۆماسیەتی کوردیش لە ئێستادا قورسایی پێویست بخاتە سەر ئەم ڕێکخراوە هەوڵدات مامەڵەکردنی لە گەڵیدا لە ئاستی ئاژانسە مرۆڤ دۆستەکان و ڕێکخراوەو ناحکومیەکانەوە بەرز کاتەوە بۆ سەرەتای مامەڵەیەکی سیاسی و دانەنان بە کێشەی گەلی کوردستاندا چونکە بڕیارەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان گەر توانای پابەند کردنیشیان لاواز بێت بناغەیەکی باشن بۆ خەباتی سیاسی و دیپلۆماسی و توێژی سیاسیانە لە بەر تیشکی ئەو باس و خواسانەی سەرەوەدا دەخوازم بڵێم گرنگی کارکردنی زیاتری کورد لە سەر ئەورووپاو وڵاتانی ناوچەکەو ناوەوەی عێراق و هێزەکانی زیاتر ڕوون دەبێتەوە بۆ ئەوەی لە گەڵ گرنگی زۆرو هەستیاریشدا زیاد لە پێویست گرەو لە سەر هەڵوێستی ئەمریکا نەکات هەروەها ئاوڕێکی جدی بەرەو ڕێکخستنەوەی نێوماڵی خۆی و ئامادەکردنی بدات کە هەموو دەزانین خراپەکاریەکانی ساڵانی ڕابردوو شپرزەیی و لاوازی بێهودەیی زۆری تێدا دروستکردووە. لە کۆتایشدا گرنگە کورد حساب بۆ هەموو ئەگەرەکان بکات.

تەنانەت ئاساییە حساب بۆ ئەوەش بکات کەلە گەڵ ئەگەری نەسەلماندنی مافەکانی کورد لە لایەن دەسەڵاتی داهاتووە وەهەر جووڵانەوەیەکی چەکدارانە کوردی بە

کردەوەیەکی ئیرهابیانە لێکبدرێنەوە کە لە لایەن هێزە نەیارەکانی واشنتۆنەوە پشتیوانی لێدەکرێت. هەموو ئەم سەرنجامەش دەمانخەنە سەر ئەو باوەڕەی کە خەباتی سیاسی دیپلۆماسی و جەماوەری کورد لە پێناو گەیشتن بە مافەکان لە فۆرمێکی بە دەستووری کراودا ڕێگایەکی درێژی لە پێشەوە ماوەو زۆر ئاسایشە کە بەشێکی بەرچاو لەو زەماوەند بوونە ئاڕاستەی ئەمریکا بکرێت. بۆیە حوکمدان لە نیوەی ڕێگادا پێش دەرکەوتنی سەرجەم ئاسۆکان و بیناکردنی گوتاری تاکتیکی سیاسی لە سەر ئەو بناغەیە کارێکی نالۆژیکی و هەڵەیە.

## ناسیۆنالیزم، دیموکراسی، عەقلانیەت و ڕۆشنگەری*

بۆ قسەکردن لەسەر چەمکی ناسیۆنالیزم و بەهای مرۆڤ و ئەقلانیەت و دیموکراسەت لە نێو پێکهاتە ژیاریەکاندا کە کۆی ئەم چەمکانە لە دنیای ئێمەدا هەمیشە بوونەتە دەروازەیەك تا زۆرێك لەم ڕۆشنبیر و کەسایەتیە سیاسی و خاوەن بۆچونانە قسەی جدییان لەسەر بکەن. لەم تەوەرەشدا هەوڵدراوە بەشێکی زۆر لەم ئیشکالاتانە گفتوگۆ بکەین لەگەڵ نووسەر و ڕۆشنبیر ئەبووبەکرعەلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکگرتوی ئیسلامی کوردستان و وەزیر لە کابینەی تازەی حکومەتی کوردستان.

**کوردستان راپۆرت:** لەسەردەمی بەجیهانی بووندا مانەوەی وتاری ناسیۆنالیستی چۆن دەبینی؟

**ئەبوویەکر عەلی:** رەنگە ئەم پرسیارە رەنگدانەوەی بە ئایدۆلوژیکردنی جیهانگیری بێت لە لایەن هەندێ ناوەند و تیۆریستی نێودەوڵەتییەوە، بە تایبەتیش لەگەڵ سەرهەڵدانی رواڵەتەکانی جیهانگیری و بڵاوبوونەوەیان بە جیهاندا، ئەم پرسیارە سەری هەڵدا، واتە پرسیار لە چارەنووسی ناسیونالیزم، لە سایەی جۆرێکی نوێ لە پەیوەندی نێودەوڵەتی و ئاستێکیتر لە تەکنیك و سیستەمی پەیوەندی و بەیەکگەیشتن و

---

* ڕۆژنامەی کوردستان راپۆرت ژمارەکانی (٣٢٦ـ٣٢٨) تشرینی دووەمی ٢٠٠٧ چاوپێکەوتنی سۆران عەزیز.

بەیەکداچوون، کە لە ڕواڵەتدا خۆی وەك جێگرەوەی ناسیونالیزم دەخاتەروو. بە واتایەکیتر بەشێ لە مژدەدەرانی بە جیهانی بوون دەخوازن بانگەشەی مەرگی ناسیونالیزم بکەن و پەیوەندی نێوان بە جیهانیی بوون و ناسیونالیزم وەك دژواری (تناقض) و بەیەکەوە هەڵنەکردن وێنابکەن و، باس لەوە بکەن کە جیهانی بوون یەکسانە بە تێپەڕاندنی سنورە نەتەوەییەکان و ملنان بەرەو دەستی کۆمەڵێ دامەزراوەی جیهانی کە لە دەرەوەی خواست و دەسەڵاتە ناسیونالیستەکانەوە دەسەڵات و هەژمونی خۆیان بەسەر نەتەوە و دەوڵەتاندا دەسەپێنن. ئەم دیدەش دەتوانین تا ڕادەیەك و بە جۆرێ لە جۆرەکان، ڕەگ و ریشەکانی بگێڕینەوە بۆ سەر ئەو بۆچوونە مارکسیستی‌یەی کە ناسیونالیزم بە دیاردەیەکی کاتی و تێپەڕی ژیانی مرۆڤایەتی دادەنێت، بەڵام دیارە جیاوازی لێرەدا لە نێوان ئەم بۆچوونە و فۆکۆیاما مەشرەبەکاندا لە فەزا و جۆری تێپەڕاندنەکەدایە، گەر لە بۆ چۆنە مارکسیستی‌یەکەدا پێنانە ناو قۆناغی کۆمۆنیزم سنورەکانی ئەو کۆتاییە دیاری دەکەن، ئەوا بە گوێرەی دیدە لیبراڵییە هاوچەرخەکە، گەشەکردنی خودی سەرمایەداری ئەو کارە دەکات. گەر قسەکردنەکانمان چڕ بکەینەوە، دەبێ بڵێین ڕوداوەکانی جیهان و سەرهەڵدانەوەی بە جۆش و خرۆشی ناسیونالیزم لە چەندین گۆشە و کەناری جیهاندا، ئەوەیان خستەڕوو، کە جیهانگیری لانیکەم تا ئەم ساتەوەختە نەك هەر نەبۆتە هۆی سستکردن و سڕینەوەی ناسیونالیزم و تێپەڕاندنی، بەڵکو لە هەندێ شوێن و کاتدا بۆتە هۆی دووبارە بوژاندنەوە و سەرهەڵدانەوەشی، چونکە لەگەڵ فشاری میکانیزمەکانی جیهانگیریدا، بە تایبەتیش کە لە هەندێ ڕووەوە، فۆرمێکی نویی باڵادەستی خۆرئاوا دەخاتەڕوو، جارێکیتر پرسیاری (شوناس) بەجدییەتێکی زۆرتر لە جارانەوە هاتۆتەوە کایە.

پرسیاری (شوناس) یش گەر لە بەشێکدا گرێدراوی (ئاین) بێت، لە بەشێکیتردا گرێدراوی ناسیونالیزمە، لەو سۆنگەوە کە ناسیونالیزم و پرسیاری شوناس لە بەیەکداچوونێکی مێژوویی فرەرەهەندان.

هەموو ئەمانەش ئەوە دەسەلمێنن کە قسەکردن لە ونبونی ناسیونالیزم وەك دیاردە و تەوژم و سەرەتای سیاسی هێشتا کاتی نەهاتووە، بەڵکو وەك ئاماژەمان پێکرد لە هەندێ شوێن و کاتدا جیهانگیری بۆتە دەرفەتێکیتر بۆ بووژانەوە و گوزارشت لە خۆدانەوەی هەندێ ناسیونالیزم، بە تایبەتیش ناسیونالیزمە سەرکوتکراوەکان، بەڵام ئەم قسانە ئەوە ناگەیەنێت جیهانی بوون، هیچ کاریگەریەکی لەسەر ناسیونالیزم و دەوڵەتی نەتەوەیی نییە، یاخود فۆرمە کۆنەکانی ناسیونالیزم بە تایبەتیش لە بەرگە بەرگیر و داخراوەکەیدا، دەتوانن رۆڵی گەورە بگێرن، چونکە لەگەڵ گەورەبوونی مەیدانخوازی (تحدیات)ەکان و قوڵبوونەوەی نیگەرانییەکان، بارستە شارستانی و ئایینییە گەورەکان دەبنە یەکەی داڵدەدان و گیرسانەوە و ریزبەندی پەیوەندی و سەرچاوەی بەها و ئیلهام و پێکهێنەری رەهەندێکی گرنگی شوناس. ناسیونالیزمیش بە سروشتی حاڵ، لەگەڵ ئەم دۆخە نوێیەدا تێکەڵ دەبێت، بێئەوەی بە تەواوی مەیدان چۆل بکات.

**کوردستان راپۆرت: بەرای تۆ ناسیۆنالیزم تاچەند لەهەناوی خۆیدا جێگای بۆدیموکراسی هەیە؟**

**ئەبووبەکر عەلی:** ئێمە کە باس لە ناسیونالیزم دەکەین نابێ پێمان وابێت کە یەك فۆرم و مۆدێلمان لە ناسیونالیزم هەیە، چونکە لە واقیعدا زیاتر لە نموونە و فۆرمێکی

ناسیونالیزم لە مێژووی ناسیونالیوم و ئەزموونە جیهانییەکاندا دەبینرێت. لە رووی مێژووییەوە و لە پەیوەندی بە مێژووی واقیعی وڵاتانی خۆرئاواوە کە هەر ئەویش ژینگەی سروشتی سەرهەڵدانی ناسیونالیومە، سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم و مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە) ئەو چوارچێوە سیاسی و ئابوری و رۆشنبیرییە نوێیە بووە، کە دیموکراسی تیایدا گەشەی کردووە، بەڵام پەیوەندی ناسیونالیزم و دیموکراسی تارادەیەکی زۆر وەك پەیوەندی نێوان سیکولاریزم و دیموکراسی وایە، واتە هەر چۆن مەرج نییە وڵاتێك گەر عەلمانی بوو، (دیموکراسی) یش بێت، هەروەك لە نمونەی وڵاتانی کۆمۆنیزمی جاران و چەندین وڵاتانی ناوچەکە و جیهان وەدەرکەوێت، هەر بەو جۆرەش لەگەڵ ئەوەشدا کە مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە) لە روی مێژووییەوە لەخۆگری گەشەکردنی ئەزموونە دیموکراسییەکان بووە، بەڵام لەگەڵ دیموکراسیدا بەیەکەوە گریدراوێکی لە جیاکردنەوە نەهاتوو نین واتە (لازم و ملزوم)ی یەکتر نین، مەرج نییە هەر ئەوەندەی دەسەڵاتێ هەڵگری خەمی ناسیونالیستی بوو، دیموکراسی بێت، بۆ سەلماندنی ئەم راستییەش دەیان نموونە لەسەر ئاستی جیهان و ناوچەکە هەن و، کوردیش یەکێکە لە قوربانیانی سایەی کۆمەڵێ دەسەڵاتی ناسیونالیستی هاوچەرخی دارِنراو لە دیموکراسی و فرەیی. لەوەش زیاتر لە هەندێ کات و شوێن و جیهانی سێیەم و خورهەڵات زۆرجار بە ناوی ناسیونالیزمەوە دژایەتی دیموکراسی کراوە، بە بیانووی بەدیهێنانی یەکیەتی ناوخۆیی و رووبەڕووبوونەوەی مەترسییە دەرەکییەکان و هێنانەدی پەرەپێدان و مۆدێرنیزەکردنی وڵات، خواستە دیموکراسییەکان وەلانراون و لەبری میکانیزم و شێوازەکانی دیموکراسی لە رێی سەرکوت و زەبرو زەنگ و خۆسەپاندنەوە دەسەڵات و وڵات بەڕێوە براوە. وڵاتانی عەرەبی بە تایبەتیش ئەوانەی سەردەمانێ

پەرەستێنی پڕۆژەی ناسیونالیزمی عەرەبی بوون، لە نموونەی ئەم دەسەڵاتانەن. ئەمە جگە لەوەی ناسیونالیزم لە فۆرمە پەرگیر و توندڕەو و ڕەگەزپەرەستەکەیدا، نەك هەر دەبێتە هەڕەشە بۆسەر دیموکراسی و کلتوری دیموکراسی، بەڵکو سەردەکێشیٚ بۆ هەڕەشەکردن لە کۆمەڵگای نیشتمانی و ئاشتی و ئارامی نێودەوڵەتی، ئەمەش زیاتر لەو ناسیولیزمانەدا دەردەکەوێت کە لەسەر بناغەی (نەژاد) فۆرمۆڵەبوون، نەك بوونی ئیرادەی بەیەکەوەژیانی هاوبەش و هاونیشتیمانییەتی، کە نموونەی زەقی ئەم مۆدێلەش نازیزم و فاشیزم و تارادەیەکی بەرچاویش کەمالیزمە. بەعسیزمیش هەر لەو سێبەرەدا دەخوێندرێتەوە. ناسیونالیزمیٚ فرەییەنەتەوەیی و ئایینی و فکری و سیاسی ڕەتکاتەوە، لێبوردە و کراوە نەبێت، ناتوانێت ببێتە چوارچێوە و سەرزەمینی خەملاندنی ئەزموونێکی دیموکراسی.

دیارە گەر ئەم مۆدێلە لە ناسیونالیزم لە ڕابردوودا مەترسی بوویێت و کارەساتی خوڵقاندبێت، ئەوا لە ئێستادا ترسناکترە. دۆخە هاوچەرخەکانیش هەموو دواخستێکی ئەرکە دیموکراسییەکان بە بیانووی ئەرکە ناسیونالیستەکانەوە ڕەت دەکەنەوە، چونکە پەرەپێدان بە ئەزموونی دیموکراسی خۆی لە خۆیدا گەورەترین ئەرکی دەسەڵاتێکی ناسیونالیستییە. هەموو ڕەچاوکردنێکی دۆخ و ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگاش دەبێت لە ڕوانگەی پێداویستییەکانی سەرکەوتنی خودی ئەزموونە دیموکراسییەکەوە سەیر بکرێت و بخوێنرێتەوە و قسەی لەسەر بکرێت، نەك لە دیدێکی ناسیونالیستانەی بەرتەسکەوە، کە هەندێجار نوخبەیەکی سیاسی وەك پاساو سودی خراپی لیٚ وەردەگرێت بۆ درێژەدان بە دەستکەوتە ناڕەواکانی.

**کوردستان راپۆرت:** وەك دیارە سەرمایەداری لەم وڵاتانەی لایی ئێمە خەریکە گەشەدەکات ئایا پەیوەندی سەرمایەداری وناسیۆنالیزم و عەقڵانیەت چۆن دەبینی ؟

**ئەبوویەکرعەلی:** هەروەك باسمان کرد ناسیونالیزم لە سایەی گەشەکردنی سەرمایەداری دا گەشەی کردووە، لە روی مێژوویی یەوە دوای چاخی بوژانەوە و سەرهەڵدانی بۆچۆن و ئایدیا نوێکان و ریفۆرمی ئایینی و بە لەرزەخستنی پایەی رژێمە کۆنەکان و ژێرخانی ئایینی و پەیوەندیە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها هاوکات لەگەڵ دۆزینەوە جوگرافییە نوێکان، گۆران لە ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا و فراوانبوونی بەرهەم و گەشەکردنی بازرگانی و دەرکەوتنی چینێکی نوێ و کۆمەڵایەتی کە ئەویش بریتی بوو لە چینی بۆرژوازی سەری هەڵداو بڵاوبۆوە، ساتە وەختێك چیتر سایەی ئیمپراتۆریەت و مۆدێل و پەیوەندییە کۆنەکانی دەسەڵات، نەیاندەتوانی ئەم گەشەکردنە بێپێشینە و خێرا و هەمەلایەنانە لەخۆ بگرن، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە ببوونە رێگر لەبەردەم پێشکەوتنی زیاتر و هێنانەدی خواستەکانی چینی تازە پەیدابووی بۆرژوازی. سنورە دەرەبەگییەکان و دەسەڵاتی دەرەبەگەکان لە میرنشینەکاندا لە سایەی دەسەڵاتێکی فشەڵی ئیمپراتۆریانەدا، کۆت و بەندی گومرگی رێگریان لەبەردەم ئازادی هاتوچۆی بازرگانی و دروستبوونی بازاڕی نیشتیمانی گەورە کە پێداویستییەکی گەشەکردنی سەرمایەداری بوو، دروستکردبوو.

لێرەوە لە رووی مێژووییەوە گەشەکردنی سەرمایەداری و ناسیونالیزم بەیەکداچوون. کاتێك ئیمپراتۆرییەتەکان بەرەو هەڵوەشانەوە برۆن، کلێسا و ئایینی مەسیحی لەبەرگی سەدەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتی خۆی وەك سەرچاوەیەکی رەوایی و هێزێکی ئاراستەکەر و فۆرمێ لە بەڕێوەبردنیش لە دەست بدات، ئەوا مۆدێلی (دەوڵەت ـ نەتەوە)

دەمێنێتەوە بۆئەوەی ببێتە سەرزەمینی ئەزموونێکی نوێی حوکمڕانی سیاسی، بەسەیرکردنی گەشەکردنی مێژوویی هەریەك لەسەرمایەداری و ناسیۆنالیزمیش دەردەکەوێت.

کە سەرمایەداری لە چەندین ڕووەوە سودی لە ناسیونالیزم وەرگرتووە لەوانەش:

أ) مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە بووە چوارچێوەی جێگیربوون و بەدیهاتنی خواستەکانی چینی بۆرژوازی خاوەن سەرمایە.

ب) ئەم چینە ناسیونالیزمی وەك ئایدۆلۆژیایەکی روحی بەکارهێنا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە روحییەی بزووتنەوەی رۆشنگەری و لێدانی ئایین لە خۆرئاوادا دروستیان کردبوو.

ج) شکۆمەندی و خوێنگەرمی نەتەوەیی لە قۆناغێکیتردا بەکارهێنا بۆ داگیرکردنی وڵاتان و دۆزینەوەی بازاڕی گەورەتر و دزینی خێروبێری خواپێداوی چەندین گەل و نەتەوە.

گەر قسەیەك لە پەیوەندی نێوان ئەقڵانیەت و ناسیونالیزمیش بکەین، دەبێت زیاتر لە گۆشە نیگایەکەوە لە چەمکی ئەقڵانیەت رابمێنین. گەر ئەقڵانیەت وەك هەڵوێستێك سەیر بکەین بەرامبەر بە لێکدانەوە و بۆچوون و تێزە ئایینییەکە، بە تایبەتیش لە ئەزموونی خۆرئاوادا، ئەوا دەتوانین بیخەینەڕوو کە ناسیونالیزم دەرکەوتێکی بزووتنەوەی ئەقڵانیەتی خۆرئاوایە، چونکە بەرهەمی ریفۆرمی ئایینی و روشنگەری و گەشەکردنی لیبرالیزمە، بەڵام ئەگەر ئەقڵانیەت وەك دژە جەمسەرێك لە بەرامبەر رۆمانسیزمەوە دابنێین، وەك ئەوەی رۆسۆ و هاوبیرەکانی لە هەندێ رووەوە خستۆیانەتە

روو کە لەوێدا ئەقڵ بەرامبەر سۆز و خەیاڵ و هەستە قووڵەکانی ناخی مرۆڤ رادەگیرێ و یەکسان دەبێت بە سوکایەتیکردن بە سۆز و هەستە مرۆڤایەتی‌یەکان، ئەوا دەتوانین ناسیونالیزم لانیکەم لە بەشێکی بەرچاویدا لە چوارچێوەی رۆمانسیەتدا ریزبەندی بکەین، لەو سونگەوە کە ناسیونالیزم بە پلەی یەکەم سۆز و هەستکردن بە ئینتیمایە، بە تایبەتیش لەسەر ئاستی تاکەکەسی، ناسیونالیزم لەم روەوە هەڵگری رەگێکی ئاینییە و دەست و پەنجە لەگەڵ سۆز و خوێنگەرمی و جۆش و خرۆشی جەماوەریدا نەرم دەکات، لە مۆدێلە ناسیونالیزمە توندڕەوەکانیشدا سودی خراپ لەم رەهەندەی ناسیونالیزم وەرگیراوە و کراوە بە تلیاك و میکانیزمێ بۆ ئەوەی تاك خودی خۆی لەبیر بچیێتەوە و ببێ بە گردێ لە بارش و شەپۆلێکی جەماوەری گەورە و ئەقڵی دەستە جەمعی تاکەکان بەڕێوەبەرێت و بە شێوەیەکی یەکجار نائەقڵانیش پرۆسەی بە مێگەلبوونی سیاسی روویدات و، ناسیونالیستە دەمارگرژ و خۆلەبیرکردو و دەروون کڵپە سەندووەکان پۆل پۆل بەرەو پیری مەرگ برۆن و لەم پرۆسەیەشدا ببنە سووتەمەنی مەیلێکی نەژادپەرەستانەی دواکەوتوو و دەسەلاتێکی سەرکوتکەر و شەڕخواز.

ناسیونالیزم لە گەڕانەوەیدا بۆ مێژووش، بۆ بەدەستهێنانی رەوایەتی و دیارکردنی هێما و بەها و قووڵاییەکانی، گەر لە روویەکەوە کارێکی ئەقڵانی ئەنجام بدات، ئەوا لە روویەکی‌تردا مامەڵە لەگەڵ ئەفسانە و راڤەی نائەقڵانی و ساختەکردنی مێژوو و زیادەڕۆیی و جۆرەها شێوازی‌تری نائەقڵانی دەکات. لەم حاڵەتانەی ئامازەشمان پێکردن ئەقڵانیەتی ناسیونالیستی لە پلەی یەکەم ئیش بە ئەقڵی ئامێری دەکات، بەو جۆرەی کە لە بیری فەلسەفی هاوچەرخدا خراوەتەڕوو. پێموایە گەر لە ئاستی یەکەمدا دەرچین، واتە دانانی ئەقڵانیەت بەرامبەر راڤەی ئایینی، گەرچی ناسیونالیزم بە تەواوی

بەتاڵ نەبۆتەوە لە هەستی ئایینی، هەر بۆیە لە جیهاندا نمونەی ناسیونالیستی ئایینی دەبینین، وە ناوەرۆکێ بدەین بە ئەقڵانیەت کە مەرجەعیەتەکەی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و کەرامەتی ئینسانی و کۆمەڵگای خوشگوزەران و ئازادی بێت، ئەوا دەتوانین بڵێین ناسیونالیزم لەو کاتەدا لەگەڵ ئەقڵانییەتێکی هاوسەنگدا سازگارە کە ببێتە چوارچێوەیەك بۆ گەشەسەندنی دیموکراسی و متوربەکراو بێت بە بەهاکانی ئازادی و فرەیی و مافەکانی هاووڵاتی و لێبووردەیی و ئاشتیخوازی. لەم فۆرمەدا ئەقڵانیەت دەبێتە سیمایەکی ناسیونالیزم. لە رووی ئەقڵیشەوە، گەر ئەقڵانیەت لەپشت سەرهەڵدانی ناسیونالیزمەوە بووبێت، ئەوا لە ئێستادا دوای چەندین کارەسات کە ناسیونالیزمی لە پشتەوە بوە، هەتا بڵێی گرنگە خۆی بە ئەقڵانی بکرێت. لێرەشەوە ئەقڵانیەت دەبێتە هێزێکی کۆنترۆڵکەری ئاراستەکەر. دەبێت بە سیما و نوێنەری لیبرالیزم و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و مافەکانی هاووڵاتی و نەتەوەیەککرتوەکان و کۆڕ و کۆمەڵە جیهانییە مرۆڤدۆست و ئاشتیخواز و دژ بە شەڕەکان.

**کوردستان راپۆرت:** کۆمەڵگای ئێمە رەوتەکانی رێنسانس و رۆشنگەری نەبینیوە و ناسیۆنالیزمی عەولەمەی هەیە چۆن دەتوانێت دیموکراسی وەك پرەنسیب قبوڵ بکات؟

**ئەبوبەکرعەلی:** مەرج نییە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی هەموویان بە هەمان پلەبەندی مێژوویی پەرەسەندنی خۆرئاوادا برۆن، چونکە گرفت و شوێن و کاتەکان و کاریگەری ژیاری نوێی خۆرئاوا و دەور دەبینین. ئەو شتانەی کە رۆشنگەرەکان لە خۆرئاوا خەباتیان بۆ دەکرد و دواتر رێبەرە سیاسی و فکرییەکانی گەلانی ئەوروپا داوایان دەکرد، بوونەتە دەستکەوی جیهانی و لە سەرتاسەری جیهاندا لە ئاستی جۆراوجۆردا

بڵاوبوونەتەوە. خەڵکانێکی زۆر لە جیهاندا لەوانەش لە کوردستان، بڕوایان بە ئایدولۆژیا و چەمك و ڕێبازە فکری و سیاسییە نوێیەکان هەیە. خۆرئاوا وەك نموونەیەکی ژیاری و سیاسی و ئابووری مەرجەعیەتی بەشێکی بەرچاوی نوخبەی زۆرێ لە وڵاتانی ناوچەکە و لەوانەش کوردستانە. خودی ناسیونالیزم وەك پرەنسیپێکی سیاسی مۆدێرن، سەدەیەك دەبێت لەناو گەلانی خۆرهەڵات و لەو نێوەندەشدا لەناو کورددا بڵاوبۆتەوە. هەستی ناسیونالیستانە و داواکاری داڕێژراو لەسەر ئەو بناغەیە، هەوێنی چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین بوون لە کوردستاندا. ناسیونالیزم لە سەدەی ڕابردوودا تا ڕادەیەکی زۆر ئەدەبیاتی کوردی بارگاوی کردووە، ڕەمزە نەتەوەییەکان زیندووکراونەتەوە و کوردبوون بووەتە خولگەی شوناس و خۆجیاکردنەوە و هەست بە جیاوازیکردن. بە جۆرێك کە ئێستاشی لەگەڵدا بێت گوتاری ناسیونالیستی با لە بەرگی ئیحساسێکی میللی گشتیشدا بێت، گوتاری باڵادەستە لە کوردستاندا. تا ئێستا هیچ گوتارێکیتر لە ڕووی هەستجووڵاندنی سیاسی و سازدان و تەیارکردنی جەماوەرەوە نەیتوانیوە تەحەدای بۆ دروست بکات. کەواتە ناسیونالیزم لەناوماندا دەژی، مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێمەی خستۆتە ژێر سێبەری خۆیەوە و تێکەڵ بە ژان و ژوار و کارەسات و هەست و نەست و خولیای مرۆڤی کوردستانی بووە، بەرهەمەکانی بوژانەوە و ڕۆشنگەریش بەدوور نین لە ئێمە. دەستکەوتەکانی جیهانگیریش بە تایبەتیش لە ڕووی هۆیەکانی پەیوەندیکردن و تێکشاکاندنی سنورە نەتەوەییەکان لەم ڕووەوە بووتە هۆکارێکیتری تێکەڵاوبوون و کرانەوە، بەڵام ئەم قسانە هیچی ئەوە ناگەیەنێت کە ناسیونالیزمی ئێمە بیگرفتە، یاخود تا ئێستا توانیومانە دیدێکی مەعریفی قووڵ دەربارەی ناسیونالیزم بنیات بنێین، یاخود هێزە ناسیونالیستەکانمان لە ڕووی هەڵگرتنی خەسڵەتە ناسیونالیسییەکانەوە بە

دەست چەندین گیروگرفتەوە نانالێنن. دیسانەوە نامەوێت پەردە بدەم بەسەر پانتاییەکی گەورە لە شێواوی و نارۆشتی و نائەقلانیەت و رواڵەتگەرایی و لاساییکردنەوە و نەزۆکی فکری کە لە پەیوەندی بە مامەڵەکردن لەگەڵ دەستکەوتەکانی رۆشنگەری لە ئاراداں. بە جۆرێك کە ئاسان نییە هێڵێکی جیاکەرەی ئاراستەگرتووی رۆشنی فکری لە کۆمەڵگادا بەدی بکەین کە توانای کەڵەکەبوونی ژیاری و ئەزموونی گەورەی هەبێت.

دواکەوتوویی فکری و نەبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی رەنگدانەوەی خراپیان لەم رووەوە دروست کردووە. ئێمە گەر ئاوڕێ لە رابردووی ناوەندە فکرییەکەمان لە پەنجا ساڵی رابردوودا بدەینەوە، دەبینین کە مارکسیزم ئایدۆلۆژی زاڵ و گوتاری باڵادەست بووە. بەشێکی زۆری نوخبە و نەوەی نوێی کورد لە رێی گوتەزاکان و میتۆد و دیدی ئەوەوە دەست و پەنجەی لەگەڵ چەمگەلی وەکو دیموکراسی، ئازادی، ناسیونالیزم، یەکسانی، هتد نەرم کردووە و هەمووشمان دەزانین کە مارکسیزم لە چ دیدێکی ئایدۆلۆژی تەسك و پڕ گرفتاوییەوە دەڕوانێتە ئەو چەمکانە. ئەم پاشخانە فکریە گەر لە ئاستێکدا خزمەتی ناوەندە رۆشنبیرییەکەی کردبێت و هەندێ پرسیاری لا دروست کردبێت، ئەوا لە چەندین رووی‌ترەوە کاریگەری خراپی بەسەرەوە جێهێشتووە و دووچاری دۆگما بوون و ئایدولۆژیاگەری و تاك رەهەندی و بەسەرخۆدا داخرانی کردووە مەسەلەیەکی گرنگی‌تر لەم روەوە کە نەیهێشتووە لە ئاستێکی تەندروستدا مامەڵە لەگەڵ چەمکە فکرییە گەورەکان و دەستکەوتە گەشەکان بکەین، تەمبەڵی و نامۆیی فکری و مامەڵەنەکردن بووە لەگەڵ جەوهەری ژیاری خۆرئاوادا. بەداخەوە کە رۆشنبیری ئێمە زۆر کەم توانیویەتی خۆرئاوا وەك ئەزموونێکی بەشەری وەربگرێت و بەم هەناسەوە بیر لە بنیاتنانی مودێلێکی هاوچەرخ لە دەسەلات و گەشانەوەو خۆبەرێوەبردن بکاتەوە،

نەك وەك رەهایەك و ئەزموونێکی دابڕاو لە هەموو رەهەندێکی لۆکاڵ و ژینگە و هەلومەرجێکی مێژوویی، قەبووڵکردن یاخود نەکردنی دیموکراسییش هەر لەم چوارچێوەدا تاوتوێ دەکرێت. بێگومان کاتێك دەتوانرێت دیموکراسی وەك کلتوور و شێوازێك لە بەڕێوەبردنی دەسەڵات و ئاراستەکردنی کۆمەڵگا قبوڵ بکرێت کە تێگەیشتنێکی روون بۆ هەلومەرجەکانی جێبەجێبوون و ژێرخانە فکرییەکەی لە ئارادا بێت و ئیرادەیەکی سیاسی تەواو و دیدێکی فکری رۆشن لەمەر ئەرکەکانی دیموکراسی و چۆنیەتی بنیاتنان و گەشەپێدان و شوێنگەی ئەو لە دەوڵەتی هاوچەرخدا، بەشێکی گرنگ لە رۆشنبیری سیاسی پێکبێنێت.

بۆیە گەر ئێمە بە رواڵەت دیموکراسیەتمان قبوڵ کردبێت، هێشتا ماومانە بە کردەوە بەرەنجامەکانی کارکردن بە میکانیزم و چوارچێوەکان و لۆژیکەکەی و پێداویستییەکانی بە دیموکراتیزەبوون قبوڵ بکەین.

**کوردستان راپۆرت:** ئایا بوونی دیموکراسی لەم رۆژگارەدا تاچەند دەتوانێت بۆ ناسنامەی نەتەوەیی کورد کاریگەر بێت ؟

**ئەبوبەکرعەلی:** مەسەلەی دیموکراسی بۆ کورد و ناسیونالیزمی کوردی زیاتر لە روویەکەوە بایەخدار و کاریگەرە. جارێ پێش هەموو شتێك خەباتی گەلی کوردستان بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی لە جەوهەردا خەبات و داوایەکی عادیلانە و دیموکراسیانەیە، واتە بوونی دیموکراسی لەو وڵاتانەی کوردی تێدایە بە واتا فراوان و رەسەنەکەی کە هاوڕایە لەگەڵ فرەنەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبی و سیاسی و فکری، دەبێتە فەزایەك بۆ پاراستنی ناسنامەی کوردی و گوزارشت لە خۆکردنەوەی، چونکە دیموکراسییەکی

راستەقینە ئەو سایە و ئاسمانەیە کە لە سایەیدا پێکهات و شوناسە جیاوازییەکان دەتوانن نمایشی جیاوازی و تایبەتمەندییەکانی خۆیان بکەن. بە پێچەوانەی دیکتاتۆریات و سەرکووت و تاکڕەوییەوە، کە ڕێ لە هەر گوزارشت لەخۆکردنەوەیەکی ئازادی شوناس و بوونە جیاوازەکان دەگرێت، کەواتە لە ئاستی ئەو قەوارە و دەوڵەتانەی کوردیان بەسەردا دابەشکراوە و لە ناویاندا دەژین پرسیاری شوناس بەتوندی بەستراوەتەوە بە پرسیاری ئازادی سیاسی و دیموکراسییەوە. هەرچی پەیوەستە بە هەرێمی کوردستان و ئەزمونی حوکمڕانی خۆماڵی کوردیشەوە، دیسانەوە دیموکراسی ئەو کەش و هەوایەیە کە تیایدا شوناسی کوردبوون و کوردستانیبوون دەگەشێنەوە و شکۆفە دەکەن، چونکە دیموکراسی بوون ئاماژە دەبێت بە بوونی ئازادی، دوای بە دەستهێنانی ئازادی، ئەگەر نیشتمانیش لە پێناسەیەکی هاوچەرخی خۆیدا ئەو سەرزەمینە بێت کە لەسەریدا هاونیشتیمانی وەك تاکێکی خاوەن ماف و ئازادی و مرۆڤێکی خاوەن کەرامەت دەژی، ئەوا نەبوونی دیموکراسی و ماف و ئازادیە گشتی و تایبەتییەکان لە کوردستان و دەرەوەی ئەویش یەکسان دەبێت بەبێناوەرۆکبوونی چەمکی نیشتمان، نیشتیمانیش ئەو سەرزەمینەیە کە درەختی شوناس لە سەریدا گۆل دەکات و خۆی نمایش دەکات.

گەر لە رویەکیتریشەوە سەیری دۆخەکە بکەین هەست دەکەین بەشێ لە ڕەوایەتی ئێمە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، بەتایبەتیش پێش دەستوری عێراق و تا ڕادەیەك ئێستاش، پەیوەست بووە و پەیوەستە بە ئامادەبوون بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەهاکانی ئازادی و دیموکراسی... خودی ئەم ئاماژە بوونە با لەسەر ئاستی تیۆریش بووبێت لە رابردوودا میکانیزمێکی خۆجیاکردنەوە و پاساوێکی بوون و کەرەسەیەکی داواکردنی پشتیوانی لێکردن بووە. ڕەهەندێکیتری پرسی ناسنامەی کوردبوون و کوردستانی

بوون، دیسانەوە پەیوەستە بە رویەکیتری دیموکراسییەوە کە ئەویش بەشداری سیاسییە، گەر هاولاتیانی کوردستان بە هۆی دیموکراسی و میکانیزمەکانییەوە ئەو هەستەیان بۆ دروست بێت کە خۆیان خاوەنی راستەقینەی دەسەلات و رەوایەتی سیاسین و بەشدارن لە بەرێوەبردنی دەسەلاتدا و دەسەلات بە پێکهاتەکانییەوە نوێنەرایەتی خواست و ویستی ئەوان دەکات و، رونی هەیە و گەندەلی و یاساشکێنی و خۆپەرەستی ژیانی لێ هەراسان نەکردوون، ئەوا بە پەرۆشەوە دەچنە نێو مەسەلە نیشتمانییەکانەوە و ئینتیمای نیشتمانی و نەتەوەییان بەهێزتر دەبێت و شانازیشیان بە ناسنامەی کوردایەتیانەوە زۆرتر دەبێت و هەست بە کەسێتی مەعنەوی و بوون و رێزی خۆیان دەکەن. کەواتە دیموکراسی لە رۆژگاری بە جیهانی بوونی خۆیدا، لە رۆژگاری ئەمرۆدا، بەتوندی لەگەل پرسی ناسنامە و ناسیۆنالیزمی ئەقلانی تێکەل بووە و، هیچ ناسیۆنالیزمێ ناتوانێت لە دەرەوەی ئەوەوە دۆخێ بخولقێنێ نەتەوە بەرەو شکۆ و خۆشگوزەرانی و بەرزی و کاریگەربوون بەرێت.

**کوردستان راپۆرت:** ئایا هەستی ناسیۆنالیزم بەتەنها بەسە بۆ بەرهەم هێنانی ناسیۆنالیزم بەوپێیەی ناسیۆنالیزم بەتەنها کارکردن نیە لەسەر عاتیفە و سۆز و سیمبول؟

**ئەبوبەکر عەلی:** روونە کە تەنها هەستی ناسیۆنالیستانە بەس نییە بۆ بوونی ناسیۆنالیزم، چونکە لەگەل ئەوەدا کە ناسیۆنالیزم لە رەهەندێکیدا لەگەل هەست و سۆز و هەستکردن بە ئینتیما بۆ نەتەوە و نیشتمان تێکەلاوە و کارلێك دەکەن، بەلام لە رەهەندێکیتریدا هۆشیارییە کە مەعریفە بەرهەم دەهێنێ و فەزایەکە لە ریی کۆمەلێ میکانیزمی پێگەیاندو پێکچواندن و ئاوێزانکردنەوە نەتەوە دروست دەکات، بەم

جۆرەش وەك هەوێن و پاڵنەر و تەکاندەر دەچێتە ناو سیاسەت و پەروەردە و ئابووری و سوپا و دامەزراوەی ئەکادیمییەوە، هەروەها لە رویەکیترەوە کاردەکاتە سەر خوێندنەوەی مێژوو و دارشتنی کەسێتی نیشتمانی. لێرەوە "ئەقڵ" یش بە تایبەتی لە سەر ئاستی دەستەبژێرە سەرکردەکەی ناسیۆنالیزم دەبێت رۆڵی یەکلاکەرەوە ببینێ لە ئاراستەکردنی سیاسەت و هەنگاو و ستراتیژەکان.

ناسیونالیزم پێویستی بە باشخوێندنەوەی واقعی نیشتمانی و دەستنیشانکردنی ئاڵۆزی و کێشەکان هەیە. خوازیاری سیاسەتێکی ئەقڵانی وایە، وزە و توانا نیشتمانییەکان بەفیڕۆ نەدات و بەناوی ناسیۆنالیزمەوە شەڕی دەسەڵاتی شەخسی و حزبی و گرووپی نەکات. لافی ناسیونالیزم لێنەدرێ و لە هەمانکاتدا شوناسەکانی خوار ئەو لە خێڵ و ناوچە و زار و شێوە زمان و حزب و تایەفە تۆخ بکرێتەوە و بکرێتە هێڵی دەستنیشانکردنی دۆست و دوژمن. ناسیونالیزم گەر تەنها هەست و سۆز بوو، تەنها هەندێ کەف و کوڵی شۆڕشگێڕانە و بمرێ و بژی بوو تەنها هەستێکی میللی گشتی بوو، نەگۆڕابوو بە چاودێر بەسەر رەفتارە سیاسییەکانەوە، ناتوانێ وەزیفەی سرووشتی خۆی ببینێت.. بۆ نموونە دەسەڵاتێکی ناسیونالیستانە کاتێك گەندەڵی دەکات، یاسا پێشێل دەکات، ناعەدالەتی لە سایەیدا باڵادەستە و رۆتین و دواکەوتوویی ئیداری و دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا و یاریکردن بە پارەی گشتی و چارەنووسی نەتەوەوە دەبێت بە بەشێ لە کارنامەی. دەبێت ناسیونالیزمەکەی چ مانایەکی بۆ بمێنێتەوە؟

ناسیونالیزم گەر هەندێ هێڵی گشتی بەردەوامی هەمیشە هەبێت لە چەندین روەوە هەر قۆناغە و رەنگدانەوە و ئەرکی خۆی هەیە، بە جۆرێ لە هەندێ کاتدا ئەو هەستە

سەرەتاییە زۆر دەوری نامێنێ و دەبێت بگۆڕدرێت بە توخمێکی هەست بە لێپرسراوێتیکردن بەرامبەر نیشتیمان و نەتەوە و چارەنووسیان.

**کوردستان راپۆرت: ئایا ئێمە ناسیۆنالیزمان هەیە؟ ئەگەر هەیە چ جۆرێکە؟**

**ئەبوبەکرعەلی:** بەڵێ ئێمە ناسیۆنالیزمان هەیە، بەڵام زیاتر ئەو ناسیۆنالیزمەیە کە لە سەر سۆز و عاتیفە ئیش دەکات، تاکو ئێستاش دیدێکی مەعریفی قووڵمان بۆ ناسیۆنالیزم نییە، ناسیۆنالیزم نەبۆتە کایە و بابەتەێکی فکری و تیۆری وا کە بتوانێت پێوەر بداتە دەست هاوولاتی و کۆمەڵگا، بۆ داوەری کردن دەربارەی سیاسەت و درووشم و گوتار و نەخشەکان. ناسیونالیزمی کوردی لە رووی مێژووییەوە تەمەنی لە ناسیۆنالیزمەکانی‌تری ناوچەکە کەمتر نییە، بەڵام لە بەر سرووشتی کۆمەڵگای کوردی و دابەشبوونی کوردستان و چەوسانەوەوەی نەتەوەیی و بە ئاکام نەگەیشتنی بزووتنەوە نەتەوەییە کەو دروستنەکردنی دەوڵەت و، دوای ئەوەش کاریگەری ئایدۆلۆژیای چەپ و چەندین هۆکاری‌تر، نەیتوانیووە لە هەندێ رەوەوە ناوەڕۆکی سرووشتی خۆی پەیدا بکات و ئەرکەکانی بە جوانی رابپەڕێنێ. ناسیونالیزمی کوردی لە ژێر جەبری واقعیەکەدا و خراپی ژیانی حزبی و تازەنەبوونەوەی رۆشنبیری سیاسی و ساختەبوونی پرسیاری بوژانەوە لە نێو ناوەندە فکری و سیاسییەکەدا، لانی‌کەم لە هەندێ رووەوە، بەوە دەناسرێتەوە کە ناسیونالیزمێکی رارایە و تواناکانی لەخۆگرتن و پێگەیاندنی سنووردارە و نەیتوانیوە ببێتە ئەو چوارچێوە کە هێزە ناسیۆنالیستەکان لە خۆبگرێت و نەهێڵێت ناکۆکییەکانیان بەشێوەیەکی خوێناوی بتەقێتەوە و بەمەش بەشێ لە سیاسەتەکانیان بچێتە خانەی دژایەتیکردنی بەهاو ئەرك و خواستە ناسیۆنالیستەکانەوە. ناسیۆنالیزم لەولاتی ئێمەدا لە هەندێ رووی مێژووییەوە بارگاوی کراوە بە ئایدۆلۆژیا. لە هەندێ

کاتیشدا شوناسەکانی خوار ناسیۆنالیزم ویستوویانە بەکاری بێنن بۆ قازانجە ناوچەیی و سنووردار و دژە ناسیونالیستەکان، بەلآم لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ناسونالیزمی کوردی هێشتا توانایەکی کۆکردنەوە و جولآندن و سازدانی گەورەی هەیە، بەلآم ئەوەش ناشاردرێتەوە کە سیاسەتە هەڵەکان و خراپەی هێزە ناسیۆنالیستەکان کاریگەری نێگەتیڤی لە سەر کردووە و تووشی جۆرێ لە شلەژاوی چەمکی و ناوخۆیی کردووە.

**کوردستان راپۆرت:** هەندێ لەناسیۆنالیزمەکانی کورد بەجۆرێك کاردەکەن لەسەر سرینەوەی ناسنامەی نەتەوەکانی دی وەك تورك و فارس و عەرەب ئایا ئەم جۆرە لەناسیۆنالیزمە ناسیۆنالیزمێکی فاشی نیە ئەی مەترسیەکانی ئەم جۆرە لە ناسیۆنالیزم چییە؟

**ئەبوبەکر عەلی:** بێگومان ئەگەر خەڵکانێك هەبن بە ناوی ناسیۆنالیزمی کوردییەوە هەوڵی سرینەوەی شوناسی نەتەوەیی نەتەوەکانیتری کوردستان بدەن، بەم کارەیان ناسیونالیزمی کوردی ناشیرین دەکەن و تێکەڵی دەکەن بە هەناسەکانی رەگەزپەرستی و فاشیەت و ستەمکاری و توندرەویی، لێرەولەوێش ئەم جۆرە کەسانە دەبینرێن گەرچی تا ئێستا نەبونەتە تەوژمێکی بەهێز و کاریگەری ناو ناسیونالیزمی کوردی. بێگومان ئەم هەوڵ و هەناسەیە کە دەمارگرژی و توندرەوی و سەرچڵی نەتەوەیی دەگەیەنێت، یەکسان نییە بە دڵسۆزی بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی، واتە ئەوەی توندتر و خوێنگەرمتر و پێداگرتر بوو بەم هەست و تێگەیشتنە شێواوە و بۆ ناوەرۆکی ناسیۆنالیزمی کوردی و پەیام و ئەرکەکەی، مەرج نییە کوردتر و راستگۆتر و کوردپەروەرتر بێت، چونکە بەم کارەی مەترسی بۆ سەر کۆمەڵگەی کوردی خۆی درووست دەکات و سەرەنجام هەر

نەتەوەکانیتری ناو کوردستان ناکات بە ئامانجی خۆی، بەڵکو هێزەکانی دەرەوەی خۆشی لە ناو خوودی بازنە کوردییەکەدا دەکاتە دەرەوەی بازنەی دڵسۆزی. دەبن بە هێزی کەمتەرخەم و ناڕەسەن و کەمخوێن لە رووی نەتەوەییەوە لە قەڵەم دەدات. ناسیونالیزم کە گەیشتە رەگەزپەرستی دەگۆڕێت بەهێز و وزەیەکی وێرانکەر و شەڕەنگێز و فراوانخواز. هەمیشە بەدوای ململانێ و دووژمنی دەستکردا دەگەڕێت. هەوڵ دەدات لە سەر تێکشکاندنی شوناسەکانیتر بینای بەشێ لە شکۆ ساختەکانی خۆی بکات. لێرەشەوە دەبێت بە ناسیۆنالیزمێکی داڕنراو لە ئەخلاق و مرۆڤایەتی بوون.. وتمان ناسیۆنالیزمی بەرچاوتەنگ و دەمارگرژ کە چاوی بە شوناسە نەتەوەییەکانیتر هەڵنایەت و بە زیادیان دەزانێ و هەندێ جاریش بەهەڕەشەیان لەقەڵەم دەدات لە سەر ئێستا و دوارۆژ و گەشەکردنی خۆی، چاوی بڕیوەتە یەکیەتییەکی بە زۆرە ملێی بێبناغە و وەکیەك لیکردنی کۆمەڵگا، سەرچاوەی خراپەکاری بۆ خودی نەتەوەکەی خۆی، چونکە دەیخاتە بەردەم مەترسی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆیی و شەڕ لەگەڵ دەرو دراوسێ و دیموکراسی و فرەیش دەخاتە بەردەم هەڕەشە و پوکانەوە. بەمەش لەبەرچاوی رای گشتی جیهانی و ناوەندە مرۆڤ دۆستەکاندا سیمایەکی دزێو و ناشیرین دەبەخشێتە وڵات و نەتەوەکەی. ناسیونالیزمی کوردیش یەکێ لەو ناسیۆنالیزمانەیە "بالقوه" گەرای ئەم تێگەیشتنەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتوە و دەبێت رێگای گەشەکردنی پێ نەدرێت، چونکە جگە ئەم فۆڕمە لە ناسیۆنالیزم، ئەگەرێکە لە بەردەم هەموو ناسیونالیزمێکدا بە تایبەتیش کاتێك دەبێت بە ئایدۆلۆژیا، سەبارەت بە ناسیۆنالیزمی کوردی چەند هۆکارێکیتریش لە ئارادان لەوانەش:

أ) چەوساندنەوەی مێژوویی و دوور و درێژی ئەم ناسیونالیزمە و نەتەوەی کورد و نەگەیشتن بە ئامانجەکانی و نکۆڵیکردن لە شووناسی کوردبوون لە زۆر کاتدا.

ب) ناسیونالیزمی کوردی زیاتر لە قوتابخانەی ئەڵمانی نزیکە و لە سەر بناغەی ئینتیما بۆ نەژاد "کورد" دامەزراوە، نەك لە سەر بناغەی کوردستانیبوون. ئەمەش وا دەکات لەم رووەوە زەمینەی لەگەشەکردنی هەستێکی لەو جۆرە لە ناویدا لە ئارادا بێت. هەڵبەت کوردستانیبوونیش تا رادەیەك ئامادە بووە، بەڵام لە راستیدا ناسیونالیزمی کوردی ریفۆرم و بیناکردنەوەیەکی لەم روەوە دەوێت کە ئەمە هەڵدەگرم بۆ نووسینێکیتر.

ج) ئەو هەڕەشانەی تا ئێستا ماون و هەڕەشە لە ناسیونالیزمەکە دەکەن.

بەڵام بەگشتی تا ئێستا ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا حاڵەت و هەندێ سیمان و نەبۆتە دیدێکی هەمەلایەنەی سیاسی نەخشە بۆکێشراو، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت رۆشنبیر و سیاسەتوانی کورد بەهەند نەیگرێ و لە خەمی ئەوەدا نەبێت کوردستانیبوون ببێتە بناغەی ناسیونالیزم لە کوردستاندا و پاشەکشە بەو جۆرە بیرکردنەوەوە نامۆیانەش بکەن کە سەرەنجام دەسەڵاتی هەبێت دەبێتە دابەشکەری گەلی کوردستان بە سەر دەرگاکانی بەهەشت و دۆزەخەکاندا.

**کوردستان راپۆرت:** ئایا ناسیۆنالیزمی کوردی وەك پەرچەکردار دروست بووە لەبەرامبەر نەتەوەو وڵاتانی داگیرکەر؟ ئایا ئەگەر وەڵامەکە ئەرێیە چۆن دەکرێ ببێتە پرۆژەیەکی عەقڵانی، واتە لەژێر تەوژمی رۆشنگەریدابێت ؟

ئەبوبەکرعەلی: لەراستیدا دروستبوونی ناسیونالیزمی کوردیش وەك ناسیونالیزمەکانی‌تر هاوکات بووە لەگەڵ ئەو گۆڕانە فکری و سیاسییانەی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم کە بەسەر ناوچەکەدا هاتوون. دوای کاریگەر بوونی ناوچەکە و گەلانی ناوچەکە بە ژیاری نویی خۆرئاوا و تەوژمە فکری و مۆدێلە سیاسییەکانی و هەوڵەکانی خۆرئاوای کۆلۆنیالیستی بۆ دەستگرتن بەسەر ناوچەکەدا، ناسیونالیزم یەکێ لە بەرهەمەکانی ئەو کاریگەربوون و بەریەککەوتنە بوو. ئەگەر سەرەتاکانی ناسیونالیزمی کوردیش بگێڕینەوە بۆ شێخ عوبەیدوڵای نەهری، ئەوا دەتوانین بڵێین ئەو ناسیونالیزمە کاردانەوە بوە بە رووی بزووتنەوەی ناوەندچێتی و گەندەڵی ئیداری و ماڵی و داتەپینی دەسەڵات و چەوساندنەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە لە لایەن هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری و ناوەندچیەتی عوسمانی لە سایەی کاریگەربوون بە مۆدێرنەی خۆرئاواوە رۆژ بە رۆژ فشاری زیاتری دەخستە سەر میرنشینە کوردییەکان، تا بە تەواوی کۆتایی پێهێنان، بەڵام بە حوکمی ئەوەی کە کورد لە پێگەی سەرەکی دەسەڵاتی ناوچەکەدا نەبوە و گەلانی ناوچەکانی دیکە و دەستەبژێرەکان زۆرتر کاریگەر بوون بە تەوژمە نوێیە هزرییەکان و لەوانەش ناسیونالیزم، لە هەندێ رووەوە ناسیونالیزمی کوردی کاردانەوە بوە بە رووی ناسیونالیزمەکانی‌تری ناوچەکەدا. ئەمەش بە تەواوی لەو وتەیەی مێژوونووسی گەورەی کورد(ئەمین زەکی بەگ)دا روونە کە ئاماژە بەوە دەکات تا تورکەکان دروشمی تورکبوونیان بەرز نەکردەوە، ئێمەش هەستی کوردبوون و گەڕان بە دوای جیاوازی و مێژوویی نەتەوەییمان تیا دروست نەبوو. واتە پێشتر (ئیسلام) و (عوسمانی بوون) ئەو دوو چوارچێوەیە بوو فرەنەتەوەیی و ئایینی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان لەخۆ گرتوە،

بەڵام ئەو پەرچەکردار بوونە لە ساتێکی مێژووییدا رێگر نابێت لە نوێبوونەوەی ناسیۆنالیزمێك ئەگەر بێت و خواست و ویست و توانایەکی راستەقینە لە ئارادا بێت بۆ بە ئەقڵانیکردن و بەرەو پێگەیشتوویی بردنی. رۆشنگەریش کە لێرەدا پێویستی بەدیاریکردنی راستەقینەی ناوەرۆکەکەی هەیە، دەتوانێت خۆی ئەو تەوژمە بێت کە ناسیونالیزم ناچار کات بە پێشکەوتن و کرانەوە و جێگیربوون و پاراستنی لە دەمارگرژی و بەسەر خۆدا داخران و دژایەتیکردنی فرەیی و دیموکراسی، بە ناوی بەرژەوەندی و یەکیەتی نەتەوەیی یەوە، چونکە رۆشنگەری لە ئەزمونە خۆرئاوایی یەکەدا و لە چاخی رۆشنگەری و لە ئاستی فکر و تیۆریدا خودان هەناسەیەکی جیهانی بوە. رۆشنگەرەکان گەرچی لە ئەزموونێکی دیاریکراوەوە دەستیان پێکردوە، بەڵام خاوەن هەناسەیەکی بان ناسیونالیستی بوون. ئەمە لانیکەم بۆ بەشێکی بەرچاو لە رۆشنگەرەکان راستە. ئەم قسانەش ئەوەمان پیێ دەڵێن کەئەوەی ناسیونالیزم باڵادەست دەکات بەسەر تەوژمەکانیتردا یاخود وردتر بڵێن بەسەر ئەقڵانیەت و روشنگەریدا، کۆمەڵگا و دەستەبژێری فەرمانڕەوا و دۆخە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکانە. هەڵبەت نابێت لێرەدا لەبیرمان بچێت کە لە سەرجەم پرسیارەکانی ئەم چاوپێکەوتنەدا دیدێکی سەراپا گەشبین سەبارەت بە ئەقڵانیەت و رۆشنگەریی بنیات نراوە. لە کاتێکدا مەسەلەکە لە ژینگە سروشتییەکەی خۆیدا واتە خۆرئاوا بەو جۆرە نییە. رۆشنگەری و ئەقڵانیەت خۆیان لە ژێر پرسیاردان و بوونەتە بابەتی تێڕامان و پێداچوونەوە و بەرهەمهێنانی بیری رەخنەیی، بەڵام رەنگە پاساوی پرسیارەکان لەوێوە بێت کە کۆمەڵگای ئێمە گرفتەکەی لە رووبەکیترەوەیە، تاکو ئێستا بەدەست نائەقڵانی بوون و نەبوونی هەناسەیەکی رۆشنگەرانەوە دەناڵێنیێ.ئەوەی مەسەلەکەشی لە کوردستاندا هەندێ ئاڵۆز کردوە لە

پەیوەندی بە کاردانەوە بوونی ناسیونالیزمی کوردی و ئەقلانیەت و رۆشنگەری درێژەکێشانی حاڵەتی لەناکاوی ناسیونالیزمی کوردی و نەگەیشتن بە ئامانجە سروشتییەکانی خۆیەتی، کە ئەمەش وای لێدەکات لە ئێستاشدا بە جۆرێ لە جۆرەکان و لە هەندێك ئاستدا کاردانەوە بە شتێ لە سیما و ستراتیژەکانی دیاری بکات و، لەو ژینگە سروشتییە بێبەشی کات کە ناسیونالیزمێك بۆ پێگەیشتن و جێگیری و خۆنمایشکردن پێویستی پێیەتی.

**کوردستان راپۆرت:** *مێژوی ناسیۆنالیستی کورد لەژێر تەوژمی چەپ گەرادا دروست بووە ئەی بۆ نەمانتوانیوە لەم تەوژمە سود وەرگرین بۆدروست کردنی ناسنامە؟

**ئەبوبەکر عەلی:** سەرەتا ناسیونالیزمی کوردی لە ناوەندە ئایینییە میللییە کوردیاکەدا سەری هەڵداوە و دواتر دەستەبژێرە نوێکان گەشەیان پێداوە و کردوویانە بە بەشێکی بەرچاو لە شوناسی تاکەکانی کۆمەڵگا و کۆمەڵگا خۆشی، بەڵام لە چلەکانی سەدەی رابردووەوە، وردەوردە ناسیونالیزمی کوردی بە حوکمی ئەو تەوژمە بەهێزەی لە ناوچەکەدا سەریهەڵدا و دۆخە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکە، کەوتە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیای چەپەوە. ئەم کەوتنە ژێر کاریگەریەش لە پەنجاکان و ناوەڕاستی هەشتاکان گەیشتە ئاستێکی وا کە چەپ، ئایدۆلۆژیای باڵادەستی ناو هێزە کوردییەکان و خودی ناسیونالیزمی کوردیش بێت، بە حوکمی ئەوەی کە ناسیونالیزم خۆی ئایدۆلۆژیا نییە و هەستکردن بە ئینتیما و سۆز و پرەنسیپی سیاسییە. چەپ زیاتر لە روویەکەوە کاری کردە سەر ناسیونالیزمی کوردی، لەوانەش: تێڕوانینی بۆ چەمکی نەتەوە و وروژاندنی ئەو پرسیارەی کەداخۆ کورد نەتەوەیە یاخود نەتەوە نییە؟ ئەم پرسیارە پرسیاری بەشێ لە کۆمۆنیستە کوردەکان بووە لە بزووتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی لە

پەنجاکاندا. هەروەها چەپگەرایی تێڕوانینی بۆ سەقفی داواکارییەکان و جۆری چارەسەرەکانیش گۆڕی، کە بەرەنجامەکەی هێنانەگۆڕێی فۆرمی ئۆتۆنۆمی بوو وەك ئامانجێك بۆ شۆڕش و بزووتنەوەی ناسیونالیستی کوردی چونکە هەروەك دەزانین ئۆتۆنۆمی ئەو فۆرمە بوو لەهەندێ وڵاتی کۆمۆنیستی و بەگشتی بیری چەپ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی خستبوویە روو گۆڕینی تێڕوانین بۆ ئایین و مێژووی نەتەوەیی کە ئایدۆلۆژیا چەپەکە هەندێ جار لەبەرگی خودی ناسیونالیزمدا مەترەحی دەکرد لەناو بە بەشێ لە نوخبە فکری و سیاسییە ناسیۆنالیستەکەدا هەستێکی نێگەتیفی بەرامبەر ئایین و مێژووی ئیسلامی کوردی دروستکرد، کە ئەمەش گرفتی تیۆری و عەمەلی بۆ ناسیونالیزمەکە دروستکرد. چەپگەرایی کوردی کاری کردە سەر دیاریکردنی دۆست و هاوپەیمانیش چونکە هەروەك دەزانین تا هەشتاکانیش دۆگماییەك هەبوو کە پێی وابوو وڵاتانی سۆسیالیستی و بزوتنەوەی رزگاری نیشتیمانی گەلان و بزووتنەوەی کرێکاری جیهانی دۆستەکانی کورد لەسەر ئاستی جیهاندا پێکدەهێنن. لێرەوە دەتوانین بڵێین چەپ بەجۆرێ لە جۆرەکان کاریگەر بووە لەسەر سنورداركردنی خەونەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی و هەندێ ئەرك و شەڕی ئایدۆلۆژیش بۆ دروستکردووە کە ئەو بێنیاز بووە لێی. هەڵبەت هەموو ئەوەی وترا ئەوەڕەتناکاتەوە کە لە هەندێکاتدا چەپگەرایی واتە مارکیسزم وزەیەکی ئایدۆلۆژی بە ناسیۆنالیزمی کوردی بەخشیوە بۆ درێژە بەبەرخۆدان و هەڵسانەوە، بەڵام بە حوکمی ئەو ناوەرۆکەی چەپ هەڵگریەتی، لەکاریگەربوونی ناسیۆنالیزمی کوردی بەم ئایدۆلۆژیایە نەیتوانیوە لێکدانەوەیەکی هەمەلایەنەی بۆ کۆمەڵگای کوردی و سروشتی ئەم کۆمەڵگایە هەبێت. پێشم وایە دروستکردنی شوناسی نەتەوەیی لە سایەی ئەو مۆدێلە لە چەپیش کەلە ناوچەکەدا

بالادەست بووە، چاوەڕوانییەکە لەجیی خۆیدا نەبێت، چونکە ئەرکی بنەڕەتی چەپ گەرهەندیٚ تێزی تیۆری لنینی لیٚ دەرکەین، کە نەخۆی جێبەجیی کرد و نە تەوەری بنەڕەتی بیرکردنەوەی چەپیش بووە لە وڵاتی ئێمەدا پەیامی چەپ بەڕێوەبردنی ململانیی چینایەتییەکان بووە، هەر بۆیە بەو ئەندازە بایەخی بە مەسەلە نەتەوەییەکان داوە کە نەبێتە ڕێگر لەبەردەم راپەڕاندنی ئەم ئەرکەو ڕێزەکانی پرۆلیتاریا تێك نەدات. لانیکەم تا نیوەی دووەمی هەفتاکان.

**کوردستان راپۆرت:** ئایا لەدونیای دیموکراسیدا دەوڵەت هی نەتەوەیە یان دەوڵەت دەوڵەتی کۆمەڵگاکانە؟

**ئەبوبەکر عەلی:** بێگومان تا ئێستا لە سایەی دیموکراسی‌یە دێرینەکانیشدا دەوڵەت هی نەتەوەیە، چونکە تاکوو ئێستاش مۆدێلی "دەوڵەت ـ نەتەوە" لە جیهاندا بالادەستە و جێگای خۆی بۆ مۆدێلێکیتری دەوڵەت و دەسەلاتی حوکمڕانێتی چۆڵ نەکردووە..، بەلام لە وڵاتێکی دیموکراسی سەقامگیردا نەتەوە لە سەر بناغەی هاوڵاتی بوون بەندە واتە هەموو ئەوانەی هەڵگری رەگەزنامەی ولاتن هاولاتین و لە رووی یاساییەوە خاوەن ماف و ئەرکی وەك یەکن، لێرەشەوە کۆمەڵگاش شتێ نییە لە دەرەوەی نەتەوە بەڵکو بەرجەستە بوونێکیتری نەتەوەیە، چونکە لە سایەی دیموکراسی دا دەوڵەت شەڕی کۆمەڵگا ناکات، وەك لە زۆریٚ لە نموونەکانی لای ئێمەدا لە سەدەی رابردوو ئێستاشدا بینراوە و روویداوە و لە ئارادایە، نەتەوەش لە حزبی فەرمان رەوادا بەرجەستە نابێت و "تایەفە" نییە، لە سایەی دیموکراسیدا نەتەوە و کۆمەڵگا خاوەنی دەوڵەتن، نەك بەپێچەوانەوە. ئەم گرفتەی لە پرسیارەکەدا خراوەتە روو گرفتی نەتەوە ناپێکەیشتووەکانە و ئاماژەیە بە دۆخی ئەو کۆمەڵگایانەی پرۆسەی بە کۆمەڵگابوون و

دامەزراندنی دەوڵەت و بنیاکردنی نەتەوە بە قۆناغەکانی گەشەکردنی سرووشتی خۆیاندا نەڕۆیشتوون، ئەمەش جۆرێ لە ناکۆکی ناوخۆیی و ناسازگاری و پەشۆکاوی خولقاندووە..

کوردستان راپۆرت: ئەورایە چۆن دەبینی کەپێی وایە پەیوەندی ناسیۆنالیزم و دیموکراسی پرکێشەیە وەپێیان وایە ناسیۆنالیزم زیاتر لەگەڵ ئایین و سۆسیالیزمدا هەڵدەکات وەپێیان وایە کە بەدرێژای مێژوو کاریگەری فیکری دیموکراسی لەسەر ناسیۆنالیزم کاریگەریەکی لاوازبووە ئایا کێشەکانی نێوان ناسیۆنالیزم و ئایین و دیموکراسی چییە؟

ئەبوبەکر عەلی: ئەم بۆچوونە هێندەی گوزارشە لە ئەزموونی ناسیونالیزم لە وڵاتانی ناوچەکە و ئەزموونی مێژوویی ناسیۆنالیزمی کوردی، ئەوەندە دەربڕینێکی وردنیە لە پەیوەندی ئەو چەمك و تەوژمانە بەیەکەوە. بەڵکو مەسەلەکە لە دیدی مارکسیزمیشەوە تەواو پێچەوانەیە.. مارکسیزم نەتەوایەتی بەدەرکەوتێکی قۆناغی سەرمایەداری و دیاردەیەکی کاتی دەزانێت.. بە تەوەرەی ناکۆکی جیاوازی ناو کۆمەڵگاشی نازانێ، وەك دیفاکتۆیەکیش مامەڵە لەگەڵ نەتەوایەتی‌دا دەکات. بەدەر لەوە دژایەتی دەکات و بە کۆنەپەرستیی لە قەڵەمی دەدات.. سۆسیالیزم بە پلەی یەکەم پێی لە سەر خەباتی چینایەتی و هاوچارەنووسی کرێکارانی جیهان دادەگرت.. دیارە لێرەدا لە رووی تیۆرییەوە باس لەو مۆدیلە لە ناسیۆنالیزم نییە کەتەنانەت سۆسیالیزمیشیان وەك پاساوێك بەکارهێناوە بۆ باڵادەست بوون و فراوانخوازی، لەوێنەی ناسیۆنالیزمی رووسی. لە رووی مێژوویشەوە ناسیۆنالیزم لەگەڵ لیبرالیزمدا سەری هەڵداوە و لەگەڵ

گەشەکردنی ئەویش گەشەی کردووە. ئەگەر سەدەی (١٩) لە خۆرئاوادا بەسەدەی ناسیۆنالیزم ناسرابێت، ئەو زەمەنە مێژوویی‌یە مێژووی دەسەڵاتە سۆسیالیستیەکان نییە... یەکەم دەسەڵاتی سۆسیالیستی پایەدار لەساڵی (١٩٧١) و لەڕوسیادا هاتە کایەوە وڵاتانی خۆرئاوای ئەورووپاش کەژینگەی مێژوویی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ناسیۆنالیزمە رۆژێ لەڕۆژان لەژێر دەسەڵاتی سۆسیالیستە مارکسیستە تەقلیدیی‌یەکاندا نەبوون.. لەرووبەکی‌ترەوە کۆکردنەوەی سۆسیالیزم و (ئایین)یش کە هاوکێشەیەکدا زۆر وردنییە. چونکە لە مێژووی نوێ دا هیچ ئایدۆلۆژیایەك هێندەی سۆسیالیزم لە بەرگە مارکسیزمەکەیدا دژایەتی ئایینی نەکردووە.. دەسەڵاتە سۆسیالیستەکانی بلوکی رۆژهەڵاتی جارانیش بە شێوەیەکی خوێناوی ئایین و شوێنکەوتووەکانیان سەرکوت کردوون، هەرچی پەیوەندی بە ئایین و ناسیۆنالیزم و دیموکراسیشەوە هەیە لەوەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا تارادەیەك لە سەری وەستاین. ماوەتەوە بڵێین راستە ناسیۆنالیزم بە هەندێ رەنگ و هەناسەی ئایینی متوربەکراو.. هەردووکیان بە پلەی یەکەم کار لە سەر سۆز دەکەن، مەسەلەی مردنی پیرۆز و چەمکی شەهید و زۆرشتی‌تر ئاماژە بە هەندێ لەیەکچوون دەکەن.. لە دونیاش دا چەندین مۆدێلی ناسیۆنالیزمی ئایینیمان هەیە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئایین و ناسیۆنالیزم یەك شتبن و یەك ئەرك لە کۆمەڵگادا راپەڕێنن دەشێ لە هەندێ کاتدا جۆرێ لەهاوپەیمانی دروست بکەن، وە لە بەر ئەوەی هەردووکیان دووپێدراوی ناو کۆمەڵگان و لە چوارچێوەی کلتورێکدا کاردەکەن، کاردەکەنە سەریەکتر، بەڵام لە بەرەنجامی کۆتایدا تایبەتمەندی خۆشیان دەپارێزن.. دەشێ ئایین لە هەندێ کاتدا وزەی بەرگری و رەوایەتی بەناسیۆنالیزمێك ببەخشێ، چونکە رووبەڕوو وەستانەوە بەرامبەر بەستەم لەوانەش ستەمی نەتەوەیی

گەر کێشەیەکی ناسیۆنالیزم بێت لە بەرگە ئەوا لەهەمان کاتدا مەسەلەیەکی ئایینیشە، لەکاتی سەرکێشانی ناسیۆنالیزمیش بەرەو رەگەزپەرستی و دەمارگرژی، ئەرکی ئایینە رووبەرووی بوەستێتەوە، کەواتە دۆخەجیاوازەکان و بە تایبەتیش فۆرمەکانی ناسیۆنالیزم جۆری پەیوەندی لە نێوان ئایین و ناسیۆنالیزمدا دیاری دەکات و لە سەر ئاستی کۆمەڵگاشدا هەر یەکەیان دەبنە رووپەکی شووناسی کۆمەڵ. لە رووی فۆرمیشەوە ناسیۆنالیزم و مۆدیلی "دەوڵەت ـ نەتەوە" ئەو چوارچێوە ئابووری و سیاسی و کلتوورییە بووە کە دیموکراسی تیایدا گەشەی کردووە، ئەوەی ناکۆکە لەگەڵ دێموکراسیدا ناسیۆنالیزم نییە لە خوودی خۆیدا، بەڵکو ناسیۆنالیزمێکی نەژاد پەرست و بەرچاو تەنگ و توندڕەوە. خراپترین و ترسناکترین مۆدیلەکانی ناسیۆنالیزم و حوکمدارێتی ناسیونالیستانە، مۆدێلی ناسیونال سۆسیالیستەکان بووە، لەهەر شوێنێ سۆسیالیزم، لە بەرگە مارکسییەکەیدا لەگەڵ ناسیۆنالیزم تێکەڵ بەیەك بووبن، کارەساتیان خوڵقاندووە و دۆخێکی ترسناکیان لە سەرکوت و تێکشکاندنی کۆمەڵگای مەدەنی و ژێرپێدانی ماف و ئازادییەکان هێناوەتە کایەوە، زۆربەی هەرە زۆری دەسەڵاتی ناسیۆنالیستە چەپەکان، هەر لە ئەڵمانیای نازییەوە بگرە هەتا دەگاتە وڵاتانی ناوچەکە و چەندین وڵات لە جیهانی سێهەمی جاراندا، دەسەڵاتێکی رەشی سەرکەوتکەر و خوێناوی بوون، چونکە بە قووڵاییدا ئاماژە بووە بە لادان لە بازنەی سۆسیالیستی و ناسیۆنالیستیدا و بەیەکەوە گرێدانی رووە هەژموونخوازەکەی هەردووکیان بووە لە چوارچێوەی مەیلێکی دەسەڵاتخوازانەی سەر شێتانەی دەستە بژێرێکی دیاریکراودا.

## ئەنفال... پرۆسەی بەشتومەك كردنی مرۆڤی كورد*

پێمwایە پرسیاری چۆن لە ئەنفال تێبگەین؟ تاكو ئێستاش لەناوەندی فكری كوردیدا پاساوی خۆی هەیە، ئێمە پێویستیەكی قوڵمان بە ئەنفالناسی هەیە چونكە ئەنفال تەنها كارێكی میكانیكی رووت نەبوو لە ساتە زەمەنێكی دیاریكراودا روویدات، پرۆسەیەك نەبوو دابڕاو لە بونیادی عەقڵێكی سیاسی دیاریكراو كە عەقڵیەتی بەعسە، جیهانبینی و شێوازێكی بیركردنەوە و فەلسەفەیەك لەپشت ئەنفالەوەیە، دەزگایەكی تیۆری و ئایدیۆلۆژیای لە دواوەیە كەناو لەشتەكان دەنێ و شوناس دەدا بە قوربانیەكان.

قسەكردن دەربارەی عەقڵی ئەنفالچی و خەسڵەتە دیاریكەرەكانی تەنانەت بۆداڕشتنی جۆری پەیوەندییەكانی ناو خۆمان و هەر پێكەوە ژیانێكی ئایندەش گرنگە، ئەویش لەو سۆنگەوە بەهۆی كلتورێكی سیاسی دەیان ساڵە و ئامادەبوونی ئایدیۆلۆژیای خوێن لەم وڵاتەدلو شێوانی بونیادی عەقڵی كوردی دەشێ بەشێ لە رەگەكانی ئەو عەقڵە و توخمە پێكهێنەرەكانی لە فۆرمی جۆراوجۆردا هێشتا هەركاری خۆیان بكەن، رەنگە لەچەند ساڵی رابردووشدا تارادەیەك هەندێ شایەتی درێژبوونەوەی ئەو كلتورە شوومە بووین بۆناو هەناوی بەشێ لە مرۆڤەكانی ئەم كۆمەڵگایە، دۆزینەوەی ئەو ئایدیۆلۆژیا و

---

* لەژمارە (٢)ی گۆڤاری (ئەنفال)ی ساڵی (٢٠٠٠)دا بڵاوكراوەتەوە.

سیستم و تۆڕی پەیوەندییە لێپرسراوە. لەبەرهەمهێنانی کارەساتێکی گەورەی وەکو ئەنفالدا لەو رووەشەوە خزمەتمان پێ دەکات کەشەرە فکری و سیاسی و نەتەوەیەکانمان لەپێناو قوربانیانی ئەنفالدا لەسەر گۆڕەپانە سروشتیەکەی خۆیدا بکەین و تووشی وەهم و شەڕکردن لەگەڵ دوژمنە دروستکراوەکان نەبین، کەکارێکی لەم جۆرە رەنگدانەوەی خراپی دەبێت بۆسەر جۆری ئاراستەکردنی وزەو توانا کوردییەکەو شانسی بەیەکەوە ژیانی تەوژمەکانی کۆمەڵگای کوردستانیش تارادەیەکی زۆر کەم دەکاتەوە..

## بەعس و ستراتیژیەتی ناولێنان

بۆچی بەعس لە عێراقدا ناوی (ئەنفال) بۆ قەلاچۆکردنی بەشێکی بەرفراوانی گوندنشینی کوردەواری بەکار دەهێنێ؟ چ ستراتیژیەت و وێناکردنێك ئەم ناولێنانەمان بۆلێکدەداتەوە؟ لە ڕاستیدا گەڕانەوەی بەعس لەسەرەتای هەشتاکانەوە بۆ بەکارهێنانی هەندێ چەمك و زاراوە و رەمزی کەلەپوری ئیسلامی لە پروپاگەندەی خۆیدا دەبێت لەمیانەی شەڕی (عێراق ـ ئێران) و ئەو تەوژمە ئیسلامییە بەهێزەوە تێیبگەین کە ئەوکاتە لەسەراپای ناوچەکەدا لە پەرەسەندن و بەهێزبوونێکی خێرادا بوو کۆماری ئیسلامی ئێران ستراتیژیەتی پڕوپاگەندەی خۆی دژی بەعس و رژێم لەسەر ئەو بناغەدا داڕشتبوو کە دەیویست رژێم و ئایدیۆلۆژیاکەی بە نائیسلامی، بەڵکوو دژە ئیسلامی لەقەڵەم بداو هەموو شەرعیەتێکی کلتوری و مێژوویی لێدابڕێ، رژێمیش لەم رێگایەوە دەیویست گومان لەسەر راستگۆیی ئەو پروپاگەندە دانێ و رەوایەتی لێ بسەنێتەوە و بەپێچەوانەوە خۆی بکات بە نوێنەری مێژوو رەسەنایەتی و ئێرانیەکان بخاتە ئەودیو

هەموو ڕەوایەتیەکی ئایینی و شارستانیەوە، هەربۆیە جەنگەکەی بەجەنگی (قادسیەی سەدام) ناوناو فارسەکانیشی بەئاگرپەرست لەقەڵەمداو ئەو موشەکانەی شارە ئێرانیەکانیشی پێدەکوتا ناوی ڕەمزە ئیسلامیەکان و بەڵکوو ڕەمزە شیعیەکانی لێدەنان، ڕژێم بەم کارەی ویستویەتی هێندەی پێی دەکرێ ڕای گەلانی مسوڵمانیش چەواشە بکات بەسود وەرگرتن لەو دواکەوتوویی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ژیاریەی زۆربەی ئەو گەلانە بەدەستییەوە دەناڵێنن، هەروەها ویستویەتی ئەم شێوازە لە پڕوپاگەندە هاندەرێکیتر بێت بۆ مرۆڤی عێراقی و بەتایبەتیش سەربازی عێراقی، چونکە دەستپێشخەری عێراق لەشەڕەکەداو داگیرکردنی بەشێکی بەرچاو لەخاکی کۆماری ئیسلامی ئێران لەڕووی سایکۆلۆژیەوە بەخاڵێکی لاوازی سەربازی عێراقی دادەنرا، گرنگە لێرەدا سەرنجمان بۆ ئەوە رابکێشرێ کە کاتێ بەعس و دەزگا پڕوپاگەندە زەبەلاحەکەی چەمك و زاراوەیەك لە کەلەپورو مێژووەوە وەردەگرێ و بەکاری دێنێ تەنها لەڕووی فۆرم و شکڵەوە وەری دەگرێت بەمەبەستی پەیداکردنی ڕەوایەتی و قووڵایی پێدانێکی مێژوویی بەهەنگاوو ڕەفتارەکانی، هەروەها بۆچەواشەکردن و کەمکردنەوەی کارایی گوتار و پڕوپاگەندی بەرامبەریش.

دەزگا پڕوپاگەندەیی و ئایدیۆلۆژیاکەی ڕژێم زاراوە و چەمکەکە بەناوەڕۆکە مێژووییەکەوە بەکار ناهێنێ، بەڵکو وەکو وشەیەکی ناو فەرهەنگی زمانی عەرەبی بارگاوی کراو بەهەندێ دۆخی مێژوویی بۆ پێناسەکردنی واقیعێکی تەواو جیاواز لەو واقیعە مێژووییەی زاراوەکەی بەرهەمهێناوەو بەسەریدا براوە بەکاردەهێنێ، ئەمەش مەسەلەیەکی باوی دنیای فکرو سیاسەتە بەتایبەتیش فکرو سیاسەتی هاوچەرخ، بۆ نموونە بەکارهێنانی چەمکی هەژموون (هیمنە) لای بیرمەندێکی وەکو (گرامشی)

ئاماژەیەکی تایبەت بەخۆی هەیەو زیاتر دەربڕی ئامادەیی ئایدیۆلۆژی و مەقبولیەتی کۆمەلایەتی تەوژمێکی فکری و کۆمەڵایەتی دیاریکراوە، لەبەرئەوە گەر ویستمان چەمکی هەیمەنە لەواتا کلاسیکیەکەوە بگوێزینەوە بۆ واتا نوێیە کەدەبێ بڵێین بەواتا یاخود بە ناوەرۆکە (گرامشی)ەکەی ئەگەرنا لەبەکارهێنانی چەمکەکەدا دەکەوینە هەڵەیەکی زەقەوە، یاخود بەکارهێنانی چەمکی (شێت) لای فۆکۆو جیاوازی ئەم بەکارهێنانە لە بەکارهێنانی ئاسایی و ڕۆژانە[1] یاخود (وطني) لای رژێم و بەکارهێنانی لای کورد کە (١٨٠) پلە بەکارهێنانەکان جیاوازن، هەر بەم جۆرەش کاتێ دەمانەوێ لەئاماژەکانی ئەنفالی بەعس تێبگەین دەبێت لەکاتی بەکارهێناندا بڵێین ئەنفال بەناوەرۆك و واتا بەعسیەکەی، ئەگەرنا تووشی سەر لێشێواویەکی فکری و مەنهەجی دەبین و قسەکردنەکانیشمان لەسەر پرۆسەکە لەسەرەتایەکی ناڕاستەوە دەست پێ دەکات و هەر لە یەکەم هەنگاویشەوە دەبین بەقوربانی گەمەکردنی بەعس بەچەمك و زاراوەکان و ناولێنانی دیاردەو کەس و دەرکەوتەکان بەغەیری ناوی خۆیانەوە.

هەر لەم رووەوە سەیر دەکەین یەکێ لەو نوسەرانەی کە دەیەوێت تارادەیەك مەسەلەی ئەنفال بەئیسلام شی بکاتەوە کەچی سەرەڕای ئەوەش دەڵێ: "بەعس ئەو دەسەڵاتەی ئایین (احتكار) دەکات کە توانای رەوایەتی بەخشینی سیاسی هەیە ئەگەر ناهەموو فکرو بیروباوەڕو ئەخلاقیەکانی پشتگوێ دەخات و بەڵکو دژایەتیشی دەکات"[2].

[1] فۆکۆ دەیەوێت باس لە مرۆڤێك بکات رەوشتێکی دیاریکراوی سیستیماتکرلو قبوڵ ناکان و کۆمەڵگاش مامەڵەی شێتی لەگەڵ دەکات و فرێی دەداتە دەرەوەی جەستەی خۆی.

[2] گۆران بابەعەلی، ئەنفال، ژینۆسایدێك لەئاییندا بۆ رەوایەتی دەگەڕێت، رەهەند ژمارە (١٩٩١/٧) ١٩٩٧.

بەعس وەك پارتێکی ناسیونال‌سۆسیال لەدیدکی ناسیونالیستانەی لائیکی مۆدێرنانەوە مامەڵە لەگەڵ چەمکی ئەنفال دەکات و دەیخاتە گوتاری سیاسی سەربازی خۆیەوە، لەم سۆنگەشەوە دەتوانین تا رادەیەك ستراتیژیەتی بەعس لە بەکارهێنانی (ئەنفال) بۆ پرۆسەی ژینۆسایکردنی بەشێ لە نەتەوەی کورد حاڵی بێت کە دەکرێ بەم جۆرە کورتی بکەینەوە.

یەکەم: بەحوکمی ئەوەی کە چەمکی ئەنفال لەبەکارهێنانە ئیسلامیەکەیدا بەغەنیمەتی جەنگی دەوترێت لەکەلوپەلی ماددی و تفاق و کەرەسە جەنگی، کاتێ بەعس ئەم چەمکە بۆ قەڵاچۆکردنی گروپێکی بەشەری سود لێوەردەگرێت لێرەوە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ لە وێناکردن و بیرکردنەوەی بەعس تێدەگەین دەربارەی ئەنفالکراوەکان.

کە ئەویش دەتوانین ناو بنێین بە (پرۆسەی بەشتومەکردنی مرۆڤ) ئیتر دوای ئەم شوناس پێدانە ئەنفالکراوەکان نەك هەر هاوڵاتیەکی خاوەن ماف نامێنن و هەموو مافە یاساییەکانیان لەدەست دەدەن، بەڵکو هەر لە بنەڕەتدا بەمرۆڤ دانانرێن و تەماشا ناکرێن. واتە مرۆڤ بوونیش لەدەست دەدەن.

کاتێك قوربانیەکانیش دەخرێنە گۆڕی بەکۆمەڵەوە پێویست بەهیچ راچڵەکانێکی ویژدان و سەر لێکردنەوەیەك ناکات چونکە ئەوان تەنها بەرواڵەت مرۆڤن ئەگەر نا شتێ نین جگە لەکۆمەڵێ کەلوپەلی ژەنگرتووی بەکارنەماوی زیانبەخش، بۆ نمونە وەکو پاشماوەی کورە ئەتۆمیەکان کەپێویستە بۆ ئەوەی لەزیانیان بەدووربین بخرێنە ژێر گڵەوەو لەهەناوی خاکدا بشاردرێنەوە، لەبەرئەوە زۆر بەسەهودا چوین و تووشی

گومرایی بووین گەروا بیربکەینەوە بەعس شوناسی فکری و ئایدیۆلۆژی و ئایینی ئەنفالکراوەکانی لاگرنگ بووە.

لەراستیدا ئەوانەی ئەنفالکران هەموویان مارکسی بوونایە یاخود ئیسلامی جێگای بچوکترین بایەخی رژێم نەبوو، ئەم ناسنامە پێدانانە بۆ ئەو یەکجار بێواتایە، ئەوەی بۆ رژێم گرنگ بوو ئەوان لە پانتاییەکی جوگرافیدا نیشتەجێ بوون کە ببووە سەرزەمینی رەمزی یاخیبوون لە دەسەلاتی رژێم و مل پێنەدانی و پرسیار دروستکردن لەسەر سروشتی ئەو دەسەلاتە، ئەوان لەناوچە قەدەغەکراوەکاندا دەژیان ئەو ناوچانەی رژێم بڕیاری دابوو نابێ ژیانی تێدا بێت، لەو دیو ئەو هێلانەوە دادەنیشتن کە سنورەکانی رژێمیان دیاری دەکرد کاتێ رژێم ئەنفالکراوەکان یەکسان دەکات بەشتومەك و کەلوپەل، ئیتر فکری ئەنفالکراوەکان چ مانایەك دەبەخشێ؟ گەر بەم جۆرە نەبوایە گەر پیاوەکان تاوانبار بوون ئەی ژنەکان چی و چۆن؟ گەر ژن و پیاوەکان هەردووکیان هەلگەڕاوە بوون ئەی مندالانەکان چۆن؟ هێنانە گۆڕێی هەر مەسەلەیەکی تایبەت بە باوەڕو بێباوەڕیی ئەنفالکراوەکان حکایەتێکی بێتامە و هیچیتر.

دووەم: (نفل) لە زمانی عەرەبیدا واتای زیادە لە خۆدەگرێت، بەعسیش دەیەوێت پێمان بلێت ئەنفالکراوەکان باربوون بەسەر شانی کۆمەلگای عێراقییەوە، بەشێ نەبوون لەو کۆمەلگایە وەکو لوێك یاخود ئەندامێکی زیادی جەستەوا بوون و تەندروستی و جوانی جەستەی کۆمەلگای عێراقی دەیخواست ئەوان لە کۆل بکرێنەوەو لەناو ببرێن، چونکە بوونی ئەوان لەسەر زەوییەکدا کە بەکردەوە لەوەوپێشیش هەر لەناو ئەوانەوە کەسانێ سەریان هەلداوە ئالای دوژمنایەتی رژێمیان هەلکردووەو لە لولەی تفەنگەکانیشیانەوە ئەم دوژمنایەتیەیان دەربڕیوە، ئەو ناشیرینیە بووە بەرووی عێراقدا

کە بێگەردی کۆمەڵگای عێراقییان تێکدابوو، بۆیە تیابردنیان دەبێتە ئەرکێکی نیشتمانی، هەڵبەتە گرفتی رژێم هەر لەگەڵ ئەنفالکراوەکاندا نییەو نەبووە، بەزیاد زانینی رژێمیش تەنها هەر ئەنفالکراوەکان ناگرێتەوە بەڵکو سەرجەم کورد دەگرێتەوە لەچوار چێوەی ئەوەی پێی دەوترێت قەوارەی عێراقی هاوچەرخ.

کاتێك رژێم عێراق بەبەشێ لەنیشتمانی عەرەب و لەوەش ترسناکتر گەلی عێراقی بەبەشێ لە نەتەوەی عەرەبی دابنێ و سەرۆکەکەشی کەڵکەڵەی سەرکردایەتی ئەو جیهانە عەرەبیەی لەسەر دابێ و رێگای گەیشتن بەئاواتەکانیشی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و خەستکردنەوەی گیانی عەرەبچێتی بێت، بەڵگە نەویستەبوونی کورد وەکو گروپێکی نەتەوەیی جیاواز و خاوەن ئاوات و ئامانجی نەتەوەیی تایبەت بەخۆی دەبێت بە رێگر لەبەردەم ئەم خواستەی رژێم و سەرۆکەکەیدا گەر هەندێ ئاوڕ بەلای سیاسەتە سۆسیالیستیەکانی رژێمیشدا بدەینەوە کەدەیویست هەرچی زیاتر مرۆڤ بەدەوڵەتەوە ببەستێتەوە و تا لەم رێیەشەوە کۆنترۆڵ بکرێت گوندنشینەکانی کورد کە لە دوایدا بەشێکی گرنگیان ئەنفال دەکرێن، ژیان و گوزەرانیان تارادەیەکی بەرچاو سەربەخۆبوونی لەدەوڵەت پێوە دیارەو ئەوکلتورو کەلەپورەی هەشیانەو لەناویدا دەژین و بەرهەمی دەهێنێتەوە هەروەها ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەی نێوانیشیان لەزۆر کارتێکردن دەیانپارێزێ کە ئایدیۆلۆژیا ناسیونالسۆسیالەکەی رژێم دەیەوێت بەدی بێنێ.

سێیەم: ئەگەر ئەنفال لەبەکارهێنانە مێژووییەکەیدا غەنیمەتی ماددی جەنگیی بێت ئەوا رژێم بەو ناولێنانە دەیەوێت بڵێت: ئەوەی روویداوە هەر لەبنەڕەتدا تاوان نەبووە.

چونکە بەئێستاشەوە ئەو غەنیمەتانەی لە مەیدانەکانی جەنگدا دەستیان بەسەردا دەگیرێت بەتاوان دانانرێت و، یاساکانی شەڕی نێودەوڵەتی سیفەتی تاوانی پێ نەداوە، بەعس زیرەکانە نایەوێت ناوی شتەکان بەناوی خۆیانەوە بنێت، لەفەرهەنگی بەعسدا شۆڕشی کورد یاخی بوونە، پێشمەرگە تێکدەور لەیاسا دەرچوو و بەکرێگیراوە، ژینۆسایدیش ئەنفالە.

کورد گەر وریا نەبێت و بکەوێتە تۆڕی ناولێنان و پێناسپێدانی بەعسەوە بۆ ئەنفال و ئەو شوناسەش بدات بەقوربانیەکان کە ئیحاکانی ئەم وشەپێمان دەڵێت، گومانی تیانییە دەچینە ناو بازنەی ستراتیژیەکانی رژێمەوە لە کەمەکردن بەناوو ئاوەڵناوەکان. دەبێ ئێمە تاسەر ئێسقان سووربین ئەوەی روویدا ژینۆساید بوو (ژینۆساید) دەتوانرێ وەسفێکی یاسایی ئەو کارەساتەمان بۆ بکات هەروەها ئەوەی روویدا جیاکاری و رەگەزپەرستییە، ئەم تاوانانەش لەدنیای مۆدێرنەو نوێدا روودەدەن و هەر بەم جۆرەش دەتوانین لەئاستی نێودەوڵەتی باس لە ناساندنی قوربانیەکان و سزای تاوانباران و لێپێچانەوەی یاسایی بکەین.

## ریشەکانی ئەنفال لەسەر زەمینی مۆدێرنەدا

(ئەنفال لە کوردستاندا بەبێ مۆدێرنە مەحاڵ بوو، وەك چۆن زۆربەی تاوانەکانی سەدەی بیستەم بەبێ تواناکانی مۆدێرنە مەحاڵ بوو)[1] لێرەوە ئەوانەی بەدوای رەگ و ریشەی ئەنفالی بەعس لەمێژوودا دەگەڕێن پەلکێشمان دەکەن بۆسەر زەمینێ کەگەر

[1] مەریوان وریا قانع، لەنێوان مۆدێرنە و ئیسلامی سیاسیدا، رەهەند، ژمارە (١١)، ساڵی ٢٠٠٠، لا٦٠.

بابەتی بین و مەنهەجیانە بیر بکەینەوە ناشێ لەوێدا ریشەی ئەنفالمان دەستکەوێت، ئەنفال گەر جیاکاری نەژادی و رەگەز پەرستی بێت یاخود ژینۆساید، لەهەردوو حاڵەتدا دەبێت لەچوارچێوەی فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنەو بەرهەمەکانی ئەودا بیدۆزینەوە، ئەنفالکراوەکان گەر لەسەر بناغەی کوردبوون بەو دەردە ببرێن کە بران و پرۆسەکە خۆی گەشەکردنێکی سروشتی دەیان ساڵ چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ململانێی ناوەندی دەسەڵاتدار بێت لەگەڵ کوردستان و گەلەکەی کە لە ئەنفالدا دەگاتە لوتکەی دڕندایەتی و خوێناوی بوونی خۆی، دەبێت لەدوای ئەوساتە مێژووییەوە بەدوای هۆکارەکانیدا بگەڕێین کە نەژاد پەرستی سەرهەڵدەداو تیۆریزە دەکرێت و لەچەندین شوێنی جیهانیشدا پیادەکرێت، (بابەکی ئەحمەدی) بەپشت بەرای چەند تیۆریستێکی خۆرئاوایی ئەو راستییە دەردەخات ئەوەی پێی دەوترێت رەگەزپەرستی لەسەدەی نۆزدەدا و بەسود وەرگرتن لەپێشکەوتنەکانی بایۆلۆژیاو ئەنترۆپۆلۆجیا سەری هەڵداوە[1] هەربۆیە بێتێگەیشتن لەمۆدێرنە وەك ئایدیۆلۆژیا و دەوڵەت و سیستەم، سروشتی ئەنفال و ئەو مەرجەعیەتەی رەوایەتی بۆ ئەم قڕکردنەو بەکۆمەڵ تیابردنە لێ وەردەگیرێت روون نابێتەوە، ئەنفال لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا روودەدات، لەوکاتەی حکومەتی عێراق لەهەوڵێکی نەپچڕاوەی هەمەلایەنەدایە بۆمۆدێرنەکردنی چەك و تفاقی جەنگی و دامەزراندنی ئیدارەی نوێ و دەزگا بیروکراتیەکان کە روداني لەوجۆرە بێئەو پێداویستیانە زەحمەت دێتە پێش چاو، لەرووی فکریشەوە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالناسیۆنالی بەعس و ئەو فۆرمەی مۆدێرنە بۆ دەوڵەت و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانیش پێشکەشی دەکات دیسان بەشدارن لەخولقاندنی مەرگەساتەکەدا.

---

[1] بابەکی ئەحمەدی ئەم بیروڕایانەی لەکتێبەکەی خۆیدا (دەوڵەتی مۆدێرنە)دا باسکردووە.

لەبەر رۆشنایی ئەوەی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا دەتوانین پاڵنەرەکانی ئەنفالی بەعس بگەڕێنینەوە بۆ ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

**یەکەم: ئایدیۆلۆژیای ناسیونالسۆسیالیستی بەعس:** گومانی تێدانییە بەعس حزبێکە هەڵگری بیروباوەڕی ناسیونال - سۆسیالیستی و دامەزرێنەرەکەشی کە (میشیل عفلق)ە سەرچاوەیەکی گەورەی بیر و وێناکردن و ئیلهامەکانیشی فەلسەفەی ئەلمانییە کە لە مێژووی خۆیدا مارکسیزم و فاشیزمی بەرهەم هێناوە.[1]

روونە کە مێژووی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم لە رۆژهەڵات و لەوانەش دنیای عەرەبدا دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم.[2]

ئەم پرەنسیپە سیاسییە تەنها بە (مجرد)ی لەخۆرئاواوە ناگوێزرێتەوە بەڵکو بزاوتە ناسیۆنالیستەکانی ئەوێش دەبنە سەرمەشقی بزاوت و سەرکردە ناسیونالیستەکانی خۆرهەڵات، بەتایبەتیش لەقۆناغێکدا کە بیری چەپ دەبێتە ناسنامەی فکری بزاوتەکە.[3]

زۆربەی هەرە زۆری ناسیونالیستەکانی سەدەی نۆزدەی ئەورووپاش کە ئەو سەدە بەچاخی زێڕینی ناسیۆنالیزمی خۆرئاوایی دەناسرێ ناسیونالێکی فراوانخواز و دوژمنکار و رەگەزپەرست بوون.

[1] کاتی خۆی میشیل عەفلەق ماوەیەك لەئەلمانیا ژیاوە.

[2] (جۆرج تەرابیشی) دەرباری ناسیوناليزمی عەرەب، گۆڤاری (سەردەم) ژمارە (٥/ت١/١٩٩٩).

[3] لە پەنجاکاندا کۆنگرەیەکی بزوتنەوە ناسیوناليستەکانی عەرەب یاخود راستر بڵێین پارت و رێکخراوە ناسیونالیستە عەرەبیەکان لە پایتەختی لوبنان دەگیرێ و تیایدا بڕیار دەدرێ ئەم ناسیونالیزمە لەرووی فکرییەوە بێتە هەڵگری بیری چەپ و سۆسیالیستی، بۆ ئەوە بڕوانە (العالم الاسلامی والمکائد الدولیە خلال القرن الرابع عشر الهجری، فتحی یکن، مؤسسە الرسالە) ص ٥٥.

ناسیۆنالیزمێك بوون تێکەڵاو بەبزوتنەوەی کۆلۆنیالیزم و داگیرکردنی وڵاتان و قڕکردنی گەلان، گەر چاوێ بخشێنین بەهەندێ لەرێبەرە فکرییەکانی خۆرئاوای ئەوکاتە بەئاشکرا ئەو نەزعە (متعالی)یەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەگەڵ گوتاری ناسیونالیستی خۆرئاواییدا ئاوێتە بووە. هەر بۆ نموونە (هیگڵ)ی گەورە فەیلەسوفی ئەڵمانیا لە وتەیەکیدا پاکانە بۆ قڕکردن و لەناوبردنی گەلانی بێهێز و لاواز و دواکەوتوو دەکات و پێی وایە تەنها گەلە بەهێز و بەدەسەڵاتەکان مافی ژیانیان هەیە، بەڵکو مافی خۆیانە گەلە بێهێزو دواکەوتووەکان تیابەرن[١] کە ئەمەش رەوایەتی دانێکی بێپەردەیە بەژینۆساید و قڕکردنی نەتەوەو گەلانیتری دنیا، هەر لە سەر زەمینی هێگڵ و لەئەڵمانیای (بسمارك)ەوە بوو، نیچەش هاواری دەکرد (هەق لەگەڵ هێزدایە) و بانگەشەی بۆ پیرۆزکردنی هێز دەکرد.

نوسەرێکی وەکو (کار بیرسون)یش پێی وابوو رێسای مانەوە بۆ باشترین و بەهێزترین رێسای سروشتیی پەیوەندی نێوان گەلانە.[٢]

ئەم هەناسە جەهەنەمیانەو چەندین هەناسەیتری لەم جۆرە دەگوێزرێنەوە بۆ سەرزەمینی خۆرهەڵات و کارەسات دەخولقێنن، هەموو دەزانین ناسیۆنالیزم کاتێ سەردەکێشێ بۆ فاشیزم و رەگەزپەرستی و فراوانخوازی و دەمارگرژی و توندرەوی و هەوڵدان بۆ تواندنەوەی نەتەوەکانیتر و ژینۆسایدکردنی کلتور و فەرهەنگیان، سەبارەت بەشوێنکەوتنەکانی دەگۆرێت بە (ئایین)، بەڵکو بەئایینێکی دۆگما، لەجیهانی عەرەبیشدا چەندین ناسیونالیست دەکاتە ئەوەی بانگەشە بۆ بەئایینکردنی ناسیۆنالیزم بکات،

---

[١] الدکتور علي محمد تقوی، الاسلام والقومیة، الطبعة الاولى/ ١٤٠٤ هـ، ص٢٣.

[٢] هەمان سەرچاوە و لاپەرەی پێشوو.

ئەوەتا (علی ناصرالدین) یەکێ لە ڕێبەرانی ناسیونالیستی عەرەب ڕاشکاوانە دەڵێ: "نەتەوایەتی سەبارەت بە ئێمە نەتەوەپەرستانی عەرەب ئایینە، بەهەشت و دۆزەخی خۆی هەیە، بەڵام لەم دنیایەدا".[1]

ناسیونالیستێکیتریش بەناوی (عومەر فاخوری) داوای ئەوە دەکات نەتەوایەتی عەرەبی ببێتە قورئان و ئینجیلی نەتەوەپەرستە عەرەبەکان.[2]

هەمیشە چەکێکی دەستی بەعس ئایدیۆلۆژیاکەی بووە بۆ ئەوەی نائینسانترین سیفەت بخاتە پاڵ نەیارو دوژمنەکانی تاکو شەرعیەت بدات بەپاکتاوکردن و تیابردنیان و پاکانەش بکات بۆ ڕەفتارەکانی.

ژینۆسایدی کورد لە سەدەی بیستەمدا نەك هەر لەعێراقدا بەڵکو لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەدا لە ناوەرۆك و لەبنەمادا هەر وەك (د. ئەمیری حەسەنپور) دەڵێ بەرنامەو سیاسەتی ئایدیۆلۆژی ناسیۆنالیزمی تورك و عەرەب و فارسە کەنەزمی جیهانی سەرمایەداری ڕێگای بۆ خۆشکردووە[3] لەراستیدا لەسەردەمی جەنگی ساردا ڕێگا خۆشکردن و کۆمەکی ئۆردوگای ڕۆژهەڵات بۆ ڕژێمە ناسیوناليستەکانی ناوچەکە و کوشتوبڕ و تیابردنی سەدان هەزار کورد هیچی لە یارمەتیەکانی خۆرئاوا کەمتر نەبووە.[4]

---

[1] العالم الاسلامي والمكائد الدولية، ص ٥٧.

[2] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[3] گۆڤاری (ئەنفال) ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٠، ل١٨.

[4] عێراق و سۆڤیەتی کۆن هەر لەساڵی (١٩٧٢) ەوە پەیمانی هاریکاری و دۆستایەتیان گرێدا لە ئاستی نێودەوڵەتیدا بەشێوەیەکی گشتی ئۆردوگای سۆسیالیستی پشتیوانیان لە هەڵوێستەکانی عێراق کردووە، زۆربەی چەك و چۆڵ و تفاقی جەنگی عێراقیش ئاماوەیەکی دوور دریژ سەرچاوەکەی هەر ئەوان بوو ە لە ڕوویەکی ترەوە دەزگای ئاسایش و هەواڵگری عێراق زۆربەی کات لە وڵاتانی سۆسیالیستی مەشقیان پێ دەکرا.

**دووەم: قەوارەی عێراقی هاوچەرخ و دەوڵەتی مۆدێرن:** رەگێکی‌تری ئەنفال لە پێکهاتەی ئەو قەوارەیەدایە ساڵی (١٩٢١) پێکدێ و ناوی عێراقی لێ دەنرێ، دیارە بیرۆکەی دەوڵەتی نوێ بەرهەمی فەلسەفەی سیاسی مۆدێرنەیەو تەمەنی لە (٢٠٠) ساڵ تێناپەڕێ، کە لەفەرهەنگی سیاسیدا بە (مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە) دەناسرێت، روونە مکانیزمەکانی مومارەسەکردنی دەسەڵات لەم دەوڵەتەدا لەفۆرمەکانی پێش خۆی ـ کە فۆرمی ئیمپراتۆریەت بووە ـ زۆر جیاوازە، دەوڵەتی مۆدێرن بەوە دەناسرێتەوە دەسەڵاتێکی یەکجار ترسناکی سزادان و کۆنترۆڵکردن و چاودێری و دەست خستنە ناو کاروباری ژیانی تایبەتی مرۆڤەکانی هەیە.

کەڵەکەبوونی دەسەڵات لەدەستی تاکە کەسێك یاخود نوخبەیەکی دیاریکراوداو مەرکەزیەتێکی توند دەکرێ ببێتە یەکێ لە خەسڵەتەکانی ئەم دەوڵەتە، ئەم دەوڵەتە بەو هەموو توانایەی هەیەتی و لەرێی شەرعیەتدان بە بەکارهێنانی زەبرو زەنگ و کۆنترۆڵکردنی کایەکانەوە، هەروەك (ئالان تۆرین)ی تیۆریست لەبواری فکری سیاسیدا دەڵێ، گەر دیموکراسیەت کۆت و پێوەندی نەکات دەبێت بە وەحش و هەرەشەیەکی گەورە بۆ سەر مرۆڤایەتی و دەوروبەرەکەی دروست دەکات هەروەك چۆن لە نمونەی فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزم و زۆرێ لە رژێمەکانی جیهانی سێهەمدا بینیمان.

کاتێ ئەم دەوڵەتە دەگوازرێتەوە بۆ خۆرهەڵات بە دەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم دەناسرێت وەك مێژووی ناوچەکەش دەریدەخات ئەم دەوڵەتە دەیەوێت لەرێی چڕکردنەوەی زەمەن و قۆناغەکان و سەپاندنێکی توندوتیژ لەلایەن نوخبەیەکەوە نەتەوە دروست بکات، بەڵام روونە کە ئەم پرۆسەهاوشان نابێ بە دیموکراتیزەکردنی دەسەڵات

و کردنەوەی فەزاگشتییەکەی کۆمەڵگا، هەر لێرەشەوە نابێ بە دەوڵەتی گەل بەڵکو گەل، دەبێ بە موڵکی دەوڵەت، لە عێراقیشدا وەك زۆر وڵاتیتری ناوچەکەو بەهۆی ئایدیۆلۆژیا سۆسیالیستیەکەی حزبی بەعسەوە کە شێوەیەکیتر لە توندوتیژی بەرهەم دێنێ و ئەزموونی دەسەڵات و دەوڵەت بەسەر ژیانی تاکە کەسی و کۆمەڵگاوە زیاد دەکات، ئەم پرۆسە واتە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوەو تازەکردنەوەی و مۆبیلیزەکردنی کۆمەڵگا رەهەندێکی ترسناك بەخۆوە دەگرێت، چونکە سەرکردەکانی پارتی بەعسی عەرەبی لە عێراقدا کار لەسەر دروستکردنی کۆمەڵگایەکی یەك رەنگ و خاوەن شوناسێکی یەکگرتوو دەکەن، نایانەوێ هیچ پانتاییەکی جوگرافی یاخود شوناسێکی گروپی و ناوچەیی بمێنێ کە ئاماژە بێت با بچوکیش بێت — بۆ دەسەڵات و شوناسێك لەدەرەوەی ئەو دەسەڵات و شوناسەی ئەم پارتە دەخوازێت لەعێراقدا بوونی هەبێت.

لەم میانەدا کورد دەبێت بەوبوونە جیاوازەی هەرەشە بۆسەر ئەم یەکیەتییە سومبولی و مەعنەوی و شوناسەی کۆمەڵگای عێراق پێکدەهێنێ و نایەوێ لەگەڵ ئەوبارە نوێیەدا ئاوێتە بێت، بەڵکو تێکەڵاو بوونێکی دەوێت لەچوارچێوەی عێراقدا کە لە هیچ کار لێکردن و هاوکێشەیەکدا تایبەتمەندیە سەربەخۆکانی خۆی ون نەکات و بیپارێزێ.

کورد کاتێ باس لە دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی دەکات لە کوردستاندا دەیەوێت پرسی دابەشکردنی دەسەڵاتی ناوەند بێنێتە گۆڕێ، کورد داوا دەکات شاڵاوی (تەعریب و تەرحیل و تەبعیس) بووەستێ لەکاتێکدا ئەو سێکوچکەیە ئامرازی دەستی رژێمن بۆ بەدی هێنانی ئەو عێراقەی دەیەوێت بەدی بێنێ و بەحوکمی سروشتی ئەو

ئایدیۆلۆژیایەی هەڵیشی گرتووە زەحمەتە بتوانی بێچاو برینە گۆڕانی دیموکراتی کوردستان بتوانێت دەسەڵات بەڕێوەبەرێت، کورد دەیەوێ لەپاڵ حزبی بەعسدا حزب و رێکخراویتر هەبن، دەیەوێت، بپرسێت بۆچی من دەبێ ئەندامی حزبێ بم کە عەرەبییەو (ناسیونالیستە)و خەونەکانی لەچوار چێوەی عەرەب بوون و دنیای عەرەبدا بەدی دێ ؟ دەیەوێت لەپاڵ ئینتیما بۆ عێراق ئینتیمایتری هەبێت، ئینتیما بۆکوردو بۆکوردستان، کورد لەدیدی رژێمەوە هەڕەشەیە بۆ سەرهەماهەنگی کۆمەڵگای عێراقی، چونکە دەیەوێت بڵێت منیش بەشم هەیە لە دەسەڵاتداو پشکم هەیە لە سەروەت و سامانی نیشتمانەکەمداو دەبێت سنوری کوردستانەکەم دیاریکراو بێت و ئەو سنورە مێژووییەش بێت کە لەپێش شاڵاوی بەعەرەبکردندا لەئارادا بووە، لەپاڵ شوناسی عێراقی بووندا باسی شوناسێکی نوێ دەکات کە کورد بوونە، کورد بوونیش بەوئامازەو ناوەرۆکەوە تاکە رژێم دەیەوێت لەبازنەیەکی کلتوری تەسکدا قەتیسی داو بیهێڵێتەوە، بەڵکو بەو جۆرەی کورد وێنا لەخۆی دەکێشێ و بەو هەول و مەرجەی دەیەوێت لەچوارچێوەی عێراقدا بمێنێتەوە کاتێ رێز لە شوناسی عێراقی بوونەکەی دەگرێت کە بەرژەوەندی یەکانی و شوناسە کوردییەکەی پارێزراوو رێز لێگیرابێت، ئەم داوای عێراقێك دەکات پێکهاتە و شوناسە جیاوازەکانی ئەم کۆمەڵگایە بتوانن گوزارشتێکی ئازاد و راستەقینە لە خۆیان بدەنەوەو دەرفەتی بەیەکەوە ژیانێکی ئاشتیانەو شەرافەتمەندانەیان لە پێشدابێت، هەموویان توانای ژیان و گەشەکردن و بەرەو کامڵبون چونیان هەبێت، بەڵام دەسەڵات لە عێراقدا دەیەوێت هەموومان یەك شوناسمان هەبێت و سەرجەم شوناسەکانیتر تەنها سێبەرو لەبەر گیراوەیەکی کاتی ئەوبێت، کە ئەویش عێراقی بوونە،

له زۆر جاریشدا عێراقی بوون یەکسان دەکرێ به بەعسی بوون و بەڵکو لەوەش ترسناکتر ئەم مانایه دەگۆڕێ بۆ گوێرایەڵ بوون بۆتاکه سەرکردەی عێراقیەکان!!

سروشتی دەسەڵات له عێراقدا لەباریدا نییه وا به ئاسانی دان بەپێکهاتەکانی کۆمەڵگای عێراقیدا بنێ، بەڵکو بەردەوام دەیەوێت حەقیقەتی ئەم سروشت و پێکهاته عێراقییه بشارێتەوەو وێنای ساختەی لەجیاتی دابنێت، روونه کۆمەڵگایەکی یەکگرتووش بەوجۆرەی مۆدێله مۆدێرنەکەی بەعس دەیخواست سەرەنجام دەبێته سەرکوتکردنی شوناسه جۆراوجۆرەکان و بەگۆڕانی عێراقی بەدەوڵەتی خوێن نەبێت نایەتەدی، داستانی خوێناوی کوردو شیعەکانیش هەریەك و بەجۆرێك حیکایەتی ئەم بەسەرهاته تراژیدیایەمان بۆدەگێڕێتەوە لەچوارچێوەی عێراقدا له عێراقیبونێکی لەم جۆرەدا ئاساییه کورد ببێته هاووڵاتی پله دوو، بەڵکو هەرکاتێ بەرژەوەندیەکانی رژێم و ستراتیژیەکانی بیخوازێ هەر له بنەڕەتەوه سیفەتی هاووڵاتی لەبەشێ لەکورد بستێنێتەوە، دەزگا ئایدیۆلۆژیەکەی بەعسیش بەسود وەرگرتن له شوناسی عێراقی بوون دەکەوێتەگەڕ بۆناولێنان و پێناسەکردنی هەموو سەرجوڵاندن و ناڕەزایی و رازی نەبوونێکی کوردی بەو واقیعە، وێنەی بێگانه لەشێوەی بەکرێگیراوی بێگانه بەکورد و شۆڕشەکەی دەبەخشێ، شۆڕشی کوردی به یاخیبوون دادەنرێ ! ئەم پێناسەکردنەش تاوانبار کردنیەتی بەخێڵەکی بوون و ناشارستانی بوون ! ئەوانەی ناتوانن له ناو کۆمەڵگایەکدا ئاسوده و ئاسایی بژین که یاساو دام و دەزگا هاوچەرخ و مۆدێرنەکان حوکمی دەکەن، کورد لەپروپاگەندەی عێراقیدا دەبێته سێبەری ئیسرائیل، که دەیەوێت لەباکوری عێراقدا خەنجەرێکی ژەهراویتر بدات له گازەرای پشتی نەتەوەی عەرب و

ئیسرائیلی دووەم دروست بکات! دەبێتە دوژمنی یەکیەتی خاکی عێراق و هەرەشە بۆسەر ئاسایشی نەتەوەی عەرەب؟!

لەفەزای ئەم عێراقی بوونەدا هەر پرسیاریکردنێ لە ئایدیۆلۆژیای نوخبە و سروشتی دەسەلات تاوانێکی لێ خۆشنەبووە، لەناو عێراقی مۆدێرندا کورد لە مسوڵمانبوونییەوە (کە ٩٥٪ مسوڵمانە) یاخود لە ئینسانیبونیەوە مافەکانی وەرناگرێ، چونکە نەپێوەر و بەها ئیسلامیەکان و نە بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ بەشداری لە ئاراستەکردنی سیاسەت و ستراتیژدا ناکەن، بەڵکو لە عێراقی بوونیەوە ئەو مافانە وەردەگرێ، کاتێ جیاوازیەکی بەرچاویش لەنێوان عێراق و شەخسی سەرۆك و عێراقییەکاندا نامێنێ ئەوکاتە دەردەکەوێ کە تاچەند ئەو مافانەی لەم شوناسەوە وەردەگیرێن قابیلن بۆهەڵکشان و داکشان، بەڵکو لێ سەندنەوە، هەر لەم میانەدا پێوەرێکیتر دەبێت بەپێوەری رادەی دڵسۆزی و راستکردن لەگەڵ عێراقی بووندا کە ئەویش (سەربازبوون)ە، سەرباز دەبێتە رەمزی گوێرایەڵی و وەفاو راستگۆیی و قوربانیدان بۆعێراق و سەرۆکەکەی (سەربان) رەمزی شەرەفی نیشتمانێتی عێراقییەکانە، عێراقییە راستەقینەو بەشەرەفەکان ئەوانەن دەتوانن بۆپارێزگاری کردن لە عێراق و دەروازەی رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی و دەستکەوتەکانی شۆرشی حەفدەو سی تەموزو رژێمی دەسەلاتدار لەهەموو کاتێکدا ئامادەی مردن و گیانبەخت کردن و قوربانیدان، کوردیش زۆر کەم نەبێ وەك سەربازێکی دڵسۆز خۆی ساغ نەکردۆتەوە، هەر بۆیە بەردەوام گومان لەعێراقی بوونەکەی کراوە، گومان لە ئامادەیی سەربازبوون و عێراقی بوونیش سەردەکێشێ بۆ تاوانبارکردنی بەخیانەتی نیشتمانی، ئەوەی لای رژێم گرنگە مسوڵمان بوون و مەسیحی بوون یاخود مارکسی بوون و ئیسلامی بوونی کورد و

لەوانەش ئەنفالکراوەکان نیە، ئەوەی ئەو ئازار دەدا گومانگردنیەتی لە سەرباز بوونی کورد، ئەوەی گرنگە لای ئەو ئەوەیە کورد دژی ستراتیژیەتی رژێم نەبێت و گوێرایەڵ بێت، نەپرسێت بۆبەشێ لەنیشتمانە مێژوویەکەی لەدانیشتوانی بنەڕتیی خۆی چۆڵ دەکرێ و تەعریب دەکرێت ؟ نەپرسێ بۆزمانێکی دیاریکراوی بەسەردا فەرز دەکرێت؟ بۆ مێژووەکەی لە قوتابخانەکانی کوردستاندا ناخوێندرێت؟ بۆ دەبێ من سەربازی پارێزەری دەروازەی رۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەبی بم ؟ بۆ لە حزبێکدا ئەندام بم کە سەرجەم دروشمەکانی باس لە پان عەرەبیزم دەکات؟ بەم جۆرە ناکرێ باس لەکارەساتی ئەنفال و مەرگەساتی ئەنفالکراوەکان بکەین و باس لە دەوڵەتی مۆدێرنەو قەوارەی نویی عێراق نەکەی، توێژەرێکیش بەناوی (هێلین مالین) لەم رووەوە دەڵێ: (دەستەواژەی سەدەی بیستەم) رێگای بەریشەهەڵکێشان و لەناو بردنی خەڵکدا بۆمسۆگەر کردنی شەرعیەتی دەسەڵاتی دەوڵەت.

رێگایەك بۆ لەڕەگ و ڕیشە دەرکێشانی ئەو گروپانەی بەتەواوی لەناو دەوڵەتی نەتەوەدا جێگیر نابن توانەوەیان بووە، رێگایەکیتر دەرکردن و دور خستنەوەیان، سێیەمیش لەناوبردنیان".[1]

ئەم سروشتەی دەوڵەتی مۆدێرن کاتێ دەسەڵاتێکی رەها بەرهەم دێنێ و لەسایەشیدا مافە فەردی و کۆمەڵایەتیەکان بوونێکیان بۆنامێنێتەوە، ئامرازێکی بنەڕەتی تەفسیرکردنی، هەموو ئەو ژینۆسایدو پاکتاوی نەژادی و ئەتنیەیە کە لەمێژووی نوێ و

[1] گۆران بابەعەلی، ئەنفال: ژینۆسایدێك لە ئایندا بۆ رەوایەتی دەگەڕێت، گۆڤاری رەهەند/ ژمارە (٧)، ١٩٩٩ل ١٤٨ ئەویش وەرگرتووە.

هاوچەرخی دنیادا روویانداو یەکی لەوانەش شاڵاوی ئەنفالەکان بوو لە کوردستانی لەمەڕ خۆمان.

**سێیەم: بێباکی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی:** نەبوونی هیچ جۆرە بەرپەرچدانەوەیەك لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە دژی هێرشکردنە سەر بارزانیەکان زیاتر هانی بەغدای دا ئەنفال دژی کورد بکات بێئەوەی لەسەر ئەم کردەوەیە سزا بدرێت.[1] رەنگە گەر بڵێین بەشێ لە تاوانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و بەتایبەتیش بڕیار بەدەست و زلهێزەکانی دنیا دژ بەکورد دەگەڕێتەوە بۆسەرەتای دروستبوونی قەوارەی عێراقی زیادەرەویمان نەکرد بێت، ئەو کاتەی کورد بە زۆر بەعێراقەوە لکێنراو رۆڵی چارەنوسسازی ئینگلیزەکان لەم مەسەلەدا و بەشداری راستەوخۆی لەبەهێزکردن و پاراستنی قەوارەی عێراقی و سەرکوتکردنی شۆڕش و راپەڕینەکانی کوردا، بەڵام بائێمە واز لەو مێژووە بێنین و بگەڕێینەوە بۆ ئەو ساتە مێژووییەی ئەنفالی تێدا روو دەدات، کە چۆن کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی بەدام و دەزگا نێودەوڵەتیەکانی و ئەندامە دەستڕۆیشتوەکانیەوە نەك هەر لەئاست رەفتارەکانی رژێمدا بێدەنگ دەبێت، بەڵکو بەجۆرێ لەجۆرەکان هەوڵی پاکانە بۆکردن و بەهێزکردنیشی دەدات، گومان لەوەدانییە ئەنفالکردنی گوندنشینی کوردەواری لەژێر هەلومەرجێکی بێدەنگی سامناك و گەورەدا ئەنجام درا.. بەجۆرێ هەندێ جار شارێکی کوردستان بەتەواوی ئاگادار نەبوو بەسەر قەوارەی ئەو مەرگەساتانەی لەناوچەو شارێکیتردا ڕوودەدەن، هەربۆیە ئەم شاڵاوانە لەسەر ئاستەکانی پارچەکانیتری کوردستانیشدا زۆر کەم کاردانەوەی وروژاند، رژێم لە کاتێکدا هێرشەکانی ئەنفالی

---

[1] خالید سالح، ئەنفال/ ژینۆسایدکردنی کورد لە عێراق، گۆڤاری، رەهەند / ژمارە (٧) ١٩٩٩، ل٩٩.

نەدەشاردەوەو دەستگیرکراوەکانی لەشاشەکانی تەلەفزیۆنەوە نیشانی ناوخۆو دنیا دەدا، بەڵام دواتر ئەوەی بەسەری هێنان و کردەوەی بێسەرو شوێنکردنی دەیان هەزار مرۆڤی کوردی لە سایەی نهێنیەکی قووڵدا ئەنجامدا، بەجۆرێ کە ئەوەی پرسی کۆمەڵکوژی و ژینۆسایدی کوردی لەسەر ئاستی ناوچەکەو دنیادا ورووژاند ئەنفال نەبوو، بەڵکو کیمیابارانکردنی هەڵەبجەو قوربانیەکانی ئەو کارەساتە بوو، هەڵەبجە بووە ناسنامەی کێشەی کوردو سومبولی بەکۆمەڵ کوشتنی گەلی کوردستان، لە کاتێکدا بەپێی هەندێ لەو راپۆرت و بەڵگەنامانەی دواتر دەسکەوتن و بڵاوکرانەوە دەردەکەوێ هەندێ لە وڵاتان و بەتایبەتیش ئەمریکا تا رادەیەکی باش ئاگایان لەباری عێراق لەو کاتەداو شاڵاوەکان بووە،[1] بەڵام سەرەڕای ئەوە تەنانەت لەدوای کیمیابارانکردنی هەڵەبجەشەوە کەمتر ئامادەبوون باس لە تاوانە بەکۆمەڵ کوژییەکانی رژێم بکەن، لە (دیکۆمێنتێك)دا لەژێر ناونیشانی (چەند دەلیلێك دەربارەی سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە عێراق) کەلەلایەن تیپە وەزاریەکەی (جۆرج بۆش)ەوە لەئابی (١٩٨٨)دا ئامادەکراوە، بەڕێوەبەرایەتی نویی بۆش ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆگەشەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ عێراقی (صدام حسین)دا.

تیمە وەزارەیەکە دان بەوە دادەنێن کەلە عێراقدا رژێمێکی دیکتاتۆری حاکمە و مافەکانی مرۆڤیش بەشێوەیەکی زۆر ترسناك پێشێل دەکرێن، بەڵام لەهەمان کاتدا دەگەنە ئەو دەرەنجامەی کە دەڵێ: "ئێمە نابێ بەهیچ شێوەیەك خۆمان هەڵقورتێنین لەکێشەی کورد لە عێراقدا، کە نزیکەی شەست ساڵە بەردەوامە، هەروەها نابێ بەرامبەر

[1] پۆست هیتلەرمان، ژینۆساید، هاوتاوانی، بێدەنگبوون، وەرگێڕانی کاوە سالح، رەهەند ژمارە (٧) / ١٩٩٩ ل ٢٠٧ ـ ١٨.

هەوڵە مەشروعەکانی عێراق ببینەوە کە مەبەستیەتی یاخیبوونی کوردەکان دابمرکێنێتەوە".[١]

رۆژنامەی پراڤدای ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێشووش لە رۆژانی ١١ - ١٩٨٩/٩/١٣ لەچەند وتارێکدا بەئاشکرا پاکانە بۆکردەوەکانی رژێمی عێراقی دەکاو داکۆکی لێ دەکات و تەئیکد لەسەر پشتگیری کردنی ئەو سیاسەتەی رژێمی عێراق دەکاو وای نیشاندەدا کە گوایە قوربانی دەستی هەڵمەتێکی ناو زڕاندنە.[٢]

تەنانەت لە (٢٠٠٠/٤/١٦) بوو لە یەکێ لە هۆڵەکانی بینای پەرلەمانی هۆڵەندا (دنیس هالیدای) رێکخەری پێشووی کاروبارە مرۆییەکانی سەر بەنەتەوەیەکگرتوەکان لە عێراق لە وەڵامی پرسیارێکی (یان پاپ)ی لێپرسراوی بەشی دیالۆگی ئەوروپی - عەرەبی - ناو رێکخراوی کەنیسەکان بۆ ئاشتی لەهۆڵەندە دەربارەی ئەگەری ئەو مەترسییەی لەوانەیە میللەتی کورد دوچاری بێتەوە لەحاڵەتێکدا رژێمی عێراقی بگەڕێتەوە ناو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و هەوڵی بیناکردنەوەی ژێرخانی سەربازی خۆی بدات و نمونەی کیمیابارانی هەڵەبجەو ئەنفالی وەبیرهێنانەوە، (دنیس هالیدای) شەرعیەتی تەواوی بەخشیە هەموو ئەوتاوانانە کاتێ کە وتی: (ئەوکاتەی رژێمی بەغدا کوردی ئەنفال کردو کیمیایی پیاکردن ئەوان لەحاڵەتی بەرەنگاریدا بوون و لە دژی حکومەتی عێراق چالاکیان دەنواند.[٣]

هەڵبەتە لێرەدا نابێ رۆڵی چەندین وڵاتی عەرەبیمان لەبیر بچێت کە بەملیارات دۆلار بە درێژایی جەنگی عێراق - ئێراندا یارمەتی رژێمی عێراقیانداو بەشداربوون لە

---

[١] خالید سالح، ئەنفال: ژینۆسایدکردی کورد لە عێراقدا، گۆڤاری رەهەند، ژمارە (٧)، ١٩٩٩، ل١٠٦.

[٢] رۆژنامەی پراڤدی نوێ (١٣-١١ / ٩/ ١٩٨٩)

[٣] کوردستانی نوێ، ژمارە (٢٤٤١)، ٢٠٠١/١/١.

بەهێزکردنی بازوەکانی و ماشێنە زەبەلاحە سەربازیەکەی، کە دواتر ئەو سوپایە بەشێوەیەکی بەرپلاو بۆئەنجامدانی پرۆسەی ژینۆساید و شالاوی ئەنفالەکان بەکارهێنرا، لە لایەکی‌ترەوە گەر شەڕی عێراق ـ ئێران ئەو کەش و هەوایەی خۆشکردبێت پرۆسەکەی رژێم خێراترو خوێناوی‌تر بێت و زەمینەی ئەنجامدانی رەخساوتر کردبێت، لەم روکارەشەوە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەبلۆکی خۆرهەلات و خۆرئاوای ئەوکاتەوە بەشێ لەبەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی، فەزای جەنگی ناوبراو بیانوویەکی لەباربوو بۆ شەرعیەتدان بەتاوانەکەو ئەنجامدانی ئەمەش لە چەند روویەکەوە:

١) شاردنەوەی تاوانەکە و تێکەڵاوکردنی بەشەڕی دژ بە ئێران و دوژمنایەتی کردنی ستراتیژیەتەکانی شۆڕشی ئیسلامی و چەرەدووکەڵی جەنگەکە، هەربۆیە بڕیاری ئەنفالکردن لەسایەی جەنگدا دەدرێ و بەکردەوە سەربازیەکانیش بۆ ئەنفالکردنی رەش و روتی کوردەواری دەبن بەجۆرێ لەدرێژکردنەوەو تەواوکردنی جەنگی عێراق ـ ئێران.

٢) سود وەرگرتنی رژێم لەو وزەو شەڕخوازیەی (٨) ساڵ شەڕی خوێناوی لەعێراقدا دروستی کرد بوو بۆ ئەنجامدانی تاوانی بەکۆمەڵکوژی و وێرانکاریەکی لەم جۆرە.

٣) رژێم ویستی بەم کردەوە سەربازیانەو هەڵمەتەکانی شکۆیەکی‌تر ببەخشێ بەو سەرکەوتنانەی لەجەنگی خۆیدا دژی ئێران باسی دەکرد.

٤) کورد و هێزە سیاسیەکانی لەبەرئەوەی تارادەیەکی بەرچاو گرەویان لەسەر بەزینی عێراق لە جەنگەکەدا کردبوو، لەگەڵ پێچەوانە دەرچوونی ئەم چاوەڕوانییە تووشی نائومێدی و شڵەژانێکی گەورەبوون، بەجۆرێ کورد هەستی دەکرد بێ هیچ پشت و

پەنایەك کەوتۆتە بەردەم ماشێنێکی زەبەلاحی جەنگیی بێبەزەییەوە. دیارە ئەمەش کار لەسەر ورەو گیانی بەرگری دەکات.

٥) جەنگەکەو ئەو بارودۆخەی خولقاندبووی ئەو رۆڵەی عێراق بینیبوی بۆ بەربەستدانان لە بەردەم پەرەسەندنی شەپۆلەکانی شۆڕشی ئیسلامی، عێراقی لە جاران زیاتر دڵنیاکردبۆوە کە لە حاڵەتێکی وادا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و هێزە سەربازی و سیاسییە جیهانیەکان لە بەرامبەر هەر هەنگاوو رەفتارێکدا کاردانەوە لە خۆنیشان نادەن چونکە پێویستیان بەعێراقە.

عێراق بەکردەوە بەنوێنەرایەتی خۆرهەڵات و خۆرئاواو زۆرێ لە دەوڵەتانی ناوچەکە شەڕی ئێرانیەکانی کرد، (تاریق عەزیز) لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ (جیمیس بیکەر)ی وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکادا دەڵێ: "عێراقیەکان هەشت ساڵ لەبری لاوانی ئەمریکا شەڕیان لەگەڵ ئێراندا کرد" ئەمەش لەچەندین مەسەلەدا وەدەردەکەوێت وەك:

١) گەر یارمەتییە بێدرێغییەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاواو دەوڵەتانی ناوچەکە نەبوایە رەنگە عێراق خۆی بەتەنها نەیتوانیایە بەرگەی شەڕێکی وا دووورودرێژ بگرێت.

٢) گەر یارمەتی (١٣٦) کۆمپانیای خۆرئاوایی نەبوایە عێراق توانای بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاوی نەدەبوو، ئەوچەکەی شوێنەوارێکی یەکجار خراپی لەسەر سایکۆلۆژیای کوردی دانا.

٣) گەر درێژەکێشانی ئەو شەڕە و ئاڵۆزبوونی و پەرەسەندنەکانی نەبوایە دەشێ هەندێ کارەسات روونەدایەو قەبارەی قوربانیەکانی ئەنفالیش کەمتر بوایە.

٤) هەروەها ئەو سوپا زەبەلاحەو ئەو هەزاران چەکدارەی کوردو ئەو هەموو کەرەسەو تفاقی جەنگییە بۆ رژێم وابەئاسانی کۆنەبوایەتەوە، کە لە هەڵمەتە یەك لەدوای یەکەکانی ئەنفالەکاندا بەکاری هێنا.

٥) سەرەنجام رژێم لە رووی سەربازیەوە بەو رادەیە بەهێز نەدەبوو، کەهەراڵی بگاتە ئاستێ گوێ بە هیچ شتێ نەداو چی بیەوێ بیکات.

٦) گەر شەڕەکە و بەرەژەوەندییە سیاسی و ئابورییەکانی خاوەن بەرژەوەندیە جیهانیەکان نەبوایە مەرگەسات و روداوە تراژیدیەکان و لەوانەش ئەنفال پەردەپۆش و بێدەنگی لێ نەدەکراو زانیاریەکانی پەیوەندار بەم پرسەوە لەبەرچاوی رای گشتی دنیا نەدەشاردرایەوە.

ئەوەی سەرنج راکێشە تا ئەم ساتە وەختەش کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرەسمی دانی بەم تاوانانەدا نەناوەو ئەنفالیش وەك پرۆسەیەکی ژینۆسایدکردنی نەخشە بۆکێشراوناناسێ.

(هیتلەرمان) لە رێکخراوی (هیومان رایت وَچ) دەڵێ: هیچ دەوڵەتێکی ئەورووپیمان نەدۆزیەوە ئامادەی ئەم کارە بێت واتە یارمەتی داوا لێ بکەین و شکات لە دەوڵەتی عێراق بکات، کاتێ دەچم بۆلای وڵاتان و دەپرسم بۆ ئەنفال و ژینۆسایدی کوردان چیتان بۆدەکرێت؟ وەڵامم دەدەنەوەو دەڵێن کە ئەمە پروپاگەندەیەکەو هیچیتر!

هەر ئەویش لەمەڕ ئەم پرسەوە گلەیی لە سەرانی کورد دەکاو دەڵێ: کورد خۆیان هیچ هەنگاوێکیان نەناوە بۆ ئەوەی ئەنفال بکەن بە بابەتێکی تایبەت، ئەوان لە ئاستی دیبلۆماسیدا هیچ هەنگاوی وایان نەناوە کە شایستەی باسکردن بێت بۆ ئەوەی

مەسەلەی ئەنفال بەرەو پێش ببەن، تاکو ئێستاش باس لە تەعویز بۆکەس و کاری ئەنفالەکان لە گۆڕێدا نیە باس هەر باسی دەرهاویشتەکانی جەنگی کەنداوی دووەمە رەنگە هۆکارێکی ئەو بێدەنگییەش هۆکارێکی لەوە دابێ ئەوان خۆیان بەشداری تاوانەکە بوون گەر بەبێ دەنگ کردنیش بێت.[1]

هەروەها لەم رووەوە ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە دوای دەساڵ تێپەڕین بەسەر جەنگی کەنداوی دووەم و سەرەڕای ئەو بارەی رژێمی تیا بووە لەم ماوەیەدا، بەڵام پرۆسەی پاکتاوکردنی نەژادی لەزۆرێ لەناوچە کوردیەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەودا بەشێوەیەکی بەرباڵو ئەنجام دراوە کەچی هیچ کاردانەوەیەکی شایانی باسیش لەهیچ ئۆرگان و بڕیاربەدەستێکی جیهانەوە نەبینراوە بتوانێ تارادەیەك سنور بۆ ئەم پرۆسە نەخشە بۆکێشراوە ترسناکە دابنێ.

مەترسیەکانی بەئیسلامی کردنی ئەنفال

لەچەند ساڵی رابردوودا و لێرەولەوێ گوێمان لەهەندێ دەنگ بووە و هەندێشتمان خوێندۆتەوە کە بە جۆرێ لەجۆرەکان هەوڵ دەدەن لەسۆنگەی ناونانی هەڵمەتی قەلاچۆکردنی بەشێ لە گوندنشینی کوردەواری بەناوی (ئەنفال) بەرگی ئیسلامی بکەنە بەر ئەم تاوانە و لێکدانەوەیەکی ئیسلامیانە بۆ پرۆسەکە بکەن و وای نیشاندەن کە رەگ و ریشەکانی ئەنفالی کورد لە مێژوودا و رەوایەتی پێدانیشی لە ئیسلامدایە.

[1] پۆست هیتلەرمان، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠.

حەز دەکەم لێرەدا بەرژەوەندییە راستەقینەکانی نەتەوەییمان بکەینە پێوەر و هەندێ تاوتوێی رووە مەترسیدارەکانی ئەم لێکدانەوەیە بکەین و بپرسین ئاخۆ لێکدانەوەیەکی لەم جۆرە بەهیچ راستییەکی مێژوویی پشت ئەستورە؟ یاخود پەرۆشییەکی بێخەوشی بۆگەلی کورد و پاشماوەی کارەساتبارەکانی ئەنفالی لەخۆگرتووە؟

پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە جارێ باله پێشەوە پرسیارێکیتر بکەین و وەڵامی بدەینەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە بۆیادی کارەساتی ئەنفال دەکەینەوە؟ بۆ هەموو ساڵێ ئەم یادە زیندوو دەکەینەوە؟

دەکرێ بوترێ لەبەر ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

١) هێشتنەوەی کارەساتەکە بەزیندوویی لە یادەوەری نەوەکاندا و بەتایبەتیش نەوەی نوێ.

٢) بەهێزکردنی ویستی یەککگرتوانەی نەتەوەیی واتە بەهێزکردنی گیانی ئینتیما بۆ نەتەوەو دەستگرتن بەرایەڵەکانی کوردبوونەوە، چونکە ئامانجێکی شاڵاوەکانی ئەنفال کوشتنی هەموو واتایەکی بەنەتەوە مانەوەو هاودەردی بوو لە ناو کورداندا.

٣) تاکو رای گشتی جیهانی و کۆڕ و دام و دەزگا نێودەوڵەتییەکان رەهەندەکانی تاوانەکە و قووڵایی مەرگەساتەکان بناسن و ئەمەش ببێتە هۆکارێکی گرنگ لەگرتنە پێشی هەڵوێستی پشتیوانی لەکورد و دۆزەکەی.

٤) بیرهێنانەوەی مەینەت و ئازارو گیروگرفتەکانی ئەو بەشە لەکۆمەڵگای کوردی کەپێی دەوترێت پاشماوەی ئەنفالەکان و کەسوکاری قوربانیانی شاڵاوەکە

کەبەداخەوە تائەمرۆش لەپەراوێزخراوترین و بێبەشترین توێژەکانی کۆمەڵگای ئێمەن.

٥) بۆ ئەوەی کار لەسەر تێپەڕاندنی ئەنفال و شێوازی بیرکردنەوەو میکانیزمەکانی عەقڵی ئەنفالچی بکەین کە ئەو عەقڵەش دەکرێ بەم خاسیەتانە بناسینەوە:

أ. تاوان ئەنجام دان لە بێدەنگیدا (پەردە پۆشکردنی).

ب. هەوڵدان بۆ سڕینەوەو نەفیکردنی بەرامبەری جیاواز.

ج. ناولێنانی شتەکان بەناوی غەیری خۆیانەوە.

د. ئیستیغلال کردنی پیرۆزییەکان بۆ ئەنجامدان و رەوایەتی بەخشین بەتاوان.

هـ. سزادانی بەکۆمەڵ (پۆلێن نەکردنی بەرامبەر).

دیارە دەبێ هۆشیاربین کە ئەم عەقڵە لە کۆنەستی خەڵکانێکدا چالاک نەبێ، چونکە تەنانەت لە دوای راپەڕینیشەوە هەندێ لە ئاسەوارەکانی ئەم عەقڵیەتە لەکایە سیاسیەکەدا هەر ماوە، بۆیە شەڕکردن لەگەڵیدا کارێکی جددییە.

لێرەوە دیسانەوە ناچارین بپرسین ئایا ئەوانەی سەرقاڵی بەستنەوەی ئەنفالن بەئیسلامەوە دەیانەوێ چیمان پێ بڵێن؟ دەیانەوێ گومان بکەین لە ناسنامەی ئەنفال چییەکان؟ یاخود بەشێ لە تاوانەکانیان لەکۆڵ بکەینەوەو بیخەینە گەردنی ئیسلام؟ ئایا کارێکی لەم جۆرە هەر هەمووی نارژێتە خزمەتکردن بەوانەی کوردیان ئەنفال کرد؟ لە روویەکیترەوە ئایا دەیانەوێ پێمان بڵێن ستراتیژی شەڕکردنمان دەبێ ئاراستەی ئیسلام بکەین و دژایەتی ئەو بکەین؟ ئایا لە کاتێکدا ئیسلام بەشێکی بنەڕەتی

لەکەسێتی و کلتورو بیرو باوەڕ و کەلەپوری کورد پێکدەهێنیێ و تێکەڵاوی رەهەندە جۆراوجۆرەکانی ژیانی بووە، شەڕکردن لەگەڵ ئیسلام شەڕکردن لەگەڵ خودی کورد خۆیدا نییە؟

بەڵام گرفتی هەرە گەورە لەم پرسەدا بەبڕوای من رەچاونەکردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانە، ئامادەنەبوونی (کورد)ە لەکاتی داڕشتنیی تێزەکاندا چونکە لەم مەسەلەو زۆر مەسەلەیتردا گەر بەرژەوەندییە راستەقینەکانی خەڵك پێوەر بێت لەزۆر کێشەو شەڕی لاوەکی و بەهەڵەداچوونی مەنهەجی دوردەکەوینەوە، چونکە ئەم بەیەکەوە بەستنەوە نەك ناتوانێ تەفسیری (ئەنفال) مان بۆ بکات بەڵکو تووشی هەڵەیەکی مەنهەجی گەورەشمان دەکات لەگەڕان بەدوای رەگ و ریشەو هۆکارەکانیدا خودی بەیەك بەستنەوەکەش بەدووشت لێکدەدرێتەوە:

أ) ئەوەیە کەفاروق رەفیق لەنوسینێکیدا ناوی ناوە بوغز بەرامبەر ئیسلام و شارستانیەتی ناوچەکە، ئەوانەی دەیانەوێت هەموو کلۆڵی و شکستێکی کورد لە مێژوودا بخەنە پاڵ ئیسلام و مسوڵمانبوونی کورد، کاك فاروق دوای ئاماژەکردن بەسێ نوسراو لەو جۆرە نوسینانە دەگاتە ئەوەی بڵێ: گەر ئەم نوسینانە لەمەنفای کوردی نەنوسرایە لەهەر شوێنێکی‌تری دنیا بنوسرایە خاوەنەکانی دەدران بەدادگا.[1]

ب) بەداخەوە لەچەند ساڵی رابردوودا گۆڕەپانەکە شایەتی هەندێ حاڵەت بووە کە هەندێ کەس و ناوەند دەیانەوێ سەرجەم کارەسات و ململانێ و ئاڵوگۆڕەکانی جیهان و ناوخۆ لە رەوانگەی ململانێیی نێوان تەوژمە سیاسی و فکرییەکانی ناو

---

[1] فاروق رەفیق، خۆرئاواو (ئەو)ەکانی: مسوڵمان وەکو (ئەو)ی خۆرئاوا، گۆڤاری رەهەند، ژمارە (٨)، ١٩٩٩، لا ٧٣ ـ ٧٠ .

کوردستانەوە لێکبدەنەوە واتە زۆر کەم دەتوانن بەرز ببنەوە بۆئاستی راڤە کردنێکی مەنهەجی و رەچاوکردنی خەمە گەورەکانی نیشتمان و لە خۆگرتنی ئامانجەکانی نەتەوە، لەهەموو بۆنەو دەرفەتێکدا دادەبەزن بۆ ئاستی تەوژم و گروپ و هەر لەو ئاستەشەوە سەیری بەرژەوەندییەکان و جۆری شیکردنەوەکان دەکەن، ئەگەر نا چ پاساوێ بۆ ئەوە هەیە ساتەوەختەکانی کارەساتێکی نەتەوەیی گەورەی وەکو ئەنفال بقۆزرێتەوە بۆهێرشکردنە سەر ئیسلام و هەندێ کەس لەو کاتەشدا هەریبری لای دژایەتی کردنی ئیسلام و تەوژمی ئیسلامیی کوردستانی بێ؟

چونکە لەئەنفالدا لەپاڵ رەش و رووتی کوردا مێژوو بەهاو مانا جوانەکانی ئیسلامیش ئەنفال کراو شێوێنرا، ئەم کەسانەی خەریکی ئەم کارەن بەدڵنیاییەوە لە دووحاڵەت تێناپەڕن:

١) یا ئەوەیە زۆر رووکەش و ساکارن و بە بەکارهێنانی وشەیەك لە قورئاندا بەرگی ئیسلامی لەبەر تاوانێ دەکەن؟!

٢) یاخود دەزانن وانییە، بەڵام دەیانەوێ پروپاگەندەی سیاسی بکەن و پێداویستیەکانی شەڕی تەوژم و گروپ وایان لێ دەکات ئەو جۆرە شیکاریانە بکەن کە ئەمەشیان تاوانە، هەڵبەتە من بەزیادی دەزانم بچمە ناوباسی ئەوەی ئەنفال لەئیسلامدا یانی چی، چونکە وەك لەسەرەتاوە وتمان مەسەلەکە لە ئیسلامدا پەیوەندی بە مرۆڤەوە نیەو مرۆڤ ئەسیر دەکرێت و ئەسیریش ناکوژرێت و حوکمی هەڵگەرانەوە لە (ئایین)یش لای ئەوانەی بڕواشیان پێیەتی لەسەر بناغەی شوێنی جوگرافی نادرێ، بەڵکو لەسەر بناغەی بیروباوەڕ دەدرێ، بەڵکو ئەگەر دەسەڵاتێ لە

سەدا سەد ئیسلامی بێت و بزوتنەوەیەکی چەکداری ئیسلامی لەدژی بەرپابوو لە فقهی ئیسلامیدا رێسای خۆی هەیە. لەو رێسایانەش بریتییە لەوەی:

ـ ئەسیریان ناکوژرێ، ماڵیان بەتاڵان نابرێ، ژن و منداڵیان پارێزارو دەبێت، ئەوەی مەدەنیەو شەڕ ناکات دەستی بۆ نابرێت و... هتد، هەڵبەتە من بڕواناکەم ئەوکەسانە نەزانن بەعس حزبێکی ناسیونالیست و سۆسیالیست و عەلمانییە، پانتایی سروشتیی گەڕان بەدوای تاوانەکەشدا سیاسەتە، نەك ئایین، هەروەها دەزانن پۆلێنکردنی بەعس و رژێمەکەی لە عێراقدا بۆ هاووڵاتیان و پێکهاتەکان لەسەر بناغەی مسوڵمان و نامسوڵمان نییە، بەڵکو لەسەر بناغەی عەرەب و غەیری عەرەب و بەعسی و غەیرە بەعسیە، بەدەرلەوە بۆ ئەوەی بزانین ئەنفالکراوەکان لەسەرچی ئەنفالکران و تووشی سزای بەکۆمەڵ هاتن هێندە کارێکی زەحمەت نیە تاپێویستی بەهەندێ شیکارکردن و لێکدانەوەی سەیرو سەمەرە هەبێت، بەتایبەتیش دوای ئاشکرابونی ئەو هەموو بەڵگەنامانەی رژێم لە راپەڕیندا ئێمە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ئەو بەڵگەنامانە دەبینین تاوانی ئەنفالکراوەکان لەدیدی رژێمەوە بەروونی دەستنیشانکراوە کە بەشێوەیەکی سەرەکی دوو تاوانە، بۆیە وەڵامی ئەوپرسیارەی ئەنفالکراوەکان بۆ ئەنفال کران؟ لەسەر زاری سەرۆکی رژێم و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و عەلی حەسەن مەجیدی راپەڕێنەری شاڵاوەکان، وەڵامدراوەتەوە ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

یەکەم: سەدام حوسێن لە ساڵی (١٩٨٣) دا دوای ئەنفالکردنی بارزانیەکان لەوتەیەکیدا دەربارەی ئەوان وتی: ئەوانە خیانەتیان لەعێراق و لەپەیمان کرد، ئێمەش

ناردمانن بەرەو دۆزەخ[١] بەگوێرەی بڕیارێکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشیش کە لە ئابی ١٩٨٧دا دەرچووە سزای سەربازی هەڵاتوو لە سێدارەدانە هەڵبژاردنی ڕیزی نیشتمانیش یەکسانە بەتاوانی هەڵهاتن لەسەربازی واتە لەسێدارەدان، بەرەو ڕووی دانیشتووانی ناوچە قەدەغەکراوەکانیش ئەوانەی دواتر بوونە سوتەمەنی شاڵاوەکانی ئەنفال دەڵێ یان ئەوەتا دەگەڕێنەوە ڕیزی نیشتمانیی یان ئەوەتا هەموو مافێکی یاسایی هاووڵاتی لە دەست دەدەن و حوکمی سەربازی هەڵاتوویان بەسەردا دەدرێت[٢] کەواتە لەچاوی سەرکردەکانی بەعسەوە ئەنفالکراوەکان بۆیە وایان لێ بەسەرهات چونکە خیانەتیان لە نیشتمان (لە عێراق) کردبوو، ڕیزی نیشتمانیان هەڵنەبژاردبوو لە ڕیزەکانی خیانەتدا مانەوە، لەبەرئەوە حوکمی سەربازی هەڵاتوویان بەسەردا درا، کە سەربازی هەڵاتوو ڕەمزی خیانەتکردنە بەرامبەر نیشتمان (عەلی حەسەن مەجید)یش لەکاتێکدا بە دەنگی تۆمارکراوی خۆی دەڵێ تەنها و تەنها عێراق پیرۆزو موقەدەسە کوردیش هەر لە (مێژەوە) تاوانی بنەڕەتی ڕێز نەگرتنە لەم پیرۆزییە مۆدێرنە.

**دووەم:** دووەم تاوانی ئەنفالکراوەکان لەڕوانگەی ڕژێمەوە دژی ڕژێم بوونە، ئەو تاوانەی هەر ئەوەندەی درایە پاڵ کەس و گروپێ ئەو کەسە ئەگەر ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕش و زاوای سەرۆکیش بێ یاخود ئەو گروپە باڵە بەعسیەکان عەرەبتر بێت تکای بۆناکات و تاکە ئەگەرێ لەچاوەڕێی دابێ ئەگەری مەرگ و مردنە هەر ئەمەش دەتوانێت کوشت و بڕی شیعەکان و دەستدرێژی کردنە سەرکوێت و کوشتنی حسین کامل و براکەی و دەیان کادری سەرەوەی خودی بەعسی پێ لێکبدرێتەوە.

---

[١] خالید سالح، ئەنفال: ژینۆسایدردنی کورد لە عێراق، وەرگێڕانی کاوە جەمال/ گۆڤاری (ڕەهەند) ژمارە (٧) ١٩٩٩، ل٩٩.

[٢] هەمان سەرچاوە، ل ١٠٠.

هەر لەم سۆنگەوە کاتێ (عەلی حەسەن مەجید) دەکرێ بە بەرپرسی نوسینگەی باکوری حزبی بەعس بڕیارێکی قەرەقووشی دەردەکات و دەڵێ: "یاخیبوان هەموو جۆرە مافێکی موڵکایەتی ون دەکەن، دانیشتوانی ناوچە قەدەغەکراوەکان مافە یاساییەکانیان (تجمید) دەکرێت، پاشان خزم و کەس و کاری پلە یەکەمی یاخیبوەکان و مەدەنیە بریندارەکان کە لەلایەن دەزگاکانی ئەمن و موخابەراتەوە دەزانرێن و دژ بە رژێمن هەڵدەواسرێن[1] قسەکان لەوە روونترن کە پێویست بەهیچ رونکردنەوەیەکیتر بکات.

مەسەلەکانی نیشتمان و خیانەتی نیشتمانی و هاوولاتی و سیستمی ماف و سەروەرێتی و رەگەزنامەش لە چوارچێوەی مۆدێرنە و لەسەر بناغەی جیاوازی رەگەزی و نەتەوەیی نەبێت تێگەیشتن لێیان مەحاڵەو بەئیسلام تەفسیر ناکرێن.

زۆر سادەین گەر وابیربکەینەوە بەعس دەسەڵمەێتەوە لە رشتنی خوێنی مسوڵمان یاخود ئیسلام لای ئەو حەسانە بۆمرۆڤ دروست دەکات، مەگەر سەدان و هەزاران تێکۆشەری ئیسلامخواز لە زیندانەکانی عێراقدا تووشی بێبەزەییترین سزادان و لەسێدارەدان و کوشت و بڕنەبوون؟

شەڕی رژێم لەگەڵ کورددا شەڕی موسڵمان بوون و نامسوڵمان بوون نییە، بەڵکو شەڕی ناسیۆنالیزمێکی بەرچاو تەنگە لەگەڵ نەتەوەیەکدا کەپێی دەوترێت کورد یاخود بڵێین لەگەڵ گەلی کوردستانە.

---

[1] خالید سالح، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩٧.

مەسەلەکەش ئەوەندەی پەیوەندی بەئیسلام و مسوڵمان بوونی کوردەوە هەبێت ڕێك پێچەوانەیە واتا ئەگەر ئیسلام بناغەی پەیوەندی سیاسی نێوان گەلانی مسوڵمانی ناوچەکە بوایە مەحاڵ بوو کارەساتێکی لەو جۆرە ڕوویدات، کەواتە لەئارادانەبوونی سیاسی و یاساییانەی ئیسلام لەشانۆی ناوچەکەدا مەرجێکی بنەڕەتی ڕوودانی ئەم کارەساتەیە، چونکە ئەوەی لەدەرەوەی چوارچێوەی عێراقی بوون ژیان و ماف و کەرامەت بەئێمە ڕەوابیبێنێ ئیسلامە، لە ئیسلامدا من بەحوکمی مسوڵمان بوونم دەبمە خاوەنی کۆمەڵێ ماف، من و عەرەبێکیش لەبەردەم ئیسلامدا یەکسانین، بەڵکو ڕێگا لە بەردەممدا کراوەیە من باشتربم لەو (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) چونکە باشی و خراپی من پەیوەست نییە بەناسنامەی نەتەوەیی و ڕەنگ و زمانی منەوە، بەڵکو پەیوەستە بە بیروباوەڕ و پابەندبون بە بەهاکان و جەوهەری ئینسانی خۆمەوە، جیاوازی ڕەنگ و زمان و نەژاد لەدورو نزیکەوە نابێتە بناغەی داڕشتنی یاساو ئەحکامەکانی یاسای سزادانی ئیسلامی، ئیسلام ئەو شوناسەیە هەمیشە لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیاکەی بەعسەوە ماف و واتا دەدا بە کوردو بوونەکەی بۆ ئەوەی بشتوانرێ کورد لە لەحزەیەکی دیاریکراودا لە سەرجەم مافەکانی دابماڵرێ پێویست بوو ئەم سیستمی ماف پێدانەی ئیسلام کە لە سەیرکردنی بۆ مافەکانی مرۆڤ دان بەم قەوارە دەستکردەدا نانێت لە بەردەمدا نەمێنێ، واتە ئیسلام وەك ڕێکخەری پەیوەندیەکان و ئاراستەکردنی نەخشە و ستراتیژەکان لە ئاستی سیاسەتدا لەگۆڕەپانەکە بکرێتە دەرەوە، ئەمەش ئەو کارە بوو هەر لەسەردەمی ڕژێمی پادشایەتیدا ئەنجام درا.

له لەحزەی مسوڵمان بوونی کوردیشەوە تاسەر هەڵدانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، کورد یادەوەریەکی تاڵی لەو جۆرەی لەگەڵ عەربدا نییە، ئەمەش بوونی هەر (مصداقیه)تێ لەمێژوودا بۆ ئەم جۆرە تێزە دەکات بە سفر.

ئێستا باقسەکانمان کورتبکەینەوەو زۆر بەکورتی بڵێین بەبێ گوێدانە باشی و خراپی نیازە شارەوەکان ئەم جۆرە لێکدانەوەیە بۆ ئەنفال بەرەنجامی خراپی بۆکورد و کۆمەڵگای کورد لێ دەکەویتەوە، چونکە:

١) بیانوو دانەوەیە بەدەستی رژێم بۆ ئەوەی کەرەسەیەکی پروپاگەندەی تازەی دەستکەوێ بۆشاردنەوەی تاوانەکانی و بەکارهێنانی لەکاتی پێویستدا، لەکاتێکدا بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێمە دەخوازێت گوتاری ئێمە دەربارەی ئەنفال بەجۆرێ بێت تاسەر ئێسقان دابڕان لە نێوان ئیسلام و پرۆسەکەدا بەدی بێنێ و رای گشتی ئیسلامیش بەو جۆرە بدوێنێ کە رژێمی عێراق تەنها تاوانی دژ بە کورد ئەنجام نەداوە، بەڵکو پرۆسەی گاڵتەکردن بە ئیسلام و شێواندنی ناوەرۆکەکەشی پیادە کردووە لەرێی بەکارهێنانی وشەیەکی قورئانیی بۆشاڵاوە بەدناوەکەی.

٢) گومان دروستکردنە لەسەر ناسنامەی سیاسی و فکری ئەنجامدەرانی ئەنفال.

٣) قایل بوونە بەو ناولێنانەکەی بەعس، بۆ شاڵاوەکە ئەمەش شاردنەوەی تاوانەکەی لەپشتەوەیە، کە تەنها کاتێ بەتاوان لەقەڵەم دەدرێ ساغ بێتەوە کە تاوانی رەگەزپەرستی و ژینۆسایدە.

٤) گوتارێکی لەم جۆرە دژی دروستبوونی ئیرادەیەکی یەکگرتوانەی نەتەوەییە، چونکە بانگەشەی پۆلێنکردنی کۆمەڵگایە لەسەر بناغەی فکری و سیاسی

تەوژمەکانی و تێکدانی ئەو پەیوەندیانەشە کە ئەم پێکهاتانەی کۆمەڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

٥) بەجۆرێ لەجۆرەکان سوکایەتی کردنە بەگەلی کوردو لەوانەش کەس و کارو پاشماوەی ئەنفالەکان، چونکە کەس ناتوانێ نکولی لەوە بکات زۆربەی هەرە زۆری کورد مسوڵمانە، بۆیە هەموو دژایەتی کردنێکی ئیسلام یەکسان دەبێت بە دژایەتی کردنی ئاینی زۆرینەی کوردو رێزنەگرتن لە بەشێ لە موقدەساتی ئەوو هەستی ئاینی تاکەکانی.

٦) بڵاوکردنەوەی بوغزو گیانی رقوقین لەناو کۆمەڵگادا، چونکە ئەو جۆرە قسەکردنانە حەساسیەتی جۆراوجۆر دەجولێنێ بەو سیفەتەی قسەکردنێکی فکریی رووت نیە.

٧) تا رادەیەکی بەرچاو چەواشەکردن و سەر لێتێکدانی جەماوەری تێدایە.

٨) سود وەرگرتنێکی خراپە لەمەینەتی و کوێرەوەری و بێبەشییەکانی گەل و بەتایبەتیش کەس و کاری ئەنفالکراوەکان بۆ بوغزی تاکەکەسی و هەندێ جاریش شەڕی تەوژم و گروپ.

٩) شێواندنی سروشتی ململانێی نێوان رژێم و کوردە کە هەر لەسەرەتاوە ململانێیەکی نەتەوەییە نەك ئاینی، واتە ململانێ نیە لەسەر جیاوازی ئاینی، بەڵکو لەسەر جیاوازی نەتەوەیە.

ئەگەر پێوەری بەرژەوندیەکانی نەتەوە و مەنهەجی بوون و توێژینەوەی بابەتی بێت زۆر زەحمەتە لەچوار چێوەی هیچ کام لەمانەدا جێگای ئەو گرێبەندییە ناشەرعییە ببێتەوە، بەعس لە دوورونزیکەوە نەیپرسیوە لەئاین و بیروباوەڕی ئەنفالکراوەکان، ئەم

جۆره پرسیاره جێگای بایەخیشی نەبووه، بەم شالآوانەو بەبەشداری پێکردنی بەشێ لەگەلی کورد خۆی ویستویەتی هەموو هەستێکی ئەخلاقی و هەست بەکورد بوونێ بەمانا نەتەوەییەکەی لەتاکی کوردا بکوژێت، ئەم جۆره لێکدانەوەش پێ ناچێ خزمت به پڕکردنەوەی چاڵ و چۆڵیەکانی ئەو هەڵکۆڵینەی رژێم بکات چونکه کارێکی لەو جۆره خۆنمایش کردنێکی یەکگرتوانەی نەتەوەیی دەوێت.

## کورد و عەلمانیەت، ئەزموونێکی تاڵ و واقیعێکی تراژیدی، سەرنجێك

ئەم نووسینه داوەری کردنێکی سەراپاگیر نییه دەربارەی عەلمانیەت، بەڵکو سەیرکردنیەتی لەگۆشەنیگای پەیوەندی دەسەلآته عەلمانیەکانی ناوچەکەو تا ڕاددەیەك خۆرئاواش بەکێشەی کورد و تراژیدیای دەیان ساڵەی نەتەوەی کوردەوه.

ئەمەش بۆ رزگارکردنی مشتومڕه فکری و سیاسییەکانی لەمەڕ خۆمانه بەرەو جدی بون و ڕێزگرتن له واقیع و رەنگدانەوەکانی، عەلمانیەت لەزۆر شوێنی دنیادلو لەوانەش خۆرئاوا زەمینەسازکەری دیموکراسی و کرانەوەو پێشکەوتن بووه، بەلآم لەهەمان کاتدا له زۆر شوێنیتری دنیاش لەوانەش وڵاتانی کۆمۆنیستی پێشوو رژێمەکانی ناوچەکه زەبرو زەنگ و دەسەلآتی خوێناوی بەرهەمهێناوه.

لێرەشەوه ئەوەندەی لەعەلمانیەت تێگەیشتن گرنگه خودی عەلمانیەت گرنگ نیه، چونکه دواجار عەلمانیەتیش زیاد له مۆدێلێکی سیاسی بەرهەم هێناوه، یاخود لانیکەم لەگەڵیان هەڵی کردووه.

عەلمانیەت کاتێ لەدیموکراسی دابڕاو لەگەڵیدا هەڵینەکرد دەگۆڕێت بۆ مێردزمەیەکی ترسناک.

هەر ئەمەش داستانی مۆدێلە عەلمانیەکانی ڕۆژهەلات و تراژیدیای کورد لە سایەی هەندێ لەو رژێمانەمان بۆ دەگێڕێتەوە. ئەم نووسینە ڕەتی ئەو بۆچوونانە دەکاتەوە کە خەبات کردن بۆ عەلمانیەت یەکسان دەکات بە خەبات کردن بۆ سەرفرازی و ئازادی نەتەوەیمان. چونکە عەلمانیەت لە بەرامبەر ئیشکالیەتی دەسەڵاتی دینیەوە سەری هەڵداوە نەك کێشەو ستەمی نەتەوەیی، کۆلۆنیالیزم و ڕەگەز پەرستی ناسیۆنالیزمی توندڕەومەندخواز و دوژمنکارو کارەساتە نەتەوەی یەکان لە سایەی عەلمانیەتدا بەدیهاتوون. بۆ پرۆژەیەکی نەتەوەیی عەلمانی بوون و ئیسلامی بوونی ئەو دەسەلاتەی مافەکانی زەوت کردووە گرنگ نیە، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کێ باوەڕی بە فرەیی نەتەوەیی و بەیەکەوە ژیان و مافی چارەنووس و ئازادی نەتەوەکان هەیە و کێش دژی ئەم سەرەتایانەیەو کار بۆ سەرکووت کردنی شوناسە جیاوازەکان و نەتەوەکان دەکات و بڕوای بە باڵادەستیی نەتەوەیی و جیاکاری و چەوساندنەوەو ملپێکەچکردنی نەتەوەیی هەیە. بە مانایەکیتر پرۆژەیەکی نەتەوەیی لەوانەش پرۆژەی نەتەوەیی کوردی نابێت هاوپەیمانی ئایدۆلۆژی هەڵبژێرێت بەڵکو دەبێت دورو نزیکی هێزو تەوژمەکان لە خواستەکانی خۆی بکات بە پێوەری هاوپەیمانێتی و کاری هاوبەش لەگەڵ هێزەکانیتردا.

** ** ** **

گەلی کورد لە هەر چوار پارچەکەو بەتایبەتیش لەم بەشەی خاکەکەیدا بەقۆناغێکی ناسکدا تێدەپەڕێ و ئەمەش دەخوازێ ڕێبەرانی فیکری و سیاسی بەرپرسانە لاپەڕەکانی مێژووی دوێنێ و بەتایبەتی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردو شۆڕشەکەی و ئەزموونی کورد لەگەڵ ڕژێم و دەسەڵاتدارانی ناوچەکە هەڵدەنەوەو بەرەنجامی پێویستی لێ هەڵێنجن بۆ ئەوەی هەر ئاوا ژیانمان دووبارە بوونەوەی ئەزموونە شکستخواردوەکان و دروشمە ڕەنگاورەنگەکان نەبێت، خراپیش نیە گەر لە ڕوانگەی بەرژەوندی رووتی کوردانەوە ڕژێم و دروشم و ئایدیا و ئەزمونەکان هەڵسەنگێنین و حوکمیان بەسەردا بدەین و دیدی نویی خۆمان بنیات بنێین، ڕەنگە یەك سەدەی ڕەبەق لە ئازار و مەینەتی و خوێن و فرمێسك و شۆڕش و خەبات و کەوتن و هەڵسانەوەی کورد بەس بێت بۆ ئەوەی کارایی چەندان ئایدیۆلۆژیا و جۆری ڕژێم و میکانیزمی خەبات و شێوازی جۆش دان و چۆنیەتی دیاریکردنی ئامانجەکان وەدەرکەون لانیکەم لە بەرگە ڕۆژهەڵاتیەکەیدا، هەق واشە لەبەر ڕۆشنایی واقیع و تێگەیشتنی هێز و دەوڵەت و شەپۆلەکانیشەوە ئەو ئایدیۆلۆژیا و تێزانە بخوێنینەوە کە لەسەد ساڵی ڕابردوودا بوونە مۆرکی دیاری ناوەندە فکری و سیاسیەکە و بەشێکی بەرچاو لە نوخبەی ئەم وڵاتانە.

کورد لەسایەی دەسەڵاتی عەلمانی ڕژێمەکانی ناوچەکەدا توشی کارەساتی مەزن هاتووە بۆ ئەوەی وانەزانین هەر ئەوەندەی ناوی عەلمانیەت هات وابزانین (گومانی تێدانیە کە دەربڕی پێشکەوتن و ڕزگاربوون و ئازادییە)[1] یاخود وابزانین عەلمانیەت پەیوەستە بەمافەکانی مرۆڤ و ئازادی فیکرو بیروباوەڕو یەکسانی هەروەها گوزارشتە

[1] سیگا/ گۆڤار/ ژ (١) بەهاری ٢٠٠٠ ل (١٧٢).

لەمافەکانی مرۆڤ و پیادەکردنیەتی[١] یاخود عەلمانیەت برای دیموکراسیەتە وەك هەندێ لە وڵاتانی ئێمەدا بەو جۆرە دەیخەنە ڕوو.

ئەم وەسف و قسانە بۆئێمەی کورد لەسەراپای سەدەی رابردوودا زیاتر لە حیکایەت و سەرگوزشتە دەچن تا قسەیەك بن لە واقیعی ئێمەدا هەستیان پێ بکەین. بە درێژایی ئەزموونی تاڵی ئێمە لەسایەی دەسەڵاتدارە عەلمانیەکاندا عەلمانیەتێکمان تاقیکردۆتەوە هەلگری هیچ کام لەم خەسڵەتانە نەبووە، گەردەشوتریێ ئاخر ئەم عەلمانیەتەی ئێرە راستەقینە نییەو عەلمانیەتەکەی خۆرئاوا پێوەرە بۆباشی و خراپی عەلمانیەت و تێگەیشتن لە ناوەرۆکەکەی، وەڵامەکەی زۆر سانایە چونکە ئێمە لە سەرەتای سەدەی رابردووەوە دەسەڵاتە عەلمانیە خۆرئاواییە ئیمپریالیزمە داگیرکەرە دونیا خۆرە کە خاکی ئێمەی دابەشکردو لەبەرخاتری بەرژەوەندییە ناڕەواکانی خۆی نەخشەی ناوچەکەی بەجۆرێ داڕشتەوە کە بەشی کورد ببێ بە چەوساندنەوەو بێبەشی و ژێرچەپۆکی و هەژاری.

کاتێ لەلایەن دەسەڵاتی عەلمانی ناوچەیی یاخود جیهانیشەوە یارمەتی درابین بۆ ئەوە نەبووە ئێمە لەژێر باری ستەم و زۆرداری رزگارمان بێت و لەسایەی رەوشێکی مرۆڤانەی باشتردا بژین بەڵکو بە چاوی کارتێکی فشار بۆ سەر ئەم دەسەڵات یاخود ئەودەسەڵات سەیرمان کراوە.

لەبەرئەوە ویستراوە کۆمەکییەکە لە سنورێکی دیاریکراودا بمێنێتەوە کە بەسودوەرگرتن لەو بتوانرێ لەلایەکەوە سوپای عێراق ماندوو و سەرقاڵ بکرێ و

[١] هەمان سەرچاوە.

لەلایەکیتریشەوە بەو ئەندازە نەبێ کە کوردان سەربکەون، ئەمە لەپەیوەندی بەکوردستانی عێراقەوە.

ستالین و یەکیەتی شۆرەوی لە بەرامبەر وەدەستهێنانی ئیمتیازای نەوتی باکوور لەگەڵ (قوام السلطنة)ی سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی ئێران، ئێمەیان بەگورگان خواردووەدا و کۆماری کوردستان هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لەبارچوو، شای ئێران لە شۆڕشی ئەیلولدا دەمێ هەوڵی دووبەرەکی نانەوەی لەنێوان ریزەکانی شۆڕشی کوردی دەدا و تاوێکیتریش لەگەرمەی شۆڕشدا رێکەوتنامەی جەزائیری لەگەڵ دەسەڵاتە عەلمانیەکەی بەعسی عێراق مۆر دەکات و گەورەترین کارەسات بەسەر کورد و شۆڕشەکەیدا دێنێ.

ئەمریکاش بەهەمان عەقڵیەتی بەکارتێکردنی کورد لەسەر مێزی سیاسەتی ناوچەکەدا مامەڵەی لەگەڵ کردوین، ئەوەتا کیسنجەر دەربارەی نسۆکەکەی (١٩٧٥)ی شۆڕشی ئەیلول و دەستلێبەردانی ئەمریکا دەڵێ: "ئێمە دەست لە کۆمەکی کوردەکان هەڵدەگرین بۆ ئەوەی عێراق بتوانێ بپەرژێتە سەر سوریەکان و حسابیان لەگەڵدا بکات، چونکە دەوڵەتی سوریا ئامادە نیە لە دووەمین قۆناغی سنوردانان بۆهێزەکان لە خۆرهەڵاتی ناڤیندا بەشداری بکات".[1]

دکتۆر (حەسەنەین هەیکەل)یش بەپشت بەستن بەراپۆرتێکی (اوتیس بایك) نوێنەری ولایەتی نیۆیۆرك و کۆمیتەی تایبەتی کۆنگرێسی ئەمریکا دەربارەی مەسەلەی کورد و شۆڕشی ئەیلول لەسەرەتای حەفتاکاندا لەسەر زمانی ئەو دەنووسێ: "مەبەست

[1] رۆژنامەی (اطلاعات) ژ ١٣٥٨/٦/٢.

لەکۆمەکی وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا بۆکوردەکانی عێراق ئەوە نەبوو کە بتوانن سەرکەون و لەبەرنجامی ئەمەشدا بگەن بە خودموختاری چونکە شتێکی لەم جۆرە ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێت کار لە کوردەکانی ئێران بکات و شا تووشی گێروگرفت بکەن".[1]

بەڵکو ئەگەر سەیری مێژووی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست بکەین دەبینین هێزە ئەوروپیەکان و دەوڵەتە عەلمانیە خۆرئاواییەکان زۆرجار فشاریان خستۆتە سەر (باب العالی) و دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی شۆڕش و راپەڕینەکانی کورد سەرکوت کات بەڵکو زۆرجار خۆیان بەشداری راستەوخۆیان هەبووەو شارەزایی جۆراوجۆریان پێشکەش کردووە بۆ کوژاندنەوەی کڵپەی ئەو شۆڕش و راپەڕینانەی کورد و، هەوڵی ئاژاوەنانەوە و دوبەرەکی و ناکۆکی تایەفەگەری و ئایینی و نەژادییان داوە لەکوردستاندا بەتایبەتیش لەنێوان کورد و مەسیحیەکاندا، هەندێ جار ئەوکەمایەتیە ئایینیانەیان هانداوە دژی کورد بوەستن و بەشداری شۆڕشەکان نەکەن و گێروگرفتیان بۆبنێنەوەو هەوڵی لەباربردنیان بدەن، کۆمەڵگای کوردی کە لە مێژوودا نمونەی لێبوردەیی ئایینی بووەو مسوڵمان و مەسیحی و جولەکەو ئایینەکانیتر لەپاڵ یەکەوەو بێشەڕو ناکۆکی ئایینی ژیاون، عەلمانیەتە خۆرئاواییەکە کە لافی ئەوەی لێ دەدا عەلمانیەتی بۆ چارەسەری ناکۆکی و شەڕی ئایینی بەکارهێناوە کەچی لای ئێمەهەوڵی نانەوەی شەڕو ناکۆکی ئایینی دەداو ئاگری دوبەرەکی و رق و کینەی مەزهەبی خۆش دەکات و پیاوی ئایینی ئەڵقە لەگوێ و داردەستی خۆی دەنێرێ بۆ تێکدانی نێوان

---

[1] هەمان سەرچاوە.

مسوڵمانانی کوردستان و شوێنکەوتەی ئایینەکانی‌تر بۆ ئەوەی بەڵگەی بەدەستەوە بێت بۆ دەست‌خستنە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانی بەبیانووی ئەوەی ئەمان سەرپەرشتیاری مەسیحەیکانن و لە چەوساندنەوە دەیانپارێن، یاخود ئینگلیزی و فەرەنسیەکان بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خۆیان دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی شۆڕشەکانی کوردەوە لەوە لاوازتر نەبێ و روسیای قەیسەری هەڵینەلوشێ و قووتی نەدا، ئەم خیانەت و سیاسەتی دژایەتی‌کردنی کوردەی ئیمپریالیزمی خۆرئاوا ئەوەندە بەربڵاو و ئاشکرا و زەقە جێگای مشتومڕ و نەفیکردن نیە، ئەوەش دەخاتە روو کە عەلمانیەت و دەسەڵاتە عەلمانیەکان سەبارەت بە کورد هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە تا دەگات بە ئێستا مایەی کوێرەوەی و دواکەوتن و هەزارو یەك دەردەسەری و کێشمەکێش و هێشتنەوەی وەك گەلێکی بێ‌دەوڵەت و بێ‌قەوارە بوون.

شایانی وتنە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بەتورك کردن و تواندنەوەی نەتەوەیی نەبوو، بەڵکو سیاسەتی ئیمپراتۆریەت بەڕێوە دەبراو دەست تێوەردانیش لە ناسنامەو بونیادی ناوخۆی گەلانیش نەدەکرا، بەتەنیا باج وەردەگیراو لەکاتی شەڕیشدا بەپێی ژمارەی پێویست سەرباز وەردەگیرا.[١]

---

[١] بۆدرێژی ئەم باسەو ئاگاداربوون بەسەر ئەو جموجوڵە گومان لێکراوانەدا بڕوانە کوردو عەجەم مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران نووسینی صالح محمد امین (نەوشیروان مصطفی) چاپی ١٩٩٢.

### ئاوڕێ بۆ دواوە

لێرەدا بۆ ئەوەی دەرکەوێ عەلمانیەت و دەسەڵاتە مۆدێرنەکانی دوای عوسانیەکان بۆ کورد چەندین هەنگاوو گەڕانەوە بوو بەرەو دواوە وا چاکە ئاوڕێ لە رابردوو بدەینەوە.

(پاش دارمانی عەباسەیکان (کوردەکان) چەندان دەوڵەت و میرنشینی جۆراوجۆریان لەسەرتاسەری کوردستاندا هەبووە، هەندێکیان حوکمی ناوچەیەکی گەلێ فراوانی دەرەوەی کوردستانیان کردووە، لەگەڵ بەشێك لەکوردستانی عێراق و تورکیای ئێستا هەروەها وەکو دەوڵەتی زەندیەکان کە حوکمی ئێرانیان کردووە، هەروەها میرنشینەکان لەسەرتاسەری کوردستان کە ئەمڕۆ سەر بە عێراق و ئێران و تورکیایە هەبوون و خاوەن سەربەخۆیی تەواوی خۆیان بوون و نەبەستراونەتەوە بەدەوڵەتی عەباسییەوە پەیوەندیان بە سەلجوقی و مەغۆل و دەوڵەتانی مەمالیك و ئێران و عوسمانیەکانیش لەدواییدا تەنها لە هەندێ پەیوەندی دیاریکراو تێنەپەڕیوە.[1]

میرنشینە کوردستانیەکان لەناو قەڵەمڕەوی ئۆتۆکراتیەتی عوسمانی و سەفەویدا خاوەن دەسەڵاتی سەربەخۆ بوون.[2]

کەواتە سەرەڕای ئەو زوڵم و زۆرەی تووشی کوردەکان هاتووە[1] لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیداو بەتایبەتی لەکۆتاییەکانی ئەو دەوڵەتەداو هەر لەم پێناوەشدا خەڵکی کورد

---

[1] چمکێ لەمێژووی کوردو شارستانیەتی نەتەوایەتییان، نوسینی محمد امین عبدالکریم وەرگێرانی بز هەرسین، رۆژنامەی هاوپەیمانی چوارشەممە ٢٥/٢/١٩٩٨ ژ (١١).

[2] کورتە لێکۆڵینەوەیەکی موفاوەزارەتەکانی شۆرشی ئەیلول ـ مەلا بەختیار.

راپەڕیون و چەندین شۆڕش و سەرهەڵدانیان بەرپا کردووە، جا یان داوای ریفۆرمی ئیداری و ئابوریان کرووە یاخود خەونیان بەرزگاری و دروستکردنی دەوڵەتی کوردانەوە بینیوە وەك لە شۆڕشەکەی شێخی نەهریدا وەدەرکەوت، بەڵام سیاسەتێ لەئارادا نەبووە بەناوی ژینۆسایدو قڕکردنی کوردان و سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی وەك دواتر دژی کورد پەیڕەو کرا، دەوڵەتی عوسمانی گەرچی وەك دەوڵەتەکانی ئەوکاتە بنەماڵەیەکی تورك لەسەری هەرەمەکەیەوە بووەو ئەوان دایانمەزراندبوو وە رەگەزی تورك تیایدا زاڵ و باڵادەست بووە، بەڵام دەوڵەتێکی تورکی نەبووە، بەڵکو بەهەموو کەموکوڕییەکانیەوە دەوڵەتێکی ئیسلامی بووە بەناوی ئیسلامەوە حوکمی کردووە و دەسەڵاتدارانیش شەرعیەتیان لەئیسلام و پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلام و پارێزگاری کردن لە خاك و نیشتمانی ئیسلامی وەرگرتوە، هەربۆیە ناسنامەی تاکی عوسمانی تەنها ئایینی تاکەکەی تیا دیاریکرابوو نەك نەتەوەو نەژاد، هەروەها رەگەزنامەی عوسمانیەت رەگەزنامەی هاوبەشی هەموو ئەو گەل و نەژادو گروپە نەتەوەیی و ئایینیانە بووە کە لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتدا ژیاون، بە واتایەکیتر فرەییەکی ئایینی و نەتەوەیی هەبووەو سیاسەتی ئیمپراتۆریانە پەیڕەوکراوە، دەرگای زۆربەی یان بڵێین هەموو پلەوپایەکانی ئمپراتۆریەتیش بۆ نەتەوە جۆراوجۆرەکان جگە لە پلەو پایەی (سوڵتان) کراوە بوو، ئەلبانیەکان زیاتر لە (٣٠) جار پایەی (باب العالی) یاخود (صدر الاعظم) واتە وەزیری یەکەم یاخود سەرۆك وەزیرانیان وەرگرتووە، کوردەکان توانیویانە ببنە فەرماندەی گەورەی سەربازی و کاربەدەستی جۆراوجۆرو بشگەنە پایەی (شیخ الاسلام)ی دەوڵەت کە پایەیەکی گرنگ و ناسکی دەوڵەت بووە.

---

[١] رۆژنامەی (ولات) ژ (٢٩٢) ٥/ئازاری ١٩٩٨.

ئەم سیاسەتە بەتایبەتی تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەردەمی دەستکردن بە ریفۆرم بەشێوە ئەورووپییەکەی لەناو دەوڵەتی عوسمانی درێژەی کێشا، بزوتنەوە ریفۆرمخوازی لەئارادابوو کە بەشێکی لەژێر فشاری خۆرئاوادا ئەنجام دەدرا بووە هۆی بەرەو مەرکەزی رۆیشتنی ئیمپراتۆریەت و کەمکردنەوەی دەسەلاتی ویلایەتەکان و هەرێم و ناوچە نیمچە سەربەخۆکانی وەکو میرنشینەکانی کورد، سەرەڕای ئەمە میرنشینە کوردیەکان کە بەهۆی ئیدریسی بەتلیسیەوە لەدوای جەنگی چالدێران سەربەخۆیی ناوخۆیان پارێزرابوو، تانیوەی سەدەی نۆزدەهەمیش برپان کرد، واتە کورد لەسایەی دەسەلاتدارانی عوسمانیدا بەدرێژایی سەدان ساڵ جۆرێ لەخۆبەڕێوەبردنیان لە فۆرمی میرنشینیدا هەبووە، سیاسەتێکیش نەبووە بەناوی (تەتریك) و کوردستان دەیان میرنشین و حکومەتی خۆجێیی بەخۆوە بینیوە.

بەڵکو هەندێ لەو میرنشینانەو لەهەندێ برگەدا ـ وەك میرنشینی سۆران ـ وەك دەوڵەتێکی شێوە سەربەخۆ جوڵاونەوەو دراویان دەرکردووەو ئیدارەی سەربەخۆی خۆیان هەبووە.

دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتیش تا پێش کەوتنە ژێرکارتێکردنی خۆرئاواوە نەیویستووە سیاسەتێ بگرێتە پێش کورد وەك گەلێکی بێخاك و نیشتمان لێ بکات.

عوسمانیەکان نکولیان لەکورد و کوردستانیش نەکردووە وەك نیشتمان و زێدی مێژوویی کوردان (قاموس الاعلام)ی عەللامە (شمس‌الدین السامی) کە لەساڵی (١٨٠٤) دا دانراوە، سنورەکانی کوردستانی وەك خۆی وتووە، هەوڵی نەداوە بەشێ لەسەرزەویەکانی کوردستان کەم کاتەوە و داببڕێت، باسی شارە گەورەکانی کوردستان

دەکات کە بریتین لە دیاربەکر، سلێمانی، کەرکوك، رواندوز، ئەربیل، بتلیس، وان، ئورمیە، کرمانشاە و..هتد.

هەروەها دەڵێ ژمارەیەکی زۆری کوردان لەشارەکانی موسڵ و هەمەدان و بەغدا و تەورێز دەژین، جا دەڵێ کوردستان وڵاتێکی گەورەیە و بەشی هەرە زۆری دەکەوێتە ناو قەڵەمڕەوی وڵاتی عوسمانیەوە، زۆرجار باسی ئازایەتی و مێرخاسی و جوامێری کوردان دەکات کە چۆن هەر لەکۆتایی عەباسیەکانەوە خاوەنی چەندین شورە و قەڵاو قەوارە بوون.[1]

دژی فەرهەنگ و کلتور و زمانی کوردی نەبوون و هەوڵی سڕینەوە و لەناوبردنیان نەداوە، بە شێوەیەکی سروشتی و عەفەوی ژیانیان بردۆتەسەر، نوخبەیەکی کەم لەوانەی لە کاروباری میریدا کاریان کردووە پێویستی وای لێکردوون فێری زمانی تورکی بىن، بە کورتی لە سایەی دەسەڵاتی عوسمانیدا سەرەڕای زوڵمی کاربەدەستان و خراپی باری ئیداری و کارگێڕی و هەژاری خەڵك، بەڵام کورد بوون یاخود ئینتیما بۆ هەر نەتەوەیەکیتر تاوان و کەمی نەبووە، قسەکردن بەزمانی خۆو لەبەرکردنی جل و بەرگی نەتەوەیی و هۆزان و بەستەچڕین بەزمانی خۆ رەمزی جیاخوازی یاخود ناشارستانی بوون و دژایەتی کردنی رژێم نەبوە، هاوبەشیبوونی کوردیش لەدوو پەیوەندی ئیسلامی بون و عوسمانی بووندا لانیکەمی کەرامەتی بۆپاراستوە و هەستی نەکردوە وەك جەستەیەکی نامۆ سەیری دەکرێ و هەوڵی لەناوبردنی دەدرێ، هەڵبەت خوێنەر نابێ وابزانێ من لەسەنگەری بەرگریکردندام لە دەوڵەتی عوسمانی و وادەزانم ئەو دەوڵەتەیە

---

[1] رۆژنامەی (الاتحاد) سیاسة بریطانیا الجدیدة.

کە دەبێ هەمووماں هەوڵی گێڕانەوەی بدەین، نەخێر بەڵام دەشمەوێ لەو مێژووە نیمچە ساختەی قوتابخانەکان دەرچین کە ناسیونالیستە عەرەبەکان نوسیویانەتەوە یاخود کەسانێ دەینوسنەوە بە حوکمی ئایدیۆلۆژی و دژایەتی‌کردنی هەموو سیمایەکی ئیسلامی وای لێ کردوون چاو لە واقیع بپۆشن و راستیەکان ئاوەژووکەنەوە.

لێرەدا ئێمە لە شوێنگەی بەراوردکردنی هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمای و دواتر ئەو دەوڵەتانەداین کە لەسەر داروپەردووی ئەو دروستبوون بەرامبەر بوون و ناسنامەی نەتەوەیی کوردی و تەنها لەم گۆشەوە حوکم بەسەر مێژوو و واقیعدا دەدەین.

## سەردەمی ئیتیحادیەکان

بەبڕوای نوسەر دەوڵەتی عوسمانی وەك سەرەتا و پرەنسیپ و بەعەمەلی لە ساڵی (١٩٠٨) دا واتە لە سەرکەوتنی کودەتای ئیتیحادیەکانەوە بەسەر سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەمدا کۆتایی پێهات، سوڵتان لەوە بەدوا تەنها وەك رەمزێ مابۆوەو کودەتاچیەکان بەگوێرەی مەرامی خۆیان ئاراستەیان دەکرد، دیارە مانەوەشی بۆچەواشەکردن و پەردەپۆشکردنی سیاسەتە چەپەڵەکانیان و هاتنەکایەی زەمینەی لەباربوو بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی رەسمی و یاسایی بەیەکجاری وەك رەمزێ بۆ رژێمێکی دیاریکراوو قۆناغێکی مێژوویی لایبەرن و جڵەوی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی لێ بسێننەوە، ئەمەش ئەوە بوو کە دواترو لەساڵی (١٩٢٤)دا لەسەر دەستی کەمال ئەتاتورك روویدا.

بەشێ لەو زەمینە خۆشکردنەش پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی دوژمنکارانە و ناسیونالیستانەی توندڕەوبوو بەرامبەر نەتەوە ناتورکەکانی چوارچێوەی ئیمپراتۆریەت

بۆ ئەوەی رۆڵەی ئەو نەتەوانە بەتەواوی بەرامبەر بە ئەستانە نائومێد و بەدبین ببن و هەڵوەشاندنەوەی سیستمی سەڵتەنەت کاردانەوەی توند لەملاولا نەوروژێنێ.

تۆرانیە ناسیونالیستەکان هەر ئەوەندەی کودەتاکەیان سەری گرت لە سەرەتاوە تائەوەندەی شوێن پێی خۆیان قایم دەکرد هەندێ دروشمی چەواشەکەری وەکو برایەتی و یەکسانیان بەرز کردەوەو باسی زوڵم و ستەمی قۆناغی لەوەوپێشیان دەکرد، لەوەها حاڵەتێکیشدا سەیر نابێ کە زۆرێ لەرۆڵەی گەلانی سنوری ئیمپراتۆریەت بەوبانگەشەو دروشمانە فریو بخۆن و کودەتاکە وەك هەوڵێکی ریفۆرمخوازانەو تازەکردنەوەی ژیانی سیاسی و کارگێڕی ناو دەوڵەتی عوسمانی دابنێن، یەکێ لەو گەلانەش کوردبوو کە هەر لە یەکەم رۆژەوە کوردەکان بەشداری چالاکیەکانی ئەم رێکخراوەیان کرد، هەر لەو سەروبەندەشدا هەندێ کۆڕو کۆمەڵی کلتوری و سیاسی گەلانی غەیرە تورك و لەوانەش کورد پێکهاتن، بەڵام بەهاری بەڵێن و لاف و گەزافی ئازادیخوازانەو یەکسانیخوازانەی تۆرانیەکان هێندەی نەبرد بەرەو زەردی رۆیشت و هاوینی گەرمی چەوساندنەوەو نکوڵی لەبوون و مافی گەلانی غەیرە تورك دەستی پێکردو وردە وردە لە رووی راستەقینەیان هەڵماڵراو حەقیقەتی ئەو پرۆژەیان وەدەرکەوت کە دەیان ویست جێبەجێی بکەن.

ناسیونالیستە تورکە تۆرانیەکان بەحوکمی ماسۆنی بوون و عەلمانی بوون و ناسیونالیست بوونیان و لەرێی پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەتورککردنی گەلانی چوارچێوەی قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کەوتنە هەڵوەشاندنەوەی ئەو دوو پایە گرنگەی کە گروپە نەژادی و ئایینیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی بەیەکەوە بەستبۆوەو کەئەوانیش ئیسلام بوو سەبارەت بەگەلانی موسڵمان و عوسمانیەت بوو سەبارەت بەسەرجەم هاووڵاتیانی سایەو سنوری دەوڵەت.

دەبینین لە بەرنامەی ئەو حکومەتەی لە ساڵی (١٩١٣)دا پێکیان هێنا لە خاڵێکیدا هاتووە: "دەبێ تورك وەکو میللەتێکی جیاوازی تایبەت حسابی بۆ بکرێت و سەربەخۆ بێ و دووربێ لەرێبازی ئایینی ئیسلام".[١]

گەر سەیری خاڵەکانی‌تری ئەو بەرنامەیەش بکەین دەبینین سەرجەمیان لە دەوری بەرنامەیەکی ناسیونالیستانەی تورکی دەخولێنەوە، هەر ئەمەش بوو گەلان و نەتەوەکانی‌تری ناو ئیمپراتۆریەتی نائومێد و رەشبین کرد و بەشێکیان کەوتنە سەر ئەو کەلکەڵەی کە ئیتر ریفۆرم لەناو ئیمپراتۆریەتدا چارەسەری رەوشەکە ناکات و کەوتوونەتە بەردەم شاڵاوێکی رێکخراوی مەبەستگەرایانەی بەتورك کردن و تواندنەوەی نەتەوەیی و بنچینەکانی دەوڵەتیش بەتایبەت ئیسلامی بوون و عوسمانی بوون، بەکردەوە رۆخێنراون و گەر هەندێکیشیان لێ مابێت ناسیونالیستە تورکەکان دەیانەوێ بۆ چەواشەکردن بەکاری بێنن و خراپ سودیان لێ وەربگرن و لەژێر پەردەی ئەواندا سیاسەتێکی فراوانخوازانەو چاوچنۆکانە بەرامبەر گەلە دراوسێکانیان بەرێوەبەرن.

رووداني جەنگی جیهانی یەکەم و بەشداری سەرشێتانەی ئیتیحادیەکان لەو شەڕەدلو بەزینی دەوڵەتی عوسمانی لەشەڕەکەدا ناوچەکەی خستە بەردەم قۆناغێکی نوێوەو هاوکێشەو ساختمانە سیاسیەکەی لە ریشەوە گۆڕی، ساڵی (١٩٢٠) پەیمانی (سیڤەر) مۆرکراو لەو پەیمانەدا ئاماژە بە مافە مێژووییەکانی گەلی کورد کراو لە مادەکانیدا چەسپێنرا، بەڵام سەرهەڵدانی بزوتنەوەی بەرەنگاری نیشتمانی تورك بە سەرکردایەتی (مستەفا کەمال) بارەکەی بە جۆرێکی‌تر ئاراستە کردو گۆڕی.

---

[١] کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوەمی جیهانی، بەرگی یەکەم هەتا کۆتایی شەڕی یەکەم، نوسینی مامۆستا رەسول هاوار، ناوەندی چاپ و راگەیاندنی خاك/ ٢٠٠٠/ل (٤٥٣).

بەداخەوە کورد لەو قۆناغە ناسك و یەکلاکەرەوەی مێژووی خۆیدا جارێکیتر لەلایەن (مستەفا کەمال) و بزوتنەوەکەیەوە بەبەڵێن و وادەی درۆ فریوی خواردو وزەو تواناکانی خۆی خستە خزمەت ئەویزوتنەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی تورکیا، کەمالیەکان لە لایەکەوە بەخراپی و بۆقازانجی خۆیان سودیان لەکارتی ئایینی وەردەگرت بۆ جۆشدانی خەڵکەکەو بەهێزکردنی گیانی بەرەنگاری و بەرخۆدانیان لەلایەکیترەوە پەیمانیان دەدا بە کوردەکان کەدەوڵەتی نوێ کۆماری تورك و کورد دەبێ.

لە ساڵی (١٩٢٣)دا زلهێزانی جیهانخۆری ئەو کاتەو بەبەشداری نوێنەرانی (مستەفا کەمال) پەیمانی لۆزانیان مۆرکرد پەیمانی لۆزان سەرەتای عەمەلی دامەزراندنی کۆماری نوێی تورکی و فەرزکردنی عەلمانیەت و بێبەش کردنی کورد بوو لەمافە نەتەوەییەکانی، هەموو ئەو دەستکەوتانەی کورد لە پەیمانی سیڤەردا بەدەستی هێنابوو لە پەیمانی لۆزاندا نەك هەر ناوێکیان لێ نەمابوو، بەڵکو هێزە خۆرئاواییە عەلمانیە داگیرکەرو بەرژەوەندی پەرستەکان و دوژمنی گەلانی بارکەوتوو لەبەر خاتری بزوتنەوەی کەمالیزم وازیان لێهێناو فەرامۆشیان کردو بەمەش گەورەترین خیانەت و ناپاکیان لەگەڵ کوردو نیشتمانەکەی کردو دەرگای دۆزەخێکی دەیان ساڵەیان بەرووی کورددا خستە سەرپشت، هەروەکو چۆن سەرەتای ئاشکرا کردنی جەنگێکی هەمەلایەنەو بێئامان بوو دژی ئیسلام و هەموو سیمایەکی ژیانی تورکیا کە پەیوەندی بەئیسلامەوە هەبێت.

ئەویەشەی رێکەوتننامەکانی نێوان هاوپەیمانان و وەفدی کەمالی کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبوو بە رێکەوتننامەی کیرزن ناسراوە کە تیایدا چوار مەرجیان بەسەر تورکیادا سەپاند:

١) ئیلغاکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامی بەتەواوی لەتورکیا.

٢) تورکیا دەبێ هەموو پەیوەندییەك بە ئیسلامەوە بپچڕێنێ.

٣) دەبێ تورکیا لەکارخستن و ئیفلیجکردنی جوڵەی هەموو ئەو ئیسلامیانەی لە تورکیادا ماون دەستەبەر بکات.

٤) دەبێ دەستوری عوسمانی کە لەسەر ئیسلام بەندە بگۆڕێت بەدەستورێکی شارستانی رووت.[1]

(مستەفا کەمال) کە هەر خۆی ئامادەبوونی پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی لەم جۆرەی تیابوو بەهەموو هێز و توانایەوە کەوتە جێبەجێ کردنی ئەم داواکاریانە، بەڵکو لە سەرەڕێی جێبەجێ کردنیاندا گەیشتە ئاقارێ رەنگە خۆرئاواییەکان هەر بە بیریاندا نەهاتبێ.

(مستەفا کەمال) رایگەیاند: "ئێمە شەرێکمان ناوێت تیایدا بوترێ وتی و دەڵێن بەڵکوو شەرێکمان دەوێ وتمان و دەڵێینی تیابێت".[2]

بەجاڕدانی عەلمانیەت سەردەمێکی ستەمگەری ترسناك لە تورکیادا دەستی پێ کرد، ئەوەی پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبێت کەوتەپەیڕەوکردنی هەندێ رێ و شوێن لەوانەش:

---

[1] العلمانية نشاتها وتطورها واثارها في الحياة الاسلامية المعاصرة، دانراوی/ سفر بن عبدالرحمن الحوالي، دار السلفية للنشر والتوزيع/١٩٨٧/ص (٥٧).

[2] هەمان سەرچاوە/ ل (٥٧١).

١) قەدەغەکردنی هەر پۆشاکێ رەنگدانەوەی سیمای ئیسلامی بێت، وەك پۆشاکی زانایانی ئایینی و ئافرەتانی مسوڵمان و گۆڕینی بە شەپقەو پانتۆڵ و رواڵەتی‌تری خۆرئاوایی و بەزۆر سەپاندنی.

٢) لەسەرئاستی رۆشنبیری: گۆڕینی پیتی عەرەبی بەپیتی لاتینی، بۆ ئەوەی نەوەی نوێ لە کلتور و مەرجەعیەتی ئیسلامی بەتەواوی دابڕێ.

٣) لەسەر ئاستی سیاسی و ئایینی: ئیلغاکردنەوەی ئیسلام وەك دینی دەوڵەت و گۆڕینی بە ئایینە ئەورووپیە تازەکە (عەلمانیەت) هەروەها قەدەغەکردنی هەر چالاکیەك مۆرکی ئایینی پێوەبێت.[1]

سەرەڕای قەدەغەکردنی تەریقەتەکانی تەسەوف و داخستنی زۆر مزگەوت و بەڵکو گۆڕینی هەندێکیان بۆشتی ناشایستە بە پەیامی مزگەوت وەکو مزگەوتی ئەیا صۆفیا، هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی ئەوقاف و..هتد.

دەربارەی کوردیش هەر لە یەکەم رۆژەکانی دروستبوونی کۆمارەوەو لەدوای پەیمانی (لۆزان)ەوە رەوشی خاوێنکردنەوەی دەزگاکانی دەوڵەت لەکوردان دەستی پێکردو نوێنەرانی کورد لە پەرلەماندا هەموویان دستگیرکران و بەکارهێنانی وشەی (کوردو کوردستان) لە فەرهەنگی تورکیادا قەدەغە کرا نەخشەی عوسمانیەکان کە کوردستانی لەسەر نەخش کرابوو هەموویان گۆڕدران و کوردستان بەناوچەکانی رۆژهەڵات و خواروی رۆژهەڵات و کوردەکانیش بە تورکە کێویەکان ناوبران".[2]

---

[1] ترکیا الجمهوریة الحائرة/ د. محمد نورالدین/ الطبعة الاولی/ بیروت ١٩٩٨/ص٢٨.

[2] سی ساڵ خەبات و ولاتێکی وێران/ کرمانج گوندی/ ١٩٩٠ سوید، ل (٢٠).

زمان و فەرهەنگی کوردی قەدەغە راگەیانرلو مادەی ٢٧/٢٦ دەستوریش باس لەوە دەکات کە زمانە قەدەغەکان لە تورکیادا نابێ لەبواری بڵاوکردنەوەو راگەیاندندا کاریان پێ بکرێ و بەپێچەوانەوە هەرکەسێ بەکاریان بێنێ روبەڕووی لێپێچانەوەو سزای یاسایی دەبێت کە بەپلەی یەکەم مەبەست لەودوو ماددەیە زمانی کوردانە.

هەربۆیە بۆماوەی زیاتر لە (٦٥)ساڵ نەك هەموو جۆرە نوسین و بڵاوکردنەوەیەك بە زمانی کوردی لەو وڵاتە قەدەغە کراوە بەڵکو قسە کردن بەو زمانە لەشوێنە گشتییەکانیش کەوتۆتە بەرشتە یاساغ کراوەکان، بەڵکو کار گەیشتۆتە ئەوەی ئەم یاساغ بوونە تەنانەت فۆلکلۆرو هونەرو گۆرانی و مۆسیقای کوردیش بگرێتەوەو دەوڵەت بڵاوکردنەوەی چەند گۆرانیەك بە کوردی بە کارێکی نایاسایی بداتە قەڵەم و رێ لە بڵاوبوونەوەیان بگرێت عەلمانیەت لە تورکیادا لە رێی ئایدیۆلۆژیا ناسیونالیستە پان تورکیزمەکەیەوە هەر لە یەکەم رۆژەوە لە خەمی ئەوەدا بووە نەتەوەی مەزنی تورکی پێکبێنێ، پرۆژەی دروستکردنی نەتەوەو دەوڵەتی نەتەوەیی تورکیش هەر نیشتمانی تورکان و نەتەوەیی تورکی نەگرتۆتەوە بەڵکو بەکردەوە لە هەوڵی ئەوەدا بووە هەرچی گروپی نەژادی و نەتەوەییتر هەیە لەناو تورکیادا لەوانەش دووەم نەتەوەی گەورەی وڵات واتەکورد بەگوێرەی سیاسەتێکی هەمەلایەنەی پاکتاوی نەژادی لەبۆتەی نەتەوایەتی تورکیدا بتوێنێتەوە، مۆدێلە عەلمانیەتە سەرەرۆکە دانی بە هیچ جیاوازیەکی نەژادی و نەتەوەیی لەتورکیادا نەناوە، بەڵکو بەوە دەناسرێتەوە لە باسکردنی هەر جیاوازیەکی واقیعی لەو جۆرە ترساوە.

باسکردن له بوونی کورد و ناسنامەی نەتەوایەتی و فەرهەنگی و کلتوری کوردی با لەچوارچێوەیەکی زۆر تەسکیشدا بووبێ بەهەڕەشە بۆسەر یەکپارچەیی خاکی وڵات و سەروەری کۆماری تورکیا داناوە!

هەڵبەتە ئیمپریالیزمی رۆژئاواش بەیارمەتیدان یاخود بەبێ دەنگی هاوکاری ئەم سیاسەتە بووە، چونکە لەکاتێکدا کوردەکان بەگوێرەی رێکەوتننامەی سیڤەر چاوەڕێی دروستکردنی قەوارەی تایبەت بە خۆیان بون له پەیماننامەی لۆزاندا که سڕەرەوەی پەیماننامەی سیڤەر بوو نەك هەر ئەم خواستیان لەبەرچاو نەگیرابوو بەڵکو له پەیمانە تازەکەدا کورد تەنانەت بە کەمینەش دانەنرابوو، واتە تەنها گروپە ئایینیيە نامسوڵمانەکان بەکەمینە دانرابوون وەك کار کردنێ بەچەمکی کەمینە له فەرهەنگی رابردوی دەوڵەتی عوسمانیدا لەکاتێکدا دەوڵەتیعوسمانی سروشتێکی ناسیونالیستانەی نەبوو دانیشتوانی لەسەر بناغەی موسڵمان و نامسوڵمان پۆلێن دەکرد نەك ناسنامەی نەتەوەیی، وە رەوشەکە دوای دروست بوونی دەوڵەتی نوێی تورکیا بە تەواوەتی گۆڕابوو، ئیسلام و ناسنامەی ئیسلامی و ئایینی بەگشتی وەك پێوەر و سەرەتاو پرەنسیپ خرابووە دەرەوەی بازنەی بایەخی سیاسی و کارپێکردنەوە.

دەوڵەت لەسەر بناغەی ناسیۆنالیزم دامەزرابوو، هەر لەسەر بناغەی ئەم رێکەوتننامە و یاساکانی دەوڵەتە نوێیەکە کورد له فەرهەنگی دەسەڵاتە لائیکەکەی تورکیادا هیچ مانایەکی نەما، لەفەرهەنگی تورکە نەتەوە پەرستەکاندائەواندا شتێ له تورکیادا نەبووە بەناوی کوردەوە دیارە بەڵگە نەویستیشە کە لەو کاتەدا شتێ نیە بەناوی کێشەی کورد، گەر شۆڕش و خەباتیش هەبوو ئەوە کاری گێرەشێوێنانەی کۆمەڵێ بەکرێگیراوی بێگانەو تیرۆریستەو کێشەکەش کێشەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵە و چارەسەریش پەیوەندی

بە مافی کلتوری و سیاسی و مەدەنی گروپێکی نەتەوەییەوە نیە بەڵکو چارەسەرکە دەبێ ئەمنی بێت یاخود لە باشترین حاڵەتدا هەوڵدان بێت بۆ پەرەپێدانی ناوچەکە لەرووی ئابوری و سنوردانان بۆ بێکاری و هەژاری دانیشتوانەکەی کە دیارە چارەسەرەکان لەم ئاستەشدا زیاتر قسە بووەو ئەو بەشەی پێی دەوترێت کوردستان لەوڵاتی تورکیا لەچاو بەشە تورکەکەیدا لەهەموو رووەکانی ژیاری و شارستانیەوە دەڵێی وڵاتێکی جیاوازە، بەم جۆرە نکولیکردن لە بوون و ناسنامەی کورد بووە ستراتیژیەت و سیاسەتی نوخبە عەلمانیە نوێیەکەو بیروباوەڕێ کە سوپای تورکیاشی لەسەرپێ دەگەیەنرا، کە بەگوێرەی دەستور ئەرکی پاراستنی مۆرکی عەلمانیەتی کۆماری لەئەستۆدایە.

بەرپرسە تورکەکان لەبۆنەی جۆراوجۆرەکانداو بەشێوەی جیاوازو راشکاوانەو بێپەردە ئەو مەسەلانەیان دەربڕیوەو لەبەرچاوی رای گشتی دنیاو ناوچەکەدا بێپەردە گوزارشتیان لەناوەرۆکی بیروباوەڕە نوێیەکەیان داوەتەوە.

ئەتاتورک خۆی لە سەرەتاوە رایگەیاند: "لە تورکیادا جگە لە نەتەوەی تورک هیچ کەمایەتیەکی دیکەبوونی نییەو هەمووان دەبێ لە خزمەتی نیشتمانی گەورەی تورکدا بن، ئەو کوردانەی لەتورکیادا نیشتەجێن بەزمانی کوردی دەپەیڤن وەك تورك وان، ئێمەی تورکیش هەمیشە ئەوان بە بەشێك لەخۆمان دەزانین"[١].

وەزیری عەدل (محەمەد عیزەت) لە بەردەم دەنگدەرانیدا بەراشکاوانە وتبووی: "تورك تاكە خاوەن و گەورەیە لەم وڵاتەدا، ئەو تورکانەش کەلەرووی رەچەڵەکەوە

---

[١] کوردستانی نوێ/١٩/١١/١٩٩٨ ـ ژ (١٧٤٥).

تورکی ساغ نین تاکە یەك مافیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە ببنە خزمەتکارو کۆیلە، بادۆست و دوژمن ئەم راستیەیان لەبیربێ و چیاکانیش بیزانن"[1]

کەدیارە مەبەستی لە تورکە رەچەڵەك پۆخەڵەکان کوردەکانە کە لە فەرهەنگی کەمالیزمدا بەتورکە کێویەکان ناسراون و ناودەبرێن، واتە کورد بۆی نەبووە بڵێ کوردم و ئەو وتنە تاوانە بووەو زۆرجار بۆتە هۆی لێسەندنەوەی نەك زۆربەی مافە سیاسی و مەدەنیەکان بەڵکو وەك هاووڵاتیەکی ئاسایی مافی ژیانیشی لێ سەنراوەتەوە.

کاتێ بەزۆریش دەکرێ بەتورك لەم حاڵەتەشدا ناتوانێ ببێت بەتورکێکی ئاسایی و ساغ بەڵکو وەك تورکێکی ئاغەڵ و لاکەوتەو ناساغ سەیری دەکرێ و دەبێ کاری خزمەتکاری تورکە رەچەڵەك ساغ و وەچاخزادەکان بێت.

(عیسمەت ئینونو)ی سەرۆك وەزیران کە رۆژێك لەمەڕ برایەتی تورك و کورد دەخافت، لەهەیڤاژ وتی (١٩٣٠)دا لە (سیواس) لەئاهەنگی کردنەوەی هێڵی شەمەندەفەردا گوتی: لەم وڵاتەدا تەنێ نەتەوەی تورك بواری هەیە داوای مافە نەتەوایەتی و نەژادیەکانی بکا، هیچ کەسێکی دی ئەو مافانەی نییە.[2]

ساڵی (١٩٧١)یش (یتماد امیر)ی سەرۆك وەزیران دەڵێ: "ئێمە جگە لە نەتەوەی تورك، هیچ نەتەوەیەکی دی لە تورکیادا نابینین ئەوانەی لە تورکیادا دەژین، هەموویان تورکن کورد لە تورکیادا نیە".[3]

---

[1] رۆژنامەی الاتحاد ژ (١٥٨)، ١٨/١١/١٩٩٥.

[2] سی ساڵ خەبات ـ ل (٢٠).

[3] هەمان سەرچاوە.

تەنانەت کار گەیشتە قەدەغەکردنی جل و بەرگی کوردیش لە شۆڕشەکەی (١٩٢٥)دا نوێنەری ئەنجومەنی نەتەوەو روناکبیرانی کورد (حسن خیری)یان لەداردا (علی صائب)ی سەرۆکی دادگا ئەم تۆمەتەی دابووە پاڵ کە دەڵێ: "ئێوە بە جلی کوردییەوە دێنە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەن لە ئەنقەرە بەمەش بانگەشەی کوردایەتیتان بڵاوکردۆتەوە".[1]

بەم جۆرە (کوردەکان ئەگەر سەردەمێ لە فەرهەنگی تورکیادا نەتەوەیەکی خاوەن کولتورو مێژووی نێو ئیمپراتۆریەتی ئالی عوسمان بوون، ئەوا ئەوڕۆ لەدیدی شۆڤێنیزمی تورکدا کۆمەڵە خەڵکێکی دواکەوتوون بێزمان و بێشمەکن و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە شوێنە گشتییەکاندا بەسوکایەتی کردن بە شەرەفی تورك لە قەڵەم دەدەن".[2]

کورد لە بەرامبەر وەها سیاسەتێکی رەگەزپەرستانەدا بێدەنگ نەبوو یەکەم کاردانەوەش شۆڕشە ئیسلامییە میللییە مەزنەکەی (١٩٢٥) بوو بە رێبەرایەتی شەهید شێخ سەعیدی پیران کە گیانی ئیسلامخوازی و نەتەوایەتی کوردی تێکەڵ بەیەك بوون و شۆڕشگێڕان هەوڵیاندا کۆمارێکی ئیسلامی سەربەخۆی کوردان دروست بکەن.

سیاسەتی دژی ئیسلامیانەو دژە کوردیانەی وڵاتانی خۆرئاواو دەسەڵاتە عەلمانیەکەی تورکیا بە هاوکاری یەك و لەرێی گەلە کۆمەکیەوە ئەم شۆڕشەیان سەرکوت کرد، لەم سەرکوتەدا روسەکان و فەرەنسیەکان و ئیتالیەکان و بەریتانیەکانیش بەشێوەیەك لەشێوەکان بەشداربوون، لەفەرهەنگی کۆمۆنیستە بەلشەویەکان و

[1] الاتحاد/٣ حوزەیرانی (١٩٩٥) ـ (١٣٤).

[2] سی ساڵ خەبات ـ ل (٢٣).

کەمالیەکانیشدا شۆڕشەکە بەکۆنەپەرست لەقەڵەمدرا بەتۆمەتی ئەوەی لایەنگرانی ڕژێمی خەلافەت و هەندێ کەسایەتی کۆنەپەرست هەڵیانگیرساندووە.

هەڵبەتە مێژووی نوێ و هاوچەرخی تورکیا گۆیای ئەوەیە کە چارەنووسی ئیسلام و کورد بە شێوەیەکی بنەڕەتی بەیەکەوە بەستراونەتەوە، چونکە ڕژێمە تازەکەو دیموکراسیە هاوچەرخەکەشی بێئیسلام و بێکورد بووە، بۆیە دەبینین پەیمانی لۆزان کە عەلمانیەتی فەرز کرد هەر ئەویش بوو کوردی وەك کەمایەتیش نەهێشت و نکوڵی لەبوونی کرد، کە بەرگی ئیسلامی قەدەغە دەکرێت بەرگی کوردیش قەدەغە دەکرێت، کە هەوڵی لەریشە دەرکێشانی ئیسلام دەدرێ هەوڵی تواندنەوەی کوردیش دەدرێ، بە شێوەیەکی گشتیش هەرکرانەوەیەك بەرووی یەکێکیاندا کرانەوەیە بەروی ئەوانیتردا.

شۆڕشی کورد دوای تێکشانی (١٩٢٥) لەداردانی سەرکردەکانیشی بەردەوامبوو.

جارێکیتریش بەرەنگاری چەکداری لە سەرەتای هەشتاکانەوە بەشێوەیەکی خوێناوی دەستی پێکردەوە.

(د. یوسف القرضاوي) لەبارەی شۆڕشی کوردستانی تورکیاوە دەڵێ: "لەو کارەساتانەی عەلمانیەتی تورکی بەسەر تورکیایدا هێناوە، شۆڕشی کوردەکانە، کە زیانێکی زۆر و زەبەندی مادی و ئەدەبی بەو وڵاتە گەیاندوە، دەیان ملیار دۆلار، دەیان هەزار قوربانی، هەوڵ و کات و شارەزایی، کە دەکرا هەموو ئەمانە بخرێنە خزمەت بیناکردن و بوژانەوەی وڵات، بەڵام هەمووی تەرخانکرا بۆ راوەدونانی شۆڕشگێڕان و بەرەنگاربوونەوەی یاخی بوەکان.

ئەم شۆڕشە کوردیەش کە چەکی هەڵگرتوەو هێز بەکار دەهێنێ شتێکی ناسروشتی نەبووە، بەڵکو شتێ بووە لۆژیکی واقیع سەپاندویەتی، هەروەها ئەولۆژیکە عەلمانیەی لەئارادا بووە.

کاتێ تورکیا بەگوێرەی خەلافەتی ئیسلامی حوکمی دەکردو لەژێر سایەی ئیسلامدا بوو، ئیسلام هەموو توخم و رەگەزەکانی لەئامێز دەگرت، سا تورك بوایە یان کورد یاخود عەرەب، برایەتی ئیمانی کۆی دەکردنەوە (انما المؤمنون اخوة).

دیارە زیاتر لەسەرەتای دەوڵەتەکە تا کۆتایی سەدەی (١٨) کاتێ خیلافەت ئیلغاکرایەوەو لەگەڵیا ئیسلام وەك کۆکەرەوەو گرێدەری رەگەزەکانی نەتەوە ئیلغا کرایەوەو تورکەکان دەوڵەتێکی تورکی تۆرانیان دروستکردو بەناویانەوە حوکم دەکات و زمان و فەرهەنگیان دەپارێزێ و گۆرانی بەسەروەریەکانی رابردوویاندا دەڵێ.

ئەوکاتە مافی کوردەکانیشە کەئەوانیش خەون بە دەوڵەتێکەوە ببینن هەموو پارچەکانیان کۆکاتەوەو ناوی ئەوان هەڵگرێ و زمان و کلتورو فەرهەنگیان ببوژێنێتەوە، هیچ رەگەزێ لە رەگەزێکیتر بەڕێزتر نیە، هەروەها هیچ نەتەوەیەکیش لە نەتەوەیەکیتر بەڕێزتر نیە، ئەمە هەمان شتیشە کەکوردەکانی عێراق بانگەشەیان بۆکرد کاتێ کە بانگەشە نەتەوایەتیەکە عەرەبی دابڕاو لە ئیسلام کرا، لەبەرئەوە شتێکی سەیر نەبوو ئەمانیش بانگەشە بۆ نەتەوایەتی کوردی بکەن".[1]

[1] التطرف العلماني في مواجه الاسلام/ الدكتور يوسف القرضاوي، الاندلسية للنشر والتوزيع، ٢٠٠٠، صص١٣٢ ـ ١٣٣.

کوردایەتیش لە بەرەورووبوونەوەی دیکتاتۆریەت کە دەسەڵاتە عەلمانیەکە دروستی کردووە خۆمان ئاگامان لێیەو لەبەرچاومانە چۆن بەشێکی بەرچاوی ئاوەدانی وڵاتەکەی کاول و وێران بووە ملیۆنیان راگوێزراون یاخود ناچاربوون شوێنی نیشتەجێی خۆیان چۆڵ بکەن و جاری وا هەبووە بۆپەیداکردنی پاروە نانێك و ژیانێکی نەمری و نەژی رویان کردۆتە شارە گەورەکان یاخود سەری خۆیان هەڵگرتوەو رویان لە هەندەران و وڵاتانی دنیا کردووە.

سەرەڕای دواکەوتوویەکی ماددی و فەرهەنگی و زانستی ئاشکرا کە بەگوێرەی نەخشەیەکی جیاکارانەی بەرچاو تەنگانە ناوچەکانیان بەدەستەوە دەناڵێنن، ئەمەش بە شێوەیەکی بنەڕەتی بەرەنجامی ئەو ئایدیۆلۆژیا عەلمانیە ناسیونالیستە بوو کە کەمال ئەتاتورك و هاوبیرانی بەزەبری هێز و بەزۆر بەسەر خەڵکیاندا سەپاند.

دیارە عەلمانیەت و ناسیۆنالیزم بەناوەرۆکە ئەورووپیەکەی بەتایبەتی ئەورووپای سەدەی نۆزدە و قۆناغی گەشەسەندووی فراوانخوازی و داگیرکردنی گەلان و کۆلۆنیالیزم بەیەکەوە گرێدراون، پرۆسەی ناسیۆنالیزمیش لەوساتە مێژووییانەدا لە ناوەرۆکدا کاری دروستکردنی کۆمەڵگاو وەك یەککردنی شەبەنگەکانی بوو، بەڵکو لە ساتەوەختی سەرەڕۆیی خۆیدا شکۆو گەورەیی خۆی لە تیابردن و بەنەفرین کردنی گەلانیتردا دەبینێتەوە هەر ئەم ناسیۆنالیزمە بوو، نازیزم و فاشیزم و کۆلۆنیالیزمی لێکەوتەوە، کەمالییەکان وەك زۆربەی سەرکردەکانی دوای قۆناغی رزگاری لە ئیستیعماری راستەوخۆ لە وڵاتانی ئیسلامیدا خاوەنی رۆشنبیریەکی سەربەخۆو خۆماڵی نەبوون، ئەو رۆشنبیریە سیاسیەی هەیانبوو پچڕ پچڕو لە دەرەوەی کۆمەڵگاکەی خۆیانەوە وەریان گرتبوو، هەربۆیە نەیانتوانی لەچوارچێوەی واقیعی کۆمەڵگاکەیاندا بیربکەنەوە بەڵکو لە

چوارچێوەی هەندێ چەمك و رۆشنبیریەکیتردا بیریان دەکردەوە و رەفتار و ئاراستەی سیاسان دادەڕشت و رەوتی فکری و ئایدیۆلۆژیان دیاری دەکرد.

(مستەفا کەمال) خۆی لەسەردەمی کۆماری سێیەمدا لە لوتکەی ململانێی توندی نێوان دامەزراوی کڵێساو دەوڵەتدا لە فەرەنسا ژیابوو، کەوتبوە ژێر ئەو ئەزموونەوە.

کاتێك لەجەنگی میللیشدا سەرکەوت و کۆماری نوێی تورکیای دامەزراند ویستی ئەو ئەزموونە وەکو خۆی بگوێزێتەوە بۆ تورکیاو گۆڕانێکی هەمە لایەنە بەسەر سەرجەم بوارەکانی ژیانی فەردی و کۆمەلایەتیدا بێنێ و دابڕانێ لەنێوان نەوەی نوێ و مێژوو مەرجەعیەتی فکری و ژیاری رابردووی نەتەوەی تورکدا دروست بکات.

تاکو ئەو نەوە نوێیە باوەڕ بەوە بێنێت، تاکە رێگای گەیشتن بەهێزو شارستانیەت و پێشکەوتن شوێنکەوتن و لاساییکردنەوەی بست بە بست و هەمەلایەنە و کوێرانەی خۆرئاوا و خۆدارنینە لەفکر و فەرهەنگ و ژیاری ئیسلامی، دیارە گواستنەوەی ئەزمونێکی لەم جۆرە بۆ ولاتێکی وەکو تورکیا کەلە رووی مێژوویی و مەرجەعیەتی فکری و ژیاریەوە بەتەواوەتی لەفەرنسا جیاواز بوو کاردانەوەو مشتومڕی گەورەی لێکەوتەوە، سروشتیشە کە ئەم عەلمانیەتە زۆر توندڕەو دەرچێ و لەرووی عەقڵی رۆشنبیریشەوە جێگای مەترسی بێ و هەمیشەش لەبەر هەڕەشەدا بێت، چونکە هەرگیز نەیتوانیوە هەموو رەهەندەکانی کۆمەڵگای مەدەنی تورکی لەبەرچاو بگرێت.

بەتایبەتی رەهەندی ئایینی کە رەگ و ریشەیەکی قوڵی لەناو کۆمەڵگادا هەیە، هاوکات فرەنەژادی و مەزهەبی کۆمەڵگای تورکی رەچاو ناکات، بەڵکو بەجۆرێ رەفتار دەکات کە تەواوی ئەم شتانە لەئارادانەبن یەکەو راست پشتگوێیان دەخات بەم جۆرەش

عەلمانیەتەکە تاك رەهەندانە دەمێنێتەوە چاوکوێریش دەبێت لەئاستی گیروگرفتە واقیعی و حەقیقەتەکانی کۆمەڵی تورکیدا لەبەرئەوە دەبینین ئایدیۆلۆژیا عیرقی و ئایینی و مەزهەبیەکان سەریان هەڵداوەتەوە دوای ئەوەی (کەمال ئەتاتورك) پێی وابوو هەر بە خواستی بەعەلمانیکردن و سەپاندنی بە زەبری هێز بۆ یەکجاری ئەو شتانە لەناو دەبات و نایان هێڵێت، ئەمەش لەسەرەوە بۆ خوارەوە لەدەرەوە نەك لەناوخۆدا.[1]

لە رووی نەتەوەییەوە هەر ئەم چاوکوێرەی عەلمانیەتە لەو وڵاتەدا کە دەیان ساڵە کاربەدەستانی ئەو وڵاتە نکوڵی لەبوونی گەلێکی (١٥) ملیۆنی وەکو کورد دەکەن و کەسێکی وەکو (جەمال گورگیل) کە لەدوای کودەتاکەی ساڵی (١٩٦٠)دابوو بەسەرۆك کۆماری تورکیا دەڵێ: "خەڵکێکی ئاوهایی کە خاوەنی کەسێتیەکی تایبەتی بێ و پێی بگوترێ کورد هەر لەدنیادا نیە"[2] لێرەوە ئەو وتەیە بەتەواوەتی راستە کە دەڵێ: "ئەتاتورك وا لە عەلمانیەت تێگەیشتبوو کە بریتییە لە رەگدەرکێشانی ئایین لە کۆمەڵگادا، هەروەها وا لە ناسیۆنالیزم و نەتەوایەتیش تێگەیشتبوو کە بریتیە لە نکولی کردن لە گروپە نەژادیەکانی غەیری تورك".[3]

دیارە چەوساندنەوەی گەلێکی وەکو کورد یاخود زۆربەی هەرە زۆری چەوساندنەوەیەکی دووسەرە دەبێت لەلایەکەوە وەکو کوردێ نکولی لەبوون و ناسنامەی نەتەوەیی دەکرێت و سیاسەتی پاکتاوکردنی رەگەزی لەگەڵدا پەیڕەو دەکرێ و دووچاری چەندان مەینەتی و چەرمەسەری دێت لەم پێناوەدا، لەلایەکیتریشەوە وەکو

---

[1] بڕوانە گەل، ئاین، دەوڵەت، گفتوگۆیەك لەگەڵ (محمد ئەرەکۆندا)، و: شوان احمد، گۆڤاری (مەدەنیەت) ژ (٥-٦) تشرینی دوەم - کانونی یەکەم ٢٠٠٠، ل (١٠٥).

[2] سی ساڵ خەبات لە (٢١).

[3] ترکیا الجمهوریة الحائرة، ل (٢١).

موسڵمانێ وەك هەر موسڵمانێکیتری ئەو وڵاتە دژایەتی ئاین و فەرهەنگە ئیسلامیەکەی دەکرێت و بەزۆر شێوازێکی ژیانی دیاریکراوی نائیسلامی بەسەردا دەسەپێنرێ و ئازادی ئایینی زەوت دەکرێت، ئێستاشی پێوە بێت عەلمانیەت نەلەتورکیاو نەلەهیچ یەکێ لەو وڵاتانەی کوردی تێدا دەژی خزمەت بە کورد و کێشەکەی و کەمکردنەوەی باری گرانی مەینەتی و کوێرەوەریەکانی ناکات چونکە لە روویەکەوە عەلمانیەتەکە دەبێت بەئایینی نەتەوەو نەتەوایەتی باڵادەست و لەسەرە رێی سەرکوتکردنی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردیشدا سڵ لە گرتنە پێشی بێئەخلاقترین شێوازەکانی سەرکوت و تۆقاندن و خوێنرێژی ناکاتەوە مێژووی دەیان ساڵی رابردووش باشترین شایەتە.

لە لایەکیترەوە عەلمانیەت ئەو جۆرەی تائێستا لە رۆژهەڵات بانگەشەی بۆکراوە. پرۆژەی نوخبەیەکە و هەڵقوڵاوی ناو ناخی جەماوەرو کۆمەڵگا مسوڵماننشینەکان نیە لەبەرئەوە تاکو ئێستا هەروەك لەتورکیاو عێراق و سوریاو ئێرانی شاهەنشایی و زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانیتر وەدەرکەوتووە دەبێ دەوڵەت بە زەبری هێز بیسەپێنێ و رژێمێکی شێوە تۆتالیتاری دروست دەکات، دیارە کە رژێمێکیش ئەوە خەسڵەت و سروشتی کارکردن و میکانیزمی کۆنترۆڵکردنی بێت بەشی کوردیش جگە لە بێبەشی و چەوساندنەوەو ئازارو کەوتنەبەر هەرەشە هیچیتر نابێت.

حەز دەکەم ئەم نوسینە بەوتەیەکی بیرمەندی گەورەی عەرەب (د. بورهان غلیون) مامۆستا لە زانکۆی سوربۆن کۆتایی پێبێنم کە دەڵێ: "عەلمانیەت هەرگیز سەرچاوەیەك نەبووە بۆبەهاکان، واتای قوڵبوونەوەی بەها ئینسانیەکان و یەکسانی نێوان مرۆڤەکانیشی نەگەیاندووە، وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەیەوێت خۆی پێوە دەرخات،

عەلمانیەکان هیچ خراپەیەکیان لەوەدا نەبینیوەتەوە کە کۆلۆنیالی گەلان بکەن و بازرگانی بەکۆیلەوە بکەن و خێرو بێری وڵاتان بەتاڵان بەرن و تەنانەت گەلانیش قڕکەن هەروەك هیندییە سورەکانی ئەمریکا".[١]

ئەگەر دکتۆر غلیۆن روبەڕووی عەلمانیەتی خۆرئاوا وابڵێ، ئەگەر لە شوێنانیش ئەم وتەیە جارێ راستبووبێ ئەوا بەدرێژایی سەدەی بیستەم سەبارەت بەئێمەی کورد بەردەوام راستبووە.[٢]

---

[١] نقد السياسة، الدولة والدين، د. برهان غليون، ط١٩٩٣/٢.

[٢] *** لە گۆڤاری (پەیامی راستی) ژمارە (٦٠) ئەیلولی ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە.

**هەڵەبجە و ناسیۆنالیزمی کوردی لەدۆزەخی ئایدۆلۆژیادا**

**لە بەعسیزمەوە تا عەلمانیەت و ئیسلامیی بە ئایدیۆلۆژیاکراوی کوردی**

رەنگە لەسەرەتادا وابێتە پێشچاو کە قسەکردن دەربارەی پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆژیا و شارێك لە پێگەی لۆژیکی پێویست بەهرەمەند نییە، بەڵام کاتێ ئایدیۆلۆژیا لەکاتی وردکردنەوەیدا بۆ هەڵوێستی سیاسی و لایەنگری گروپی و بڕیاری سەربازی و ئامرازێکی پۆلێنکردن و ناسینەوە پێناسە دەکەین، نەك تەنها لەئاستە تیۆرییە رووتەکەدا، ئەوکاتە تێدەگەین و روندەبێتەوە کە بەڵێ باسکردن لەپەیوەندییەکی لەم جۆرە تا رادەیەکی بەرچاو لەشوێنی خۆیدایەو پاساوی لۆژیکی هەیەو پێدراوە مەیدانیەکانیش رەوایەتی پێ دەدەن، هەڵبەت وەك خۆی پێ نادات کە بەدرێژی لەسەر ئەم پرسە بوەستین کەلەوکاتەشدا مەسەلەکە سنوری هەڵەبجە دەبڕێ و شۆڕ دەبێتەوە بۆ ناو قووڵایی مێژوویی کارەساتباری نویی کۆمەڵگای عێراقی و گەلی کوردستان و ئەو قەیرانە سیاسی و ئابوری و روحیانەی سیمایان بەو مێژووە بەخشیوە، بەڵام رەنگە هەر خودی هەڵوێستەکردن و لەسەر راوەستانەکە وەك ئاوڕدانەوەیەکی خێرای عەقڵی کوردی بێسوود نەبێ.

**هەڵەبجە شاری بەدوژمنکراوی ئایدیۆلۆژیای بەعسیزم**

لێرەدا دەمەوێ مەسەلەی هەڵەبجەو ئەو تراژیدیایەی بەسەر ئەم شارەدا هات ببەستمەوە بە ئایدیۆلۆژیا تۆقێنەرە سۆسیال ناسیونالیستەکەی بەعسەوە، بەعسی

عێراقی وەك پسپۆرانی بواری زانستە سیاسیەکان لەئاستی تیۆری و خەڵکە گشتییەکە لەسەر ئاستی هەستپێکردنی رۆژانەو مەیدانی دەیزانن، هەڵگری یەکێك لە ترسناکترین ئایدیۆلۆژیاکانی نەك هەر مێژووی نوێی عێراق، بەڵکو مێژووی سەرجەم خۆرهەڵاتی ناوەراست بوو، بەگوێرەی میکانیزمەکانی دەزگا ئایدیۆلۆژیا پێناسەکەرو پۆلێن کەرەکەی بەعس هەڵەبجە لەسێ بازنەی بەدوژمن کراوو گومان لێکرودا بوو بەسیفەتی هەرسێکیشیان وەك سەرزەمینێکی یاخی دەردەکەوت و دەبوایە سزابدرێت.

یەکەم بەسیفەتی ئەوەی شارێکە لە کوردستانداو دانیشتوانەکەی کوردن، دووەم لەبەر ئەوەی شارێکە بەهۆی پێشینە ئایدیۆلۆژیە چەپی و ئیسلامی و نەتەوایەتیەکەی بەپێوەرە بەعسیەکان ملکەچی پرۆسەی بەعساندن نەبووەو بەعس لەوێدا تارادەیەکی بەرچاو تۆوێکی پوچ بووە.

سێیەمیش لەساتەوەختی داگیرکردنیەوە لەلایەن هێزە سەربازیەکانی ئێرانەوە وەهاوکاریکردنی هێزە کوردیەکان لەو رووەوە ئەوشارەی خستە دەرەوەی ئەو ئاستە نزمە بێ‌نرخەش لەحەسانەو ماف کەشارێك لەسایەی دەسەڵاتەکەی بەعسدا هەیبوو، لەو ساتەدا هەڵەبجە بوو بەشارێکی چەند جار بەدوژمن کراو، بوو بە لوتکەی چڕبوونەوەی رەمزی دژایەتی کردنی بەعس و ئایدیۆلۆژیاو خەون و دەسەڵاتەکەی، هەربۆیە بەعسیش ئەمجارە بیری لە سزادانێ کردەوە کەلەئاستی قەوارەی ئەو لافاوە لەبارگاوی کردنە بەهەستی دوژمنایەتی و رقی بەدەزگایی کراوی ئەوبێ بەرامبەر ئەو شارە و دانیشتوانەکەی.

رقی بەعس بەزیندەبەچاڵکردن و ئەشکەنجەدانی سەدان کەس لە دانیشتوانی ئەوشارە لەساڵی (١٩٧٨)داو لەداردان و بێسەرو شوێنکردنی ژمارەیەکی دیاریکراوی رۆڵەکانی دانەمرکایەوەو قایل نەبوو بۆ ئەوەی لەم رێگایەوە چاوترسێنی بەشەکەیتری شارنشینان و دانیشتوانی دەورووبەری بکات و ملیان پێ کەچ کات بۆ خواستەکان دەسەڵات و پرۆسەی بەبەعس کردن و کوشتنی هەرچی پێی دەڵێی غیرەت و جوامێری و ئەخلاق و سەربەرزکردنەوەیە.

بەعسی عێراق لەم ململانێیەدا لەگەڵ ئەم شارەدا هەر لەبۆردومانی وەحشیانەی (١٩٧٤)ەوە تازیندەبەچاڵکردنی بەشی لە راپەریوانی ساڵی ١٩٨٧ و چەندین عەڵقەیتر گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە پۆلێن کردن لەناو دیوارەکانی شارداو دابەشکردنی خەڵکەکەی بۆلایەنگرانی بەعس و دوژمنان و بێلایەنێکی گومان لێکراو لەوە بەدوا کارێکی بێهودەیە، بۆیە دەبێ لەسەر ئاستی شار بەتێکڕای دانیشتوانەکەیەوە بێگوێدانە جیاوازییە ئایدۆلۆژی و سیاسی و کۆمەلایەتی و خێلەکیەکان ئەم شارە ببێ بەرەمزی خیانەت و دوژمنایەتی و هەڵگەڕانەوەو یاخی بوون، ئەمەش دەخوازێت سزایەکی ناوێزە (استثنائي) بدرێت، بۆ ئەمەش گەر هەڵەبجە بەکاتی لەژێر کۆنترۆڵی دەسەلاتی بەعس چۆتە دەرێ و دەشێ لەداهاتوودا بگەڕێتەوە سەرەوە.

هەڵەبجەییەکان وەك بەشێ لەگەڵی عێراق و کوردستان نەمێننەوە و دواتر شار بەبێ دانیشتوانەکەیەوە ملکەچ کاتەوە. بۆ ئەوەی بۆ هەموو لایەك بخرێتە روو کەلای بەعس هەربەشێ لەدانیشتوان توانای خۆمۆبایلیزەکردنیان نەبێت لەگەڵ نمونە بەعسیەکەداو نەبن بەبەشێ لەو کوتلە بەشەریە دەستەمۆکراوەی دەسەلاتی بەعسیزم و خواستی

ڕێبەرەکەی دەیخوازێت هەموو ڕەوایەتیەکی بون و مانەوەیان لێ وەردەگیرێتەوەو لەهەر ساتێکدا و بەهەرشێواز و میکانیزمێك کەبەعس و دام و دەزگاکانی و سەرکردەکەی بیانەوێت دەخرێنە دەرەوەی سنورەکانی هەرێمی ئاسایش و ژیان و پارێزراوی.

کاتێ هەڵەبجە قەدەری جوگرافیاو پەرەسەندنی دراماتیکی گۆڕانکاریی سیاسی و سەربازییەکان بەکاتیی لەژێر ڕکێفی بەعس دەردێ و دەبێ بەشارێکی داگیرکراو ئیتر لەوێوە ئەو دەرفەتە زێڕینە دەکەوێتە دەست کاربەدەستانی ئەم هێزە ئایدیۆلۆیستە تاریك بینە بۆ ئەوەی نەك هەر حەزی کوشتن و خوێنڕێژی و وێرانی لەدەروون و قووڵایی ناخی سەرکردەو فەرماندە بەعسیەکاندا بگەیەنێتە لوتکەو بەمەش ئەفسانەگەلێکی وەك زوحاك و داستانی مارەکانی سەرشانی و مێشکی کوڕە گەنجەکان بکەن بە واقیعێکی بەرجەستە لەبەرگی مۆدێرنەیەکی دۆزەخیدا، بەڵکو ویستیشیان کوردو گەلی کوردستان لە هەڵەبجەدا بکوژن، چونکە کوشتنی مەعنەوی چییە جگە لەڕوخاندنی ورەو رەشبینکردن و تێکشکاندنی ئیرادەو بڕیاردانی چۆکدادان و خۆبەدەستەوەدانی تاکێك یاخود گروپ و نەتەوەیەك؟ بەعس دەیویست لە هەڵەبجەدا دوایەمین خەنجەری ژەهراوی خۆی لە جەستەی کوردستان و گەلەکەی بووەشێنێ.. ئێمە گەر پێمان وابێ دەسەڵاتی بەعس تەنها ویستویەتی چەند هەزار کەسێ لەهەڵەبجەدا بکوژێ بەهەڵەداچووین، چونکە بۆ ئەو هەموو ژن و منداڵ و پیرێکی ئەو شارە لەپاڵ لاوو کوڕەکانیدا جەستەیەکی چەپەڵی خۆبەدەستەوەدان و خیانەتن، پاکێتی گەلی عێراق و ئاسوودەیی ویژدانی سەرۆك و هارمۆنیەتی گەل و کۆماریش وادەخوازن کە ئەو جەستانە هەرچی زووتر بخرێنە ژێر گڵ و یاخود بەکوشتنی ئەوان بەشێوەیەکی دڵڕەقانەو وەحشیگەریانەو نائاسایی ئەو خاك و سەرزەمینەش بەنەفرەت بکرێت کە باوەشی بۆ ئەوان کردۆتەوە،

ئەو هەوایە ئالودە بکرێت ئەوان هەڵیان مژیوە، ئەو خانوانە دەبێ تێك بڕمێن کەلانەی پیلانگێڕان و ئامێزی خەونی قاچاخ و بیرکردنەوەی ناپاکانە بوون.

تینوێتی بەعس بۆتۆڵە لەم شارەو لەگەلی کوردستان گەیشتبووە ئاستێ لەدڕندەیی و ژینۆسایدی و پاکتاوی نەژادی کە دەیانەویست تەنها بەوەندە واز نەهێنن کە شار بکەنە شاری خامۆشان و خانوویەرەکانی بەسەریەکدا بڕمێنن و بیکەن بەبەشێ لە کەلاوەکانی مێژوویەکی تاوانبار، هەر بەوەندە دانە سەکنان کە لەساتەوەختێکی دیاریکراودا ژیان لەوشارەدا سوك کەن و بێحورمەتی بەمرۆڤ و هەموو هەستێکی بەرزی ئینسانی بکەن، یاخود منداڵە بەریئەکان بەخوێناوی دایکەکانیان بخنکێنن، یاخود کانی عاشقان بکەن بەکانی مەرگستان ئەوان لەژێر کاریگەری خەیاڵگەیەك کە ئایدۆیۆلۆژیا ناسیونالیستە رەگەزپەرستەکەیان بۆی دروست کردبوون و، لەبەرتیشکی بیرکردنەوە پەرگیرەکەیانداو ویژدانە بیمارەکەیان نەیاندەویست ژیان تەنها لەئێستای شاردا بکوژن، چراکانی ئومێدو باوەشکردن بەژیاندا تەنها لەبڕگەیەکی مێژوویدا بکوژێننەوەو شار نوقمی دەریایەك لەتاریکی و خوێن و پیلان بکەن، بەڵکو دەشیان ویست هەموو ئەگەرێ بۆ گەڕانەوەی ژیان و ئاوەدانی بۆ ئەو بەشە لەجەستەی کوردستان لەبار بەرن، ژیان لەئایندەشدا تیرۆر بکەن، ئەوگازە ژەهراویانەی بەسەردانیشتوانی شاریشدا بارێندرا مەبەست تیایدا هەر ئەوەنەبوو، کە دانیشتوانی شاروگوندەکانی دەورووبەری بکات بە هەواڵی لەرابردووداو لەڕێی ژەهراویکردنی جەستەیان و ئالوودەکردنی هەوای ناوچەکەوە لەرووی فیزیکییەوە بیانکوژێ، راستە ئەمەش مەبەست بوو، بۆ ئەوەی هەموو ئەو شوێنانەیتر بەبیریاندا دێت ڕێگا بۆ هێزە ئێرانیەکان خۆش بکەن، یاخود لەمیانەی بەشداری لەچالاکی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە دەیانەوێت لەدەرەوەی سنورە

ڕێگاپێدراوەکانی بەعسەوە هەناسە بدەن تێبگەن کە دەبێ پەند لە هەڵەبجە وەرگرن، چونکە هەموومان چارەنووس و پاشەڕۆژ چاوەڕێیانە، بەڵام وەك وتمان ئەمە ڕوویەکی کاتی و تاکتیکی سزادانە بەکۆمەڵیەکەبوو، ڕوویەکیتر بەعس مەبەستی بوو ئەو ژەهرە بەسەراپای جەستەی مەعنەوی کوردو گەلی کوردستاندا بڵاو بێتەوەو تیرۆرکردنی هەڵەبجە ببێ بەخاڵی وەرچەرخان لەسەرە ڕێی دروستکردنی (٧٥)ێکیتر لە کوردستاندا.

بەڵام ئەمجارەیان سیاسەتی بەسوتماککردنی خاك و سزادانی بەکۆمەڵ بگاتە ئاستێ هەموو ئەگەرێ بۆ دووبارە هەڵسانەوەو سەربەرزکردنەوەو یاخی بون لەهۆشیاری تاك و نوخبەی کوردیدا بکوژێ و تەنانەت تروسکایەك نەمێنێتەوە کە لەوێوە مرۆڤی کورد گۆشەیەکی ئاسۆو سپێدەی قۆناغێکی بەرخۆدان ببینێ و هەستی بجولێنێ و ورەو ئومێدی بخاتەوە بەر.

بەم جۆرە هەڵەبجە بوە پانتاییەکی بەدۆزەخ کراو بۆ خۆنمایشکردنی ئایدیۆلۆژیای بەعسیزم، بۆ وەرگێڕانی بنەماو گوتەزاو هەستی بەعسیانە بۆنەخشەو تەکتیك و ئابلۆقەدان و چاندنی تۆوی مەرگ و پەیڕەوکردن لەستراتیژیەتی سڕینەوەی نەیارە سیاسی و ئایدیۆلۆژیەکان.

هەڵەبجە بۆ بەعس شوێنێ بوو، کەهەرچەکی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی تێدا تاقی نەکرایەوە، بەڵکو ئایدیۆلۆژیای بەعسیشش لەبەرگ و لێکدانەو پەیڕەوکردنە هەر توندو رادیکاڵ و دڕندانەکەیدا تێدا تاقیکرایەوە، هەڵەبجە هەر مرۆڤی تێدا نەکوژراو تاوانی ڕشتنی هەزاران خوێنی بەناهەقی لەلایەن کوێلەکانی بەعسەوە تیادا ئەنجام نەدراو

لەوێشەوە سوکایەتی بەشەرەف تەواوی مرۆڤایەتی نەکرا، بەڵکو لەهەمان کاتدا شوێنی بوو کە ئایدیۆلۆژیایەکی سیخناخ بەرق و دوژمنایەتی سەرۆك پەرستی و کودەتای بەسەر عەقڵ و ویژدان و ئەخلاقدا کرد، لێرەشەوە هەڵەبجە لەسایەی دەسەڵاتی بەعسی عێراقدا تەنها غەدر لێکراوێکی سیاسی یاخود ئابوری نەبوو، بەڵکو پێش ئەوە قوربانی جیهانبینی و تێڕوانین و ستراتیژیەتێك بوو کە رەنگدانەوەی جەبرو چوارچێوەو فەزایەکی ئایدیۆلۆژیایەکی سەراپاگیرو دژی ئەخلاقیی بوو، بۆیە ئەگەر ئایدیۆلۆژیا هاوچەرخەکان و قوربانیانی ئەوان لەناو مێژوودا لە ئەنسکلۆپیدایەکی جیهانیدا خوێنرانەوەو تۆمارکران دەبێ هەڵەبجە لەلاپەڕەکانی پێشەوەدا شوێنی بۆدیاری بکرێت بۆ ئەوەی خەڵکانی ویژدان زیندوو گەلانی دونیا تێبگەن کە چۆن ئایدیۆلۆژیا نەفەسچن و سەراپاگیرە نوێیەکان ئەوکەناڵە بەترس و مەرگ چێنراوەیان پێکهێناوە کە دەیان ملیۆنیان لەم ژیانەدا رەوانەی تونی مەرگ کردووە.

## "هەڵەبجە" شانۆی غەدرێکی خۆماڵی

ئەگەر ئەوەی باسمان کرد، گێڕانەوەی یاخود وەبیرهێنانەوەی هەندێ لەناونیشانە درشتەکانی ئازار و مەرگەساتەکانی هەڵەبجە بێت، وەك شار و کلتور و دانیشتوان و ژیان و ئاییندە، لەپەیوندی بەئایدیۆلۆژیایەکی ناسیونالیستی عەرەبیی لەعێراقدا، ئەوا داستانی ئەم بەشە لەخاك و گەلی کوردستان هەرلێرەو لەگەڵ نەیارە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و نەتەوەییەکانی کورد وەکو نەتەوە کۆتایی نایەت، بەڵکو دوای ئەوەش کە ئایدیۆلۆژیای بەعسیزم لەبەرەنجامی سەرکێشی سەرکردە لەخۆبایی و نەزانەکانیەوە بەرەو داڕمانی

یەك بەدوای یەکی پایە کلتوری و سیاسی و سەربازییەکانی ڕۆیشت و جارێکیتر ئیرادەی ژیانی هەڵەبجەییەکان و گەلی کوردستان بەسەر خواست و سیاسەتی مەرگ و سوککردنی ژیان لەلایەن بەعسیەکانەوە سەرکەوت، دوای ئەوەی کە هەڵەبجە بە برینەکانیەوە ئاهەنگی گلانی جەللادەکانی لەئامێزیدا گێڕا کەچی بەدور لە هەموو سەرەتایەکی لۆژیکی و نەتەوەیی و ئەخلاقیی جارێکی دی ئەم شارەو دانشتوانەکەی هێندەی نەبرد، خۆیان لەئابلۆقەی شەڕێکی‌تری ئایدیۆلۆژی و سیاسی و سەربازی خۆماڵیدا دۆزییەوە، بەڵام داخۆ ئەگەر ڕەفتاری بەعس لە بەرامبەر هەڵەبجە لەسۆنگەی دوژمنایەتی قوڵی بۆ گەلی کوردستان و ئێران قابیلی تێگەیشتن بێت، داخۆ دەبێت ئازاردانی ئەم شارە لەسایەی قوتابخانەی بیری کلاسیکی کوردایەتی و ناسیۆنالیزمی کوردو تەوژمێکی ئیسلامی ناوخۆ چۆن تێبگەین و بخرێتە ناو کام چوارچێوە لەلێکدانەوەو پاساوەوە؟ لەراستیدا ئەگەر بەوردی سەرنجی دووبارە ئازاردانەوەی هەڵەبجە بدەین لەقۆناغی شەڕی ناوخۆ لەکوردستاندا زوو لەوە تێدەگەین کە ئەو واقیعەو ڕەفتارە سیاسی و تەراتێنە سەربازییەکان بەدەستنیشان کردنی ئەو ناتەواویە قووڵانەدێ کەلەخودی ناسیۆنالیزمی کوردی و ئیسلامی ئایدیۆلۆژیکراودا هەبون و تائێستاش بەشێکیان هەن، کاتێك هێزێکی کوردی یاخود زیاتر بۆماوەیەکی زۆر ئەم شارە و دانیشتوانی بێ‌بەش دەکات لە لانی‌کەمی مافەکانی خۆیان و شارەکەو دەوروبەری بەدەست فەرامۆشی و ئاوڕلێنەدانەوەی هەمەلایەنە دەسپێرێ و جینگڵ دانی جەستەی شار بەدەم ئازاری برینە قووڵەکانی بەعسیزمەوە بەردەوام دەبێ.

بەڵکو کارنامەی هێزە خۆماڵیەکان لەبەرامبەری هێندەی‌تر دەیبینەوە ناو مێژووی ئازاردانەکانیەوەو ئەو برینانە هەڵدەکوڵنەوە کاتێك هێزێك هەر لەبەر ئەوەی ئەوشارە

لەژێر کۆنترۆڵی خویدانیە رێگا نادا دەستی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتیدانی دانیشتوانەکەی بەجوانی پێ بکات و ئەمەش دەکات بەهۆکارێکی فشار بۆ بەهێزکردنی پێگەی سیاسی و سەربازی خۆی زیاتر لەپرسیارێ لەسەر ناوەرۆکی ئەو ئایدیۆلۆژیایە دادەنێ کە ئەم هێزە هەڵگریەتی، هەڵەبجە لەو سۆنگەوە کەبەهۆی کیمیابارانەوە بوو بوو بەهێمای سەراپای ئازارو مەینەیتەکانی گەلێکی بێناویشان و کوردستانێکی بێنەخشە (بەمانای یاسا نێودەوڵەتیەکەی) و چاوەڕوان دەکرا کە دەسەڵاتە خۆماڵی و لۆکاڵییە کوردییەکە و هێزە دەسترۆیشتوەکان لەئاوەدانکردنەوە و خزمەتکردنی خەڵکەکەیدا بیکەن بەهێمای ئاراستەی قۆناغ و ژیانێکی نوێ لە کوردستاندا کە ئاماژە بەکۆتایی هاتنی بەعسیزم بکات و دەرگا بەرووی تێگەیشتنێکی سەدان جار ئینسانیتر بەرووی ژیان و مرۆڤدا لەم دەڤەرەدا بکاتەوە.

بەڵام بەداخەوە نەك هەر ئەوە بۆ چەندین ساڵ نەبوو بە خەون و واقیعێکی بەدیهاتوو بەرجەستە بەڵکو بەپێچەوانەوە هەڵەبجە جیا لە زۆر ناوچەیتری کوردستان بوو بەیەکێ لەوپانتاییانەی ناسیۆنالیزمی کوردی و ئیسلامیی خاوەن نینۆك بەشێکی گرنگ لە ململانێ خوێناویەکانیان بخەنە سەر کۆڵ و بەردەرگای خانوە دارماوەکانی.

ئەوە راستە کە وەفاداری بۆ هەڵەبجە و مامەڵە لەگەڵ کردنی وەك هێمای چەوساندنەوەی کورد و بێبەش کردنی گەلی کوردستان لەسەرتاییترین مافەکانی لەوانەش مافی ژیان و بێوەیی تەنها بەخزمەتکردنی ماددی خەڵکی هەڵەبجە نادرێتەوە، ئەگەر هەموو چیرۆکەکە لەمەدا کورت بکەینەوە بەدیوەکەیتردا ستەمان لەرەمزبوونی هەڵەبجە کردووە، بەلۆژیکی بازرگان و لەچوارچێوەی یاسای تایبەتیدا مامەڵەی لەگەڵ

دەکەین، چونکە هەموو خزمەتی بە بەرەو پێشچوونی بزوتنەوەی سیاسی نیشتمانی گەلی کوردستان و ئاوەدانکردنەوەی نیشتمان و پەرەدان بەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و خزمەتکردنی مرۆڤی کورد بەجۆرێ لەجۆرەکان خزمەت کردنە بەکەسێتی مەعنەوی شەهید کراوی هەڵەبجە و سەرجەم قوربانیانی رێگای خۆڕاگری گەل و دەستگرتنی بەژیان و مانەوەو خۆبەدەستەوە نەدان، بەڵام لەلایەکی دیکەوە هەرگیز راست نییە ئەمە بکرێ بەپاساو بۆ فەرامۆشکردنی زیانلێکەوتووترین بەش لەگەلی کوردو خاکیی کوردستان، هەڵەبجە وەك شارو هەڵەبجەییەکان وەك بەشێکی ئازاردراو لەجەستەی نەتەوە هەقی خۆیانە چاوەڕێی ئەوەبن لەریزی یەکەم و سەری سەرەوەی نەخشەی بایەخپێدانی دەسەڵاتی کوردی و ئەو هێزانەوە بن کە هەڵەبجەیان کردۆتە کەرەسەیەکی راگەیاندن و رەگەزێکی پێکهێنەری گوتاری سیاسیان بۆ دەرەوەی خۆیان و هەندێك جاریش هەڵەبجە تێکەڵ بەجەستەی حزب دەکەن و حزب رەگی خۆی بەقووڵی دەگێڕێتەوە بۆ ناو کاسەی پڕاوی ژن و منداڵی ئەو ناوچەیە.

لەهەموو ئەم گێرمەوکێشەشدا ئایدیۆلۆژیا راستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ، ئامادە لەعەقڵدا، یاخود عەقڵی بەناوەکیدا دەبێ بەکەرەسەیەکی خۆشکردنی ئاگرەکەو بێبەشکردنی ناوچەکەو ئازار پێگەیاندن، بەڵکو سوکایەتی پێکردنی هەڵبەت ئەگەر لەروویەکەوە ئایدیۆلۆژیا لەسۆنگەی قانگدراو بەهەستی بەدوژمنکردنی ئەوی دی فکری و سیاسی و جەبرەکانی بەشداری قوڵکردنەوەی برینەکان بکات، ئەوا لەروویەکیترەوە لەبەر لاوازی و نەبوونی یەکیەتی و هارمۆنیەتی ناوخۆیی و دیدگا رۆشنی و هەژاری و کەم خوێنی مەعریفی، دەبێتە ئەو بەربەستە لاوازەی نەتوانێ لافاوی رقی کوێرانە لەخۆ

بگرێ و بەری لێ بگرێ و ناوچەکەو کوردستانیش لەکارەسات بەدوور بخاتەوە کە ئەمەش لەناسیۆنالیزمی کوردیدا بەرجەستە دەبێت.

هەروەك روونە هەڵەبجە لەرووی مێژوویەوە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەدواوە مەڵبەندێکی گرنگی چەپ و حزبی کۆمۆنیستی عێراق بووە، هەڵەبجەییەکان دەگێڕنەوەو لاپەڕەی یاداشتنامەکانیش تۆماریان کردووە کەچۆن ململانێی نێوان چەپە کوردەکان و شوێن کەوتوانی قوتابخانەی بیری کوردایەتی کە ئەوسا لە پارتیدا بەرجەستەبووە لەهەندێ عەڵقەی مێژوویدا مەنگی و ئارامیی شارەکەی شێواندووەو لەئاستێکیشدا بووبێت نائارامی و کێشمەکێشمی ناوخۆیی ئازاری داوە، لەکاتێکدا دانیشتوانی ئەو ناوچەو ئەوشارە بێنیازبوون لەو ململانێیە، بەڵام گەر ئێمە بەسەر ئەو قۆناغەدا بگوزەرێین و یەکسەر بێینە دۆخی دوای راپەڕین و سەیری هەڵەبجە بکەین لە لە دۆخی ئابلۆقەی شەڕی هێزە کوردیەکان لەنێوان خۆیاندا، دووبارە دەتوانین سیناریۆکان و چنگاڵی رەشی ئایدیۆلۆژیا لەزیاتر شێواندنی سیمای لەبنەڕەتدا شێواوی شارو ناوچەکەو دانیشتوانەکەیدا ببینین.

شەڕی ناوخۆ لەم بەشە لەکوردستاندا گەرچی شەڕێکی سیاسی بوو بەمانا کۆنە پەرستەکەی سیاسەت، شەڕکردن بوو لەسەر بەهێزکردنی پێگەی حزبی و زیاتر دەست رۆیشتوویی سیاسی و دارایی و سەربازی وەك چۆن لە هەموو کوردستاندا وابوو.

بەڵام لێرەدا مۆرکێکی‌تریشی بەخۆوەگرت یاخود بڵێین رەهەندێکی‌تریشی بەخۆوەگرت کە ئەویش بەزەقی هاتنە ناوەوەی توخمی ئایدیۆلۆژیابوو وەك هۆکارێك بۆ پاساودان و رەوایەتی پێدان و سازدان لەشەڕەکەدا.

عەلمانیەتی بەئایدیۆلۆژیکراوی شێلراو بەپاشخانێکی چەپی رادیکاڵەوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیایەکی بەمۆرك ئیسلامیی رادیکاڵ هەڵەبجەیان کردە مەیدانی شکاندنی ئێسکی یەکترو بەجۆرێ لەنێوەندی ململانێی توندو بەجانەوەر کردنی بەرامبەری شەڕکەردا هەڵەبجە لەهەموو رەمزییەت و ئاماژەکانی داڕنراو وەك جەستەیەکی بێرێز دوچاری پێخوستکردن هات، هەڵەبجە نەك هەرگۆڕا بەسەرزەوییەکی ئاسایی و جوگرافیایەکی بێمێژوو، نەك هەر برینە قوڵەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ئایدیۆژیای بەعسیزم نکوڵیان لێکرا یاخود دانپیانانێکی روکەشیان پێکرا، بەڵکو لەوەش زیاتر لەهەڵەبجەوە نەك هەر هەڵەبجەییەکان ئازاردەدران، و بێبەش دەکران بە لانیکەم لە ژیانێکی ئاسودە و ئاسایش و ژیان بەدور لەترس و تۆقاندن و فەرهەنگی شومی بەعسیزم بەڵکو بەدەردی جاران و لەئاستێکی‌تردا سەرجەم کوردستان ئازار دەدرا و گومان بەدەوری رەوایەتی سکاڵاو داواکاریەانی کوردا دروست دەکرا و کورد لەبەرگی کائینێکی دوژمن بەخواست و هیوا و بەرژەوەندیەانی خۆی وەك مرۆڤ و نەتەوە وێنا دەکرا.

لە روانگەی عەلمانیەتێکی بەئایدیۆلۆژیاکراوەوە هەڵەبجە گەر بۆماوەیەکی دیاریکراویش بووبێت لەسەر زەمینێکەوە کە هەڵگری بەشێکی گرنگی ژوارو ژان و ئازارەکانی مێژوو خەون و چاوەڕوانییەکانی کوردبووە بەرەو ئاینده، گۆڕا بەسەر زەوییەك کە ئایدیۆلۆژیایەکی رکابەری ئیسلامی رادیکال خۆی تێدا نمایش دەکا، دیسانەوە لە روانگەی ئەم ئایدیۆلۆژیایەشەوە هەڵەبجەبوو بەو شارەی کە ملکەچ بوون بۆ دەسەڵاتی ئایدۆلۆژیا فەرمانڕەواکەی دەڤەر رەتدەکاتەوە هەر ئەمەش وای لێ دەکات شایستەی سزادان بێت یاخود ئەو حەسانەی لێ بسەنرێتەوەکە مێژووی پڕ خەباتی شارو کارەساتە گەورەکان کەبەسەری هاتووە لەسەرووی هەمووشیانەوە کیمیابارنی هەڵەبجە

بۆی دروست کردبوو، ئازاردانەوەی هەڵەبجەو دواخستنی خزمەتکردنی و بێبەشکردنی لەمافەکانی بەشێ بوو لەهەرەسهێنانی سیستمی حەرام لەرۆشنبیری سیاسی کوردی و حزبە بەشەڕ هاتوەکانی کوردستاندا، کە لە هەڵەبجەدا جوانتر لە شوێنەکانی دی بەرجەستە بوو چونکە هەڵەبجە هەم رەمزێکی گەورەو هەم کارەساتبارێکی مەزن بوو، هەڵەبجە لەچاوی ئایدۆلۆژیا باوەکەی دەڤەر ناوچەیەکی داگیرکراوبوو، هەروەك چۆن لەپێش راپەڕینیشدا لەو لەحزەدا کەشوناسی داگیرکراو دەدرێ بەهەڵەبجە سزادان و بڕیاری لەسێدارەدانی ژیان بەهەموو رواڵەتەکانیەوە دەبێ بەبڕیارێکی جێبەجێ کراو، کەناوچەیەکیش داگیر دەکرێ لۆژیك و یاسا سەربازییەکان دەبن بەپێوەر بۆ رەفتار و جوڵانەوە و سەیرکردن. لەم کاتەشدا گەر ئازاری ناوچەی داگیرکراویش بدرێ گەر سیستمی ماف تیایدا رابگیرێ و کار بەحاڵەتی لەناکاو بکرێت و لەم میانەشدا چەندەها کەس دووچاری بێبەش بون لەماف و یاساییەکانیان بێن، نەویژدانی سەرکردەکان ئازار دەدات و نەزۆر وردیش دەکرێتەوە، بێئەوەی رەچاوی جەبری جوگرافیا بکەن لەم شارەدا، بێئەوەی لەدانیشتوانی ئەم شارە بپرسن یاخود لەحاڵەتی نەبوونی هۆیەك بۆگەیشتن بەپرسیارکردن، خەڵك واقیعی شارو ناوچەکە بخوێننەوە کە داخۆ ئەم دۆخەی کە لە بەرگی یاخیبوواندا خۆی دەردەخات، (خیار)ێکە ئیرادەیەکی ئازاد هەڵیبژاردوە، ئاماژەیە بەپرۆژەی جوڵانەوەیەکی مەبەست گەرایانە، یاخود جەبر و هەڵکەوتەو شوێنگەو گۆڕانە بابەتیەکان بەسەریاندا سەپاندووە؟، بەڵام چاوەڕوانیەکی لەم جۆرە لەکاتی شەڕی ناوخۆ لەهێزەکان بێهودە بوو، چونکە ئەوان نەك لەکاتی شەڕدا کە چرای عەقڵ جگە لە عەقڵی ئامێری دەکوژێتەوەو غەریزە دەبێ بەبزوێنەری جەستەو رەوتی رووداوەکان، بەڵکو لەحاڵەتی ئاسایشدا لە تێڕوانینی فکریانە بۆ دۆخ و واقیع و

روادوەکان بێبەش بون و ئەوەی کە چوارچێوەی گۆڕان و روداوەکەیان دیاریکردووە لێکدانەوەیەکی سەرپێیی و سیاسەتێکی پراگماتی بووە، نەك تێڕامانێکی قووڵی ستراتیژی و بینینی سیماکانی ئاسۆی ئاینده، لەدیدی عەلمانیەتی بەئایدۆلۆژیکراوەوە لەنێوان دانیشتوانی هەڵەبجەو یاخی بوە ئیسلامییەکاندا تەماعی دروست دەبێت، مەلەفەکان تێکەڵ دەبن و لەم کاتەشدا ئاساییە سزاکان مۆرکی سەربازی وەربگرن کەیەکێ لەمۆرکەکانی یاسای سەربازیش سزادانی بەکۆمەڵە، هەر ئەمەشە کوشتنی چەندان کەسمان بۆ لێکدەداتەوە بێدادگایی کردن و لێپرسینەوە لەدانیشتوانی بێتاوان و بێلایەنی ئەوشارە.

گەرچی ئامانجی ئاشکراکراوی هەڵگرانی ئەم ئایدیۆلۆژیایە بریتی بوو لە رزگارکردنی شارو ناوچەکەو دانیشتوانەکەی لەچنگی هەندێ کە لە روانگەی ئەوانەوە ژیان و ئاسایش و گوزەرانی لەوان زەوت کردووە، بەڵام بەکردەوە بێبەشکردنی خەڵك و شارەکەی دەکرد بەهۆکارێکی فشار بۆ ئەوەی بەراوردکردن دروست بکات و بەگوێی خەڵکەکەدا بدات کە ئێوە قوربانی دەستی دەسەڵاتدارانی ناو هەڵەبجەن، ئەوە ئەوانن رێگایان لەئاوەدان کردنەوەو باشترکردنی ژیان و گوزەرانی ئێوە گرتووە نەك ئێمە، بەڵام لەراستیدا مەسەلەکە هەمووی بەم جۆرە نەبوو چونکە پێش هەموو شتێك لەسەرتاسەری کوردستاندا تواناکانی گەلی کوردستان لەشەڕو کوشتن و وێرانیدا بەفیڕۆ دەدران، لەلایەکیترەوە گەر ئیرادەیەکی راستەقینەی خزمەتکردن لەئارادا بووایەو پۆلێن کردنە ئایدیۆلۆژیەکە بیتوانیایە دۆسێی هەڵەبجە وەك ناوچەو دانیشتوان لەلایەنەکانی ململانێ چەکداریەکە لێکجیابکاتەوە ئەوکاتە دەتوانرا زۆر لەوکارانە بکرێن کە نەکران،

تێکەڵکردنەکەش لەراستیدا گەر جاریَ لۆجستی و مەیدانی بوویێت یاخود بڵێین ڕێگریەکان بەم جۆرە بووبن ئەوا لەناوەرۆکدا سیاسی و بڕیار لێدراوی حزبی بون.

هەرچی پەیوەندی بەناسیۆنالیزمی کوردیشەوە هەیە وەك ئایدیۆلۆژیا (چونکە لای ئێمە ناسیۆنالیزم زیاتر لەوەی بەپرەنسیپی سیاسی پێناسە کرابێت بەئایدۆلۆژیا ناسێنراوە) کەرەسەیەکی لێکدانەوەی واقیعەکەیە و بێپەیوەندی نیە بەو هەلومەرج و دۆخەی کە تیایدا لەباتی دڵنەوایی و خزمەتکردن و پاداشتدانەوە هەڵەبجەی تیا دادگایی کرایەوە، بەڵام ناسیۆنالیزمی کوردی وەك ئایدۆلۆژیا لەبەر تۆکمەیی و یەکانگیریەك کەتیایدایە، بەڵکو لەبەر لاوازی و هەژاری ڕێکخستنی ناوەکی و سنورداربوونی ئاسۆکانی ئەم ڕۆڵەی دەبینی.

ناسیۆنالیزم گەر پێگەیشتوویێت، گەر ڕۆڵی سەرەکی هەبێت لەدیاریکردنی دیدگاکان و پێناسەدان بەهێزو لایەنەکان، دوژمن لەناو ماڵی خۆیدا هەڵنابژێریَ، نامێڵی جیاوازی ئایدۆلۆژیا لەناو ریزەکانی گەل و لەناو کۆمەڵگادا چوارچێوە ریَ پێدراوە یاسایی و ئەخلاقی و نەتەوەییەکان تێپەڕێنن، لاوازی بیروباوەڕی کوردایەتی بەمانا مەعریفی وئەخلاقی و مەیدانیەکەی بەشدارە لەئەو ئازاردانە زۆرەی هەڵەبجەو دانیشتوانی ناوچەکە بەگشتی کە لە دوای ڕاپەڕینەوە بەدەست هێزە کوردیەکانەوە چەشتیان.

هەڵبەت ناکریَ باس لە ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیاو پەیوندی بەروانینە هەڵەبجەو سویَ و ژوارەکانی ئەم شارە بکەین و ئاماژە بەئادیۆلۆژیای رادیکاڵی ئیسلامیی نەکەین کەلەلای خۆیەوە ناوچەکەی کردبوو بەو پانتاییەی نمایشی بون و شوناسی خۆی تێدا دەکرد.

رادیکاڵیەتی ئیسلامیش بەجۆرێکیتر مامەڵەی لەگەڵ شاردا دەکرد گەر گوتاری ئەم تەوژمە لەمەڕ پەیوەندی شوێن بەبوونی ئەوەوە بخوێنینەوە (کەشوێن لێرەدا ناوچەی هەڵەبجەو هەورامانە) تێدەگەین کەجۆرێ لە پیرۆزی بەم خاکە دەدا، بەڵام پیرۆزییەك بەو ناوەرۆکەی ئەو پێی دەدا.

ئەو پێی وابوو هەڵەبجە شارێکی پیرۆزە چونکە رادیکاڵیەتی ئیسلامی حوکمی دەکات و لەرووی مێژووییەوە باوەشی بۆ ئەو گرتۆتەوەو ئەو زەویە بە پیتە بووە کە پێش ناوچەکانیتری کوردستان تۆوی ئەوی تێدا سەوز بووە، هەر لەوێشەوە سەیری دنیای دەوروبەرو بەشەکانیتری کوردستانی دەکرد، ئەویش هەڵەبجەی بەنیشتمانێکی تایبەت دادەنا، نیشتمانی ئایدیۆلۆژیاو تێروانینێکی دیاریکراو.

نیشتمانێ کەدەبێ سنورەکەی فراوان بکرێت و بەشێوەیەکی کاتی سنورەکانی دەستنیشان کراون، ئەوەی ئەم سنورە لماویانەشی دیاری کردووە توانای سەربازی و سیاسی ئایدیۆلۆژیاکەیە لەگەڵ هاوسەنگی هێزەکان و هێزی ئایدۆلۆژیای رکابەری بەرامبەر.

رادیکاڵیەتی ئیسلامی ئەو مافەی بەخۆدابوو کە بەناوی هەڵەبجەو هەڵەبجەییەکانەوە بدوێت و خۆی وانیشان بدا کە نوێنەرایەتی شەرەفی مێژوویی و کاراکتەرە مەعنەویەکەی دەکات، بۆیە ناکرێ تەنها لەرووی پێدراوە مەیدانی و واقیعیەکانەوە سەیری رەفتارو گەمەو شەڕەکانی ئەم لەگەڵ بەرامبەرەکاندا بکرێت.

ئەمە جگە لەوەی لەسەنگەری بەرگری کردن لەشاردایە، لەهەمان کاتدا هەڵگری رۆح و بەهاکانی شاریشە، تاقە هێزێکە لەپاکێتی شوناسی شارتێکەیشتبێت و لەسەر مەبنای

ئەو تێگەیشتنەش گوتارو سیاسەتەکانی دابڕێژێ، باڵێکی ناو ئەم رادیکاڵیەش سڵیان نەکردەوە لەوەی پەنا بەرنە بەرسیستمی ناولێنانی ئیسلامی مێژوویی بۆ جیاکردنەوەی هەڵەبجەو هەورامان لەدەرەوەی خۆی و دیاریکردنی ئەم هێماو شوناس و کاراکتەرەی لەخۆی گرتوەو هەڵگریەتی، لەبەرئەوە باسی (دار الاسلام) و (دار الکفر)یان دەهێنایە گۆڕێ، باسی مەککەو مەدینەیان دەکردو هەڵەبجەو خورمالیان بەمەدینە دەچواند کە پێویستە هەڵگرانی ئایدیۆلۆژیای مژدە بەخشی ئیسلامیی رادیکاڵ لەرەوتی گەشەکردنی هاوچەرخانەی خۆیدا کۆچی بۆ بکەن و بیکەنە بنکەی دەرچوونەوەیەکی نوێ و کانگای پەخشکردنی روناکی و بەرەی دواوەو نەخشەکێشان بۆ فراوانکردنی بازنەکانی (دار الهجرە) و فشار خستنە سەر ئەو بازنەی کە بەگوێرەی ئەو زمانەی ئەوان بەکاریان دەهێنا بەرجەستەکەری گوناه و نەفامی و کوفر بوو، لەدیدی ئەم باڵەوە هەڵەبجە لەساتێکدا دەبووە خەیبەر کە (احزاب) گەلەکۆمەیان لەسەر کردووەو پێویستە بەو گیانەوە بەرگری لێ بکرێت کە هاوەڵان بەرگریان لەمەدینە دەکرد، روونیشە کەهەموو ئەم دابەشکردن و ناولێنان و جیاکردنەوانەش زمانی سەربازی و فەزاکانی شەڕو بەرخۆدانیان بەسەردا زاڵە.

یەکێ بەم جۆرە بیر کاتەوە زیاتر لەوەی چاوی لەناوەوە بێت، واتە لە چارەنووسی خەڵکە ئاساییەکەو خەمی ژیان و گوزەران و یاری دەروونی و ئێستاو ئایندەیان بخوا، چاوی بڕیوەتە نەخشە سەربازیەکان و دابەشبوونە گروپیەکان و گەمە سەرچڵەکان و خۆبەیانکردنی رۆحی جەنگاوەرانەی گروپ کە ئەرکی سەرشانی دووبارە بوژانەوەی ئەخلاقیی موجاهیدو جەنگاوەرە لەوێنەی جوامێری و ئازایەتی و دان بەخۆداگرتن و چاوبڕینە پاداشتی دوارۆژوو سوربوون لەسەر ئامانج و خۆبەدەستەوە نەدات، لەم

بارودۆخەداکە زمانی پیرۆزکردنی خوێنی شەهیدو پایەی گەورەی پیاوێك لەسەنگەری بەرەنگاری دایە بەرامبەر نەفامی نوێ (!) لەکوردستاندا دەبوا هەڵبجەییەکان لەوە تێبگەیشتنایە کە ئەگەر دووچاری ئابلۆقەش بوون لایان سەیر نەبێت، چونکە ئەوە شتێ نیە جگە لەدووبارە بونەوەی داستانی پێغەمبەر (د.خ) و هاوەڵانی لەشێوەی (ئەبو تالیب) گەرچی ئەمەش لەسەر حسابی ژیان و گوزەرانی هەزاران کەس تەواو ببێ.

لێرەوە تێدەگەین کە ئایدۆلۆژیا هەر لە ئایدۆلۆژیا سۆسیال ناسیوناله تۆتالیتارەکەی بەعسەوە بگرە تا عەلمانیەتێکی بەئایدیۆلۆژیا کراوی هەندێ هێزی کوردی بە پاشخانێکی سیخناخ لەپێوەرو چەمك و مەبەستەکانی چەپی کلاسیك تا دەگاتە ئیسلامیی بەئایدیۆلۆژیاکراو لە بەرگی تەوژمێکی رادیکاڵی ئیسلامیدا لەئاستی جۆراوجۆرو بەقەبارەی جیاواز بەشداربووە لە تۆمارکردنی تۆماری ستەم و چەوساندنەوەی دانیشتوانی ناوچەکەو ئەو شەڵاڵە خوێنەی لەوشارەوە رێچکەی گرتوەو ئەو هەموو کارەسات و ئازاردانە تاوانبارانەی بەشێکی گرنگ لەمێژووی نوێ و هاوچەرخی ئەمشارەو تێکڕای ناوچەکەیان پێکهێناوە.

گەر ناسیۆنالیزمی کوردی سەرزەمینی ناوکویی هێزەکان بوایەو سنوری بزجوڵەو ئاراستەی بۆدارشتنی سیاسەتەکان و دیاریکردنی دۆست و دوژمنەکان و دیاریکردنی جۆرو شوێن و کاتی شەڕو جەنگەکان و شێوازی پەیوەندییە نێوخۆییەکان دیاری بکردایە، ئەوا هەر لەبنەڕەتەوە لەکوردستاندا شەڕی ناوخۆیی هەڵنەدەگیرساو سیمای دوای راپەڕینی دزێو نەدەکردو هەڵبجەش لەونێوەندەدا نەدەبوو بەشانۆی سوکایەتی کردن بەبەها نەتەوەیی و ئەخلاقی و نیشتمانی و ئیسلامیەکان.

گەر ناسیۆنالیزمی کوردی وەك ژێرخانی فکری و بونیاد هێندە لاواز نەبوایە کوردستان بەو جۆرە دابەش نەدەبوو، چەمکی دەڤەر جێگای چەمکی نیشتمانی نەدەگرتەوە، ئەندامی حزب نەدەچووە شوێنی هاوولاتی و میلیشیای سەربازی حزبیش نەدەبووە جێگرەوەی سوپای نیشتمانی کە ئەرکی پاراستنی سنورەکان و رێگرتنە لەدەستدرێژی بۆسەر نەتەوەو نیشتمان بەلام لە ڕاستیدا ناسیۆنالیزمیش یەکێ بوو لە قوربانی‌یە ڕەش هەلگەڕاوەکانی دۆزەخەکە.

### لەمەڕ ئیسلام و ئیسلامیەکان و ناسیۆنالیزمی کوردی

ڕەنگ بێت ئەمڕۆ زۆرترین قسە هەبێت لەسەرئەوەی کە بزوتنەوە ئیسلامیەکان هیچ خزمەتێك بەپرۆژەی ناسیونالیستی کورد ناکەن، بەڵام ئەم قسانە تاچەندە لەئاستی لۆژیك و واقیعدان، ئەمە لەکاتێکدا ئەمڕۆ هەندێ لەلایەنە ئیسلامیەکان پێچەوانەی ئەوە ئیدیعا دەکەن؟

بەش بەحاڵی خۆم ئەو خوێندنەوە بەڕاست نازانم پێشم وایە هەر لەوێشەوە لۆژیکی خۆی لەدەستدەدا کە خوێندنەوەیەکی لەو جۆرە دەخرێتە بەردەم ڕەگەزەکانی واقیعە بەرهەست و مێژوویی و تەنانەت هەنووکەیەکەشەوە، سەرەتا ڕاستە لەرووی تیۆرییەوە ئەگەری ئەوە هەیە ئیحساساتی ئاینی لە قۆناغێك و بڕگەیەکی مێژوویی دیاریکراودا لەدژی ناسیۆنالیزمێکی دیاریکراو تەوزیف بکرێت. ئەوەش ڕەتناکەمەوە کەهەندێ بیرکردنەوەو سیاسەت و لێدوان لەنێو ناوەندە ئیسلامییەکە لەساڵانی رابردوودا هەستی پێکراوە کە دەتوانرێت بەبیرکردنەوەیەکی ناکوردانەی ناوبەرین ناکوردانە بەمانای خیانەت نا بەمانا سیاسیە بازارییەکەی بەڵکو لەو روانەوە کە لەفۆرمەلەکردنی ئەزموونە ئیسلامیەکەدا هەندێ جارو لای هەندێ کەس و ناوەند هەوڵی گوێزانەوەی ئەزموونێکی ئیسلامی دەرەکی دراوەو هەناسەی نێونەتەوەیی بوونی ئیسلامیی پێوە دیاربووە، هەروەها گروپیش هەیە لە وێنەی (انصار الاسلام) کە لەپەیڕەو و پرۆگرامی خۆیاندا

سەرەتاکانی کاری نیشتمانیان بەئاشکراو بێپەردە رەتکردۆتەوە، بەلام ئەمە حالەتن. واتە هێلی گشتی حالەتە ئیسلامیەکە هاوبیروڕا بووە لەگەڵ بزاڤە نیشتمانییە کوردیەکەدا لەوەی پەیوەندی دارە بە داخوازیە نیشتمانی و نەتەوەییە کوردیەکەوە هەیە، لەرووپەکیترەوە ئەو لێدوان و هەڵوێست و سیاسەتانەی باسمان کردن لەناو بەشێ لە ئیسلامیەکاندا کەوام پێناسەکرد دەربڕی هەستێکی رەسەنی نیشتمانی کوردی نەبێت شتێ نیە تایبەت بێ بە ئیسلامیەکانەوە بەلکو خودی بزوتنەوە و هێزە ناسیۆنالیستە تەقلیدی و مێژوویەکانی کۆمەلگاش لەماوەی رابردوودا لەچەندین رووەوە چەندین رەفتارو سیاسەت و هەلوێستیان لەناوەرۆکدا دژ بەپەیامی کوردایەتی و پێداویستی بە مێژوویەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی بووە دەکرێ پالنەر و فۆرمەکان لەنێوان ئەو دوو ناوەندەدا جیاوازبن، بەلام هەلەی هێزە ناسیۆنالیستە کوردییە دەست رۆیشتوو دەسەلاتدارەکان زۆر بەخراپتر لەسەر ئاراستەکردنی بزاڤی رزگاری نیشتمانی کورد کەوتۆتەوە، چونکە ئەوان رێبەری بەکردەوەی بزاڤە کە بون و (مقدرات) ی نیشتمانی و توانایەکی زۆرو زەوەندەی دارایی و سەربازیان لەبەردەستدابووەو هەلەی ئەوان هەلەی هێزێکی جەماوەری لەوان سنوردارتر نەبووە ئەوەی پێگەو هەست و (انتما)ی ناسیۆنالیستانەی کوردیشی لەدوای راپەڕینەوە لاواز کرد ئەو ناکۆکیە بوو کەلەناوخۆی بالەکانی بزوتنەوە ناسیۆنالیستەکەدا بەشێوەیەکی خوێناوی تەقیەوەو نائومێدیەکی زۆری لەناو نەوەی نوێدا دروستکردو بلاوکردەوەو دەرفەت و تواناو وزەیەکی زۆری لەدەرەوەی ئاراسەی پێداویستیەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردی بەفیڕۆداو تائێستاش هەرێمی کوردستان بەدەست ئاکامەکانییەوە دەنالێنێ.

لە رویەکیترەوە گرفتە تیۆری و مەیدانیەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی کوڕی ئەمڕۆو دوێنی نین، بەڵکو رەگ و ریشەی هەندێکمان دەگەڕێتەوە بۆدەیان ساڵ لەمەوپێش، لەکاتێکدا حزب و رێکخراوی ئیسلامی کوردی بەشێوەیەکی سەرەتایی لەسەرەتای هشتاکانەوە وەدەرکەوتن و لەدوای نەوەتەکانەوە بوون بە ژمارەیەکی سیاسی حساب بۆکراوو هەست بەبوون و کاریگەریان دەکرێت.. لەکاتێکدا ناسیۆنالیزمی کوردی تەمەنی لە (١٠٠) ساڵ تێدەپەڕێ کاتێ لە شتەستەکان بزوتنەوەی کوردایەتی دووچاری کەرتبوونێکی مەترسیدار دێت و تارادەیەکی زۆر سێبەری خۆی دەخاتە سەر تێکڕای حاڵەتە کوردیەکە هەروەها کاتێ لەناوەڕاستی هەفتاکانەوە جارێکیتر کێشە ناوخۆییەکان سەر هەڵدەدەنەوەو شەڕی نێوان هێزە کوردیەکان هەر لەسەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشەوە دەست پێ دەکاتەوەو کارەساتی گەورەی وەك هەکاری لێ دەکەوێتەوە لەپاڵ چەندین کارەساتیتر، کاتێ لەهەشتاکاندا شەڕی نێوان ئەو لایەنانە تائاستێکی ترسناك قوڵ دەبێتەوە لەکاتێکدا کوردستان بەشێکی بەرچاوی لەبەردەستی هێزی پێشمەرگەو ئەو حزبانەدا بووە، هەموو ئەمانە کاریگەری خراپ بەسەر شوناس و ورەو (انتما)ی تاك و گەلی کوردەوە بەجێ دەهێڵن کە لەدورو نزیکەوە پەیوەندی بەبوون و نەبوونی ئیسلامیەکانەوە نییە، شەڕو ناکۆکی چەند ساڵەی نێوان پارتی و یەکیەتی لەسەر نفوز و پارە و دەسەڵات چ پەیوەندیەکی بەئیسلامیەکانەوە هەبووە؟ ئەگەر ئەو شەڕو ناکۆکیە نەبوایەو یاسا سەروەر بوایەو دەزگا نیشتمانیەکان لەکار نەخرانایە لایەنە چەکدارەکەی ئیسلامیەکانی کوردستان هەر لە بنەڕەتەوە نەیدەتوانی تێکەڵ بەروداوەکان و شەڕی ناوخۆ ببێت. لێرەدا قسە زۆرەو نامەوێ بەدرێژی بچمە نێو باسەکان، بەڵام مەبەستمە کەهەموومان بەشداربین لەوەی باس و

خواستەکانی لەمەڕ ئیسلامیەکان لەچوارچێوەی جەنگی دەرونی و هێزەکانیتریش لەو چوارچێوە کەرنەڤاڵەیەی ئێستا تێیدایەو ئەو کەش و هەوا پڕو پاگەندە ئامێزەو پێداویستی شەڕی نێوان حزبیەکان دەربچێت چونکە ئەم جۆرە مامەڵە کردنە سایکۆلۆژی رقاوی و بوغز بۆتاکەکان و شوێنکەتوانی تەوژمەکان دروست دەکات. لەکاتێکدا ئێمە کاتی ئەوەمان هاتووە لە جەبری تەفسیرە سادەو ساختەو ئایدیۆلۆژیەکان دەربچین ناکرێ چیتر دروستنەبوونی دەوڵەتی کوردی ببەستینەوە بەتەوقەنەکردنێکی شێخی حەفید لەگەڵ ئەفسەرێکی ئینگلیز، یاخود فەتوایەکی مەلای خەتێ و پێمان وابێ مێژوو ئەم روداوە پەرش و بڵاوو لاوەکیانە دروستی کردووەو ئاراستەیان پێداوە! ئەمە ئەگەر واز لەوەش بێنین کە ئەم شتانە هەر لە بنەڕەتەوە چەند راستیان تێدایەو چەندیشیان پێداویستی شەڕی فکری و ئایدیۆلۆژی و سیاسی دروستی کردوون و واز لە حیکایەتی ئەو فەزایەش بێنین کە سەردەمانێ مێشکی ئێمەی بەم تەفسیرە سادانە ماندوو دەکرد کە ئەگەر لێکۆڵەرەو رۆشنبیری گەلێکیتر ئاگاداری ئەم تەفسیرە نوکتە ئامێزانە بن بۆ مێژوومان گومان لەجدیەتی سەراپای ناوەندە فکرییە کوردیەکە دەکات.

هەموو ئاگامان لێیە لەنەوەتەکاندا و بەتایبەتیش لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا یەکێ لەپڕوپاگەندەکان ئەوەبوو کە ئەگەر ئیسلامیەکان دەنگ بەدەست بێنن و سەرکەون، ئەمریکا وازمان لێ دەهێنێ تەنانەت هەندێ لەوەش تێیان دەپەڕاند و دەیانوت ئەگەر ئەم ئیسلامیانە نەبوونایە ئەمریکا زۆرشتی بۆ کورد دەکرد من رۆژانێ لەم رووەوە بە برادەرێکم وت عەزیزم واچاکە ئەم لێکدانەوەیە نەبێتە دۆگما چونکە لەبنەڕەتەوە ئەمە لێکدانەوەیەکی سیاسیانەیە کە ململانێی نێوان تەوژمەکان لەناوخۆدا دەیخوازێ دەنا خۆ

لەدەیان ساڵی رابردوودا و لەگەرمەی شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکاندا ئیسلامیەکان وەك هێز و تەوژمی سیاسی هەر لە ئارادا نەبون، ئەدی بۆچی خۆرئاوا و ئەمریکا هیچیان بۆ کورد نەکرد؟، بارزانی رەحمەتی بە ئەمریکیەکانی دەوت: ئەگەر ئێوە راست دەکەن لەگەڵ ئێمە و تاسەر پشتیوانیمان بکەن ئەوەندە ئامادەین بۆدۆستایەتی کردنتان تەنانەت ئامادەین کوردستان بکەینە ویلایەتی (٥١)ەمینی ئەمریکا، بەڵام سەرەڕای ئەوە شۆڕشی ئەیلولیان بەو دەردە برد کە هەمووما‌ن دەیزانین خۆئێستا پەکەکە چەپێکی توندڕەون و لەدوورونزیکەوە پەیوەندیان بە ئیسلامییەوە نیە هەڵگری ئاڵای کێشەیەکی رەواشن، کە کێشەی گەلی کوردە لەتورکیا ئەدی بۆچی ئەمریکا نەك یارمەتیان نادات بەڵکو دژایەتیشیان دەکات؟

لەبەرئەوە هەڵوێستی ئەمریکا لەسەر بەرژەوەندیەکان وەستاوە نەك شوناس و ئایدیۆلۆژیایی هێزەکان راستە ئایدیۆلۆژیاش هەندێ کاریگەری هەیە بەڵام بنەڕەتی نیە ئەمریکا یارمەتی موجاهیدانی ئەفغانی دەدا لە کاتێکدا هەموو دەزانین هەڵگری چ ئایدۆلۆژیایەك بوون.

هەمووما‌ن هەست بەوە دەکەین کەلێکدانەوەی ماڵوێرانی و شکستەکانی کورد بە ئیسلام راکردنە لە لەتەفسیرێکی راستەقینەو دیاریکردنی هۆکارەکان، دەبێ نەهێڵین باسی ئیسلامییەکانیش بەو جۆرەی لێ بێت و رۆڵی سەلبی هەندێ ئیسلامی ئەوەندە گەورە بکرێت لێپرسراوێتی گەورەی هێزە ناسیونالیستەکان لەدروستکردنی شکست و نائومێدی و لاوازیەکان لەبیربەرێتەوەو پەردەپۆش بکات.. هەرکەس و لایەنێ چەند رۆڵی

سەلبی یاخود ئیجابی گێڕاوەو دەگێڕێ بێ (تهویل)کردن و بەشێوەیەکی بابەتی بڵاویکرێتەوەو باس بکرێت.

گەرجارێکیتریش بێینەوە سەر ڕەهەندەکانی پرسیارەکەی ئێوەو باسی جەدەلیەتی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزمی کوردی بکەین دەتوانین بڵێین ئیسلام بەپێچەوانەی ئەو دیدە تەقلیدیە دژی ئیسلامییەی لەناو ناوەندە فکریەکەدا لەرابردوودا هەستی پێکراوە، هەروەك كاك مەریوان وریا قانیعیش لەوتارێکی خۆیدا ئاماژەی پێ کردووە خزمەتی بەرچاوی بەم ناسیۆنالیزمە کردووە، هەروەك كاك مەریوان بۆی چووە ئیسلام لە ڕێی تۆڕە ڕێکخستنە تەقلیدیەکانی خۆی لەکوردستاندا کەمەبەستی ڕێبازەکانی سۆفیگەرییە هەروەها لە ڕێگەی هەندێ بەهای خۆی لەوێنەی عەدالەتخوازی و ستەم ڕەتکردنەوەو... هتد، خزمەتی بەبونیادی ناسیۆنالیزمی کوردی کردووە ئێمە سەیردەکەین لەکاتێکدا هێشتا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەوری خۆی هەبوو و هەستی ئایینی خەڵکی بەهێزبوو ڕێبەرێکی مەزنی وەك شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری سەرهەڵ دەدات کە هەندێ بەباوکی نەتەوایەتی کوردی دەزانن، ئەم پیاوە مسوڵمانیەتی و پێگە ئایینیەکەی ڕێگەی ئەوەی لێ ناگرێ بڵێیت ئێمە لەگەڵ تورك و فارسەکان لەزمان وداب و نەریت و ئایینیشدا جیاوازین (مەبەستی مەزهەبە ئایینیەکەیە چونکە کورد زۆریەی شوێنکەوتەی شافیعین لەکاتێکدا مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەتی عوسمانی حەنەفی و فارسەکانیش شیعە بوون) هەروەها ڕێگای ئەوەی لێ ناگرێ شۆڕش بکات و هەوڵی پێکەوەنانی مەملەکەتێکی کوردستانی بدات.

دوای ئەوەش وەك دەزانین هەر لە بنەماڵەی بارزانیەکانەوە بگرە تا شێخ مەحمودو شێخی پیران و قازی محەمەد ڕەمزە ئایینیە میللیەکان ڕێبەری شۆڕش و ڕاپەڕینە

کوردیەکان بوون هەر ئەوان بوون راپەڕیون و داوای سەربەخۆی کوردستان و مافە نەتەوایەتیەکانی کوردیان کردووە.

پێگە جەماوەریەکەی شۆڕش هەمیشەو تاکۆتایی شۆڕشی ئەیلول و تەنانەت تا رادەیەك تا ئێستاکەش هەر جەماوەرە مسوڵمانە رەشورووتەکە بووە، راستە نوخبەیەکی تیابووە کە رەنگە نەك هەر ئیسلام لەپشت ئاراستەکردنیەوە نەبوویێ، بەڵکو پێی وابوو بێت ئیسلام رۆڵی سیلبیش لەکوردستاندا دەگێڕێ، بەڵام ئەم بەشە زیاتر لەئۆرگانەکانی سەرکردایەتی و راگەیاندن و هەندێ ئۆرگانیتردا دەوریان بووە، بەدەست لەبیرمانە یاخود بۆمان دەگێڕنەوە کە چۆن پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول زۆرجار بەسەڵاوەت لێدانەوە هێرشیان دەکردە سەر مۆڵگەو هێزەکانی رژێمی بەعسی، راستە لە چلەکانەوە بەدەرکەوتنی بیروباوەڕی چەپ و فۆرمە نوێکانی رێکخستن لە کوردستاندا و ئاڵوگۆڕ کردن لەشوێنگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی نوخبەکاندا، رۆڵی ئیسلامیش لە ئاراستەکردنەکانی شۆڕشەکان و بزوتنەوەی کوردایەتیدا لاواز دەبێت بەتایبەتیش لەئاستی سەرکردایەتی و ئاراستە فکریەکاندا و بزوتنەوەی کوردایەتی مۆرکێکی عەلمانی بەخۆیەوە دەگرێت، بەڵام ئیسلام هەر وەك ئاماژەمان پێکرد وەك بەشێکی گرنگ لە فەرهەنگ و شوناسی تاکی کوردی بنکە جەماوەریەکەی شۆڕش رۆڵی خۆی لەسازدانی فەرهەنگ و شەرعیەتدان بەخەباتە کە لە ئاستێکیشدا بوو بێت ون نەکردوە، ئەوە جگە لەوەی کە باوەڕە ئاینیەکانی خەڵك لە کاتی تەنگانەو نارەحەتی و لێقەوماندا هەروەها لەکاتی دەست لێبەردانی هەموو دونیا داو بەتەنها مانەوەی کورد لەمەیداندا بەرامبەر بەدوژمنێکی دڕندەو بێبەزەیی، لەرووی سایکۆلۆژیەوە رۆڵی دڵدانەوەی خەڵك و بەرگە گرتنی ئازارەکان و سکاڵا بردنە لای پەروەردگار و نائومێد نەبوونی یەکجارەکی بینیوە،

لەلایەکی‌ترەوە ئیسلام بەو تێکەڵاوبوونەی هەیبووە لەگەڵ فەرهەنگی کوردیدا ڕۆڵی خۆی هەبووە لەوەی ئەم فەرهەنگە بەرامبەر شاڵاوی دوژمنەکانی بۆتواندانەوەو لاوازکردنی کەسیەتی مەعنەوی کورد لە ئاستێکدا بپارێزێت یاخود ڕاستتر بڵێین بەشدار بێت لەو پاراستنەدا ئیسلام بەتایبەتیش لەعێراقدا ڕۆڵی هەبووە لەوەی شەڕی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی کورد دژ بە کورد نەبێتە شەڕی ئەهلی و شەڕی هەموو عەرەب دژ بە هەموو کورد وەك لەهەندێ شوێنی وەك بۆسنەو ڕەوەندا بینیمان، بۆیە من خۆم گەرچی بیرێکی ئیسلامیم هەیە، بەڵام پێم وایە واقیع پێمان دەڵێ کە ئیسلام ئەو ڕۆڵە نێگەتیڤەی، لەسەر ناسیۆنالیزمی کوردی نەبووە بەڵکو ئیسلامی میللی هەمیشە ئەو ناسیۆنالیزمەی لەباوەش گرتووە.

مسوڵمانبونی زۆرینەی گەلی کورد نەبۆتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی خەڵك لەناو ریزەکانی کوردایەتی و شۆڕشدا چەك هەڵبگرن و بەرگری لەماف و کەرامەت و ژیانی خۆیان بکەن و هەزاران شەهید لەو پێناوەدا پێشکەش بکەن.

ئێمە لەکوردستاندا لەرابردوو و ئێستاداو لەسەرانسەری سەدەی بیستەمدا کە بەسەدەی ناسیۆنالیزمی ڕۆژهەڵات دادەنرێ لەکوردستاندا تەوژمێکمان نەبینوە لەمیانەی بەرەورووەستانەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی و خەباتی گەلی کوردستان بۆ ئازادی و سەرفرازای شکڵ و شێوەو شوناسی خۆی وەرگرتبێ و لەئیسلامەوە شەرعیەتی وەرگرتبێ و ڕژێمی بەعس و ڕژێمەکانی پێش ئەویش بەکاریان هێنابێ.

بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی دامەزراوە تەقلیدیە ئایینیەکانی کوردستان لەرابردوودا لەریزی شۆڕشدا بوون بوونی کەسانێکی تاك و تەرا لێرەو لەوێ لەژێر باڵی بەرگی

مەلایەتی و شێخایەتییەوە پێچەوانەی ئەمە جولاًبنەوە ئەو هێڵە گشتییە ناسرێتەوەو رۆژێ لە رۆژانیش دیاردەیەکی لەوجۆرە نەبووە بەتەوژم و خەڵك لەدەوری کۆببێتەوە.

گەر سەیری ئەو دەیان هەزار جاش و چەکدارەی رژێمیش بکەین کەلەمێژووی هاوچەرخی کوردی ئەم پارچەی کوردستاندا دروست بوون دەبینین لەدوورونزیکەوە ئیسلام دەخالەتی نییە بەدیاردەکەوە بەڵکو رژێم ناکۆکی عەشیرەتی و عەقڵیەتی خێڵەکی و بەکارهێنانی فشارو زۆرو تەماع نانەبەرو بزواندنی غەریزە سەرەتاییەکانی مرۆڤ و هەندێ شتی‌تری بەکار هێناوە بۆ دروستکردنی جاش و خەڵکی دژە شۆڕش، بەپێچەوانەوە دیاردەی جاشایەتی لەمێژووی هاوچەرخی کورددا جگە لەوەی راستەوخۆ لەخزمەت ستراتیژیەتی دەسەلاًتی عەلمانی توندڕەوی نەتەوەی باڵادەستدا بووە لەفۆڕمی بەعسیزمدا، دژی بەهاکانی ئیسلام و کوردەواریش بووە لەرووی ئەخلاقیی فەردیشەوە بەپێوەرە ئیسلامییەکە ئاماژە بووە بەناپابەندی ئایینی کەسەکان و گوناهکاری و فەوزاو روخاویی ئەخلاقیی.

ئەگەر ئێستاش لەکوردستادا ریفراندۆمێك بکرێت بۆدیاریکردنی پەیوەندی کورد بەبەشەکەی‌تری عێراقەوەو لە تورکیاو ئێران و سوریاش بەهەمان شێوە سەربەخۆییش (خیار)ێك بێ لە بەردەم جەماوەردا من دڵنیام خەڵکە مسوڵمانەکە واتە جەماوەری کوردستان کەزۆرینەی هەرەزۆری مسوڵمانە رەنگە (٩٠٪) زیاتریان دەنگ بۆ سەربەخۆیی کوردستان بدەن بێگومان بەئیسلامیەکانیشەوەو ئیسلامییش هیچ رێگرنابێ لە بەردەم ئەو پرۆسەو بەدیهێنانی ئەو خواستەدا چونکە مەسەلەی خۆڕێکخستنی سیاسی و فۆرم و دیاریکردنی پەیوەندییەکان لەو چوارچێوەیەدا لەدیدی ئیسلامییەوە

بەجێهێلراوە بۆگەشەسەندنی کۆمەڵگاکان و بەرژەوەندی گەلان و ژیانیان لەسایەی ئازادی و یەکسانی و دەرچوونیان لەستەم و چەوساندنەوەو بەدیهێنانی هاوکاری و برایەتی نێوانیان بەڵام لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەخاڵێ بکەم ئەویش ئەوەیە کە پەراوێز خستنی ئیسلام لەچلەکان بەدواوە لەگوتاری شۆڕش و دیاریکردنی سیاسەتەکان و سازداندا گەر هۆکارێکی بابەتی لەپشتەوە بێت ئەوەیە کە بەرامبەرەکانی کورد واتە ئەو ناسیۆنالیزمانەی کوردیان چەوساندۆتەوە واتە ناسیۆنالیزمی عەرەبی و تورکی و فارسی ناسیۆنالیزمی چەند گەلێکی مسوڵمانان بوون لەپاڵ سەرهەڵدانی نوخبەیەکی نوێی کوردی کە بەدەر لە مەسەلەی ناسیۆنالیزم بڕوای بەهیچ شێوازێك لەرۆڵبینینی سیاسی و نەتەوەیی ئیسلام نەبووە واتە رێبەرایەتی شۆڕشی کوردی و نوخبە دەست رۆیشتووەکە بەحوکمی دیدگا ئایدیۆلۆژیەکانی نەیویستوە رەهەندە ئیسلامیەکەی کەسێتی کوردو کۆمەڵگای کوردی بەشێوەیەکی مەنهەجی لەخزمەت وەدیهێنانی ئامانجەکانی خەڵکدا وەگەڕخات. گەرچی لەزۆر کاتیشدا سوودی لە قورسایی مەعنەوی زانایانی ئاینی کوردستان بەقازانجی شۆڕش وەرگرتوە..

لەبەرئەوە گەر کەسێتی کورد لەپاڵ ئینسانی بووندا دوو رەهەندی سەرەکی هەبووبێ کە ئەویش رەهەندی کوردبوون و مسوڵمان بونە زۆرجار تەنها رەهەندە کوردیەکەی دوێنراوەو هەوڵی زیندوکردنەوەو چالاککردنەوەی دراوەو تارادەیەکی بەرچاو رەهەندە مسوڵمانێتییەکەی ئەم کەسێتییە فەرامۆش کراوەو هەوڵنەدراوە چالاك بکرێتەوە بۆیە چالاکییەکانی ئەم رەهەندە لەئاستە فەرهەنگی و عاتفی و فکریەکەدا وەستاوە، چونکە ئەم کەسێتییە کەئیسلام رەسەنە لەپێکهاتنیدا لەکاتێکدا ئامادەبووە بەسیفەتی کورد بونی بچێتە ناو کورەی خەباتێکی نەتەوەیی سەختەوە بەمەبەستی پارێزگاری کردن

لەشوناس و رزگاری و ئازادی و خوشگوزەرانی پێی وانەبووە بەم کارەی وازی لەمسوڵمانیەتیەکەی هێناوە، ئەی کەواتە بۆچی ئەو روەی کەسێتییەکەشی بەکارنەهێنراوە بۆ ئەوەی سەرجەم کەسێتی و بونیادە کوردیەکە لەئاستێکی بەربلاوتر بێتە مەیدان لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکاندا؟ دیارە بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئاراستەی فکریی ئەو نوخبەیەی باسمان کرد کە دیدگا ئایدیۆلۆژیەکانی لەم روەوە رێگای پێ نەداوە ستراتیژیەتەیتێکی لەوچەشنە پەیرەو بکات، چونکە ئەگەر ئامانج بەرەوپێشردنی رەوتی ناسیۆنالیزمی کوردی بێت چالاککردنی ئەو رەهەندە، ئیزافەیەکی سودبەخش دەبێ کە خزمەت بە تەبایی کۆمەلایەتیش دەکات و رێ لەوە دەگرێت هێزێك یاخود تەوژمێك خۆی بەنوێنەری ئیسلامیی لەناو کۆمەڵگادا تەرح بکات و کار لەسەر ئەم لایەنە فەرامۆشکراوە بکات هەربۆیە ئێمە دەبێ بۆ دەستنشانکردنی هۆیەکانی لاوازی (انتما)ی ناسیوناليستانەی مرۆڤی کورد بەو ئەندازەیەی کەهەیەو نەخۆشی و ئیکشالیەتەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە پانتاییەکی بەرینترو فراوانتردا بگەڕێین و تێرامان و لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونمان هەبێت.

با دووبارە بگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزمی کوردی و بیرۆکەی جیاوازبوون و ئەو بەرەنجامانەی لەو رووەوە کەوتونەتەوە یاخود دەکرێ بەبەرنجامی لۆژیکی لەقەڵەم بدرێت دەوترێن (ئاین) رەگەزێ نەبووە بۆ قوڵکردنەوەی هەست بەجیاوازبوون لەناو کورددا لە بەرامبەر نەتەوەکانی دەوروبەریدا.

ئیسلام وەك ئاینی زۆرینە ئامرازێکی لێکچواندن بووە نەك جیاوازی دروستکەر، کە ئەم مەسەلەیە بۆ نەتەوەکانیتر بەپێچەوانەوەیەو ئەوەش وایکردووە (ئاین) لەو

ناسیۆنالیزمانەدا لەوانەش ناسیۆنالیزمی عەرەبی رەگەزێکی سەرەکی و گرنگ بێت، چونکە شوناسی ناسیونالیستانەی ئەو ناسیۆنالیزمانە لە بەرامبەر ئەوێکی ئاینی جیاوازەوە درستبووە کە ئەویش بریتی بووە لە کۆلۆنیالیزمی خۆرئاواو ئاینی مەسیحی، دیارە بە ڕای من ئەم لێکدانەوە یاخود خوێندنەوە بۆ دیاریکردنی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ناسیۆنالیزم راستی تێدایە، بەڵام پێم وایە هەموو راستییە کە هەر ئەوەندە نیە ئەم بۆچوونەش ئەوەندەی ئاگاداربم بۆتە بۆچوونێکی تەقلیدی ناوەندە فیکرییەکە لەرابردوودا.

ئەوە راستە بەهۆی هاوئاینی کورد لەگەڵ ئەو نەتەوانەی لەناوچەکەدا دەرگیربووە لەگەڵیاندا لەوانەش عەرەب ـ کەراستر وایە بڵێین بزوتنەوەی نەتەوایەتی ئەو نەتەوانەو لەوانەش عەرەب هۆکارێ بووە لەوەی ئیسلام لەسیەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم بەدواوە نەبێتە رەگەزێکی بەهێزو باسکێکی ئەستووری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی، بەوجۆرەی لەهەندێ شوێنیتری دنیاو ناسیۆنالیزمیتردا دەبینرێت لەوێنەی فەلەستین، کشمیر، شیشان، بۆسنە..هتد، کە لەو شوێنانەدا بەهۆی جیاوازی ئاینییەوە بەیەکداچوونێکی قوڵی ئیسلام و شوناسی میللی دەبینرێت ئیسلام رۆڵێکی گەورەی سازماندەیی و مەیدانی و شەرعیەتپێدان دەگێڕێت.

هەروەها ئەوەش راستە کە مسوڵمان بوونی گەلانی دەوروبەر کەناسیۆنالیزمەکانیان کوردیان چەوساندۆتەوە لەرابردوودا بۆتە هۆی ئەوەی جۆرێ لە رق هەڵسان و دوژمنایەتی کردنی ئیسلام لەناو بەشێ لەنوخبە سیاسی و فکرییە کوردیەکەدا سەرهەڵ بدات، بەڵام لەدوای ئەم بەشەوە دەبێت هەڵوێستەیەکیتر بکەین چونکە رەهەندەکانی

پرسەکە لەمەدا کورت نابێتەوە بەڵکو پێویستە لەپاڵ ئەم راستیەدا ئاماژە بەچەند خاڵێکیتر بکەین لەوانەش:

* جێگرتنەوەی (انتما)ی نەتەوەیی بۆ (انتما)ی ئایینی لە ئەزموونی خۆرئاوادا دەبێت لە سیاقە ئەوروپیە مێژوویەکەدا تێی بگەین، چونکە کاتێ لەخۆرئاوادا دەوڵەتی نوێ (ناسیونالیستی) لەحاڵەتی فۆرمۆڵەبووندا بوو، کەنیسەی مەسیحی خاوەنی سیستمی یاسایی، قانونیی خۆی بوو. (انتما) بۆ کەنیسە یەکسان بوو بە (انتما) بۆ فۆرمێ لەئیدارە و یاساو رێکخستنی سیاسی و کۆمەڵایەتی کەلەپەیکەری کەنیسەدا بەرجەستە دەبوو، دیارە هیچ دەوڵەتێکی نەتەوەیی رازی نابێت دەسەڵاتێکی دەرەوەی دەسەڵاتی خۆی لەرێکخستنی ژیانی سیاسی و یاسایی و کۆمەلایەتی و سیستمی پەروەردەو فێرکردندا دەوری هەبێ و دەسەڵات لەگەڵ ئەمدا بەش بکات، لەبەرئەوە ئەو جێگرتنەوە لەوێ زەرورەتێکی دروستبوونی دەوڵەت بوو، بەڵام لەئیسلامدا ئێمە لە بەردەم گرفتێکی لەو چەشنەدا نین، رێکخستنی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسایی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی و جیهان و مسوڵمانان بەگشتی بەشێ نییە لە جەوهەری دینەکە بەڵکو نەزعەیەکی ئەوەو ئەنجامدانی بەجێهێلراوە بۆ بەرژەوەندی ئەو گەلانە خۆیان، بۆیە ئەزموونی ئیسلامی دەکرێ لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی مۆدێرنیشدا مومارەسە بکرێت چونکە (انتما) بۆ ئیسلام (انتما)یە بۆ بیروباوەڕ مەنزومەیەکی قیەمی و جیهانبینی نەك پەیکەر و رێکخستنێکی ئیداری دیاریکراو لەبیریشمان نەچێ شەڕی ئاین لە ئەوروپادا پێش ئەوەی بەناوی ناسیۆنالیزمەوە بکرێت بەناوی زانست و ئازادی و (اعتبار) گێڕانەوە بۆ ئینسان واتە بۆ ژیانی دنیاو جەستەو.. هتد بەرپاکراوە، ئەو شەڕە

رۆشنگەرە گەورەکان کردیان کەهەندێکیان باوەڕیان بەهاوولاتیی گەردوونی هەبوو نەك ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی نەتەوەیی.

*راستە لەبەرنەبوونی جیاوازیی ئایینیی ئیسلام نەبۆتە رەگەزێکی گرنگی ناسیۆنالیزمی کوردی هەر چەندە ئەم نەبوونە هەموو بەوە لێکنادرێتەوە بەڵکو بەشێکی بەهۆی هەژموونی ئایدیۆلۆژیا زاڵەکەی ناوەندی فکری و سیاسەکەوە بووە کە هەڵوێستی بەرامبەر ئاین وەکو ئاین سەلبی بووە کە ئەویش وەك دەزانین مارکسیزم بووە، بەڵام ئەوەی ئیسلام نەبووە بەئیزافەیەکیتر بۆ ناسیۆنالیزمەکەو رەگەزێکی هێز جیایە لەوەی بوترێت دژایەتی کردووە یاخود بزوتنەوەیەکی ئاینی پێچەوانەو دژ بەئامانج و خواستەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لەئارادابووە، مێژووی هاوچەرخی ئێمە بەتاڵە لەبزوتنەوەیەکی لەوجۆرە، بەپێچەوانەوە دامەزراوە دینییە تەقلیدیەکە لەکوردستاندا زۆرجار ژێرخانی بزوتنەوە ناسیونالیستەکە یاخود بڵێین بەشێ لەو ژێرخانەی پێکهێناوە، هەمیشەش بنکەی شۆڕش و ناسیۆنالیزمەکە خەڵکە مسوڵمانە رەش و روت و رەنجبەرو گەداو جوتیارو پاڵەو کاسبکارە کوردەکە بووە بەتایبەتیش پێکهاتەی لەشکرە چەکداریەکان و بازووی بەرەنگاربوونەوەی شۆڕش.

*ئەم مەسەلە دەبێ لەدیوێکیتریشەوە سەیر بکرێت واتە ئەگەر بەهۆی نەبوونی جیاوازی ئاینی ئیسلام رۆڵێکی تەییارکردنی گەورەی بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی نەبینوە بێگومان دەڵێین رۆڵێکی تەییارکردنی گەورە دەنا بەهاو هەناسەکانی لەناو جەماوەرەکەدا کە تێکەڵ بەفەرهەنگی میللی خەڵك بووە هەمیشە ترخمێ بووەو دەوری خۆی بینیوە.

بەڵام باواز لەمە بێنین و بڵێین ئەگەر لەو رووەوە بەگوێرەی پێویست ئامادە نەبووە ـ کە دیارە ئامادە نەبوونەکە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی دواتر رێبەرایەتی شۆڕش دەکەن کە ئەم خیارە فەرامۆش دەکەن یاخود لانیکەم کارلێکی لەگەڵدا ناکەن ـ بەڵام لەوە بترازێت ئیسلام و بەهاکانی و هەستی مسوڵمانانەی خەڵك بەجۆرێکیتر خزمەتی ناسیۆنالیزمی کوردی کردووە، ئەویش لەوسۆنگەوە کەلەروانگەی ئیسلامەوە کوردو عەرەب و فارس و تورك و هەموو گەل و نەتەوەیەك یەکسانن هیچ نەتەوەیەك رێزی نییە بەسەر نەتەوەیەکیترەوە، جیاوازی رەگەز، زمان و رەنگ تەرازووی رێزپێدان نین، ئەم بەیەکسانی سەیرکردنەش شەرعیەت دەدا بەداخوازییە نەتەوەییەکانی کورد واتە مسوڵمانێکی کورد هەر لەروانگەی خودی ئەو پرنسیپە ئیسلامیانەی سەرەوە دەتوانێ بڵێ: ئەگەر پێوەر ئیسلام بێ ئەوا بەو ئەندازەی عەرەب و فارس و تورکێ مافی دروستکردنی دەوڵەت و قەوارەی نەتەوەیی و بواژندنەوەی زمان و فەرهەنگ و کەسێتی مەعنەوی خۆی هەیە، منیش هەمەو ئەگەر دژایەتی کردنی ناسیۆنالیزمی کوردی و داخوازییە رەواکانی گەلی کوردستان لەسەربەخۆیی و ئازادی و لەستەم بەدووری بەرگیکی ئاینی لە خۆگرتبوو ناسیۆنالیزمی کوردی دەتوانێ بەهەمان لۆژیکی ئیسلامی سەرەوە هەموو شەرعیەتێکی ئاینی لەو دوژمنایەتیی کردنەدا بڕنێ و سیما دزێوو شاراوەکانی ئەو فاشیزم و ناسیۆنالیزمە داخراوو کۆنەپەرستە بخاتە روو کەلەپشتی ئەوەوە کاری خۆیان دەکەن.

*راستە ناسیۆنالیزم کار لەسەر بیرۆکەی جیاوازبوون دەکات، بەڵام ئەم جیاوازییە هەمەلایەنەو سەراپاگیر نییە، چونکە بیرۆکەی جیاوازبوون وەك دەزانین لەکاتی زیادەڕەوی کردن تێیدا فاشیزم و نازیزم و بەربەریەتی ناسیونالیستانەی خولقاندووەو

دەخولقێنێ، بۆیە ناسیۆنالیزم بۆ ئەوەی بخەملێ پێویستی بەوەنیە لەهەموو وردو درشتێکدا لەگەڵ بەرامبەرەکاندا جیاوازبێت بەڵکو زیاتر ئیش لەسەر جیاوازی زمان و فەرهەنگ و نەژادو بەیەکەوە بوونی سیاسی و مەسەلەی لەم جۆرە دەکات هەڵبەت ئەگەر جیاوازی ئاینیش لەگۆڕێدابو و هەستی کرد تەوزیف کردنی خزمەت بەستراتیژەکانی ئەم دەکات کار لەسەر ئەویش دەکات بەڵام (جیاوازی ئاینی) مەرجێکی دروستبوونی ناسیۆنالیزم نییە دەنا دەبوو لەخۆرئاواشدا نەتەوە کاتۆلیکەکان نەیانتوانیایە ئەزموونی ناسیونالیستانەی جیاواز بەرهەم بێنن و مەسەلەکە سەبارەت بەجیهانی ئیسلامیش هەربەهەمان شێوەیە. ئێمە دەبینین بیرۆکەی مافەکانی مرۆڤ لەسەر تێپەراندنی ئەو جیاوازییە دروست بووە واتە مرۆڤ بەحوکمی مرۆڤ بوونی بەدەر لە جیاوازی ئاینی و نەتەوەیی و رەگەزیان لەو مافانە بەهرەمەند دەبن.

گەلان بەو ئەندازەی پێویستان بەهەستکردن بەتایبەتمەندی و جیاوازی شوناس و هۆشیاربوون بەرامبەر بەو جیاوازبوونە هەیە بەهەمان شێوەو زیاتریش پێویستیان بەدۆزینەوەی زەمینەی هاوبەش و (مشترکات)ی ژیاری و فەرهەنگی هەیە بۆ لەیەکتر تێگەیشتن و هاوکاری و هاریکاری یەکتر لەپێناو خێرو خۆشی هەموان و مرۆڤایەتیدا، بۆ ئەوەی ئەوهەست بەجیاوازیکردنە سەرنەکێشێ بۆ هەوڵدان بۆ سڕینەوەی بەرامبەرەکان و نکوڵی کردن لەماف و شوناس و شکۆو ئازادیان لەناوچەی ئێمەشدا (ئیسلام) دەتوانێ یەکێ لەو توخمانە بێت ئەو رۆڵە ببینێ، رۆڵی دروستکردنی پەیوەندی و لێکتێگەیشتن و قبوڵکردنی یەکترو رەخساندنی زەمینەیەك بۆچارەسەری گرفتەکان و گێڕانەوەی مافەکان و سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ستەم لە پەیوەندیەکاندا، بەبیروڕای من یەکێ لەگرفتەکانی ناوچەکەش ئەوە بووە لەسەد ساڵی رابردوودا رۆڵی ئیسلام لەکایەی

سیاسەت و گەڕان بەدوای چارەسەرەکان و سەیرکردنی پەیوەندیەکاندا ڕۆڵێکی پەراوێزخراوبووە.

دەنا دەیتوانی هۆکارێ بێ لەوەی هەندێ سەرەڕۆیی و وەحشیگەری نەتەوەیی لەناو ناسیۆنالیزمە باڵادەستەکانی ناوچەکەدا دروست نەبێت، هەڵبەت خوێندنەوەیەك لە ئیسلام لەپشتیەوە دیدێکی ناسیۆنالیستانە و بەرچاوتەنگانە ئامادەنەبێ کە ئیسلام تەنها وەك ڕووپۆشێ بەکاربێنێ.

مەبەستمە بڵێم کاتێ چارەسەری کێشەی ئێمە پێویستی بە لەیەکتر تێگەیشتن دەبێ لەگەڵ گەلانی دراوسێدا بەدڵنیاییەوە ئیسلام ڕۆڵێکی ئیجابی دەبینێ لەدیاریکردنی ئەو (مشترکات)انەی نەتەوە مسوڵمانەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و کێشەکانیش لە چارەسەرنزیك دەکاتەوە.

هەڵبەت ئەگەر بڵاوبوونەوەی دیموکراسی کارێك بکات گەلانی ناوچەکە وەکو گەل بەشداری لەدیاریکردنی پەیوەندیەکان و چارەسەرەکاندا بکەن و مەسەلەکە هەمووی بۆ نوخبە تەقلیدییە دەسەڵاتدارەکان بەجێ نەهێلرێ تا ئەم مەسەلەیە رونترو کاریگەرتر بێت.

بەحوکمی ئەوەی زمانی ئیسلامی هێشتا ئەو زمانەیە لەپانتاییەکی فراوانی جەماوەریدا ئامادەیی هەیە بۆ گوێگرتن لێی واتە تەرحکردنی داواکردنی مافەکان و چارەسەرکردنی گرفتەکانە بەزمانێك کە گەلانی ناوچەکە هەموویان وەك یەك لێی تێبگەن.

*خاڵێکی‌تر که پێویسته لەم میانەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە ئەگەر (ئیسلام) له (٥٠) ساڵی رابردووی مێژووی ناسیۆنالیزمی کوردیدا رۆڵی گەورەی نەبینیوه مەرج نییه تاهەتایه بەوجۆره بمێنێتەوه بەڵکو ئێستا بەهۆی بوونی تەوژمێکی ئیسلامی کوردستانییەوه دەتوانرێ ئەو رەگەزەش بەشێوازی جۆراوجۆر تێکەڵ بەناسیۆنالیزمەکه بکرێت و ئەم رەهەنده بەشێوەیەکی جددی بەکاربهێنرێ که پێم وایه هێزێکی وەکو یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان، لەئێستادا تارادەیەك ئەو دەوره دەگێرِێ کە دەکرێ لەداهاتوودا ئەو دەوره زیاتریش پەرەبسێنێ که ئەمەش بەنده بەئاستی ستراتیژی بیرکردنەوەی نوخبەی سیاسی کوردو توانای لەخۆگرتنی بۆ سەرجەم وزەو تواناکان لەسەره رێی خەباتی هەمەلایەنەدا بۆگەیشتن بەمافەکان و چەسپاندنی بنەماکانی دادپەروەری و یەکسانی گەلانی ناوچەکەو لەگۆرِانی نابەرامبەری و ستەم و چەوساندنەوەی نەتەوەیی.

بۆیه ئێمه بۆ دەستنیشانکردنی ئەو هۆکارانەی کاریگەربوون لەسەر پێدانی سروشت و ناوەرۆکێکی تارادەیەکی بەرچاو شێواو کەمن لەنوسینێکمدا لەگۆڤاری هەژان بەپێناسەکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی بەناسیۆنالیزمێکی لەناکاو (راپا) هەندێ جاریش (نائومێد) گوزارشتم لەم حاڵەته داوەتەوه به ئیسلام تەفسیر ناکرێ وەك بەشێکی بەرچاو لەنوخبه کوردیەکه لەماوەی رابردوودا ویستویەتی بیکات، واته ویستویەتی هەرچی ماڵوێرانی و کارەساتی کورد هەیه ببەسێتەوه بەئیسلام و لەحزەی مسوڵمان بوونی کوردەوه !

لێرەدا خراپ نییه ئاماژه بەوه بکەین ئەم هەوڵدانه بۆ تەفسیرکردنی شکست و سەرنەکەوتنەکانی کورد بەئیسلام و ئاینی زۆرینەی کوردەوه جگه لەوەی بەڵگەیه

لەسەر هەژارییەکی مەعریفی و مەنهەجی گەورەو بێکەرەسەیی لەخوێندنەوەی واقیع و مێژووی کوردیدا لەهەمان کاتدا دەرخەری ئەو تاکتیکانەیە کەئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو گرتوویەتیەپێش بۆ بەدیهێنانی ئامانجە فکری و سیاسیەکانی، بێگومان ئەم حاڵەتە لەرابردوودا لەبواری فکریدا نیمچە تراژیدیای ناوەتەوە، چونکە ئێمە سەیر دەکەین ئایدیۆلۆژیا زاڵەکە کەزیاتر مارکسیزم بووە کە بەناوی کوردایەتیەوە شەڕی بەشێ لەناسیۆنالیزمی کوردی و توخمەکانی کردوە، ئاخر ئەگەر وانیە دەبێ ئەو هەموو سوکایەتی و بێحورمەتیە بەرەمزە مێژوویەکانی کورد لە (صلاح‌الدین)ی ئەیوبییەوە بگرە تا شێخ محمود تەنانەت دوای ئەویش بەچی لێکبدەینەوە؟ ئایا ناسیۆنالیزمێ هۆشیاربێ بەئەرکەکانی خۆی دەرك بەوە بکات مێژوو سەرچاوەیەکە بۆ دروستکردنی شوناس و هەست بەشانازی کردن و قووڵایی بەخۆبەخشین، مێژووی خۆی بەو دڕندەییەوە دەخاتە بەردەم هێرش و پەلامار کەتەنانەت هەندێ جار دوژمنەکانی ناسیۆنالیزمی کوردیش نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە لەسوکایەتی پێکردنی؟ ئایا ناسیۆنالیزمێ دیدێکی ناسیۆنالیزمانەی هەبێت دەکەوێتە تێکشکاندنی رەمزە مێژووییەکانی خۆی هەر لەبەر ئەوەی بەرهەمی مێژوویەکی هاوبەشی ناوچەکەو سەردەمی پێش وەردەرکەوتنی ناسیۆنالیزمن لەم ناوچەدا؟

هەموو دەزانین کە (صلاح‌الدین) وەك مەزنترین رەمزی مێژوویی کورد، ناسیۆنالیزمی کوردی دەتوانێ لەسەر ئاستی جیهاندا شانازی پێوەبکات کەچی لای هەندێ فەریکە ناسیونالیستەوە بە (خائن) و خزمتکردنی عەرەب و ئەم و ئەو لەقەڵەم دراوە وەك ئەوەی ئەو لەگەرمەی وەردەرکەوتنی فکرو مۆدێلی ناسیۆنالیستیانەدا ژیابێت و پشتی کردبێتە نەتەوەکەی؟ بیرمانە بەشێخ (مەحمود) دەوترا خولە قوپچەو زۆرن ئەو

سەرکردەو رەمزە کوردیانەی کە بەدەرەبەگ و رەمزی کۆنەپەرستی بە نەوەی نوێ دەناسێنران! ! ئەم هەوڵە بەشێ بوو لەکاری ئایدیۆلۆژیایەك کە پێویستی بەوشەپەبوو بۆخۆی کە لەدەرەوەی شوناس و بەرژەوەندی باس و خواسە نەتەوەییەکانەوە هەڵوێستێکی نێگەتیڤی نەگۆڕی بەرامبەر ئاین هەبوو جێی خۆشحاڵیە کە ئێستا خەریکە ئەم دیدە سادەیە بۆلێکۆڵینەوەی کارەسات و نەهامەتی و بەجێمانەکانی کورد جێگای خۆی بۆ دەیدەنێکی مەنهەجیتر و عەقلانیتر چۆڵ دەکات ناکرێ لەم نێوەندەشدا رۆڵی رەهەندیەکان لەیادبکرێت کە لە دیدێکی فکری رووتەوە دەوریان هەبوو لەپاشەکشەکردن بەوبۆچون و لێکدانەوە ئایدیۆلۆژییە کرچ و کاڵانەی جگە لە درێژەدان بەچەواشەکردن و خۆنەناسینی کوردو ناسیۆنالیزمەکەی شتێکیتری بەداوە نەبوەو نییە، ئێمە گەر بمانەوێ بەشێوەیەکی زانستی و لەدیدێکی پەرۆشەوە بۆ ئایندەی ناسیۆنالیزمی کوردی بەدوای ئەو هۆکارانەدا بگەڕێین کە لەرابردووی ناوچەکەو کوردستاندا لێپرسراو بوون لە لەقاڵبدانی خەونەکانی کوردو پەرتەوازەیی ناوماڵەکەی و درەنگ کەوتنی گەیشتنی کاروانی ئاواتەکانی و ئەو هەموو شکست و نەهامەتیەی مێژووی نوێ و هاوچەرخ لەم رووەوە بۆی تۆمار کردوین، دەبێ خوێندنەوەی لایەنگرانەو ئایدۆلۆژیایانە تێپەڕینین و هەر رەگەزەو توخم و هۆکارە چەند بەشداربووە لە خولقاندنی کارەساتەکاندا ئەوەندەی خۆی قەوارەی پێ بدەین.

من پێم وایە لەدوای هەموو ئەوەی کە ئاماژەمان پێکرد هێشتا ئەوە راستییەکی مێژووییە کە ئەگەر جیاوازی ئاینی هەبوایە بەدڵنیاییەوە ئیسلام رۆڵێکی چەند قاتی دەبینێ کە لەبەر نەبوونی ئەو جیاوازیە نەیتوانیوە بەو ئەندازە ببینێ، بەدەر لەمە هۆکاری دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە رێی بەزۆر

راپێچکردنی ئیسلام بۆ بەردەم دادگای مێژوو لێکنادرێنەوە، چونکە هەروەك لەسەرەتادا ئاماژەمان پێکرد ئیسلام بەهۆی رێکخستنە تەقلیدیەکانی خۆی و هەندێ لەبەهاکانی وەك عەدالەتخوازی و دژایەتی کردنی ستەم و یەکسانییەوە خزمەتی ناسیۆنالیزمی کوردی کردووەو، کارێکی نەکردووە خەڵك لەدەوری ئاڵای شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکان کۆنەبێتەوە یاخود ئێستا جەماوەر لە سۆنگەیەکی ئایینیەوە بە حوکمی موسڵمانبوونیان ئازادی و سەربەخۆیی و گەیشتن بەمافەکانی کورد رەتبکاتەوە.

من پێم وایە ماکی چارەرەشی و ناکاراییەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ جەبرەکان چوارچێوەی قەوارە نوێکان کە لەدوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە لە ناوچەکەدا دروست بوون، ئەوەی بەدەوڵەتی دوای کۆلۆنیالیزم ناسراوە.

کاتێ بەهۆی جۆراوجۆر لەوانەش سیاسەتی بەرژەوەندی خوازانەی ناڕەواو دژی کوردانەی هێزە ئیمپریالیستیە خۆرئاواییەکان، کورد بەسەر چەند قەوارەیەکی مۆدێرندا دابەش دەکرێت ئیتر ئەو قەوارانەو جەبرەکانی دەبن بەزیندانێکی گەورە بۆ کوردو ناسیۆنالیزمەکەشی.

سەیردەکەین هەموو ئەو شتانەی ناسیۆنالیزمێك کاری لەسەر دەکات بۆ گەشەکردن و بەگشتیکردنی بەهاکانی لەوێنەی سوپا، قوتابخانە، دادگا، ناوەندی ئاکادیمیا، دەزگاکانی حوکمڕانی، ئەتڵەسی نیشتمانیی. سەرجەم ئەم دەزگا و سیستەمانە دەکەونە دژایەتیەکی سەرسەختی ناسیۆنالیزمی کوردی، کورد دەچێتە سوپایەکەوە بۆ سەربازیکردن کە وەزیفەیەکی ئەسڵی ئەو سوپایە سەرکوتکردنی هەر جوڵانەوەیەکی

مافخوازانەی کوردە سوپای ناسیۆنالیزمێك کە نەك هەر لە رووی ناسیۆنەوە جیاوازە، بەڵکو دوژمنیشە، کوردێك کاتێ دەبێتە ئەندام پەرلەمان بۆی نەبووە تەرحی مەسەلە کوردییەکان بکات یاخود نوێنەری بەرژەوەندی کورد بێت، لە قوتابخانەو میدیادا زمانێکی بەسەردا فەرز دەکرێت و زمانی خۆی وەلادەنرێ و هەندێ جار بۆقسەکردن و گۆرانی وتنیش قەدەغە دەکرێت، مێژووی ناسیۆنالیزم و نەتەوەکانیتری پێدەخوێنرێ و مێژووی خۆی قەدەغە دەکرێت، بۆ ئەوەی بتوانێ پۆستێکی حکومی وەربگرێت و دەورێ بگێڕێ لەپێکهاتەی دەسەڵاتدا، یەکەم مەرج کە داوای لێ دەکرێت ئەوەیە دەبێ بەعەمەلی نکوڵی لەشوناسی نەتەوەیی خۆی بکات!، لەولاوە پشتیوانی کردن ئەم قەوارانە بوو بە بەشێك لەستراتیژیەتی زلهێزانی جیهان، ئەمەش کوردو ناسیۆنالیزمەکەی رۆژ بە رۆژ تووشی چوونە ناو گەمەی ترسناك دەکرد ئاسۆکان تەڕو تووشتر دەبوون و بواری خۆنمایشکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی بەرتەسکتر دەبۆوە.

ئەم قەوارانە و ئەو فەزایەی پێکیانهێنا و جەبرەکانیان لەگەورەترین ئەو هۆکارانەبوون لەپشت ناکامی ناسیۆنالیزمی کوردیەوەن کەوەك ئاماژەشمان پێکرد هۆکارە دەرەکیەکە کەلەدژایەتی کردنی کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوایدا بۆ خەونەکانی بەرجەستەدەبوو هێندەیتر رێگای لە بەردەم کوردا سەختتر کردبوو.

مەسەلەیەکیتر کەهەر لەچوارچێوەی ئەو قەوارانەدا گوزارشتی لەخۆی داوەتەوەو زەبری گەورەی لەناسیۆنالیزمی کوردی داوە نادیموکراسی بوونی رژێمەکان و توندڕەوبوونی ناسیۆنالیزمەکانیانە. واتە ئەو رژێم و دەوڵەتانەی نەتەوەی کوردیان بەسەردا دابەشکراوە ستەمکارو نادیموکراسی بوون.

مەسەلەی نادیموکراسی بوونەکەش ئاشکرایەو پێویست بەقسەکردنی زۆر ناکات مێژووی رژێمەکان و ناوچەکە باشترین شایەتە، بەڵام رەنگە مەسەلەی مۆدێلە نەتەوەییەکە لەگەڵ ئاشکرابوونیدا هەندێ لەسەر وەستانی بووێت.

ئێمە سەیردەکەین نموونەی ناسیۆنالیزمە باڵادەستەکانی ناوچەکە بەتایبەتیش لەبەرگە کەمالیزمی و بەعسیزمیەکەیدا لەبەرگیراوی ئەزموونی ئەلمانیاو ئیتالیا بوون کە لەسەر بەکارهێنانی توندوتیژی و بەزۆر کردن بەیەك و فاشیزم بنیاتنرابوون، لە تورکیا نمونە عەلمانیەکەش لەوڵاتێکی وەکو فەرەنساوە دەگوێزرێتەوە کە دیسانەوە لەسەر بەزۆر سەپاندن و توندوتیژی و توندڕەوی بونیاتنراوە. زەبوونی سروشت و پێکهاتەی ئەم ناسیۆنالیزمانەو ئەو (خیار)و کەرەسەی قەوارە تازەکان و مۆدێرنەی سیاسی خستبوونیە بەردەست بەگشتی بوونە ئاستەنگێکی گەورەی تاقەت پروکێن بۆ ناسیۆنالیزمێکی هەژاری وەکو ناسیۆنالیزمی کوردی.

هەر لەم میانەداو لەپەیوەندی بەگەڕانەوە بۆ هۆکارە خودییەکان ناکرێ رۆڵی ئایدیۆلۆژیا پەشێوی بێهێزیەکانی ناو ئەم ناسیۆنالیزمە لەیاد بکەین، بەتایبەتیش کە لەدوای چلەکانەوە مارکسیزم وردە وردە دەبێتە مۆدێلی باوی ناوەندە فکرییە کوردیەکە، گەر بەشە کوردستانەکەی لەمەڕ خۆمان بەنموونە وەربگرین دەبینین ئایدیۆلۆژیا هەر لەسەرەتای شەستەکانەوە دەبێتە هۆکارێك بۆ کەرتبوونی ریزەکانی کوردایەتی و سەنگەر لەیەکتر گرتن و چاندنی تۆوی ناکۆکی و دووبەرەکی، ئەو کەرتبوونەی بەبچوك کراوەیی لەکەرتبوونەکەی (علي و معاوية) دەچێ کەتائێستاش کورد بەدەست بەرەنجامە خراپەکانیەوە دەناڵێنێ.

تەنانەت لەهەڵگیرساندنی جەولەکانی شەڕی ناوخۆ لەدوای راپەڕینیشدا خوێندنەوە ئایدیۆلۆژیەکان و جیاوازییە حزبیەکان رۆڵی خۆیان هەبوو لەهەڵگیرساندنی شەڕو درێژبونەوەی پاشخانە ئایدیۆلۆژیەکەی نوخبە دەسەڵاتدارە کوردیەکە یاخود بەشێکی کە ناکۆکە لەگەڵ نەریتەکانی بەیەکەوە ژیان و دیموکراسی هاوچەرخدا، لێپرسراوە لەبەشێکی بەرچاوی ئەو شکستەی لەدوای راپەڕینەوە دووچاری ئەزموونی تەعەدوییەت و بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی نێوان هێزەکان هات، پەنابردن بۆتوندوتیژی و نەزعەی عەسکەرتاریەت و یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکان بەزەبری هێز، جیاناکرێتەوە لەو مۆدێلە فکری و ئایدیۆلۆژی و رۆشنبیرییە سیاسیيەی لەرابردودا بونیادی بیرکردنەەو پایەکانی بزاڤە کوردیەکەی لەسەر دامەزراوە، هەڵبەت لەپاڵ هۆکاریتردا، بەڵام لەپاڵ ئەمانەدا دەبێ هەندێ (واقیع بین) بین و مەسەلەکە هەموو هەر ئەوەنییە کەناسیۆنالیزمی کوردی توانای خەوبینینی گەورەی نەبووە بەحوکمی ئەوەی سەرکردایەتی و نوخبە فکریەکەی ناوی خاوەنی خەیاڵێکی چڕ و پڕ و فراوان نەبوون، چونکە گەر لەم روانگەوە کەم و کوریش هەبێت کەدیارە هەبوە و ئایدیۆلۆژیا چەپەکە بەشی خۆی دەوری هەبووە بۆ لەقاڵبدانی ئامانجەکان و بچوکردنەوەیان بەنەقلکردنی مۆدێلی لامەرکەزی و ئۆتۆنۆمی وڵاتە سۆسیالیستیەکان و هەوڵی خۆ وەك یەك لێکردن لەگەڵ بزوتنەوەی چەپی نەتەوە باڵادەستەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی بەشێ لەو پەراوێزخستن و نابەرامبەریەی دوچاری تاکی کورد هاتبوو، بەڵام مەسەلەکە رەهەندیتریشی هەیە بەشێکی گرنگی ئەم لەقاڵبدان و ئاسۆ سنورداریە بەناهاوسەنگی هێز و پەیوەندیەکانی هێز لێکدەدرێتەوە، واتە ناسیۆنالیزمی کوردی کاتێ پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی چەك و شۆڕشی چەکداری بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی دوای دەیان ساڵ خەباتی خوێناوی خۆی ناتوانێ

سەرکەوتن بەسەر دەزگا سەرکوتکەرەکاندا بەدەست بێنێ، هێزێکی خاوەن سەنگی جیهانیش ئامادەنیە لەسۆنگەی مرۆڤ دۆستی و ئەخلاقیەوە یاخود لە سۆنگەی بەرژەوەندیە سیاسی ـ ئابوریەکانی خۆیەوە پشتیوانی لێبکات و تای تەرازووەکەی بۆ راست بکاتەوە، ئەم حاڵەتەش وادەکات (خیار)ەکانی کورد سنوردار بن، کەدیسانەوە ئەم حاڵەتەش بەشێکە لەرەنگدانەوەی هەڵکەوتی جوگرافی و جۆری دابەشکردنی کوردستان و سروشتی رژێمەکان و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان، ئێمە گرنگە لەکاتی لێکدانەوەکاندا بگەڕێینەوە بۆ ئاستە مەیدانیەکان بۆ ئەو هۆکارانەی چارەنووسی هێزەکان لەچوارچێوەی تۆڕی پەیوەندیەکاندا دیاری دەکات.

شەڕی ئایدیۆلۆژیاش لە بەرگی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دژ بە ئیسلام هۆکارێکە لەهۆکارەکانی لاوازیەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی و تەنها رووکەشەکەشی باسی ناسیۆنالیزمەو لەناوەرۆکدا هەڵگری رەنگدانەوەکانی جیاوازی فکری و ئایدیۆلۆژیایە ئەو گرفتەی کە تا ئێستا کورد تێی نەپەڕاندوە بۆ ئەوەی نەتەوە مانا سیاسی و ئەخلاقیی و سایکۆلۆژییەکانی خۆی بەجوانی پەیداکات و ناسیۆنالیزمی کوردیش لە بەشێ لەو لادانە رزگارکات کەدەمێکە جەستەیان شەکەت و لاواز کردووە و هەر ئەمەش وایکردووە بەشێ لە ناوەندە فکری و سیاسییەکە بە نیمچە بەردەوامی هەوڵی داڕنینی شەرعیەتی نەتەوەیی لە ئیسلامیەکانی کوردستان بدەن و وەك هێزگەلێکی دژ بە خواستە نەتەوەییەکان بیانخەنە ڕوو.!

ئێمە دەبێ دەرکی ئەوەبکەین کەئەمڕۆ تەوژمی ئیسلامی لە کوردستاندا خاوەنی حزبی سیاسی خۆیەتی بۆیە بۆ ئەوەی دیدگای ئەو تەوژمەمان لە مەڕ (ناسیۆنالیزم) بۆ

دەربکەوێت ناچارین بگەڕێینەوە بۆ پرۆگرام و بەرنامەی سیاسی حزبە سیاسیەکان، بۆ نمونە گەر سەیری پرۆگرامی یەکگرتووی ئیسلامی وردستان بکەین لە (٢٠) ئامانج (١٣) ئامانجیان بەدەوری مەسەلە ناسیۆنالیستیەکان و خواست و داواکارییە نیشتمانی و نەتەوەیەکاندا دەخولێنەوە.

من دەپرسم لەئەنجومەنی حوکم مامۆستا (صەلاح الدین)ی ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان لەسەر چ ماف و داواکاریەکی کورد لەگەڵ مام جەلال و کاك مەسعود ناکۆك بوو؟ بەدڵنیاییەوە هیچ ئەمەش ئەوەمان بۆ دەخاتە روو کە ئەوەی ئێمەی لەیەکتر جیاکردۆتەوەو، ناکۆکی لەنێوانماندا دروستکردووە ناسیۆنالیزم و ناکۆکی لەسەر داخوازییە نەتەوایەتیەکان نیە بەڵکو لەئاستی ئیسلامی و عەلمانیەکاندا ناوەرۆکی بزوتنەوە ناسیۆنالیستیەکەیە لاوازی کلتوری بەیەکەوەژیانە.

گەر بەنموونەیەك مەسەلەکە لێکبدەینەوە دەڵێین ئەوەی یەکێتی نیشتمانی و یەکگرتووی ئیسلامی لێکجیا دەکاتەوە ناسیۆنالیزم و داخوازییە نەتەوەییەکان نین، بەڵکو جیاوازی دیدەکانە لەهەندێ روەوە بۆ شێوەی ئیدارەکردنی کۆمەڵگا جا ئەو کۆمەڵگایە لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیدا بێت یاخود هەرێمێکی فیدراڵ.

لەو سۆنگەشەوە کەناسیۆنالیزم خۆی ئایدیۆلۆژیا نیە و فەلسەفە و جیهانبینیەکی دەوێت بۆ ئەوەی بونیادی دەوڵەت و سیستمی سیاسی و کۆمەڵگای لەسەر بنیاتبنێ، لێرەوە ناوەرۆکی ناسیۆنالیزمەکە لای یەکێتی سۆسیال دیموکراتە و لای یەکگرتوو ئیسلامییە کە دیارە ئەم دوو ناوەرۆکەش جیاوازیەکانیان لە ئاستێکدا دەبێت، نەك

لەهەموو ئاستەکاندا ئەوەی ئێمە کۆدەکاتەوە ناسیۆنالیزمە، بەلأم بەداخەوە ناسیۆنالیزمی کوردی تا ئێستا لەوە لاوازتربووە ئەم وەزیفە گرنگەی خۆی جێبەجێ بکات و ئەم دەورە ببینێ.. لێرەوە بۆ لەیەکتر تێگەیشتن و چارەسەری کێشەکان و دیاریکردنی چوارچێوەکان گرنگە ئەوە دەستنیشان بکەین ئێمە لە سەرچی لەیەکتر جیاوازین، لەسەر ئایدیۆلۆژیاو فکر، ناسیۆنالیزم، کورسی و پارەو دەسەلأت... هتد چونکە ناکۆکی و جیاوازیەکانیش جۆراوجۆرن.

دەبوا لەم رووەوە ناسیۆنالیزم خۆی ببێتە مەرجەع، هەڵبەت ئەگەر وەزیفەیەکی مەرجەع بەوە تێگەیشتین لایەنەکان وەك پێوەر پەنای پێ بەرن بۆ سنوردانان بۆ ناکۆکیەکان و بەزیندوویی هێشتنەوەی گیانی بەیەکەوە کارکردن واتە گرفتێکی کورد لە رابردوداو لەوانەش لەدوای راپەڕیندا لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە تەوژمی فکری و حزب خۆی خستۆتە جێگای نەتەوە، لەکاتێکدا ناسۆنالیزم بەرامبەر بەتەیارە فکرییەکانی ناو نەتەوەیەك راناگیرێ و بەراورد ناکرێت، بەڵکو دەبێت جیاوازی تەوژمەکان سەرەنجام لەناو هەستکردنی هاوبەش بەئینتیما بۆیەك نەتەوە فێری بەیەکەوە ژیان و تەبایی بکات، بەجۆرێ ئیسلامی و عەلمانی و پارتی و یەکێتییەکان و حزب و پێکهاتەکانیتری کوردستان هەست بکەن نەتەوەیەکی هاوبەشیان هەیەو نابێ زەقکردنەوەی جیاوازییە حزبی و ئایدیۆلۆژیەکان بگەنە ئاستێ ئەو شوناسە کاڵ بکاتەوەو بەمەش دەرگا بەرووی قوڵکردنەوەی ناکۆکیەکان و لێکهەڵوەشاندنەوەی سیاسیانەو بەڵکو تارادەیەك کۆمەلأیەتی کۆمەڵگاشدا بخرێتە سەرپشت.

## کێشەی کورد، لە نێوان "نەتەوەیی بوون" و "ئیسلامی بوون" دا

زۆرجار لێرەولەوێ و لە ناوەندە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکەدا باس لەوە کراوە و دەکرێت کە کێشەی کورد کێشەیەکی نەتەوەییە نەك ئیسلامی یاخود ئاینی. هەندێ جاریش ئەم وەسف کردنەی ماهیەتی کێشەی کورد لە سۆنگەی پرسیار خستنە سەر هەڵوێستی نەتەوەیی لایەنێکی ئیسلامی یا خود ئیسلامییەکانی کوردستانەوە بووە، زیاد لە جارێکیش لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکەوە بە ئاشکرا باس لەوە کراوە کە ئەم هێزانە دەخوازن کێشەی کورد لە کێشەیەکی نەتەوەیی‌یەوە بگۆڕن بە کێشەیەکی ئاینی! یاخود خودی سەرهەڵدانی ئەوان ئاماژەیە بەو تەرزە لە بیرکردنەوە، لەم سۆنگەوە داخوازم ئەوەندەی گونجاوە مشتومڕێکی بابەتیانەی ئەم پرسە بکەین پەنجە لەسەر هەندێ خاڵ دابنێین و بزانین داخۆ ڕاستە شوناسی کێشەی کورد و داخوازییە نەتەوایەتییەکانمان پانتاییەکی ناکۆکی و جیاوازی نێوان تەوژم و هێزە سیاسییەکانی کوردستان پێکدەهێنن؟.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە داخۆ هیچ تەوژمێ لە کوردستاندا ڕۆژێ لە ڕۆژان و توویەتی جەوهەری کێشەی کورد ئاینی‌یە نەك نەتەوەیی؟ واتە کێشەی موسڵمانبوونە نەك کوردبوون ؟

وە ئایە لەم شوێنەدا ئاینی و ئیسلامیی یەك واتای هاوبەش دەدەن بە دەستەوە؟ ئایە ناکرێت کێشەیەك لە هەمانکاتدا نەتەوەیی و ئیسلامیش بێت؟ ئەگەر دەکرێت چۆن و بە چ شێوەیەك ؟ ئەگەر ئێمە کوردستانی‌یەکان داوالێکراو بین، تێگەیشتنێکی هاوبەش

دەربارەی مەسەلە بنەڕەتی و چارەنووسسازەکانی گەل و نیشتمانەکەمان بنیات بنێین داخۆ دەبێ ئەم تێگەیشتنە لەم بوارەدا لە چیدا ڕەنگبداتەوە ؟

لەم ویابەتەدا زۆر بە کورتی دەمانەوێت لە سەر ئەم پرسیارانە بووەستین و بەشداری بکەین لە قولکردنەوەی یەکتر تێگەیشتنێکی زیاتری نێوان تەوژمەکانی کۆمەڵگا کە تا کە ڕێگای دروستکردنی متمانەو ئایندەیەکی هاوبەشە بۆ هەموان.

هەڵبەت لێرەدا ناچینە ئەو بوارە لە قسەکردنی فکری و مەعریفی کە هەندێ توێژەر و ڕۆشنبیری کورد ئیشی تێدا دەکەن و پرسیاری بنەڕەتیان ئەوەیە داخۆ لە کوردستاندا بە مانا زانیستییەکەی بزوتنەوەی ناسیونالیستی هەیە ؟ داخۆ هێزە خۆ بە ناسیونالیست زانەکان تا چەند هەڵگری ئادگار و ناوەرۆك و شوناسی ناسیۆنالیزمن؟

## کێشەی کورد کێشەیەکی نەتەوەییە

پێموایە بە خوێندنەوەی مێژوی تازەو هاوچەرخی کوردو بزاڤە ڕزگاریخوازەکەی گومان بۆ کەس نامێنێتەوە لەوەی کە کێشەی کورد لە ناوەڕۆکدا کێشەیەکی نەتەوەییە نەك ئاینی و مەزهەبی.

واتە کێشەی نەتەوەیەکە کەلە سەر خاك و نیشتمانی خۆی ستەمی لێکراوەو چەوسێنراوەتەوەو لە مافەکانی بێبەش کراوە. بەڵکو سیاسەتی تواندنەوە و گۆڕینی دیمۆگرافی و سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی لە دژ پەیڕەو کراوە.

بە واتایەکی‌تر هێرش کردنە سەر کورد و دەستدرێژی کردنە سەری و وێرانکردنی سەرچاوەکانی ژیان لە خاکەکەیدا و ڕشتنی خوێنی ڕۆڵەکانی لە بەر کورد بوون بووە

نەك موسڵمان بوون، یاخود سوننە و شیعە بوون یاخود هەر ئایینێکیتری لەم جۆرە. گەر لە پارچەیەك و لە هەندێ کاتدا شتێکی کەمی لەمانەش تێکەڵ بوو بێت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیتوانیوە لە جەوهەرو ناوەڕۆکی بزوتنەوەکەی بگۆڕێ، کە نەتەوایەتی و داخوازییە نەتەوەایەتییەکان پێکی هێناوە.

ناسیۆنالیزمی کوردی لەو ناسیۆنالیزمانەش جیابووە کە مەسەلە ئاینی و ناسیونالیسییەکان تیایاندا بە جۆرێ لە گەڵ یەکتردا جۆش دراون ئاسان نییە لە یەکتریان جیا بکەینەوە. هەروەك لە ناسیۆنالیزمی کشمیر، شیشان، بۆسنە و هەرسك، ئەفغانستان، پاکستان، تا ڕادەیەك فەلەستین و هەندێ شوێنیتردا دەیبینین. ئەمەش لە بەر هۆکارێکی زۆر سادە کە ئەویش بریتییە لەوەی گەلانی دراوسێی کورد کە ئەم نەتەوەیە ململانێی لە گەڵ دامەزراوە سیاسییە داپڵۆسێنەرەکانیان هەبووە، نەتەوە گەلێکی موسڵمان بوون. جولەکە و ئەرەسەدۆکس و براهماتی نەبوون وەك لە نمونەکانی فەلەستین و شیشان و بۆسنەو کشمیردا بە دی دەکەین.

بەڵام لە گەڵ ئەم ڕاستییەدا کە کاریگەر بووە لە سەر ڕەنگ و بۆ دان بە ناسیۆنالیزمی کوردی و جیاکردنەوەی لە هەندێ ناسیۆنالیزمیتر، نابێ بە جۆرێکیتر بەشداری (ئیسلام)ممان لە دروستبوون و شکڵ گرتنی سەرەتاکانی ئەم ناسیۆنالیزمەدا لە بیر بچێت. چونکە هەر وەك کاك مەریوان وریا قانع دەڵێ (ناسیۆنالیزمی کوردی تا ڕادەیەکی زۆر کۆی ئەو ژێرخانە ئایینیەی کە ئیسلام لە نیشتمانی ئێمەدا هەیبووە خستۆتە خزمەت پرۆژەی بە نەتەوە بوون و مەسەلەی نەتەوایەتییەوە، ئیدی لە خودی سەرکردە ئاینییەکانەوە بگرە تا بەو تۆڕە بەرفراوانەی پەیوەندی ڕێکخستن دەگات کە تەریقەتە جیا جیاکان لە کوردستاندا لە ژێر دەستیاندا بووەو بە کاریان هێناوە بۆ

ڕاپەڕین و یاخی بوونی بەردەوام. لەم پرۆسەیەدا ئیسلام لە شەخسی پیاوە ئایینییەکانیدا، لە تۆڕی دەزگاکانیدا تەنانەت لەو ئایدیایانەشدا کە باس لە عەدالەتخوازی و مافی جیاواز بوون دەکات، خزمەتێکی گەورەی بە ناسیۆنالیزمی کوردی کردووە. ئەو زەمینە ڕەمزی و ڕێکخراوەیی و بەشەری و سەرکردایەتییەی بۆ ئامادە کردووە کە پێویستی پێ بووە).[١]

واتە ناسیۆنالیزمی کوردی لە بەرایی یەکانی خۆیدا بە مانا میللی‌یەکەی مەشرەب ئیسلامی بووە. هەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆ ڕۆژنامە کوردییەکانی بیست و سیەکان و ئەدەبیاتی شۆڕش و ڕاپەڕینە کوردی‌یەکان تا دەگاتە دروستکردنی (ژ. ك) و شەهید قازی‌محمد هەست بە تێکەلاوبوونێکی(خۆڕسك)ی هەستە ئیسلامی و ناسیونالیستی‌یەکە دەکات. تەنانەت لە گەڵ ئەو گۆڕانانەی دروستبوونی حیزبی هاوچەرخی کوردی و هاتنە ناوەوەی بیری چەپ و کاریگەری لە سەر ڕەوتی بزوتنەوەی نیشتمانی و کاریگەر بوونی بەشێکی بەرچاو لە نوخبەی کوردیەکە بە ئایدۆلۆژیا مۆدێرنەکان لەوانەش (مارکسیزم) و بە سێکولارکردنی ڕێبازی فکریی بزوتنەوەکە دروستی کردن و هێنانیەکایەوە، تا شۆڕشی ئەیلول و شەخسی ڕێبەری شۆڕش خوا لێخۆشبوو بارزانی و بنکەیەکی فراوانی شۆڕش گەر لە سەر ئاستی هەست و نەستیش بوو بێت ئەو لێکدابڕانە ڕووی نەدابوو کە دواتر و لە قۆناغێکی‌تردا هەندێ لە سیماکانی وەدەردەرکەوتن. بەڵکو هەر توێژەرێ بە وردی سەرەتاکانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و تورکی و فارسی و کوردی بخوێنێتەوە هەست بە جیاوازیەکی زەق لە نێوان ناسیۆنالیزمی کوردی و ئەو ناسیۆنالیزمانە دەکات

---

[١] مەریوان وەریا قانع، لەنێوان مۆدێرنەو ئیسلامی سیاسیدا، گۆڤاری (ڕەهەند) ژمارە (١، ٢٠٠٠، ل٣٤).

کە ئەویش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بە پێچەوانەی زۆریێ لە ناسیۆنالیزمەکانیترەوە ڕابەرانی سەرەتایی ئەم ناسیۆنالیزمە زانا و ڕەمزە ئیسلامی‌یە میللی‌یەکانی کۆمەڵگا بوون واتە بنەماڵە ئاینی‌یەکانی کۆمەڵگا ڕابەرایەتی ڕاپەرینە میللییەکانیان کردووە، ئەم ئاماژە کورتەمان بۆ ئەوەبوو بیخەینە ڕوو کە ئیسلامو ناسیۆنالیزم لە کوردستاندا لە ڕووی مێژووییەوە لە دۆخی بە یەکداچوونو هاوکاری کردندا بوون نەك بە یەکدادانو دوژمنایەتی، تەنانەت لە دوای چلەکانیشەوە کە وردە وردە دیاردەی هێرشکردنە سەر ئیسلام سەر هەڵدەداتو لە هەفتاکانو هەشتاکان زیاتروە دەردەکەوێت و لە نەتەوەکاندا بەلوتکەی خۆی دەگاتو بەشیێ لە ناوەندە روناکبیریو سیاسییەکە هەوڵی ئەوە دەدات بۆ هەر شکستێکی کورد ڕاڤەیەکی ئایینی پێشکەش بکات.[1]

ئەم هێرشکردنە لە سۆنگەی نەتەوەییەوە نەبووە، بەڵکو گەر بە ناوی نەتەوەیشەوە ئەنجام درابێت لە بنەڕەتداو ژێرخانەکەی ئایدۆلۆژیای چەپو مارکسیزم بووە، کە بەدەر لە هەرشتیێ هەڵویستێکی نەگۆڕ و (سلبی) دەربارەی (ئایین) وەکو (ئایین)و (مێژووش) بە مانا نەتەوەییەکەی هەبووە، بە سەیرکردنی ئەو سەرەتایانەی پەیوەندی نێوان ئیسلامو ناسیۆنالیزم لە کوردستاندا کارێکی ئاساییە کە لە مێژووی هاوچەرخی ئێمەشدا بزوتنەوە گەلێك سەر هەڵبدەن کە بە هەناسەیەکی ئیسلامییەوە بەرگری لە شوناسو مافە نەتەوەییەکانی نەتەوەکەیان بکەن، بەڵام گرنگە بۆ ئەوەی ئەم هەناسە لە ئاستێکی بەرزدا بێنو بەرامەی کوردەواری بڵاو بکاتەوە دەبێت ئەو بزوتنەوانەلە ڕووی فکریو سیاسییەوە درێژ کراوی ئۆرگانیو دەروێشانەی هیچ تەوژمو قوتابخانەیەکی فکری ئیسلامیی هاوچەرخ نەبنو لە پێگەیەکی تەواو کوردستانییەوە

---

[1] نموونە لەم ڕووەوە زۆرە وەك حیکایەتی فەتواکەی مەلای خەتیێ و تەوقە نەکردنەکەی شێخ مەحمودو..هتد.

سوود لە سەرجەم ئەزموونەکان وەربگرن بە تایبەتیش ئەوانە یان کە لە گیانی سەردەم و دۆخی کوردستانەوە نزیکترن.[1]

لێرەشەوە دەکرێت لە دیدێکی نەتەوەیی‌و بە پێوەرە نەتەوەییەکان بە تایبەتیش لە ئاستی داخوازییە سیاسییە نەتەوەییەکاندا سەرنجێ لە پەیوەندی (ئیسلامی بوون‌و نەتەوەیی بوون) لە ئەزموونی تەوژمی ئیسلامیی کوردستانیدا بدەین.

دیارە هەموو بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی داواکاری و دروشمی نەتەوەیی هەیە کە دروشمی سروشتی و ناوەندی بزوتنەوەیەکی لەو جۆرەش لە دۆخی ئاسایی خۆیدا پێکهێنانی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەییە. گەر لەم ڕوانگەوە سەیری هێزو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان بکەین بە جیاوازی ئایدۆلۆژییانەوە بە تایبەتیش ئەو هێزانەی کە بوون و چالاکی ئاشکراو یاسایی یان هەیە و خاوەن قورسایی ڕێژەیی خۆیانن بەگشتی لە سەر مەسەلە نەتەوەیی یەکە کۆکن یاخود بڵێین لە سەر دروشم و ئامانجە نەتەوەیی یەکان جیاوازو ناکۆک نین.

هەموویان لە سەر ئاستی تیۆرو ئەدەبیات و بە کردەوەش پابەندی خۆیان بە نەتەوەیی بوونی کێشەی گەلی کوردستان و چارەسەر کردنی عادیلانەی کێشەکەوە ڕاگەیاندووە.

ئێمە ئێستا هیچ هێزێکمان نیە لە کوردستانداو لەوانەش ئیسلامی‌یەکان دژی دروشمی ناوەندیی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان لەم بەشەی کوردستان و

[1] ئیسلامیەکانی کوردستان لە رووی فەرهەنگییەوە پێویستیان بەکرانەوەو بەخۆداچوونەوەی زۆرتر هەیە بۆ نموونە نەپشتکردنە کەلەپوری سەدان ساڵەی هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی بەناوی شەرعیەوە زۆر قابیلی تێگەیشتن نییە.

بڕیاری پەرلەمانی کوردستان بن، کە لە (فیدرالیزم)دا خۆی دەبینێتەوەو داوای ناوەندچێتی لە عێراق یاخود ئۆتۆنۆمی، ولایەتی ئیسلامییان هەر فۆرم و داخوازیەکی لەو ئاستە خوارتر بکات، یاخود بە پاساوێکی ئایدۆلۆژی دیاریکراو لەوانەش پاساوی ئاینی ئەو مافە بە مافی گەلی کوردستان نەزانێت. لەم ڕوەشەوە جگە لە پەیڕەوی ناوخۆی حیزبەکان و ئەدەبیات و دروشمەکانیان کە بە گشتی (تبنی)کردنی کێشە نەتەوەیی یەکەی لە خۆ گرتووە، لە یەك دوو ساڵی ڕابردوودا دوو وێستگەی گرنگمان لە بەردەم بوو کە دەربڕی ئاراستەی هێزە سیاسی‌یەکانی لە مەڕ مەسەلە نەتەوەیی یەکە خستە ڕوو.

کەئەوانیش:

یەکەمیان ڕیفراندۆمە نارەسمییەکەی بزوتنەوەی ڕفراندۆم بوو لە کوردستان کەلە ٢٠٠٥/١٢/٣١ دا، هاوکات لە گەڵ هەڵبژاردنەکانی کوردستان و عێراق ئەنجام درا.

دووەمیشیان شەڕی دەستور و بەشداری هێزەکوردییەکان بە ئیسلامی‌یەکانی کوردستانیشەوە بوو لە لیژنەی داڕشتنی دەستوری عێراقدا، لە ڕیفراندۆمە نارەسمییەکەدا (٩٨,٨)ی زۆربەی هەرە زۆری دەنگدەری خەڵکی کوردستان دەنگیان بۆ سەربەخۆیی کوردستان و جیابوونەوە لە عێراق دا. کە دیارە ئیسلامییەکان لەمەوپێش لانی‌کەم (١٥٪) ی دەنگدەری کوردستانیان پێکهێناوە. کە ئەمەش دەری دەخات مەسەلەی سەربەخۆ بوون و چارەنووسی کوردستان یەکێکە لەو هاوبەشانەی کە زۆرینەی هەرە زۆری هاوڵاتیانی کوردستان و سەرجەم هێزە سیاسییەکانی لەسەری کۆکن، *لە شەڕی دەستور و ئەو لیژنەش کە بۆ داڕشتنی دانرابوو.* ئیسلامییە

کوردستانییە بەشداربووەکان لە لیژنەکەدا بە کردەوە هەندێ کەس و لایەنی بەرامبەر لەوانەش ئیسلامیان لە خۆیان تورە کرد لە سۆنگەی پێداگرتنیان لە سەر داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان. لەوێدا بێ هیچ ڕەوشێ سەلماندیان کە ئەوانیش بەشێکی لە دابڕان نەهاتووی هێزو وزە نیشتمانیەکەن بۆ گەیشتن بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستانو بەرژەوەندییە نیشتیمانییە کوردستانیەکان دەخەنە پێش هەر بەرژەوەندییەکیترەوە.

دەربارەی مەسەلەی گێڕانەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانیتری هەرێمیش کە پرسێکی نەتەوایەتی گرنگە، شایەتی بوونی هەڵوێستێکی جیاواز نین هێزە نیشتمانیەکان بە گشتییەك دیدی هاوبەشیان هەیە گەر لەم پێدراوە مەیدانیانەشەوە بگوازینەوە بۆمەسەلە تیۆرییەکان، پێوەر پرەنسیپە تیۆرییەکانی تیۆری ناسیۆنالیزم بێت ئەوا هێزەکان بە گشتی دەکەونە ژێر پرسیاری تیۆری و فکرییەوە نەك تەنها تەوژمێکی سیاسی کۆمەڵایەتی دیاریکراو.

هەر بۆیە بە بڕوای ئێمە دەرگای ڕەخنە گرتن لە تەوژمی ئیسلامیی کوردسانیی مەسەلەی نەتەوایەتیو داخوازییە نەتەوەییەکان نیە بە دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆشەوە، چونکە ئەوانیش بە (تبنی) کردنی دروشم و خواستە نەتەوەییەکان لەم ئاستەدا، بوونەتە هێزی ناسیۆنالیستی و تەنها لە هەندێ ڕووی ناوەڕۆکە فکری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو ناسیۆنالیزمە لە گەڵ هێزە ناسیۆنالیستەکانیتر جیاوازن نەك خواست و داواکارییە نەتەوەییەکانو مافە سیاسییەکان.

چونکە ناسیۆنالیست بوون پەیوەستە بە(انتماء)و خەبات کردن بۆ بەدیهێنانی خواست و دروشمە نەتەوەییەکان. واتە ناسیۆنالیزم ئایدۆلۆژیایەك نیە بەرامبەر ئایدۆلۆژیاکانیتر هێندەی کەپرەنسیپ و داخوازی سیاسییە.

بەم جۆرەش ئێمە هێزمان هەیە ناسیۆنالیست و سۆسیال دیموکرات، ناسیونالیست و ئیسلامی... هتد

## ناوەڕۆکی ئیسلامیبوونی کێشەی کورد

ئەگەر کێشەی کورد لە ناوەڕۆکدا کێشەیەکی نەتەوەیی بێت واتە کورد بە سیفەتی کورد بوونی بکەوێتە ژێر فشارو لە هەمانکاتدا لە سەر ئەو بناغەیە خواست و ئاوات و داواکاری هەبێت، ئەوا لە هەمانکاتدا ئەم کێشەیە لە ناوەڕۆکدا کێشەیەکی ئیسلامیشە، بەڵام لێرەدا ئیسلامی بوون یەکسان نییە بە ئاینی بوون. واتە ناوەڕۆکی ئیسلامی بوون بەو واتایە نایەت کە ئێمە لە بەر ئەوەی هەڵگری شوناسی موسڵمانێتی و موسڵمانین ستەممان لێکراوەو ململانێکەش لە نێوان (ئیسلام) م و (نائیسلام) دایە و بەمەش جەوهەری ململانێکە ببێتە ئاینی، چونکە هەروەك وتمان واقعی مێژوویی و ئێستای بزافی ناسیۆنالیزمی کوردی ئەم ڕایە پشت ڕاست ناکاتەوە، بەڵکو ئەو پرسیارەی ئیسلامی بوونی کێشەی کورد دەیخاتە ڕوو ئەوەیە ئایە دەکرێت لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیيەوە بەرگری لە مافە نەتەوەییەکانی نەتەوەی کوردو گەلی کوردستان بکرێت لەو فۆڕمەدا کە خودی بزوتنەوە ناسیۆنالیستەتییەکە دیاری کردووە و پیی گەیشتوە ؟ ئایە دەکرێت

ئێمە (تأصیل)ێکی ئیسلامیمان هەبێت بۆ کێشەی کورد و مافە نەتەوەییەکانی ئەم نەتەوەیە و بە زمانێکی ئیسلامی بەرگری لە مافەکانی بکەین؟

ئایە بە هاو پرەنسیپە ئیسلامییەکان ئەو چەکەن کە بەشێ لە شەڕی نەتەوەیی خۆمانیان پێ بکەین بە تایبەتیش بەرامبەر ئەوانەی لێرەو لەوێ دەیانەوێت کارتی ئیسلام و ڕەوایەتیەکی ئیسلامیی گومانلێکراو بە ڕووی داخوازییە نەتەوایەتییەکانی گەلی کوردستاندا بەرز بکەنەوە ؟ ئایە ئەو مافە دەدەین بە ئیسلامی‌یەکی کوردستانی کە ئیسلام بە سەرچاوەیەکی گرنگی فکرو ئیلهامی سیاسی خۆی دەزانێت بڕوای وابێت کە لە پاڵ هەستو ئینتما نەتەوەییەکە ئایدیاو گیانی عەدالەتو هەق خوازی ئیسلام داوای لێدەکات لە سەنگەری بەرگری کردن لە مافەکانی گەلەکەیدا بێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارانەیە ناوەڕۆکی ئیسلامی بوونی کێشەی کورد دیاری دەکەن و لەو گرفت و تەم و مژو ناڕۆشنی و گومان و ڕاڕایی‌یە دەرماندەهێنن کە هەڵەی مەنهەجی و ڕواڵەتی بوون لەم ڕووەوە دروستی کردوون.

بۆ نمونە ڕوناکبیرێك یاخود سیاسییەکی ئیسلامیی کوردستانیی کاتێ دەیەوێت دیدێکی ئیسلامی بۆ خستنە ڕووی ڕەوایی مەسەلە نەتەوەییەکە بخاتە روو وابیرکاتەوە کە ئیسلام بڕوای بە جێنشینی و کەرامەتی مرۆڤ هەیە لە سەر زەویدا، باوەڕی بە دادپەروەری و یەکسانی گەلان و ڕەتکردنەوەی گەلی هەڵبژێردراوی خواو دژایەتی کردنی ستەم و جیاوازی فەرهەنگ و زمان و ڕەنگ و ڕەگەز و نەتەوەکان هەیە، پیی وابێت ئیسلام دژی ستەم و زۆرداریە لە هەر بەرگێکدا بێت. هەر لەم سۆنگەشەوە بیخاتە ڕوو کە هەڵوێستی ئیسلامیی ڕەسەن و ڕاست لایەنگیریی بێ ئەملاو لای مافی نەتەوەیی گەلی

کوردستانه به دیاریکردنی مافی چارەنووس و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیشەوە، چونکه له بەر چارەسەر نەبوونی ئەم کێشەیەو ستەمە نەتەوایەتییەکەو دەرهاوێشتەکانی هەموو ئەو بەهاو پرەنسپە ئیسلامییانەی سەرەوە ژێر پێ دراون و بێ ڕێزیان پێ کراوە، کەرامەتی مرۆڤی کوردو گەورەیی ئەم مرۆڤە له کوردستاندا سوکایەتی پێکراوە. دوژمنایەتی زمان و فەرهەنگی کراوە، مامەڵەی نایەکسانی لەگەڵ کراوە، سیاسەتی جیاکاری و هەڵاواردنی نەتەوەیی به سەردا جێبەجێ کراوە ستەمی جۆراو جۆری دەرهەق ئەنجامدراوە لەولاوە کێشەو داخوازیەکانی له ناوەڕۆکدا ڕەواو عادیلانەن بۆیە هەر بەم پێیەش مەسەلەی ڕزگار بوونی کوردو لابردنی ئەو ستەم و هەڵاویردنە نەتەوەییەی دژی پەیڕەو دەکرێ و ئەو بێمافیەی دووچاری بووەو گەیشتنی به سەرجەم مافەکانی، له ناوەڕۆکدا ئەرك و مەسەلەیەکی ئیسلامییە، واتە نەك ناکرێت کەس و هێزێ له دیدێکی ئیسلامیەوە دژی بەم خواستانه بووە ستێتەوە، بەڵکو هەموو هوشیار بوونێکی ڕاستەقینە به ناوەڕۆکی ئیسلام و ڕۆح و بەهاو پرەنسیپەکانی دەخوازێت پشتیوانی لەم گەلە بکرێت بۆ گەیشتن به ئازادی و ڕزگار بوون و سەرفرازی. بەم جۆرەش ئیسلامی بوون لەم شوێنەدا یەکسان دەبێت بەپێدانی ڕەوایەتیەکی ئیسلامی بەخەباتی هەقخوازانەی گەلی کوردستان بۆ گەیشتن بەمافەکانی و داڕنینی هەمان ڕەوایەتی لەودەسەڵات و ئایدۆلۆژیا و ناوەند و میکانزمانەی له پێش ژێرپێدانی مافە نەتەوەیی و ئینسانییەکانی گەلی کوردستانەوەن[1] به حوکمی ئەوەش کە ئێمە تا ئێستا له دەورو بەرێکی ئیسلامی دا دەژین دەکرێ له دەرفەتی جۆراو جۆرداو به ئاراستەی دەرەوە سوود لەم زمانه وەربگیرێت. له ناوخۆشدا بەشێ له ئازادی

---

[1] بڕوانە (ئەبوبەکر عەلی) کێشەی کورد له ستراتیژیەتی یەکگرتوودا/ ١٩٩٨.

گوزارشتدانەوە لە خۆی تەوژمێکی نیشتمانیی دەخاتە ڕوو، بەم جۆرەش (نەتەوەیی بوون) و (ئیسلامی بوون) سەبارەت بە کێشەی کورد دەبن بە دوو ڕوویەك دراوو پەیوەندی بە سەقفی داواکاریەکان و بە ڕەوایی و ناڕەوایی داواکاریانەوە نامێنێت، بەڵکو لە هەندێ ڕووی سنووردارە و پەیوەندی بە پاڵنەرو زمانی دەربڕین و (تأصیل) کردنەوە هەیە. بۆیە دەشڵێم سنوردار چونکە مۆدێرنەی فکری و سیاسی بەشێکی بەرچاو لە زمانی قسە کردنی سیاسی بەشێکی گرنگ لە ئیسلامی‌یەکانی کوردستان پێکدەهێنێت و ئەوانیش لە دەربڕینیاندا زۆربەی ئەو چەمكو دەستەواژانە بەکار دەهێنن کەهێزە نیشتیمانییەکانی‌تر بە کاریان دەهێنن.

### نەتەوایەتی وەك چەترێك بۆ هەمووان

زۆر گرنگیشە لەم شوێنەدا ڕەچاوی شعوری نەتەوەیی کەسانی سەر بە تەوژمە ئیسلامییەکە بکرێت کە بە شێکی بەرچاو لە ناویاندا سەربەخۆ خوازنو پەرۆشیو دڵسۆزی خۆیان بۆ ئێستاو ئایندەی گەلو نەتەوەکەیان لە کەسانی‌تر بە کەمتر نازانن، ڕاست نییە بە ناهەقو بە ناوی نەتەوەییوە ئازاری ڕوحیان بدرێ، چونکە خودی ناسیۆنالیزم دەبێت خودان ناوەڕۆکێکی موگناتیسی کۆکەرەوەی پێکهێنەرەکانی نەتەوەبێتو ئەو زمانەی نوێنەرایەتیشی دەکات دەبێت بە هەمان هەناسە و ڕوحیەتەوە بێتە ئاخافتن، لە ڕوویەکی‌ترەوە نەتەوایەتی دەبێ لە سەروی ململانێ و کێبڕکێ سیاسییە ناوخۆییەکانەوە بێت و هەروەك ئیسلام موڵکی هەمووان بێتو چەترێك بێت بۆ کاری هاوبەش و هاوچارەنووسی و کێبڕکێیەکی تەندروست، چونکە ئەگەر گۆڕا بە

ئامرازێکی ململانێی سیاسی و جەنگی دەرونی بەدەست تەوژمێکی سیاسییەوە دژ بە تەوژمێکی‌تر، ئەوا لەو نێوەندەدا زۆر لە خاسیەتەکانی خۆی لەدەست دەداو ڕۆشنبیریی نیشتیمانیش دوچاری داڕزانی زیاتر دەکات، ئەمڕۆ ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە لە پاڵ هەوڵی دڵسۆزانەو بێ‌وچان بۆ دابینکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکانی هاوڵاتیان‌و گەشەدان بە ژیانی کۆمەڵایەتیمان جیهادی هەرە گەورەی قۆناغەکە تێکۆشانی هەمە لایەنەیە بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی سیاسیانەی کۆنکرێتی بۆ کێشەی گەلی کوردستان‌و بردنە پێشەوەی کێشەکەی تا گەیاندنی بە دوا قۆناغی سروشتی هەر بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی کە خود خاوەنی سیاسی‌و دیاری‌کردنی مافی چارەنووس‌و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەییە.

ئەمەش هاو چارەنووسی سەرجەم تەوژمەکان دەخوازێت، هاو چارە نووسیش زەمینەی کارو تێگەیشتنی هاوبەش و دیاریکردنی پانتاییەکانی کۆکی‌و جیاوازبوونی هێزەکان‌و ڕێزگرتن لە نەگۆڕە نیشتیمانیەکانی پێویستە.

## له حوکمی ئایدۆلۆژیاوه بەرەو دەسەلاتی خەڵك

ئەم بابەتە ناونیشانێکی‌تریشی هەیە کە بریتیە لە (عەلمانیەت و ئیسلامیی‌بوونی باوەوە بەرەو دیموکراسی و دەسەلاتی خەڵك) بەکورتی نوسەر لەم بابەتەو چەندین نووسینی‌تردا بانگەشە بۆ رێبازی سێیەم دەکات، چونکە پێی وایە ئەو مۆدیلە دەسەلاتە عەلمانی و ئیسلامییەی لە (٥٠)ساڵی رابردوودا لەناوچەکەدا بالآدەست بووە هەردووکیان لەئاستی جۆراوجۆردا شکستیان خواردووە و نەیانتوانیوە خەونی گەلانی ناوچەکە لە دیموکراسی و ئازادی و سەربەخۆیی و خۆشگوزەرانی و گەشەپێدان و سەربەرزی بهێننەدی. بۆیە ئێستا کاتی ئەوە هاتوە گەلانی ناوچەکە بیر لە مۆدێلێکی نویی حوکمڕانی بکەنەوە، مۆدێلێ هێزەکان بخاتە ناو پەیوەندییەکی نوێی ئاشتیخوازانەو لە سایەیدا رێز لە شوناسی ئیسلامی کۆمەڵگا بگیرێت، لەهەمان کاتدا کۆمەڵگا دووربخاتەوە لە حوکمی ئایدیۆلۆژیایەکی ئیسلامیی یاخود عەلمانی و رەچاوی فرەیی فکری و سیاسی و ئاینی و نەتەوەیی و مەزهەبی بکات و خواست و چاوەڕوانییەکانی هاوولآتی و کۆمەڵگا و ئیرادەی ئەو ببێتە خولگەی سەرەکی سیاسەت و کێبڕکێی سیاسی.

لە سەرویەندی تەواوبوونی ڕەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستاندا جارێکی دی مەسەلەی شوێنی ئیسلام لەم دەستورەدا بۆوە بە بابەتی مشتومڕی بەشێ لە ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسییەکە، ئیسلامییەکانی کوردستان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەو

له یەکتێکەیشتنە مام ناوەندییەی له دەستوری عێرقدا لەم ڕووەوە بەدیهاتووە له دەستوری کوردستانیشدا ڕەنگبداتەوە، هەندێکیتریش پێیان وایە دەبێ کوردستان لەم ڕووەشەوە تایبەتمەندی خۆی هەبێتو دەستوری کوردستان بە دەربڕینی خۆیان عەلمانیترو ڕۆڵی ئیسلام لە پەیوەندی بە بواری گشتییەوە کەم ڕەنگتربێت ئێمەش دەمانەوێت ئەم مەسەلەیە بکەین بە دەرفەت بۆ دەربڕینی هەندێ بیرو بۆچوون، هەڵبەت ئەم مەسەلەیە بۆ یەکەم جارە له نێوەندە سیاسی و فکرییەکەی کوردستان بەم جۆرە قسەی لەسەر دەکرێت، چونکە عەلمانیەت وەك مۆدێلێ بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات له ڕابردووی کوردستاندا بابەتی قسە لەسەر کردن نەبووە، بەڵکو عەلمانیەت بە ئایدۆلۆژیاکانیەوە له کایە فکریو سیاسییەکەدا ئامادە بووە نەك وەك کۆمەڵی ڕێو شوێنی کرداری بۆ لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتە بە یەکداچووەکان بە تایبەتیش دەسەڵاتی سیاسیو ئاینی بەو جۆرەی ئەزموونی مێژووی خۆر ئاواو بە تایبەتیش فەرنسا بەخۆیەوە بینیوە، ئەویش لەو سۆنگەوە کە گەلی کوردستان یەکەم جارە بەم شێوازە له بەردەم پرسی شوناسی دەسەڵاتو بوونی دەستورو ڕێکەوتنی مەدەنیدا خۆی دەبینێتەوە و بۆ ماوەی سەدەیەك بە نیمچە بەردەوامی له شۆڕشو ململانییەکی خوێناویدا بووە بۆ چەسپاندنی مافی بوونو گوزارشت له خۆدانەوە، بەڵام کۆمەڵگا موسڵمان نشینەکانیتری ناوچەکە بۆ دەیان ساڵ دەچێ ئەم پرسە بۆتە پرسێکی گرنگو خولگەیی چەندین ململانیی سیاسیو ئایدۆلۆژیو کۆمەڵایەتی، ململانێی نێوان تەوژمی ئیسلامیو عەلمانی هەندێ وڵاتیش بە ئاقارێکدا ڕۆیشتووە کە سەرنجام بە تیاچوونی هەزاران مرۆڤ، یاخود سزاو ئەشکەنجەدانیان تەواو بووە.

خۆشبەختانە کۆمەڵگای ئێمە لەم ڕووەوە یادەوەری تاڵی زۆری نیە هەر ئەمەش لە خۆیدا زەمینەی لە یەکتر تێگەیشتنی هێزەکانی لەگەڵ یەکدی ئاسانتر کردووە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە نوخبەی کۆمەڵگا لە قۆناغێکی گرنگی ڕاگوزاری خۆیدا خوێندنەوەیەکی هاوسەنگو قوڵو زانستیانەی بۆ واقیعەکەی خۆیو پێداویستیەکانی ئاڵو گۆڕەکانو گەیشتن بە سانە وەختی سەقامگیریو چوارچێوەیەکی پتەو بۆ بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە هەبێت، دەستە بژێرە فکریو سیاسییەکە کاتێ بیر لە مەسەلەیەکی بنچینەیی وەکو دەستوور دەکاتەوە دەبێت تا ئەو پەڕی ئەوەی کە دەکرێت خۆی بخاتە سەرو ململانێ سیاسیو کۆمەڵاتیەکانی ئێستاو بە خوێندنەوەی ئەزموونی وڵاتانی ناوچەکەو پەرەسەندەنەکانی دنیا،دیدێکی ژیاریانە بۆخۆی بنیات بنێت.

## دەرچوون لە بازنەی داخراوی مێژووی وڵاتانی ناوچەکە

هەروەك ئاماژەمان پێکرد وڵاتانی ناوچەکە لە سەدەی ڕابردووداو بە تایبەتیش لە (٥٠) ساڵی دووەمی ئەو سەدەیەدا، کە بە قۆناغی دەرکەوتنی کودەتا سەربازیەکان و ئایدۆلۆژیا شۆڕشگێڕیەکان ناوزەد دەکرێت، بە هۆی لە بار چوونی ئەو نیمچە ئەزموونە لیبڕاڵییە سەرەتاییەی لە چەندین وڵاتدا لە ئارادا و پاشەکشەی ترسناکی ئەو فۆرمە بەراییەی دیموکراسی، چەندین وڵات کەوتنە ناو بازنەیەکی داخراوی ململانێ و توندوتیژی نێوخۆییەوە، کە دیارە پەیوەندیە دەرەکییەکانی دەسەڵاتی ڕەسمی بە شێوەیەکی گشتی لە خزمەت یەکلاکردنەوەی ئەو ململانێیانە بە قازانجی لایەنێکی

دیاریکراو بە کارهێنراوە، ئەوەی زەمینەی ئەو شەڕە ناعەقڵانیەشی خۆشتر دەکرد قۆناغە مێژووییەکە و بارودۆخە نێودەوڵەتیەکە بوو، مەبەستمان لە قۆناغە مێژووییەکەش بوونی ئایدۆلۆژیای چەپی شۆڕشگێڕی شێللراو لەگەڵ فۆرمێکی توندڕەو و دواکەوتووی ناسیۆنالیزم بووکە لە هەندێ وڵاتدا بووە هۆی بەرهەم هێنانی ئۆپۆزسیۆن لەسەر شێوازی خۆی کە بەشێ لە ڕەنگدانەوە سلبییەکانی لە دروسبوونی کۆمەڵێ گروپی تەندڕەوی ئیسلامیدا خۆی نواند، دیارە هەروەك سۆراخکەرانی بواری فکر ئاگادارن ئایدۆلۆژیا لە ناوەرۆکدا هەژمونخوازەو ڕێژەگە رایش بە جۆری لە سازش سەیر دەکات.

ئایدۆلۆژیا بە تایبەیش لە بەرگی ئەو ئایدۆلۆژیانەی لەو قۆناغەدا برەویان هەبوو، دروشمەکانیان هەزاران کەسیان دەبزواندو بەرەو توونی ململانێو جەنگەکانیان دەبردن، وەك زانراویشە تەماحی ئایدۆلۆژیا داگیرکردنی کۆمەڵگایە، کەمتر داندەنێت بە بوونی کێبڕکێ کار (منافس)و زیاتر بەرامبەرەکانی بە دوژمن پێناسە دەکاتو لە جیاتی مونافەسە لەگەڵ کردن دەچێتە نێو ململانێ لەگەڵیاندا، ئایدۆلۆژیاکانی ئەو سەردەمە بە ئایدۆلۆژیا ئیسلامیەکەشەوە گرەوێکی گەورەیان لەسەر دەوڵەت کردبوو بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەوەوە کۆمەڵگا بخەنە ژێر فشاری خۆیانەوە و بەو جۆرەی دەیانەوێت لە قاڵبی بدەن و ئاراستەی بکەن و هەریەکەش لای خۆیەوە پرۆژەی هەڵوەشاندن و دروستکردنەوە و داڕشتنەوەی کەسێتی نیشتیمانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، لە دۆخێکی لەم جۆرەدا کە ڕادیکاڵیەت تا ئەو ئاستە باڵادەست بێت و کۆمەڵگا بەو جۆرە ترسناکە بەسەر ڕەشوسپیدا دابەش بکرێت، قسەکردن لە هەر ڕێکەوتنێکی سیاسی و بێلایەنی حکومەت و لە یەکتر تێگەیشتنی فکری و سیاسی کە لانیکەمی کاری هاوبەش

و بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی لێبکەوێتەوە، لە سایەی سەرەتای هاوڵاتێتی‌یەکساندا، کارێکی قورس‌و گران بوو.

هەر بۆیە بە گوتەی (د. بورهان غلیون) بەو جۆرەی کە لە کتێبی (تیرۆرکردنی عەقل)دا باسی لێوە دەکات کۆمەڵگاکانی ناوچەکە بە هۆی لاوازی بیرباوەڕی نیشتیمانێتی‌و پایەکانی دەوڵەت‌و نەبوونی دیموکراسی‌و ڕەگە کلتوریە سوڵتانیەکانەوە، دووچاری لێکدابڕان‌و بەدابەشبونێکی ڕۆشنبیریی ناوەکی سەخت هاتن، ئەم حاڵەتە بۆ دەیان ساڵ کایە سیاسی‌و ئابوری‌و فکری و کۆمەڵاتیەکانی خستبووە ژێر سێبەری چڕی شومی خۆیەوە، ئەم پرۆسە بەسوێیەش کە هەندێ لە ڕەگەکانی دەچێتەوە ناو دەوڵەتی پاش کۆلۆنیالیزم و کاڵوکرچی دەوڵەت‌و تێکشکانی گەشەی ناوەکی کۆمەڵگاکان خۆیان، نەك هەر ڕێگریوو لە بەردەم گەشەکردنی فۆرمە تازەکەی دەوڵەتدا، وەك دەستکەوتێکی مۆدێرنەی سیاسی، بەڵکو لە چەندین ڕووەوە ماناکانی کۆمەڵگای لە زۆری لەم کۆمەڵگایانە سەندەوەو ئەخلاقی مەدەنی دووچاری قەیرانی قوڵ کردوو، ئاسۆی پەرەپێدانی سیاسی‌و ئابووری تەڵخ کردووە، کۆمەڵگایەکیش کە بەم جۆرە بە هەستی سلبی‌و بوغزو ململانێ‌و پێکدادانی کوێرانە قانگ درابێت هەر مۆدێلێ لە دەسەڵات لەم چورچێوەداو لە سایەی ئەم هەل‌و مەرجەدا بەرهەم بێنێ، ڕو پۆشەکەی ئایدۆلۆژیا نوێکانی عەلمانی بێت یان ئیسلامی‌ومێژوویی، ناتوانێت لەگەڵ سەرەتاکانی دیموکراسیدا هەڵبکات.

## ڕوەو سازشێکی مێژوویی

دوای دەیانساڵ لە ژیان لە ناو بازنەیەکی داخراوی توندوتیژیو بە نەفرەتکردنی یەکتری، هەروەها دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردو ڕیزبەندیو بلۆك بەندییە جیهانییە پێشووەکە، کە هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ مانەوەی فۆرمەکانی زۆرداری لە دەسەلاتداو بواری گەمەو مانۆڕکردنی پیّدەدا و ڕیگرێکی گەورەی بەردەمی کرانەوە و گۆڕان بوو، کۆمەڵگاکانی ناوچەکە و لەوانەش کۆمەڵگای ئێمە بۆ یەکەمجار لە (٥٠)ساڵی ڕابردوودا ڕوناکییەك لە ئاسۆدا دەبینن و پیّدەنێنە ناو قۆناغێکی نویّ، کە لەم قۆناغەدا پێش هەموو شتیّ دەخوازێت سیاسەت لە چنگی ئایدۆلۆژیا هەژمونگەرەکان و لێکدانەوە ڕەهاگەرەکان و پرۆسە زۆرە ملێکان ڕزگار بکرێت و (اعتیبار)و شایستەییو ڕۆڵی خۆی بۆ بگەڕێتەوە، مەبەستمان لەوەیە کە سیاسەت بگەڕێتەوە بۆ نشینگەی سروشتی خۆی کە کۆمەڵگای مەدەنییە، لەوێوە پێوەرو ڕەمزو بەهاکانی دیاری بکات، چونکە هەر ئەو کاتە دەتوانیّ ڕەچاوی واقیعی مێژووییو ئاینی و فەرهەنگی و نیشتیمانییەکە بکات و دەوڵەت ڕۆڵە شۆڕشگێڕە سەلبیەکەی جارانی نەمێنیّ و ببێتە قەوارەیەکی جێگیری فراوان و بیّ لایەن، ئەگەر سیاسەت بە مانا ژیاریەکەی لە شوێنێکدا هەبێت کە ڕێژە گەرایی و سازش و دانوستان و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و قسەکردن لەسەر مەسەلە گشتییەکان لە ئارادا بێت، ئەوا وڵاتی ئێمە پێویستی بە خەباتێکی فکری و سیاسی بەهێزە بۆ ڕزگارکردنی سیاسەت لەو ستەم لیّ چوویەو، پەردە هەڵماڵین لەو بەناو سیاسەتەی بەناوی سیاسەتەوە مومارەسەکراوەو دەرخواردی کۆمەڵگا دراوەو جەستەی کۆمەلایەتی تووشی ژەهراوی بوون کردووە.

ولاتانی ناوچەکە کە ئێمەش بەشێکین لە پێکهاتەی ناوچەکە، پێویستیان بە سازشێکی مێژوویی نێوان هێزە کۆمەلایەتییە جیاوازیەکانو لەوانەش نێوان تەوژمی ئیسلامیو عەلمانیو مۆدێلێکی تازە لە دەوڵەتو حکومەتو دەسەلاتو پەیوەندی بەیەکەوەژیان هەیە، چونکە مێژووی نوێ و هاوچەرخی ناوچەکە چەندین وانەی گرنگی خستۆتە بەر دەستمان بۆ ئەوەی هەڵە و شکستەکان دووبارە نەکەینەوە و لە سفرەوە دەست پێنەکەین، نمونەی تورکیاو ولاتانی عەرەبی و ئێران و هەندێ ولاتیتریش خستویەتیە ڕوو، کە عەلمانیەت بەو جۆرەی لە خۆرهەلاتدا خراوەتەڕوو تەرح کراوە، عەلمانیەتێکی بە ئایدۆلۆژیکراو بووەو، تا ڕادەیەکی بەرچاویش دژی دیموکراسی و بەهاکانی بووە، زیاتر پرۆژەیەك بووە کە نوخبەیەك ویستویەتی لە ڕێی دەوڵەت و دام و دەزگاکانی و بە بەکارهێنانی زەبروزەنگ و شێوازەکانیتری زۆر لێکردن و ناچارکردن، بەسەر کۆمەلگا و کەسێتیێ نیشتیمانیدا بسەپێنی، لە هەندێ ولاتیشدا ئەم مۆدیلە لە عەلمانیەت، سەرەنجام شەڕی دەوڵەت دژی کۆمەلگا و داڕزانی ڕۆشنبیریی نیشتیمانی لێکەوتۆتەوە، عەلمانیەت لە فۆرمە خۆرهەلاتیەکەیدا، لە زیاتر لە ڕویەکەوە بەرەنجامی پێچەوانەی ئەزموونە خۆر ئاواییەکەی لێکەوتۆتەوە، ئەگەر لەوێ عەلمانیەت پیرۆزی دارنین بوبێت لە دەسەلات، لێرەسروتێ بووە بۆ بە پیرۆزکردنی سەرکردە و دەسەلاتدارەکان و خستونیەتە سەر و یاسا و لێپرسینەوەوە، کە تەنها دەشێت خوا بەو جۆرە بێت ئەگەر لەوێ دەرگایەك بوبێت کرابێتەوە بەسەر ڕووی داننانو ڕێزگرتن لە جیاوازییەکان، لێرە زیاتر پاساوێك بووە بۆ کوشتنی جیاوازییەکان، سڕینەوە، یاخود هەوڵێ بووە بۆ سڕینەوەی هەموو پنتێکی هێزو دەسەلات کە بکەوێتە دەرەوەی دەسەلاتی سەرکردەی بێ وێنەو نوخبە فەرمانڕەواکەوە ئەمەش لەو سۆنگەوە بووە کە

هەر وەکوو (غلیۆن) بۆی چووە، وڵاتانی ئێمە لە ڕووی مێژووییەوە گرفتی تاکڕەوی سیاسیان هەبووە نەك بوونی دووفاقیی دەسەڵاتی ئاینیو زەمەنی چارەسەری ئەمەش بە دیموکراسیو دیاریکردنی سنوری دەسەڵاتداران دەکرێت، هەروەها پێویستیان بە جۆرێکی تایبەت هەبووە لە مۆدێرنیتەو پەرپێدان، ئەگەر لە ئەزموونە مێژووییەکەی خۆر ئاوادا، جیاکردنەوەی دەسەڵاتی کەنیسە لە دەسەڵاتی سیاسی، دەستکەوتێکی ڕێنیسانسو ڕۆشنگەری خۆر ئاوایی بێت، وە هەر لەوێوەوە پێداویستییەکانی سەر هەڵدانی دیموکراسی هاوچەرخ فەراهەم هاتبێت، ئەوا لە وڵاتانی ئێمەدا لە مێژوو ئێستاشدا بە شێوەیەکە گرفتی سەرەکی هەژموونی دەوڵەت و فەرمانڕەواکانمان هەبووە کە (ئاین)یشیان ملکەچی خواستە دەسەڵاتخوازەکانی خۆیان کردووە، هەر بۆیە کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی ئێمە بە پلەی یەکەم پێویستیان بە جیاکردنەوەی حیزب و حکومەت و دەسەڵاتی سەربازی لە دەسەڵاتی مەدنی و کۆتاییهێنان بە باڵادەستی نەتەوەیی و مەزهەبی لە وڵاتێکی فرەنەتەوە و مەزهەبدا هەیە، ئەگەر ئەمە بە شێوەیەکی گشتی نمونەی ئەو عەلمانیەتە بێت کە لە خۆرهەڵاتدا ئەزموون کراوە بە تایبەتیش لە بەرگە سیاسییەکەیداو بە تایبەتیتریش لە بەرگە شۆڕشگێڕییەکەیدا، ئەوا ئەو ئەزموونە ئیسلامیانەش کە لە سایەی ئەودا سەریان هەڵداوە، ئەگەر لە هەندێ ڕووەوە دەرگایەك بووبن بە ڕووی هاتنەوە سەرخۆدا کرابنەوە، لە چەندین ڕووەوە ئەو فۆرمەی لە دەسەڵاتو حوکمڕانی بەرهەمیان هێناوە، تا ڕادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی هەمان ئەزموونە پێشووە عەلمانیەکە بووەو نەیانتوانیوە لە ئاستێکی بەرچاودا لەسەر ئاستی چەسپاندنی سەرەتاکانی دیموکراسیو پەرپێدانی سیاسییو خۆشگوزەرانیی هاوڵاتیو ئازادیەکان، نموونە کۆنەکە تێپەڕێنن، بۆیە پێمان وایە ئێستا کۆمەڵگاکانی

ناوچەکە لە وانەش کۆمەڵگای کوردستانیی پێویستیان بەوەیە کە هەردوو نموونە عەلمانیو ئیسلامییە باوەکەی ناوچەکە تێپەڕێننو ڕێبازێکی سێهەمو مۆدێلێکی نوێ لە دەسەڵات و حکومەت بێنینە کایەوە کە ئەویش لە دروشمی لە عەلمانی و ئیسلامییە باوەکەوە بەرە و دیموکراسی و دەسەڵاتی خەڵك بەرجەستە دەبێت، مۆدیلێ کە هێزە کۆمەڵاتیەکان و پێکهاتەکانی کۆمەڵگا لە ڕێی ڕێکەوتنێکی تازە، کە دەستوورێکی مەدەنی بەرجەستەی بکات، بچنە ناو پەیوەندیەکی نوێوە، کە بە بڕوای نوسەری ئەم بابەتەش ئەم نموونە تازەیە لە ڕووی تیۆریەوە لە دەستوورەکەی عێراقەوە دەست پێدەکات، (دیارە وەنەبێ ئەم دەستوورەش بێگرفت بێ) ئەگەر ئێمە پێویسیتیمان بە تێپەڕاندنی عەلمانیبوون و ئیسلامیبوونی دەوڵەت و دەسەڵات بێت بەو جۆرەی مێژووی نویی ناوچەکە بە خۆیەوە بینیوە، ئەوا دەستووری عێراق بەرەنجامی سازشی نێوان هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتیيە جیاوازیەکانە بە تایبەتیش هێزە ئیسلامی و عەلمانیەکان، دەستوورێکە شێوازێکی سێهەم لە دەسەڵات پێشکەش دەکات کە لە سنووری پێدارە سیاسییەکان و گەشەی قۆناغەکەدا ڕەنگدانەوەی جوگرافیای حیزبیو هەمەڕەنگی فکریو نەتەوەییو مەزهەبیە وەهێمای سازشی هەردوو تەوژمی ئیسلامیو عەلمانیە لەگەڵ یەکتریدا، واتە ئەگەر جەوهەری عەلمانیەت بریتی بێ لە دابەزاندنی شەرعیەت لە ئاسمانەوە بۆ زەوی، واتە هاوڵاتیانو گەل خۆیان سەرچاوەی ڕەوایەتی دەسەڵاتی خۆیان بن، وە ئەگەر بریتی بێ لە پیرۆزی داڕنین لە دەسەڵاتداران و دەسەڵات وە لە دیدی شوێنکەوتووە لیبراڵیەکانیەوە ژێرخان بێ بۆ سەرخانێ کە دیموکراسییەو، ملکەچ بوونی دەسەڵات بێت بۆ لێپرسینەوەو لێپێچینەوە، ئەوا ئەو دەستوورە هەموو ئەو خواستانەی لە ئاستێکی ماقوڵدا لە خۆگرتووە، ئەم تێگەیشتنەش بۆ عەلمانیەت

دەتوانرێ لە ناو خوودی جەستە ئیسلامییەکدا ڕیشە و ڕەوایەتی بەهێزی بۆ پەیدا بکرێت، لەولاشەوە لە پەیوەندی بە شوێنی ئیسلام لە بورای گشتیدا دەستوورەکە مەشرەب ئیسلامییە، لەبەر ئەوەی کە ئیسلام وەك ئاینی ڕەسمی دەوڵەت و شوناسی زۆرینەی گەلی عێراق و سەرچاوەی سەرەکی یاسادانان ناسێنراوە و بە مەرج دانراوە کە یاسا دەرچووەکان پێچەوانەی نەگۆڕەکانی ئەونەبن، بڕوا بوون بە دیموکراسی و ئازادی گشتییەکانیش ئەو هاوبەشەیە کە هەموو لایەك بە گوێرەی دەقی دەستوور و ماددەکانی دەبێ پابەندی خۆیانی پێوە ڕابگەیەنن ئەمەش وادەکات ئیسلامییەك بۆی نەبێ ڕاڤەیەك لە ئیسلام بکات کەپێچەوانەی سەرەتاکانی دیموکراسی بێت ئەم تێگەیشتنەش لە ئامادەگی ئیسلام لە پێگەی دەسەڵاتو ڕەوانینە بەرامبەری فکریو سیاسی لەم قۆناغەدا دەتوانرێ پشتیوانی هێزە عەلمانیە میانەڕەوەکان بە دەستی بێنێ، ئەمەش وادەکات عەلمانیو ئیسلامیەکان بچنە ناو ئەزموونێکی بەیەکەوە ژیان و هەڵکردنەوە و هیچیان تەماحی کودەتای بەسەر ئەویتردا نەمینێ، بەمەش واتا بۆ کاری نیشتیمانی هاوبەش و ڕێزگرتن لە ڕایێ هاوڵاتیو گۆڕانی ئاشتیخوازانە بگەڕێتەوە، لە باروبۆخێکی لەم جۆرەشدا جگە لەوەی هەستیاری تەوژمەکان بە هۆی تێکەڵاو بوون و لە یەکتر نزیکیانو دادوەری پێش وەخت نەکردن، بەرامبەر یەکدی کەم دەبێتەوە ڕێگاش دەکرێتەوە کە سیستەمەکە بچێتە سەر ڕەوتی گەشەی سروشتی ناوەکی خۆی واتە ڕەنگدانەوەی پەرەسندنەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنیو بونیادە فکریو ڕۆشنبیریو ماددییەکانی کۆمەڵ بێت، بە واتایەکیتر گەر ڕێگا بە ئەزموونەکە بدرێت لەسەر پێی خۆی بووەستێو سیمایەکانی بەرەو کامڵ بوون بەرێت، زەمینە دەڕەخسێنێ بۆ باڵادەست بوونی عەقڵی ڕیفۆرمخوازی، عەقڵێ بەجۆرێ ململانێکان دەبات بەرێوە

ناهێڵێت کۆمەڵگا دووچاری شڵەژانی گەورەی وا بێت کە دەزگاو چوارچێوەو بونیادەکانی توانای پاراستنی زەمینەو ئیرادەی بەیەکەوە ژیانو کاری هاوبەشیان نەبێت، هەڵبەت ئەم ئەزموونە ئێستا لە دەرەوەو لە نێو بڕیار بە دەستە جیهانیەکانیشدا لایەنگرو پیشتیوانی هەیە، ئەم دەستورە ڕێ بە هیچ تەوژمێ نادات پرۆژەیەکی هەبێت بۆ وەلانانی ئەوانیتر لە ڕێی بەکارهێنانی زۆرەوە، بەم جۆرەش ئیسلامییەکانو عەلمانیەکان هەر یەکەیان بەشی خۆیان لە دەستوورەکەدا دەبیننەوە، چوارچێوەیەکیش بۆ بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە پێشنیار دەکات، بە دڵنیایشەوە ڕەنگە هیچیان لە بەشی خۆیان ڕازی نەبن، بەڵام ئەمە ئەو سازشە مێژووییەیەکە دەبێت هەموو لایەك ئامادەی ئەنجامدانی بنو کەس بیر لە قوتدانی کۆمەڵگا نەکاتەوە، سەرەتاکانیش هەمیشە بەشی خۆیان تێکەڵاو بە گیروگرفتو پرسیاری خۆیانن، پەرەسندنەکانی دواتری کۆمەڵگا و ئاڵوگۆڕەکان لەسەر ئاستە جۆراوجۆرەکان ئەو ئەزموونە بەرەو پێشەوە دەبەن و لە ساتەوەختێکیشدا دەتوانن بیکەن بەو چوارچێوانەی کە هەموو لایەك بە هی خۆیانی بزانن، ئامادەیی ئیسلامیش لەم ئاستەدا لە دەستووری کوردستانو وڵاتانیتری ناوچەکەشدا لە قازانجی دیموکراسیو سەقامگیری سیاسیو پاشەکشە کردن بە شەڕە ئایدۆلۆژیاکانو پرۆژە مەیدانییەکانە، هەر بۆیە بۆ ئەوانەی کە هیچ باوەڕێکیشیان بە ئیسلام نییە یاخود لانیکەم بڕوایان بە ڕۆڵی ئیسلام لە بواری گشتیدا نیە، چاوەڕێ دەکرێت لە سۆنگەی زەمینە سازکردن بۆ گەشەکردنی دیموکراسی سەقامگیری سیاسیو پیشتیوانی لەم بۆچوونە بکەن.

ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ ناتوانین ئیسلام لە کۆمەڵگاکانی خۆمان بکەینە دەرەوە،بەڵکو ناتوانین لە بواری گشتیو کایەی سیاسی وەلای بخەین، هەر بۆیە دەبێت

یاسای بنەڕەتی لەم میانەدا ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکان بێت لە نێوان ئیسلام و دەوڵەت و سیاسەتدا نەك لێکدابڕان یاخود بەیەکدادان چونکە ئەم پەیوەندییە قەیراناوییە و پێویستی بە قسە لەسەرکردن و تیۆریزەکردنی نوێ هەیەومەسەلەکە بە عەقڵی سۆزدار چارەسەر ناکرێت چونکە ڕۆڵی (ئایین)پێش ئەوەی پەیوەندی بە دیدو نوسینی چەند نوسەرو ئاواتی هەندێ سیاسییەوە هەبێت، پەیوەستە بە پەرسەندنە مێژووییەکان‌و ئەو قۆناغەی کۆمەڵگاکانی پێدا تێپەڕ دەبێت‌و سروشتی ئاین‌و خودی کۆمەڵگاکان، تێگەیشتن لەو ڕاستییە دەبێتە بەرزکردنەوەی ئاستی واقیعبینی‌و دوورکەوتنەوە لە توندڕەوی، ئەویش بە دڵنیاکردنەوەی ئەم بەشە لە شوناسی کۆمەڵگا لە دەستوردا کە ئیسلام پێکی دەهێنێ لە پاڵ پاراستنی مافـو ئازادیە گشتییەکاندا کارێ دەکرێت کۆمەڵگا لە ئەگەری شەڕو ململانێی ئیسلامی‌و عەلمانی دور بخرێتەوەو پاساوی شەڕی ئایدۆلۆژیاش لە تەوژمی ئیسلامی بسەنرێتەوە، کە ئەو پاساوەش لە پەراوێزخستنی ئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە بە مەش سەرجەم وزەو تواناکان بخرێنە خزمەت پرۆژە نیشتیمانی‌و کۆمەڵایەتیەکان، ئەو ترسەش کە هەندێ جار دەردەبڕێ گوایە ئەم ئامادەبوونەی ئیسلام لە دەستووردا ڕێدەگرێ لە دەرکردنی کۆمەڵێ یاساکە لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆکن، لە ڕووی زانستییەوە ترسێکی زۆر زانستی و جدی نیە، چونکە یاسا شتێ نیە لەسەرەوە بسەپێنرێت‌و جێبەجێبکرێت، یاخود هەر ئەوەندەی دەربکرێت ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی بێنێتە دی یاخود بەبێ ڕازی بوونی گشتی کاریگەر بێت، شارەزایانی بواری فەلسەفەی یاساو کۆمەڵناسی ئەوەیان بۆ ڕوونکردوینەوە کە یاسا ئەگەر ڕەنگدانەوەی فەرهەنگو واقیعی کۆمەڵگا خۆی نەبێ، ناتوانێ ئەو کاریگەریە زۆرەی هەبێت، ڕاستە هەندێ جار یاسا بەشدار دەبێت لە گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، بەڵام

لەهەمان کاتدا ئەوەش ڕاستە کە ئەگەر ئەو یاسایە لانیکەمی ڕەوایەتی فەرهەنگی نەبێ ناتوانێ (اختراق)ی هەناوی کۆمەڵگا بکات، لەو سۆنگەشەوە کە ئەمڕۆ ململانێکان زیاتر لە دەوری هەندێ مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکان کۆبوونەتەوە، نەك مەسەلە سیاسیو ئابووریەکان ئەم مەسەلەیە زیاتر روون دەبێتەوە، وا باشە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەم ڕایەمان نموونەیەك بە یاسای سزادانی عێراقی بێنینەوە، ئەم یاسایە بۆ دەیان ساڵ دەچێ لە عێرقدا مافی ئازادی جنسی بۆ سەرو تەمەنی (١٨)ساڵ مسۆگەر کردووە، بە گوێرەی ئەم یاساییە هەر پەیوەندیەکی سێکسی لە نێوان دوو کەسدا کە تەمەنی یاساییان تەواو کردبێتو زۆر لێ کردن لە پەیوەندیەکەیاندا نەبێت، لە دەرەوەی لێپێچانەوەی یاساییەوەیە، واتە بە تاوان دانانرێتو بەشێکە لە ئازادی فەردی تاکەکان، بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم دەقەدا بە حوکمی زەبروزەنگی هەندێ دابو نەریتی کۆمەڵایەتی ساڵانە دەیان ئافرەت بە تۆمەتی پێ هەڵخلیسکانی سێکسی کە ڕەنگە بەشی زۆریشیان لە هەندێ سۆزگۆڕینەوەی سەرەتاییو گومان تێنەپەڕێ دێنە کوشتن ئەم واقیعە دەری دەخات کە کلتور ڕۆڵی بنەڕەتی دەبینێت لە دیاریکردنی کاریگەری ماددەو بڕگە یاساییەکان نەك خواستی بەشێ لە نوخبە، ئەمەش هەر پەیوەندی نیە بە یاساو (وضعی)ییەکانەوە، بەڵکو تەنانەت ئەحکامە فقهییە ئیسلایەکانیش دەگرێتەوەو گەر نەگۆڕابن بۆ بەشێ لە دابونەریتی کۆمەڵایەتی جێبەجێکردنیان ئاسان نیەو زۆربەی خەڵك پێیانەوە پابەند نابن، بۆ نموونە چەند کەس لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەرگەی ئەوە دەگرێت بچێتە ماڵەوەو پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیدا ببینێ لەحاڵەتی زینا کردنداو خۆی بگرێو دواتر مەسەلەکە بە لێکجیاکردنەوەی قەزایی کۆتایی پێ بێتو تۆمەتی زیناش لە ڕووی یاساییەوە بەسەر ژنەکەیدا نەچەسپێت لە بەر ئەوەی (٤) شایەتی نیە بەو جۆرەی

قورئان داوای دەکات؟ یاخود ئایە هێشتا هەزاران ئافرەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا بونیان نیە کە لە بەشێ لەو مافانە بەهرەمەندنەبوون کە یاسای باری کەسێتی بۆی دەستە بەرکردوون لە کاتێکدا کە یاساکە هەڵێنجراوی مەزهەبە فقهییە ئیسلامیەکانە؟ گەر قسەکان پوخت بکەینەوە دەبێ بڵێین کۆمەڵگای کوردستانی بە قۆناغێکی ڕاگوزەریدا تێپەڕدەکاتو دەخوازێت هێز و تەوژمەکانی خاوەنی کۆمەڵی تێگەیشتنی هاوبەش بن بۆ ڕێکخستنی سیاسیو بەیەکەوە ژیانو ئاراستە کردنی ململانێو کێبڕکێکان، بۆیە ئەو لۆژیکە ڕاستەکە دەڵێ نابێت نموونەی ئێمە نموونە تورکییە کە بێت کە بە زۆر سەرپۆش لەسەری کچە خوێنکارێکی زانکۆ بکاتەوە، هەروەها نابێ نموونە ئێرانییەکەش بێ، کە بە زۆر لەسەری بکات، بەڵکو دەبێت وڵاتی ئێمە وڵاتی ئازادی بێت کە لە سایەیدا ڕێز لە ڕەهەندەکانی شوناس و ئازادی هەموان و پێکهێنەرەکانی فەرهەنگ و پێکهاتەکانی کۆمەڵ بگیرێت، لە دۆخێکی ئاواشدا یەکەم هەنگاو بەرە و دروستکردنی مۆدێلێکی نوێ لە دەسەڵات دەنێین، کە تیایدا دەسەڵات و حکومەت نابێتە ئامرازی دەستی ئایدۆلۆژیایەکی هەژمونخواز و زەمینەی بەشداری سیاسی دەڕەخسێو ئایندەی کۆمەڵگاش مسۆگەرترو سەقامگیرتر دەبێتو شانسی پەرەسەندنی دیموکراسیو لێبوردەییو بە یەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەش چەندقات دەبێتەوە، ئەمەش وا دەکات پشتیوانی کردن لەم سازشەی نێوان هێزەکان لەم قۆناغەدا بکاتە ئەرکێکی نیشتیمانیو دیموکراسی، هێزە سیاسییەکانیش لە بەرەنجامی کۆتایدا ناچار دەکات لە جیاتی خەڵك سەرگەرمکردن بە درووشمی ئایدۆلۆژی پەرگیر و سازماندەرەوە، بیر لەوە بکەنەوە چۆن بگۆڕدرێن بۆ هێز گەلێکی خاوەن پروگرام و کێ بڕکێکەش لە بواری خزمەتکردن بە هاوڵاتیان و کۆمەڵگادا بێت، ئایدۆلۆژیاش لە جیاتی ئەوەی سەرەنێزەی ململانێ و

کەرەسەی سازدانی هەڵگرانی بێت بۆ گیان بەختکردن، بگۆڕێت بە سەرچاوەی ئیلهام لێ وەرگرتن و هاندانی زیندوێتیێ و تازە بوونەوە، ئەو کاتەش ئایدۆلۆژیا ناوەڕۆکە کۆنەکەی لەدەست دەدلو واتا و ناوەڕۆکیکی نوێ وەردەگرێت بەڵکو لە ئایدۆلۆژیاوە دەبێت بە ئایدیا.

## پێگەی ئیسلام لە ڕەشنوسی دەستووردا، و مەسەلەی فرەئایینی لە کوردستاندا

پاش بڵاوبوونەوەی ڕەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستان، چەندین کەس و ناوەند قسەیان لە سەر ماددەی (٧) ی ڕەشنوسی ناوبراو کرد، کە تایبەتە بە دیاریکردنی شوێن و پێگەی ئیسلام لە دەستورەکەو بواری گشتی لە کوردستاندا. بەشێ لە ئیسلامیەکان پێگەی ئیسلامیان بەو جۆرەی لە ماددەکەدا هاتووە پێ لاواز بوو، پێیان وابوو بە بەراورد لە گەڵ ئەوەی لە دەستوری عێراقدا هاتووە زۆر کاڵترە. چونکە نەك شەریعەتی ئیسلام بەڵکو بنەماکانی بە سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسادانان، وە ئەو بڕگەشی تیا نیە کە لە دەستوری عێراقدا هەیەو ڕێ دەگرێت لەوەی هیچ یاسایەك دەربچێت پێچەوانەی ئەحکامە نەگۆڕ و یەکلاکەرەکانی ئیسلام بێت. لە بەرامبەریشەوە هەندێ لەوانەی خاوەن دیدێکی ڕادیکاڵانەتری عەلمانین پێیان وابوو ئەوەی لە ڕەشنوسەکەدا سەبارەت بە پێگە و ڕۆڵی ئیسلام هاتووە زۆرە و دەستوری کوردستان دەبێت عەلمانیتر بێ و مەسەلە ئاینیەکان لە چوارچێوەی پەیوەندی نێوان خواو بەندەدا قەتیس بدات. ئێمە لەم بابەتەدا ناچینە ناو هەموو ئەو مشتومڕانەی دەربارەی ئەم ماددە کراون و ئەو باری سەرنج و ڕەخنانەی دەربارەی ماددەکە خراونە ڕوو، بەڵکو

تەنها مامەڵە لە گەڵ گۆشەیەکی ئەو لێکدانەوە و ڕەخنانە دەکەین کە پەیوەستن بە مەسەلەی ئایینەکانیتر و فرەئایینی لە کوردستاندا و پرسی ئامادەیی ئیسلام لە نێوان کۆمەڵگاو ئیسلامییەکاندا. چونکە هەندێ کەس لە شوێنکەوتەی ئایینەکانیتر و ناوەندە فکری و سیاسییەکەی کوردستان بە گشتی لە قسەکردنەکانیاندا لەو گۆشەنیگایەوە ڕەخنەیان لە ماددەکەو پێگەی ئایینەکانیتر گرت و بە هەڕەشەیان دانا بۆ سەر ئازادی ئاینی لە کوردستاندا! پێشیان لە سەر ئەوە دادەگرت کە ئێمە لە کوردستاندا گرفتی موسڵمان بونمان نییە، هەتا جەخت بکەین لە سەر ڕۆڵی ئیسلام لە دەستوردا! بۆیە هەر لە بنەڕەتەوە ئەم ماددەیە زیادەو دەبوا لە ڕەشنوسەکەدا نەبوایە! چونکە بە بیروڕای ئەوان کوردستان خودان واقیعێکی جیایەو ناکرێت پێوانە بکرێت بە بەشەکەیتری عێراق و وڵاتانیتری ناوچەکە، ئەوەی پێ لە سەربوونی ماددەکەش دادەگرێت، ئیسلامی سیاسی و هێزە ئیسلامییەکانی کوردستانن نەك خەڵك. بە مانایەکیتر داخوازییەکی گروپییە نەك جەماوەری، بەڵام لەم نێوەندەدا چەند مەسەلەیەکی بەرچاو هەیە کە لەم ڕووەوە لە سەر وەستانی ئەوێت و شرۆڤەیەکی زیاتر دەخوازێت.

## ئیسلام و فرەئایینی

ئەوانەی باس لە هەژموون و هەڕەشەی ئیسلام دەکەن بۆ سەر فرەئاینی و ڕێزو ئازادی ئاینەکانیتر لە کوردستاندا بەجۆرێکی وا قسە دەکەن وەك ئەوەی بەڵگە نەویست بێت کە هەموویەهێزبوونێکی پێگەی ئیسلام یەکسان بێ بە تواندنەوەی ئاینەکانیتر!

یاخود چەوساندنەوەی شوێنکەوتووەکانیان و فشار خستنە سەریان لە سەر ئاستی باوەڕ و پەیڕەوکردن و پەرستش و گوزارشت لە خۆ دانەوە، بەڵام پێم وایە لەم بۆچوونەیاندا پشت بە خوێندنەوەیەکی مەعریفی و زانستی قوڵی ئیسلام و تەنانەت خوێندنەوەی واقیعی مێژوویش نابەستن. واتە گرفتی بەرچاویان لە بواری ئیسلام ناسی دا هەیە. چونکە ئیسلام لە سەر ئاستی دەقە دامەزرێنەرەکانی و تەنانەت وەك وتمان واقیعی مێژوویشدا، ئاینێ بووە هەر لە سەرەتاوە دانانی بە فرەئایینی کردووە بە یەکێ لە پایە و سەرەتاکانی خۆی. لە قورئاندا چەندان ئایەت جەخت لە سەر ئازادی ئاینی و ڕەتکردنەوەی زۆر لێکردن لە ئایندا دەکەنەوە و باوەڕهێنان بە ئیسلام دەبەستنەوە بە بڕیارێکی ئازادانەی ناوەکی مرۆڤ خۆیەوە. کە ئایەتی (لا اکراه فی الدین) ناونیشانی گەورەی ئەو هێڵە گشتی و جیهانبینی‌یە دەردەبڕێت. ئیسلام لەو کاتەشدا کە خاوەن ئاینەکانی‌تری وەك بابەتێ بۆ (بانگەواز) کردن و بانگهێشت کردن بۆ لای خۆی تەماشا دەکات، زۆر ڕاشکاوانە ئەوەی ڕاگەیاندووە کە دەبێت بانگەواز بۆ ڕێگەی خوا بە (حیکمەت) و (ئامۆژگاری باشە) و (باشترین شێوازی مشت و مڕ) بێت ﴿ أدع الی سبیل ربّك بالحکمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتی هی أحسن ﴾ لە ئایەتێکی‌تردا ڕاستەوخۆ ئاماژە بە خاوەن کتێبەکان دەکات و دەفەرموێت ﴿ ولا تجادل أهل الکتاب الاّ باالتي هی أحسن ﴾ یان نابێ مشتومڕ لە گەڵ خاوەن کتێبەکانی‌تر بکرێت، یاخود دەبێت لە ئەوپەڕی ڕێز و باشی و شایستەیدا بێت. کە تیایدا ڕێز لە هەست و بیرو باوەڕو بڕیارو ئازادی بەرامبەری ئاینی بگیرێت و شێوازێکی لە هەڵسوکەوتی لە گەڵدا بەکار نەهێنرێت، کە پێچەوانە بێت لە گەڵ سەرەتاکانی دادپەروەری و لێبوردەیی و بە یەکەوە ژیان.

چونکه ئەگەر کوشتنی مرۆڤێك بە بێتاوان بە وێنەی کوشتنی سەرجەم مرۆڤەکان بێت، ئەوا ستەم و سوکایەتیکردنیش پێی، ستەم و سوکایەتیکردنە بە ئینسانیەتی هەمووان.

پێغەمبەریش درودی خوای لە سەر بێت لە زیاتر لە فەرمودەیەکدا هەڕەشە لەو کەسانە دەکات بیر لە ئازاردان و چەوساندنەوەی خاوەن ئاینەکانیتر دەکەنەوە، بە تایبەتیش ئەوانەی لە وڵاتانی ئیسلامیدا لە پاڵ یەکداو لە سایەی یەك دەسەڵاتی سیاسیدا دەژین. چونکە هەر وەك (علی کوری ابی طالب) دەڵێ: (خەڵکی یان لە ئاین و بیرو باوەڕدا براتن، یاخود لە بەدیهاتنندا - واتە لە مرۆڤایەتیدا - هاوتاتن). لە دیدی جیهانبینی یەکتاپەرستی هاوسەنگەوە مرۆڤەکان، بە جیاوازی بیروباوەڕ و ئاین و نەتەوە و نەژاد و ڕەنگ و ڕەچەڵەکیانەوە، برای یەکترین، هەموویان لە یەك ئیرادەی بوونەوە سەرچاوەیان گرتووە کە خوای گەورەیە. واتە لە مرۆڤایەتیدا برای یەکترن. هەر بۆیە پێغەمبەر (د.خ) لە فەرمودەیەکدا جەخت لە سەر ئەو سەرەتایە دەکاتەوە و دەفەرموێت ﴿ **اشهد بأن العباد كلهم اخوة** ﴾ شایەتی دەدا کە بەندەکانی خوا هەموویان برای یەکترین. ئەم ژێرخانەی وێناکردن و جیهانبینییەش لە سەر ئاستی (اصول الفقه)دا دوو ڕێسای گرنگی بەرهەم هێناوە کە یەکەمیان دەربڕی ئازادی ئایینییە و دەڵێ ((**اتروكوهم وما يدينون**)) کە ڕێ دەگرێت لەوەی هیچ کەس و ناوەندو دەسەڵاتێ دەست بخاتە ناو عیبادەت و پەرستش و بیرو باوەڕی خاوەن ئاینەکانیترەوە.

ڕێساکەیتریش باس لە پەیوەندی نێوان ئەوان و موسڵمانانە لە سەر ئاستی کۆمەڵگادا و دەڵێ ((لهم ما لنا وعليهم ما علينا)) ئەوەی بۆ ئێمەیەو مافمانە بۆ ئەوانیشەو ئەوەی ئەرکی سەرشانی ئەوانە ئەرکی ئێمەشە. کە لە پەرەسەندنە

مۆدێرنەکەی بیری سیاسی خۆرئاوادا ئەم ڕێسایە گەشەی کردووە بۆ سەرەتای هاوڵاتێتی یەکسان.

هەر ئەم هەڵوێست و تێڕوانینە ئایینیەشە لە مێژودا بۆتە هۆی ئەوەی جیهانی ئیسلامی بە بەراورد لە گەڵ کۆمەڵگاکانی ئەو کاتەدا، ببێتە مەڵبەندی فرەئاییني. لە گەڵ داننان بەوەی کە لێرەولەوێ و لای ئەم فەرمانڕەوا یاخود فلان والی و لە هەندێ شوێن و کات و برگەی مێژوییدا پێچەوانەی ئەمە ڕەفتار کراوە، وەك بەشێ لەو داڕوخانەی دووچاری کۆمەڵگای ئیسلامی بەگشتی هاتووە، بەڵام گرنگە کە مێژوی ئیسلامی شایەتی قڕکردنی خاوەن ئایینەکانیتر نییە. بەڵکو شوێن کەوتووانی ئاینەکانیتر لە کاتێکدا وەك کۆمەڵێ دورگە لە ناو زەریایەکی موسڵمانشیندا بوون کەچی بۆ سەدان ساڵ لە گەڵ برا موسڵمانەکانیاندا بەیەکەوە ژیاون و پاریزگاری لە سەر و ماڵ و ئایینیان کراوە. تەنانەت کاتێ جولەکەکان لە ئەورووپا و بە تایبەتیش لە ئەندەلوس کەوتنە بەر شاڵاوی چەوساندنەوەی مەسیحییەکان، پەنایان بۆ وڵاتانی ئیسلامی هێناو لێرە پەنادران. ڕەنگە کوردستانی خۆمان یەکێ لەو مەڵبەندانە بێت کە ڕاستی ئەم قسانەمان دەسەلمێنێ. جولەکەو مەسیحی و یەزیدی و خاوەن ئاینەکان بە گشتی لە پاڵ برا موسڵمانەکانیان ژیاون و بەشێوەیەکی گشتیش لێبوردەیی ئاینی بەسەر پەیوەندییەکانیاندا حاکم بووە. تەنانەت مەسەلەی هێرشکردنی پادشای کوێرەش بۆ سەر یەزیدیان، کە هەندێ لەم نێوەندەدا دەیوروژێنن ناکرێ هۆکارەکەی بە پلەی یەکەم بگێڕینەوە بۆ جیاوازی ئاینی، چونکە وەنەبێ ئەو شەڕ و خوێن ڕێژیانە کەم بووبن کە میرنشینەکان لە نێوان خۆیان و دەوڵەتانیتری ناوچەکە لە کێشمە کێشمەکانی نێوانیاندا ئەنجامیان داوە. کە بە گشتی لە سەر دەسکەوت و دەسەلات و دەست

ڕۆیشتویی و فراوانکردنی قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییەکەیان بووە. خۆ ئەگەر بە گریمانەش وا دابنێین کە ئەو هێرشە بە پاڵنەری ئاینی ڕووت بووبێت (کە ئاسان نی‌یە ئەوە بسەلمێ) ئەو کاتە دەتوانین زۆر بە ڕاشکاوی باس لە تێنەگەیشتنی پادشای کوڕە بکەین بۆ ئەو بەشە لە ئیسلام کە پەیوەستە بە مافی خاوەن ئاینەکانی‌ترەوە. چونکە ئەگەر کوشتن و تالانکردنی یەزیدی‌یەکان لە ڕووی ئاینی‌یەوە ڕەوا بوایە، ئەوا ئەوان نەدەگەیشتن بە سەردەمی پادشای کویرەو هەر زوو لە ناو تۆفانێ لە موسڵمان کە هەر چواردەورەی دابوون کۆتاییان پێدەهات و قەڵاچۆ دەکران و دەتوانەوە. چونکە ئەوەی ئەوانی هێشتۆتەوە توانا و هێزی خۆیان نەبووە. بەڵکو ئەوەی پارێزگاری لێ کردوون ئەو حەسانەو هەڵوێستە ئایینی‌یە بووە کە ئیسلام بەرامبەر ئایینەکانی‌تر هەیبووە و نیشانی داوە.

هەڵبەت ئەمە بەو مانایە نی‌یە کە فۆرم و ئاستەکانی فرەیی‌ئایینی لە مێژووی ناوچەکەدا دێنین و لە ئێستادا تەرحی دەکەینەوە. یاخود لە ڕوانگەی خودی دەقی دامەزرێنەری ئیسلام (قورئان) خۆیەوە ڕەخنەمان لەو واقیعە نەبێت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لە سیاقە مێژوویی یەکەی خۆیداو لە دنیای کۆندا فراوانترین دیدی لێبوردەیی و کراوەیی و فرەئایینی لە دنیای ئیسلامی‌دا بووە، ئەم گەڕانەوەشمان بۆ مێژوو بۆ کوشتنی سەرچاوەکانی تەنگبینی ئاینی و سەلماندنی ئەو دیدەشە کە دەڵێ ئەگەر لە مێژوویەکدا کە فرەئاینی تیایدا نامۆو نا ئاسایی بووەو جیاوازی ئاینی کارەساتی ناوەتەوە، واقیعەکە بەو جۆرە بوو بێت، داخۆ دەبێت لە ئێستادا کە مۆدێرنەی فکری و سیاسی مەسەلەی فرەیی و لێبوردەیی ئاینی گەیاندۆتە ئاستێکی هەستیاری ئەخلاقی و شارستانی و سیاسی و یاسایی چۆن مامەڵە لە گەڵ ئەو مەسەلە هەستیارەدا بکەین؟.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین لە پاڵ ئەو هەڵوێستە ئاینی و ژیاریيە بەرامبەر دیاردەی فرەیی و جیاوازی ئاینی. هەڵوێستێکی‌تری تراژیدی و ناهەموار بەرامبەر فرەیی سیاسی،نزیکەی سەراپای مێژوی سیاسی ئیسلامی تەنیوە. واتە لە کاتێکدا موسڵمانان لە گەڵ خاوەن ئاینەکانی‌تردا لێبوردە بوون. لانی‌کەم چەوساندنەوەو کوشتن و دەست گرتن بە سەر ماڵیاندا بە حەلاڵ نەزانیوە،بە زۆر و سەرەنێزە وازیان پێ لە ئاین و بیرو باوەڕەکانی خۆیان نەهێناوە، کەچی لە ناو یەکتردا لە ئاستی فرەیی. سیاسی و بەڕێوە بردنی دەسەلاتدا، لە چەندین عەلّقەی مێژوی ئیسلامیدا بەرامبەر یەك نا لێبوردە و نا میهرەبان بوون. چڕبونەوەی‌دەسەلات لە دەستی سوڵتان و میرێکدا و شەرعیەتدا بە هێز و شمشێرو (غلبة) بۆ جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتنە دەست و نە دۆزینەوەی میکانیزمێ بۆ ڕێکخستنی جیاوازی‌یە سیاسی‌یەکان و دەزگاو دامەزراوە گەلێك بۆ دابەشکردنی سامان و دەسەلات و مسۆگەر کردنی بەشداری سیاسی و ڕاگرتنی هاوسەنگی‌یەکان و دورخستنەوەی شمشێر لە چارەسەرکردن و بە لاداخستنی ناکۆکی‌یە سیاسی‌یەکان و گرفتی دەسەلات دا، ئەمانە بە گشتی کێشەیەکی گەورەی فکرو واقیعی سیاسی مێژویی جیهانی ئیسلامی بوون و عەقڵی ئیسلامیی نەیتوانیوە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە. ئێستاشی لە گەڵدا بێت پرسی فرەیی سیاسی و بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە لە سایەی دەسەلاتێکی کراوەو دادپەروەردا، کە مافی هەموو لایەنەکان ڕەچاو بکات، بیرۆکەی وەلانان و پەراوێز خستن و بێبەشکردن، بەڵکو هەندێ جار تواندنەوەی هەندێ لایەنی لە سەردا نەبێت، لە گرنگترین ئەو پرسانەیە کە لە وڵاتانی ئیسلامی‌دا پێویستی بە قسە لە سەر کردنی جدی و چارەسەرکردن و ڕەخنە لێگرتن و تێکۆشانی فکری و سیاسی هەیە.

## پرسی ڕۆڵی ئیسلامله نێوان کۆمەڵگا و ئیسلامییەکاندا

ئەو باری سەرنجەی دەیەوێت مەسەلەی ڕۆڵی ئیسلام لە تەوژمە ئیسلامییەکەدا کورت بکاتەوە. قوڵی زۆری تێدا نییە، بەڵام گەر بابەتەکە بەو جۆرەش بێت هێندە لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. ڕاستە کۆمەڵگای ئێمە ئەمڕۆ لە حاڵەتێکدایە هێزە سیاسییە جەماوەری و دەسترۆیشتووەکان چیان بوێت تێپەڕی دەکەن و ڕەوایەتی یاسایی پێدەبەخشن. ئەو مەسەلە ئیسلامیانەش کە مۆرکێکی سیاسیان هەیە، کاردانەوەی زۆری جەماوەری ناوروژێنن، بەڵام ئەمە هەموو چیرۆکە کە نییە، وە ناتوانێ یەکلاکەرەوە بێت لە مەسەلەی دەستنیشانکردنی ئاستی ئامادەگی ئیسلام لە ناو کۆمەڵگادا و ئەو ڕۆڵەی لە قوڵاییە شاراوەکاندا و لە سەر ئەست و ئاراستە کردنی تاکەکاندا دەیبینێت. ئەو بێ باکی و گوێ پێ نەدانە بە پلەی یەکەم بەرەنجامی هەڵوێستێکی فکری و ئایدۆلۆژی نییە. هێندەی ئاماژەیەبە بوونی ئەولەویەتێکیتر لە ژیانی مرۆڤی کوردا، کە ئەویش کێشەی نەتەوایەتییە. چونکە بە شێوەیەکی ئاسایی مەسەلەی شوناسی دەسەڵات و ئەو مشتومڕانەی لەم ڕووەوە دەکەونەوە، دەکەونە دوای دروست بوونی قەوارەی نەتەوەیی یەوە. لە هەندێ ڕوشەوە نارەزایی دەربڕینە بەرامبەر گوتاری تەوژمی ئیسلامی سیاسی و بە تایبەتیش بەشێ لەو تەوژمە، لە ژێر کاریگەری ئەو جەنگە دەروونییەی لە ساڵانی ڕابردوو ئاڕاستەی کراوە، لە گەڵ هەڵەکانی خۆی و ئەو گرفتەی لە سەر ئاستی گوتاردا هەیەتی. مەبەستمە بڵێم ئەو ژێرخانە فەرهەنگی و مێژوویی یەی ئیسلام لە ناو گەلێکی موسڵماندا پێکی دەهێنێ لە پاڵ تێکەڵاوبوونی بە مەسەلەی دەسەڵات بۆ ماوەی (١٣) سەدە زیاتر و بوونی تەوژمێکی

ئیسلامی بەربڵاو لە سەر ئاستی جیهانی ئیسلامی، کە خۆی لە سەر ئەو مەرجەعیەتە حساب دەکات، زۆر لەوە قوڵترە بە بەئاڕاستەیەکی برگەیەکی مێژوویی ڕای گشتی، لە وڵاتێکیشدا کە ڕای گشتی لە گەڵ گرفتی گوزارشت لە خۆدانەوەدا ڕو بەڕووە، حوکم بە سەر پێگەو ئامادەیی ئەودا بدرێت. بۆ نمونە لە سی و چل و پەنجاکانی سەدەی ڕابردووی تورکیاداو لە سایەی کەمالیزم دا ڕوخسارەکانی ئیسلامی لە زۆر بواری ژیانی هاوچەرخی تورکیادا شاردرانەوە، بەڵام چونکە وەك ژیلەمۆ هەرمابۆوە لە حەفتاکان و هەشتاکان و نەوەدەکاندا جارێکیتر تەنانەت لە سەر ئاستی سیاسیشدا خۆی نواندەوە. بۆیە کاتێك ڕەگەزێکی کلتوری یاخود سەرچاوەیەکی سازماندان، لە قۆناغێکدا بە هۆی هۆکاری جۆراوجۆرەوە دووچاری سستی دەبێت، مانای وا نی‌یە لە دۆخ و کەش و هەواو سەردەمێکیتردا چالاك نابێتەوەو خۆی نمایش ناکاتەوە. لێرەشەوە گەر پێمان وا بێ قسە کردن لە سەر ڕۆڵ و پێگەی ئیسلام لە بواری گشتی کوردستاندا قسە کردنێکی دروستکراوی دەستی ئیسلامی‌یەکانە، گەر لە ڕوکاردا وابێت لە قوڵایدا بە هەڵەدا چووین، چونکە ئیسلام بە تایبەتیش لەو شوێنانەی مژدەکان نایەنە دی و سیاسەت لە قەیراندا دەژی، هەمیشە وەك سەرچاوەیەکی ئاڕاستەکردنی ناڕەزایەتییەکان و خواستە وەڵام نەدراوەکان خۆی نمایش دەکات و وەك دوایەمین قەڵای خەڵکە موسڵمانەکە خۆی دەخاتە ڕوو.

هەڵبەت مەرج نی‌یە ئەو خۆ خستنە ڕوە یەك شێوە و فۆرمی هەبێ،بۆ نمونە وەك ئەوەی ئیسلامی‌یەکان دەیخەنە ڕوو، بۆیە شوناسی دەسەڵات لە ناو وڵاتانی ناوچەکەدا یەکێکە لەو مەسەلانەی تا ئێستا یەکلایی نەبۆتەوە. بە بڕوای منیش ئەم گرفتە نە بە عەلمانی ڕادیکاڵ و نە بە ئیسلامی ڕادیکاڵ یەکلایی ناکرێتەوە، چونکە هەردووکیان گرەو

له سه‌ر پێدراوه كاتی‌یه‌كان ده‌كه‌ن و له ئالۆزی شوناسی هاوچه‌رخی ئه‌م وڵاتانه تێناگه‌ن و دیدیان بۆ ئاراسته كردن و چاره‌سه‌ره‌كان به پله‌ی یه‌كه‌م ئایدۆلۆژی‌یه نه‌ك زانستی و مه‌عریفی. به‌ده‌ر له‌مه‌ش گه‌ر واش دابنێین كه گرفته‌كه به ته‌نها گرفتی ته‌وژمی ئیسلامی‌یه. ئه‌گه‌ر واش بێت ئایه ئه‌م گرفته چاره‌سه‌ركردنی ناوێت؟ ئایه ته‌وژمی ئیسلامی به‌شێ نی‌یه له پێكهاته‌ی سیاسی و فكری و جه‌ماوه‌ریی كوردستان ؟ ئایه ململانێی نێوان ده‌وڵه‌ت و ته‌وژمی ئیسلامی له چه‌ندین وڵاتدا، نه‌بۆته سه‌رچاوه‌ی نه‌هامه‌تی و جۆره‌ها ده‌رهاویشته‌ی نێگه‌تیف و نه‌خوازراوی له دوای خۆی به جێ نه‌هێشتووه ؟ گه‌ر وه‌ڵامه‌كه به‌ڵێ بێت، ئایه وڵات و گه‌لی ئێمه له دۆخێكی وا ناسكدا كه پیایدا تێپه‌ر ده‌بێ، له هه‌موو كه‌س زیاتر پێویستی به له خۆ گرتنی ئه‌م ته‌وژمه نی‌یه له ناو دام و ده‌زگا ده‌ستوری‌یه‌كانی خۆیدا ؟ ئایه بونیاده سیاسی‌یه‌كه‌ی سیستمی سیاسی ده‌وڵه‌تێكی وه‌كو ئیسرائیل توند ڕه‌وترین حیزبی ئاینی له خۆ نه‌گرتووه و نه‌یكردووه به به‌شێكی جیانه‌كراوه له دیمه‌نه سیاسی‌یه‌كه؟. به كورتی گرفتی ئیسلامی‌یه‌كانیش كه‌م نی‌یه،بۆیه ئه‌و دیده‌ی كه پێی وایه ده‌بێ دیدی وان ڕه‌چاو نه‌كرێت ئه‌و دیده‌یه كه كه‌ره‌سه‌ی شه‌ڕی ئایدۆلۆژی ده‌داته ده‌ستی ئیسلامی‌یه‌كان، دیدێكه دوور مه‌ودا و قوڵ نی‌یه، به‌و جۆره بیر ناكاته‌وه كه زه‌مینه‌ی به‌یه‌كه‌وه هه‌ڵكردن و ژیانی پێكه‌وه‌یی بۆ هێزه جیاوازه‌كان بخوڵقێنێ، بۆ ئه‌وه‌ی به‌ربه‌سته‌كانی نێوانیان كاڵ بێته‌وه‌و پیرۆزیش له كێ بڕكێ سیاسی‌یه‌كان دابنرێن و كۆمه‌ڵگاش خاوه‌ن كۆمه‌ڵێ نه‌گۆڕ بێت كه مه‌رزه‌كانی ژیانی سیاسی پێكبێنن. بۆیه گه‌ر ده‌ستور و مۆدێله سیاسی‌یه‌كه‌ی ئێمه به سود وه‌رگرتن له هه‌ڵه‌ی ده‌وروبه‌ر بتوانێت نمونه‌یه‌كی نوێ له‌م به‌یه‌كه‌وه ژیان و

چارەسەر کردنی گرفتی فرەیی‌یە سیاسی و ئایدۆلۆژیە بخاتە ڕوو، کارێکی کردووە لە قازانجی ئێستا و دوارۆژی خۆی و گەل و ولاتەکەی.

## هەوڵی لاوازکردنی پێگەی ئیسلام و مەسەلەی فرەیی و ئازادی ئاینی

لێرەوە جێگای خۆیەتی ئاماژە بە ڕوویەکی‌تری مەترسی‌یەکانی ئەو دیدە بۆ سەر فرەئاینی لە کوردستاندا بکەین کە دەیەوێت ڕۆڵی ئیسلام لە دەستوردا نا دیدە بگرێت و هەموو ئامادە بوونێکی ئیسلام با لەو ئاستەشدا بێت کە لە ڕەشنوسی دەستورەکەدا هاتووە یەکسان بکات بە هەڕەشە کردن لە ئازادی و فرەئایینی. وە ڕەچاوی دیدی ئیسلامی‌یەکان ناکات لە نوسینەوەی دەستور کە مۆدێلی دیموکراسی(توافق)ی ئاراستەی داڕشتنی دەکات. ئەمیش لەو سۆنگەوە کە ئەو مەترسی‌یە ئیسلامی‌یەی ئەوان باسی دەکەن لە ئەم ڕەشنوسە و لە واقعیشدا بوونی نی‌یە. چونکە ڕەشنوسی دەستورەکە تەنها لەو ماددە پێکنەهاتووە بەڵکو گەر واش بوایە خودی ئیسلام بەو جۆرەی ئاماژەمان پێکرد فرەئاینی لە خۆ گرتووەو تەنها پەرەپێدانی ڕەنگدانەوەو بەرجەستە بوونەکانی دەوێت بەو جۆرەی کە سازگار بێت لە گەڵ ئەو دۆخە سیاسی و یاسایی یەی مۆدێرنەی سیاسی خوڵقاندویەتی. لە ڕەشنوسی دەستوردا چەندین ماددەی‌تر هەیە کە جەخت لە سەر ماف و ئازادی‌یە سیاسی و مەدەنی‌یەکان لەوانەش ئازادی و مافە ئاینی‌یەکان دەکەنەوە و هاولاتیانی کوردستان بە جیاوازی ئایینی و نەتەوەییانەوە بە چاوی یەکسان تەماشا دەکات و دەستەبەریەکانیش بۆ هەموانە بە یەکسانی. لە ئەمڕۆشدا کوردستان گرفتێکی نیە بە ناوی گرفتی جیاوازی ئاینی، بۆیە

گەورەکردنی ئەم مەسەلەیە مەبەستێکی ئایدۆلۆژی سیاسی لە پشتەوەیە و گوزارشت لە پێداویستی‌یەکی واقعی ناداتەوە. دەستور ڕێگر نی‌یە لەوەی هەر هاوڵاتی‌یەکی ناموسڵمان لە کوردستاندا متمانەی خەڵك بە دەست بێنێ ببێتە سەرۆکی هەرێم یاخود سەرۆك وەزیران. سوپاس بۆ خوا براکانمان لە پەیڕەو کەرانی ئاینەکانی‌تر بە دەست نەبوونی ئاسایشەوە لە سۆنگەی جیاوازی ئاینی‌یەوە ناناڵێنن. زەقکردنەوەی ئەم پرسەش گەر بە هۆشیارانە مامەڵەی لە گەڵ نەکرێت خۆی لە خۆیدا دەبێتە مەترسی بۆ سەر فرەئاینی‌یە کە. واتە ڕێك بە پێچەوانەوە دەشکێتەوە، چونکە گەر لە ژێر فشاری ئەم دیدەدا پێگەی ئیسلام لەوە لاوازتر بێت کەلە ڕەشنوسەکەدا هاتووە، کە ئیسلامی ڕادیکاڵ لە کوردستاندا پێی قایل نی‌یە - ئەوا شەڕی ئایدۆلۆژی و ئیسلامی و عەلمانی پەرەدەستێنێ، لەو کاتەشدا مەترسی ئەوە هەیە کە ئەگەر مەسەلەی بوونی ئاینەکانی‌تر بکرێت بە پاساوی لاواز کردنی پێگەی ئیسلام لە دەستوردا نەك هەر لە سەر ئاستی ئیسلامی ڕادیکاڵ، بەڵکو لە سەر ئیسلامی میللی و ئاستی موسڵمانی ئاسایشدا هەستی سەلبی بەرامبەر ئەو بەشە لە هاوڵاتیانی وڵاتەکەمان دروست ببێ و بەمەش مەسەلەکە بە پێچەوانەوە بشکێتەوە. مەسەلەی تەوزیفکردنی ئایدۆلۆژی و سیاسیانەی ئاینەکانی‌تر لە کوردستاندا مەسەلەیەکی ناسکەو دەبێت بە واقیعی و لە چوارچێوەی سروشتیی خۆیدا باس بکرێت. بۆیە پێویستە ئەوەی ئەوان داوای بکەن ئازادی ئاینی و فرەیی و مافی هاوڵاتێتی یەکسان بێت هەموو ئەو مەسەلانەش لە ڕەشنوسەکەدا دەستەبەر کراوە گەر دەستەبەری‌تریش هەبێ لەچوارچێوە ئاسایی‌یەکاندا زیاد بکرێت شتێکی ئاسایی‌یە.

خستنە ڕووی مەترسیش بە هۆی پێگەیەکی مام ناوەندی بۆ ئیسلام لە دەستوردا کە هێمایە بۆ ڕێکەوتنێکی نێوان تەوژمەکانی کۆمەڵگاو گەیشتن بە چارەسەرێکی مام

ناوەندی، هەروەها ئاماژەیە بە مۆدێلێکی بە مەدەنی کراوی ئیسلامیی بوون بەڵکو گەر ڕوونتر بڵێین مۆدێلێکی تا ڕاددەیەکی بەرچاو بە عەلمانی کراو کە سەرەتاکانی هاوڵاتێتی یەکسا ن و یەکسانی ژن و پیاوو ئازادی بیرو باوەڕو ئاین و کاری سیاسی و سەرجەم ماف و ئازادییەکانیتر و دیموکراسی بوونی مۆدێلی دەسەڵات دەبنە چوارچێوەی تیۆری بۆ لێکدانەوەو ڕەنگدانەوەکانی، بێ پاساوەو ئاماژە نییە بە تێگەیشتنێکی قوڵ و هاوسەنگ بۆ واقیعی وڵاتانی ناوچەکە کە کوردستانیش بەشێکە لەو واقیعە گەرچی بە هەندێ جیاوازیشەوە بێت.

### واقیعی کوردەواری، لە نێوان دوو شێوازی فەرامۆش کردن و ستەم لێکردندا

پێکهاتەی دەرونی و عاتیفی و سیستمی ڕەوشتی بەهاکان لە ناو گەل و نەتەوەیەکی دیاری کراودا بە درێژایی ڕۆژگارو قۆناغە مێژووییە جۆرو جۆرەکان دروست دەبێت. هەر بۆیە ڕەگ و ریشەی قوڵیان هەیە و چەندەها هۆکار و کارتێکەر دەوریان لە دارشتن و خەملاندنیدا هەیە.

گەلو نەتەوەی ئێمەش لەم یاسایە بەدەر نییە، بە درێژایی قۆناغەکانی گەشەکردنی خۆی، رشتەی بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەکانی هاتونەدی و، جێگای خۆیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆحی و فەرهەنگی خەڵکیدا کردۆتەوە، بە تایبەتی بۆ زیاتر لە (١٤) سەدە دەچێ ئیسلام وەك کارتێکەرێکی کاریگەر، کاری خۆی لە کەسێتی مرۆڤی کورد دەکات...

دیاره مەبەستم ئەوە نییە بڵێم لەم ماوە دوور و درێژەدا، ئیسلام وەك ئەوەی كە هەیە و پێویستە، لە ژیانی كۆمەڵایەتیو ئابووری و سیاسی خەڵكیدا ئامادەیی هەبووە، نەخێر، چونكە زۆرجار و ئێستاش لە زۆر شوێنی وڵاتەكەمان و ناو گەكەماندا كۆمەڵێ عورف و داب و نەریتی كۆمەڵایەتی ڕوكەش كراو بە ئیسلام، یاخود هەر خۆی سەربەخۆ، سیما و پێوەرەكانی بەشێ لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك دیاری دەكەن.

هەر چۆنێ بێ تێكەڵاو بوونی كورد لەگەڵ ئیسلامدا، بە چاوپۆشین لەو دواكەوتوویی‌یە فكری و ژیارییەی لەم چەند سەدەیەی دووایدا هەبووە و ژیانی بەرەو وشكهەڵاتن و دواكەوتن برد، تێكەوڵاوبوونێكی ڕوحیو فەرهەنگی بووە، لە ڕوویەكیترەوە بەشدارییەكی شارستانیو ژیاریی بووە، دەرك كردنی ڕەهەند و قوڵایی ئیتیجاهی ئیسلامی گەلی كورد و دیاریكردنی كاریگەری ئەو لەسەر جۆری داڕشتنی كەسێتیو ئەندازەی بەشداری كردنی لە خەملاّندنی ژیانی ڕوحیو كولتوری كۆمەڵگای ئێمە، شتێكی هەتا بڵێی پێویستە بۆ سەرجەم ئەو شەپۆلە فكری وسیاسیو ڕێبەر و جوڵانەوانەی دەیانەوێ لەناو كۆمەڵدا، ئاڵوگۆڕ بەدی بێنن.

چونكە فەرامۆش كردنی ئەم ڕەهەندەی كەسێتی كورد، وە ئەم ڕووكارەی كوردەواری، بەرەو خوێندەویەكی كاڵو كرچو ناتەواوی ڕەوشو ژیانی خۆمانمان دەباتو، ڕێ لەوە دەگرێ بتوانین تێگەیشتنێكی ڕاستو دروستو زانستیمان هەبێت بۆ سورشتی پێكهاتەی كۆمەڵایەتیو، جۆرو قەبارەی بەربەستو ئاستەنگەكانو، دیاری كردنی قەیرانو تەنگژەكانو، دانانی ڕێگەچارەی گونجاو بۆ دەربازبوونو چاكسازیو گۆڕان.. دەتوانین بڵێین لە ساڵانی ڕابردوودا چەندین شەپۆلی فكریو سیاسی، لە هەردوو بازنەی مەرجەعیەتی فكری خۆرئاواییو ئیسلامی دا، دەرك نەكردنی دروست بەو

ڕاستی‌یەی لە پێشەوە باسکراو، ڕەچاو نەکردن‌و بایەخ پێنەدانی بە گوێرەی پێویست، تووشی جۆرێ لە خوێندنەوەی ڕووکەشانەی کردوون بۆ واقیعی کۆمەڵگای کوردستان‌و مرۆڤی کورد.

هەندێ شەپۆلی سەر بە مەرجەعیەتی بیری خۆرئاوا لە کوردستاندا، تێز و جیهانبینی و بەرنامەی پەروەردەیی‌و چاکسازی‌و جۆرێ ئاراستە کردنی خۆی لەسەر ئەو بناغە داڕشتبوو کە ئیسلام ئەو کاریگەرییەی جارانی لە ژیانی خەڵکیدا نەماوەو، لە ژێر فشاری شەپۆلی فکری‌و فەرهەنگی‌و، شاڵاوی ژیاریی‌و ئاڵ‌و گۆڕەکانی جیهاندا، ئەمیش زیاتر پاشەکشە دەکات‌و پانتایی کارتێکردنی کەم دەبێتەوەو، لە سوچێکی تەسکی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکیدا دەمێنێتەوەو، لە باشترین حاڵەتا دەبێ بە بەشێ لە کەلەپوری نەتەوەیی - هەر بۆیە لە گوتاری فکری‌و سیاسی خۆیدا نەك هەر ئەو ڕەهەندە یەکلاکەرەوەی مرۆڤ و مێژوو واقیعی کوردی فەراکۆش دەکرد و دەیویست لەبیر خەڵکی بەرێتەوە، بەڵکو هەندێ جار لە ئەندێشەی ڕێبەرانی فکری ئەو گوتارو تەوژمەدا، ئەوەیش هەبوو کە کاری بۆ لاواز کردن‌و سڕینەوەو پەراوێز کردنی بکرێت‌و هەوڵ بدرێت لە یاداوەری گشتی خەڵکیدا بکرێتە دەرەوە، یاخود ببێ بە ژێر دارو پەردووی واقیعێکی ناهەموار و مەرگەسات‌و تاریکەوە، دیارە خوێندنەوەی ماتریالیانەی مێژوو و، لێکدانەوە واقیعی کۆمەڵایەتی و کەسێتی کورد لە ڕوانگەی تیۆرە کۆمەڵناسی‌و مێژوویی‌و دەروونی‌یەکانی خۆرئاواوەو، حساب نەکردن بۆ جیاوازی‌یە مێژوویی‌و فەرهەنگی‌یەکان‌و، بەکار هێنانی پرۆگرام‌و پێوەرەکانی ئەوان بەشێوەیەکی ڕەها، هەروەها ئەو گۆڕانە ڕواڵەتیەی لەبەرەنجامی شاڵاوی فکری‌و فەرهەنگی‌یەوە بەسەر هەندێ لە توێژەکانی نەوەی نوێوە بەدەر کەوتبوو، وای لێ کردبوون باوەڕ بەوە بێنن، کە بوژانەوەو سەربەرز

کردنەوەی ئیسلام‌و جارێکی‌تر ئامادەبوونەوەی جدیانەی لە ژیانی فکری‌و سیاسی‌و فەرهەنگی کۆمەڵگادا، شتێکە جێگای بیر لێ کردنەوە نیە، چونکە ئیسلام نەناسیش جگە لەو هۆکارانەی لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا هۆکارێکی‌تری ئەم ئاژاوە فکرییە بووە، هەر ئەمەشە تاکو ئیستاش وا لە هەندێ ناوەندی ئەو تەوژمە دەکات کە ژیانەوە ئیسلامی‌یەکەو گەشانەوەی پشکۆی ئیسلامەتی‌و گەڕانەوە سەریەخۆو ئاوێتە بوونی بە ژیانی بنکەیەکی جەماوەری بەرین‌و، شوێن پەنجە دانان لەسەر بەشێکی‌تری خەڵکی، پێ لێك نەدرێتەوە.

لەبەرامبەر ئەمەشەوە لەگەڵ گەشەکردنی بەربڵاوی تەوژمی ئیسلامیی لە کوردستاندا کە لەسەرەتای هەشتاکانەوە قۆناغێکی پەلهاوێشتنی خۆی دەست پێکردو دوای ڕاپەڕینیش بەیەکجاری بوو بە بەشێ لە واقعی فکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردەواری، لێرەو لەوێ هەست بەوە دەکرا کە هەندێ دەنگی سەر بەم تەوژمە، هەروەك شەپۆلەکەی پێشوو، بەڵام بەجۆرێکی‌تر و بەڕووکارێکی‌تردا لەخوێندنەوەی سروشتی کەسێتی کوردو واقیعی کۆمەڵگای کوردیدا بەهەڵەداچوون و نەیانتوانی واقیعی فکری و فەرهەنگی و ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا وەك پێویستە هەڵسەنگێنن. دیسانەوە ئەمانیش ڕواڵەتی شتەکان تووشی جۆرێ لە ڕەشبینی و نائومێدی کردبوون بەرامبەر تاك و کۆمەڵگای کوردی. کە ئەمەش هەندێ جارو لای هەندێ کەس بڕیاری ئایدۆلۆژی توندی بەدواوە بوو، بەڵام بەتێپەڕینی ڕۆژگارو دەوڵەمەندبوونی ئەزموونەکان و زیاتر گەشەکردنی هۆشیاری سیاسی و فکری و کۆمەڵایەتی و، بەسەیرکردن و سوود وەرگرتن لە ئەزموون و ئاڵوگۆڕەکان لەسەر ئاستی ناوچەکەو جیهاندا، کەموکورتی هەردوو تێڕوانینەکە بۆ خاوەنەکانیان و جەماوەریش زیاتر دەرکەوت و، ئەمانیش گەر

بەتەواویش وازیان لەو تەوژمە بیرکردنەوە نەهێنابێ، بەزۆریێ لەتێزو بیرکردنەوەو تێڕوانینەکانیاندا چوونەوەو، لەئاستێکیشدا لەگوتاری سیاسی و فکریاندا ڕەنگی دایەوە. ئەمەش شتێکی سروشتی و چاوەڕوان کراوە، چونکە لەڕووکارێکیترەوە بەرەنجامی گەشەی کۆمەڵگای کوردەواری و گۆڕانە جیهانییەکانە. دیارە بۆئەوەی حوکم بەسەر ئاراستەو هەست و نەست و شێوازی بیرکردنەوەو ژیانی گەلێکی چەوساوەو بن دەستی وەکو کوردا بدرێت، کە ساڵەهای ساڵ بەپێچەوانەی خواست و ویستی خۆیەوە، دەرەتێنرێ و کەسێتی دەشێوێنرێ و هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەو لاوازکردنی ئینتمای ئیسلامی نەتەوەیی دەدرێ، دەبێت داوای ئاستەمی لێنەکرێت، دەبێ دەرفەتی بۆ بڕەخسێ تاگوزارشت لەناسنامەو ئینتیمای خۆی بداتەوە.

ئێستا ئەگەر لەم ڕووەوە نمونەیەك بێنینەوەو سەیری پێشوازی گەرمی خەڵکی کوردستان و موسڵمانانی گەلەکەمان بکەین بۆ مانگی پیرۆزی ڕەمەزان ـ بە ژن و پیاو و لاو و پیرو توێژە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە جۆراوجۆرەکانەوە ـ دەگەینە چ بەرەنجامێ؟

لەڕاستیدا دەگەینە چەندەها بەرەنجامی گرنگ کە زیاتر هانمان دەدا بە تێڕوانینەکانماندا بچینەوە و ئەوانەمان کە بەهەڵەداچووین لەبەر ڕۆشنایی واقیع و دیمەنی شکۆداری جەماوەردا ڕاستیان بکەینەوە. لەو بەرنجامانەش:

یەکەم: تێکەڵاوبوونی ئیسلام بە ویژدان و فیکرو ژیانی کۆمەڵایەتی و فکری و ڕۆحی خەڵکی کوردستان، ڕەگ و ڕیشەیەکی قوڵ و کاریگەری هەیە ـ بەجۆرێ کە بۆهیچ هێزو شەپۆلێکی فکری و سیاسی ئاسان نییە نکوڵی لەو ڕاستیە بکات و، بتوانێ تاسەر گەلی

کورد بەئاڕاستەیەکی پێچەوانەی ئەو حاڵەتەدا بەرێت.. دەرك کردنی ئەم ڕاستیەش کاردەکاتە سەر تێڕوانینی فکری و داڕشتنی بڕیاری فەرهەنگی و سیاسیمان.

دووەم: بەگشتی وەك ئاکامێکی خاڵی یەکەم ئینتیمای تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە بۆ ئیسلام، ئینتیمایەکی ڕەسەنە. ئەگەر بەهۆی چەندەها هۆکاری بابەتی و خودییەوەو لەبەر باری ناهەمواری گەلی کوردو واقیعی پرکوێرەوەری و چەرمەسەری... هتد ئەم ئینتیمایە لەڕابردوودا وەك پێویست نەبووبێ بەئینتمایەکی فکری، ئەوا لانیکەم وەك ئینتیمایەکی ڕۆحی و ویژدانی و ئەخلاقی و بەگشتی فەرهەنگی ماوەتەوە، کە ئەمەش سەرەتایەکی گرنگە بۆ گۆڕینی بۆ ئاراستەیەکی فکری و ژیاری و جۆشدانی ئەو جەماوەرە لەچوارچێوەی پرۆژەیەکی ئیسلامیی نیشتمانیی کوردیدا و، بەکارهێنانی سەرجەم ئەو مەخزونە بۆسەربەرزی هەڵسانەوەو گۆڕانی کۆمەڵگاو بنیاتنانەوەی تاکی کوردی.

سێیەم: سەرەڕای دەیان ساڵ لەشاڵاوی فەرهەنگی و بوونی تەوژمی فکری جۆراوجۆرو نەخشەو پیلانی داگیرکەرانی کوردستان، بۆ شێواندنی ڕەوشت و ڕماندنی بنەماکانی بەها باڵاکانی کوردەواری، ئەو شاڵاوە تەنها شوێنەرواری بەسەر بەشێ لە ڕواڵەت و ژیانی کوردەوارییەوە داناوە. نەیتوانیوە ئاراستەی کۆمەڵگاو هێڵی گشتی ناوی بەرەو دوژمنایەتێکی فکری ئیسلام ببات. هەڵبەتە مەبەستم ئەوەنیە شوێنەواری خراپی ئەو شاڵاوە فەرهەنگییە نەخشە بۆدارێژراوە لەسەر کەسێتی کورد لەڕوویەکیترەوە بشارمەوە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە بڵێم برەوساندنی هەندێ بیروڕاو ئایدۆلۆژیا لەهەندێ بڕگەی مێژووی هاوچەرخماندا زیاتر لەسۆنگەی شوێنکەوتنی مۆدێل و پڕکردنەوەی بۆشاییەوە بووە.

چوارەم: بەپێچەوانەی هەندێ بیرکردنەوەی هەڵەوە لە هەردوو بازنەی فکری ئیسلامی و بەرامبەردا، بوونی ئازادی و گەشەکردنی ئیسلام وەك فکرو فەرهەنگ و تێڕوانین ژیان و بیرکردنەوەو تێکۆشان، پەیوەندیەکی ڕاستەوانە دەیانبەستێ بەیەکەوە. هەرکاتێ لە کۆمەڵگا موسڵمانشینەکاندا ئازادی هەبوو، خەڵك لەژێرباری زۆر لێکردن نەیاندەناڵاند مرۆڤەکان لەئاستێکی بەربڵاودا بەرەو باوەشی ئیسلام دەگەڕێنەوەو دەیکەنە مەشخەڵانی بەختەوەری ڕێگای خەبات بۆ ڕزگاری و دادپەروەری و برایەتی و گۆڕان و خۆشگوزەرانی و خۆدۆزینەوەو خۆسەلماندان. کەواتە ئەوەی حساب بۆ باوەڕی قووڵ و ئینتمای ئیسلامی مرۆڤی کوردو کۆمەڵگای کورد نەکات، هەروەها ئەو کەسەیش وەك هەڵگری پەیامی ئیسلامخوازی خۆی دەردەخات و تێڕوانینی (تکفیری)یانەی هەیە بۆ واقعی کۆمەڵگاکەمان، هەردووکیان پێویستە ئەگەر دەیانەوێت خزمەت بەئێستاو ئایندەی گەلەکەمان بکەن و بەشداری لە بەرەو پێش بردنی جوڵانەوەکەی و ئاراستەکردنی بەئاقاری سەرکەوتن و سەرفرازیدا بکەن پێویستە لەوە دڵنیابن کە تێڕوانینەکانیان لە ڕەشبینی و ناواقیعی بوون و نائومێدییەوە سەرچاوەیان گرتووە.

مێژووی سیاسی گەلانی موسڵمان پێویستی بەخوێندنەوەی فراوان و قووڵتر هەیە، بۆئەوەی زۆرێك لەڕاستییە شاراوەکان وەك خۆیان بۆنەوەی نوێ و بەتایبەتی بۆ نەوەی ڕابوونی ئیسلامیی هاوچەرخ ڕوون ببێتەوە..

بۆئەوەی بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ واقیعی ئێستادا دەکەن و چۆن سەیری ئایندەی خۆیان و گەلانی موسڵمان بکەن. چونکە ئەو حاڵەتە نائاسایی و ناهەموارەی کە تائەمڕۆ گەلانی موسڵمانی تێدا دەژین، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕابردووە نەخوازراوەی

كە سیستەمی سیاسی دەوڵەتانی ئیسلامیی لەدوای قۆناغی ڕاشدین، پێیەوە گرفتاربوون و هیچ جۆرە پێشكەوتنێكی پێویستی بەخۆیەوە نەدی. سیستەمی سیاسی دەوڵەتانی وڵاتە موسڵمانەكان ـ بەداخەوە ـ تا بە ئەمڕۆش هەر لەحاڵەتێكی زۆر دواكەوتوودان بە بەراورد كردن لەگەڵ بنەماكانی ئیسلام و ئەزموونە هاوچەرخەكانی ڕۆژئاواشدا. زۆربەی زۆری دەسەڵاتە سیاسییەكان دەوڵەتەكانی جیهانی ئیسلامیی هێشتا هەر نمونەی حوكمی تاكە حزب و تاكە بنەماڵەو بگرە تاكە كەسیشن، دیكتاتۆریەت و دابڕان لەجەماوەری گەلانی خۆیان سیفەتی جیاكەرەوەیانە. هەر ئەوەش خاڵی لاوازو كوشندەی وڵاتانی موسڵمانەو پێویستە لەسەر سیاسەتمەداران و ڕوناكبیران و دڵسۆزانی میللەتانی موسڵمان گشت هەوڵ و تواناكانیان بخەنەكار بۆ دانانی سنوورێك بۆ ئەم حاڵەتە ناهەموارەو ڕێگاچارەی ڕیشەیی بگرنەبەر بۆدابین كردنی دادپەروەری و ئازادیەكان و ڕێزگرتن لەمافەكانی مرۆڤ و بەشداریكردنی میللەتان لەبڕیاری سیاسی و دیاریكردنی چارەنووسی گەل و وڵاتدا.

چاكترین هۆكارو ڕێگاچارە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە گەورەیەو دەربازبوون لەم حاڵەتە نائاساییەی ئێستا، ئەوەیە كە سەركردایەتی سیاسی لەنێوان ئەندامانی جەماوەری گەلدا هەڵبژێردرێن و چین و توێژو خانەوادەیەكی دیایكراو نەبن كە سەركردایەتی كردن بە موڵك و میراتی خۆیان بزانن و بە هەق و ناهەق بوارنەدەن لەخۆیان دەربچێت وەك حاڵی حازر لەزۆرێ لەوڵاتانی ئیسلامیدا ڕەچاو دەكرێت.

میللەتانی جیهان لەئاكامی ئەزموون و ڕووداوەكانی ڕۆژگاردا بەم ڕاستیانە گەیشتوون و هەوڵ ئەدەن لەسەری بڕۆن. هەق وایە ئێمەش سوودیان لێوەربگرین و لەو خاڵەوە

دەست پێبكەین كە گەلانی جیهان پیی گەیشتوون، نەك لە هەوەڵەوە دەست پێبكەین و ئەزموون و نەهامەتیەكانی میللەتان دووپات بكەینەوە بەسەر خۆماندا.

ئەركی سەرشانی هەر بزاڤێكی سیاسی ئیسلامیشە كە بەشێوەیەكی بەرنامەبۆكراو و بەسوود وەرگرتن لە بنەماو بەهاكانی ئیسلام و واقیعی مێژووی سیستەمی سیاسی دەوڵەتانی ئیسلامیی و ئەزموونەكانی گەلانی جیهان بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، كاری جیدی لەسەر ئەم دوو تەوەرە سەرەكیە بكەن. واتە؛ كۆمەڵگە و سیستەمی سیاسی:

**بنیاتنانی كۆمەڵگەی مەدەنی و ئەهلی لەڕێگای:**

- پەروەردەكردنی تاكی خاوەن باوەڕو ڕەوشت بەرزو هۆشیارو خزمەتگوزار بە گەل و وڵات.
- دروست كردنی خێزانی دامەزراو و ئاسوودە.
- پێكهێنانی دەزگاو دامەزراوەی مەدەنی و ئەهلی كە لەڕێگایانەوە كۆمەڵگەی جێگیرو هاوسەنگ دروست دەبێت و دەتوانێت زۆرێك لە پێداویستییەكانی خۆی دەستەبەر بكات و ئەرك و قورسایی سەرشانی حكومەت و دەوڵەت سووك بكات و بەرگەی ڕووداو و نەهامەتیەكانی ڕۆژگار بگرێت. لەهەمان كاتدا كۆمەڵگە بتوانێت چاودێری دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی بكات و ڕێگای هەڵەو لادانی لێبگرێت و پشتیوانی لێبكات لەپێناوی دابین كردنی بەرژەوەندیە باڵاكاندا.
- هەروەها پێویستە لەسەر هەر بزاڤێكی سیاسی ئیسلامی كە گرنگیەكی باش بدات بە ڕۆشنكردنەوەی ئازادی و دادپەروەری و یەكسانی و خۆشگوزەرانی..

چونکە سیستەمی سیاسی ڕاست و دروست باشترین زەمانەتە بۆ جێبەجێکردنی بەهاکانی ئیسلام و دەستەبەرکردنی پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی و ئاسایش و ئاسوودەیی بۆ گەل و وڵات.

تەنها ئەوەندە بەس نییە کە داوای گەڕانەوەی حوکمی ئیسلامی بکەین، چونکە ئاشکرایە کە لەئیسلامدا شێوەو شێوازێکی دیاریکراو بۆ دەوڵەت و سیستەمی سیاسی دانەنراوە.. بەڵکو لەئیسلامدا تەنها بنەماو ڕێسا گشتییەکان دیاریکراون وەك: دەسەڵاتی سیاسی ئوممەت و مەبدەئی شوراو یەکسانی و دادپەروەری و ستەم نەکردن و لەخواترسان... ئەوەی کە گرنگەو ڕوودەکاتە هەر سەرکردایەتیەك بریتییە لە ئالیات و (ضمانات)ی عەمەلی بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بنەماو ڕێسا گشتییانە.. لەکۆن و نوێدا دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیی جیاجیا هەبووەو ئێستاش هەیە، بەڵام ئەو بنەماو بەها گشتییانەی سەرەوە ڕەچاو نەکراون.. بگرە زۆر وادەبێت ستەم و ناڕەوایی و تاکڕەویی و دیکتاتۆریەت پیادەدەکرێت و ناوی ئیسلامیشی لێدەنرێت.[1]

## نەگۆڕەکانی کۆمەڵگا، چوارچێوەیەك بۆ سەقامگیری و دەرفەتێك بۆ بەیەکەوە ژیان

هەموو کۆمەڵگا سەقامگیرەکانی دنیا خاوەنی کۆمەڵێ نەگۆڕن، کە بەهۆی ڕێکەوتنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان و پێکهاتە جۆراوجۆرەکان لە سەر ئەو نەگۆڕانە کۆمەڵگاکانیان لە

[1] پەراوێز: الحضارة دراسة في اصول وعوامل قیاسها وتطورها . الطبعة الثانیة، تالیف د.حسین مؤنس، لاپەڕە (١٦٧) ((النظم السیاسیة ومیسرة الحضارة)).

بە لەرزەکەوتنی گەورەو گورچك بڕ دەپارێزن. لە کاتێکدا کۆمەڵگا دووچاری گرفت و نائارامییەکیش دەبێتەوە، ئەو نەگۆڕانە دەتوانن تا ڕادەیەکی بەرچاو ڕێگر بن لە پەرەسەندنی ڕوداوو نائارامییەکان بۆ سنوری پاشا گەردانی و شەڕی هەموان دژی هەموان، یاخود کلۆرکردنی جەستەی نیشتیمانی و چڤاکیی کۆمەڵگا. نەگۆڕەکانیش لە نێوکۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا یەك شت و هاوجۆر نین. دەشێ بە گوێرەی جیاوازی کۆمەڵگاکان نەگۆڕی جیاوازیشمان هەبێت.

بەڵکو لە ناو خودی کۆمەڵگا و گەل و نەتەوە و وڵاتێکدا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکیتر دەشێت گۆڕانیان بەسەردا بێت، یا خود لانیکەم هەندێکیان بگۆڕێن، چونکە فۆرمی دەسەڵاتی سیاسی و دەوڵەت و ئاستی پەرەسەندنی ژیاریو شارستانی و دۆخی نێودەوڵەتی و جۆری سیستمی ئابوری و دابەشبوونە ئایدۆلۆژیو فکریەکان، هەریەکەیان لە جیی خۆیەوە کاریگەرن لە دیاری کردن و چەسپاندنی نەگۆڕەکان. دیارە لە سەردەمە پێشووەکاندا نەگۆڕەکان بە پلەی یەکەم لە کەسەکاندا بەرجەستە بوون. بە تایبەتیش لە سوڵتان و پیاوان و ڕێبەرانی ئاییندا.

بەڵام لە هەمانکاتدا ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ لە دەرەوەی کەسەکانەوە نەگۆڕ نەبوو بێت، بەڵام نەگۆڕەکان هەمیشە بەرەنجامی ڕێکەوتنی نێوان تاك و گروپ و هێزەکان نەبووە. لە کۆن و نوێدا چواچێوەی زۆرەملێ و نەگۆڕی سەپاوو دۆخی سەپێنراوو لە ئارادا بووە، ئەم بار و هەلومەرجەش هەمیشە لەسەر حسابی لێبوردەیی و گوزارشتدانی ئازاد لە خۆوە ڕێگرێ بووە لە خواست و ویستەکانی مرۆڤ. دیارە گەر واز لەمێژوی کۆن بێنین و لە چوارچێوەی مۆدێلی دەوڵەت نەتەوەو سەردەمی مۆدێرنەی

فکری و سیاسی لە مەسەلەی نەگۆڕەکانی کۆمەڵگایەك ورد بینەوە، دەتوانین بەرچاو ڕونانەتر و بەرجەستانەتر قسە بکەین. کۆمەڵگا هاوچەرخەکان لە خۆرئاواو دەرەوەی خۆرئاواشدا بە ئاڵ و گۆڕ و کێشمەکێشی زۆر و جۆراوجۆردا تێپەڕیون. زۆر جار کێشمەکێش و ململانێکان هێندە توند و تیژبوون، سەرجەم چوارچێوەو دەزگاو دەستەبەرە لە ئارابووەکان، نەیانتوانیوە لە خۆیان بگرن و سەرەنجام سەری لە کودەتاوە دەرچووە. مرۆڤایەتی لە مێژوی هاوچەرخی خۆیدا باجی گەورەی ئەم هەڵکشان و داکشانە گەورانەی داوەو یەکجار قورسی بەسەریدا شکاوەتەوە.دیارە دەوڵەتی هاوچەرخ بە میکانیزم و شێوازەکانی کارکردن و خۆ فۆرمەڵکردنیەوە هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابووە کە چوارچێوەیەك بێت بۆ یەکبوون و وەك یەك لێکردن و هاوشێوە کردن. لە ڕێی دام و دەزگا جۆراوجۆرەکانییەوە هەوڵی داوە یەکیەتییەکی ناوەکی کۆمەڵگایی دروست بکات. لەم پێناوەشدا هێڵی سوری جۆراوجۆری دیاریکردوە. لە سەدەی حەڤدەهەمدا کە سەرەتای شکڵ گرتنی ئەم مۆدێلە نوێیەی دەوڵەت بوو، دەسەڵاتداران و پادشاکان دەیانویست لە ڕێی سەپاندنی تاکە ئایینیك و جۆرێ لە دەسەڵاتی خۆسەپێنەرانەوە یەکیەتی یاسایی و سەروەری ناوەکی بێتە کایەوەو بەسەرناکۆکی و دابەشبوونە ناوخۆییەکاندا زاڵ بن، کە بەشێ بوون لە ڕواڵەتەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتی پێشوو حوکمی سایەی ئیمپراتۆریە فشەڵەکان.

بیری سیاسی نوێو هەڵگرانی لە خەباتیاندا بۆ تێپەڕاندنی فۆرمە کۆنەکانی دەسەڵات و دەوڵەت و کۆمەڵگاو پەیوەندییەکان و سیستمی مافەکان، پایەکانی کۆمەڵگای نوێیان دەچەسپاندو لە هەمانکاتدا سیماکانی کۆمەڵگا نوێکانیان بەو ئاڵ و

گۆڕانەشەوە دەخەملاند کە دەیخواست بە سەر هێماو پنتەکانی دەسەڵات و ڕێو جیی هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا بێت.

هەڵبەتە قسەکردن لە نەگۆڕەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی هاوچەرخدا دەمانگێڕێتەوە بۆ قسەکردن لە نەگۆڕەکانی ئاین و ئایدیۆلۆژیاکان ئەو پەرەسەندنەی خوودی ئەم مۆدێلە لە خۆڕێکخستنی سیاسی بە خۆیەوە بینیوە. دیارە لە سەردەمی پێش مۆدێلی دەوڵەت نەتەوەدا نەگۆڕەکانی کۆمەڵگاو پەیوەندیەکان بەپلەی یەکەم لەلایەن ڕاڤە ئایینییەکان و داب و نەریتەکانەوە دیاریکراون دیارە لە سەردەمی نوێشدا ئاین و ئایدۆلۆژیاکان ڕۆڵی خۆیان هەرماوە.

ئاینەکان لە نێوخۆیاندا نەگۆڕی خۆیان هەیە، ئایدۆلۆژیاکانیش هێڵە سورو نەگۆڕەکانی خۆیان هەبووەو هەیە. ئێمە گەر سەیری ئایدۆلۆژیایەکی وەك نازیزم، فاشیزم، مارکسیزم، بەعسیزم بکەین. وە ئەگەر سەیری (ناسیۆنالیزم) بکەین لەو ساتە مێژووییانەی ڕۆڵی ئایدۆلۆژیای بینیوە و بەو جۆرە مامەڵەی لە گەڵ کراوە، لەگەڵ ڕستێ لە نەگۆڕو سەرەتاو چوارچێوەو هێڵی سورو پێوەرو دەزگای پۆلێن کردن و دابەشکردن ڕوبەڕو دەبینەوە. هەریەك لەم ئایدۆلۆژیانە دەزگاو پێناس کردنی تایبەت بە خۆیان هەیە. هەموو دەزانین ڕیزبەندییە نەژادییەکانی نازیزم و فاشیزم لە سەر ئاستی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ کراوەکانی خۆیان و جیهانیشدا بە چ کارەساتێك شکایەوە. خۆ ئەگەر سنورێ بۆ هەستی شەڕخوازی و فراوانخوازیان دانەنرایە مرۆڤایەتیان خستبووە بەردەم هەڕەشەیەکی گەورە و مەترسی دارەوە. مارکسیزمیش بە ئەزموونە بەرفراوانەکەی و دۆگماکانییەوە بانگەشەی بۆ دابەشکردن و ڕیزبەندیو بە یەکدادانێکی سەخت دەکرد کە

لەوێدا باسیٚ لە جیاوازی نەدەماو دوژمنە چینایەتییە دەسنیشانکراوەکان دەخرانە بەردەم دووڕیانی وەدەرنان و توانەوە یاخود تیابردن و تیاچونی یەکجارەکی.

ناسیۆنالیزمیش بە زمانە ڕۆمانسیە حەماسەت ئامێزەکەیەوە چۆن زۆر جار پەنای بردۆتە بەر دەستنیشانکردنی خیانەتکار و دروستکردنی دوژمن. مۆدێلێکیش لە ئایدۆلۆژیای ئیسلامی هاوچەرخ دەبینین چۆن خوێن ساردانە لە ڕیی دابەشکردنی مرۆڤ و کەسەکان بەڵکو هەندیٚ جار گروپ و هێز و کۆمەڵگاکان بۆ باوەڕدار و بیٚباوەڕ تەنانەت دەگاتە بە ڕەوا بینینی ڕشتنی خوێنی منداڵو بیٚ تاوانەکانیش وەك مومارەسە کردنی جۆرێك لە فاشیزمی ئاینی. دیارە ئەگەر لە وڵاتێکدا تەواوی دانیشتوانەکەی لە سەر ئاینیٚ یاخود هەڵگری هەمان شوناسی نەژادیو نەتەوەیی و چینایەتی بن (کە ئەوە نیمچە ئەستەمە) تا ڕاددەیەك لە کارەساتی ئەم نەگۆڕو دۆگمایانە کەم دەبێتەوە، گەرچی لە سەر ئاستی ئازادیو مافەکانی تاك لە هەموو حاڵەتەکاندا هەر کارەسات دەنێتەوە، بەڵام کاتێك کۆمەڵگایەك زیاتر لە نەژادو ڕەنگ و شوناس و ئاین و پێکهاتەیەکیان تێدا بێت، سەپاندنی نەگۆڕەکانی ئاینیٚ، ئایدۆلۆژیایەك، یاخود نەتەوەیەك دەبێتە سەرچاوەی زۆرداری و کوشتنی جیاوازییەکان و سەرکوتکردنی شوناسە جیاوازەکان. کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی لە سەدەی ڕابردودا لەم میانەدا باجێکی زۆری داوە. چونکە لەچوارچیوەی قەوارە هاوچەرخەکانی ناوچەکەدا، کە کوردیان بەسەردا دابەش کراوە. لەکاتی دیاریکردنی نەگۆرەکانی دەولەتدا وەك گرووپنەتەوەیەکی خاوەن شوناس وتایبەتمەندی جیاواز،نەك هەرڕێز لەخواست وویستی نەگیراوە،بەڵکو هەوڵدراوە لەڕێی بەکارهێنانی توندوتیژی مادی و مەعنەوییەوە،ناچار بەدەستبەرداربوون لەناسنامەو کەسێتی مەعنەوی خۆیبکرێت.

وڵاتانی ئیسلامی ناوچەکەش بە گشتی بەهۆی تێکشکانی گەشەی سروشتی ناوەکی ئەم کۆمەڵگایانەو دیاردەی کۆلۆنیالیزم و مۆدێرنەیەکی تێکشکاوو کەلەپوری سوڵتانیی مێژوییی و هەژمونی ئایدۆلۆژیا شۆڕشگێڕە نوێکان و زۆرداریەکانی سیستمی سیاسی نێودەوڵەتی و جۆرەها هۆکاریتر، هەریەکەیان بە ئاستی جیاواز بە تایبەتیش لەوکۆمەڵگایانەیاندا کە بوونە کایەی تاقیکردنەوەی کودەتا و مومارەسەی دەسەڵاتی نوخبە نوێکان، ئەوانەی کە هەڵگری هەناسەیەکی هەژموونخوازانەی ناسیونالیستی و چەپی داخراو بوون، ئەم کۆمەڵگایانە دووچاری جۆرەها بەلەرزە کەوتن و ڕاچەنین و پێکدادانی ناوخۆیی هاتن کە لێرەدا جێگای ئەوە نییە بچینە ناو درێژەی ئەم بابەتەوە.

## گەلی کوردستان و نەگۆڕەکانی

لێرەدا گەر بەکورتیش بێ پێویستە باسێ لە بایەخی دیاریکردنی نەگۆڕەکانی گەلی کوردستان بکەین لە هەرێمدا، سەرەتاش دەبێ بڵێین باسکردن لەم نەگۆڕانە بە شێوەیەکی گشتی لە چوارچێوەی قەوارەی دەوڵەتدا دەکرێت، بەڵام ئەمەش واتای ئەوە ناگەیەنێ نەتەوەو گەلێك گەر قەوارەیەك لە خوار قەوارەی دەوڵەتی هەبوو ناتوانێ باس لە نەگۆڕەکان و کۆدەنگی نیشتمانی لەسەر کۆمەڵێ سەرەتاو چوارچێوەو هێڵی گشتی بکات، کە لانیکەمی چوارچێوەی خەباتی ناوکۆیی و بەیەکەوە هەڵکردن و ئیرادەی بەیەکەوە ژیان و هاوکاری و هاریکاری و هاودەردی دیاری بکات.

هەروەك لە پێشەوەشدا ئاماژەمان بە جیاوازی نەگۆڕە نیشتمانییەکان لە گەڵ نە گۆڕەکانی ئاین و ئایدۆلۆژیاو نەتەوەیەکی دیاریکراو کرد، لێرەشدا دەبێت زیاتر جەختی

لێبکەینەوە. چونکە باسکردن لە نەگۆڕە نیشتمانییەکان لە سایەی باوەڕبوون بە جیاوازی و دیموکراسی و فرەڕەنگی و دەنگیدا، جیاوازە لە باسکردنی لە سایەی دەسەڵاتێکی تاکڕەوی یەك ڕەنگدا کە ئەوەی جێی بایەخی نییە ڕێکەوتنی سیاسییە هەمیشەش نەگۆڕەکان و تێکڕای سیاسەتەکان لە سەرەوە بۆ خوارەوەو لە ڕێی نوخبەیەکەوە دیاری دەکرێت (گەر هەندێ جار نەوترێت کەسێك) و سیاسەت لە کۆمەڵگای مەدەنییەوە بەهاوپێوەرو چوارچێوەکانی وەرناگرێت، بەڵکو کۆمەڵ ناچار دەکرێت بە وەرگرتنی ئەو بەهاو پێوەرو چوارچێوانە لە ڕێگەی بەکارهێنانی تواناو زۆر لێکردنەکانی دەوڵەتەوە.

هەرێمی کوردستان و بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستانیی بە گشتی لە قۆناغی ڕابردوودا، بەهۆی نەگەیشتنی بە ئامانجە ناسیونالیستەکانی خۆی و لە وانەش پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی، هەروەها لە سۆنگەی کاریگەرییە ئایدۆلۆژییەکان و دابەشبوونە دیالەکتیکی و کۆمەڵایەتیو مێژوییەکانی ناوخۆیو نەخشەکانی کۆلۆنیالیزم و سروشتی دابەشکردنی نیشتمانەکەیو بەربەرەکانی خوێناوی ڕژێمەکان بۆ داواکانی، هەر لە دواکەوتنی حیزبی هاوچەرخ لە کوردستاندا بە ماوەیەکی کەم، لە ناوخۆیدا دووچاری ململانێو کەرتبوون و هەندێك جار پێکدادانی خوێناویش هاتووە. واتە گەلی کوردستان و بزاڤە نیشتمانییەکەی لە هەندێك ساتی مێژوویی دیاریکراودا نەبێ نەیتوانیوە لە دەوری کۆمەڵێ چەسپاوی نیشتمانی و نەتەوەیی کۆببێتەوە کە لانیکەم ڕێبگرێت لە شەڕی خۆ بە خۆ و دیاریکردنی بەشێ لە شوناسی هێزەکان لە بەرامبەر یەکترەوە. دیارە دوای ڕاپەڕین و دروستکردنی دام و دەزگا نیشتمانیە کوردستانیەکان، چاوەڕێدەکرا کە دۆخەکە لەم ڕووەوە پێشکەوتنێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ و ئەم دام و دەزگایانە ببن بەو چوارچێوەی هەمووان لە خۆبگرن و وورده ورده لە شێوەی

دامەزراوەو سیستمی یاساو مافی هاوچەرخدا ئەو نەگۆڕانە دیاریبکرێن کە ڕەهەندو ڕووکارەکانی شوناسی نیشتمانیی گەلی کوردستان پێکدەهێنن.

دیارە ئەمەش فراوانکردنی ئاسۆکانی بیرکردنەوەو پەروەردەیەکی سیاسی و دەروونێکی نوێی دەویست بۆ ئەوەی ئەو ئەرکە مەزنە بە ئەنجام بگات.

بەڵام ئەم ئاواتەی گەلی ئێمە لەو قۆناغەدا نەهاتەدی و جارێکیتر ململانێ ناوخۆییەکان هەموو سنورەکانی پێشووتریشی بەزاند و لە ئەدەبیاتی سیاسی کوردیشدا باسی چوونە ناو سەردەمی کۆتاییهاتن بە حەرام و هێڵە نەتەوەیی و نیشتمانیەکان دەکرا. ئەوەی فریای کورد و گەلی کوردستان کەوت لەو قۆناغەدا بۆ ئەوەی بە تەواوی بە نەفرەت نەبێت، بارودۆخە عێراق و هەرێمی نێودەوڵەتییەکە بوو.

بەڵام ئێستا گەلی کوردستان دوای ئەو قۆناغە پێی ناوەتە ناو قۆناغێکی نوێی ژیانی سیاسی خۆی کە لە پێکهێنانی حکومەتی نوێی هەرێمی کوردستان (کابینەی پێنجەم) و هەوڵدان بۆ دەرکردنی دەستوری هەرێم بەرجەستە دەبێت، لێرەشەوە زۆر گرنگە کە سەرکردایەتی سیاسیو فکریی کۆمەڵگا خوێندنەوەیەکی وردی بۆ واقیعەکەی هەبێت و ئەم جارەیان نەگۆڕەکانی بە دەستووری بکات و بەمەش بەردی بناغەی کۆمەڵگایەکی هاوچەرخ و سەقامگیر دابمەزرێنێ و دابنێت،

دیاریکردنی نەگۆڕەکانی گەلی کوردستانیش، بە دڵنیاییەوە ڕەنگدانەوەی ئەو فرەنەتەوەیی و ئاینی و فکری و سیاسییە دەبێت لە کوردستاندا هەیە، ئێمە تەنها کورد و موسڵمان و عەلمانی یاخود ئیسلامی نین، بەڵکو گەلی کوردستان وەك پێدراوێکی سیاسی بەرجەستەکەری نەتەوەو ئاین و مەزهەب و ڕێبازی سیاسی جۆراوجۆرە لەم

ڕوانگەشەوە دەکرێ، نەگۆڕە بنەڕەتیەکان و پێکهێنەرە بنچینەییەیە ناوخۆییەکانی شوناسی کوردستانیش لەم چوار خاڵەی خوارەوەدا دەستنیشان بکەین:

**یەکەم / کوردبوون:** بە حوکمی ئەوەی زۆرینەی دانیشتوانی هەرێم لەم نەتەوە پێکدێن، کورد بوون ئەو چواچێوەیەیە کە هەموو تاکەکانی ئەم نەتەوە بە جیاوازی ئاینیو مەزهەبیو سیاسییەوە کۆدەکاتەوە و دەبێتە ئەو هاوبەشەی کە خزمەت بە یەکیەتی ناوخۆیی نیشتمانیو تێپەڕاندنی شوناسە ناوخۆییە بەرتەسکەکان دەکات بۆ شوناسێکی بەرفراوانتر، بەڵام دیارە ئەم کورد بوونە دەبێ نەگاتە ئاستی ئەوەی مۆدێلی تورکی لە کوردستاندا دووبارە ببێتەوە واتە خەڵك لە ڕێی (انتما) بۆ ئەم نەتەوە و مافەکانی دەست بخات چونکە بەشێ لە دانیشتوانی کوردستان شوناسی نەتەوەیی جیاوازیان هەیە، بەڵام لە گەڵ ئەوەدا کورد بە حوکمی ئەوەی نەتەوەیەکی گەورەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و خاوەن مێژوویەکی دوورو درێژی قوربانی دانە مافی خۆیەتی لە گەڵ باوەڕبوون بە سەرەتای فرەیی هەوڵی گەشەدان بە شوناسیو کەسێتی نەتەوەیی و تواناکانی خۆی بدات.

**دووەم / ئیسلام:** ئیسلام بە حوکمی ئەوەی ئاینی زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانی هەرێمی کوردستانە یەکێکی‌تر لە نەگۆڕەکانی کۆمەڵگای کوردستان و پێکهێنەرێکی گرنگی شوناسەکەیەتی. ئیسلام هاوبەشێکی‌ترە لە نێوان هەموو ئەوانەی بە موسڵمان دەژمێردرێن بە جیاوازی نەتەوەیی و مەزهەبیانەوە.

بەم جۆرە نەتەوەی تورکمان وکوردو عەرەب، لە سەر بناغەی کلتورو ئاینی هاوبەش، دەچنە ناو پەیوەندییەکی هاوبەشەوەو دەبن بە برای یەکترو لەم ڕێگەیەشەوە

لە هەستیارییەکان کەم دەکرێتەوەو ئیرادەی بەیەکەوە ژیان لە ئاست و کایەکانیتر بەهێز دەکرێت و سود لەم ڕەهەندەی کەسێتی نیشتمانیی وەردەگیرێت بۆ دروست کردنی گیانی هاودەردیو هاوچارەنوسی. گەر کورد بوون چواچێوەیەك بێت بۆ تەواوی کوردەکان، ئەوا ئیسلام چوارچێوەیەکیتری فراوانترە بۆ تەواوی خەڵکە موسڵمانەکەی کوردستان. هەڵبەت لێرەدا ئیسلام تەنها وەك بیرو باوەڕو دروشم و پەرستن و فۆرمێکی ژیان سەیر ناکرێت بەڵکو بۆ ئەوانەی کە لەم ڕووەوە پابەند نابن لە سەر ئاستی کلتورو داب و نەریتی و فەرهەنگیش سەیر دەکرێت. چونکە ئیسلام خۆی بڕوای بە فرەئاینی هەیەو لەم سەردەمەشدا موسڵمان بوون لە ڕووە ڕەسمییەکەوە مانایەکی یاسایی و کلتوریش لە خۆ دەگرێت.هەموو ئەمەش دەخوازێت ڕەچاوی ئەم ڕەهەندەی کلتورو کەسێتی نیشتمانی بەو قەوارەی کە ئامادەگی هەیە لە کاتی دروستکردنی بڕیاری سیاسی و داڕشتنی سیاسەتەکان و دەرکردنی یاساکاندا بکرێت.

**سێهەم / کوردستانییبوون:** ئەگەر کورد بوون تەنها لە خۆگری کوردەکان و ئیسلام تەنها لە خۆگری موسڵمانەکان بێت، ئەوا کوردستانیی بوون ئەو چوارچێوە هەرە فراوانەیە کە توانای لە خۆگرتنی سەرجەم پێکهاتەکانی گەلی کوردستانیی دەبێت بە نەتەوەو ئاین و مەزهەب و ڕێبازە سیاسییە جیاوازیەکانیەوە. دەبێت هاوڵاتی کوردستانیش لە ڕێی (انتما)ی بۆ کوردستان و دەسەڵاتە سیاسییەکەوە مافەکانی دیاری بکرێت نەك شوناسەکانیتر.

بەم جۆرە کوردێك و تورکمانێك و ئاشوریو کلدانێك و یەزیدیو مەسیحییەك و سوننەو شیعەیەك لە بەردەم یاسادا یەکسان دەبن و خاوەنی مافی وەك یەك دەبن لە

هەموو ئەو شتانەدا کە هاوبەشی گشتین و ناچنە بازنەی تایبەتمەندی گروپی و شوناسەکانی‌ترەوە. دەبێت هەموو لایەك دروشمی کوردستان نیشتمانی هەمووانە و دەبێت هەمووشمان بە سەربەرزیو ئازادی و یەکسانی لە سەری بژین ببێتە دروشمی هەموو لایەك. هەڵبەت بیرۆکەی کۆبوونەوە لە سەر بناغەی نیشتمانیی هاوبەش کە بەشێکە لە دەسکەوتەکانی مۆدێرنەی سیاسی خزمەتێکی گەورەی بە لێبوردەییو سەرەتای بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە کردووە بە تایبەتیش لەو وڵاتانەدا کە زیاتر لە نەتەوەو ئاین و مەزهەب و گروپێکیان تێدا دەژی.

چوارەم / دیموکراسی: لە پاڵ ئەو نەگۆڕانەدا دیموکراسیش دەبێت نەگۆڕێکی‌تر بێت پرەنسیپ و ڕێبازو چوارچێوەو دەستەبەرو شێوازە هاوبەشە بێت کە هەمووان باوەڕیان پیی بێت. چونکە لە کۆمەڵگایەکی هاوچەرخی فرەڕەنگ و دەنگدا تەنها دیموکراسییە بتوانێت مافی جیاوازەکان بپارێزێ و خەڵکی لە ڕێی ئیش کردن بە میکانیزم و دەستەبەرەکانییەوە بتوانن ڕێ لە زۆرداریيو سنور تێپەڕاندنی دەستەڵاتی سیاسی بگرن و ئازادی هەموو لایەك پارێزراو بێت و لە سایەی ڕێکەوتنێکی سیاسی مەدەنی هاوبەشدا کە بە پلەی یەکەم دەستور بەرجەستەی دەکات بە ئاشتی لە گەڵ یەکدا بژین و جیاوازیەکان نەبنە سەرچاوەی نائارامیو هەڕەشە، بەڵکو ببنە مایەی دەوڵەمەندکردنی زیاتری ژیان و فەرهەنگ و ئەزموونە نیشتمانییەکە.

ڕەچاوکردنی ئەم چوار نەگۆڕە لە کاتی نوسینەوەی دەستور و داڕشتنی سیاسەتەکان و ئاڕستەکردنی کایەکاندا خزمەتێکی گەورە بە سەقامگیری و مەدەنی‌کردنی ژیانی سیاسی لە کوردستاندا دەکات و هەموو لایەکیش لە شوناسی خۆی دڵنیا دەکاتەوە. کاتێ شوناسی گەلی کوردستان بەم نەگۆڕانە دیاری دەکرێت ئەو کاتە

سەرجەم نەتەوە و ئاین و مەزهەب و تەوژمە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن شوناسی خۆیان بپارێزن و لە هەمان کاتدا هەمووان خاوەنی شوناسێکی هاوبەش بن. ئەم نەگۆڕانە بۆمان دەردەخەن کە شوناسی نیشتمانی لەم ڕۆژگارەدا زیاترلە توخمێ بەشداری لە دروستبوونیدا دەکات هەڵبەت لە پاڵ ڕەهەندە جیهانییەکەی ئەمڕۆ کە مرۆڤ بە سیفەتی مرۆڤ بوونی دەبێتە هەڵگری شوناسێکی گەردوونی.

## لە رەنگدانەوەی هاوچەرخەکانی چەمکی نیشتمانپەروەریتی[1]

لەکوێوە نیشتمانپەروەری دەست پێ دەکات؟ ئایا تەنیا لە چەك هەڵگرتن و بەرگریکردن لە نیشتمان و بەهای مرۆڤەکاندایە؟ با بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە نەچینە چوارچێوەی دیاریکەرە تیۆریەکان، هەرچەندە بێگەڕانەوە بۆ ئەو تیۆرانەی دیاردەی ناسیۆنالیزم لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا لێکدەدەنەوە، ناتوانین وەك ئەوەی پێویستە دیدێکی زانستی و قووڵ دەربارەی ئەم پرسە بنیاتبنێین، گەر بەکورتی و لەچوارچێوەی پێدراوە کوردیەکەدا قسەبکەین رەنگە بڵێم کێ نیشتمانپەروەرە و رواڵەتەکانی نیشتمانپەروەری لەچیدا بەرجەستە دەبن؟ یەکێ بێت لەو پرسیارە گرنگانەی لەبەر تیشکی گۆڕانە ئایدیۆلۆژی و مەیدانیەکاندا پێویستی بە وەڵامی تازە هەیە، چونکە ئەگەر شۆڕش لە فۆرمە کۆنەکەیدا وادەرکەوێت فەرمانەکانی خۆی تەواوکرد بێت و واقیعە نوێیەکە خوازیاری فۆرم و میکانیزمی نوێ بێت، بۆ ئاراستەکردنی خەباتی نیشتمانی، ئەوا بەدڵنیاییەوە بوارەکانی بەرجەستەکردنی بەها نیشمانیەکانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە ئێمە لەکاتێکدا بەشێکی زۆری کوردستانمان لەبەردەستدایەو لەناو ئەزموونێکی حوکمڕانی خۆماڵیدا بەهەر شێوە و لەهەر ئاستێکد بێت بۆ چەندین

---

[1] لەساڵی (٢٠٠٢) دلو لە میانەی بەشداری لە نۆسیەی (نیشتمانپەروەری و ئینتیما)ی رۆژنامەی (برایەتی) بەدو عەڵقە بڵاوبۆتەوە.

ساڵەژیان بەسەردەبەین و دەست و پەنجە لەگەڵ چارەسەرکردنی دەسەڵات لەدام و دەزگا حکومیەکاندا بەواتا کوردیەکەشی بێت نەرم دەکەین، هەروەها لەکاتێکدا لەسەردەمی جیهانگیری و وەرچەرخان و ئاڵوگۆڕە خێرا و مشتومڕە فیکریەکانی جیهاندا دەژین، دیارە گەر تێگەیشتنمان بۆ نیشتمانپەروەرێتی هەمان تێگەیشتنە کۆنەکە بێت و ئەم تێگەیشتنە درێژکراوەی جەبری شۆڕش و ئەزموونی چەکداری کوردی بێت لە شاخ، نەك هەر حاڵەتێکی ئاسایی نییە، بەڵکو بیرکردنەوەیەکی کارەساتباریشە، ئەمڕۆ نەك چەك هەڵگرتن ئەو بەرمۆدایە نییە هەموو رەنگدانەوەکانی‌تری نیشتمانپەروەری هەڵلوشێ، بەڵکو گەر لە چەکی کوردی لەدوای راپەڕینەوە وردبینەوە و لەبەر رۆشنایی ئەرکی سروشتی ئەم چەکە و وەزیفەکانی بزاوتی ناسیونالیستی و تیۆرە هاوچەرخەکان لە پەیوەندی ئەم بە مەسەلەی نیشتمانپەروەرێتی کوردستانی وردبینەوە، رەنگە بگەینە بەرەنجامی پێچەوانەو تارادەیەکی زۆر تێگەیشتن و وێناکردنەکمانمان گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەرگری لەنیشتمان بەواتا سەربازی و پێشمەرگایەتیەکەی بەتەواوی لەفەرهەنگیی نیشتمانپەروەرێتی هاوچەرخی ئێمەدا بکەینە دەرەوە، بەڵام کاتێك ئەم چەکە بۆماوەی (١٠)ساڵ لەسەر جەستەی نیشتمان بەشداری لەدروستکردنی سنورەکانی ناوخۆو کەرتبوونە تراژیدیە ناوەکیەکان دەکات و خەڵکیش بڕوای وایە ئەوەی ناوەندەکانی شارنشینی کوردستان لە رەحمەتی تانك و زرێپۆشەکانی دوژمن دپارێزێ بڕیارێکی نێودەوڵەتیە نەك چەکە کوردیەکە لە بەردەم راستیەکی لەم جۆرەدا دەبێت زۆر هۆشیارانە باس لە بەیەکەوەگرێدانی چەك هەڵگرتن و مەسەلەی نیشتمانپەروەرێتی بکەین و بەدوای فۆرم و ناوەرۆکی نوێدا بگەڕێین بۆ ئەو پەیوەندییە، بێگومان گوتاری باوی کوردی و

پێداویستیەکانی فەراهەمکردنی پروپاگەندەی سیاسی لە کێبڕکێ حزبییەکاندا تێکچوونی ئەولەویاتی بزاوتی ناسیۆنالیزمی کوردی و پەراوێزکەوتنی مەسەلە ژیانیە گرنگەکان لەوانەش نوێکردنەوەی رۆشنبیری نیشتمانی و گەڕان بەدوای پێداویستییە تازە پەیدابووەکانی دووبارە (انتما) دروستکردنەوەی تاکەکان و جەماوەر بۆ نیشتمان و نەتەوە، کارێکیان کردووە تائێستا ئەم لۆژیکە زاڵبێت و پێشمەرگە وەك رەمزێکی قۆرخکەری واتاکانی نیشتمانپەروەرێتی بخرێتەروو (لای گوتاری حزبی باو) بەڵکو تراژیدیاکە لەوەدایە هەندێ جار بۆ پرسیاردانان لەسەر شەرعیەتی هێزێکیتر یاخود بەکارەسەکردنی مێژوو بۆ ململانێی سیاسی ئاراستەی قسەکردنەکان لەمەڕ پرسی نیشتمانپەروەرێتی و (ئینتیما) بۆ کوردستان بەجۆرێ دەخرێتە روو، وەك ئەوەی زەمەنی ئەم (انتما)و سەلماندنی رۆحی نیشتمانپەروەرییە بەسەرچووبێت و شتێکە زیاتر لەوەی راستییەکەو دەبێت ئێستا مومارەسە بکرێت و لە بەردەم تاقیکردنەوەدا بێت یاخود تەحەدایەك بێت لە بەردەممماندا و خۆ ئامادەکردنی دەوێت، لەدوێنێدا کۆتایی پێهاتووە ! !

رەنگە ئەو قەیرانی شوناس و بێباکیەی بەشێ لەنەوەی نوێش لەکوردستاندا تووشی بووەو سەرهەڵگرتنی بەکۆمەڵێ بەشێکی بەرچاو لەم نەتەوەیە بۆسەر زەمین و نیشتمانی کەسان و گەلانیتر، هەر بەمە لێکبدرێتەوە کە لە هەمان کاتدا ناتەواوی سیستمی پەروەردەیی و میدیاو میکانیزم و گوتاری تەقلیدی حزبی کوردیش دەردەبڕێت، بەکورتی ئەمەی کە ئێمە پێویستە بیرکردنەوەمان بۆ ناوەرۆکی نیشتمانپەوەرێتی و مەسەلەی ئینتیما بۆنیشتمان بگۆڕین و مەسەلەکە زەحمەتە مشتومڕی زۆر هەڵبگرێت، بەڵکو نەبوونی قەیرانەکە قوڵتر دەکاتەوە.

کوردو کوردستانییەکان کاتێك دەیانەوێت وەك بانگەشەی بۆکراوەو دەکرێت بەمانا کلاسیکیەکە باوەکەی لەرێکخستنەوەی ئەو چەمکەو شوناسپێدانێکی نوێدایە تێگەیشتنە لەو راستییەی کە ئێمە چی دی ناشێ بە چەمکەکانی لۆژیکی شۆڕشی چەکدارو شەرعیەت و زەبرو زەنگی شۆڕشگێڕانە مامەڵ بکەین.

نیشتمان پەروەری لە رەگ و ریشە دەرکێشانی فەرهەنگی توندوتیژی و خوێنە لە پەیوەندییە کوردی و کوردستانیەکەدا، بەرگریکردنە لەماف و کەرامەت و ئازادی هاووڵاتی، هەستکردنە بەلێپرسراوێتی بەرامبەر ئەم نیشتمان و گەلە و چارەنووسی نەوەکانی داهاتوو.

وا لەپاراستنی چەسپاوەکانی کۆمەڵگاو بەگەورە زانینی خوێن و ئابڕوو خواست و هیواکانی مرۆڤی کورد کوردستانیدا، وا لە گرەوی پاراستنی بەها باڵاکانی کۆمەڵگەو پاراستنی مۆرکی کوردەواری لەکایە جۆراوجۆرەکانی ژیان و کۆمەڵگادا، وا لەوەدەرنانی چەك و لۆژیکی هێز لە یەکلایی کردنەوەی کێشەکان و دیاریکردنی قورسایی هێزەکان و سەپاندنی (خیار)ەکان و فۆرمۆڵەکردنی هاوکێشەکانداو گەڕانەوەیە بۆ ستراتیژیەتی دیالۆگ و باوەڕهێنانێکی قوڵ بە پرەنسیپی بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانەو رێزگرتنە لە ئیرادەو (خیار)ی جەماوەرو مومارەسەکردنی فەرهەنگ و واقیعی خۆماڵیە لەدیدێکی ژیان دۆستانەوە لەناو سەردەمەکەدا.

نیشتمانپەروەری روێکی‌تری خەباتکردنە بۆ چالاککردنەوەی بەهاکانی خۆشەویستی، برایەتی، لێبوردەیی، هاودەردی لە پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانداو دژایەتی کردنی بێ‌رەحمانەی دیاردەی گەندەڵی ئیداری و ماڵی و سیاسی و کۆمەڵایەتیە، تێك و

پێکشکاندنی ئەو ریۆشوێن و بەربەست و رێگرانەیە کە ناهێڵن هاوولاتی وەك چەمکێ ناوەرۆکە یاساییەکەی خۆی پەیدا کات بۆ واقیعی ئەمڕۆی کوردستان هەوڵی دڵسۆزانەیە بۆ یەکیەتی و ئاشتی و ئاوەدانی بۆ راماڵینی سنورە وەهمیەکان و ئیدارە ناوچەییەکان و رێ و شوێنە ناسروشتیەکان کەمکردنەوەی ئەو جیاوازییە نائاسیی و هەستپێکراوەی نێوان نوخبەی سیاسی و دەسەڵاتدار و بنکە جەماوەریە بەرباڵاوەکەیە، سنوردارکردنی زیاتری ناعەدالەتی لەدابەشکردن و بەهرەمەندبوون لە داهاتی نیشتمانی و خێروبێری ئەم ولاتەیە.

هەوڵدانی بەکردەوە و دڵسۆزانەیە بۆیەکخستنەوەی مێژوو دروشم، سرود، ئاڵاو ئاوات لە کوردستاندا، دروستکردنی چوارچێوەیەکی هاوچەرخە بۆ کۆبوونەوەو ئاراستەی کردنی وزەو توانای سەرجەم هێزە سیاسیەکان و تێکڕای جەماوەری خەڵك و کۆبوونەوەی هێزەکانە لەسەر بەرنامەیەکی کاری نیشتمانی هاوبەش و ستراتیژیەتێکی نیشتمانی رۆشن، بایەخدانە بە نەوەی نوێ بە توێژە هەژارەکانی کۆمەڵگا بەجوتیارو لادێنشینی کوردەواری کە بۆ دەیان ساڵ سوتەمەنی سەرەکی شۆڕش و راپەڕین بوون بەکورتی خەباتە بۆ هاتنەکایەی ئەو هەل و مەرجەی کەوا لە هاوولاتی دەکات ئومێدی بەدوارۆژ بێت، متمانەی بەسەرکردایەتی سیاسی کوردی هەبێت لانیکەم بەشێ لە خەونەکانی لەسەر خاکی نیشتمان بەدی بکات..

گەر شۆڕیش بێتەوە بۆ دنیای تاك و هاوولاتی نیشتمانپەروەرێتی لە چەندین جوڵەو رواڵەتدا خۆ نمایش دەکات بەکورتی وەك فەرمودەکە دەفەرموێت (اتق الله حیثما کنت) لە هەرکوێ بووی هەست بە لێپرسراوی بکە، لەهەر دامەزراوەیەکدا ئیش دەکەیت و

هەرکارێك دەکەیت بەدڵسۆزی و وەردەکاریەوە بیکەیت، خۆت بە لێپرسراو بزانی بەرامبەر خەڵك و نیشتمانەکەت، بەم جۆرە خیانەتیش دەبێت مانای نوێ وەربگرێت، لێرەشەوە هەر ئەوە خائن نییە کە چەك بۆ دوژمن هەڵدەگرێت، بەڵکو ئەوەش کە مشەخۆرەو دژی نیشتمانە، لەکارەکەیدا دڵسۆز نیە، بەرامبەر چارەنووسی ئەم گەل و نیشتمانەو بەرژەوەندییە گشتیەکان هەست بەلێپرسراوێتی ناکات، گوێ بەناو ناوبانگی خۆی و گەلەکەی نادات، بەجۆرێ لە جۆرەکانی ناپاکی دەکات، رێزگرتنی یاسا هەستی جوانی و پاك و خاوێنی، بەشداری لە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەداو خۆدەربازکردن لەچوارچێوەی چەمك و چوارچێوە خێڵەکی و ناوچەییەکان، بەشداری کردن لەخۆشی و ناخۆشییە گشتیەکانی خەڵك.. هتد، هەموو ئەمانەش دەبن بە دەرخەری ئاستێ لە نیشتماپەروەرێتی مرۆڤ.

هەڵبەتە لێرەدا ناکرێت یەکەیەکە هەموو ئەوسیماو کارو جوڵەوکایانە بژمێرین کە لەواقیعی ئەمرۆی ئێمەدا سەرتای نیشتمانپەروەرێتی بەرجەستە دەکەن کەدیارە هەموو ئەمانەش دەخوازن حزبی کوردی بخرێتەوە قاڵبە سروشتیەکەی خۆی و (انتما) بۆ حزب شوێنی (انتما) بۆ نیشتمان نەگرێتەوە وەك لەم چەند ساڵەی رابردوودا بەداخەوە بینیمان کە جگە لەوەی (امتیان)ی هاووڵاتی بەسترایەوە بە جۆری ئەندامێتی حزبی ئەم جۆرەش لە (انتما) کرا بە پێوەرێك بۆ پۆلێنکردنی نیشتمانپەروەرەکانیش کە هەموو دەزانین ئەم بارە نائاساییە چ زەبرێکی کاریگەری لەژیان و پەیامی حزبیداو چۆن دیاردەی هەلپەرستی و گەندەڵی و مشەخۆری و خۆپەرستی تەشەنە پێکردو لەولاوە تارادەیەکی زۆریش خەڵکی لە بەرامبەر (انتما) فراوانەکەوە واتە سەر بەنیشتمان بوون بێمتمانە کران، چونکە لەنیشتمانێکدا کە دەسەلاتێکی خۆماڵی تێدا حاکم بێت

(دەبێت)، هاونیشتمانی بوون و (انتما) بۆ نیشتمان حەسانەیەکی یاسایی و ئەخلاقی بۆ هاوولاتی دروست بکات و رۆڵەکانیشی لە روانگەی نیشتمانپەروەرێتیەکی راستەقینەوە دەبێت لەسەر بناغەی لێهاتوویی و دڵسۆزی و دەستپاکی دابەشکرێن نەك هەندێ ئیعتیبارو پێوەریتر کەوا دەکات پلەو پەیایەی سیاسی لای هەندێ وەك غەنیمەت و دەرفەتێ خۆدەوڵەمەندکردن و بەهرەی نارەوا وەرگرتن سەیر بکرێت، نەك بەچاوی ئەمانەتەوەو بەرۆحێکی لێپرسراوی زیندووەوە بەرامبەر رۆڵەکانی گەل مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، هەموو ئەمانەش دەخوازن (حکومەت) ناوەندێکی بیلایەن بێت بۆ (انتما) کردن ناوەندێ بێت لەسەر تەوژمە فکری و سیاسیە جیاوازەکانی کۆمەڵگاوە بۆ ئەوەی بەکردەوە ببێت بە سومبولی یەکیەتی نیشتمانی و لانیکەمی ئەو زەمینە هاوبەشەی هاریکاری و هاودەردی کۆمەڵایەتی دروست بکات. کە هەموو کۆمەڵگایەك بۆمانەوەی خۆی پێویستی پێیەتی.

ئێستا لەبەر چەندەها هۆکاری جۆراوجۆری بابەتی و خودی هەستی نیشتمانپەروەری و (ئینتیما) بۆکوردستان لاواز بووە کە زۆر گرنگە رۆشنبیر و سیاسی جددی کورد بەشوێن هۆکارو رەگ و ریشەکانی ئەم لاوازبوون و بیباکییەدا بگەرێت کە لە کوردستانیی هاوچەرخدا بووە بە دیاردەو رۆژانەش لەگەڵ دەرهاویشتەکانی لەسەر ئاستی دام و دەزگا رەسمی و دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ناوەندە جەماوەرییەکەو دەستەوپەخەین و بەڵکو بووە بە تەحەدایەکی ناوخۆش لە بەردەم ناوەندە فیکری و سیاسیەکەدا کە تاچەند دەتوانن بەقووڵیی دەرکی مەترسیەکانی ئەم دیاردە بکەن و بەجورئەت و راشکاوی تەواوەوەو لەدیدێکی نیشتمانی بەرفراوانەوە لەم رووەوە هەڵوێستە بکەن و دەست لەسەر برینەکان دابنێن و رەخنە لە ناتەواویەکانی بگرن و

بەگوێرەی ستراتیژیەتێکی نەخشە بۆکێشراویش کار بۆ تێپەڕاندنی یاخود لانیکەم ئابلۆقەدانی دیاردەکەو کەمکردنەوەی شوێنەوارە نێگەتیڤەکانی بکرێت.

دیارە هەر ئەوەندەی هەست بەگیروگرفتێکی لەم جۆرە بکرێت و بەتەحەداو مەترسی سەیر بکرێت کە هەڕەشە لە ناوەو سایکۆلۆژیای مرۆڤی کورد دەکات، مەسەلەیەکی لەم جۆرە دەبێتە خولگەی بیرکردنەوەو خەمی نوخبەو ڕێبەرایەتی فکری و سیاسی کۆمەڵگاو دەکرێت بە مەسەلە، ئەوکاتەش دەکرێت بیر لە هەنگاوی عەمەلی بکرێتەوە بە ئاقار چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان و سەرلەنوێ خوێندنەوەی مرۆڤی کوردو بەخۆداچوونەوەیەکی ڕەخنەگرانەو ئاوڕدانەوەیەکی ئازایانە بۆ کەڵەبوونێکی مێژوویی هۆکارەکان کە لەپشت ئەم دیارەوەن و تارادەیەکی زۆریش خودی هێزە نیشتمانیەکان بەتایبەتیش هێزە دەسەڵاتدارو دەستڕۆیشتوەکان و بزاوتی ناسیونالیستی کوردی لێ بەرپرسیارن، ئەمڕۆ بەخۆمان بزانین یان نەزانین دابڕانێکی ترسناکی سیاسی و ڕۆشنبیری لە کۆمەڵگای کوردیدا لەئارادایە کەهەڕەشە لە یەکیەتی و هاوچارەنووسیە نیشتمانیەکان دەکات ئەمەش واقیعێکی خولقاندووە کە هێزەکان تارادەیەکی بەرچاو بەسەرخۆیاندا دابخرێن و شوناسە ناوچەیی و گروپیەکان پانتاییەکی زۆر لەبیرکردنەوەو ڕەفتاری خەڵکیدا داگیر بکەن بەشێکیتریش بەپشتێکردنێکی نیمچە تەواوی شێوە ژیانی کوردی و سەر هەڵگرتن گوزارشت لەهەڵوێستەکە بکەن.

ئێستا چیتر ئەم واقیعەی ئێمە پینەو پەرۆ هەڵناگرێت و لەسەروەستانێکی جددی دەوێت لەهەندێ ڕووەوە هەنگاوی فریاکەوتنی بەپەلەی دەوێت وەك کۆتایی هێنان بەم دوو کەرتیەو یەکخستنەوەی هێزەکان و هێورکردنەوەی نائارامیەکانی جەماوەر لەم ڕووە

لە هەندێ رووی‌تریشەوە کاری نەفەس درێژو ستراتیژی دەوێت بەخۆداچوو نەوەی فکری و گۆڕانکاری لە فۆرمەکانی کارو جۆری پێوەرەکاندا دەخوازێت.

دەبێت لەم رووەوە ناوەندەکانی توێژینەوە دەوری گەورە ببین و چەندین ئەڵقەی لێکۆڵینەوەی زانستی و سیمینارو مێزگردو توێژینەوەی مەیدنی بکرێت و ئۆرگانە جۆراوجۆرەکان رۆڵی خۆیان ببینن و نەشترسین لەوەدەرخستنی لاوازیەکان و پەردەهەڵمانین لەسەر ئەورووە لەسیمای واقیعەکەمان کە بەراستی گەش و روون نیە، کاتێ باسی چارەسەریش دەکەین دەبێت مەعریفانە باس لە بیناکردنەوەی سەرلەنویی رۆشنبیری بکەینەوە کە ئەمڕۆ سەرچاوەی جۆراوجۆری مێژوویی و هاوچەرخ، لەپاڵ رۆشنبیری میللی بەشداری لەپێکهێنانی ئەم رۆشنبیرییەدا دەکەن ناکرێ جەمسەرگیری رۆشنبیری بگاتە ئاستێ هیچ (ثوابت)ێ نەهێلێ بۆهاوکاری و هاریکاری لەم رووەوە جگە لەو کەرتبوونە مەترسیسدارەی دووچاری قوتابخانەی تەقلیدی بیری کوردایەتی و هێزەکانی بووە بەتایبەتیش دوو هێزە سەرەکیەکە وەك دەزانین بە حوکمی کاریگەری بوونیان زۆرترین شوێنەواریان بەسەر واقیعە کوردیەکەوە جێهێشتوە بەڵکو ئەم کەرتبونە تائەندازەیەکی بەرچاو لێپرسراوە لەو بێ‌باکی و لاوازبونەی هەستی نیشتمانی کە لە گۆڕێدایە، جگە لەمەش دەبێ هۆشیارانە مامەڵە لەگەڵ عەلمانی بوون و ئیسلامیی بونی تەوژمەکانی کۆمەڵگا بکرێت یەکجار گرنگە هەردوو تەوژمەکە کوردستانی بوون دەستپێکی جوڵەو دیاریکەری بەشێکی گرنگ لەناسنامەو تێڕوانینیان بێت، واتە کوردستانی بوون ئەو نەگۆڕەبێت کە هەموو هێزەکان لەچوارچێوەی ئەوداو لەسۆنگەی ئەرکەکانیان بەرامبەر گەل و نیشمانەوە بتوانن لانی‌کەم سەرەتای بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانە هەڵبژێرن، لەبازنەی ئەوەی پێی دەوترێت عەلمانیەتی کوردی و ئیسلامخوازی

کوردی پێویستمان بەبەخۆداچوونەوەیەکی فکری و بزوتنەوەیەکی رەخنەگرانە هەیە، ناکرێت ململانێی نێوان ئەم دوانە بکاتە ئاستێك بەها نیشتمانی و کوردەواریەکان بکرێنە سوتەمەنی ئەم ململانێیە چونکە ئەو بەهایانە بالەرووی مێژووییەوە ژێرخانێکی ئیسلامیان هەبێت بەهۆی ئەو ئامێزبوونەی کورد لەگەڵ ئیسلام هەیەتی و مێژوویەکی دورو درێژی ژیان و تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئەم ئاینەدا بوون بەبەهای میللی و نیشتمانی و کلتوری کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگا خاوەنیانە.

پێویستە لەم شوێنەشداو لە باسی بیناکردنەوەی رۆشنبیری نیشتمانیدا باس لە کەلێنێکی دیار لە گوتاری نیشتمانی کوردیی رەسمی باو بکرێت ئەویش نیمچە فەرامۆشکردنێکی تەواوی رەهەندە موسڵمانێتییەکەی زۆرینەی هەرە زۆری گەلی کوردو کەسێتی کوردستانیە لەکاتی سازدان و نەخشەدانانی بۆ ریفۆرم و هەوڵدان بۆ راستکردنەوەی لادانەکان و تەقاندنەوەی زۆرترین وزەو توانا نیشتمانیەکان لەپێناوی بنیاتنان و پچراندنی کۆتەکانی رووە نێگەتیفیەکەی کەلەپورو رووە ئیستیهلاکی و بازاریەکەی رۆشنبیری هاوچەرخ، دەمەوێ بڵێم لەکاتێکدا لەسەر ئاستی مرۆڤی سادەی کوردی و بنکە جەماوەریەدا هێشتا ئیسلام رۆڵی گەورەی هەیە لە سەر ئاراستەکردن و بیرکردنەوەو بڕیار و پێوەرەکانی تاك و خێزان و یەکەکانی کۆمەڵگا و ئەوەی پێشی دەوترێت بەها نیشتمانی و کوردەواریەکان لەرووی دووەمیاندا بەهای ئیسلامی کۆمەڵگاش لەحاڵێکی وادا گەر کوردبوون و کوردستانی بوون لە (٥٠٪)ی کەسێتی کوردی پێکبێنێ ئەوا مسوڵمانێتی ئەم کاراکتەرە لە (٥٠٪)یتری پێکدەهێنێ لەبەرئەوە ناکرێت مرۆڤی کورد بە لە (٥٠٪)ی وزەکانیەوە کار بکات هەڵبەتە لە (٥٠٪)کەیتریشی بەهۆی شەڕی ناوخۆو جۆرەها کارتێکەریترەوە بەتەواوەی ئیش ناکات و ئەو کاتەش

ئاستی وەگەڕخستنی تواناکان دێتە خوارەوە بۆئاستێکی زۆر نزم گوتاری باڵا دەستی ناوەندە سیاسیەکە لەدیدێکی نیشتمانی رووتیشەوە بێت بتوانێ خۆی متوریە بکات بە (موفردە) ئیسلامییەکان ئەوکاتە ئەم گوتارە (زۆرترین) (اختراق) لەسەر ئاستی سایکۆلۆژیای کەسێتی کوردی و کۆمەلانی خەڵکیش دروست دەکات ئەو دژواریە (تناقض)ەش دەسڕێتەوە یاخود کەمدەکاتەوە کەهەندێ جار لەنێوان (ئینتیما) ئیسلامیەکەی خەڵك و گوتارە ناسیونالیستیەکە کوردیەیەکە هەستی پێدەکرێت لەسۆنگەی ئەوناوەرۆکە ئایدیۆلۆژییەی ناسیۆنالیزمی کوردی لە (٥٠) ساڵی رابردوودا هەڵیگرتووە نە خودی بزاوتە نیشتمانی و نەتەوەییەکە.

پێویستە رۆشنبیری سەر بە قوتابخانەی کلاسیکی بیری ناسیونالیستانەی کوردی کە دیدێکی خۆرهەلاتناسانەی هەبووە بۆ مێژووی ئیسلامی و خودی ئیسلام خۆی دیدگاکانی تازە بکاتەوە.

پێم وایە گەر لەم رووە کارێکی جددی بێتە ئەنجامدان لەو روانگەوە کە ئەرکە نیشتمانیەکان دەیخوازێ دەوری بەرچاوی دەبێت لە کەمکردنەوەی گرژیەکانی ناوکۆمەڵگاو زەمینەی لەیەکتر تێگەیشتنی هێزە نیشتمانیەکانیش زیاتر بەهێز دەکات و شانسی بەردەم هەموو ئەوانەی بەناوی ئیسلام و مۆدێرنەوە دەیانەوێت لەسەر حیسابی زیاتر شەکەت کردنی جەستە نیشتمانیە زامارەکە کەشەڕی ئایدیۆلۆژیای بەرچاو تەنگانە بکەن نزیك دەکاتەوە لە سفر.. گومانی تیا نییە لە بەرامبەریشەوە ئەوبەشە لەناوەندە ئیسلامییەکە کەدیەوێت بەگوتارێکی ئایدیالی ئیسلامی رووتەوە کاربکات ناچار بەدابەزین بۆسەر زەوی واقیع دەکات و تێی دەگەیەنێت کە تاکە دەرفەت لە بەردەم

کرانەوەی دەرگاکانی ئایندە بەرووی تەوژمە ئیسلامیە کە لەکوردستاندا کوردستانی بوونی ئەم تەوژمەو لەخۆگرتنی خەمەکانی نیشتمان و (تبنی)کردنی دڵسۆزانەی خەون و ئاوات و هیواکانی گەلی کوردستان و نەتەوەی کوردە.

ئیشکردن بەم ئاراستەیە واتە چالاککردنەوەی بەها ئیسلامیە نیشتمانیەکانی کۆمەڵگا لەشێوەی برایەتی، خۆشەویستی، لێبوردەیی، دڵسۆزی، چاکەخوازی راستگۆیی و..هتد، لەپەیوەندیە سیاسی و نیشتمانی و کۆمەلایەتیەکاندا رەنگە یارمەتی زۆرمان بات لە چارەسەرکردنی قەیرانی شوناس و (انتما) کە بەشێ لەنەوەی نوێی ئەمڕۆ بەدەستەیەوە دەناڵێنێ، هەروەها لەو هاوکێشە سەقەتەش رزگارمان دەبێت کە مۆدێرنەو غەریگەرایی (تغریب) بەیەکتر یەکسان دەکات، کە لە حاڵەتێکی لەم جۆرەدا جگە لە تێکشکانی خودی پرۆسەی مۆدێرنەو نامۆبوونی زیاتری کەسێتی نیشتمانی و نەتەوەیی شتێکی‌تری بەدواوە نابێت، لەپاڵ ئەمەدا دەبێت هێزە سیاسیەکان بەتایبەتیش ئەوانەی (مقدرات)ی ئەم گەل و وڵاتەیان بە دەستەوەیە و قسەکەری رەسمین بەناوی کێشەی گەلی کوردستان و ئەمڕۆ لە پێگەی دەسەڵاتدان و ئەوان نەخشی سەرەکیان هەیە لە ئاراستەکردنی روداوەکان و دارشتنی جۆری پەیوەندیەکان و کارکردنە سەر واقیعەکە، بەجوانی لەوە تێبگەن کە لەسەردەمی جیهانگیری و کرانەوەی دەرگاکاندا لەساتەوەختی دڵشکاویی کوردو شەکەتی مرۆڤی کوردا لەبەرنجامی ئازاردانێکی دورو درێژی ناوخۆیی و دەرەکی ئەو رۆحەدا پێویستە دۆخ و هەلو مەرجێ بخولقێنن و بێننە کایەوە کە خەڵك هەست بەئاسایش و ئازادی تەواو و بەگشتی هەست بەژیان بکات لەم وڵاتەدا یاخود کاتێ لەرێگەی کەناڵە ئاسمانیەکانەوە خۆی بەراورد دەکات بەجیهان و بەتایبەتیش بەجیهانی جادوو ئامێزی خۆرئاوا هەست بەبوونی

لانیکەمی ژیانێکی ئابڕومەندانەی هاوچەرخانە بکات ئێمە بەهەڵەداچووین گەر کورد نەتوانێ پرۆسەیەکی ئاشتی لەناوخۆیدا بگەیەنێتە ئاکام ئیرادەی بەیەکەوە ژیان و هاوچارەنووسی بەم لاوازیە بێت کە هەیە، ناعەدالەتی زۆر لەدابەشکردنی سامان و دەسەلآتدا ببینرێت بە هۆی جیاوازی کردن لە سەر بناغەی ئینتیمای سیاسی و فکری و حزبی و دوورونزیکی لەبازنەی دەسەلآتەوە، گەندەڵی ئیداری و ماڵی و سیاسی لەئارادابێت، هێشتا مەترسی تەقینەوەی پرۆژەی شەڕە دواخراوەکانی لەبەردەمدا بێت، لەهەمان کاتدا داوای لێ بکەین بەسەر شکستە سایکۆلۆژیەکاندا باز بدات و کیبریائی بریندارى نیشتمانی چاك بێتەوە!! پرۆسەی بەهێزکردنەوەی (انتما) بۆ کوردستان و بوژاندنەوەی هەستی نیشتماپەروەری کوردی و لێپرساوێتی لە ئەستۆ گرتن پێش هەموو شتێك سەرمەشقێکی نیشتمانی دەوێت کە بەهاکانی ریفۆرم و (ئیصلاح) لەکایەکانی ژیاندا لەخۆیدا بەرجەستە بکات خاکی بوون و بۆخەڵك بوون، رێز لە ئیرادەی خەڵکگرتن و ژیان لەگەڵ خەم و خەونەکانی خەڵکی بەروونی پێوە دیاربێت، هەنگاوی بەکردەوەی دەوێت کەخەڵکی متمانەی بۆبگەڕێتەوە ئەم پێشڕەوە سەرمەشقە کەدەکرێت لەسەر ئاستی نوخبە سیاسیەکە مەسەلەکە تەرح کەین هەنگاوی چۆنایەتی وادەنێت سەراپا گەرانەوە بۆ بەها نیشتمانەکانی لێدەچۆڕێت، خەڵکی دەبێت هەست کەن لەسەر خاکی نیشتماندا دەرفەتی وەگەڕخستنی تواناکانیان لەئارادایە رێز لە وزەو تواناو دڵسۆزییەکانی دەگیرێ و دەرگاکانی خۆپێگەیاندن و پێشکەوتنی لە بەردەمدایە بەبێ گوێدانە لایەنداری و بێلایەنی و بۆچوونی فکری و سیاسی تایبەت بەخۆی، هەڵسوکەوتی سەرکردەکان رەمزە نیشتمانیەکان بەدڵسۆزی و راستگۆییەوە دەستیان لەناو دەستی یەکتردایەو هەموولا ئامانجە مەزنەکانی نیشتمان و گەلیان لەبەرچاوەو

ئامادە نین لەژێر فشاری هیچ هەل و مەرجێکدا سازش لەسەر (ثوابت)ە نیشتمانیەکان بکەن، هەروەها پاش ئاسایی کردنەوەی بارەکە بەو جۆرەی ئەرکە نیشتمانیەکان دەیخوازێت بەشداری سیاسیانەی خەڵك ببێتە واقیعێکی عەمەلی خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن هەستبکەن دەزگاو بڕیارو سیاسەتەکان ڕەنگدانەوەی ئیرادەو خواست و ئامانجەکانی ئەوانە تاکو هەمووان بەلێپرسراویەوە خۆیان بەخاوەنی پرۆژەو بڕیارەکان بزانن ئەمەش دەخوازێت قەیرانی دەسەلآت چارەسەر بکرێت و کەناڵەکانی چالاککردنی ڕۆڵی جەماوەر بەهێزتر بکرێن.

دەبێت ئەمانەو چەندان مەسەلەیتر کە ناکرێت لێرەدا باسیان لێوە بکەین ببنە واقیعێکی هەستپێکراو ئەگەرنا هەستی نیشتمانی و نەتەوایەتی بەهەندێ ئاهەنگ و هەڵپەرکێی کچان و کوڕانی وڵات نابوژێتەوە چونکە لەبیرمان نەچێت زۆرێ لەو لاوانە لەکاتێکدا بەگەرمی لەچۆپی و شێخانیدا پێ دەدەن بەزەویدا (معجب)نین بە ژیان لەنیشتمانداو خولیای بەجێهێشتنی لە سەریاندا دێت و دەچێت.

هەڵبەتە گومانی تیانیە کە ئیشکردن لەم بوارەدا کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەوێناکردنی تاك بۆ خۆی و نیشتمان و ژیان لەسەر نیشتماندا، پەیوەستە بەناوەوەی هاووڵاتیەوە لەکوردستان و غەیری کوردستانیشدا تەنها ئیشی دامەزراوەیەکی دیاریکراو نیە بەڵکو دەبێت سەرجەم دامەزراوەکانی کۆمەڵگا، دامەزراوە سوننەتی و مۆدیرنەکان خێزان و پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا لە پرۆسەیەکی جۆشخواردووی هەمەلایەنەی یەکتر تەواوکەردا سەرقاڵی بەهێزکردنی ڕۆحی نیشتمانپەروەرێتی بن لای تاك و کۆمەڵ بەگشتی، بەلآم لەبیرمان نەچێت دامەزراوەی سیاسی ئەرك و بەرپرسیاریەتی سەرەکی و بنچینەیی دەکەوێتە ئەستۆ هەر ئەویشە دەتوانێت بەجۆرێ ئاراستەی دامەزراوە

جۆراوجۆرەکان بکات و فەزایەك بۆکارکردنی جددیان بخولقێنێ، کە هەریەکەیان خۆی بە وزەو توانایەکی بەرزەوە کاربکات و کاری دامەزراوەکانیتریش تەواو بکات، نەك دامەزراوەیەك کاری دامەزراوەیەکیتر هەڵبوەشێنێتەوە یاخود هەندێ دامەزراوە دەوری (تجمید) بکرێت وەك لە بەشێ لەواقیعەکەی خۆماندا هەستی پێ دەکرێت.

هەرچۆنێك بێت گەر بزوتنەوەیەکی رەخنەگرانەو ئاوڕدانەوەیەکی سیاسی راستگۆیانەو کارکردنێکی جددی زانستیانەی خوێندنەوەیەکی بابەتیانە بۆ واقیع و کێشەکانمان هەبێت، ئێستاش دەتوانین لەم رووەوە هەنگاوی گەورە بهاوین، چونکە پێم وایە گرفتەکە بەپلەی یەکەم گرفتی نوخبە فکری و سیاسیەکەیەو ئاستەکانیتری کۆمەڵ ئامادەیی هەڵسانەوەی زۆری تێدایە.

## کۆمەڵگەی کوردی، لەنێوان ستەملێکردن و بێقەوارەییدا*

پرسیار: دەتوانن ئەگەر بەکورتیش بێت پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردیمان بۆ بخەنە روو؟

**مامۆستا ئەبوبەکر:** دەربارەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری، گەر ئاوڕێ لە رابردووی کۆمەڵگە بدەینەوە دەبینین، نەك تەنها ئەمڕۆ، خێڵ یەکێك بووە لە رەگەزە سەرەکیەکانی پێکهاتەی دوێنیی کوردەواری، کۆمەڵگەی کوردەواری لە کۆمەڵێ خێڵ و بنەماڵەی جیاواز پێکهاتوە، دیارە کە بنەماڵە لەچوارچێوەی خێڵدایە، تیرە

---

* ئەم بابەتە دەقی گفتوگۆیەکی برای نوسەر (محەمەد چیا)یە لەگەڵ نوسەر لەگەڵ دەنگی یەکگرتوو ـ رادیۆی سلێمانی، کە دواتر سازدەری گفتوگۆکە وەك نامیلکەیەك لەساڵی (١٩٩٩)دا بڵاوی کردەوە.

لەچوارچێوەی خێڵدایە، جگە لەوە خێڵ رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەدیاریکردنی رەوت و پەیوەندیەکانی ناوەوەو عورف و ئەو سیستمە بەهاییەی بە سەر کۆمەڵگادا باڵا دەست بووە. خێڵ تەنانەت لەنێوان پەیوەندیە تاکە کەسیەکانی ناو کۆمەڵگەی کوردەواریشدا رۆڵی بینیوە، بێگومان تا ئەمرۆکەش (خێڵ) هەر رۆڵ دەبینێ لەگەڵ ئەو گۆڕانانەش کەهاتوونەتەدی، دوای خێڵ تەریقەتەکانی وەك تەریقەتی قادری و نەقشبەندی، ئەوانیش خۆیان پێکهاتەیەکیتری کۆمەڵگەی کوردەواری بوون، لەسەردەمانێکیشدا میرنشینەکان وەکوو پێکهاتە دەرکەوتوون، ئەگەرچی ئەوانیش بەرجەستەکردنی جارێکیتری هەندێ پێکهاتەیتربوون وەکو خێڵ، بەڵام ناوچەکەیان پێکهاتەکەی فراوانتر بووە، بۆیە ئەم شتانە بەم جۆرە باس دەکەم چونکە تا ئێستاکەش کاریگەرییان بەسەر ناسیۆنالیزم و عەقڵی کوردییەوە هەر ماوە.

کەواتە هەر لەخێزانەوە، هەر لە خێڵەوە، هەر لە تەریقەتەکان و، میرنشینەکانەوە بگرە، تا ئەو نیمچە دەسەلاتەی هەندێ ئاغاو بەگ هەیانبووە لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا، ئەوانە هەموو رەنگدانەوەیان بەسەر بیرکردنەوەو عەقڵیەتی مرۆڤی کوردەوە هەبووە، لەم دوا دوایەیشداو، لەپەنجا ساڵی رابردوودا، ئەگەر زۆر نەچینە پێشتریش، یاخود لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە وردە وردە کۆمەڵگەی کوردەواری پێکهاتەی نوێی بەخۆیەوە بینیوە، کە ئەویش کۆڕو کۆمەڵەکان بوون، دوای ئەوانیش حزبی کوردی دەردەکەوێ و دەبێت بە بەشێك لەپێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردەواری.

دیارە کە حزبی کوردیش بەجۆرێك لەجۆرەکان دەکەوێتەوە ژێر کاریگەری ئەوکەش و هەوایەی کە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا هەیە، لێرەوە دەتوانین بڵێین ڕاستە کۆمەڵگەی کوردەواری کۆمەڵگەی دوێنێ نیە، بەڵام هێشتا رەگەزەکانی دوێنێش

چالاکییان ماوەو لەناو جەستەی کۆمەڵگەی کوردەواریدا ئیش دەکەن، لە ئێستادا حزب ڕۆڵی پەیداکردوەو ڕۆڵی گەورەشی هەیە، هەروەها وا وردە وردە خەریکە سەرەتای سەرهەڵدانی سەندیکاو یەکێتی و ڕێکخراوە جەماوەریە جۆراوجۆرەکانیتریش دەبینین، دیارە گەرچی لە رابردوودا، هەر لە چلەکانەوە، سەرەتای سەرهەڵدانی جۆرێك لەو ڕێکخراوانە هەبووە، بەڵام لە وڵاتێکدا کە ئازادی تێدا نەبێ و دیکتاتۆریەت حاکم بێت، وە لە سنورێکی زۆر بەر تەسکدا نەبێت ڕێگە بە فرەحزبی و چالاکی ڕێکخراو بوون نەدرێت، ئەو کۆمەڵانە ناتوانن بەچاکی ڕۆڵی خۆیان ببینن.

خەڵکی کوردستانیش بەهۆی ئەودۆخە تایبەتییەوە، زیاتر لە شۆڕش و بووە، ڕووبەڕووبونەوەی خوێناویدا بووە، بەڵام لەدوای ڕاپەڕینەوە خەریکە وردە وردە گەرچی تائێستا لەگەڵ ژیانی حزبایەتیدا زۆر تێکەڵاوەو، پاشکۆیەتی زۆر پێوە دیارە، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەردەکەون ڕێکخراوو فۆرمە نوێکانی خۆڕێکخسن گەشە دەکەن و دەبنە پێکهاتەیەکی نوێ کۆمەڵگەی کوردەواری.. کە ئەمە دەبێت بەسەرەتایەك بۆ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە کوردەواریدا، کەواتە ئێستا کۆمەڵگەی کوردەواری تێکەڵەیەکە، لە خێڵ و، تەریقەتەکان و، بنەماڵەکان وحزبەکان و ئەو یەکێتی و سەندیکا و ڕێکخراوانەش کە هەست دەکرێن خەریکە ڕۆڵی خۆیان پەیدادەکەن.

هەڵبەت نابێ کاریگەری بەعس و سیستمی جاشایەتی و کاریگەری یەکانیان بەسەر کۆمەڵگای کوردییەوە لە بیر بکەین. کە ڕۆڵی خراپیان لە ژیانی ڕۆحی و ئەخلاقی و سیاسیی کوردستاندا گێڕاوە.

ئەمەش وادەکات کە بڵێین کۆمەڵگای کوردی تێکەڵەیەکە لە رواڵەتەکانی سوننەت و مۆدێرنە وەك هەندێ کۆمەڵگای‌تری رۆژهەڵات و لەقۆناغی راگوزەریدایەو کایەو توخمە دژ بەیەکەکان لەناو فەزای فەرهەنگەکەیدا بەتەنیشت یەکەوە دەژین.

پرسیار: پێم وایە بوونی قەوارەیەك بۆ کورد، وەکو بونی سێبەرێك وایە بۆدانیشتن، ئێمە تائێستا بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو قەواریەمان نیە، رەنگە هۆکەی ئەوەبێ کە ئەوەندەی بیرمان لە ئازادی کردۆتەوە، ئەوەندە بیرمان لە قەوارەیەك نەکردۆتەوە، تا ئەو ئازادیەمان بپارێزێت بەلای جەنابتانەوە چۆن دەکرێت بیر لەدروست کردنی ئەو قەوارە سیاسیە بکەینەوە؟

**مامۆستا ئەبوبەکر:** دیارە دروست بوونی قەوارە سیاسیە تازەکان، لەم دەڤەرەی ئێمەدا کە کوردستانیش بەشێکی گرنگ و ستراتیژیی پێکهاتەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە، سەرچاوەی چەندین کێشەو نەهامەتین.. ئەم قەوارانەی ئێستا لەسەر دارو پەردووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و، لەسەرەتای ئەم سەدەیەوەو بەتایبەتی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، بە پێی پەیمانگەلێکی وەکو پەیماننامەی سایکس بیکۆ، سیڤەرو پەیمانی لۆزان و کۆمەڵێ پەیمانی‌تری هێزە ئیمپریالیستی و داگیرکەرەکان دروست بوون، ئەم پەیمانانە ناوچەکەیان بەجۆرێکی تازە دابەش کردەوە، کە لەم پرۆسەیەدا راستییە مێژوویی و ئایینی و نەتەوەیی و جوگرافی و واقیعیەکانیان لەبەرچاو نەگرت.. بەڵکو ئەوەی زیاتر تەحەکومی دەکرد بەسەر دابەشکردن و داڕشتنەوەی جوگرافیای ناوچەکەدا، بەرژەوەندی داگیرکاران خۆیان بوو.

کەواتە ئەو قەوارانەی دروست بوون لەراستیدا نەخشەی دابەش کردنەوە کە دروستی کردن، قەوارەکانیش لەسەر بناغەی راستیە نەتەوەییەکان دروست نەبوون، بەڵکو لەسەر بناغەی بەرژەوەندی زلهێزەکان و دۆستەکانیان بووە کوردیش بووە یەکێ لە هەرە قوربانیەکانی ئەم نەخشە و فرێدرایە دەرەوەی ستراتیژی زلهێزانی ئەو کاتەی دنیاو دارشتنەوەی جوگرافیای ناوچەکە لە سەر حسابی ئەو تەواو بوو یەکجار قورسیش لە سەری کەوت، کورد هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەو بەڵکو لە پێشتریشەوە هەوڵی داوەو بیری لە دەوڵەتی کوردی کردۆتەوە، هەر لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، لە (پاریس) لە دانیشتنەکانی ئاشتی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، نوێنەرانی کورد لەو دانیشتنانەدا زۆر هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی کوردی بنیات بنێن.

دیارە لە پەیمانی (سیڤەر)یشدا دەزانین سێ ماددەی تایبەت بوو بەوەی کە کوردەکان وردە وردە بتوانن قەوارەی سەربەخۆی خۆیان دروست بکەن، بەڵام لەدواییدا جارێکیتر بەرژەوەندی داگیرکەران لە پەیمانی (لۆزان)دا ئەو خەونەی کوردیان زیندەبەچاڵ کرد، پێم وایە هەندێ گەل و خەڵکیتریش بەقەدەر ئێمە بیری لەدەوڵەت کردۆتەوە، بەڵام هەڵکەوتەی شوێنی کورد، هەڵکەوتەی جوگرافی و شوێنی کوردستان لەرووی جوگرافیەوە، کە نزیک بوە لەهەردوو پایتەختی ئیمپراتۆریەتی سەفەوی و عوسمانیەوە وای کردووە کە شانسی کەمتر بێت بۆ دروستکردنی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەیی لەو گەل و نەتەوانەیتر کە دوور بوون لەو شوێنانەو دوچاری ئەو دابەشکردنە ئاڵۆزە نەبوونەوە.

دەبینین کاتێ ئەمپیراتۆریەتی عوسمانی هەڵدەوەشێتەوە، بەشێکی گەورەی کوردستان دەکەوێتە ژێر دەستی ئەو دەوڵەتە نوێیەی لە تورکیادا دادەمەزرێت، کە ئیمپریالیزمی خۆرئاوا رۆڵی هەبوو لە شکڵپێدان و دارشتنیدا، کەواتە هەر لەسەرەتاوە کوردەکان بەهۆی شێوازی دروستکردنی ئەو قەوارە تازانەی خۆرئاوا بەپێی پەیماننامە تازەکان دایمەزراندن، نەبوون بەخاوەنی قەوارەیەکی سەربەخۆی خۆیان.. لێرە بەدواوە. دەمێنێتەوە سەر شۆرش و خەبات کردنی کورد خۆی، کوردیش خەباتی کرد، خوێنی رشت و قوربانی زۆریدا، بەڵام دیسان هەڵکەوتی جوگراف، ململانێی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، بەرژەوەندی زلهێزەکان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان بەسەردا دابەش کرابوو لەپاڵ لاوازی و گرفتەکانی کورد خۆی، هەموو ئەوانە وایان کرد ئەو خەباتەش تاکو ئێستا لەگەڵ ئەو هەموو قوربانی دانە سەخیانەدا، لەگەڵ ئەو هەموو قارەمانیەتەدا، وەك ئەوەی چاوەڕێ دەکرێت بەرنەگرێت. لەم خەباتەشدا لەسەرەتاوە باس باسی دەوڵەتی کوردی بوو، تا شۆرشی شێخ سەعیدی پیرانیش باس باسی سەربەخۆیی کوردو کوردستان بوو، باسی قەوارەو دەوڵەتی کوردی بوو، بەڵام وردە وردە لە دواییدا، کە ئەم کیانە ناوچەییانەی دوای شەڕی جیهانی یەکەم دروست بوون و خۆیان سەپاندو، بوون بە ئەمری واقیع، مەسەلەی دەست تێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتان لە سایەی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هاتە پێشەوە، هەروەها بەهۆی جەنگی سارد لەنێوان رۆژهەڵات و رۆژئاواداو، دابەشبوونی ئەو دەوڵەتانەش بەسەر نفوزی ئەو سەربازگاکانداو کاریگەری پەیداکردنی بیری چەپ و سۆسیالیستی کە ئەویش لەراستیدا زیاتر مۆدێلی حوکمی زاتی و لامەرکەزی و ئەوانەی پێبوو، نەك پرۆژەی سەربەخۆیی، کاریان کردە سەر بیرکردنەوەی دەستە بژێری کوردی، ئەمانەش وایانکرد

بواری مانۆڕ لەبەردەم کورددا تەسکبێتەوە، تەنانەت وای لێهات و حاڵ گەیشتە ئەوەی کە هەندێ جار کورد داوای لامەرکەزیەکی ئیداری بکات!، یان داوای ئۆتۆنۆمییەکی سنورداری دەکرد، کەچی ئەوەشی پێ ڕەوا نەدەبینرا، جۆرەها تۆمەتی حازربەدەستی وەك خائین و پیاوی ئیمپریالیستی دەدرایە پاڵ و بەجیاخوازو.. هتد. لەقەڵەم دەدرا. لەبارێکی وا ناهەمواردا کوردێك کە کەمترین مافەکانی پێ ڕەوا نەبینرێ، لەهەر چوار لاشەوە ئابلۆقە درابێ، خۆشی هێشتا خێڵ دەوری ترسناکی تێدا ببینێت، هێشتا میتۆدێکی فیکری دیاریکراو، یاخود ڕۆشن لە ئارادا نەبێ خەڵکەکە چەکدارین پێی، کە لەگەڵ پێکهاتەی کەسایەتی ئەم مرۆڤەدا بگونجێت و، بەرچاو ڕۆشنی بکاتەوە، دەبێت چ دۆخێ بێتە کایەوە؟ کەواتە هۆکارە بابەتیەکان بەبڕوای من ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لەوەی تاکو ئێستا کورد دەوڵەتی خۆی نەبێت، ئەمەش ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە هۆکارە خودییەکانیش ڕۆڵیان هەبووە، بەڵام بەپلەی دووەم دێن.

ئێستاش ئێمە لەواقیعێکدا دەژین، کە هێشتا لەناو ماڵی کوردا، ناکۆکی و دابەش بوون هەیە، دابەش بون و دابڕان و ناکۆکی لە نێوان باڵەکانی بزاڤی ڕزگاریی نیشتیمانی خەڵکی کوردستان لە پارچەکاندا تەنانەت لە یەك پارچەشدا لەئارادایە. ئێمە شایەتی چوار پێنج ساڵ شەڕی ناوخۆین لە کوردستانی عێراقدا، لەولاوە هەڵوێسی خۆرئاوا تائێستاش دژایەتی قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردی دەکات، چونکە لەم ساتە مێژووییەدا لەگەڵ ئەوەدا نیە پێکهاتەی جوگرافی و سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست هەڵبوەشێنرێتەوە و دابڕێژرێتەوە، بەڵام ئەگەر کیانێکی فیدراڵی لە عێراقدا بێتە کایەوە، ئەگەر فیدرالیزم سەربگرێ ئەوا وردە وردە دەبێت بەسەرتایەك بۆ ئەوەی ئەگەر ئالوگۆڕێك لەپێکهاتەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا هاتەدی،

کوردیش توانای تێگەیشتنی لەو ئاڵوگۆڕانە هەبو، وەشوێنی خۆی لە ناویاندا دۆزیەوە، بەوجۆرەی کە پێویستە، ناو ماڵی خۆی رێکخستبوو، هەروەها رۆڵی لەئاراستەکردنی روداوەکانداو لە رێکخستنەوەی ناوچەکەدا هەبوو، ئەوکاتە دەوڵەتی کوردی، بەمانا نوێکەی ـ دیارە کە لەوە دەچێ گۆڕان بەسەر خودی چەمکی دەوڵەتدا بێت بەمانا کلاسیکیەکەی ـ دەبێتە ئەگەرێکی چاوەڕوانکراو و زەمینەی بەدیهاتنی لەجاران سازتر دەبێت، دیارە لەم ساتە وەختەی ئێستاشدا، هێشتا بەربەستی بابەتی (موضوعي) لەبەردەمدا ماوە، بەڵام سەرەڕای هەموو بەربەستەکان دەوڵەتی کوردیی وەکو خەونێك، وەکو ئامانجێکی مەرکەزی بزاڤی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان دەبێ هەر بمێنێ، بۆ ئەوەی کورد خەونی گەورەتر بێ و هەوڵ بدات زەمینەی بە دیهاتنی بۆساز بکات من بەم جۆرە لەمەسەلەکە حاڵیم.

پرسیار: وابزانم بەشێکیتری ئەو پرسیارەی ئاراستەی بەڕێزتانمان کرد، پەیوەندی بە خۆمانەوە هەیە وەکو کورد، لەروی پێگەیشتنی عەقڵیەوە، بەدرێژایی مێژوو چی وای لەکورد کردوە لەژێر دەستەیی رزگاری نەبێت؟ ئایا دەتوانن سلبیاتەکانی پێکهاتەی عەقڵیەتی کوردی دەستنیشان بکەن؟

مامۆستا ئەبوبەکر: وەك ڕوونە کورد لەسایەی ئیمپراتۆریە ئیسلامیەکاندا کۆمەڵێ قەوارەی هەبووە، ئێمە دەوڵەتی ئەیوبیەکانمان هەبووە، دەوڵەتی دۆستەکیەکانمان هەبووە، شایەتی دروست بوونی (٥٢) قەوارەی کوردی، وەکو نیمچە دەوڵەت و لەشێوەی میرنشیندا بووین، دوایەمین میرنشینی کوردیش لە پەنجاکانی سەدەی نۆزدەدا دەڕوخێ، کەواتە لەژێر ئەو قەڵەمڕەوەدا جۆرێك لە خۆ بەڕێوەبردن، جۆرێك

لەشێوە فیدرالیزم، جۆرێك لە کۆنفیدرالی، جۆرێك لە دەوڵەت بوون، لەوێنەی ئەیوبیەکان و دۆستەکیەکان هەبووە.

چەوسانەوە بەم مانایەی ئێستای واتە لە سۆنگەی کورد بوون و جیاوازی نەتەوەیی یەوە. زیاتر لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە پەیدا بوو، لێرەوە چەوساندنەوە لە سۆنگە نەتەوەییەکەوە دەست پێ دەکات، ئەگەرچی لەسەدەی (١٩)ەوەو بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی ئەو سەدەوە دەستی پێکرد، بەڵام زیاتر لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە توندوتیژو بەرفراوان بوو، دیارە وەکو وتم شوێن و هەڵکەوتی جوگرافیای کوردستان کە لەنێوان سەفەویەکان و عوسمانیەکاندا بووە، بە حوکمی ئەوەی ئەم دوو دەوڵەتەش بە نیمچە بەردەوامی ململانێیان هەبووە، زۆرجاریش کوردەکان ویستویانە سوود لەو ململانێیە وەربگرن، بەڵام لەهەمان کاتدا لەو نێوەندەدا هەندێ جار سودی خراپیان لێ وەرگیراوەو بەرهاڕین کەوتوون، ئەو حاڵەتەو دۆخی ئەم سەدساڵەی رابردووی کوردو کوردستان، کە بۆ کوردو ناسیۆنالیزمی کوردی سەدەیەکی پڕ سفت و سۆ، پڕ خوێن، پڕ ئازار، پڕ تێکشکان، پڕشۆڕش و بەرخواردن و بەئاوات نەگەیشتن بووە وایان لە عەقڵیەتی کوردیدی و کورد کردووە.. پچرپچڕ بیر لە ژیان بکاتەوەو نەتوانێت ئەزمونێکی کەڵەکەبووی مێژویی دروست بکات، ئەو واقیعە تراژیدیایە جۆرێ لە بێ متمانەیی لە لا دروست کردووە، بۆیە زیاتر بیری فریادرەسێ لەدەرەوەی سنورەکانی خۆیەوە کردۆتەوە، عەقڵیەتی ناوچەگەری و ئیشکردن لەسەر شوناسی ناوچەیی، لاوازی هەستی نەتەوایەتی، بوونی دیالیکتی جیاواز، ناوچەو هەرێمی جیاواز، بوونی خێڵ و پێکهاتەی جیاواز، لەمێژووی نوێشدا بوونی حزب و تەوژمی فکری و سیاسی جیاواز نەبوونی شوناسێکی یەکگرتووی بەهێز بۆ تێپەڕاندنیان، ئەمانە هەموو رۆڵیان بینیوە لەوەی کە

عەقڵی کوردی، عەقڵێك بێت نەتوانێت هەندێ سنوورداربوون تێ پەڕێنێت و تەجاوزی بکات، لەسەر ئاستێکی فراوانتر بیر لە مەسەلەکان و کێشەکان بکاتەوە کە پێویستی‌یەکی کاری نەتەوەیی بەرفراوانە.

دیارە ئەو بێ‌متمانەیی و، ناوچەیی بوون و نەبونی ئەزموونی کەڵەکەبووە لە پاڵ زوو هەڵچون و سادە بیرکردنەوەو زوو متمانە بە بەرامبەر کردن، یاخود دەرك نەکردنی ئەو پێکهاتەو مێژو هاوکێشانەی حوکمی ناوچەکە دەکەن و ئاراستەی رووداوە سیاسیەکان دیاری دەکەن، عەقڵی کوردی بەگوێرەی پێویست نەکرێتەوەو (خلاق)، یاخود داهێنەر نەبێت و بەو جۆرەی پێویستە رۆڵ لە شیکردنەوەی واقیعەکان و ئاراستە کردنی رووداوەکاندا نەبینێ.

بەڵام دووبارەی دەکەمەوە فاکتەرە بابەتیەکان رۆڵێکی سەرەکییان هەبووە لەوەی کە تەنانەت عەقڵی کوردیش تووشی ئەو حاڵەتە ببێ، پێم وانیە عەقڵی زۆر گەل لە رۆژهەڵاتی ناوەراست و لەدونیاشدا لەعەقڵی کوردی پێشکەوتووتر بێت، بەڵام هەلومەرجی بابەتی وای کردوە کە ئەو گەلانە دەوڵەت و قەوارەیان هەبێ و ئێمەش بەو جۆرە بمێنینەوە، ئێمە ئەگەر سەیری دەوڵەتەکانی خەلیج بکەین، پێکهاتەی عەشایەری ئەوان پێشکەوتووتر نەبووە لە عەشایەری کوردی، بەڵام هەڵکەوتەی جوگرافیی ئەوان، بوونیان لەشوێنێکدا بووە کە ئیرادەیەك خواستویەتی، دەرەنجام کۆمەڵێك دەوڵەت، لەسەر بناغەی خێڵ و بنەماڵەو هەندێ میرنشینی لەوەوپێش دروست ببن.

پرسیار: لەئەمڕی رۆشنبیریدا بانگەشەیەکی باش هەیە بۆ مەدەنیەت و بیناکردنی سیستمێکی مەدەنی لەبری ئەو سیستمە خێڵەکیەی کە بەسەر عەقڵیەتی کوردیدا زاڵە،

یەکێك لە پێناسەکانی مەدەنیەتیش بەتایبەتی لەرووی جێبەجێ کردن و پراکتیکەوە، واتە دابەش کردنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی بەسەر کەناڵ و دەزگا جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگەدا، ئەم پرۆسەیە لەو دەوڵەتانەدا کە لە رووی سەقامگیربوونی سیاسی و جێگیربوونی قەوارەیان و کەم بوونەوەی هەڕەشە دەرەکیەکان لەسەریان ئەم پرۆسەیە لەو وڵاتانەدا دەتوانم بڵێم لەخزمەتی چەسپاندنی دیموکراتی و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەدەستهێنانی مافە تاکەکەسی و کۆمەڵیەکانە، بەڵام لەلای ئێمە پرۆسەیەکی لەوشێوە ئایا تا چەند کاریگەرە لەسەر دابەشکردنەوەی ئەو هێزە کەمەی کە هەمانەو تا چ رادەیەك کاریگەر لەسەر بەرەو پێش بردنی پرۆسەی سەربەخۆیی بوون و بەدەستهێنانی مافە هەرە سەرەتاییەکانمانە کەئێستا لێمان زەوت کراوە؟

**مامۆستا ئەبوبەکر:** باسی مەدەنیەتت کرد، بەس ئەگەر بوترایە کۆمەڵگەی مەدەنی راستتر دەبوو، کە زیاتر پەیوەندی بە دابەشکردنەوەی دەسەڵاتەوە هەیە بەسەر ئۆرگانە جۆراوجۆرەکاندا، بەبڕوای من گەشەکردنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگە مەدەنی ـ کەزۆر جار چەمکەکە لای ئێمەخواستراوەو، بەچاولێکەری بەکاردەهێنرێ و زەمینەی پراکتیککردنی ئەوەندە نیەو گواستنەوەی ئالی هەیە بۆ چەمکەکە، بانگەشەیەك و هەندێ جاریش وەکو پروپاگەندەیەکی سیاسی سوودی لێ وەردەگیرێ ـ چوارچێوەی قەوارەیەکی سیاسی جێگیردا زیاتر ئەو دامەزراوانە ئیش دەکەن و گەشە دەکەن، چونکە ئەگەربێت و کۆمەڵگە لەبەر هەڕەشەی لەناوچوون و سڕینەوەی ناسنامەو تێکشکانی فیزیکی و ماددی خۆیدا بێت، ئەو دەزگایانە چۆن دەتوان لەوێدا گەشە بکەن؟

له کۆمەڵگەی ئێمەدا سەرەڕای ئەوەی لە دوای ڕاپەڕینەوە لە ئاستێکدا جۆرێك لە جێگیری سیاسی و خۆبەڕێوەبردن هەیە بەڵام ئەو ڕێکخراوانە بەوجۆرەی پێویستە گەشەیان نەکردووە، حزبەکان دەسەڵاتداری یەکەمن، قسەی یەکلاکەرەوەو دوایی بۆ ئەوانە تەنانەت قسەی یەکەم بۆ دامەزراوە نیشتمانیەکانی‌تری وەکو پەرلەمان و حکومەتیش نیە، چ جای بۆ دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بێت.

بەڵام ئەگەر بێت و وردە وردە دەسەڵات لە حزبەکانەوە بگوێزرێتەوە بۆ دامەزراوە نیشتمانیەکان، بەمانای وشە چەمکی هاووڵاتی لە کوردستاندا مانا پەیدا بکات، ئەو کاتە گەر وا بیربکەینەوە کە پێویستە دەسەڵاتێکی مەرکەزیی کوردی لەم قۆناغەدا هەبێ بۆ پارێزگاری کردن لەقەوارەو بوون و بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی لەسەر حسابی گەشەکردنی دیموکراسی و کۆمەڵگای مەدەنی، من لەگەڵ ئەوەدا نیم چونکە ئەمە بیرکردنەوەی پەنجا ساڵی رابردووی ڕژێمە سیاسی‌یەکانی دونیای سێیە، بەتایبەتی دنیای رۆژهەڵاتی ئێمە، بیرکردنەوەی ئەوانەیە کە دەیانوت پێویستە یەك حزب دەسەڵاتدار بێت، دیکتاتۆریەت حوکم بکات، بۆ ئەوەی یەکێتی کۆمەڵگە پارێزراو بێت و وڵات گەشە بکات و لە پیلانی دوژمنان بەدوور بن پێویستە حیزب سەرجەم وزەو تواناکانی کۆمەڵگا ئاراستە بکات، بوونی زیاتر لە حزبێ دەبێتە هۆی دابڕدابڕبوونی کۆمەڵگاو بەفیرۆدانی وزەو تواناکانی، بەپێچەوانەوە ئێستاش ئێمە ئەگەر بەپێی لۆژیکی ئەو جۆرە دەسەڵاتە مەرکەزیە شمولیە بجوڵێینەوە، دەبێت ژیانی فرەحزبی نەهێڵین لە کوردستاندا، رەنگە جۆراوجۆرەکان و دەنگە جۆراوجۆرەکان بسڕینەوە، بەبیانووی ئەوەی کە کورد پێویستی بەدەسەڵاتێکی مەرکەزی هەیە، لە کاتێکدا کورد پێویستی بە ئەزموونێکی نوێ هەیە، مانای ژیانێکی جیاواز لە ژیانەکەی پێشووی خۆی فێر ببێ و

ئەزموون بکات، فێری مانای ئازادی سیاسی، فیکری، کۆمەڵایەتی و مافە تاکە کەسیەکان ببێ، کە ئەمەش لەژێر دەسەڵاتێکی مەرکەزی گشتگیردا نایەتەدی (هەڵبەتە لێمان تێك نەچێ مەبەستمان لەبوونی دەسەڵاتێکی بەهێزی دیموکراسی نیە کە ئەوە داواکاریی هەموومانە).

دەسەڵاتێکی مەرکەزیی لەو جۆرە لەسەر ئاستی دەرەوەو دونیا، بەپێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و، ئازادیە سیاسی و کۆمەلایەتیەکان تاوانبار دەکرێت. کە ئەوەش لەراستیدا خۆی لە خۆیدا پشتیوانی دەرەکی بۆ ئەزموونەکە کەم دەکاتەوە، لە ناوخۆشدا وا لەخەڵك دەکات جیاوازی لەنێوان ئەم دەسەڵات و دەسەڵاتەکەی پێشووتردا نەبینن.. ئەمەش گەورەترین هەڕەشە لە پرسە نەتەوەیی یەکە دەکات و دەیخاتە بەردەم مەترسی جدیەوە..

لەبەر هەموو ئەم شتانە، هێزی سوڵتەیەکی کوردی لەوەدا نیە کە لەرێی مەرکەزیەتێکی توندوتیژەوە بیرورا جیاوازەکان و پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگا تێکبشکێنێت و هەموویان چڕ بکاتەوە لەیەك فۆرمی دەسەڵاتدا، بەڵکو زیاتر لەوەدایە ئەو دەسەڵاتە تا چەند شەرعیەتی هەیە؟ چەند خەڵك لەگەڵیدایە؟ چەند گەل دڵخۆشە پێی؟ تا چەند هاوڵاتی لە سایەیدا هەست بە بوونی دادو یەکسانی دەکات ؟ تا چەند دنیای ئازاد پیشتیوانی لێ دەکات؟ ئەگەر ئەو شەرعیەتە جەماوەریەی هەبوو، ئەوکاتە بوونی پنتی جۆراوجۆری دەسەڵات و هێز بە مانا فۆکۆیی یەکەی و لە سایەی دەستورو یاسایەکی نیشتمانیدا، گوڕژمێکیتر دەدا بەو دەسەڵات و حکومەت، بۆ ئەوەی بەگوڕترو بەهێزتر بەرەو رووی هەڕەشەکانی سەری ببێتەوە.

ئێستا هێزەکان، ئاراستەی روداوەکان و هەلومەرجە سیاسی و کۆمەلایەتی و فیکریەکان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەسەر ئاستی ناوچەکەو دونیاشدا، کەواتە بەپێچەوانەوە بەهێزبونی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، ئەگەربێت و بێتەدی، کە حزبەکانیش بەشێك دەبن لەو حاڵەتە، زیاتر شەرعیەت دەدا بەو حکومەتە، گەلیش وا لیّ دەکات زیاتر پشتیوانی لیّ بکات، دنیاش زیاتر گوێمان لیّ دەگرێت و زیاتر وەکو ئەزمونێکی جیاواز لە ئەزمونەکەی پێشەوە خۆی نیشان دەدات و دەردەکەوێت، کە ئەمەش وکو وتمان بۆ زیاترکردنی پشتیوانییە ناوخۆیی و دەرەکیەکان گرنگە.

پرسیار: من حەز دەکەم نمونەیەك لەسەر ئەو پرسیارەی پێشوو بهێنمەوە بۆ جەنابتان.. بۆ نموونە کۆماری ئیسلامی ئێران لە سەردەمی شۆڕشدا کاتیّ کە شۆڕشی بەرپا کرد، کۆماری ئیسلامی ئێران پێویستی بەدەسەلاتێکی مەرکەزی هەبوو، پێویستی بەوەبوو زیاتر جەخت لەسەر دروشمەکانی شۆڕش و ئەو سەردەمە بکاتەوە، تا ئەوکاتەی توانی کێشە ناوخۆییەکان چارەسەر بکات و پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەرەوە چاك بکات، لەرووی ئاسایش و ئابوری و سیاسیەوە جۆرێك لە سەقامگیربوون بۆخۆی دروست بکات، بەلام ئێستا جۆرێك لەکرانەوە بەسەر دونیاو، جۆرێك لە پیادەکردنی ئەو سیستمە مەدەنیە لەئێراندا دەبینرێت.. مەبەستم ئەو قۆناغە بوو.

مامۆستا ئەبوبەکر: دیارە دۆخی ئێمە جیاوازە، قیاس ناکرێت لەگەڵ ئەوێدا، کورد شۆڕشێکی لە پایتەختدا هەڵنەگیرساندووەو زاڵ بوبیّ و کۆنترۆڵی ولاتێکی گرتبێتە دەست و، خۆی دام و دەزگاکانی دروست کردبێت.. بەڵکو دوای جەنگی کەنداوی دووەم،لە بەرەنجامی ئەو بارودۆخەی هاتە کایەوە. راپەڕینی خەڵکی قارەمانی کوردستان بەرپابوو. لێرە ناوچەیەکی ئارام دروست کرا، کەناوچەکە لە لایەن دەرەوە

پارێزگاری لێ دەکرێت.. دەسەڵاتێکی دەرەوەی سنورەکانی ئێمە شەرعیەتی داوە بەو ناوچەیە، کورد دەسەڵاتێکی دیفاکتۆی لێرە دروست کردووە، هێشتا گۆڕان لەمەرکەزدا رووی نەداوە، وا نۆ ساڵ بەسەر ئەو وەزعەشدا تێپەڕی کە شەرعیەتی هەڵبژاردن ویستی شوێنی شەرعیەتی شۆڕش بگرێتەوە، بەڵام بەداخەوە لەو کاتەوە لە کوردستاندا هەڵبژاردن ئەنجامدراوەتەوەو پەرلەمان و حکومەت دووچاری کێشەی گەورە هاتوون.

ئێستا کورد خەباتی بۆ ئەوەیە ئەو دام و دەزگایانەی کە شەرعیەتی جەماوەرییان هەبووە، وەکو پەرلەمان و حکومەتی هەرێم، جارێکیتر بەشێوەی سروشتی خۆیان دەست بەئیش بکەنەوەو حکومەتی یەکگرتوو پەیدا ببێتەوەو هەڵبژاردنی تازە ئەنجام بدرێت، کورتەکەی ئەوەیە هەلومەرج لەکوردستاندا جیاوازەو قیاس ناکرێ بۆسەر ئەو جۆرە شوێنانە، خەبات لێرە بەشێکە لەخەبات بۆ مافی مرۆڤ و دیموکراسی و ئازادیە مەدەنی و سیاسیەکان، لەناوخۆی کوردستاندا ئەگەر ئەزمونەکە بەوجۆرە نەبێت جێگای پشتیوانی خەڵکی کوردستان نابێ و، هاوڵاتیان تووشی رەشبینی و بەدبینی دەبن، خەڵکەکە جیاوازی ناکات لەنێوان دەسەڵاتە کوردیەکەو دەسەڵاتەکەی پێشووتردا، پاساو بۆ بەرگری لێکردنی کەم دەبێتەوە، رای گشتی و ئەو دۆستانەی کوردیش کە بەرگری لێ دەکەن لەسەر ئەو بناغە ئەم پشتیوانییە دەکەن کە لە کوردستاندا ئەزمونێکی دیموکراسی پێچەوانەی مەرکەزو ناوچەکە هەبێت گەر وا نەبوو، ئەوانیش دڵ سارد دەبنەوەو هەڵوێستیان لاواز دەبێ، کەواتە لێرە هەم ساتە مێژووییەکەو هەم هەلومەرجەکە جیاوازە، مانای شۆڕش و گۆڕانیش جیایە، بۆیە دەبێت ئەزموونەکەی ئێمە لەچوارچێوەی زەمانی و مەکانی و گۆڕاوەکانی خۆیدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، دەبێت هێزە کوردیەکانیش بەجیاوازی ئینتیمای سیاسییانەوە دەرکی ئەو جیاوازییە

بکەن. ئەگەر نا ناتوانن ئەزمونەکە گەشە پێ بدەن و لەو هەڕەشانەی ڕووی تێدەکەن بیپارێزین.

## مانایەکی‌تر لەسەرەڕۆیی خەباتی کورد بۆ دەستخستنی کەسێتی نێودەوڵەتی

پرسین لە ڕێوجێی سیاسی و ئەگەری پەیدابوونی کەسێتییەکی نێودەوڵەتی بۆ کورد بەو جۆرەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی دانی پێدادانێ، دەمانکێشێتە سەر قسەکرد، لەسەر سیستم و یاسایەکی نێودەوڵەتی گشتی زۆردارو نادادپەروەر کە لانی‌کەم لەسەدەی رابردوودا کوردی خستە ناودۆزەخی کۆمەڵێ قەوارەی دەستکردی هاوچەرخ و گێژاوی مەینەتی و چەوساندنەوەیەکی بێ‌ئەندازە و تاقەتپڕوکێنی بەسەردادا، ئێمە کاتێ دەگەڕێینەوە بۆ پرەنسیپەکانی ئەو یاسا گشتییە نێودەوڵەتی‌یەو سەرچاوەو ئامانج و دەزگاو بەڵگە نامەکانی، ئەوسا تێدەگەین ئەو دۆخەی ئەو یاسایە لەجیهاندا لەسەدەی رابردوودا خولقاندوویەتی و ئەو چەمکانەی ئیشی پێکردوون و کردوونی بەخولگە چ فەزایەکی زۆردارو نائینسانی بۆ گەلی کوردستان خولقاندووە، گەلی کورد لە سەدەی ناسیۆنالیزمی خۆرهەڵات (واتە سەدەی بیستەم) و دروستبوونی قەوارە نیشتمانی و هەرێمایەتیەکان لەسەر شوێنەوارو کەلاوەی رووخاوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەپاڵ زوڵمی (استبداد)ی ناوخۆیی ئەو نوخبە تازەی جڵەوی کاروباریان لەو قەوارانەدا گرتە دەست، کە کوردیان بەسەدا دابەشکرابوو، دووچاری زوڵم و ستەمێکی جیهانی و نێودەوڵەتیش بۆوە، تەنانەت لەهەندێ کاتدا لەناو ئەو قەوارانەشد هێزە کۆلۆنیالیستیەکان راستەوخۆ بەشداری جدی سەرکوتکردنی ڕاپەڕین و

سەرهەڵدانەکانی نەتەوەی ئێمە بوون و بەکردەوە دژی خواستە رەواکانمان بەقازانجی ئەو نوخبە پاکشۆیەی لەژێر سایەو بەپیرۆزبایی ئەوان دەسەڵاتیان گرتبووە دەست وەستانەوە، بەشداری فرۆکەو ئەفسەرە ئینگلیزەکان لەسەر دامرکاندنەوەی شۆرشەکانی شێخ مەحمود و هێرشی بێرەحمانە بۆسەر راپەرینەکەی خەلیل خۆشەوی لە ناوچەی بادینان لەساڵی (١٩٣٦)و دواتر جوڵانەوەی بارزانیەکان، هەروەها هەڵوێستی روس و ئینگلیزەکان بەروکارێکیتردا بۆ بەگورگان خواردو و دانی کۆماری کوردستان دەچنە خانەی ئەو هەوڵە راستەوخۆیانەی ئاماژەمان پێکرد.

بۆیە ئەوە هەر دەسەڵاتە زۆردارە ناوخۆییە دواکەوتووەکانی ناوچەکە نەبوون ئێمەیان خستە بەر قورسترین جۆری چەوساندنەوەو بێحورمەتیکردن بە ماف و ئازادی و کەرامەتی ئینسانیمان، ئەوە هەر تەنها ئەوان نەبوون پێشمەرگەکانی ئێمەیان بە هەڵگەراوەو یاخی و بەکرێگیراوو لەیاسا دەرچوو و چەتەو رێگر لە قەڵەمداوە، بەڵکو کۆمەڵگای نێودەوڵەتیش بووە، بریار بەدەستە جیهانیەکان و سیستەمە نا عادیل و زۆردارە نێودەوڵتیەکەش بوون، کە بەهەمان چاو سەیری ئێمەیان کردووەو رۆژێ لە رۆژان بەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵ ئێمە نەکردووە کە گەلێکی چەندین ملیۆنین و لەپێناو لابردنی زوڵمێکی مێژوویی کەلێمان کراوەو بۆ بەدەستهێنانی مافە سەرەتایی و سروشتیەکانی خۆمان، دەستتمان داوەتە چەك و شۆرش دەکەین و دەخوازین وەك نەتەوەیەك و گەلێك بەڵکو وەکو گروپێکی بەشەری دووچاری ژینۆسایدو تواندنەوە نەبین و بتوانین لەسایەی لانیکەمی کەرامەت و ئازادی و نان و ژیان و خۆشگوزەرانی و ئاشتی و ئارامیدا ژیان بەسەرەبەرین، سیستمە نێودەوڵەتیە کۆنەکەو هێزە دەسترۆیشتوو بنچینەییەکانی ناو ئەو سیستمە لە رێی پەیماننامەی (سایکس بیکۆ)و (بریست لیوفسك)

و (لۆزان) و چەندینیتر بۆ یەکەم جار کوردیان بەم جۆرەی ئێستا بەش بەش و پارچە پارچە کرد، هەروەها لە ڕێگای پیرۆزی دان بەسنورەکانی ئەم دەوڵەتانەوەو هێنانەکایەی چەندین چەمکی وەکو سەروەری و دەست نەخستنە ناو کاروباری ناوخۆی وڵاتان و پارێزگاری کردن لە یەکێتی خاکی وڵاتان، ئێمەیان خستە ناو ئەم زیندانانەوە، تەنانەت بێئەوەی لەسەر ئاستی تاك و هاووڵاتیش مافی زیندانیەکی سیاسیمان هەبێت، چونکە مرۆڤی کورد لەنێو ئەم قەوارە مۆدێرنانەدا کاتێ نکوڵی لەشوناسی نەتەوەیی کراوەو هەوڵی تواندنەوەو مەسخکردنی دراوە، لەسایەی ئەو (استبداد)ە هاوچەرخە توندڕەوەی لەم قەوارانەدا (حاکم) بووە ئاسان نەبوە چاوەڕوانی مافی زیندانیەکی سیاسیش بکات، بۆیە سەرەنجام ئەو وەکو بەکرێگیراوو تێکدەرو سەرچاوەی ناهێمنی و جەستەیەکی نامۆو تاوانبارێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ کراوە، بەگشتی داستانی کورد لەگەڵ یاسای گشتی نێودەوڵەتی و نەتەوەیەکگرتوەکان و نیزامە دەولیەکە تۆمارێکی سەختی دنیایەك لە خوێن و فەرامۆشکردن و پەراوێز خستن و دانپیانەنان و بەجێهێشتن بۆ کەڵبەکانی دڕندەی (استبداد)و تاکڕەوی و لێسەندنەوەی هەموو شەرعیەتێکی بەرگری لەخۆکردن و چاوەڕوانیەك بووە بۆ پشتیوانی لێکردن لە پێناو گەیشتن بەمافەکانیدا.

## سەرنجێ لە مەسەلەی کەسێتی نێودەوڵەتی

هەروەك روونە کەسەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتی بەپلەی یەکەم دەوڵەتە دوای ئەویش رێکخراوە جیهانی و هەرێمایەتیەکان، لای هەندێ یاساناسیش (تاك) لە هەندێ

کاتدا دەبێتە بابەتی ئەم یاسایەو وەك کەسێتی دانی پیادادەنێ گەرچی ئەمەی دواییان جیاوازی بیروڕای زۆری لە سەرەو گرەوی زۆری لەسەر ناکرێت، لەلایەکی‌ترەوە سروشتی ئەم یاسایە وایە کە خۆی لەخۆیدا هێزێکی پابەندکەری نییەو تارادەیەکی زۆر جێبەجێ بوونی بەجێماوە بۆ ئیرادەی سیاسی دەوڵەتان و رێکخراو و دام و دەزگاکان، واتە بۆ ئەو کەسێتیانەی کردوونی بەبابەتی قسە لەسەر کردنی خۆی، لێکدانەوەشی بە شێوەیەکی بنەڕەتی کەوتۆتەبەر فشاری پەیوەندییەکانی هێزو بەرژەوەندیەکانی وڵاتان بە تایبەتیش وڵاتانی بەدەسەلاَت و زلهێزی جیهانی، واتە بەو جۆرەی بەرژەوەندییەکان ویستوویەتی لە پرەنسیپەکانی ئەم یاسایە و تۆمارەکانیان روانیوە و بەو جۆرە گوزارشتیان لێداوەتەوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بە کردەوە لەبری ئەوەی یاساکەو ئەو دام ودەزگاو چوارچێوە نێودەوڵەتیانەی لەسەر بناغەی ئەو دامەزراوان، توانای ئەوەیان هەبێت ئەو قەوارانە ئاراستەکەن و، بەو جۆرەی ئامانجەکانی یاساکەو بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵی دەولی دەیخوازێت هەر لەپاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیەوە بگرە تا هاوکاری نێو گەلان و رێگرتن لە هەڵگیرسانی جەنگ و چارەسەری ئاشتیانەی کێشەکان پەیوەندیەکان رێکخەن، کەچی بە پێچەوانەوە دەوڵەتە خاوەن نفوزەکان ئەویان وەك رووپۆش بەکارهێناوە بۆ شەرعیەتدان بەچەندین جۆری ستەم و چەوساندنەوە، مەترسیدارترین مەسەلەیەك کە لەیاسای گشتی نێودەوڵەتاندا بێ و راستەوخۆش مەترسی بووبێت بۆسەر کوردو دوچاری گرفتی دانپیانەنان و فەرامۆشکردنێکی جیهانی کرد بێت ئەو رۆڵە قەبەکراوو خولگەییە چارەنووسسازەیە کە ئەم یاسایە داویەتی بە کاراکتەرەی دەوڵەت، بەجۆرێ کە زۆربەی پانتایی ئەم یاسایەو ئەو نیزامەش داگیر بکات

که لەسایەی ئەودا سەری هەڵداوە، یاساکە وەك لە ناوەکەیدا روونە یاسای رێکخستنی پەیوەندی نێودەوڵەتان و ئەو هەلومەرجە نێودەوڵەتیەیە کە دەوڵەت وازیکارو کاراکتەری بنچینەیە تێیدا، واتە یاسای رێکخستنی پەیوەندی نێوان گەل و نەتەوەکان نییە هەروەك چۆن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بە پێچەوانەی ئەو ئیحایەی لە رواڵەتی ناوەکەیەوە هەست پێ دەکرێت، رێکخراوی دەوڵەتە یەکگرتوەکانە نەك نەتەوە یەکگرتوەکان، لێرەشەوە چەمکی نەتەوە لە پەیوەندییەکی قووڵدا دەبێت لەگەڵ دەوڵەتدا، واتە نەتەوە تەنها لەناو چوارچێوەی دەوڵەتی هاوچەرخدا مانا پەیدا دەکات و لەدەرەوەی دەوڵەتەوە شتێکمان نابێ ناوی نەتەوە بێت و مامەڵەی نەتەوەی لەگەڵدا بکرێت، دەوڵەت دەبێتە مەرجێکی گرنگی بوون یاخود نەبوونی نەتەوەیەك بەتایبەت لەرووی سیاسی و لە سایەی نەبوونی دیموکراسی و فرەییدا.

ئەم واقیعەش کە پەیوەندیەکانی هێز و ئەو یاسایەش کە تا رادەیەدی زۆر دەرهاوێشتەی ئەو پەیوەندیانە دروستیان کردووە، بە بەراورد لەگەڵ هەندێ توێژینەوەی تیۆری و فکری و فەلسەفی و زانستە سیاسیەکان مشتومڕەکان لەسەر چەمکی نەتەوە و سەروەری نەتەوەیی دەباتە بوارێکیترەوە، ئەم بەیەکەوە گرێدانە ئۆرگانیەی چەمکی نەتەوە و دەوڵەت وەك چوارچێویەکی مێژوویی بۆ مومارەسەکردنی دەسەڵات لەرێی میکانیزمە هاوچەرخەکانەوە، تارادەیەکی زۆر بەرجەستەکەری ئەزموونی ئەورووپی و رەوتی گەشەکردنی ناسیۆنالیزمە لەو بەشە لە جیهاندا، تراژیدیای کوردیش لێرەوە دەست پێدەکات یاخود قوڵتر دەبێتەوەو رەهەندی خوێناویتر و ئاڵۆزتر وەردەگرێت، چونکە لەگەڵ دارشتنەوەی نەخشەی سیاسی وجوگرافیی ئەو ناوچەی کوردی تێدایە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە کورد نەك هەر بێبەش دەبێت

و بێبەش دەکرێت لە دامەزراندنی قەوارەی تایبەت بە خۆی، بەڵکو بەشێوەیەکی یەکجار ئاڵۆزو دڵڕەقانەش وەك خاك و گەل دابەش دەکرێت کە دواتر و تا ئێستاش ئەم دابەشکردنە بەم شێوەیە رۆحی کوردی شپرزە دەکات و گەیشتن بەهەر چارەسەرێکیش بۆ کێشەی کورد یەکجاری قورس دەکات.

نەبوونی دەوڵەتیٚ بۆ کورد ئەم نەتەوە دەخاتە ئەویدو ئەو چوارچێوانەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی و سیستمە دەولیەکە دانیان پێدادەنیٚ و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، نەبوونی دەوڵەت لەو هەلومەرجەشدا کە کوردی تێکەوت هاوشێوە نەبوو بەدۆخی هەندیٚ هەرێم و ناوچەیتر کە راستەوخۆ لەلایەن هێزە کۆلۆنیالیستکانەوە یاخود ناراستەوخۆ لە رێی هەندیٚ فۆرم و میکانیزمیترەوە بەرێوەوەبران و بە (تکیف)کردنی یاساییانە بارودۆخیان لە چوارچێوەی (وصایە) و (انتداب)دا جێگایان بۆ کرابۆوە، کە ئەم (تکیف)ش بارێکی بۆدەخولقاندن لە روانگەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی و هێزە کاریگەرەکانی نیزامی دەولیەوە جۆریٚ لە قەوارەو دانپیانانیان بۆ مسۆگەر بێت و مەسەلەی داگیرکارییەکەش ببێتە مەسەلەیەکی کاتی و هەنگاو بەهەنگاو بەرەو دروستکردنی قەوارەی سەربەخۆی خۆیان بچنە پێش، مەبەستم لەم قسانەی پێشەوە ئەوەیە شێوازی دابەشکردنی کورد بەسەر قەوارە مۆدێرنەکاندا خستیانە هەل و مەرجێکی واوە نەتوانیٚ دەست بە هەندیٚ پرەنسیپ و سەرەتای نێودەوڵەتی و بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتوەکانەوە بگرێت بەمەبەستی بەرەوپێشبردنی خەباتی خۆی و رزگاربوونی، بەڵکو کورد لەم واقیعەدا دەبێتە بوونێکی بەیەکجاری فەرامۆشکراوی جیهانی نویٚ و کردنەدەرەوەی لە هەموو بازنەیەکی حیساب بۆکردن و ئاوڕلێدانەوەو شوێن بۆ دیاریکردن، بەرەچاوکردنی ئەو شوێنە بنەڕەتییەی دەوڵەت لە سیستم و یاسا

نێودەوڵەیتەکەدا داگیری دەکات و بەدابەشکردنی دووەمی کورد بەسەر ئەو دەوڵەتانەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم دروست بوون، دەتوانین مەسەلەی بێبەشی کورد و داننان بە کەسێتی یاسایی ئەوو لەبیربردنەوەی تارادەیەکی زۆر دەستنیشان بکەین و لێکبدەینەوە، چونکە کورد لەم نێوەندەدا دووچاری دژواری و قەیرانێکی قووڵی نوێنەرایەتی کردن دەبێت، واتە لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتی و دامەزراوە نێودەوڵەیەکانەوە دەوڵەتەکانی عێراق و ئێران و تورکیاو سوریاو ئەو وڵاتانەیتر کە کوردیان تێدا دەژی، دەبن بە تاکە نوێنەری شەرعی و دانپیانراوی کورد بەو سیفەتەی کورد وەکو کورد لە بازنەکە دەکرێتە دەرەوەو وەکو عێراقی و ئێرانی و تورکی و سوری مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بەم جۆرە هەموو مافێکی نوێنەرایەتی کردنی کورد لەسەرکردایەتی و شۆڕش و راپەڕین و حزبە کوردیەکان دەسەنرێتەوەو لەچوارچێوەی هەندێ مامەڵەی ژێر زەمینی بترازێ کەس ئامادە نابێ مامەڵەی لەگەڵ بکات، چونکە یاساو نیزامەکە مامەڵە لەگەڵ بوونە کلتوریەکان و نەتەوەو گروپە بەشەریە جیاوازەکان لەدەرەوەی دەوڵەتەوە ناکات، ئەو (استثناء)انەی لەم رووەشەوە هەبوون دیسانەوە کوردیان نەگرتۆتەوە بەم جۆرە تاقە چوارچێوەیەك کە مۆرکێکی جیهانی و نێودەوڵەتی هەبێ و کورد لەوێدا بتوانێ مانایەکی هەبێ و بابەت بێت بۆ قسەکردنی یاساو پرەنسیپەکانی یاسای مرۆڤ دۆستانەی نێودەوڵەتی (قانون الدولی الانسانی)یە لەگەڵ جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ، کە مۆرکێکی (نامولزم)ی هەیەو لەدەیان ساڵی رابردوودا بۆ زۆربەی جیهان تەنها وەك هەندێ ئامۆژگاری و سەرەتای ئەخلاقی ماوەتەوەو سەیرکراوە.

دیارە هەموو دەزانین ئەوەی پەیوەندی بەماف تاك و مرۆڤی کوردەوە هەیە و بابەتی جارنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤە لەسایەی (استبداد)ی ناوخۆ و تێکەڵاوبوونی ئەم پرسە بە بەرژەوەندی وایزکارە بنچینەییە نێودەوڵتیەکان چی بەسەرهاتوە و چ مانایەکی لەژیانی رۆژانەی ئەم مرۆڤەدا هەبووە؟ هەرچی پەیوەندی بە یاسای مرۆڤ دۆستانەی نێودەوڵەتیشەوە هەیە مرۆڤە لەگەڵ رێچکەو قسەکان و کۆنفراسیۆنی ژنێف کە بەگشتی لە پاراستنی ماف خەڵکی مەدەنی لەکاتی شەڕدا مافەکانی دیلی جەنگی و ئەرکی لایەنە شەڕکەرەکان لەکاتی روودانی جەنگداو هەندێ مەسەلەیتر بەرجەستە دەبێت دیسانەوە بۆ دەیان ساڵ کورد ناگرێتەوەو هەموو ئەو رێکەوتننامەو سەرەتایانە سەبارەت بە کوردو مرۆڤی کورد لە ژیانی ئەواندا یەکسان دەبێت بە سفر، چونکە جگە لەوەی سنورەکان لەوە تەلبەندکراوتربوون کە رێگە بدەن خاچی سوری نێودەوڵەتی و هەندێ دام و دەزگایتر بێنە ناو کایەکەوە، لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتیەوە ململانێی کورد لەگەڵ رژێمە زۆردارەکاندا مۆرکێکی نێودەوڵەتی وەرنەگرتوە، بەڵکو هەندێ جار بەشەڕی ناوخۆش دانەنراوەو بەگشتی حیسابی هەندێ هەڵگەرانەوەو یاخی بوون و لە یاسا دەرچوونی لەگەڵداکراوە، بۆیە دەبینین کاتێ بڕیاری ژمارە (١٥١٤)ی نەتەوە یەکگرتوەکان لە ساڵی (١٩٦٠)دا دەرچوو کە باسی پێدانی سەربەخۆیی بە وڵاتە کۆلۆنیالیکراوەکان و دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی دەکرد، کوردی نەدەگرتەوە، چونکە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دانی نەدەنا بەوەی کوردستان کۆلۆنیالیەکی نێودەوڵەتی بێت، لە روانگەی ئەوەوە (عێراق) و (سوریا) و هاوشێوەکانیان کۆلۆنیالی بوون و ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتووەو بەم جۆرەش پرسێ نەماوە لەم وڵاتانەدا ناوی پرسی داگیرکردن و داواکردنی سەربەخۆیی بێت بۆ گەل و خاکێکی دیاریکراو لە چوارچێوەی

ئەو قەوارانەدا، بەم واتایەش تورکیاو ئێرانیش کۆلۆنیالیزم نەبوون تاکۆلۆنیازیان هەبێت و بەشێك بوون لە کۆی ڕێکخستنەوە سیاسی و جوگرافیاکەی ناوچەکە.

هەروەها کاتێ لە ساڵی ١٩٦٧یشدا نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاریدا جەنگاوەرانی دیلی بزوتنەوە ڕزگاری بەخشە میللیەکان و ئەو خەباتکارانەی لە دژی دەسەلاتی کۆلۆنیالیزم و بێگانەکان و ڕژێمە ڕەگەزپەرستەکان دەجەنگن. بەگوێرەی بنەماکانی پەیماننامەی (ژنێف)ی تایبەت بە پاراستنی مافەکانی ئەسیری جەنگی لە جەنگە نێودەوڵەتیەکاندا مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت پێشمەرگەی کوردی نەدەگرتەوە ناوەرۆکی بەیاننامەی بنەماکانی پەیوەندی دۆستانەش کە لە ساڵی ١٩٧٠دا دیسان لەلایەن نەتەوەیەکگرتوەکانەوە دەرچوو و تایبەت بوو بە مافی دیاریکردنی چارەی خۆنووسینی گەلانی کۆلۆنیالی کراو دووبارە گەلی کوردستانی لێ بێبەش بوو، چونکە بە گوێرەی ئەو وەسفە کورد گەلێکی کۆلۆنیالی کراو نەبوو.

باسکردنی مافی چارەی خۆنووسین بەو جۆرەی لە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتوەکان و یاسای گشتی نێودەوڵەتی دا باسی لێوەکراوەو تەرح کراوە بۆ کورد هیچ مانایەکی نەبووە، کورد هەر چاوەڕوانیەکی لەو ڕووەوە لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی هەبوو بێت دووچاربوون بووە بە وەهم و دڵخۆشکردن بووە بە سەراب.

ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر سادەکە ئەویش ئەوەیە مافی چارەیخۆنووسین بەشێوەیەکی نیمچە ڕەها پەیوەست بووە بەو هەرێم و دەوڵەتانەی لەژێر دەستی کۆلۆنیالیستەکاندا بوون و لە ناوخۆیاندا لەشێوەی هەرێم و قەوارەی کۆلۆنیالیکراو دابەشیان کردوون و دەستیان بەسەردا گرتوون، مافی چارەی خۆنووسینی گەلان بووە بە

ناوەرۆکە سیاسیەکەی نەك نەتەوەکان بەمانا تیۆریە بان دەوڵەتیەکەوە، شەرعیەت وەرگرتنی بزوتنەوەیەکی میللیش دیسانەوە پەیوەست بووە بەخەبات دژ بە دەسەڵاتە کۆلۆنیالیستییەکان و ئەو هەرێمە داگیرکراوانەی کە دواتر دەبن بە دەوڵەت و دەچنە ڕیزی دەوڵەتانی ئەندام لە (UN)دا، هەر لەم سۆنگەشەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان بزوتنەوەو شۆڕش و ڕاپەڕینە کوردیەکان لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و نەتەوە یەکگرتوەکان و دام و دەزگاو کۆڕو ڕێکخراوەکانیانەوە، یاخود وڵاتانەوە بە بزوتنەوەی ڕزگاری میللی نەناسراون و بەو جۆرەش مامەڵەیان لەگەڵ نەکراوە، چونکە سەرەڕای ئەو مەرجانەی بۆ بزوتنەوەیەکی چەکداری لەو شێوە دیاریکراوە، خەبات دژی دەوڵەتە ستەمکارو زۆدارەکان لەناوخۆی ئەو قەوارانەی دوای کۆلۆنالیزم دادەمەزرێن بەخەباتێکی ڕەوای بزوتنەوەی ڕزگاری بەخشی گەلێك دانانرێن و لەقەڵەم نادرێت.

بەم چەشنە لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدا ژیاوە لەرووی یاساییەوە بە کۆلۆنیالیزم و دەسەڵاتێی بێگانەو ڕەگەزپەرست نەناسراون، خەباتی کورد بۆ ڕزگاری لە دەرەوەی هەر ڕەوایەتیەکی نێودەوڵەتیدا ماوەتەوە! کە دیوی دووەمی عەمەلی ئەم حاڵەش شەرعیەتدان بووە بە سەرکوت و چەوساندنەوەی ئێمە لەلایەن ئەم دەسەڵاتانەوە بەسیفەتی دەسەڵاتی شەرعی و ئەندامی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی.

تەنانەت گەر سەیری بڕیارەکەی ساڵی ١٩٦٠ی UN بکەین کە ماف دەدا بە گەلانی ژێر دەست و داگیرکراو بەوەی سەربەخۆبن و بەکارهێانی هێز لەو پێناوەدا بەکارێکی ڕەوا دەبینێ کۆتایی بڕیارەکەش باس لەو هەل و مەرجانە دەکات کە ئەگەر بۆ گەلانی دی دەستەبەریی بن بۆ ڕزگاربوون، سەبارەت بە کورد قوڵکردنەوەی زەمینەی زیاتر

ژێرچەپۆککردن و بێبەشکردنیەتی لە مافەکانی، ئەم بڕیارە دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆی وڵاتان و ڕێزگرتنی ماف دەسەڵاتی هەموو گەلێك و یەکێتی تەواوی خاکی دەوڵەت و... هتد دەکات بە بەشێ لەو ڕێ و شوێنانەی نامێڵێ هێزە گەورەکان وەك پێشوو یاری بە چارەنووسی میللەتان بکەن، بۆیە لێرەدا ناتوانین لەگەڵ هەندێ بیروڕای بەڕێز د. مارف عومەر بین، کە بوونی ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکان لە چوارچێوەی بایەخدانی UN بەباری کوردستان و عێراق دوای جەنگی کەنداوی دووەم بەوە دابنێین کە ئەوەی هەیە یارمەتی دانی گەلانی ناسەربەخۆیە بۆ ئەوەی بە خۆشگوزەرانی بکەن، پێم وایە بەگوێرەی ئەو پرەنسیپانەی تا ئێستاش زۆربەیان کاریان پێ دەکرێت، کورد تەنیا لەرێگەی دان لە دەرگای یاسای مرۆڤ دۆستانەی نێودەوڵەتی و ئەوەی بەدوایدا دێت لە دەست تێپەردانی مرۆڤ دۆستانە و پارێزگاریکردن لە مەدەنیەکان و کلتورو روبەروبونەوەی ژینۆسایدەوە لە رووی تیۆری و یاسایی رووتەوە بتوانێ رێگایەك بدۆزێتەوە بۆ بەرگری لەخۆکردن و دەستکەوتنی شوناسێ، کە ئەرك بخاتە سەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و گەرچی لەرووی ئەخلاقیشەوە بێت کێشەکەی (تبنی) بکات و هەوڵی چارەسەرکردنی بدات، کە ئەم کارەش دیارە بێکێشە نییەو ئیشکالیەتی خۆی هەیە.

ئێمە ئەم قسە کردنانەمان گەرچی مۆرکی قسەکردنێکی مێژوویی وەرگرت، بەڵام لە هەمان کاتدا قسەکردنە لەسەر ئێستاو بەربەستەکانی و ئایندەیەکی نزیك و دیاریش، چونکە هەمان ئەو سەرەتا و بونیادانەی هەتا دوێنێ بەو جۆرە ترسناکە شەرعیەتی بەرگریکردن لەخۆی لە کورد ستاندۆتەوە هەتا ئێستاش زۆربەیان وەکو خۆیان ماون لەگەڵ هەندێ گۆڕاندا، ئەگەر گرفتی گەورەی کورد لە ڕابردوودا نەبوونی دەوڵەتدا

بوویێت بۆ ئەوەی کەسێتی نێونەتەوەیی خۆی بەدەستبێنێ و دەوڵەتیش ئەو ڕۆڵە خولگەییەی هەبوویێت و گرفتەکەی کوردیش تا ئێستاش وەکو خۆی بێت، لەگەڵ هەموو ئەوقسانەی دەکرێت دەربارەی ئەوەی لەمە بەدوا بلۆکە ئابوری و سیاسی‌یە گەورەکان و هەندێ تەوژمی کلتوری و کۆمەلایەتی ببنە بابەتی یاسای نێودەوڵەتی و دەوری دەوڵەت پاشەکشە بکات، بەڵام تا ئێستا هێشتا زووە باسی پوکانەوەی دەوری دەوڵەت لە پەیوەندی بە پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و یاسای گشتی نێودەوڵەتییەوە بکەین، بۆیە دەبێت کورد گرەو لەسەر هەندێ مەسەلە نەکات کە ئاسان نییە گرەوی لەسەر بکرێت، بۆ نموونە گرەوکردن لەسەر ئەوەی بە بزوتنەوەیەکی رزگاریی میللی بناسرێ وەك ئەوەی لەهەندێ دەقی یاسای نێودەوڵەتاندا هاتووەو ئاماژەی پێکرا، چونکە ئەو مۆدیلە تارادیەکی زۆر لە جیهاندا بەسەرچووە، ماوەتەوە ئەوەی کورد خۆی توانای فەرزکردنی هەندێ ئەمری واقیعی هەبێت و هۆشیارانە تێکەڵاو بە هەندێ ستراتیژیەت ببێ کە چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێت پانتایی قسەکردن و ئامادەبوون و کاریگەری کورد زیاد بکات، هەروەها لەو وڵاتانەی تێیدایەتی بچێتە ناو ستراتیژیەتی خەباتێکی پەرلەمانیی سیاسی بەهێزەوەو زۆرترین سود لەو پەراوێزە دیموکراسیانە وەربگرێت کە لەمەودوا زیاتر دەبن بۆ ئەوەی لەم ڕێگایەوە لەلایەکەوە سوود لە چاودێری نەتەوە یەککگرتوەکان وەربگرێت و لەلایەکی‌ترەوە ببێتە لایەنێکی مامەڵە لەگەڵ کراو لەگەڵ هەندێ ناوەندی جیهانیدا کە بەرژەندییان لە گۆڕانەکاندایە.

هەروەها کارکردنی کورد لەسەر ڕێکخراوەکانی (N.G.O) بەگشتی و بەتایبەتیش ڕێکخراوەکانی پاراستنی مافی مرۆڤ و ڕێگا دۆزینەوە بۆ بەشداری فیعلی تیایاندا و شوێنپێ دۆزینەوە بۆ پەیداکردنی لایەنگرو دۆست بۆکێشەکەی لەو چوارچێوەدا یەکجار

گرنگە، لانیکەم ئەم کارە لە دوو رووە گرنگ دەبێت: رووی یەکەم بریتییە لەوەی ئەم رێکخراوانە ببنە کەناڵێ بۆ گەیاندنی دەنگی کورد بە نەتەوەیەکگرتوەکان و دام و دەزگاکانی، رووی دووەمیش لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە هەدێ جار (تبنی) کردنی کێشەیەك لەلایەن ئەم هێزە فشارە جیهانییە گەورەوە لەپێش گرتنی رێ و شوێنی دیاریکراوو دەستێوەردانی مرۆڤ دۆستانەی بەدوادا دێت، بەتایبەتیش لەوکاتانەی ئەمریکاو هەندێ هێزیتر هاورابن لەگەڵ ئەو ئاراساتەی بەم ئاقارەدا پەیدا دەبێت — واتە کورد کێشەی ئەوەی نەبێت کەسێتی نێودەوڵەتی هەیە یاخود نیەتی، چونکە ئەمە رێگایەکی ئاسان نییە بۆ کورد، بەڵکو لەبیری ئەوەدابێت لەپێناو ماف و ئازادی خۆیدا توانای قۆزتنەوەی ئەو دەرفەتانەی هەبێت کە گۆڕانە نێودەوڵەتی و هەرێمایەیکان دەیخولقێنن بۆ ئەوەی لە هێزێکی پەراوێزکەوتووەوە رزگاری ببێت و ببێ بەهێزێکی چالاك و لایەنێکی حیساب بۆکراوی گەمەکەو بتوانێ بچێتە ناو چوارچێوەی ئەو رووداوو دۆخ و هەل و مەرجانەوە کە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی مامەڵە لەگەڵ کۆی بارەکەدا دەکات و ئەمیش دەبێت بەبەشێ لەو بارە، هەروەها ئەوەندەی دەتوانێ لەهەندێ هەڵبژاردن و رێکەوتننامەو گفتوگۆدا داوای بەشداریکردن و چاودێرو نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان و هەندێ رێکخراوو دەوڵەت بکات بۆ ئەوەی رەهەندێکیتر بدات بەو مەسەلانە. لەگەڵ کارکردن بۆ بەدادگایی گەیاندنی ئەوانەی لێپرسراون لە ژینۆسایدکردنی کورد یاخود لەوە خوارتریش لەهەندێ تاوان و ستەمکاری، کە دەشێ بەتاوان دژی مرۆڤایەتی یاخود تاوانی جەنگ لەقەڵەم بدرێن، بەمەش دەتوانێ لەجیاتی ئەوەی بەدوای کەسێتیەکی یاسایی نێودەوڵەتیدا بگەڕێ کە تاکو ئێستاش لەزۆربەی کاتدا بوونی دەوڵەت دەخوازێت کار بکات لەسەر کەمکردنەوەی قورسایی و وەحشیگەری ئەو کەسێتییە یاساییە

نێودەوڵەتیانەی لە فۆرمی دەوڵەتدا ئەمیان پێ خوست کردووەو دووچاری جۆرەها مەینەتی و رۆژە رەشیان کردووە، دیارە لەرێی سوود وەرگرتنی زۆر لەو درزانەی کەوتۆتە دیوارەکانی ئەم دەزگایە لەگەڵ فشار خستنەسەری بۆ ئەوەی ناچاری کات بەدابەشکردنی دەسەڵات و داننان بەجیاوازی و وازهێنان لە خەونی کۆنترۆڵکردنی هەموو پانتاییەکانی ژیان و کۆمەڵگاو نکوڵی کردن لە شوناسە جیاوازەکانی ناوی.

واتە خەبات کردن بەم رووەدا سلبییە ئیجابیەدا بەو رووە کە ئەگەر ئەم دەوڵەتانە گەرچی بە رەسمی و لەرووی یاساییەوە هەر قسەکەرو نوێنەری ئێمەش بن دەبێت ئەو نوێنەرایەتی و قسەکردنە وەك جاران (ئەمری واقع)ێك و نوێنەرایەتی زیندانیەك نەبێ کە (حجر)ی لەسر دانراوەو ئەهلیەتی ناتەواوە، بەڵکو ببێتە نوێنەرایەتیکردنێکی سروشتی و راستەقینە بەوەی لەدەستوری ئەم دەوڵەتانەدا شەراکەتی کورد نەتەوەکانیتر لە نیشتمان و بەرێوەبردنی دەسەڵات و ماف و ئازادییە بنچینەییەکانی مرۆڤ و گروپە مرۆڤایەیتیەجۆراوجۆرەکان بێنە سەلماندن و کارپێکردن، بەشداری فعلی و راستەقینەی کورد لەو دەوڵەتانەی ئێستا هەن و بەشداری کردن لە نوێنەرایەتی کردن لە ناوەوەو دەرەوە، ناراستەوخۆ کورد دەکات بەبەشێکی گرنگ لەو کەسێتییەی کە هەیەو دانپیانراوە، ئەمەش جۆرێکە لەبەدەستهێنانی کەسێتی نێودەوڵەتی بەڵام لە ئاستێکیتر و لەچوارچێوەی فۆرمێکیتردا.

بوونی کەسێتیەکی ناوخۆیی لە فۆرمی فیدرالیەتدا لەناو ئەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدا دەژی بۆ ئەوەی ئەم واقیعە بەعەمەلی ببێتە هێمای ئەو دابەشکردنی دەسەڵات و شەراکەتەی باسمان کرد، مەسەلەیەکی زۆرگرنگە، بۆ ئەوەی کەسێتی نێودەوڵەتی ئەم

دەوڵەتانە مانایەکیتر وەربگرێت و کورد ببێ بە بەشێکی بونیادی پێکهاتەو دامەزراوەکانی، جگە لەمە بیرکردەوە لەداواکردنی ریفراندۆم لە پارچەیەکی دیاریکراودا لەکاتی قوڵبوونەوەی هەندێ قەیران و بارودۆخێکی دیاریکراودا، هەروەها دروستکردنی هەندێ دام و دەزگا لەسەر ئاستی هەموو پارچەکاندا لەگەڵ بوونی ناوەند گەلێ بۆ لێکۆڵینەوەی ستراتیژی بۆ گرنگی دان بە بارودۆخی کورد و خۆرهەڵاتی ناوەراست و چەندین میکانیزم و رێگایتر، دەشێ لەم رووە خزمەت بەکورد بگەیەنێت و ببن بەبەشێ لە ستراتیژیەتێکی دارێژراوی هەمەلایەنەی کوردی؟!

## بزوتنەوەی ریفراندۆم و سروشتی سەرەتاکانی

رەنگە زۆر پێویستمان بەبەڵگە هێنانەوە نەبێ لەسەر ئاستی جیهان و ئەزموونی گەلان و دوێنێی خۆشماندا بۆ سەلماندنی ئەو راستییەی کە زۆربەی پرۆژەو جولانەوەکان سەرەتا بەشێوەیەکی خاکی و سادە دەست پێدەکەن و دواتر پەرە دەستێنن و دەگەشێنەوەو پانتاییەکی گەورە لە ژیانی سیاسی و رۆحی یاخود بوارێکی دیاریکراوی فکری و کۆمەڵایەتی داگیر دەکەن.

رەنگە سەرەتا خەڵکانێ بەپێکەنینەوە لەو خەڵکانە رابمێنێ کە لەدۆخە دژوارەکان یاخود هەل و مەرجە وەستاوو ساردو سڕەکاندا دەیانەوێ بەردێ فڕێ بدەنە گۆمە مەنگەکەوەو یەکەم پرسیار لەسەر پاك و خاوێنی ساختەی دابنێن و پێیان وابێ ئەم جۆرە هەنگاوانە جۆرێك لەسەر کێشی تێدایە یاخود لانیکەم لەبەر نەبونی هەلومەرجی پێویست بۆ گەشەکردن و سەرپێی خۆکەوتن، دەستێکی دەرەکی لەپشتە؟! لە

سەرەتای ئیسلامدا هاویەشی پەیداکەرەکان و نەیارانی ئاینە تازەکە بە باوەڕدارەکانیان دەوت (غر هؤلاء دینهم) ئەمانە ئاینەکەیان هەڕا لێ کردون و توانای لێکدانەوەی دروستی لێ زەوت کردون، بەم قسانە مەبەستیان بوو بڵێن دەنا ماقوڵ نیە پێیان وابێ بەم چەند کەسەو بەم رەش و ڕووتی و بێدەرەتانییە هیچ ئایندەیەکی روناك چاوەڕێیانە، لەسەرەتاشدا هەندێ رۆشنبیر لەدژی بزوتنەوەی ریفراندۆم قسەیان دەکردو پێیانوابوو کە جگە لە گەمەیەکی کاتی دوو هێزە سیاسیەکەی کوردستان بۆ ئامانجێکی کاتی هیچیتر نیە، بەڵکو هەندێ لەوان دەیانوت کەگەمەی هێزێکە بۆ هاوسەنگی و پارسەنگی پەیداکردنەوە لە بەرامبەر هەندێ پێگەو کارتی بەهێزی سیاسی هێزەکەیتر، بەڵام لانیکەم ئێستا بەشێك لەوانە ئەم قەناعەتیان گۆڕیوەو لای ئەندامانی لیژنەکانی ریفراندۆم نایشارنەوە کە بیرۆکەکەیان بەدڵەو پشتیوانی لێ دەکەن و وازیان لە دیدگاکانی سەرەتایان هێناوە، مەبەستمانە بڵێین ڕاستە بزوتنەوەی ریفراندۆم سەرەتا بە دەستپێشخەری و هاتنە مەیدانی چەند کەسێکی دیاریکراو سەری هەڵداو ئەوانەی لە لیژنەکاندا کار دەکەن چەند کەسانێکی دیاری کراون و هێشتا خەڵکانێك هەن لەناوەندە سیاسی و فکرییەکە خەریکە گومانیان لەجدیەتی هەیە، بەڵام سەرەتاکان هەروابوون.

زۆر کەسیش لەمێژوودا ستەمی لێکراوە یاخود رۆڵی نەنرخێنراوە یان زیاد لەوەش بە ناپاکیش لەقەڵەم دراوە، بەڵام دواتر راستیەکان وەدەرکەوتوون و هەلومەرج و پێوەر و لێکدانەوەکان گۆڕانیان بەسەرداهاتووە و دوای دەیان ساڵ (اعتبار)یان بۆ گێڕدراوەتەوە. چاوەڕوانی کردن لە منداڵێ یەکسەر لەگەڵ لە دایکبوونیدا قسە بکات، بەڵکو لەوەش زیاتر توانای بیرکردنەوەیەکی باڵای هەبێ و گەوهەری لە زمانی بڕژێنێتە خوارو بەلۆژیکی بەڵگەهێنانەوەی زانستی بێتە ئاخاوتن رەنگە تەنها لەچوارچێوەی

بیرکردنەوەی ئاینی و لەدایکبوونی زاتێکی وەکو (عیسی) پێغەمبەردا (د.خ) دەستەبەر بێت، دەنا پرۆسەو جولانەوە کۆمەلایەتی و سیاسیە گرێدراوەکان بەھەناوو خەونەکانی کۆمەلگاوە سەرەتا ھەر بەناتەواوی دەست پێ دەکەن، ئەوەی لە نێوان کات و شوێن و ھەولی بزوتنەوەکان لەم ڕوەوە جیاوازە تەنھا ئاستی ناتەواوی و کەم و کورتیەکانە.

دواتریش ئەگەری ئەوە لە ئارادایە لە دوای ئەم قۆناغەش بە لاڕێدا ببرێت لە ئامانجە بنەڕەتیەکانی دوور بخرێتەوە بەلام ئەوە ھەر خودی خەباتکردنە لەناو جەرگەی ئەو جولانەوەدا کە بارودۆخەکان بەرەو راستبونەوە و ئاراستەکان بەرەو ئاقاری ئامانجەکان ڕێنومایی دەکات.

بزوتنەوەی راپرسی (ریفراندۆم)یش ھەر لەو چوارچێوەیەدا سەیر دەکرێت، گرنگ سەرەتایەك دەستی پێکردوە، کۆمەلێ چالاکیش ئەنجامدراوە، تۆوی خەونێکی گەورەش وەشێنراوە، رەنگە ڕۆژێ بێت ئەوانەی ئێستا لەناوەوە کۆلەکەیان ھەلگرتوە لەبیربچنەوە یاخود ئەوپەڕی یادێکیان بکرێتەوە بەلام ھەنگاوو بیرۆکەکە لەدوو توێی لاپەڕەکانی مێژووی ئەم گەلەدا دەمێنێتەوە، لەژێر سایەی روناکی خۆردا بزر نابێ، کێ دەلێ ھەر ئەم درەختە بێنازەی ناوخاکی نیشتمان نابێ بەنزرگەی ئەویندارانی سەربەخۆیی و سەرفرازی و لێرەوە مەشخەلانەکە ناگەیەنرێ بەکون و کەلەبەرەکانی ولات و زێدێ کە دەیان سالە چاوەڕێی ساڕێژبوونی زامی ئەو خەنجەرە دەکات کۆلۆنیالیزم و ستەمکاری ناوخۆیی لە جەستەیدا چاندوویانە بۆ ئەوەی مەحکومی بکەن بەھەلنەستانەوەیەکی تاھەتایی.

چالاكی ئەمجارەی بزوتنەوەی راپرسی (ریفراندۆم) لەكوردستانیش ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر شتێ بەڵگەیە لەسەر باوەڕبوون بەكەڵەبوونی هەنگاوەكان و خۆ بەدەستەوەنەدان و لەئاسۆی دورەوە بینینی مژدەكان و روانینیە دوارۆژو بەگەورە سەیركردنی رۆڵ و ئیرادەو خەونی گەل، گەرچی لەم قۆناغەدا باتەنها ئاماژەیەكی مەعنەوی و ئەخلاقیشی دیار بێت.[■]

## راپرسی (ریفراندۆم) لەنێوان سەرەتا و چوارچێوەكانی كاركردندا

گرنگە بزاڤ و جوڵە و چوارچێوەكانی كاركردن پێش هەموو شتێ لەئاست سەرەتاكاندا هەڵبسەنگێنرێت و داوەریان دەربارە بكرێت و سەرەنجام هەڵوێستیان لە بارەوە بگیرێت، بزوتنەوەی راپرسی (ریفراندۆم)یش لە كوردستان هەمان رێسا دەیگرێتەوە، گرنگە پێش هەرشتێ لەخۆمان بپرسین ریفراندۆم چییە؟ چ پەیوەندییەكی بەمافی چارەی خۆنوسینەوە هەیە؟ تاچەند دەربڕی قووڵایی خەم و خەونەكانە ئێمەیە؟ ئایا بڕوامان وایە ئەم چەمكە لەكاتی وردبونەوەیدا بۆ جوڵە و چوارچێوە و چارەسەر و بەشێ لە رۆشنبیری سیاسی بتوانێ گوڕێ بە كاروانی تێكۆشانی خەڵك بدات لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەكان و قوڵكردنەوەیان؟.

ئەوەی پاڵی بەهەندێكمانەوە ناوە لەناو بزوتنەوەی راپرسی (ریفراندۆم) لەكوردستان كاربكەین بەپلەی یەكەم ئەم خاڵەیە، دەنا هەموو وشیارین بەرێگرەكانی بەردەم و ناكارایی بزوتنەوەكە لەهەندێ وێستگەكانی كاركردنیدا لەگەڵ ناتەوایی و كەم و

---

[■] بڵاوكراوەی ریفراندۆم ژمارە(٤) ٢٠٠٥/٠١/٢٨

کورییەکانی کە ئەگەر ئەوانە نەبوونایە دەتوانرا لەئاستێکی بەربڵاوتردا بزوتنەوە کە تێکەڵ بەبیرکردنەوەی مرۆڤی ئاسایی کوردو ناوەندە رۆشنبیریەکەو توێژەکانی جەماوەر بکرابا.

ریفراندۆم ئەگەر ئاماژە بێت بەمیکانیزم و شێوازێکی مومارەسەی دیموکراسی و مافی چارەنووس وەئەگەر گەڕانەوە بێ بۆ هاووڵاتی و تێپەڕاندنی فۆرمی کارکردنی پەرلەمانی و مۆدێلی نوێنەرایەتی بێ لە دیموکراسیەتی ناراستەوخۆدا.

هەروەها گەر تێپەراندنی بڕیارە سەرووەکان بێت و ناچارکردنی دەسەلات بێت رەوایەتی خۆی لە کۆمەڵگاو هاووڵاتیانەوە وەربگرێت.

ئەوکاتە گومانی تێدا نییە دەبێ بەو ناونیشان و سەرەتا و ئامانجەی شایستەی ئەوە بێت مرۆڤ بانگەشەی بۆ بکات و هەوڵی بۆ بدات و لە پێناویدا تێبکۆشێت.

تەنانەت گەر ئەم هەوڵانە لەبەر هۆکار گەلێکی دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی ئەم نەگەیشتە ئەنجام هێشتا گرنگی ئەو خەباتە هەردەمێنێت، ناونیشانی بزوتنەوەی ریفراندۆمیش لە بنەڕەتدا هەر ئەمە بوو گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگای کوردستان، بۆ هاووڵاتی کوردستان تا پرسیان پێبکرێت، داخوا دەیانەوێت لەپاڵ ئەوەی دی عەرەبیدا لەعێراقدا بمێننەوە یاخود چوارچێوەو فۆرمی نوێ لەوانەش سەرەبەخۆیی هەڵدەبژێرن بۆ رێکخستنی سیاسی و پەیوەندی بەگەل و نەتەوەکانی دەوروبەرەوە، ریفراندۆم هاوارێکی میللییە بالە ئاستێکی دیاریکراویشدا بێت بۆ دەرهێنانی سیاسەتی کوردی لەو بێئاسۆییەی تێی کەوتووەو لە سۆنگەی پەراوێزخستنی جەماوەر و دیاری کردنی چارەنووسی خەڵك لەژوورە داخراوەکانداو، پرس نەکردن بەخەڵك دەربارەی

هەستیارترین پرسە سیاسی و کۆمەڵگاییەکان و دەرخستنی ناتەواوییەکانی ئەم سیاسەتە، ئەم نیوەرۆکەی بزوتنەوەی ریفراندۆم لەدیوەکەیتریدا رەخنە گرتنە لە سیاسەتی رەسمی کوردی و لە شێوەی کارکردنی حزبە سیاسیەکانی.

ئاماژەیە بەو دابڕان و بۆشاییەی لە نێوان شەقامی کوردی و هێڵە رەنگڕێژکراوەکانی ئەو سیاسەتانەدا هەیە، کە لەم قۆناغەدا شوێن و پێگەی سیاسی و دەسەڵاتەکەیان وای لێکردوون بەناوی کوردەوە نەك هەرقسە دەکەن بەڵکو سازشیش دەکەن و رەزامەندی لەسەر جۆری چارەسەرو چوارچێوەکانیش دەردەبڕن، ئەمەش ئەوە دەهێنێ کە رۆشنبیری چالاك و خەمخۆر بەشداری تێدا بکات، رەنگە لێرەدا چەندین پرسیاری رەواو وروژێنراو سەر هەڵبدەن وەك ئەوەی هەندێ لەدیدێکی ئەکادیمیانە و سیاسییەوە ئەوە بوروژێنن کە داخۆ هەر لەسەرەتاوە شتێ هەیە بەناوی هاووڵاتی کوردستانی و کۆمەڵگای کوردیەوە تاکو ئێمە بڕیاری چالاککردنی بدەین و بمانەوێت لەرووی سیاسییەوە دیاری کراوبێت؟

من خۆم یەکێکم لەوانەی ئەم تێرامان و پرسیارە بەهەند وەردەگرم، بەڵام لەولاوە دەکرێت هەرئەوە خۆی بکرێت بەپرسێکیتری گرنگ و کاری لەسەر بکرێت و بەوەش پەردە لەسەر ڕوویەکیتری سیاسەتێکی ناسیاسیانە لەماوەی چەند ساڵی رابردوودا لەکوردستاندا هەڵبماڵرێت.

هەروەها دەشێ بووترێت ئەمجۆرە چوارچێوەیەش فێڵێکیتری گەمەی حزبی و بەتایبەتیش حیزبە گەورەکانە بۆ بەکارهێنانی وزەو تواناى رۆشنبیران و خەڵکانی چالاك لەوکاتانەی بڵانسی هێزەکان و پێداویستیی جەنگە حزبیەکانیان دەیخوازێت؟

پارتی دیموکراتیی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەودیو پەردەوە سەرێکی پەتی گەمەکەیان بەدەستەوەیەو مەسەلەکەش لەوە تێناپەرێت، دیارە ئەمە شتێکی هێندە سەرسوڕهێنەر نییە لەکوردستاندا چونکە هەروەك کاتی خۆی نوکتەیەك لەسەر ئینگلیزو سیاسەتەکەیان لەدنیادا هەبوو کە دەڵێ: گەردوو ماسی لە دەریادا شەڕیان ببێ لەژێرەوە دەستێکی ئینگلیزەکانی تێدایە لەکوردستنیشدا مەسەلەکە هەربەو جۆرەیە.

ئێمە هەموو دەزانین ئەوکۆمەڵ و رێکخراو و چوارچێوانەی کەبەدوور لەچاوو هەژموونی ئەوان لەسەرەتاوەدروست دەبن دوایی هەوڵ دەدەن کۆنترۆڵی بکەن و دەستی بەسەردا بگرن.

لێرەدا رەنگە وەستان لەسەر رۆخەکانی ئەم واقیعە هیچ کاریگەرییەکی وای لەسەر ئاراستەدان بەرووداوەکان نەبێت و پاساوی دانیشتن و بەشداری نەکردن نەبێت، چونکە تەنانەت گەر پێشمان وابێت چوارچێوەیەکی دیاری کراوی کاروجوڵەو سازدانی خەڵك بەدەستپێشخەری و هەڵکردنی چرای سەوزی ئەم هێز یاخود ئەو هێز هاتۆتە بوون ئەمە هەندێ ئەرکمان لەکۆڵناکاتەوە چونکە دروشمە هەڵبڕاوەکان لەوانەش پرسی راپرسی و گەڕانەوە بۆجەماوەر لەدیاری کردنی چارەنووسی خۆیدا خۆیان لەخۆیاندا ئەوە دەخوازن وزەی کارکردنمانیان پێ ببەخشین، هەرچی پەیوەندی بە فۆرم و شێوازو چوارچێوەکانیشەوە هەیە دەکرێ بێنە ناو جەرگەی ئەو چوارچێوانەی کەهەندێکمان پێمان وایە بێخەوش و کارانین و لەوێوە دەنگ هەڵبڕین ومسداقیەتی کۆمەڵی خەڵکیش بخەینە ژێر پرسیارەوەو داوای کارایی و راستگۆییان لێ بکەین یاخود گەر لەمەش نائومێدبووین خۆمان لەدەرەوەی ئەودا شێوازو فۆرمیتری تێکۆشان بخەینە روو.

## شوێن و بایەخی ریفراندۆم، لەژیانی سیاسی و ئێستا و ئایندەی کوردستاندا*

رەنگە ئاسایی بێت هەموو دەرکەوت و دیاردەیەکی تازەی ناو ژیانی سیاسی و فەرهەنگی بەگشتی کاردانەوە و تێگەیشتنی جۆراوجۆر لەگەڵ خۆی بێنێ و چەندین پرسیاریش بوروژێنێ.

بزوتنەوەی راپرسی (ریفراندۆم)ی کوردستانیش لەم حاڵەتە بەدەر نییە. چونکە هێنانە گۆڕیی پرسی راپرسی لەچوارچێوەی کارێکی جەماوەری یاخود نیمچە جەماوەریشدا بێت بەگۆڕانێکی نوێی ناوژیانی سیاسی کوردستان لەقەڵەم دەدرێت.

پێش ئەم ساتە ئێمە گوێ بیستی مافی چارەی خۆنووسین بووین کەئەم روناکبیر یاخود ئەو هێزی سیاسی لەقۆناغێکی مێژوویی دیاری کراودا وەك دروشمێك بەشەرمنیەوە بەرزی کردۆتەوە چونکە وەك ئاگادارین تاماوەیەکی چەندان دروشمی ناوەندی شۆڕش و بزوتنەوەی سیاسی لەکوردستاندا بریتی بوو لەدیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لەدوای راگەیاندنی ئۆتۆنۆمیە بێناوەرۆکەکەی بەعس لەساڵی (١٩٧٤)دا و شێوانی ناوەرۆکی ئەم چەمکە هەندێ جار گوێ بیستی زیادکردنی ووشەی ڕاستەقینە دەبووین کە بەدوای وشە یاخود زاراوەی ئۆتۆنۆمییەوە دەلکێنرا بەمەش داخوازی سەرەکی کوردان لە خەبات و بەرخودانیاندا دەبوو بە دیموکراسی ئۆتۆنۆمی بۆ عێراق و ڕاستەقینە بۆ کوردستان، هەڵبەت ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرین کە باگراوندی

* بڵاوکراوەی ریفراندۆم ژمارە (١٢) ٢/١٠/٢٠٠٤

زۆریّ له هێز و لایەنە سیاسیەکانی ئێمه چەپ بووه، ئەوسا باشتر تیّدەگەین که دیدیان بۆ دیموکراسی لەچ فۆرمێکدا خۆی نواندووه و ئۆتۆنۆمیش له بەرگیراوەی چ ئەزموونێکی نێونەتەوەیی بووه وەك مۆدیلیّ بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەو کێشەی نەتەوایەتی، هەڵبەت لەدوای نیوەی هەشتاکان‌و لەژێر گۆڕانە دراماتیکتەکانی بلۆکی ڕۆژهەڵات‌و هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت دەبینین لای هەندیّ هێز باس له مافی چارەی خۆنوسین دەکریّ، بەڵام هەڵوێستە سیاسیە ئاشکراکراوەکانی دواترو گرتنەبەری شێوازی ئاراستە کردنی جەماوەرو پێکهاتە بنەڕەتیەکانی گوتاری سیاسی ئەو لایەنانەو سەرجەم باڵەکانی جولانەوە سیاسی‌یە چەکداریەکە ئەوەی دەردەبڕی کە هەڵبژاردنی ئەو دروشمە قەناعەتێکی قوڵی له پشتەوە نیه، لانی‌کەم ئەو باوەڕەی له دواوە نیه کە پێداگرتن لەسەر دروشم و خواستێکی لەو جۆرە له چوارچێوەی هاوسەنگی هێزەکان‌و پێدراوە سیاسیەکاندا کارێکە گونجاوە.

دوای ڕاپەڕین و ئازادبوونی بەشێکی گرنگ لەم بەشەی کوردستان و نوشست هێنانی بەعس له درێژەدان بە سەرکوتکردنی ڕاستەخۆ، لەگەڵ ئەو هەموو ئاڵۆگۆڕە گەورانەشدا کە ڕوویان دابوو وەچاوەڕوان دەکرا ڕووبدەن، دروشمی ناوەندی بزوتنەوە سیاسیە کوردیەکە نەیتوانی جەخت لەسەر دیاریکردنی چارەنووس بکاتەوە، بەڵکو سەقفی باڵای جولانەوە سیاسیەکە له گەیشتن بە فۆرمی فیدرالیزم تێنەپەڕی، تەنانەت لەم ئاستەشدا بە گوێرەی پێویست ڕادیکاڵ نەبوون‌و ناوەڕۆك‌و ڕەهەندەکان‌و تێگەیشتنی کوردیان بۆئەو مۆدێلە له فیدرالیزم ڕون نەکردەوە کە کورد داوای دەکات‌و دەخوازێت، لەو نێوەندەدا بە لانی‌کەمی مافەکانی خۆی شاد بێت بەڵکو بڕیاری فیدڕالیەت کە له پەرلەمانی کوردستانەوە دەرچوو وەك بڕیارێکی بیّ نیازی دواخراوو بەستوو مایەوە

لەچاوەڕوانی ڕۆژگارێکدا کەبەیەك جاری بەعس دێتەسەر کەڵکەڵەی گوێ گرتن لە کورد و لانیکەم ئەوەی کورد دەیەوێت جێ بەجێی دەکات!

بڕیاری فیدرالیزمی پەرلەمان کە دواتر بووە دروشمی نێوەندیو ناوکۆی زۆربەی هەرە زۆری هێزو لایەنە سیاسیە کوردیەکانی ئەم بەشە لە کوردستان، گەرچی خۆی لە خۆیدا ئاماژەبوو بە پەرەسەندنیو بەرەو پێشچوونو بەرزبوونەوەی کێرڤی داخوازیەکانی گەلی کوردستانو جوڵانەوە سیاسیەکەی، بەڵام لەهەمان کاتدا بەڕای زۆرێ لە ڕوناکبیرانو چالاکانی کورد زۆر نزمتر بوو لەوەی دەبوو کورد داوای بکردایەو پێی لەسەر دابگرتایە.

بەتایبەتیش کە دیاری کردنی نێوەرۆکی سیستەمە فیدراڵیە پێشنیارکراوەکە بەجێ هێڵرابوو بۆ ڕەحمەتی ئاڵۆ گۆڕو پێشهاتەکانو هاوسەنگی هێزەکانو گەمە سیاسیەکانی ئایندە، ئەمە جگە لەوەی لە مەسەلەیەکی واگرنگدا ناکرێ نوێنەرانی خەڵك لای خۆیانەوە و بێگەڕانەوە بۆ ڕای هاوڵاتیان و شەقام خۆبەخۆ بڕیاردەن، هەروەك دەشزانین دواتر جەولەکانی شەڕی ناوخۆو زۆرێ لەو پردەو ئاستانەی هاوکاریو کاری بەکۆمەڵی کوردستانیان تێك شکاند کە پێشتر بەلەرزۆکیش بێت لە ئارادا بوونو سەرئەنجام ئیدارەو ئیرادەی کورد دووچاری دابەشبوون هاتوو ئەمەش کاری کردە سەر تێکڕای ئاراستەکانی کاری نیشتمانیو شێوازەکانی کاری سیاسی و مەدەنی.

دوای ڕووخانی ڕژێم دەرفەتێکیتر هاتە پێش بزوتنەوەی سیاسی گەلی کوردستان گەل لەژێر کارگەری جۆرێ ئاراستە کردنو پڕوپاگەندەی هێزە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان لەوەهمی چەندین چاوەڕوانیدا دەژی، بەڵام تێپەڕینی ڕۆژەکان وردە وردە

ئاستی چاوەڕوانیەکانی دادەبەزاندو نیگەرانیشی دەخولقاند ئەم نیگەرانیە بۆ بەشێ لە ناوەندەکە بوو بە پاڵنەری بیرکردنەوە لە چوار چێوەو شێوازێکی نویی خەبات ئەویش ڕیفراندۆم بوو، بەم جۆرە گەر لەوەو پێش هەندێ جار باسی مافی چارەنوس کرابێت بەتایبەتیش لەژێر کارتێکردنی ئەدەبیاتی (لینینیزم)دا، ئەوا لەدوای سەرهەڵدانی ئەم بزوتنەوەوە شێوازێکیتری بەدیهێنانی مافی چارەنووس کە ئەویش ئەنجامدانی ڕاپرسی گشتیو جەماوەرییە دەبێ بەبەشێ لە باسو خواسەکانی ناوخەڵكو گەر لە ئاستێکی دیاری کراویشدا بێت تێکەڵ بە بیرکردنەوەی هاوڵاتی ئاساییو ئەدەبیاتی سیاسی کوردی دەبێت بەتایبەتیش دوای ئەوەی ئەو ئەدەبیاتە شەڕی ناوخۆو قوڵبوونەوەی گیانی دەمارگرژیو حزبیو نزمی ئاستی هاوخەباتی بۆئاستێکی دڵناخۆشکەر نزمی کردبۆوە بەمەش بۆ یەکەم جار لە مێژووی هاوچەرخی کوردا، مەسەلەی ئەوەی کە گەل هاوڵاتی خەڵك دەبێ پرسی پێ بکرێتو مافی خۆیەتی دەربارەی چارەنوسی خۆی قسەی هەبێت بازنەی نوخبە تێکەدەشکێنیو دەچێتە نێوماڵی مرۆڤی ئاساییو گەڕەکی شارەکانو شارۆچکەو گوندەکانو دەرەوەو ناوەوەی وڵاتیش بە جۆرێ لە جۆرەکان بەیەکەوە گرێ دەداتەوە.

خەڵك بەهەستێکی پاكو حەسرەتێکی پڕ لە ئاواتی بەدینەهاتوو لە ساتی وەقسەهاتنی ناخو لاوازبوونی شێوازەکانی چاودێری و سەرکوتی سیاسی لەڕێی ئیمزاکانی خۆیانەوە و بەو زمانەی دەتوانن و بەو شێوازە لانیکەم گوزارشتیان لە ئیرادەی بێڕتوش و قەناعەتە شارەکانی خۆیان دایەوەو داوای ئەوەیان کرد کە بابێن پرسمان پێ بکەنو بۆ ئەوەی بزانن ئێمە چی دەڵێینو ئێمە وەکو گەل مافی خۆمانە لە

دەرەوەی ویستو ئیرادەی خۆمانەوە فۆرمو چارەسەرو شێوازێ لە بەڕێوەبردنو سیستەمی سیاسیمان بەسەردا نەسەپێندرێ.

هەڵبەت گەر چاوەڕوانبین ئەم هەوڵە جەماوەرییە کە دەبێت لە ماوەیەکی کورتی قیاسیدا بگات بە ئامانجەکانی خۆی، لە ڕووی سیاسیەوە بەهەڵەدا چووینە چونکە ئامانجی ستراتیژیو مەزنی بەو جۆرە لەگەڵ (تبنی)نەکردنی لەلایەن جوڵانەوە سیاسیە کوردیەکەوە نەفەس درێژیو بەدواداچوونو بەزیندووی هێشتنەوەی پرسەکەی دەوێت، پێش دادوەری کردنو حکومدان بەسەر ئەم هەوڵەدا لەبەر ڕۆشنایی هەندێ هەنگاوی سەرەتایی بەرای من ڕەنگە کارێك بێت خزمەت بەجۆرە هەنگاوانە نەکات، هەڵبەتە ئەمە بەهیچ جۆرێ مانای بێدەنگ بوون نیە لە ئاست کەموکورتیەکانی بزوتنەوە جەماوەریەکە لەو سۆنگەوە کە ڕەخنە بە ئاراستە کردنی کەموکورتی بزوتنەوەکە لە ڕووی تاکتیكو شێوازی کارکردنو هەنگاوو گوتارەوە دەڕژێتە ڕووباری بەرەو پێگەیشتووتر بردنی زیاتری ئەو، بەڵام هێرش کردنە سەر خودی ئیشە جەماوەریەکە بە بیانووەی هێز و لایەنا دەخوازن بە سودی بەرتەسکی خۆیان سودی لێ وەربگرن، دەستبڕینی جەماوەرە بەکارێك زۆر پاساوی نیە چونکە ئێمە هەموو دەزانین لەچ واقیعێکدا دەژین، دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کوردستانی لەچ دۆخێکدان و کاری جەماوەری لە چوار چێوە ڕەسمیە سیاسیەکان لەبەردەم چ هەڵومەرجێکدان، گرنگ ئەوەیە هەموولادەرکی قوڵی ئەوە بکەین کە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریو هۆشیاری ڕاپرسیو ریفراندۆم خوازانە بۆ ئێستاو دوا ڕۆژی ئەم گەلو وڵاتە مەسەلەیەکی گرنگەو بەزیندووی هێشتنەوەی پرسی ڕاپرسی و بەرگری لێکردنی لەبارودۆخە جیاوازەکاندا ئەرکێکی نیشتمانیو ڕوناکبیریو سیاسی پڕ بایەخە.

چونکە دیوی دووەمی ئەم هۆشیاریە هەوڵدانە بۆ دەرهێنانی تاك و كۆمەڵگا لە بێباكی و كەمتەرخەمی و سلبیەت و بەستنەوەی بەشتی لە كەرامەتی ئینسانی و نیشتمانی خۆیەتی بە ئاستی هۆشیار بوونی بە مەسەلە چارەنوس سازدەكات..

**جەوهەری کێشەی کەرکوک، دواندنێکی عەقڵی ئەمریکی**

راستە کەرکوك پارێزگایەکە لەپارێزگاکانی ئەوەی ناو دەبرێت بەقەوارەی عێراقی، بەڵام لەڕاستی دا کەرکوکی ئەمڕۆ ئاماژەیە بەمەسەلەیەکی ئاڵۆزتر و مێژوویی‌تر، مەسەلەیەك کە بەکێشەی کورد دەناسرێتەوە، ئەو کێشەی هەر لەساتەوەختی دروستبونی دەوڵەتی عێراقەوە ـ وەك بەشێ لە ناهارمۆنیە ناوخۆیەکانی ئەم قەوارە نوێیە سەری هەڵداو، لە سایەی ئایدۆلۆژیا شمولییەکان و بە عسیزمدا، گەیشتە لوتکەی ئاڵۆزی خۆی و سەرەنجام بەکارەساتی ژینۆساید و کۆمەڵکوژی کۆتایی پێ هات. بەجۆرێك کە ئەگەر جەنگی کەنداوی دووەم و دەرهاویشتەکانی لەناو خۆی عێراقدا نەبوایە سەرلەبەری بوونی ئەم نەتەوەیە لەبەردەم هەڕەشەی تراژیدیایەکی گەورەتر لەوەبوو، کە ڕووی دا.

ناوەندە بڕیار بەدەستەکانی دونیاو لە پێش هەموویانەوە ناوەندەکانی بڕیار لە ئەمریکاو سەنتەرەکانی توێژینەوە و کۆڕو کۆمەڵە نێودەوڵەتیەکان، یەکجار گرنگە ئەوەبزانن، کە کێشەی کەرکوك لە دایك بووی دوای(٢٠٠٣/٤/٩) و ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری پێشوی عێراق نی‌یە،

وەك هەندێ دەوڵەت و ناوەندو لایەن دەیانەوێت وای وێنا بکەن و بخەنە ڕوو، ئەوەش لەسۆنگەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان و دژایەتی‌کردنی کوردەوە، مێژووی

کێشەی کەرکوك لەسەرەتای دامەزراندنی قەوارەی عێراقیەوە دەست پێدەکات، لەو ساتەوە دەست پێدەکات کە دانیشتوانی ئەم شارە نەیاندەویست ببن بە بەشێ لە قەوارە نوێیەکە و دواتر بەهۆی سیاسەتی هەندێ لەبڕیار بەدەستەکانی ئەوکاتە بە قەوارە تازە دامەزراوەکەوە لکێنران. دواتریش ئەم کێشەیە بەردەوام بوو. هەوڵەکانی بەعەرەب کردنی شارەکەش هەرلەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە دەستی پێکردووە، لە سییەکاندا چۆتە قۆناغێکی نوێ و لە هەفتاو هەشتاو نەوەدەکاندا گەیشتە لوتکەی خۆی و بەدەرکردنی دەیان هەزار خێزانی کورد لەو شارەدا کۆتایی پێهات. کەرکوك هەمیشە تەوەرەیەکی گەرمی دانووستان و ململانێ و نێوان شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکان و دەستەڵاتدارانی بەغدا بووە.

ئەم قسانەمان کەکورت کراوەی مێژوویەکی پڕلەخوێن و ستەم و جیاکاری نەتەوەیی و پاکتاوی نەژادییە، بۆ خودی خۆی نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بیخەینە ڕوو، کە کەرکوك گەر باوەڕمان بەوەش نەبێت کە سەرکردە ناسیۆنالیستەکانی کوردیش دەڵێن. دڵ و قودسی کوردستانە، ئەوا لەڕاستیدا ڕوی دووەمی کێشەی کوردەو بەجۆرێ لە جۆرەکان هەڵوێست لەمەڕ مەسەلەی کەرکوك هەڵوێستە بەرامبەر تێکڕای کێشەی کورد یاخود لانیکەم بەشێکی جەو هەری لەو کێشەیە. هەربۆیە زۆر گرنگە لایەنە پەیوەندیدارەکان بە کێشەکەو لەوانەش وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا پێش هەموو شتێ رەگە مێژوویی یەکان و سروشتی ئەم کێشە و ئاماژە رەمزیەکانی و ڕەهەندەسایکۆلۆژیەکەی بە جوانی بناسن و لە نزیکەوە ئاگاداری بن. چونکە بەبێ ئەو ئاگادار بوون و دەرك کردنە، چارەسەرکان ناتەواو دەردەچن، بەڵکو رەنگە ببن بەناو چارەسەر و تەنها پەردە بدەن بەسەر جەوهەری کێشەکەدا و بەشێوەیەکی کاتی ئیدارەی کێشەکە بکرێت، نەك

چارەسەرێکی ڕیشەیی بۆ بدۆزرێتەوە. ئەمەش وا دەکات کە شارەکە ببێتە سەرچاوەی نیگەرانی و نائارامی‌یەکی بەردەوام و کاریگاتە سەر ئەو دەست کەوت و چارەسەرانەی‌تریش کە لە بەشەکانی‌تری عێراق و پارێزگاکانی‌تردا بەدی هاتوون.

هەر لەم سۆنگەوە گوێ گرتن بۆ ئەوانەی کەدەڵێن جەوهەری کێشەی کەرکوک سەبارەت بە کورد نەوتە، وەتەبەنی کردنی باری سەرنجیان لەم ڕووەوە، جگە لەوەی دەبێتە پەردەپۆش کردنی زوڵمێکی نەتەوەیی گەورە کەلەم شارەدا ڕوویداوە، لەهەمان کاتدا پێچەوانەی واقیعیشە، چونکە کورد لەکاتێکدا باسی کەرکوکی کردوەو بابەتێکی (محور)یی ململانێ و دانوستانەکانی بووە لەگەڵ کاربەدەستانی بەغدا هەر لەشۆڕشی ئەیلول و نیوەی یەکەمی هەفتاکانەوە تا ساڵی (١٩٩١)،تەنها داوای ئۆتۆنۆمیەکی سنورداری کردوە، لەسایەی دەستەلاتێکی مەرکەزی بەهێزداو باسی دابەشکردنی سامان و داهاتیشی وەك ئەوەی لە فۆڕمی فیدرالیەتدا مەترەحە لە گۆڕێ دانەبوە، وتووێژکارانی کورد لەو وەرەقەدا کەلە وتووێژەکانی ساڵی (١٩٩١)ی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ڕژێمی بەعس سەبارەت بە پرسی کەرکوك دابوویان بەبەعسی‌یەکان دانیان بەوەدانابوو کەنەوت لەلایەن مەرکەزەوە بەڕێوە ببرێت. باسی دابەشکردنی سامان و داهاتیش وەك ئەوەی لە فۆڕمی فیدراڵیەتدا مەترەحە لەگۆڕێدا نەبووە. لە ئێستاشدا کوردو هەرێمی کوردستان و گەلی کوردستان بەگشتی، بەتەواوی پێکهاتەکانیەوە، پابەندی خۆی بەدەستوری عێراقیەوە ڕاگەیاندوە، لەو دەستورەشدا گەلی هەرێمی کوردستان بەئەندازەی قەوارەی دانیشتوانەکەی لەداهاتی نەوت و بوودجەی فیدرالی سودمەند دەبێت و نەوتی هەموو عێراقیش بەوەی هەرێمی کوردستانیشەوە موڵکی هەموو گەلی عێراقە. گەر بشوترێت نەوتی کەرکوك یارمەتی کوردەکان دەدات بۆ جیابوونەوە، ئەوا پێچەوانەکەی ڕاستە،

چونکە جگە لەوەی سێ پارێزگاکەیتری هەرێمی کوردستان دەیان (موقعی) ی دۆزراوەی نەوتی تێدایە، لە هەمان کاتدا ئەوەی وای لەکورد کردوە لەگەڵ عێراق بمێنێتەوە دوو هۆکارە. باوەڕی سەرکردەکانی کوردە بەوەی کە بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردستان لەمانەوە لەگەڵ عێراقدایە، لەبەر نەبونی دۆخێکی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی کە پشتیوانی لە هەنگاوێکی لەو جۆرە بکات، یاخود لانیکەم ڕێی لێ نەگرێت. بۆیە ئێمە بە چاوپۆشین لەوەی کەوەك پرەنسیب مافی چارەنوس مافی هەموو نەتەوەکانەو (وڵسن) ی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش یەکێ بووە لەوانەی لەساڵی ١٩١٤دا وەك مافێك بە گوێی گەلانی دنیایدا داوە و دواتریش لەچەندین بەڵگە نامەی نێودەوڵەتیدا چەسپاوە، بەدەر لەمە ئەو پاساوەی سەرەوە پاساوی ئەوانەیە نایانەوێت کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانیتر بگەڕێنەوە سەر هەرێمی کوردستان و بەمەش کێشەی کورد لە عێراقدا چارەسەر بکرێت. مێژوو واقیع پێمان دەڵێن کە دەستەڵاتدارانی بەغدا بەدرێژایی سەدەی بیستەم وئەوانەی کورد و گەلانیتریان چەوساندۆتەوە، لەسۆنگەی نەوتی کەرکوکەوە بووە کە لەژێر هیچ بارودۆخێکدا ئامادەنەبوون دەست لەو شارە هەڵگرن و هیچ سازشێکی بەسەرەوە بکەن، ئەمەش لەوەڵامی لایەنی بەعسی بەرامبەر بەوەفدی کوردی لەوتووێژەکانی ساڵی (١٩٩١)ی گەلی بەرەی کوردستانی دەردەکەوێت کاتێ تارق عەزیز دەیەوێت ئەوە رون بکاتەوە بۆ وەفدی کوردی کەبۆچی رازی نابن کەرکوك بخرێتەوە سەر کوردستان دەڵێت(چونکە کەرکوك نەوتی تێدایە). کەرکوك ئەگەر شارێکی ئاسایی بوایە، ئەگەر سەرچاوەی دەوڵەمەندی نەوتیی لێ نەبوایە، نەدەکەوتە بەر ئەوشاڵاوە گەورەی پاکتاوی نەژادی و پرۆسەی گۆڕینی دیموگرافی، کە بۆدەیان ساڵ درێژەی کێشا. بۆیە جەوهەری کێشەی کەرکوك لەچاوی کوردەوە

لەوەدایە کەخاوەنی کێشەیەکی ڕەوابووەو لەڕووی مێژوویی و واقیعیەوە کەرکوك بەشێ لەخاکی نیشتیمانەکەی بووە و داوای کردوە کە ئەویش بەشێ بێت لەهەر چارەسەرێك بۆ ئەو کێشە دادەنرێت و دەدۆزرێتەوە. کوردستانی بونی کەرکوکیش لەپێش شالاوی بەعەرەب کردن و گۆڕینی پێکهاتەی دانیشتوانەکەی و ئەو هەموو ستەمە بووە کەبەعس لەو شارەدا کردویەتی، بەڵام بەرامبەرەکان هەمیشە ئەم داخوازیەیە عادیلانە و ڕەوایەی کوردیان ڕەتکردۆتەوە و بەپێچەوانەشەوە ئاگری رقی ستەمکارانەیان دژی ئەم نەتەوە و نەتەوە غەیرە عەرەبەکانیتری شارەکە زیاتر کلّپەی سەندووە. ئەوە تەنها ئێستاشە لە دوای پەسەند کردنی دەستوری عێراق و دانانی نەوت بە مولکی گەلی عێراق و چارەسەرکردنی کێشەی داهات، دەرفەتێکی ڕاستەقینە بۆ چارەسەری کێشەی ئەم شارە و لە ویشەوە کێشەی کورد لە عێراقدا هاتۆتەکایەوە کەپێویستە بەهیچ نرخێ ئەم دەرفەتە مێژوییە لەدەست نەدرێت.

وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لەم روەوە ئەرکی مێژوویی و گەورەی لەسەر شانە، کە هەڵەی بەریتانیەکان لە سەرەتای دامەزراندنی قەوارەی عێراقدا لەدووەم دامەزراندنەوە و داڕشتنەوەی قەوارەی عێراقی دا دووبارە نەکاتەوە. چونکە عێراقی نوێ بەبێ چارەسەر کردنی یەکێ لە کێشە ئاڵۆزو مێژوویەکانی ناو ئەم قەوارەیە کەکێشەی کوردە دانامەزرێ و سەرناگرێت. ئەگەر وولاتەیەککگرتووەکان بەزمانی بەهامەزنەکانی دیموکراسی و ئازادی و مافی مرۆڤ و ریفۆرمەوە قسە بکات، ئەوا چارەسەری ئەم کێشەو ڕوانینە کێشەی کەرکوك لە چوارچێوەی ئەم کێشەدایە دەبێتە ئەرکێکی ئەخلاقی و ژیاری ئەو. ئەگەر بەلۆژیکی بەرژەوەندیەکانیش بڕوانێتە مەسەلەکە بەرژەوەندی ئەمریکا وا لە عێراقێکی سەقام گیردا، بەبێ چارەسەری کێشەی یەکێ لەپێکهاتە

سەرەکیەکانیش کە کوردو گەلی کوردستانە مەحاڵە ئەم سەقام گیریە بێتە دی، ئەم کێشەیەش بێ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەقازانجی چارەسەری کێشە نەتەوەیی یەکە نایەتەدی. تەنانەت ئەگەر کورد لە بەرسنورداری تواناکانی لە قۆناغێکیشدا بەناچاری مل بە چارەسەرێکی سەپێنراو بدات، ئەوە مانای ڕازی بوونی ڕاستەقینە ناگەیەنێ و لە هەردەرفەتێکدا کەبێتە پێشەوە کێشەکان سەر هەڵدەدەنەوە و چارەسەرە سەپاوەکان دەبنە سەرچاوەی کێشەی نوێ، بۆیە هەر چارەسەرێك بۆ کەرکوك چارەسەرکردنی کێشەی کوردی لێ نەکەوێتەوە جاریکیتر هەست بە ستەم لێچویی یەکی قوڵ لەدڵ و ویژدانی کورداندا دەچەێنێ ئەمەش وادەکات ئامانجەکانی وڵاتەیەککرتووەکانی ئەمریکاو عێراقیەکانیش بە گشتی نەیەنە دی. هەروەها ئەو قەناعەتە لەناو کوردا قوڵ دەکاتەوە کە هەموو دڵخۆش کردنێ بە عێراق تەنانەت لەسایەی دەستورە نوێ یەکەی و دوای ڕووخانی ڕژێمە ستەم کارەکەی بەعسیش خۆخڵەتاندن و ناڕاستەو دەبێت لەدەرفەتێ بگەڕێن بۆ ئەوەی بەیەکجاری خۆی لەچوارچێوەی ئەم قەوارە ڕزگاربکات گەرچی لەم پێناوەدا هەندێ سەرکێشیشی کردبێت.

لێرەشەوە لە ڕوانینە چارەسەری کێشەی کەرکوك و گوێگرتن لە لایەنە پەیوەندی دارەکانیشدا سێ مەسەلە سەبارەت بە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا گرنگە کە ئەوانیش بریتین لە:

١) وڵاتە یەکگرتووەکان نابێ لەڕوانگەی ئەزمونی مێژوویی خۆی لە پێکهێنانی نەتەوەوەو مانا پەیدا کردنی چەمکی هاوڵاتی سەیری کێشەی کوردو کەرکوك و جۆری چارەسەرەکان بکات، چونکە گەشەکردنی مێژوویی پرسی نەتەوەو کێشەکان

لێرە تەواو جیاوازن، بیرکردنەوە لەوەی لێرە کێشەکان تەنها لەسەر بناغەی هاولاتیەتی یەکسان چارەسەر بن، بەهەڵە داچونێکی مەنهەجی و واقیعی گەورەیە، چونکە گەلی عێراق هێشتا نەبوە بە نەتەوەیەکی سیاسی و (انتما) بۆ عێراقیش زەبری گەورەی بەرکەوتوە، بۆیە ڕێگای گەیشتن بەبنیاتنانی ئەم نەتەوە لەدوا ڕۆژدا، چەسپاندنی سەرەتای هاولاتیەتی یەکسان، وەك فۆرمێ بۆ دەست کەوتنی مافی وەك یەکی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی، بەچارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی و مەزهەبی و فەرهەنگیەکان و تێرکردنی شوناسی پێکهاتەکاندا دەڕوات بۆ ئەوەی لەبەرنجامی کۆتایدا شوناسێکی یەککرتووی عێراقی بێتەکایەوە.

٢) چارەسەری کێشەی کەرکوك بەپێچەوانەی ئەو چەرە دوکەڵەی هەندێ ناوەندی ڕاگەیاندن و سیاسی دروستیان کردووە لەبەرژەوەندی تورکمان و عەربی شارەکەو بەشەکەیتری عێراق و دنیای عەرەبیدایە، چونکە بەرژەوەندی ڕاستەقینەو گەشەسەندنی ناوچەکە وا لە گرەوی کەم کردنەوەی گرژیەکان و دارشتنی بناغەیەکی نوێ و بۆ پەیوەندیەکی نوێ هاوسەنگتر و دادپەروەرانەتردا.

٣) ولاتە یەککرتوەکان دەبێت ئاگای لەوە بێت کە ئایدۆلۆژیا داخراوەکان و بالا دەستیی نەتەوەیی لەقۆناغی رابردوودا زەبری گەورەیان لە رۆشنبیری و عەقڵی سیاسی ناوچەکە داوە، بۆیە زۆرجار ئەم عەقڵە گرژو کورت بینە بە گوێرەی پێویست بەسەر چارەسەرکاندا ناکرێتەوە، هێشتا بەهاکانی قۆناغی نوێ جێگیر نەبوون.لێرەوە ولاتە یەککرتوەکانی ئەمریکا لە مەسەلەی کەرکوك دا پێویستی بە جورئەتێکی سیاسی هەیە، گەر ئەمەش بکات و لە قازانجی چارەسەری کێشەی

کورد له عێراقدا کێشەی شارەکەو ناوچەکانیتر بەلادا بخات، بەهۆی ئەو پێگە بەهێزەی هەیەتی و ئەو میکانیزم و کارتانەی بەدەستیەوەن، دەتوانێ مەسەلە کەبەقازانجی خۆی و گەلی عێراق و تێکڕای گەلانی ناوچەکەش بشکێنێتەوە، وەبناغەی مۆدیلێکی نوێ لەبەیەکەوە ژیانی نەتەوەیی و ئاینی دابڕێژێت. هەنگاوێکی لەو جۆرەش پێش هەموو شتێ لەبەرژەوەندی عێراقدایە وەك وڵات، چونکە چارەسەر کردنی کێشەی کورد گەر جارێك لاکردنەوە بێت بەلای کوردا ئەوا دەجار هەڵگرتنی خەمەکانی عێراق و چارەسەرکردنی برینە مێژوویەکانی جەستە زامارەکەیەتی.

٤) وڵاتە یەکگرتوەکان لەچوارچێوەی ئەو چارەسەرەی باسکراو بە قەناعەت هێنان بەوەی کە بەرژەوندیەکانی سەرجەم عێراقیەکان لە جێ بەجێ کردنی ماددەی (١٤٠) دایە بەو جۆرەی لەدەستوردا هاتووە، و رازیکردنی هەموو لایەنەکانە لەرێی ئەنجامدانی ریفراندۆمێکی گشتیەوە تاخۆیان ئایندەو چارەنووسی شاری کەرکوك و ناوچەکانیتر دیاری بکەن. دەتوانی رەخنە لە هەڵەی لایەنە کوردیەکان لە شارەکەدا بگرێ و بەراشکاوانە پەنجە لەسەر ئەو میکانیزم و هەنگاوانە دابنێت کە خزمەت بە ئێستا و دوارۆژی متمانە دروستکردن لەنێوان پێکهاتەی شارەکەدا ناکەن و دیدێکی دروستیان لە پشتەوە نەبووە، هەروەك دەتوانی بەشدار بێت لە داواکردنی هەر زەمانەتێك بۆ دەستەبەرکردنی سەرجەم مافەکانی نەتەوەی تورکمان و عەرەب و ئاشوری برا لەشارەکەدا، بە جۆرێك شارەکە وەك پارێزگاکانیتری هەرێمی کوردستاندا سەیر نەکرێت و دۆخێکی تایبەتی هەبێت و پێکهاتەکانی شارەکەو پارێزگاکە هەریەکەیان بەگوێرەی قەوارەی خۆی بەشداریان

له حوکمی شارەکەدا هەبێت و له سەر ئاستی هەرێمیشدا نەتەوەی تورکمان و عەرەب و ئاشوری و کلدان و بەشدارێکی راستەقینەی دەسەلآت بن. هەروەها له دەستوری هەرێمدا سەرجەم مافە سیاسی و ئابوری و مەدەنیەکانیان بەڕەسمی بناسرێت و هەموو شێوازێکی هەڵاواردنی نەتەوەیی و ئاینی ڕەتبکرێتەوە.

رێگا ڕاستەکەش ئەمەیە، کە داوای هەموو زەمانەتێکی هاوچەرخ بۆ پێکهاتەکانی کەرکوك‌و هەرێمی کوردستان بەگشتی بکرێت وەهیچ کەم تەرخەمێیەك لەم ڕووەوە له کورد قبولْ نەکرێت نەك بەم بیانوەوە رێ لەچارەسەرێکی عادیلانەو هەمەلایەنەی کێشەی کورد لەعێراقدا بگیرێ و لەم دەرفەتە نوێیە دەگمەنەشدا ئەم کێشە بەنیوە چارەسەرکراوی بەجێ بهێلْرێت.

نوسەری ئەم ووتارەش له دوو توێ پرۆژەیەکدا بەناوی نەخشەی ڕێگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك وناوچە دابڕاوەکان بەشێکی گرنگ لەو زەمانەت و ڕێگا چارانەی خستۆتە روو رەشنوسی دەستوری هەرێمیش بەشێکی بەرچاو لەمافەکانی پێکهاتەکانی لەخۆ گرتووە و دەرفەتیش لەبەردەستدایە بۆ زیاتر دەوڵەمەنکردنی لەم رووە.

ئێستا هەموو لایەك له چاوەڕوانی ئەوەدان وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا قورسایی سیاسی و ئەدەبی خۆی بە قازانجی چارەسەری کێشەی کەرکوك وەك ڕوویەکی گرنگی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی له عێراقدا بەکار بهێنێت لەو سۆنگەشەوە کەکورد رازی بووە چارەنووسی ئەو ناوچانەی کێشەیان لەسەرە لەڕێی ریفراندۆم و لەلایەن خودی دانیشتوانی ناوچەکانەوەو بەشێوەیەکی دەستوری و

ئاشتیخوازانە یەکلایی بکرێنەوە، هیچ (احراج)ییەك بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان دروست نابێت و پشتیوانی ئەو یەکسان نابێت بەپشتیوانی راستەوخۆ لەپێکهاتەیەکی عێراق کەکوردە بەڵکو دەبێت بەپشتیوانی کردن لەدەستورو چەسپاندنی ماددەیەکی ئەو دەستورە کەهێزی دەستوریی و ئیرادەی زۆرینەی گەلی عێراقی لەپشتەوەیە و ئەمەش لانی‌کەمی ئەوەیە ئەمریکا لەعێراقدا بیکات.

هەروەها ئەمە ئەو ڕۆڵەیە کە شایستەی پێگەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لە جیهان و ناوچەکەو عێراقدا. پێچەوانەی ئەمەش درێژەدان دەبێت، بەمانەوەی کێشەی خوێناوی کورد بەبێ چارەسەرو دواخستنی بۆ دوا ڕۆژێکی نادیارو دەست هەڵگرتن لە خەونی عێراقێکی سەقامگیرو دیموکراسی کە گەلی کوردستان بەشێکی گرنگو بنەڕەتی ئەو عێراقە بێت.

## کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان، هەوڵدان لەپێناو دامەزراندنی ڕوایەتییەکی نوێ لەدەرەوەی دەستووردا*

بڵاوبوونەوەی بەشی یەکەمی ڕاپۆرتەکەی دیمستۆرا زەنگێکی هۆشیارکەرەوەبوو بۆ ناوەندە سیاسی و فکری و جەماوەرییەکەی کوردستان. بەتایبەتیش بۆ ئەو چارەنووسەی (کەرکوك) چاوەڕێیەتی ئەگەر کوردو گەلی کوردستان و سەرکردایەتییە سیاسیەکەی هەڵوێستی پێویستیان نەبێ و ئاراستەی ڕووداوەکان ڕاست نەکەنەوە. ئەوەی لەسەروەستانیشی زۆر دەوێت تەنها درێژەو وردەکاری ڕاپۆرتەکە نیە، بەڵکو ئەو

* ڕۆژنامەی (پرس)، ژمارە (٦٩)، بەرواری (١٧)ی حوزەیرانی (٢٠٠٨)ز.

هێڵە گشتی و پێوەرو هەناسەیە لەبەر تیشك و کاریگەری ئەوان ڕاپۆرتەکە نوسراوە. هۆشیاری عەقڵی سیاسی کوردیش بەشێکی گرنگی والەدۆزینەوەی ئەو یاسا ناوەکی و تارماییەکانی ناو ڕاپۆرتەکەو ئەو پیلانەی لەسەر ماددەی (١٤٠)ی دەستوور لەئارادایە. ڕاستە ئەم ڕاپۆرتە کۆتایی دنیانییە. بەڵام ئەگەر بەهۆشیارانەو جددیانەش هەڵوێستی لەبەرامبەرەوە نەگیرێ و کارەکانی دیمستۆرا نەکرێتە لێکدانەوەیەکی‌تری پراکتیکئامێزانەی ماددەی (١٤٠)، ئەوا سەبارەت بە کورد دەبێت بەسەرەتای دنیایەکی تازە، دنیایەك هێندەی بۆمان دادەڕێژرێ و دروست دەکرێت ئێمە سیماو ئادگارەکانی نانەخشێنین. بەڵام هێشتاش ڕووناکی لەوسەری دەریەندەکەوە دیارە.

گەرچی ئەوەی لەبەشی یەکەمی ڕاپۆرتەکەی دیمستۆرادا ڕاگەیانراوە تەنها بەشێکی کەم لە ڕاپۆرتە گشتییەکەیەتی، بەڵام لەو بەشە کەمەدا وەك هەڵوێستی ڕەسمی سیاسی هەرێمی کوردستانیش خستییەڕوو لەگەڵ خواست و داواکانی گەلی کوردستان یەك ناگرێتەوە.

بەڵکو هەست بە نیگەرانییەکی قوڵ دەکرێت کە ئەم سەرەتا نادڵخۆشکەرە پێشەکی بێت بۆ تەڵەزگە و کێشەیەکی گەورەتر سەبارەت بە ناونیشانی گەورەی کێشەکە (کەرکوك) و ئەو ناوچانەی لەڕووی یاساییەوە ناکۆکیان لەسەرە بێتەدی، لێرەوە نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان پێناچێت بەو ئاراستەدا ئیش بکات کە لەگەڵ نەك هەر ئاواتەکانی گەلی کوردستاندا بگونجێت بەڵکو ڕاپۆرتەکەی میکانیزمێکیش بێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی لە عێراقدا.

هەڵبەتە لێرەدا ڕەنگە تاڕاددەیەك ئەوە جێگەی تێگەیشتن بێت كە نوێنەری نەتەوەیەكگرتووەكان لەئاست چاوەڕوانی گەلی كوردستاندا نەبێت، وە ئەو بەدیهێنانی ئامانجەكانی گەلی كوردستان لە دیاریكردنی سنووره مێژووییەكانی هەرێمەكەی بەوە نەزانێ ئیشی بۆبكات، بەڵام خۆدەبێت لانیكەم چەسپاندنی ڕۆحی مادده دەستووورییەكە و چارەسەركردنی كێشەی نەتەوەیی لە عێراقدا ئامانجی ڕوون و دیایكراوی نەتەوەیەكگرتووەكان بێت.

وە دەبێ دیمستورا ئەوەی لا ڕوون بێت كە خاوەنی ئەسڵی كێشەكە گەلی كوردستانە. ناكۆكیەكانیشی لەجەوهەردا ئیداری نین بەڵكو نەتەوەیین و پەیوەستن بەكۆمەڵێ ڕەهەندیتری پەیوەست بە ژان و ژارو پەرەسەندنی مێژوویی شۆڕش و بزاڤی ڕزگاری كوردو ئاواتەكانی گەلی كوردستان. هەروەها چارەسەری ناكۆكییەكە دەبێت دڕاندنی لاپەڕەیەكیتری عێراقی كۆن بێت، عێراقی ڕەچاونەكردنی ڕاستییەكان و بە عەرەب كردن و جیاوازی و ستەمی نەتەوەیی و وەلانانی ڕای گشتی و ئیرادەی هاوڵاتیان و پێكهاتەكانی گەلی عێراق و لەوانەش گەلی كوردستان.

ئەگەر چارەسەركردنی ناوبراو ئەو ئامانجە گشتیانە بەدی نەهێنن كە بەشێكن لە بنیاتنانی واقیعێكی نوێتر لە عێراقدا، وە بەرجەستەكەری كۆمەڵێ هیوای ڕەوای بەشێ لە عێراقییەكانە، ئەو كاتە گرفتەكە بەكراوەیی بەجێدەهێڵرێ و ئەوەی ئەنجام دەدرێت تەنها پێشكەش كردنی بەناو چارەسەرە نەك چارەسەر بەڵكو گەر هۆشیار نەبین لەئایندەدا كێشەكان ئاڵۆزتر دەكات. هەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ڕاپۆرتەكە خاڵییە لەهەر خاڵێكی پۆزەتیڤ و ڕوون، بەڵكو هەرنەوەندەی ڕاپۆرتەكە لەبەر ڕۆشنایی مادده دەستوریەكە بۆ یەكەمجار لەمێژوودا پرسی دیاریكردنی سنووری كوردستانی باشوور لە چوارچێوەی

فیدراڵیەتی عێراقدا دەورروژێنێ خۆی لەخۆیدا گرنگە، هەروەها کاتێك راپۆرتەکەش وەك راسپاردەو پێشنیار دەخرێتەڕوو ئەوەش گرنگە، چونکە وادەکات لەبری خاوەن کێشەکان قسە نەکات و رۆڵ و ئیرادەی ئەوان ڕەچاو بکات و بەکورتی چارەسەرێك ناسەپێنێ، بەڵام ئەوەش ڕۆشنە کە لەهەموو حاڵەتێکدا هەر راپۆرتەکە هێزی پابەندکەریشی نەبێت لەقازانجی کورد نەبێت هەڵوێستی ئەوانە بەهێز دەکات کە دژی ماددە دەستوورییەکەو وەدیهاتنی خواستەکانی گەلی کوردستانن.

راپۆرتەکەش پێوەی دیارە کە ئەوانەی هەڵوێستی دژی ماددەی (١٤٠)یان هەیە گوێیان لێگیراوە، سەرچاوە کوردییەکانیش ئاماژە بەوەدەکەن کە پێچەوانەی کۆمەڵێ وادەو بەڵێنی لەوەوپێش جوڵاوەتەوە کە بە کوردی دلوە، لێرەدا دەشبێ بپرسیت کە ئایە کورد بەشێوەیەکی کەڵەکەبوون و بەردەوام کاری لەگەڵ نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکاندا کردووە؟

ئایا بەگوێرەی پێویست لەستافی کارکردنی ئەودا ئامادەیی هەبووە؟ ئایا قۆناغ بە قۆناغی ئامادەکردنی راپۆرتەکە تیمە پسپۆڕە کوردییەکان کاریان لەگەڵدا کردووەو راستییەکانیان بەزمانی زانست و سیاسەتێکی عەقڵانی گەیاندووە بەناوبراو تا کاریکەنە سەر ناوەڕۆکی راپۆرتەکە بۆئەوەی لەخواست و ئامانجەکانی ئێمەو واقیعی کێشەکەو بێلایەنی نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان نزیکتر بێت؟ بەش بەحاڵی خۆم گومانم هەیە لەو ئاستەدا کە بەو بەرنامە بۆداڕێژراوییە کارمان کردبێت. ئەم راپۆرتەش گەر لەم ئاستەدا ئیجابی نەبێت دەکرێت لەپەیوەندی بە مەسەلەی کەرکوکەوە دۆخەکە ئاڵۆزتر بکات و کورد دووچاری شڵەژان بکات، هەرچۆنێك بێت دەبێت کوردو سەرکردایەتییەکەی بەوپەڕی ئامادەییەوە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ڕووداوەکان و گۆڕانە مەیدانییەکان مامەڵە بکەن و ئیرادەی مکوڕی

خەڵکی ئێمەش لەسەر چارەسەرکردنی دەستووریی کێشە نەتەوەییەکەی پیشانی ناوخۆو ناوچەکەو دنیا بدەن. لێرەدا واچاکە بەراوردێ لەنێوان بەشی یەکەمی ئەم راپۆرتەو راپۆرتەکەی بیکەر هاملتۆن بکەین و بزانین داخۆ جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە؟ وە جیاوازییەکە گەر هەیە لەچیدا بەو خاڵە لەیەك چووەکانیش کامانەن؟

من پێموایە جیاوازی لەنێوان دوو راپۆرتەکەدا هەیە با لەهەندێ رووی دیاریکراویشەوە لەیەکدی بچن، راپۆرتی بیکەر هاملتۆن چارەسەرەکانی زۆرکەم نەبێت بەلای خواستەکانی گەلی کوردستاندا نەدەچوون، هانی لایەنە پەیوەندیدارەکانی دەدا کەرکوك نەکەن بەباسی گفتوگۆکردن لەچوارچێوەی ماددە دەستوریەکەدا. ئەگەری چارەسەرکردنی کێشەکەی بەجۆرێ کوردیش پێی رازی بێت دوورخستبۆوە، زیاتریش لەگەڵ نەوروژاندنی کێشەکەو سەپاندنی جۆرێ لەچارەسەریبوو کە لەناوەرۆکدا چارەسەرنەبوون، بەڵام راپۆرتەکەی دیمستۆرا ئەگەری چارەسەرکردنی کێشەکەو گەڕانەوەی بەشی زۆری ناوچە ناکۆکییەکان لانیکەم رەتناکاتەوە. دوای (سازش) و (مرونە) لەلایەنەکان دەکات و باسی گێڕانەوەی هەندێ ناوچەشە بۆسەر کوردستان و بەرەسمی ناساندنی وەك بەشێ لەسنووری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

زیاتر وەك کۆمەڵە میکانیزم و پێشنیازێکیشە بۆلایەنە پەیوەندیدارەکان، بەڵام لێکچوونیشیان هەیە، هەردووکیان بەجۆرێ لەجۆرەکان دەیانەوێت لەدەرەوەی ماددەی (١٤٠)ی دەستوورەوە چارەسەر پێشنیار بکەن و ماددە دەستووریەکە تێپەڕێنن هەروەها هەردووکیان باس لە رەچاوکردنی هەستیاری رۆڵی وڵاتانی ناوچەکە دەکەن لەچارەسەرکردنی کێشەکەدا.

واتە کێشەکە لەوە دەردەکەن کێشەیەکی عێراقی ڕووت بێت. کە ئەوەش لەزیانی کورددا نیە، بۆئەوەی کوردیش بتوانێت بەرگری لەماف و بەرژەوەندییەکان و باری سەرنج و کارتەکانی دەستیشی بکات، زۆر گرنگە ڕازی نەبێت بەچارەسەرێك ئەگەر بەجۆرێ لەجۆرەکان لەژێر ڕۆشنایی ماددەی (١٤٠)دا نەبێت، یاخود لێکدانەوەیەکی ئەو نەبێت، یان جێبەجێکردنی ڕۆحی ماددەکەو بەناوی ئەوەوە نەبێت.

هێنانە دەرەوەی کێشەکە بۆ دەرەوەی دەستوورو بۆ دەرەوەی ماڵی عێراقی لەقازانجی کورد نییە، کورد جاران وابیری دەکردەوە کە هەموو هێنانە دەرێکی کێشەکەی لەچوارچێوەی عێراقدا لەقازانجی ئەوە، چونکە خۆی هیچ بەشدارییەکی لەدروستکردنی بڕیاری سیاسی لەعێراقدا نەبوو، بەڵام ئێستا دۆخەکە جیاوازە، کورد پێکهاتەو ڕەگەزێکی سەرەکی عێراقی دوای بەعسە، پێگەی لەبەغدا بەهێزەو هاوبەشێکی سەرەکی حکومەتە بەحوکمی ئەو پێگەو بوونی دەستوورو جیاوازییەکانی ناو عێراقیش دەتوانێت لەکاتی پێویستدا کارتی فشاربێت بۆسەر ئەم هێزە یاخود ئەو هێزە، لێرەوە هێزی کورد لەشوێنی ئەوەی کێشەکانی لەچوارچێوەی دەستوورو عێراقدا ببێتە چارەسەرکردن و بردنە دەرەوەی کێشەکانی پێگەی لاواز دەکات و (خیار)ەکانی بەردەمی سنووردار دەکات، ئەم ڕاپۆرتەش گرنگە واسەیربکرێت کە یارمەتیەکی تەکنیکی نەتەوەیەکگرتووەکانە بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)، یاخود کورد بەم جۆرە سەیری بکات بواری فشار دروستکردن و ڕاستکردنەوەشی هەیە، چونکە ڕاپۆرتەکە ئاراستەی حکومەتی عێراقی دەکرێت، بەڵام دەبێت ئەوەشمان لەبیربێت ئەگەر ڕاپۆرتی بیکەر هاملتۆن کە داوای بەغدایەکی بەهێزی دەکردو لەم پێناوەشدا داوای چاوپۆشین لەبەشێ لەخواستەکانی هەرێمی دەکرد، ڕەنگدانەوەی بەشێ لەناوەندە سیاسیەکەی ئەمریکا بوو، ڕاسپاردەکانی نوێنەری

(UN)یش بۆماددەی (١٤٠) بەجۆرێ لەجۆرەکان پشتیوانی ئەمریکای لەپشتە، واتە ئەگەر پشتیوانی ئەمریکا درێژیش نەبێتەوە بۆ وردەکاری راپۆرتەکەو پۆلێن کردن و میکانیزمەکانی ئەوا بۆخودی ئەرکەکەو دیمستورا مسۆگەرە ئەمەش ڕەهەندێکیتر دەدات بەکێشەکەو دەبێت هەموو لایەك هۆشیاربێت.

ئەوەی گرنگە بۆئەوەی راپۆرتی دیمستورا نەبێتە بیکەر هاملتۆن یاخود بەدیوەکەیتردا ئەگەر سەرجەم راپۆرتەکە لەکاتی ئاشکرابووندا خواستەکانی کوردو چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی مسۆگەر نەدەکرد واچاکە بکرێتە بیکەر هاملتۆن، بەلام لەجێبەجێ نەکردنیدا.

لەڕاستیدا ئەو لۆژیك و هەناسەی راپۆرتەکەی پێنوسراوە لەهەندێ رووەوە لەبیکەر هاملتۆن مەترسیدارترن، چونکە دیمستورا ڕاستەوخۆ کار لەسەر کێشەکان دەکات بەگوێرەی دەقە دەستورییەکەو دوای جێبەجێنەبوونی ماددەی (١٤٠) لەکاتی خۆیدا دەست بەکاربووە، هەروەها ئیش بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان دەکات کە لەهەندێ رووەوە رەوایەتی زۆرە، راپۆرتەکەی بیکەر هاملتۆن تیمێکی ئەمریکی نوسیبووی، زیاتر ئاراستەی ئیدارەی ئەمریکی کرابوو، لەهەندێ برگەیدا دژی خولیاو ئامانجەکانی تیمەکەی بۆشبوو لەناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستداو گەڕانەوەبوو بۆ ئیشکردن بە تیۆری و ڕیالیستی لەپەیوەندیە نێودەولەتییەکاندا، بەمانایەکیتر جۆرێ لەدانپیانانی ناوەکی شکستی سیاسەتە نوێکانی ئەمریکای عێراقدا تێدابوو، هەربۆیە راپۆرتەکە لەپشتیوانی ئیدارەی بۆش بەهرەمەند نەبوو.

چونکە پشتیوانی لەراپۆتەکەدا گۆرانی لەحکومەتەکەی بۆشدا دەویست بەتایبەتیش سنووردارکردنی ئەزموونی دیموکراسی عێراق و بەشداری پێکردنی سوریاو ئێران لەپرسە عێراقیەکاندا، بەلام راپۆرتەکەی دیمستورا گەر وەك ئەو (ناملزم)ە، بەلام رەوایەتیەکی

دەستووری عێراقی و نەتەوەیەکگرتووەکان و پشتیوانی ئەمریکای هەیە،واتە ئەمریکا پشتوانی لەهەنگاوەکان دەکات و دەیەوێت لەڕێی ئەوەوە بەشێ لەو مەرامانەی بێتەدی کە نایەوێت خۆی ڕاستەوخۆ بۆ جێبەجێکردنیان لەسەر هێڵ بێت، گەر لەم گۆشەنیگایەوە سەیریکەین واتە لەڕووی مەیدانی و ئاستی کاریگەریوونەوە ئەوا دەتوانین بڵێین چەواشەکانی واقیعیەتەکانی ڕاپۆرتەکەی دیمستورا لە بیکەر هاملتۆن مەترسیدارترەو هۆشیاری زیاتری دەوێت بۆ کەمکردنەوە لە سلبیاتەکانی، بەڵکو گەر هەندێ بەقوڵی بچینە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەو هێڵەشاراوە پێکهێنەرەکانییەوە هەستدەکەین بەشێ لەبیکەر هاملتۆن لەناو ڕاپۆتەکەدا ئامادەیە ئەویش لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە ڕاپۆرتەکەی ئەوەندەی هەوڵی ڕازی کردنی عەرەبی عێراقی و هەندێ لە وڵاتانی ناوچەکە دەدات نیو ئەوەندە بەتەنگ مافەکانی کوردەوە نیە، مەترسیەکی جەوهەری ڕاپۆرتەکەش ئەو چەواشەکاریەیە کە لەهەندێ بەشیدایە، لەگەڵ دوفاقی لەپێوەرەکان لەمامەڵەکردن لەنێوان ناوچە جیاوازەکانداو نیشاندانی کورد وەك ستەمکارو دەست درێژی کاریێ، لەکاتێکدا جەوهەری گرفتەکە جۆرێکیترە، مەترسی گەورەتریشە گەر ئەم سەرەتایە بەم جۆرە بچێتەسەرو بێدەنگ تێپەڕێت وا لەوەدا کەنوسینی ڕاپۆرتەکە زەنگێکی ترسناك دەدا بەگوێی کوردو گەلی کوردستاندا ئەویش ئەوەیە کە تێپەڕبوونی وادەی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) یەکسان دەکات بەکۆتایی هاتن بەمیکانیزم و قۆناغەکانی جێبەجێکردنی و هێنانەکایەی پێوەرو میکانیزمی بەدیل بۆچارەسەرکردنی کێشەکە، واتە وانیشاندەدات، ئەوەی لە ماوەکە ماوە تەنها ناونیشانەکەیەتی کە ئەویش بوونی هەندێ ناوچەیە کە ناکۆکیان لەسەرە، لەبەرئەوەشە کە لەماوەی دیاریکراوی خۆیدا ماددەکە جێبەجێنەبووە ئێستا کاتی ئەوە

هاتووە نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان چۆن بەباشی دەزانێ بەوجۆرە چارەسەری کێشەکە بکات.

دیارە نەتەوەیەکگرتووەکانیش بەپلەی یەکەم ڕێکخراوی دەوڵەتانە نەك گەلان، وە بە پلەی یەکەم گوێ لەنوێنەرە ڕەسمیەکانی دەسەڵات دەگرێت، بەڵام لێرە ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە لەناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەو بەکارهێنانی هەندێ دەستەواژەی پێچەوانەی دەستووری وەك (باکوری عێراق) و گومان دروستکردن لە (ولائی) خەڵکە کوردەکەی ناو سوپای عێراق هەست دەکرێت لەکاتێکدا کورد بەشدارێکی سەرەکی دەسەڵاتە لەعێراقدا، هێشتا وەك بەشێکی نارەسەن و جۆرێ لە موعارەزەو یاخی سەیریکراوە. بەخوێندنەوەی ئەو لۆژیکەی ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەو دیوە نەوترلوەکانی دەگەینە ئەو ئاکامەی کە دەخوازێت مامەڵەی زۆر جددی لەگەڵ بکرێت و ڕیگا نەدرێت بکرێتە (بدیل)ی ماددە دەستووریەکەو ئەم بەشەش نەبێتە پێشینە واتە نەبێتە (سابقە)یەکی خراپ بۆ بەشەکانی دواتر، هەموو ئەمەش بەرچاو ڕوونی ستراتیژیی و تۆکمەیی ناوخۆیی و مرونەتی جددی و ئیرادەیەکی بەهێزی نەتەوەیی دەوێت.

ئیرادەیەك لەکاتێکدا ئاڵای بەئاشتی و یاسایی چارەسەری کێشەکەی هەڵگرێت نەگۆڕە نیشتمانیەکانی لەم کێشەدا لاڕوون بێت و دەستیان پێوە بگرێت و کراوەش بێت بەرامبەر بەچارەسەرو (خیار)ە پێشکەش کراوەکان، بەڵام شارش لەسەر جەوهەری کێشەکەو بەکراوەیی هێشتنەوەی زامی کێشەی نەتەوەیی لەعێراق ڕەتبکاتەوە، لەهەموو حاڵەتێکیشدا سەرکردایەتی کوردی دەبێت ڕاستەوخۆ لەسەر هێڵ بێت و پشتیوانێتی کۆدەنگییەکی نیشتمانی بەهێزیش لەسەر کێشەکە بەزیندوویی ڕابگرێت و لەکاتی پێویستیشتدا جەماوەر ڕاستەوخۆ بێتە قسەو ڕۆڵی خۆی ببینێ.

## نەخشەی ڕێگا، بۆ جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠) و گێڕانەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بۆ سەر هەرێمی کوردستان *

**بۆ بەڕێزان / سەرۆکایەتی هەرێم.**

**سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران.**

**سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان.**

**لە ڕوانگەی هەست بە لێپرسراوێتی نیشتمانی و ئەو ئاستەنگ و تەگەرانەی لە بەردەم جێبەجێ کردنی ماددی (١٤٠) و پرسی گێڕانەوەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی‌تر لە ئارادایە بە ئەرکی سەرشانم زانی ئەوەندەی بە من بکرێت لە پرۆژەیەکی بەرگی کۆمەڵێ پێشنیاردا بخەمە بەردەستی بەڕێزتان بە هیوای بەسوود بوون:**

**هەڵبەت ئەم پێشنیارانە تەنها ناچنە خانەی هەوڵدان بۆ جێ بەجێ کردنی ماددەکەو گێڕانەوەی ئەو ناوچانە بەڵکو لە پاڵ ئەوەدا دو سێ ئامانجی‌تریش لە بەر چاو گیراوە کە ئەوانیش بریتین لە:**

**أ) بەهێز کردنی بناغەی بەیەکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی نەتەوەیی و ئاینی لە ئێستاو دواڕۆژی کوردستاندا.**

* نەخشەی ڕێگا لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٧) لە لایەن نووسەرەوە وەك پرۆژەیەك پێشکەش بەسەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و عێراق و سەرۆکایەتی حکومەت و پەرلەمان و لایەنە پەیوەندیدارەکان کراوەو دواتریش لە ڕۆژنامەی ئاوێنەدا بڵاوکراوەتەوە.

ب) نیشاندانی ڕوویەکی گەش و شارستانیی کورد و گەلی کوردستان.

ت) سوتاندنی کارتی دەستی بەرامبەرە نەیارەکان و لێساندنەوەی کەرەسەی پڕوپاگەندە و جەنگی دەروونی لە دەست. ئەوانەی دەیانەوێت مەسەلەی کەرکوك بۆ مەرامی سیاسی و ناڕەوای خۆیان بەکاربێنن.

**یەکەم: لە ڕووی مەیدانی و میکانیزمەکانی کار کردنەوە:**

١) سوود وەرگرتن لە ڕێکخراوە ئافرەتانیەکانی کوردستان بۆ شکاندنی بەربەستەکان و تێکەڵاو بوونی ڕۆحیی زیاتر لە نێوان پێکهاتەکاندا بە حوکمی ئەوەی ئافرەت ڕەمزی ئاشتی و میهرەبانی‌یە، ئەمەش لە ڕێی ئەنجامدانی چالاکی هاوبەش و دروستکردنی چوارچێوەی هاوبەش بۆ بە یەکەوە کارکردن، هەر لەم نێوەندەدا دەکرێت ڕێکخراوێك بە ناوی (دایك) ەوە دروست بکرێت.

٢) پێکهێنانی گروپێکی لێکۆڵینەوەی زانستی مەیدانی بە پشت بەستن بە زانکۆکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەو یارمەتی لۆجستی دەزگا حیزبی و حکومی و جەماوەری‌یەکان و بەشداری هەندێ کەسی سیاسی بە مەبەستی:

أ) ئەنجامدانی مەسحێکی مەیدانیی ئێستای کەرکوك.

ب) دەستنیشانکردنی کەم و کورپییەکانی کورد لە شارەکەدا لە سەر ئاستی حزبەکان و حکومەتی هەرێم و دانیشتوانی شارەکەدا لە گەڵ دەستنیشانکردنی هۆکاری ئەو کەم و کورتیانە.

ج) تێگەیشتن لە وێنەی کورد لە چاوی عەرەب و تورکمان و کلدو ئاشوری‌یەوە.

د) پۆلێن کردنی ئەو کەس و گروپانەی دژ بە جێبەجێبوونی ماددەکەن لە ناو گروپە نەتەوەییەکانیتردا و دیاریکردنی پاڵنەرو ئامانجیان لەو دژایەتییەو دەستنیشانکردنی هۆکاری هەرێمی و دەرەکی لەم نێوەندەدا.

ھ) دەستنیشانکردنی کاردانەوەی ئەو گروپانە لە کاتی گێڕانەوەی شارەکە بۆ سەر هەرێم یاخود نەگێڕانەوەی.

و) دیاریکردنی سیناریۆکانی دواخستنی ریفراندۆم و ئەو ئەگەرە چاوەڕوانکراوانەی لێی دەکەونەوە. ئەم گروپە کە دەکرێت ناو بنرێت بە گروپی لێکۆڵینەوەی کەرکوك لە بەر کەمی کات لە ماوە (٣٠ ـ ٤٥) ڕۆژدا کارەکانیان تەواو کەن و ڕاپۆرتێ لەو بارەوە پێشکەش بە سەرۆکایەتی هەرێم بکەن.

ز) ئەم ڕاپۆرتە بە بەشداری ئەندامانی سەرەکی گروپەکەو سەرۆکایەتی هەرێم و ئەنجومەنی وەزیران و پەرلەمان و وەزیری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم و هەندێ وەزیرو پەرلەمانتارو سکرتێری حیزبە کوردستانیەکان و هەندێ م. س پارتی و یەکیەتی پارێزگاری کەرکوك و سەرۆکی ئەنجومەنی جێگرەکەی و بە پرسی مەڵبەندو لق و بەرپرسی هەندێ حیزبیتری کوردستانی لە شارەکەدا تاووتوێ بکرێت و کۆمەڵێ بڕیار وەربگیرێن و بکرێت بە نەخشەی ڕێگای سەرکردایەتی کورد بۆ چارەسەر کردنی کێشەی شارەکە، چونکە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) لە لایەن کوردەوە دەبێت ببێتە پرۆژەیەکی تێرو تەسەل و دیدێکی ڕۆشنی چوارچێوە دارو نەخشەیەکی ڕێگا.

١) له نەخشەی ڕێگاکەدا بواری سیاسی، ڕاگەیاندن، مالی، یاسایی، سەربازی... هتد جیا بکرێنەوەو بۆ هەریەکەیان کەسانی پسپۆڕو دڵسۆز دیاری بکرێن بۆ سەرپەرشتی و ئاراسته کردن

٢) هەنگاوەکانی کارکردن له ماوەی ئەو ساڵەی ماوە دابشبکرێت بە سەر (٣) قۆناغداو ئامانجەکان بە سەر قۆناغەکاندا دابەشبکرێن بۆ ئەوەی سەرجەم کارو ئامانجەکان بە هۆی کەم و کوڕی خۆمان و دەستی دەستی پێکردنی بەرامبەرەکان دوانەخرێن بۆ لەحزەی کۆتایی. بۆ نموونە دەبێت له (٤) مانگی یەکەمدا له ٢٠٪ ی هاوردەکان گەڕابنەوە بۆ شوێنی خۆیان. وەلایەنی بەرامبەر بخرێتە بەردەم بەرپرسیارییەتیەوە و گەر لەو کاتەدا ئەنجام نەدرا تۆ بواری ئەوەت دەمێنێ مانۆڕی تازە بکەیت و بزانی کەم و کوڕی و بەربەستەکان چین و پێویستە چی بگۆڕێ و چی بۆ زیاد بکەی. خۆ ئەگەر ئەو (موعد)انە بکرێنە (موعد) بۆ حکومەتی عێراقی یاخود لیژنەکە ئەوا زۆر کاریگەر دەبێت.

٣) دروستکردنی ژورێکی عەمەلیاتی کراوە بۆ ماوەی ساڵی داهاتوو بە سەرپەرشتی خودی بەڕێز سەرۆکی هەرێم و بەشداری ئەو کەسانەی بە پێویست دەزانرێت بۆ ئەوەی ئەم ژوورە کاری بە دواداچوونی نەخشەکان و سەرپەرشتی لیژنەکان و گۆڕانە ڕۆژانەییەکان لە هاوکێشەدا لێکبدا وەك خۆیان هەنگاوی پێویست دەستنیشان بکات. وە هەر چوار مانگ جارێ بە بەشداری کەسانی پسپۆڕو پەیوەندیدار هەڵسەگاندنێ گشتی بۆ ڕەوتی بەرەوپێشچوونی کارەکان بکات.

٤) کارەکان بە سەر کۆمەڵێ گروپ یاخود هەر میکانیزمێکیتری جگە لە گروپ دابەش بکرێت بۆ نموونە: گروپێك تایبەت بێت بە مەسەلەی ئاوارە، یەکێکیتر کاری دیپلۆماسی و پەیوەندی گشتی و ڕاگەیاندن و....هتد.

٥) دروستکردنی تیمێکی (علاقات عامه) لە شارەکەدا بۆ کارکردن لە سەر چاك کردنەوەی وێنەی کوردو کەمکردنەوەی نیگەرانی بەرامبەرەکان و دڵنیا کردنەوەیان. لێرەدا داننان بەو هەڵانەی ڕوویداوە یاخود بەشێ لەوان دەوری خۆی دەبێت لە کەم کردنەوەی نیگەرانییەکانی بەرامبەرەکان. چونکە ئێمە هەر دیپلۆماسیەتمان پێویست نیە بەڵکو (علاقات عامه) شمان بە ڕووی ناوەوەدا زۆر پێویستە.

٦) دانەنیشتن بە دیار میکانیزمی ئەو لیژنەیەی کە ئێستا هەیە کارنامەیەك بۆ لیژنەکە دیاری بکرێت بۆ ئەوەی کۆبوونەوەکانی دەوری و زووزوو بێت و بڕیاریان لێ بکەوێتەوە بەشداری دانیشتنەکان (ملزم) بێت و هەرچەند ئامادە بێت بە (نصاب) دابنرێ بۆ ئەوەی ڕێگا لە (تسویف) بگیرێت. دەستکاری لیژنەکە لە پەرلەمانی (بغداد)ەوە زوو زوو بکرێ بە (قچیه)و لە ناو پەرلەمانەوە ئیش بکرێت بۆ ماددەکە.

٧) دیاری کردنی (منسق)ێك بۆ هەماهەنگی و وەگەڕخستنی توانای حیزبە تورکمانیەکان و کۆکردنەوەیان لە چوارچێوەیەکی کاتی کار کردن و بوونی نەخشەی کار و بووجەیەکی دیاریکراو بۆ ئەو مەبەستە.

**دووەم: لە ڕووی سیاسی و دیپلۆماسی‌یەوە:**

١) گرتنی زیاتر لە کۆنفرانس و کۆبوونەوەیەك بۆ نوێنەری نەتەوەکانی‌تر بۆ گوێ گرتن لە داواکاریەکانیان.

٢) دیاری کردنی هەڵوێست بەرامبەر ڕووداوی (١٩٥٩) ی کەرکوك و ئیدانە کردنی.

٣) ئیش کردن لە سەر چەسپاندنی ئەو ڕاستی‌یەی کە کورد ناتوانێ دەست لە کوردستانی بوونی کەرکوك هەڵبگرێت و بەمە نەبێت کێشەی کورد چارەسەر نابێت و چارەسەریش نەبوو برایەتی نەتەوەکان دەکەوێتە مەترسییەوە ئەمەوش لە قازانجی سەرجەم پێکهاتەکانی کوردستاندایە. هەموو ئەم شتانەش بە زمانێ بوترێت خزمەت بە دڵنیاکردنەوەی پێکهاتەکان لە بەرامبەر شوناس و مافەکانیانەوە بکات.

٤) لە پاڵ ئیشە گشتی‌یەکە لێکجیاکردنەوەی هەندێ لە مەلەفەکان بە کارکردن لە گەڵ کلدو ئاشوریەکان و قەناعەت پێکردنیان چونکە گەر ئەوان لە کۆڕو نێوەندە دەوڵەتیەکان بە قازانجی کێشەکە قسە بکەن سودی بەرچاوی دەبێت. بۆ ئەو مەبەستەش دەبێت لە سەر تاسەری کوردستاندا دڵخۆش بکرێن و گەر هەست بە ستەمێ یاخود پەراوێز کەوتنێك بکەن بۆیان ڕوون بکرێتەوە یاخود گەر واقیعە بە هەر ئەندازەیەك واقیعە چارەسەر بکرێت.

٥) تورکمانەکانیش بە جیا کاریان لە سەر بکرێت لەم ڕوەشەوە سوود لە کوردە شیعەکان وەربگیرێت بۆ قسە کردن لەگەڵ تورکمانە شیعەکان و ئیسلامی‌یەکانی

کوردستان و زانایانی ئایینیش لە گەڵ ئەوانیتریان. لە گەڵ بەرەی تورکمانیش قسە بکرێت و کەناڵ بکرێتەوە بەو پەڕی ڕوونی و ڕاستگۆیی و ڕاشکاوانە دیالۆگی لە گەڵ بکرێت مەرج نیە بێ سود بێت.

٦) مەسەلەی پەیوەندییەکان لە سەر ئاستی عێراقدا بە تایبەتیش لە گەڵ هێزە شیعی‌یەکاندا سودی لێ وەربگیرێت بۆ مەسەلەی کەرکوك بە حوکمی ئەوەی زۆرێ لە عەرەبە هاوردەکان سەر بەو مەزهەبەن.

٧) لە کاتی جێ بەجێ نەبوونی ماددەکەدا (بەدیل) هەبێ بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا جێ بەجێ بکرێت وەك ئەوەی سەرژمێری پێش وەخت ئەنجام بدرێت (هەرچەندە هەندێ قورسە لە ڕووی هونەری‌یەوە بۆ زانینی هاوردەو عەرەبی ڕەسەن) بۆ ئەوەی هاوردەکان بەشداری ڕیفراندۆم نەکەن و دواتر پرسی ناردنەوەیان چارەسەر بکرێت...هتد.بە کورتی سیناریۆو بەدیلی جۆراوجۆر بۆ پرسەکە لە کاتی جێ بەجێ نەبوو تێدا بخرێتە ڕوو.

٨) ئیش کردن لە سەر تورکیاو ئێران بە شێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراوی چڕو پڕ لە ماوە ساڵەکەدا لە هەموو ئاستەکانی حکومەتەکان و پارتەکان و میدیاو دەزگاکانی‌تردا. شت نووسین لە ڕۆژنامە گرنگەکانیاندا گەر بە پارەش بوو بێت. ئەم کارە کاتی و پچڕ پچڕ نەبێ و ڕاپۆرتی دوو مانگ جارێ بکاتە ژووری عەمەلیاتی سەرۆکایەتی هەرێم.

٩) ئیش کردن لە سەر ئەمریکاو وڵاتانی ئەورووپاو (UN) و وڵاتانی عەرەبی. ئەم وەفدانەش پێکهاتەکانیان تا فراوان بێت لە ڕووی فکری و سیاسی و نەتەوەیی و

ئاینییەوە واتە نوێنەری پێکهاتە جۆراو جۆرەکانی گەلی کوردستانیان تێدا بێت باشترەو بەهێزتر دەبن.

١٠) هەماهەنگی لە گەڵ بزوتنەوەی ڕیفراندۆمی کوردستان بۆ سوود وەرگرتن لە تواناکانی بە تایبەتیش کە لە کۆنفرانسی ساڵانەی خۆیدا بڕیاری داوە ساڵی (٢٠٠٧) هەوڵەکانی لە مەسەلەی ئیش کردن بۆ کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان چڕ بکاتەوە.

١١) نەخشەیەکی تایبەتی هەبێت بۆ سوود وەرگرتن لە یەکیەتی زانایان و زانایانی ئاینی بە گشتی و حیزبە ئیسلامی‌یەکانی کوردستان بۆ دروستکردنی پەیوەندی زیاتر لەگەڵ عەرەب و تورکمانی شارەکەو کەمکردنەوەی هەستیاریەکان و لەم ڕووەوە کۆبوونەوە لە گەڵیان بکرێت و دڵیان خۆش بکرێت و بە هاوبەشی خۆیان کاریان بۆ دیاری بکرێت چونکە دەکرێ بە بەکار هێنانی ڕەهەندە ئاینی‌یەکە هەندێ لە گرفتەکان چارە سەر بکرێن یاخود لانی‌کەم ئەم کارە ڕەهەندێکی‌تری ڕەوایەتی دەدات بە خەبات بۆ دیاریکردنی چارەنووسی شارەکە.دەکرێت ئیسلامی‌یەکان و یەکیەتی زانایان بە زیاتر لە ئاڕاستەیەکدا بە کاربهێنرێن وەك:

أ) دروستکردنی پردی پەیوەندی لە گەڵ زاناو ناوەندە ئیسلامی‌یەکانی نەتەوەکانی بەرامبەر (تورکمان ـ عەرەب) تا دەگاتە کۆنفرانسی هاوبەش.

ب) کۆبوونەوەی هاوبەشی ئەو زانایانە لە گەڵ جەماوەری هەردوولا بەتایبەتیش لایەنی بەرامبەر.

ج) سوود وەرگرتن لە خوتبەکانی جومعە بۆ ئەم مەبەستە.

د) بەکارهێنانی ڕەهەندە ئیسلامی‌یەکە بۆ کەمکردنەوەی دەمارگرژی نەتەوەیی.

ه) بە کارهێنانیان بە ئاڕاستەی مەرجەعە شیعی‌یەکاندا لە سەر ئاستی عێراقدا.

و) بەشداری کردنی وەفدەکان یاخود ناردنی وەفدی سەربەخۆ لەوان بۆ ئێران و تورکیا و هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی.

سێهەم: لە ڕووی دارایی‌یەوە:

١) دانانی سندوقێ بە ناوی سندوقی برایەتی کەرکوك. بۆ کۆکردنەوەی پارە لە سەر تا سەری دنیادا لە لایەن سەرمایەداری کوردو حکومەتی هەرێم و ڕێکخراوە بیانیەکان و هەندێ لە وڵاتان دەشکرێ هەموو ئەم پارانە بە ناوی ئەو لیژنەوە خەرج بکرێت کە ئێستا لەوێ کار دەکات.

٢) سەبارەت بە ئەگەری منافسەی حیزبی لە نێوان پارتی و یەکیەتی هەردوولا شتێ مۆرکەن کە شتی لەم جۆرە بە هیچ شێوەیەك قابیلی قبوڵ کردن نەبێ و ئەو کەسانەی سەرپێچیش دەکەن توندترین سزا بدرێن.

٣) سەبارەت بە ڕەشنوسی دەستور دەرفەتێکی گرنگە بۆ ئەوەی بکرێت بە دەرفەتێ بۆ پیشاندانی نیاز پاکی و جدیەتی کورد بۆ بەهاکانی کوردستانی بوون لە سەر ئاستی ماف و ئازادی پێکهاتەکانی گەلی کوردستاندا لەم ڕوەشەوە ئەم هەنگاوانە بنرێت:

أ) مەسەلەی سرود و ئالاّ بەم جۆرە نەمێنیٚ و ئازایانە بنوسرێت بە یاسا ڕێکدەخرێن و دەبێت ڕەمز بن بۆ برایەتی و بەیەکەوە ژیانی پێکهاتەکانی گەلی کوردستان و هێمای هەمووانی تێدا بێت.

ب) لە دیباجەی دەستورەکەدا ناوی نەتەوەکانیتر بیٚ و ئاماژە بە هەندیٚ لە ویستگەکانیان بکرێت.

ج) لە دەستوردا کەرکوك دۆخێکی تایبەتی پیٚ بدرێت بۆ نموونە کە بە شێوەیەکی (توافق)ی لە نێوان پێکهاتەکانیدا بەڕێوە دەچێت یاخود لە نێوان چوار ساڵی هەڵبژاردنی ئەنجومانی پارێزگادا هەر ساڵەو یەکێکیان پارێزگار یاخود سەرۆکی ئەنجومەن بن و مەسەلەکە بە زۆرینەی ڕێژەیی نەبێت ئەم خاڵە زۆر گرنگە (مصداقیە) ی کورد دەردەخات کە دەڵێت کەرکوك لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا دۆخێکی تایبەتی دەبێت.

د) جەخت کردنەوەی زیاتر لەوەی لە هەر شوێنیٚ پێکهاتەیەك زۆرینە بوو دەتوانیٚ حوکمی خۆجێیەتی خۆی (ئۆتۆنۆمی) دابمەزرێنیٚ.

هـ) جەخت کردنەوە لە سەر بایەخی زمانەکانیتر و ئاماژە بکرێت کە مەسەلەی زمان دواتر بە یاسا ڕێکدەخرێت وەیاسایەکی زمان لە کوردستاندا دەربچێت و زمانی تورکمانی و کلدو ئاشوری بکرێنە زمانی فەرمی لە پاڵ زمانی کوردیدا، دەکرێت وەك دەست پێشخەریەکی جوان هەندیٚ بە بەڵگەنامەی ڕەسمی کوردستان بە هەرسیٚ زمانەکە لە سەری بنوسریٚ، لە پەرلەماندا

وەرگێڕانی دەست بەجێ پەیڕەو بکرێت و هەر چوار زمانەکە قسەی پێ بکرێت.

و) مەسەلەی نەورۆز لە دەستوردا نەمێنێ و جەژنی نەتەوەیی وەکو جەژنی ئاینی وایەو پێویستی بەو جیاکردنەوەیە نیەو بخرێتە چوار چێوەی ئەو یاسایەی جەژن و بۆنەکان ڕێك دەخات. دەکرێت ڕۆژی ڕاگەیاندنی فدراڵیەت بکرێتە جەژنی نیشتمانی هەرچەندە جەژن بەو مانایە لە سەر ئاستی دەوڵەت دەبێت هەرچۆنێ بێ گەر هەبوو بەو جۆرە هاوبەشە بێت.

١) هەموو ئەم خاڵ و سەرەتایانە لە کۆنفرانسێکدا ڕابگەیەنرێت و ناو بنرێت ((ڕەشنوسی دەستور یاخود دەستورو پێکهاتەکانی گەلی کوردستان)) لەوێدا گەر مافە ئاینیەکانی برا یەزیدیەکان و هەر گروپێکیتریش پێویست بوو فراوانتر بکرێت و لە سەر ئەو بناغەش نوێنەرایەتی بکرێن و لە پاڵ ڕەهەندە نەتەوەیی یەکە ڕەهەندە ئاینیەکەشیان بۆ ڕەچاو بکرێت بۆ ئەوەی کوردستانی بوونیان بەهێزتر بێت. ئەم کۆنفرانسە دەکرێت هەندێ گەورە بکرێت و نوێنەری (UN) و کۆنسوڵخانەی بەریتانی و ئەمریکی و نوێنەری پەرلەمانی عێراق و هەندێ ڕێکخراوو حکومەتیتر و نوێنەری کۆماری ئیسلامی و تورکیای بۆ بانگهێشت بکرێت.

٢) هەر لەم کۆنفرانسەدا یاخود لە کۆنفرانسێکیتردا بەڵگەنامەیەك ڕابگەیەنرێت بە ناوی ((بەڵگە نامەی کەرکوك بۆ برایەتی پێکهاتەکانی کوردستان و گەلانی ناوچەکە)) لەوێدا بە بەڵگەنامەیەك کە دەکرێت ڕووێکی ڕەسمیشی پێ بدرێت لە

کۆمەڵێ بواردا باس لە برایەتی پێکهاتەکانی گەلی کوردستان و برایەتی نێوان گەلانی ناوچەکە لە سەر ئاستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بکرێت پێم وایە هەنگاوێکی لەم جۆرە دەنگدانەوەی خۆی دەبێ و گرنگیشە پڕو پاگەندەیەکی زۆری بۆ بکرێت.

٣) ساڵی (٢٠٠٧) لە کوردستاندا ناوبینرێت بە ساڵی ئاشتی و برایەتی دەکرێت ئەمە بە بڕیارێکی پەرلەمانی کوردستان بێتە ئەنجامدان.

٤) لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە: گروپێکی سەرپەرشتی هاوبەشی ڕاگەیاندن لە سەر ئاستی شارەکەدا دروست بکرێت لە نێوان سەرجەم دەزگا کوردستانییەکان و ئەوانەی بڕوان بە چارەسەری پرسەکە هەیە لە چوارچێوەی میکانیزمەکانی ماددەی (١٤٠).

**چوارەم: لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە:**

١) کۆمەڵێ دروشمی هاوبەش بنوسرێ بە درێژایی ساڵ لە ڕاگەیاندنەکانەوە لێبدرێنەوە بۆ نموونە:

*کەرکوک شاری ئاشتی و برایەتی.

*برایەتی نەتەوەکانی کوردستان ڕەگی لە قوڵایی مێژودایە.

*نەتەوەکانی کوردستان لە ئاییندا براو لە مێژوو نیشتمان و چارەنووسدا هاوبەشن.

*دەبێت هەموو هاوڵاتیانی کوردستان بەدەر لە ئینتمای ئاینی و نەتەوەیی و مەزهەبیان لە بەردەم یاسادا یەکسان بن.

*کوردستانیبوون کورد و تورکمان و عەرەب و کلد و ئاشوری دەکات بە خاوەن مافی وەك یەك.

*برایەتی نەتەوەکانی کوردستان لە هەموو پیلانێ بەهێزترە.

*ئێمە سەدان ساڵە بەیەکەوە دەژین و هەر بەو جۆرەش دەمێنینەوە.

*کوردستان مەڵبەندی بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانەی ئاین و نەتەوەکانیەتی.

*سوکایەتی بە هەر هاوڵاتیەکی کوردستانی سوکایەتییە بە سەرجەم گەلی کوردستان.

*دروستکردنی کۆمەڵێ تابلۆ کە نیشاندەری برایەتی و بەیەکەوە ژیانی نەتەوەو ئاینەکان بن و لە شوێنە گشتییەکاندا دابنرێن و بکرێن بە سلایدات بۆ هەندێ تەلەفزیۆن.

*بەهێز کردنی ڕاگەیاندنی حیزبە تورکمانییە کوردستانیەکان یاخود دروستکردنی کەناڵێکی تەلەفزیۆن و ڕادیۆیی بە زمانی تورکمانی کە تەنها بەو زمانە بەرنامە پەخش کات.

*دروستکردنی فستیڤاڵی ئەدەبی و هونەری هاوبەش و دیاری کردنی خەڵات بۆ باشترین شیعرو چیرۆك و ڕۆمان لە سەر برایەتی پێکهاتەو نەتەوەکانی کوردستان نوسرا بێت، هەوەها کورتە فلیم و گۆرانی و....هتد.

*سرودێکی تایبەت و ڕەمزێك بۆ شارەکە بەو جۆرەی لە شارەکانی ئەوروپادا هەیە ئاماژەیە بێت بە ژیان و چارەنووسی هاوبەشی شارنشینەکان.

*هەر لە ڕووی ڕەمزییەوە دەکرێت ئاهەنگێکی ژنهێنانی جەماعی تێکەڵ ساز بدرێت.

*بەشێ دیاری بکرێت بۆ بەرپەرچدانەوەی شایعەو پروپاگەندەو ئاراستە کردنی جەنگی دەروونی و چەکەکانی لە وێنەی شایعەی ترس یاخود ئومێد بەو جۆرەی چارەسەری کێشەکان دەیخوازێت کە ئەمە دەتوانرێت وەك ئامڕازێکی فشاری دەروونی تەواو کەر یاخود هاندان سودی لێ وەربگیرێت و دەکرێت سود لە هەندێ پسپۆری بیانیش وەربگیرێت.

داواکردن لە هەندێ ڕۆژنامەنووسی دۆستی کورد لە دنیادا وە ئەو ڕۆژنامە نووسە کوردانەی لە ڕۆژنامەکانی دنیادا کار دەکەن یاخود پارەدان بە هەندێ ڕۆژنامە نووس کە ڕیپۆرتاژ لە سەر شارەکە ئامادە بکەن و گرنگی چارەسەر کردنی کێشەکە بە قازانجی گێڕانەوەی بۆ سەر هەرێم بخەنە ڕوو.

*دروست کردنی کارتی جوان کە ڕەمزی برایەتی و دروشمی جوانی لە سەر بێت بە هەر چوار زمانەکە چاپ کرابێت و بنێردرێ بۆ ماڵەکان.

*کردنەوەی (Web) سایتێ بۆ کەرکوك و بڵاوکردنەوەی زانیاری و شتی پێویست تیایدا کە خزمەت بە پرسەکە بکات.

*ناردنی هەزاران ئیمەیڵ بۆ کۆنگریسی ئەمریکی، یەکیەتی ئەوروپا، نەتەوە یەکگرتووەکان، حکومەتی عێراقی داوای چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوك و

بایەخەکەی بکەن و هەوڵبدرێت بەشێکی باش هی نەتەوەکانیتر بێت بۆ کاریگەر بوون.هەر کە ناوی شارەکەش هات بوترێ (کەرکوك شاری ئاشتی و برایەتی).

دەشکرێ گەر لە کاتی خۆیدا جێ بەجێ نەبوو هەوڵبدرێت لە پەرلەمانی عێراق گۆڕین لەو ماددەدا بکرێت بۆ نموونە ساڵی (٢٠٠٧) بکرێت بە کۆتایی (٢٠٠٨) ئەمە لە کاتی ناچاریدا.

**پێنجەم: لە ڕووی سەربازییەوە:**

دیارە ئەم مەسەلە زۆر ناسکە، کوردو گەلی کوردستان گەرچی ناتوانێ لە ڕیزی (حساب) بۆکردنەکانیدا بیکاتە دەرەوە بەڵام دەبێت زۆر هەستیارانە مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت چونکە خراپ بەکارهێنانی:

١) کێشەکە ئاڵۆز دەکات و گێڕانەوەی شارەکەو ناوچەکان زەحمەت دەکات یاخود کاتێکی زۆر دەخایەنێت.

٢) لە ڕووی ناوبانگەوە لە سەر کورد دەکەوێت.

٣) ڕێگای دەستێوەردانی دەرەکی دەکاتەوە.

٤) هەر لە ئێستاوە گروپێکی سەربازی هەبێت کە لە سەر ئاستی شارەکەدا سەرجەم ئەگەرو سیناریۆکان تاوو توێ بکات بۆ هەریەکەیان نەخشەی خۆی هەبێت. وە سەرجەم داوەکان لە دەستی ئەمدا بن لانیکەم ئەوەی پەیوەستە بە کوردەوە بۆ ئەوەی مەسەلەی چەك مۆرکی کاردانەوەی حساب بۆنەکراو بە خۆیەوە نەگرێت.

٥) بۆ ئەوەی ڕێبگیرێت لە هەر ئاژاوە گێڕییەك كە بە (اختراق) لە ناوخودی كورد خۆیا بێتە ئەنجام دان.

* كورد لە هیچ بەكارهێنانێكی چەكدا دەستپێشخەر نەبێت. گەر ناچار بوو هەوڵی كۆنترۆڵ كردنی ناوچەكە لە دەرەوەی شارەكە بدرێت و ڕێگا نەدا شەڕی ئەهلی لە شارەكەدا دروست بێت.

*ڕاییگەیەنێ و بە كردەوەش بیسەلمێنێ كە ئەو چەكە چەكی میلیشیاو بەرچاو تەنگیی نەتەوەیی نیە و تەنها چەكی كوردیش نیە، بەڵكو چەكی یاساو هەموو پێكهاتەكانی شارەكە و گەلی كوردستان و كێشەیەكی ڕەوایە.

*زۆر گرنگە گەر بتوانرێت ئەم چەكە فراوان بكرێت بۆ چەكێكی كەركوكی و كوردستانی ونەتەوەكانیتری لە گەڵدا بێت بە تایبەتیش توركمان كە دەكرێت لە ئێستاوە ئیش لە سەر ئەم مەسەلانە بكرێت.

*دروشمی كورد لە بارەی چەكەوە ڕێگرتن بێت لە خوێن ڕێژی نەتەوەیی و ئاژاوە گێڕییەك كە دەیەوێت ئاگری شەڕی نەتەوەیی خۆشی بكات.

**شەشەم: لە ڕووی ئابوری و دارایی و خزمەتگوزارییەوە:**

١) دەستپێكردنی هەڵمەتێكی خزمەتگوزاری لە گەڕەكە عەرەب و توركمان نیشینەكاندا بە ناوی حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە.

٢) لە گەڵ فشار كردن بۆ خەرج كردنی بڕی ئەو پارەیەی لە لایەن حكومەتی عێراقەوە دیاری كراوە لە سەر ئەوە نەوەستین و لە بودجەی ئەمساڵی

حکومەتی هەرێم ڕێژەیەك بۆ ئەو مەسەلە دیاری بکرێت ئەکرێت لە ژێر بواری کارەسات و ڕووداوە لە ناکاوەکاندا بێت یان هەر ناوێکی‌تر.

٣) دانانی سندوقی برایەتی یاخودپشتیوانی کەرکوك. بۆ ئەوەی سەرمایەداری کوردو حکومەتی هەرێم و ڕێکخراوە پەیوەندیدارەکان و خەڵکی ئاسایی و هەندێ وڵاتیش گەر هەبوو کۆمەکی بکەن. گرنگ ئەوەیە دروشمی ئەمساڵ بۆ کوردو کوردستانیەکان ئەوە بێت کە نابێ پرسی ماددەی (١٤٠) و جێبەجێ‌کردنی لە سەر پارە پەکی بکەوێت. گەر هەندێ پرۆژەش لە کوردستاندا لە ڕوەوە بوەستێنرێ لە ڕووی زەمەنی دوورمەوداوە لە قازانجی دوا ڕۆژی کوردستانە.

٤) دەکرێت پارەکان بە ناوی لیژنە فەرعی سەرپەرشتیاری جێ بەجێ کردنی ماددەکەوە بۆ بوارە دیاریکراوەکان خەرج بکرێت.

## کۆتایی بەشی دووهەم